# ئازادی

## یان

# توفان

توێژینەوەیەکی بابەتیانەی گوتاری سیاسی شەرعی و
قۆناغە مێژوویەکانی

وەرگێڕانی
فاتح محمد سەنگاوی

نوسینی
دکتۆر حاکم المطیری



بڵاوکردنەوەی ناوەندی بڵاوکردنەوە

ناوی کتێب: ئازادی یان تۆفان

نوســــەر: د.حاكم المطيري

وەرگێـــڕ : فاتیح سـەنگاوی

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر

خـــە ت: نەوزاد کۆیی

بــەرگ : أمين مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ، ١٤٢٨ك - ٢٠٠٧ز

تــــــیراژ: ٣٠٠٠ دانە

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

له کـتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٨٣ ) ی سـاڵی ٢٠٠٧ دراوەتێ



بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی:

(( نحن أحق بالشك من إبراهيم ))

متفق عليه

واتە: ((ئێمە شیاوترین ڕاڕاو دوو دڵ بین وەك لە ئیبراهیم))

بەناوی خودای گەورەی میهرەبان

## پێشـەکی وەرگـێڕ:

گوتاری سیاسی ئیسلامی یاخود سیاسەتی شەرعی یەکێکـە لـەو بوارە هەرەگرنگانەی لە ئەمڕۆدا پێویستی بە هەڵوێستە لەسەر کردنو پێداچونەوە هەیە لەبەر چەندین هۆکاری جۆراوجۆر، دیارە لـەم رووەوە بـەردەوام نوسـراوی زۆر دەنوسـرێت و کتێـب گـەلێکی زۆر بـە چـاپ دەگەیەنرێت، بەڵام کەمیان نوێخوازیو تازەیی پێوە دیارە بەتایبـەتیش ئەم بوارە خۆی لە خۆیدا بەشێکی هەرە زۆری پەیوەندی هەیە بە واقعو گۆڕاوەکان و بورای ئیجتهادەوە.

پاشان خوێندنەوەی کتێبی (الحرية والطوفان) ی (د. حاكم المطـيري) بۆم دەر کەوت کارێکی جـوانو دانـسقەیەو نوسـەر توانیویـەتی لـەم کتێبەیدا تاڕادەیەکی باش نوێکردنەوە یا بەخۆدا چونەوەیەکی گونجـاو ئەنجام بدات لە گوتاری سیاسی ئیسلامیدا، بەتایبـەتی لـە نێوخـۆی گوتارەکەدا، (د. المطـيري) (هـەروەك هەنـدێ لـە نوسـەرانی تـریش ئاماژەیان پێی داوە) لەم بوارەدا کارێکی دیارو بەرچـاوی ئـەنجام داوەو شێوازی تەقلیدیانەی قوتابخانەی سەلەفی ئەمڕۆی تێپەڕاندوەو قـسەی لە چەندین بابەت کـردوە کـە لای هەنـدێك بـە جـێگیرو نـەگۆڕەکان (الثوابت) دێتە ئەژمار.

لەگەڵ دەرچونی ئەم کتێبـــــەدا ڕاســـــتەوخۆ لە ڕۆژنامەو گۆڤارە

عەرەبی یەکانو سایتەکانی ئەنتەرنێتـەوە قـسەو باسـی زۆری لەسـەر کراو زۆرینەی هەرە زۆریان بە شێوەیەکی ئیجابیانە هەڵیان سەنگاند، فەهمی هوەیدی سەبارەت بە پرسیارەکانی سـەرەتای کتێبەکـە دەڵـێ: ((لە راستیدا (د. المطیـــري) لـە پێـشەکیەکەیدا پرسـیار گـەلێکی خستوەتە روو هیچ کات بە بیرمدا نەهاتوە ئەم پرسیارە جێی سەرقاڵی یەکێك لە سەرکردە سەلەفیەکان بێت)).

نوسەر لە کتێبەکەیدا تارادەیەکی باش دیدێکی نوێی خستوەتە روو بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەرهاویشتەکانی ئـەو سیاسـەتانەی ئەمڕۆ روو بـە ڕووی جیهـانی ئیـسلامی دەبێتـەوە، لەگـەل ئەوەشـدا نوسینی ئەم بابەتە هەروەك نوسەر لە شوێنێکی تردا ئاماژەی پێ دەدا لەبەر ئەنجامی پەستانی بـارودۆخی ئێـستادا نیـە، بـەڵکو بانگەشـە کردنی ئەو بۆ ئازادیو فرەلایەنی سیاسی مێژوویەکی پێشینەی هەیەو هەڵتۆقاوی ئەم بارودۆخە نیە، بەڵکو (وەکو لە نێو کتێبەکەیدا بەدەر دەکەوێت) بیروبۆچونەکانی مەبدەئیو بەڵگەدارو پشت ئەسـتورن بـەو گوتارە سیاسیە ئیسلامییە رەسەنەی لـە مێـژووی ئیـسلامدا بـوونی هەبوەو ئەو ناوزەدی دەکات بە (گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو) .

دەتوانرێ بوترێ ئەم کتێبە توێژینەوەیەکی کورتو پوختە سەبارەت بە گوتاری سیاسـیو قۆناغـە مێژویـەکانیو ئـەو تایبەتمەندییانـەی هەریەکە لەو قۆناغانە هەیبوە، توێژەر قۆناغەکانی گوتـاری سیاسـی دابـەش دەکـات بەسـەر سـێقۆناغی یـەك بـەدوای یـەك دا بـۆ ئـەم

مەبەستەش سێ زاراوەو دەربڕینی نوێ بەکار دەهێنێت، کە پێشتر پێی دەرنەبڕراوە، قۆناغی یەکەم لای نوسەر بە قۆناغی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو ناوزەد دەکرێ، کە بریتییە لە سەردەمی پێغەمبەری خوداو خەلیفەکانی ڕاشیدین و ماوەیەك دوای ئەوان، لەم قۆناغەدا ڕێنمایەکانی ئیسلام بەو شێوەیەی کە هەیە ڕەنگی داوەتەوەو ڕۆڵی هەبوە لە واقعی سیاسیو کۆمەڵایەتی دا.. پایەکانی ئەم گوتارەش لەسەر چەندین هێڵی گشتی و خاڵی سەرەکی بنیات نرا بوو، لەوانە مافی ئومەت لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتو چاودێریکردنو لێپرسینەوەو لابردنو مەرج لەسەر دانانی، سەرەڕای مافی ئازادی بیرکردنەوەو دەربڕینو مافی ئینتمای سیاسیو فیکری و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و پێویستی بەدیهێنانی دادگەریو یەکسانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا لەبەردەم قەزاو دادگادا.. وە دەستەبەر کردنی مافی گەلو خەڵك لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ستەمو زۆرداریو ... هتد.

بەرپاکردنی دەوڵەتیش لەسەر بنەماو بناغەی تێڕوانینی ئیسلامیانە شوێنو پێگەیەکی دیارو بەرچاوی هەبوە لەم قۆناغەدا هەروەك (د. المطيري) باسی دەکات.

نوسەر قۆناغی دووەمی ناوناوە گوتاری سیاسی شەرعی تەئویل کراو، کە بە کۆتایی هاتنی سەردەمی ڕاشیدینو ماوەیەك دواتر دەست پێدەکات و تا سەردەمی کەوتنی دەسەڵاتو سەڵتەنەتی عوسمانیەکان درێژە دەخایەنێت لە سەرەتاکانی سەدەی رابردوودا، لەم بەشەدا نوسەر

به ئازایەتیو جورئەتی زانستییەوە تەواوی ئەو سـلبیاتانە دەخاتـە روو کە بە هۆیەوە مـافی ئومـەتو خەڵکی زەوت کراوە، لەوانە زەوتکردنـی مـافی ئومـەت لە بیرورا وەرگـرتنو ڕاویـژ پێکردنیـدا، هـەروەها دوور خستنەوەو پەراوێز خستنی چاودێری کردنی ئومـەت لە خانەی سامانو دارایی گـشتیدا، لەگـەڵ پاشەکـشەکردنی ڕووبەڕووبونـەوەی سـتەم و لادانو زۆرداری ستەمکاران، بە بیانوی پێویستی گوێڕایـەڵی کـردنو ڕونەدانی فیتنەوە، لەگەڵ هەموو ئەم کـەمو کورتیو سـلبیاتانەی ئـەم قۆناغە بەڵام توانرا پارێزگاری بکرێ لە هەندی بنەمای گوتاری سیاسی دابەزێنراو لەوانە فەرمانڕەوایی کردن بە شەریعەتو جیهـادو بـەرگری کردن لە سنوری موسڵمانان و هێڵانەوەی خەلافەت ئەگەر بـە روکـارو وێنەش بووبێ، لەم بەشەدا نوسەر توێژینەوەیەکی دووورو درێژ سەبارەت بە زۆرداری دادگەر (المستبد العادل) ئەنجام داوە ئەگەر بەراوردی کەین بە قەبارەی کتێبەکە، قۆناغی سێهەمیش نوسەر ناوی ناوە بە قۆنـاغی گوتاری سیاسی شەرعی گـۆڕێنراو، لـەم قۆناغـەدا نوسـەر تیـشکی خستوەتە سەر بارودۆخی ئێستاو ئەو شکستو پاشکۆیەتیو بە پەراوێز بوونەی کە دەرهاویشتەیەکی سروشـتی ئـەو لادانو گۆڕانکارییانەیـە بەسەر گوتاری سیاسی شەرعی دا هـات، لـەم قۆناغـەدا شـەریعەتی ئیـسلامی گـۆڕا بـە سیـستەمو یاسـا هاوردەکـان، تـەواوی گـەلانی موسڵمان بوونە دیلو کۆیلەو ژێر دەستەی کۆلۆنیالی رۆژئـاوایی، ئـەم گوتارە لـە هەنـدێ ڕوویـەوە بـەناوی دیـنو شـەرعەوە ڕەوایـەتی پـێ

بەخشرا، بە تایبەت لە نوسـراوەکەی عـەلی عەبـدورازق دا بـە نـاوی (ئیسلام‌و بنەماکانی فـەرمانڕەوایی – الاسـلام وأصـول الحکـم) کـە بیروبۆچـونی ئـەو وابـوو یـان وای ڕاگەیانـد کـە ئیـسلام سیاسـەت‌و فەرمانڕەوایەتی تیادا نیە، ئەمەش پاساوێك بوو بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی خەلافـەت و دەســەڵاتی ئیــسلامی‌و ســەرهەڵدانی دەوڵەتۆچــکەی ناوچەیی‌و چەندین سیستەمی عەلمانی بەکرێ گیراوو ئەڵقە لە گوێ – هەروەك دەوترێ – بەپەراوێز خستنی شەریعەت‌و لەکار خستنی.

پرۆژەو ئامـانجی کۆتایی کتێبەکە وەك یەکێك لە نوسـەران ئامـاژەی پێدەدات بریتیە لە توڕدان‌و فرێدانی هەردوو گوتاری تـەئویل کـراوو گۆڕێنراو و گەڕانەوە بۆ گوتاری دابەزێنراو، لەم نێوەندەش دا دەخوازرێ دەسەڵات‌و دەوڵەت بەخۆیدا بـچێتەوەو چاکـسازی ئـەنجام بـدات، لـە هەمان کاتدا (د. المطیـري) بانگەشەی کاری جەماعی‌و دەستاو دەست کردنی ئاشتیانەی دەسەڵات دەکا لە نێوان پارتە سیاسیەکاندا.

دواجار نوسەر گومان‌و ڕاڕایی دەکاتە سەرەتاو هەنگاوی یەکـەم بـۆ چاکسازی و سەرلەنوێ بنیات نانەوە، بۆ ئەم مەبەسـتەش ئامـاژە بـە فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەکـات، لێـرەوە دەخـوازێ گومـان لـە زۆربەی بیروراو بۆچونەکانی کۆمەڵگە بکرێـت، بەتایبـەتی تێـڕوانین‌و تێگەیشتنی کۆمەڵگە بـۆ دیـن‌و بوارەکـانی، گومـان کـردن لـەوەی ناودەبرێت بە ڕۆشنبیری ئیـسلامی و.. هتـد. کـە دەکـرێ بەرئـەنجامی چـەندین هۆکـارو هاوکێـشەی نێوکۆمـەڵگـە بـن نـەك ڕەنگدانـەوەی

راستەقینەی بەهاو ڕێنماییە ئیسلامیەکان... بە کـورتی نوســەر لـەم توێژینـــــەوەیەدا دەیەوێت گۆڕانکاری بکرێت و کۆمەڵگاکان لـەباری مت بوو ســــــڕبوی خۆیـان دەرچـن و ئـــازادی و مافـەکانی خۆیـان بەدەست بهێنینن.

ئەوە ماوە بڵێین نوسەر لە پێگەیەکی بەهێزی ئیسلامیانەوە دەدوێ و پشت ئەستورە بە بەڵگەی بەهێزو خۆیـشی کەسـێکی بـەتوانای ئـەو بوارەیە، بۆ زیاتر ناسین و ئاشنا بوونی نوسەریش دەکرێ سەیری پێگەی نوسەر بکرێ لە ئینتەرنێت دا..

ئەوە ماوە بڵێین دوای ماندوبون و هەوڵدانێکی زۆر توانیمان مۆڵەتی وەرگێڕان و چاپکردنی ئەو کتێبە لە نوسەر وەربگرین لە ڕێی نوێنــەری ئەو بەڕێز (ساجد العبـدلی)یـەوە، ئەمــەش مایـەی ڕێـزو ســوپاس و پێزانینـــە.

هیوادارم وەرگێڕانی ئەم کتێبە کەلێنێك پڕ بکاتەوە لە کتێبخانــەی کوردیدا..

فاتیح سەنگاوی
چەمچەماڵ ٣/١٠/٢٠٠٦

بەناوی خوای بەخشندەی دلۆڤان

## پێشـــەکی:

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیـان، درودو سـڵاو خوایـە بڕژێت بەسەر پێغەمبەرمان پێشەوای تێکۆشەران موحەممـەدی کـوڕی عەبدوڵڵا وە بۆ سەر کەسوکارو هاوەڵانی بە گشتی.

پاش سوپاس‌و ستایش، ئەم نوسراوەی بەردەســتتان توێژینەوەیـەکی کورت و پوختە سەبارەت بـە گوتـاری سیاسـی ئیـسلامی و قۆناغـە مێژوویەکانی و سروشتی هـەر قۆناغێـك و دیـارترین ڕواڵەتـەکانی، هەوڵیشم داوە وەڵامی زۆرێك لەو پرسـیارانە بدەمــەوە کـە ماوەیـەکی زۆرو دوورو درێژە جێی قســـەوباس و مشت ومڕە لەم پرسیارانەدا خـۆ دەنوێنن:

١- سروشـتی دەوڵـەتی ئیـسلامی چـۆنە؟ ئایـا ئیـسلام سـستمێکی سیاسی مەشخەڵ رونی هەیە؟ ئایـا لـە توانادایـە ئـەو سیـستمە سەرلەنوێ زیندوکرێتەوە؟ وە ئایا ئێمە پێداویـستیمان هەیـە بـەو سیستمە؟

٢- چ پەیوەندییەك لە نێوان کۆمەڵگەو دەوڵـەت دا هەیـە؟ پانتـایی دەســت تێــوەردانی دەوڵــەت لــە کاروبارەکــانی کۆمەڵگــە تــا چ رادەیەکە؟

٣- چین ئەو مافە سیاسیانەی شەریعەتی ئیسلامی هێناونی؟

٤- گوتاری سیاسی ئیسلامی چـۆن پاشەکـشەی کـرد؟ هۆکارەکـانی پاشەکشێیەکەی چی بوون؟ پەیوەندی فیقهـی سیاسـی بەواقعـەوە چیە؟ شوێنەواری ئەو فیقهە لەسەر رۆشنبیری کۆمەڵگە چیە؟

٥- چۆن ئیسلام سـەرەتا لـە ئاینێکـەوە کـە بانگەشـەی دەکـرد بـۆ ئازادکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی و داوای ئەوەی دەکرد تـەنها مـل کەچی بۆخوا بکرێ گۆڕا بۆ ئاینێك کـە پێویـستیش بکـا لەسـەر شوێنکەوتوانی ملکەچی سەرکردەو زاناکانیان بن باهەرچی لادان و گۆڕانکاریـیـەکیش هەیـە ئـەنجامیان دابـێ، بـە بیـانوی گـوێ رایەڵیکردن بۆ کاربەدەست و فەرمان ڕەوایان (أولو الأمر) .

٦- بۆچی زۆرینەی زانایانی ئیسلام و بـانگخوازانی لـەمڕۆدا گرنگـی نادەن بە مـافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی و دادگەری کۆمـەڵایەتی و یەکـسانی... هتـد، کـە ئەمانـە ئـەو بنەمایانـەبون بـەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا بانگەشـەی بـۆ دەکـردن و لـە مەدینەشدا تەئکیدی لەسەر دەکردنەوە، هەر ئەمەش بـوو سـەری کێشا بۆ خێرا بڵاوبونەوەی ئیسلام لە هەموو جیهاندا، چونکە گەل و نەتەوەکان بینیـان ئـەم ئیـسلامە ئـایینی دادگـەری و ئـازادی و بەزەییە، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾(الانبیاء: ١٠٧)؟! واتە: ئێمە هەر بۆیـە تۆمـان نـارد کـە بـەزەیی و چـاکەیەك بیـت بـۆ تـەواوی خـەڵکی دونیـاو هـەموو جیهانیان.

٧- چۆن توانرا چەمکی شەریعەت بە شێوەیەك پـەرت بکـرێ تـاوەکو وای لـێ بێت سیاسەتی شەرعی، مافـەکانی مـرۆڤ، ئازادیـەکان، دادگەری کۆمـەڵایەتی، یەکسانی، هەموو ئەمانە پەیوەندی نـەبێت بەو شەریعەتەی دەویستریٚ پیـادە بکـرێ و بـەو ئایینـەی ئـەمڕۆ بانگەشەی خەڵکی بۆ دەکرێ؟!

٨- کەواتــە حەقیقــەتی بانگــەوازی پێغەمبەرانــە و ئــەو ئایینــەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی لە چیدا بەرجەستە دەبـێ ئەگـەر خەڵکی بانگەشە نەکرێ بۆ ئەو بنەمایانە کە بەشێکن لـە واتـای ووشەی (لا إله الاالله)؟! هیچ پەرستراوێك شایـستەی ملکەچـی و گوێڕایەڵی و ترس وبیمو وویستن و خولیا نیە جگە لە خـوا، جگـە لە ویش هـەموو مـرۆڤن، بـراو خوشـکن، لـە دایـك و بـاوکێکن، گوێڕایەڵی و بە گەورە زانی و ترس لە هیچ دروستکراوێك دروسـت نیە با پلەوپایەو توانای هەر چەندوچۆنێك بێـت، چـونکە هـەموو بەندەی خوان، لەگەڵ ئەوانیتردا هەموو پێکەوە ئازادن.

٩- چۆن توانرا ئیسلام لە ناوەڕۆکەکەی خاڵی کرێتەوە، وای لـێهاتووە زۆربەی بانگخوازان ئەمڕۆ بانگەشەی خەڵکی دەکەن بۆ ئاینێك کە نرخی تێدا نیە بۆ مرۆڤ و ئازادی و رێزو مافەکانی، بۆ ئاینێك کە بانگەشە ناکات بۆ دادگەری کۆمەڵایەتی و یەکسانی و ئازادی، بەڵکو ڕەفزی گۆڕانی واقع دەکاو داوای مانەوەو چەسپاندنی دەکا بە بیانوی گوێ رایەڵی بۆ کاربەدەست و فەرمان ڕەوایان.

١٠- چۆن بانگەشەی گەلانی جیهانی ئازاد بکەین کـە فـەرمان ڕەواو خەڵکی تیایدا یەکسانن، گـەل لەسـەرکردەکانی دەپرسـێتەوە، بـە ئاشکرا ڕەخنەیان لـێ دەگرێو بە لێسەندنەوەی متمانـە لـە کـار لایان دەبات، فەرمان ڕەواش ناتوانێ کەسـێ بەنـدبکا یـا ئـازادی زەوت بکا یا سزای بدا، چـونکە فـەرمان ڕەوا بریکـار و جێـداری ئەوانەو بۆیان هەیە لە کاری خەن، چۆن ئائەمانە بانگ بکەین بـۆ ئاینێك کە ئەمڕۆ داوا لە شوێن کـەوتووەکانی دەکـا مـل کەچـی فەرمانڕەوابن و خراپەکاری و سـتەمەکەی هەرچـۆنێك بـووە دەبـێ ئـارامی لەسـەر بگـرن، چـونکە گوێڕایـەڵیکردنی ئەمانـە لـە گوێڕایـەڵیکردنی خـوای گـەورەو پێغەمبەرکەیـەتی؟ ئـەم گەلـە ئازادانە ئەگەر هاتنە ناو ئەم ئایینە نوێیەوە حەرامـە هەسـتن بـە دروستکردنی پارتەسیاسـیەکان یـا دەسـتاو دەسـتیو ئـاڵوگۆڕی دەسەڵات بکەن لە نێوان خۆیاندا؟!!

وای لـێ هاتووە ئەمڕۆ خەڵکی بانگ دەکـرێن بـۆ ئاینێـك ئەگـەر شێواو ئەتککراویش نەبێ ئەوا پەرت و کەم وکورتە، چاکسازی گـەل و نەتەوەی پێنـاکرێ و کاروبارەکانی میللەتی پێ ناچێ بە ڕێـوە، بـەڵکو کۆتو بەنـدە، ئیـسلامی ڕاسـتەقینە بێبـەری و خاوێنـە لـەم جـۆرە ئیسلامە هەرئەمەش سـەری کێـشا بۆئـەم واقعـەی ئـەمڕۆ جیهـانی ئیسلامی تیایدا دەژی: لە دواکەوتن و تێکشکان و بڵاوبونەوەی ستەم و گەندەڵی و خراپـەکاری، هـەر بۆیـە ناچـارین پێداچـونەوەی گوتـاری

سیاسی ئیسلامی بکەین.

بۆئەم مەستەش خۆم پابەند کردووە بەوەی تەنها فەرموودە ڕاستو دروست (صحیح)ەکان بهێنم، لە رووداوو گێڕانەوە مێژووییەکانیش تەنها پەسەندکراوەکان وەر بگرم، هەوڵیشم داوە توێژینەوەی رچە (سند)ی گێڕانەوە مێژووییەکان بکەم -لەگەڵ ئەو قورسیو ماندوبونو شەکەتیەی تێیدایە- بۆ ئەوەی خۆبپارێزم لە گێڕانەوە هەڵبەستراوەکان، تەنها ئەو رووداوە مێژووییانەم هێناوە کە ڕاستو دروستن یا لە نێو مێژوونوساندا بە ناوبانگن، چونکە مێژوونوسان لە زۆر وردەکارییدا ڕێبازێکی جیا لەڕێبازی فەرموودە ناسانیان هەیە.

هەوڵیشم داوە بەدواداچونی قۆناغەکانی گوتاری سیاسی بکەم بە درێژایی مێژووی ئیسلام، بۆ ئاشنابون بەو گۆڕانکاری و گۆڕانانەی بەسەریدا هاتووە، هەروەها زانینی هۆکارو دەرەنجامەکانی.

دەقەکانم بە شێوەیەك راڤە نەکردووە کە ئەو مانایە لە خۆنەگرن، هەروەها گوێشم نەداوە بەوەی خەڵکی ئەمڕۆ چ بۆچونێکیان هەیە، لام نەکردەوە بەلای هاوڕاو دژەڕاکانیشم دا، بەڵکو مەبەستم ڕەوا و ڕاستی بووە بە دەر لەوەی خەڵکی چی دەڵێن، چونکە هەرکەسە رەزامەندی خوا بە نارەزایی خەڵکی بەدەست بخا خواش لێی رازی دەبێ و رەزامەندی خەڵکیش بەدەست دەهێنێ، هەر کەسەش رەزامەندی خەڵکی بە تورەکردن و رق هەستانی خوا بەدی بهێنێ، خوالێی تورە

دەبێ و خەڵکیش رقیان لێی هەڵدەسێ.(١)

ئەشزانم ئەو دەرەنجامەی پێی گەیشتوم توڕەیی زۆرێك لە خەڵكی دەوروژێنێ، چونكە هەژاندنی بیروباوەڕی خەڵكی ویرانكردنی ئەو چەمكگەلانەی لەسەری پێ گەیشتوون و لە تێڕوانین و دیدی ئەواندا بووە بە خودی ئایین خۆی لەخۆیدا شتێكی هەروا ئاسان نیە، لە كاتێكدا ئەو شتانە لە راستیدا رۆشنبیری و كەلتوری كۆمەڵگاكانن و بە تێپەرینی نەوەكان گواستراوەتەوەو بەجێماوە، هەر ئەو رۆشنبیری یە بەجێماوانەشە ئایین و حوكمەكانی ئایین بە پێی پێداویستی و بەرژەوەندی و بەهاكانی خۆیان دارشتووەتەوە، تا كار گەیشت بەوەی پێی گەیشت، نەك بە هۆی ئایینەوە بەڵكو بە هۆی ئەو لادانانەی لە نێو ئایین دا ئەنجام درا سەبارەت بە بنەماو ویست و مەبەستەكانی خودی ئایین خۆی لە رێی لێكدانەوەی خراپ و شێواندنی سست كەرو بێرەواج كردنیەوە، تا وەهای لێهاتووە ئایینی ئەمرۆی خەڵكی ئەو ئایینە نیە كە هاوەڵان (خوایان لێ رازی بێت) لە سەری بوون سەرەڕای ئەوەی قورئان بەردەوام تەرپرو پاراوە وەكو كاتی دابەزینی،

---

(١) رۆژی هەینی ٢٠ / ١٢ / ٢٠٠٢ مامۆستا و ئەدیب عەبدولمەجید موبارەك لە برمنگهام لە ئینگلتەرا پەیوەندی پێوە كردم، هەواڵی خەوێكی پێدام نزیكە بڵێم مژدەیەكی خێرا و پێشوەخت بوو بۆ ئەم كتێبە، لەوكاتەدا پێیدا دەچوومەوەو ریشەو ئوسوڵەكانم راست دەكردەوە – لە خەوەكەیدا قسەیەكی لە شێوەی ئەوەی سەرەوەم كردبوو بۆ ئەو كەسەی – ئاگاداری دەكردم لە رق و توڕەیی خەڵك. مامۆستا عەبدولمەجید پێشتر ئاگاداری بابەتەكانی نێو ئەم كتێبە نەبوو؟!!.

بەڵام زۆرجار بەهۆی ئەو تێگەیشتنو چـەمگگەلو ڕاڤـەو تەئویلانـەی سـەدان زانـا کردویانـە پـەردەو ڕێگـری دروسـت دەبێـت لـەڕێی تێگەیشتنیدا، تا ڕادەی ئەوەی کاتـێ موسـڵمانێ دەیـەوێ ئایـەتێکی قورئان بخوێنێ هەرچەندە ڕوونو ئاشکرابێتو دەلالەتەکـەی بڕابێتـەوە کەچی دەبێ دەیان کتێب بگەرێ بۆ ئەوەی ببینێ ئەوانی تر چۆن لێـی تێگەیشتون، ئائەمەیە ئەو جیاوازییەی لە نێوان هاوەڵان (خوایان لـێ ڕازی بێت) کە قورئان و پێغەمبەر ﷺ ڕێی تێگەیشتنیان بۆ دیـاری دەکردن هەر بۆیە ڕۆشنبیری و کلتورو بەهاو بەرژەوەندیەکانی تریان لە خۆ دادەڕنی بۆ تێگەیشتنی ئایەتەکان، هـەموو ئـەو پەیوەندیانـەیان دەبڕی کە گرێی دەدان بەو ڕۆشنبیرییەوە- بـەڵام موسـڵمانانی ئـەمڕۆ قورئان و سوننە مەشخەڵی ڕێیان بۆ دیاری ناکات، بەڵکو موفەسـیرو ڕاڤەکاران و زانایان، بە مردوو زیندویانەوە، سـەرەڕای جیـاوازی چـاخ وتێگەیشتن و ڕۆشنبیریشیان؟!!

ئەم توێژینەوەیەم دابەش کردووە بـۆ سـێ بـەش بـە پێـی قۆناغـە مێژوییەکانی گوتاری سیاسی شەرعی کە بریتین لە:

١- بەشی یەکەم: قۆناغی یەکەم: قۆناغی گوتاری سیاسـی شـەرعی دابەزێنراو.

٢- بەشی دووەم: قۆناغی دووەم: قۆناغی گوتاری سیاسی تەئویلکراو.

٣- بەشی سێهەم: قۆناغی سێهەم: قۆناغی گوتاری سیاسی گۆڕێنراو.

سەرنجێکی بچوك: سەرجەم ئەو سەرچاوەو کتێبانەی بۆی گەڕاومەتــەوە بە پێی چاپە بەناوبانگەکانێتی یا ئەوەی تەنها یەك جـار چـاپکراوە جگە لەم سەرچاوانە:

١- طبقات ابن سعد: تحقیق عبدالقادر عطـا- دار الکتـب العلمیــة- بیروت.

٢- تاریخ ابن جریـر الطـبري: ط٣ - ١٩٩١ م، دار الکتـب العلمیــة- بیروت.

٣- البدایة والنهایة - تاریخ ابن کـثیر: ط٣ - ١٩٨٧ م، دار الکتـب العلمیة - بیروت.

٤- مصنف ابن شیبة - تحقیق کمال الحوت، ط١. التاج - بیروت.

ئیتر داوای سەرکەوتن و بە جێیەتی لە خوای بەرزو بالاّ دەکەم، تەنها قسەی ئەو پێغەمبەرە پیاوچاکە دەڵێم کە خوای گەورە (لەسەر زمــانی ئەوەوە پێمان) دەفەرموێ: ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ (هود - ٨٨)

واتە: من هیچم ناوێت تەنها چاکسازی نەبێت، بە گـوێرەی توانــام، ڕێکخستنی کارم بەدەستی کەس نیە بەدەســتی خـوا نــەبێت، پــشت و پەنام هەر بەو بەستووە و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە.

# قۆناغـە مێژوويیـەكانی
# گوتـاری سـیاسـی شـەرعی

## بەشـــی یەكـەم

### قۆناغی یەكــەم

### قۆناغی گوتـاری ســیاسی
### شــەرعی دابەزێنراو
### (١ ك – ٧٣ ك)

ئەکرێ قۆناغە مێژوییەکانی گوتـاری سیاسـی ئیـسلامی – کـە بریتیە لە کۆو و پێکهاتەی بڕیارو حوکم و بنەماکانی سستمی فەرمان ڕەوایەتی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا – دابەش بکـەین بـۆ سـێ قۆنـاغی سـەرەکی، هـەر قۆنـاغێکێش چـەندین ئادگـار و تایبەتمەنـدی و مەشخەڵی خۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە قۆناغەکانی تر:

## قۆناغی یەکەم: قۆناغی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو:

بریتیە لەو قۆناغەی ڕێنماییەکانی ئیسلامی تێدابەرجەسـتە دەبـێ هەروەك چۆن دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەم قۆناغە کـە لـەڕوی مێژوییەوە بەبەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی لـە مـەدینـەی منـەوەرەوە دەست پێ دەکات، پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچـی بـۆی کـرد، تـا دەگاتە کۆچی دوایی دوا خەلیفەیـەکی سـەحابی پێغەمبـەر ﷺ کـە ئەویش عەبدوڵلای کوری زوبێرە (ساڵی ٧٣ ك)، سەرەڕای ئەو کەلێن و ناتـەواوی و لادانـەی لـە دوادواییـەکانی دەسـەڵاتیدا پەیـدابوو کـە بەسەرەتای کۆتایی هاتنی ئەم قۆناغە دادەنرێ.

ئەم قۆناغە بەوە جیادەکرێتەوە کەم ئەم سەرەتاو بنەمایانەی خوارەوە تیایدا ڕوونو ئاشکرابووە:

١- زەرورەتـی بـوونی دەوڵـەت بـۆ ئـایین، وە ئـایین بـەبێ دەوڵـەت نـابـــێ:

لەم قۆناغــەدا بنــەمای زەرورەتــی بــەرپاکردنی دەوڵــەت ئاشــکراو دیاربوو، ڕون بویەوە ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، چونکە نەگونجاوەو ناکرێ ئیسلام کە پەیامێکی نەمری مرۆڤایەتیە، وە شــەریعەتێکی کامــڵ و تەواوەو خوای گەورە هەڵی بژاردووە بۆ مرۆڤــەکان، دەوڵــەتێکی نــەبێ حوکمەکانی ئەو پەیامەی تیا بەرجەستەبکاو ئەو ئەرك و مافانەی تیا بەرپابێ لەگەڵ ئەو سنورانەی دەبنەهۆی پاراستنی ئەو مافانە.

قورئــان لــە زۆر ئایــەت دا تەئکیــدی لەســەر پێویــستی دەوڵــەت کردووەتەوە وەك مەبەست و ئامانجێك، هەروەك لــە فــەرمودەی خــوادا هاتووە: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا﴾ (النور: ٥٥) .

واتە: خوا بەڵێنی دڵنیا بەخش و تــەواوی داوە بــە وانــەی باوەڕیــان هێناوە لە ئێوەو کارو کــردەوە چــاکەکانیان ئــەنجام داوە بەڕاســتی لــە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکــات لــە وڵاتــدا هــەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دیــن و ئاینــەیان بۆ دەچەسپێنێت کە خوا خۆی پێی رازیە، هەروەها ترس و بیمیــان بــۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و هێمنی، ئــەو کاتــە ئــیتر بــە تــەواوی هــەرمن

دەپەرستن هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیارنادەن.

هەروەها تەئکیدی لە زەرورەتی دەوڵەت کردووەتـەوە وەك هۆکارێـك بۆ مەبەستێکی تر: وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ) (الحج: ٤١) .

واتە: ئەوانـەی کـە ئەگـەر پایـەدارمـان کـردن لـە زەویـدا نوێـژو دروشمەکانی بە چاکی رادەگرن، زەکاتیش بەتەواوی دەدەن، فەرمان بـە چاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە دەکەن.

ڕوون و ئاشکراشە زۆربـەی واجبـەکان نـاکرێ بەرپـەڕی تەواویـەوە ئەنجام بدرێ- بەڵکو ناکرێ هـەر بـەجێبهێنرێ- مەگـەر لـە سـایەی دەوڵەتێکدا کە بـە ئیـسلام فـەرمان ڕەوایـی بکـاو جێبـەجێ کـاری شەریعەتەکەی بێـت وەکـو زەکـات و جیهـــادو فـەرمان بـە چـاکەو بەرهەڵســـتی خراپەو سنورەکان و... هتد.

هەر شتێك ئەنجامدانی ئەرکێکی لەسەر وەستابێت ئەوا ئـەو شـتە خۆیشی بەناچاریو زەرورەت دەبێ بە ئەركو واجب (مالا یـتم الواجـب الا به فهو واجب ضرورة)

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتەشی لە مەککەدا بووە، کاری کردووە بۆ ئەنجام دان و جێبەجێ بونی ئـەم مەبەسـتە، هـەر بۆیـە لـە وەرزو بۆنەکاندا دەچووە لای هۆزەکان و بەدوای کەسێکدا دەگەڕا پـشتگیریو هاوکاری بکا بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەی کـە خـۆی لـە خۆیـدا

هۆكارێكه بۆ چەند ئامانجێكی بالآتر، كه خۆ لـه بـەرپابونی ئـایین و سـەقامگیر بـونی دادگەریـدا دەنوێنـێ كـه قورئـان بـۆی هـاتووە، پێغەمبەر ﷺ بانگەوازەكەی خستەڕوو بۆ بەنی شـەيبان گەورەكـەيان موثەنای كوڕی حاریثە لە بەرانبەردا ووتی: (ئێمە كاتێ كە چـوینەتە عێراقەوە بە پێی پەیمانێك بووە كە كیسرا لێمانی وەرگرتـووە، ئـەویش بەوەی هیچ شتێكی خـراپ و نەشـیاو نەكـەین، وە خراپـەكاریش جـێ نەكەینەوە، من وادەبینم ئەم شتەی تۆ بانگەوازی بۆدەكـەی لەوانەیـە كە پادشاكان پێیان ناخۆشە، ئەگەر پێت خۆشە پشگیریو هاوكاریـت بكەین لە سنوری دامێنی ئاوی عەرەبەوە ئەوا دەیكـەین. پێغەمبـەری خواش ﷺ فەرموی: (وەلآمەكەتان خراپ نـەبوو چـونكە بـە ڕاسـتو ڕەوانی دەرتانبـڕی، لە ڕاستیدا ئایینی خوا كەسێك سـەری دەخـا لـە هەمـوو روویەكەوە پەروانەی بێتو وە بە هەموولا هەوڵی بۆ بدا)[1]

لێرەدا رونە پێغەمبەری خوا ﷺبانگەشە بۆ دین و دەوڵـەت دەكـا، هەربۆیە بە نوشەیيان هەست دەكەن بەوەی پادشـاكان رازی نـابن بـە شـتێكی هاوشـێوەی ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ بـۆی هێنـاون، ئەوەشـی تەئكیـدی ئەمـە دەكاتـەوە ئەوەیـە كاتـێ پێغەمبـەر ﷺ بەیعـەتی

(١) ابن حبـان لـه متمانەپێكراوەكانـدا هێناویـەتی ١/٨٠، (ابـو نعـيم في دلائـل النبـوة ل ٢٨٢) و ج (٢١٤)، البيهقـي في دلائل النبـوة ٤٢٢/٢، والسمعاني في الانسـاب ٣٧/١، لە رێگەی ابان بن عبدالله البجلي لـه ابان بن تغلب لـه (عكرمـه)ەوە ئەویش لـه (ابـن عبـاس ئـەویش لـه علـی وە (خوایـان لـێ رازی بێـت) گێراوەتـەوە (متطلانـي لـه (المواهب اللدنية)دا دەڵێ:(حاكم و بەیهەقی و ئەبو نەعیم بەڕچەیەكی باش (حسن) هێناویانە) هەروەها (حافظ) له (فتح)دا ٧ / ٢٧٩، ج ٣٨٩ هەمان شت دەڵێ.

دووەمی لە ئەنسارەکان وەرگرت لە مەککە لەسەر بیستن و گوێڕایەڵی بوو لە تەنگانەو ئاسودەیی و لە چوست و چالاکی و خۆشیو ناخۆشیدا، کە ئەمەش بەیعەت و پەیمانی جەنگ(حرب)ە.

لە فەرمودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵلادا هاتووە: (ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، لەسەر چی بەیعەتت پێبدەین؟ فەرمووی (بەیعەتم پێ دەدەن لەسەر بیستن و گوێڕایەڵی لە چوست و چالاکی و خاوو خلێچکیدا، وەبەخشین لەکاتی تەنگانە و ئاسودەییدا، وەلەسەر فەرمان دان بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە، وەڕەوا بوترێ و لە پێناوی خوادا گوێ بە سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران نەدرێ، وە لەسەر ئەوەی پشتگیریم بکەن و بمپارێزن- ئەگەر هاتم بۆلاتان- لەو شتەی خۆتان و خاوو خێزان و منداڵەکانتانی لێ دە پارێزن) ئەنسارەکان لەمە تێدەگەیشتن بۆیە گەورەکەیان (أسعد بن زرارە) ووتی: (دەرچوونی ئەو ئەمڕۆ دژایەتیکردنی هەموو عەرەبە، کوژرانی پیاوە ناودارەکانو شمشێر لەمل نانە.[1]

لێرەدا گوتاری سیاسیانەی پێغەمبەر ﷺ بۆیان رون و ئاشکرایە، وە دەیەوێ دەوڵەت بەرپا بکا، پاش ئەم بەیعەتەش پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ بەرپاکردنی دەوڵەت و دین پێکەوە، چونکە ناکرێ ئاینێك بۆ خواو لە پێناوی خوادا بەرپا بکەی بێ ئەوەی دەوڵەتێکیش هەبێت ئەم

(١) احمد گێراویەتیەوە ٣٢٢/٣، (ابن حبان)یش لە (صحیح)ەکەیدا ١٧٢/١٤، ح (٦٢٧٤) و سەنەدەکەشی (صحیح).

ئەرکە لە ئەستۆ بگرێ، پێغەمبەریش ﷺ توانی پاش کۆچکردنی ئەم ئامانجە سەرەکیە بەدی بهێنێ کە ئاسانکاری دەکا بـۆ ئـەوەی ئـەرکی بەرپاکردنی ئایین و ملکەچی تەواو بۆ خوا دەر بـبڕدرێ. ئەوەشـی ئـەم راستی یە دووپات دەکاتـەوە ئـەو دەسـت پێـشخەرییەی هـاوەڵان بـوو (خوایان لـێ رازی بێـت) پـاش وەفـات کردنـی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ یەکلایی کردنەوەی بابـەتی جێنـشینێتی لـە کـەپری بـەنی سـاعیدە (سقیفه بنی ساعده) کردیان پێش ئەوەی جەستەی پـیرۆزی ئەسـپەردە بکەن، ئەم کارەشـیان تـەنها لەبـەر باوەڕبونیـان بـووە بـەم ئەسـڵەو هەستکردنیان بووە بەو بنەما سەرەکیە، چـونکە ئـەو رەفتـارە و بـەو شێوەیە هیچ لێکدانەوەیەکی نیە جگە لـەم شـیتەڵکارییە نـەبێ کـە بریتیە لە زەرورەتی بەرپاکردنی دەوڵەت لە رێـی یـەکلایی کردنـەوەی بابـەتی ئیمامــەت و دەسـەڵات و پارێزگـاری لـێکردنی لـە پێنـاو پایەداری ئایین و پارێزگاری لێکردنی.

ئەم دەست پێـشخەرییە بـۆ یەکلاکردنـەوەی ئـەم بابەتـە بەڵگـەی هۆشیاری ســـیاسی هاوەڵانە ﷺ و تێگەیشتنیانە بۆ سروشتی ئـەم ئاینەو وە بۆ ئەوەی ئاین و دەوڵەتە، ئەوەشی ئەم راسـتی یـە تەئکیـد دەکاتەوە هەڵوێستی ئەبوبەکرە – درودی خوای لەسەربێ-.

لە بەرانبەر ئەوانەی زەکاتیان نەدەدا بە دەوڵەت پاش وەفات کردنی پێغەمبەر ﷺ بە بیـانووی ئـەوەی ئەمـە لەسـەریان پێویـست نیـەو

ئەکریَ پابەند نەبن پێیەوە، مەسەلەی زەرورەتی دەوڵەت بۆئایین جێــی ناکۆکی ئوممەت نیە، بگرە جێی کۆڕانی هەموو مەزهەبەکانە، چونکە ئامانج لە ناردنی پێغەمبەران و دابەزانــدنی کتێبـــەکان بریتیـــــە لەوەی دادگەری لە نێوان خەڵکیـــدا بەرپا بێــت، هــەروەك خـــــوای گەورە دەفەرموێ: (لَقَدْ أَرْسَــلْنَا رُسُــــلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَــابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ) (الحديد-٢٥) .

ئەم دادگەرییەش بەرپاناکرێ و بەدی نایەت مەگەر بەبەدی هاتن و بەرپاکردنی دەوڵەتێك نەبێت کە ئەو ئامانجە بەدی بهێنێت، کە بریتیە لە بەرپاکردنی دادگەری و چاکسازی کــردن بــە پێــی توانــا، شــێخی ئیسلام ئیبن‌و تەیمیە دەفەرموێ (لە راستیدا خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووەو کتێبەکانی دابەزاندووە بۆ ئەوەی خەڵکی تا رادەیەکی باش لە چــاکەو چاکــسازی دابــن، نــەك بــۆ ئــەوەی خراپــەکاری و گەنــدەڵی بەیەکجارەکی بنەبڕ بکەن و هیچی نەهێڵن، چونکە ئەمە لە سروشتی مرۆییانەدا دەگمەن‌و مەحاڵە، لەبەر ئــەوە هــەر دەبــێ خراپــەی تێــدا بێ)[1]

(١) (مختصر منهاج السنة)ی غنیمان٢/ ٤٨٣.

٢- زەرورەتـــی بـــەرپاکردنی دەســـەڵات، وە دەوڵـــەتیش بـــە بـــێ پێشـــەوا (إمـــام) نـــابـــێ.

ئا ئەمەش بنەمای دووەمە لە بنەماکانی گوتاری سیاسی شـەرعی دابەزێنراو، جا هەروەکو چۆن ئایین بە بێ دەوڵەت نابێ[1]، بـە هـەمان شێوە دەوڵەتیش بە بێ پێشەواو دەسەڵاتێك نابێت کە هـەڵ دەسـێ بـە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو دەوڵەتە، ئەم ئەسڵەش بە هەمان شێوە جێی کۆڕا (إجماع)ە، ماوەردی – لەم بارەیەوە دەفەرموێ:

(ئیمامەت دانراوە بۆ جێگرتنەوەی پێغەمبەرێتی لـە پاسـەوانێتی کردنی ئایین و بەڕێوەبردنی کاروباری دونیاو پەیماندان بەو کەسەی ئەم ئەرکە لە ئومەت دا جێبەجێ دەکا بە کۆڕا واجبە[2]

لێرەدا مەبەستمان لە کۆڕا (إجماع) کۆڕای هاوەڵانە –خوایـان لـێ ڕازی بێـت- کـە بـەهێزترین و دروسـترین کۆڕایەکـە، شەهرسـتانی

(١) لێرەدا مەبەست ئەوە نیە ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی نەبوو ئاینیش نابێ بەڵکو بریتیە لە حاڵەتی ئاساییانەی ئیسلام وەك ئاینێك کە پێویستی بەدەوڵەتە تازەمینە خۆش کا بۆرەنگدانەوەی زیاتری بەهاورێنماییەکانی (وەرگێر).

(٢) الأحكام السلطانية ل(٥) مەبەست لە ئیمامەت لێرەدا جێگرتنەوەی پێغەمبەرە ﷺ ئەویش بـە جێبـەجێ کردنـی شـەریعەتوو بـەرپاکردنی دادگـەری نـەك تـەنها سەرۆکایەتی و فەرمان ڕەوایەتی، کەواتە ئەو واجبە لەسەر ئوممەت لاناچێ مەگەر پاش بەرپاکردنی ئیمامەت بەواتای یەکەمی هەروەك موسلمانان پێی ئاشنان، نەوەك بەرپاکردنی هەموو حوکم و ئیمامەتێك.

فەرموبەتی (.... هاوەڵان (خوا لـــێیان ڕازی بێـت) هەرلـە بناغــەوە ڕێکن لەسەر ئـەوەی کـە هــەر دەبــێ ئیمــام هــەبێ.. ئـەم کۆڕایـەش بەڵگەیەکی یەکلا کەرەوەیە لەسەر پێویست بونی ئیمامەت) [1]

قورتوبیش فەرمویەتی: (سەبارەت بە واجبی ئیمامەت جیاوازی لە نێوان ئومەت، هەروەها زانایاندا نیە.. هاوەڵانیش پاش جیاوازییەك کە کەوتە نێوان کۆچکەران و پشتیوانانەوە کۆبوون لەسەر پـێش خـستنی ئەبوبەکری صدیق.. ئەگەر فەرزی ئیمامەت واجب نەبوایە لە قورەیش و بەدەر لەوانیشدا ئەوا ئەو بەربـەرەکانێ و گفتوگۆیانـە لـە نێوانیانـدا شیاوو گونجاو نەدەبوو... ئەمە بەڵگەی واجبێتیەتی، وە پایەیەکـە لـەو پایانەی ئایین کە کاروباری موسڵمانانی لەسەر ڕاوەستاوە) [2]

(أصم)یش کاتێ کە دەڵێ ئیمامەت دروست (جائز)ە نەك پێویست (واجب) ئەوە بۆ کاتێکە کە موسـڵمانان بتـوانن لـە نێـوان خۆیانـدا دادگەری ئـەنجام بـدەن و بـە مافـەکان هەسـتن و سـنورو ئەرکـەکان جێبەجێکەن، ئەگینا (بونی ئیمام) واجبە) [3] شـێخی ئیـسلام ئیبنـو تەیمیە فەرمویـەتی: (سەرپەرشـتی کاروبـاری خـەڵکی لەگـەورەترین واجبەکانی ئایینە، بەڵکو ئایین بەوە نەبێ بەرپانابێ، مرۆڤـ کاتێ بـە

(١) نهایـة الإقـدام ل (٤٨٠)

(٢) الجـامع لأحكـام القـران ١ / ٢٦٤ سـەرنج دە لـەو قسەیەی کە دەڵی پایەیەکە لە پایەکانی ئایین و پاشان بەراوردی کە بەوەی پاشتر باس و خواسی دێ!

(٣) سەرچاوەی پێشوو ١ / ٢٦٤.

تەواوی بەرژەوەندی یەکانی بەدی دێ کە پێکەوە کۆبن، چونکە هەمویان پێویستیان بە یەکترییە، لە کاتێ کۆبونەوەشیاندا پێویستیان بە سەرۆك هەیە، وە لەبەرئەوەشی خوای گەورە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەی پێویستکردووە، ئەوەش بە بێهێز و فەرمانداریێتی بەدی نایەت، هەروەها هەموو ئەوانەشی واجب کراون لە جیهادو دادگەریو جێبەجێ کردنی سنورەکان ئەنجام نادرێن و بە تەواوی جێبەجێ ناکرێن بە بێ هێزو فەرمانداریێتی)[1]

ئیمامی غەزالیش فەرمویەتی: (سوڵتان زەروری یە بۆ ڕێکخستنی کاروباری دین و دونیا، ڕێکخستنی کاروباری دونیاش لە ئایین دا زەرورییە، ڕێکخستنی کاروباری دینیش زەرورییە بۆ دەست خستنی بەختیاری دوارۆژ، ئەمەش بێدوودڵی مەبەستی پێغەمبەران بووە، بۆیە واجبێتی بونی ئیمام لە هەرە پێویستیەکانی شەرعە کە ناکرێ وازی لێ بهێنرێ)[2]

ئیبنوخەلدون فەرمویەتی: (دانانی ئیمام واجبە، واجبێتی یەکەشی لە شەرعدا بەکۆڕای هاوەڵانو تابعین زانراوە، چونکە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) دەست پێشخەربوون بۆ بەیعەت دان بە ئەبوبەکر

(١) السياسة الشرعية ل ١٧٦ - ١٧٧، لێرەدا مەبەست لە ئیمامەتی شەرعیە نەك هەموو ئیمامەتێك، وەك بارودۆخی زۆربەی حکومەتەکانی ئەمڕۆ کە جێگرێتی پێغەمبەر ﷺ ناکەن لە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامیدا.

(٢) الإقتصاد في الإعتقاد ل ١٩٩

لـێ ڕازی بێت) دەست پێـشخەربوون بـۆ بەیعـەت دان بـە ئەبوبـەکر (خوای لـێ ڕازی بێت) وەکاروباری خۆیان دابەدەستیەوە).[1]

ئـیبن‌و حـەزمیش فەرمویـەتی: (بـەزەروورەتی عـەقڵ‌و سـەلمێنراوە ئاشکراو بێگومانەکانی ئـەوەمان زانیـوە کـە خـەڵکی نـاتوانن بـەو کاروبارو بڕیارو فەرمانانە هەستن کە خوا لە سەری پێویست کـردوون لە سەروەت و سامان و تۆڵەو سـزاو خـوێن سـەندنەوەوەو مـارەبڕین‌و جیابونەوەو ستەم نەکردن‌و بەدەم هـــەژارەوە بوون‌و... هەموو ئەمانـە ناکـــرێ و ناگونجێ بە بێ ئیمام ئەنجام بدرێ، ئەمانەش لەو وڵاتانـەدا کە سـەرکردەی نیـە شـتێکی ئاشـکراو بەرچـاوە، لەوێـدا فـەرمانی فەرمانڕەواکان جێبەجێ ناکرێ‌و ســـنورەکان پیادە نابن، تەنانەت زۆر لە مەسەکانی ئایین نەماون، بەرپاکردنی ئایین بەدی نایەت مەگەر بە پاڵپشتی و هاوکاری کەسانی تر)[2]

---

(١) المقدمة ل ١٩١.

(٢) الفصل فی الملل والنحل (٤/ ٨٧) . رامێنە لە دەقی ووتەی ئەم پێشەوایانەو چۆنێتی شیتەڵکاری و هۆکاریان بۆ واجبێتی ئیمامەت لەڕووی شەرع و ژیریەوە، وە چۆن بە پایەیـەك لـە پایـەکانی ئایینیـان دانـاوە، لەبـەر ئـەوەی ئـایین بـەوە بـەرپا دەبـێ، پاشـانیش بڕوانـە واقعـی گوتـاری سیاسـی بزوتنـەوە ئیـسلامیە هاوچـەرخەکان بـۆ ئـەوەی مـەودای ئـەو کەلێنـە هەسـت پـێ بکـەین کـە توشـی گوتـاری سیاسـی و عەقائیدیان بووە لەبـەرەنجامی پـەراوێز خستنی ئەم ئەسڵەوە! بڕوانـە ئـەو وتەیـەی ئیبن‌و حـەزم بـەوەی کـە نـەبونی ئیمـامێکی شـەرعی کـە هەسـتێ بـە واجبانـەی خـوا فــەرزی کــردوون لەســەر ئومــەت سەردەکێـشێ بــۆ نــەمان و ڕۆیــشتنی ئــایین و بەنەبون‌ونەمانیشی ئاینیش پیادە ناکرێ.

شەرعیەکانە، چونکە ئایین بەبێ ئەوە بە پایان ناگـا سـەرەڕای ئـەوەی زەرورەتێکی کۆمەڵایەتیە بۆ چاکسازی، کاروباری کۆمەڵگە بەبێ بونی دەسـەڵات بـەرێوە ناچـێ، هـەروەك شـێخی ئیـسلام ئیبنـو تەیمیـە فەرمویەتی: (هەموو مرۆڤەکان لە دونیاو دوارۆژدا بەرژەوەندیەکانیان بەدی نایەت مەگەر بە کۆبونەوەو هاوکـاریکردنی یـەکتر نـەبێ، هـەر بۆیە وتراوە: مرۆڤ بەسروشتی مەدەنیە، جـا ئەگـەر کۆبونـەوە ئـەوا پێویستە هەندێ کاروبار ئەنجام دەن تـاوەکو بەرژەوەنـدی خۆیـانی پـێ بەدەست بهێنن وە خۆبپارێزن لەو کاروبارانەی خراپەکاری تێدایـە، بـۆ بەدی هێنانی ئەو مەبەستانە گوێڕایـەڵی فـەرمانکارێك بکـەن و بـۆ خراپەکانیش نەهی کارێك، هەموو مرۆڤەکان پێویـستە گوێڕایـەڵیان هەبێ بۆ فەرماندارو نەهی کارێك)[1]

زاناکان رێکن لەسەر ئەوەی سەرپەرشتیکردنی کاروباری گشتی لـە بەرێزترین ئەرکە شەرعیەکانە، هەروەك عیززی کـوڕی عەبدولـسەلام فەرمویەتی: (موسڵمانان رێکن لەسەر ئەوەی سەرپەرشتی کردنـەکان (الولايات) لە باشترینی گوێڕایەڵی کردنەکانە، چـونکە کاربەدەسـتە دادگـەرەکان گـەورەترین پاداشـتو زۆرتـرین رێزیـان هەیـە، بەسـەر خەڵکانی تردا، بە هۆی ئەوەی لە ژێر دەسـتیاندا زۆرتـرین رەوا بـەرپا دەکرێو چەندەها خراپەکاری و ناڕەوا دوور دەخرێتەوە.... بـە کـورتی و

(١) الحسبة ل (٨)

پوختی پێشەواو کاربەدەست و فەرمانڕەوا دادگـەرەکان پاداشـتیان لـە هەمـوو خەڵکی گەورەترە ئەمـەش جێی ئیجماعی ئەهلی ئیـسلامـە)[1]

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیـە فەرمویـەتی: (واجبـە میرایـەتی بـەئایین دابنرێ و هۆکارێکی نزیك بونەوە بێ لە خوا، چونکە نزیك بونـەوە لـە خوا لەم رێگەیەوە بەئەنجام دانی کوێڕایەڵی کردنـی خـواو گوێڕایـەڵی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە باشترین هۆکـاری نزیکبونـەوە لـەخوا دادەنرێ)[2]

ئەمـەش تەفسیری هۆکاری ئەو پێشبڕکێ و کێبەڕکێیانەی هاوەڵانمان بۆ دەکات کە لەم رووەوە بەدی دەکرێ هەروەك لەبەسەرهاتی سـەقیفەو رووداوی راوێژدا دەبینین کە عومەر خـستیە نێـوان شـەش کەسـەوە، ئەوانیش کێبـڕکێیان تیادا کرد لەبەر ئـەوەی لـە پێغەمبـەری خـواوە بیستبویان رێزی ئیمامـەت چ رێزێکی هەیە، هـەروەك لـە فـەرمودەی (صحیح)دا هاتووە: (سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل الا ظله: إمام عادل...)[3]. حەوت کەس لە سێبەرو سایەی خوادان لـە رۆژێکـدا کـە کەس سایەو سێبەوی نیە جگە لە ئـەو: یـەکێکێك لەوانـە پێـشەوای دادگەرە.

(١) قواعد الأحكام ١ / ١٢٠ – ١٢١.

(٢) الحسبة ل ٩ ، رامێنە لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر ئەم تێگەیشتنە داهاتووە لەواقعی هاوچەرخ دا؟!.

(٣) رواه البخاري، ژمارە (٦٦٠) و (١٤٢٣) و مسلم ژمارە (١٠٣١).

(ابـن کـثیر)یـش لەبەسـەرهاتی کێبـەڕکێی شـەش کەسـەکەدا وتویەتی: (مەبەست ئەوەیە ئەوان، بەدوور لە خەڵکی و لە ماڵێکـدا دەستیان کرد بە راوێژ سەبارەت بەو کـارەی پـێ راسـپێردرابون. قـسە زۆربوو، دەنگ بەرزکرایەوە، (أبو طلحة) فەرمویەتی: من گومانم وابوو هەریەکەیان لە خۆی دوور دەخاتەوەو وەری ناگرێ، گومانم وانەبوو کـە کێبـڕکێی تێدا بکەن).[1]

ماوەردی وتویەتی: (داخوازیکردنی ئیمامەت خراپ (مکروه) نیـە، ئەوەبوو ڕاوێژکاران (أهل الشوری) ناکۆکیان بـوو لەسـەری، داواکـار داواکردنەکـەی رەت نەکرایـەوە، ئەوەشـی داخـوازی دەکـرد ڕێی لـێنەگیرا)[2]

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مەودای ئەو هۆشیارییە سیاسیەی هاوەڵان هەیانبووە، وەچۆن لە سروشتی ئەم ئایینە گەیشتوونو پیـادەی کـاری سیاسیان کردووە وەك گوێڕایەڵییەك بـۆ خـواو وەدەیـانکردە هۆکـاری نزیکبونەوەو پەرستش، لەم قۆناغەدا ئەو بۆچونانە نـەهاتبووە ئـاراوە کەپێیان وایە ئـەم جـۆرە کێبەرکێیانـە کـەم و کـورتی ئاییندارییـەو تانەوتەشەر دانە لە دادگەرێتی؟!

کێبەرکێی ئەوان بۆ ئیمامەت لەبەر خێرو شـکۆمەندیەکەی بـووە،

---

(١) البداية والنهاية ( ٧ / ١٥١) وە (ابن سعود) یش (٣ /٢٨٥) بە سەنەدێکی (صحیح) لەسەر مەرجی موسلم گێڕاویەتیەوە.

(٢) الاحكام السلطانية ل ٨.

وه بەوپێیـەی ئیمامـەت دەروازەیـەك بـووە لـە دەروازەكـانی چـاكەو چاكسازی، ئەم كێبەركێیانەیان وا دانەناوە كە پێچەوانەی ئـەو نـەهی كردنانە بن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە سەبارەت بە داواكردنـی ئەمیرایـەتی هـەروەك لـەو فەرمودەیـەی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ فەرمویەتی: (ئەی ئەبو زەڕ، تۆ كەسێكی لاوازی، ئەم كاربەدەستییەش سپاردەیە، وە لە رۆژی قیامەتدا مایـەی ریـسوایی و پاشـگەزبونەوەیە مەگەر یەكێك مافەكەی دا بێ، وە ئەوئەركەی جێبەجێ كردبێ).[1]

وە ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ بە عەبدوڕەحمانی كوڕی سەمورە دەڵێ: (ئەی عەبدوڕەحمان، داوای فەرماندەیی و ئەمیرایەتی مەكە).[1]

چونكە ئەم فەرمودانەیان لەسەر رووی راستی خۆی خوێندبوەیـەوە، كـە ئـەو قەدەغەبیـە لـەڕووی شـەرعەوە بریتیـە لـە داواكردنـی فەرماندەیەتی لەبەر خودی فەرماندەیەتیەكـە و ئـەو بـەرزی و رێـزو شكۆمەندییەی تێیدایە، بەڵام ئەگەر كەسێ داخوازی كرد لەبەرئـەوەی دەروازەیەكە لە دەروازەكانی چاكەو چاكسازی و بـەرپاكردنی دادگـەری لە نێوان خەڵكیدا، تـەوا زانایـان رێكـن لەسـەر ئـەوەی ئەوكەسـە پاداشت دەدرێتەوە، نەوەوی فەرمویەتی: (ئـەم فەرمودەیـە ئەسـڵێكی گەورەو گرنگـە بـۆ خـودوورگرتن لـەكار بەدەسـتێتی، نـەخوازەلا بـۆ كەسانێك كە بێدەسەلاتن لە ئەنجام دانی ئەركەكانیدا، بەلام ریسوایی

(٢) صحیح مسلم ، ژمارە ١٨٢٥

(١) صحیح مسلم ، ژمارە ١٦٥٢.

پاشگەزبونەوەکەی ئەوا بۆ ئەو کەسانەیە شیاوی ئەو کارە نین، یـاخود شیاون بۆی بەڵام دادگەرنین تیایدا، ئەوانە خوا لـە دوارۆژدا ریـسوایان دەکا... بەڵام ئەگەر کەسێ شایستەی کاربەدەستێتی بوو دادگەریش بوو تیایـدا، ئـەوە چـاکەیەکی گەورەیـەو بـە ئاشـکراش لـە فـەرمودە سەحیحەکاندا بـاس دەکـرێ وەکـو فـەرمودەی (سـبعة یظلـهم الله في ظله...) کۆڕای موسڵمانانیشی لەسەر هەیە)[1].

یوسف (سەلامی خوای لەسەر) داوای کاربەدەسـتی لـە فیرعـەونی میـسر کـرد سـەرەڕای کافرێتییەکـەی، بـە مەبەسـتی چاکـسازی و بەرپاکردنی دادگەری لە نێوان خەڵکـدا بـە پێـی توانـاو بـۆ لـوان و فەرموی: ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ (یوسـف: ٥٥)، بمکە خەزنەداری زەوی چونکە مـن کەسـێکی پـارێزەرو لێـزان و زانام (لەو شتەدا)

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە سەبارەت بەڕونکردنەوەی ئـەم بابەتـە فەرمویـەتی:[2](دەسـەڵاتدار تاوانبـار دەبـێ بـەو دەسـت درێـژی و مافخواردنەی ئەنجامی دەدا لە سنوری توانای خۆیدا، بەڵام من لێـرەدا دەڵێم: ئەگەر کاربەدەستی دەسەڵاتداری گشتی یا هەندێ لە دەسـت و پێوەندەکانی تری وەکو فەرمانداریی و والیێتی و قەزاو هاوشێوەی ئەمانە، ئەگەر نەشی توانی (بەوپەڕی تەواوییەوە) ئەرکەکانی بەجێ بگەیەنێ و

(١) (شرح صحیح مسلم) نەوەوی ١٢ / ٢١٠ – ٢١١.

(٢) الفتاوی ٢٠ / ٥٤ – ٥٨.

واز لە حەرامەکانی بێنێ ئـەوا لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا دروسـتـە کاربەدەستێتی بکا، لەوانەیە واجبـیش بـێ، ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە چونکە کاربەدەستێتی ئەگەر لەو واجبانـە بـێ کـە بەرژەوەندیـەکانی پێبـەدی دێ، لـە جیهـادی دوژمنـان و دابەشـکردنی دەسـتکەوت و ئەنجامدانی سنورەکان و پاراسـتنی ئاسایـشی رێگـەکان: کـە ئەمانـە کردنیان واجبە. جا ئەگەر ئەمە پێویستی بکا کەسانێکی نەشیاویش کاربەدەستیەتی بکەن و هەندێ شتیتش ببەن کە بۆیـان دروسـت نیـە یابیبەخشنە هەندێکی تر کە نە گونجاوە، نەشتوانی واز لەوانە بهێنێ: ئەوا ئەمە دەچێتە بواری (ما لا يتم الواجب أو المستحب الا به، فيكون واجباً أو مستحبا) (ئەگەر واجبێك یان باشەیەك بە شتێك ئەنجام دەدرا ئەوا ئەو شت و هۆکارەش دەبێتە واجب یا سوننەت، ئەگەر خراپیەکەی کەمتـربوو لە بەرژەوەندی ئـەو واجبـە یـا سـوننەتە، بـەڵکو ئەگـەر کاربەدەستییەك واجب نەبێ و ئەو کاربەدەستییەش ستەم لەخۆ بگرێ، هەر کەسەش بیگرێتە ئەستۆ ستەم ئەنجام بدا ئەگەر کەسێك ئەو کارە بگرێتە ئەستۆ بە مەبەستی سوککردنی ستەم تێیداو بەرگریکردن لـە خراپە زۆرەکانی لە رێی ئەنجامـدانی خراپەکـەمو ئاسـانەکانی، ئـەوا ئەوکارە بەم نیازە شتێکی باشە، وە ئەنجامدانی ئەو خراپانەش بە نیازی رێگری لە خراپتر شتێکی چاك و باشـە. ئەمەش دەرگـاو دەروازەیەکـە بە پێی جیـاوازی نیـازو مەبەسـتەکان جیـاواز دەبێـت، هـەر کەسـێ

ستەمکاریّ داوای لێکردو پابەنـدی کـرد بـەوەی دەبـێ پـارەو پـول و سامانێکی پێدا، کەسێکیش ببوە نێوەند (واسطة) بـۆ ئـەوەی رێگـری بکا لەو ستەمە زۆرەی لە ستەم لێکراوەکە دەکرێ، لـە سـتەم لێکـراو وەربگرێ و بیداتە ستەمکار ئەویش لـە توانایـدا بـێ بـە هـۆی ئـەم پێدانەوە ستەم نەکا، ئەم رێگری کردنە ئەگەر کرا: ئـەوا ئـەو کەسـە چاکەکارە، بەڵام ئەگەر نێوەندێتی بکا وەك هاوکارییەك بـۆ سـتەمکار ئەوە خراپەکارە.

بەڵام لەم کارانەدا بەزۆری خراپی نیازو کردەوە بەدی دەکرێ، بۆ نمونە مەبەست تیایدا دەستکەوتنی دەسەڵاتودرایی بێت، لە کارو کردەوەشدا ئەنجامـدانی حـەرامکراوو نـەکردنی ئەرکـەکان بێـت نـەك لەبـەر یەکانگیربوون یاخود لەبەر بەکەڵکیو چاکێتی، پاشان کاربەدەسـتێتی هەرچەندە دروست (جائز) یا باش (مستحب) یا ئەرك (واجـب) بـێ، بەڵام دەکرێ بۆ کەسێکی دیاری کراوی تر واجبتـر بێ یا باشتربێ، هەر بۆیە هەندێ جار چاکترینیان پێش دەخرێ، جاری واش هەیـە لـە رووی باشـترییەوەیە، هـەر لـەم دەروازە یـەوە بـووە یوسـفی راسـتگۆ کاربەدەستێتی خەزنەداری سەرزەوی میسری گرتە ئەسـتۆ، نـەك هـەر ئەوە، بەڵکو هەر خـۆی داوای ئـەوەی کـرد بیکەنـە خەزنـەداری ئـەو زەمینە، لە کاتێکدا پادشاو خەڵکی میسر کافربوون، هـەروەك خـوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ جَاءَكُمْ يُوسُفُ مِنْ قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي

شَكٍّ مِمَّا جَاءَكُمْ بِهِ﴾ (غافر: ٣٤) وه سه‌باره‌ت به یوســف (لــه ســجندا) فه‌رمویه‌تی: ﴿يَا صَــاحِبَيِ السِّــجْنِ أَأَرْبَـــابٌ مُتَفَرِّقُـونَ خَيْـرٌ أَمِ اللَّـهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّـــارُ، مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلا أَسْـــمَاءً سَـــمَّيْتُمُوهَا أَنْـتُمْ وَآبَاؤُكُمْ﴾ (یوسف ٣٩-٤٠) ئاشكراشه ئه‌وان ســه‌ره‌ڕای بێباوه‌ڕێتیــشیان خاوه‌نی باوو نه‌ریت و ڕێ و شوێنێك بون لــه وه‌رگـرتن و ســه‌رفكردنی دارایی به‌سه‌ر ده‌ســت و پیێوه‌نـدو كه‌ســوكارو ســه‌ربازو ڕه‌عیه‌ته‌كـه‌ی پاشادا، ئه‌و دابه‌شكردنه‌ش به پیێی ڕێ‌وشوێن‌و دادگه‌ری پێغه‌مبــه‌ران نه‌بوه‌و یوسف بۆی نه‌ده‌كرا ئه‌وه‌ی له ئـایینی خوادایــه ئــه‌نجامی بـدا، چونكه ئه‌و خه‌ڵكه گوێبیستی نه‌ده‌بون، به‌ڵكو به پێی توانا دادگه‌ری‌و چــاكه‌كاری ئــه‌نجام ده‌دا، به‌ده‌سه‌ڵاته‌كه‌شــی تــوانی ڕێــزی كه‌ســوكاره باوه‌ڕداره‌كانی به‌ده‌ست بهێنێ، كه نه‌ده‌كرا به هیچ شتێكی تــر ئــه‌وه‌ی به‌ده‌ست بكه‌وێ، هه‌موو ئه‌مانه‌ش له چوار چێوه‌ی ئــه‌و فه‌رموده‌یــه‌ی خوادایه: (فأتقوا الله ما استطعتم) .

ئه‌گه‌ر دوو ئه‌رك تێكگیران نه‌ده‌كرا پێكــه‌وه كـۆ بكرێنــه‌وه‌و ئــه‌نجام بدرێن ئه‌وا گرنگترینه‌كه‌یان پێش ده‌خرێ و ئه‌وه‌ی تریان له‌مباره‌دا بــه واجب دانانرێ، وازهێنان له واجبه‌كــه‌ی تــر له‌بــه‌رخاتری ئه‌نجامــدانی گرنگترینه‌كه‌یان وادانانرێ كه واجبێكی راسته‌قینه‌ی واز لێهێنابێ بــه هــه‌مان شــێوه ئه‌گــه‌ر دوو حــه‌رام پێكــه‌وه كۆبونــه‌وه نــه‌ده‌كرا خــۆ ده‌ربازكه‌ین له گه‌وره‌كه‌یان مه‌گه‌ر به ئه‌نجامدانی خوارتره‌كه‌یان، ئــه‌وا

لەم بارەدا ئەنجامدانی خوارترەکەیان بە حـەرامی راسـتەقینە دانـانرێ هەرچەندە ئـەوەیان بـە وازلێهێنـانی واجبێـك و ئـەمیان بـە کردنـی حەرامێك ناو ببرێ بە پێی رەهایەتیان، لەوەدا واجب یا حەرامن، ئەمە زیانی نیە،لەم حاڵەدا دەوترێ: واز لێهێنانی ئەرکێ لەبـەر بیانویـەك، ئەنجامدانی حەرامێك لەبەر بەرژەوەندنیەکی زۆرتر یا لەبـەر ناچـاری، لەبەر نەکردنی حەرامێکی گەورەتر) .

٣- زەروورەتی گرێدانی بەیعەت، ئیمامەت بە بێ ئەم گرێ بەستە بەدی نایــەت:

ئائەمە بناغەی سێیەمە لە بناغەو بنچینەکانی گوتـاری سیاسـی شەرعی دابەزێنراو لە قۆناغی یەکەمیدا کە نماینـدەی ڕێنماییـەکانی ئایینی ڕاست و رەوایە، پەیوەندی نێـوان ئوممـەت وە ئیمـام ڕاوەسـتاوە لەسەر گرێبەسـتی نێـوان هـەردولا، کـە ئوممـەت تیایـدا رەسـەنترە، ئیمامیش نوێنەری ئەوە بـۆ ڕاپەڕانـدنو بـەرێوەبردنی کاروبارەکـانی، فەرمانڕەوایی و دەسەلات بەڕاسـپاردنی خـوایی (التفـويض الالهـي)و مافی میراتگری نین، بەڵکو بەگرێبەستی بەیعەتە لە نێـوان ئوممـەت و ئیمامدا، لەمەشدا ئیسلام پێش ڕۆژئاواکەوتووە لە دیـاریکردنی ئـەو بناغە فەلسەفیەی بە هۆیەوە دەسەلات پیادەی سـەلاحیەتەکانی دەکـا بە پێی بیردۆزەی گرێ بەستی کۆمـەلایـەتی، بـە شـێوەیەك تاکـەکانی کۆمـەڵگە لە ڕێی ئەو پەیمانەوە واز دێنن لە هەندێ لە ئازادییەکانیان بۆ دەسەلات لە پێناوی ڕێکخستنی کاروبارەکانیان و بـەڕێوەبردنی بـە شێوەیەك کە بەرژەوەندی کۆمەڵگە بـەدی بێنێـت، بـە پێـی بینـشی فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن لـۆك (١٧٠٤ ز.ك) (*) لـە کتێبەکانیـداو فەیلەسوفی فەڕەنسی جان جاك ڕۆسۆ (١٧٧٨ ز) لـە کتێبـــی (گـرێ

---

(*) ك - کۆچی دوایی کردووە.

بەستی کۆمەڵایەتی)دا، سەرەڕای بێتوانایی خاوەنی ئەم بیردۆزانە لەوەی ئەم بناغە فەلسەفیە بسەلمێنن وە لە چ کاتێکدا ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتیە بەدی هاتووە.

ئیسلام دەست پێشخەربووە لە سەقامگیرکردنی بنەمای گرێ بەست نەك لەسەر بناغەیەکی فەلسەفی بیردۆزەیی، بەڵکو لەسەر بناغەیەکی واقعی کرداری، ئەوەتا یەکەم گرێبەستێك لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بریتیە لەگرێ بەستی پەیمانی عەقەبە کەلە سەر بناغەی ئەو پەیمانە دەوڵەتی ئیسلامی بەرپابوو، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لە پاش ئەو پەیمانە کۆچی کرد بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی پیادەی سەلاحیاتەکانی بکا بەپێی ئەوپەیمان و رێککەوتنەی کە بەرەزامەندی خەڵکی مەدینە بەدی هات و بەو پێیەش پێغەمبەر ﷺ ئەبێتە ئیمام و مافی بیستن و گوێڕایەڵی دەبێ لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە راستی دا (گرێ بەستی کۆمەڵایەتی) دەوڵەتی ئیسلامی راستی یەکی مێژوییە و بەرەزامەندی هەردوولا بەدی هات، خەڵکی مەدینە لەیەکەم کۆبونەوەیان لەگەڵ ئەودا لە مەککە بە پێغەمبەر ﷺ یان ووت: (ئێمە گەل و نەتەوەکەمان بەجێ هێڵاوە، هیچ گەل و نەتەوەیەك نیە ئەوەندەی ئەوان دوژمنایەتی و خراپە لە نێوانیاندابێ، ئەمە خوایە بە هۆی تۆوە کۆك و رێك بن، دەچینە لایان و بانگەشەیان دەکەین بۆ ئەم کارەی تۆ، ئەوەی خۆمان لەم ئاییینەدا لێتمان وەرگرتووە دەیخەینە ڕوو بۆیان، ئەگەر خوا

کۆك و کۆی کردنەوە بۆت ئەوا هیچ کەسێ لە تۆ سەربەرزتر نابێ) [1]
ئەوان ڕەزامەندی و بەدەمەوە هاتنی گەل و هۆزەکەیان بەمەرج دانا بۆ ئەو مەبەستە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵکی مەدینەدا دوو پەیمان و بەیعەتی جیا لە یەکی گرێدا، بەیعەتی یەکەمی لەسەر باوەڕبون بوو بە خواو هاوبەشی پەیدانەکردن بۆی و گوێڕایەڵی کردنی بوو، بەڵام پەیمان و بەیعەتی دووەم بۆ بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی و بەرگری لێکردنی بوو، کە بریتیە لە پەیمان و بەیعەتی جەنگ.

لەسەر ئەم بناغەیە کەلە گرێ بەستی بەیعەتدا خۆی دەنوێنێ دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە بەرپاکرا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە کودەتایەکی سەربازی یا شۆڕشێکی جەماوەری نەچووە مەدینەوە، بەڵکو بە پێی گرێ بەست و ڕەزامەندی بوو، قورئانیش ئەمە تەئکید دەکاتەوە هەروەك لە فەرمودەی خوادا هاتووە: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ (النساء: ٦٥) نەخێر، سوێند بە

(١) تهذيب سيرة ابن هشام ل ٥٣، شێخی ئەلبانی ئیسنادەکەی بەباش (حسن) داناوە لە پەراوێزی (فقه السيرة ل ١٤٦)دا لەراستی ئیسنادەکەی (صحيح)ە، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق گێڕاویەتیەوە، کە پێشەوایەتی ئەوخاوەن قورساییە لە (السيرة والمغازي)دا، ئەویش لە مامۆستاکەی (عاصم بن عمر الانصاري) یەوە گێڕاویەتیەوە کەجێی متمانەیە و زانایە بەژیاننامەی پێغەمبەر و هاوەڵان، ئەویش لە کۆمەڵێك لەو ئەنسارییانەوە گێڕاویەتیەوە کە ئامادەی پەیماننامەکە بوون - کەواتە ئیسنادەکەی (صحيح)ە.

پەروەردەگارت ئەوانەی (لافی بـڕوا لێـدەدەن) بـڕوا نـاهێنن هـەتا لـە هــەموو کێــشەیەکدا کــە ڕودەدا لـــە نێوانیانـــدا تۆنەکەنــە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، قورئان ئـەوەی سـەلماندوە کـە موسـڵمانان لـە مەدینەدا پێغەمبەریان کردوەتە دادوەر بەوەی کارو بـارو کێـشەکانیان دەگێڕنەوە بۆ لای ئەوو باوەڕیان پێی هێناوە، ئەمــەش نـاوەڕۆکی گـرێ بەستی شاهێدی دانی پێغمەبەرایەتیە بەئەو، لەگەڵ ئەوەشدا دەتــوانن دادوەری ببەنە لای کەسـانی تـرو پـشت هەڵکـەن، هـەروەك خـەڵکی مەککە کردیان بەڵام ئەم پشت تێکردنە لە بازنەی باوەڕدەریان دەکا بۆ بازنەی هاوبەش پەیداکردن، پێغەمبــەری خـواش ﷺ چـەندین جـار پەیمان و بەیعەتی لە هــاوەڵان وەرگرتــوە – هــەروەك لــە حودەیبییــەدا روویدا – بۆ ئەوەی ئەم بنەمایە تەئکیـد بکاتــەوە، ئـەویش بنــەمای بیستن و گوێڕایەڵیە بنیات لەسەر گرێ بەستی بەیعەت.

دواتریش پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی وەرگرت لە نوێنــەری هــۆزو شارەکان ئەوانەی ئارەزوومەندانە دەهاتنــە نێــو ئیــسلامەوەو پابەنــدی گوێڕایەڵی کردنی دەوڵەتی ئیسلامی دەبون، بۆ ئەوەی تەئکید بکاتەوە لەسەر ئەوەی پەیوەندییەکە بەرپا بووە لەســەر بناغــەی ڕێککــەوتنی هــەردولا، هــەروەك لەگـەڵ نوێنــەری (کنانــە)و نوێنــەری (عــامر بــن صعصعە)و نوێنەری (عقیل بــن کعــب)و نوێنــەر (مزینــە)و... هتــدا ئەنجام درا[1].

(١) سەیری طبقات ابن سعد ( ١ / ٢٢ ) بکە.

خواى گــەورەش بــەڵێنى جێنــشينى ســەرزەمينى بــەباوەڕداران داوە هەروەك فەرمويەتى: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ (النور: ٥٥) واتە: خــوا بــەڵێنى دڵنيابــەخش‌و تەواوى داوە بەوانەى باوەڕيان هێناوە لە ئێــوەو كــاروكردەوە چــاكەنيان ئەنجام داوە بەڕاستى لەئايندەيەكى نزيكدا جێنشين‌و پايەداريان دەكات لەوڵات دا، بۆ ئەوەى تەئكيد لەسەر ئەوە بكاتەوە كــە جێنــشينى بــۆ كۆو كۆمەڵ و ئوممەتە بەگشتى نەك تەنها بۆ پێغەمبەر ﷺ .

لەبەر رونى ئەم بنەمايەو ئەوەى كە ئيمامەت دانامــەزرێ مەگــەر پــاش گــرێ دانــى بەيعــەت نــەبێ، هــاوەڵان خوايــان لێ رازى بێــت دەسپێشخەرييان كرد بۆ بەستنى ئەم پەيمانە لە كاتى بەجێ‌نشين بونى خەليفەى يەكەم دا، ئەبوبەكر نەبووە خەليفە پاش ئەوە نەبێ كە گــرێ بەستى بەيعەتيان پێيدا هيچ دەسەڵات يا هێزێكى نەبوو كــە بتوانــێ پيادەى كاروبارەكانى پێ بكــا وەك خەليفەيــەكى موســڵمانان، ئەگــەر ناوەڕۆكى ئەو گرێ بەستە نەبوايە، كە بەرەزامەندى ســەرجەم هــاوەڵان بەدى هات، ئەوانەى كەخاوەنى پايەى (الحل والعقد) بون هەنــدێكيان لە كەپرى (بەنى ساعيدە) پەيمانيان پێيدا و جەماوەرى هاوەڵانيش لــە مزگەوتدا بەيعەتى گشتييان پێيدا[1].

ئەگەر ئەم گرێ بەستە ئەوەندە گرنگ و ناچــارى نەبوايــە هــاوەڵان

(١) سەيرى (صحيح البخارى) لەگەڵ (الفتح) بكە چ (السلفية) ١٣ / ٢٠٦ ف ٧٢١٩

خۆیانیان پێوە سەرقاڵ نــەدەکرد و خــەریك دەبــون بــە ســپاردەکردنی پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە پێویستیشی نەدەکرد تەواوی ئەوانــەی لــە سەقیفەو مزگەوتدابون ئەو پەیمانە بدەن ئەگەر زەرورەت و ناچاری لــە ئارادا نەبوایە، بە هەمان شێوە عومەر تەنها بــە پــاڵاوتنی ئەبوبــەکر کاتێ کە لە سەرەمەرگدابوو وەپاش ئەوەی راوێــژی بــە هــاوەڵان کــردو ئەوانیش پێی رازی بون[1] یەکسەر نەبوو بە خەلیفە، بەڵکو کاتێ بوو بە خەلیفە کە موسڵمانان بەیعەتیان پێیــدا لــە پــاش کۆچــی دوایــی ئەبوبەکر بە رەزامەندی هاوەڵان –خوایان لــێ رازی بێت- هــەر بۆیــە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە فەرمویەتی (ئەگەر وارێ بکەوتایە تــەنها عومەرو کۆمەڵێك لە هاوەڵان بەیعەتیان بە ئەبوبەکر بدایەو هاوەڵانی تر رێگربونایە لە بەیعەتدان ئــەوا بــەو بەیعەتــە (ئــەوەی یەکــەم –و-) نەدەبویە ئیمام، ئەبوبەکر کاتێ بوبــە ئیمــام کــە جــەماوەری هــاوەڵان بەیعەتیان پێیدا ئەو هاوەڵانەی خاوەنی تواناو هێزبون)[2] جارێکی تــر دەڵــێ: (هەروەها عومەر کاتێ ئەبوبەکر ئەوکارەی پێسپارد ئەو وەختە بۆیە ئیمام کە بەیعەتیان پێیداو گوێڕایەڵیان بۆی دەربــڕی، ئەگــەر وا رێبکەوتایە ئەوان پێسپاردنەکەی ئەبوبــەکریان جێبــەجێ نەکردایــەو بەیعەتیان پێی نەدایە نەدەبویە ئیمام).[3]

---

(١) طبقــات ابــن ســعد ١٤٨/٣،وە(ابــن جریــر الطــبري ٣٥٢/٢، وە حــاکم٧٩/٣) وتویەتی:(سەحییحە بە پێی مەرجی موسلم)

(٢) منهاج المسلم ١ / ١٤١.

(٣) منهاج السنة ١ / ١٤٢.

ئەمەش تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێسپاردن (عهد) تەنها پالاوتن (ترشیح)ە، ئوممەت بۆی هەیە پەسەندی کاو دانی پێدانێ یا بەرهەڵستی بێ‌و پەسەندی نەکا، جەماوەریش – کە زۆرینەن- ئەوانن تای تەرازووی هەڵبژاردنەکە قورس دەکەن لەکاتی بونی جیاوازی لە ئوممەتداو رێك نەبونی لەسەر بۆچونێك لە بابەتی هەڵبژاردنی ئیمامدا، بە هەمان شێوە عوسمان نەبوو بە ئیمام و فەرمانڕەوا تەنها بەوەی عومەر پالاوتی لە نێو شەش کەسەکەدا، وە بەڕەزامەندی پێنجەکەی تریش نەبوو بەوە، بەڵکو پاش ئەوە بوو بەخەلیفەی موسڵمانان کە هاوەڵان لە مزگەوتدا گرێ بەستی بەیعەتی گشتیان لە گەڵیدا ئەنجامدا، هەروەك شێخی ئیسلام ئیبن‌و تەیمیە فەرمویەتی: (عوسمان نەبوو بە خەلیفە بەوەی هەندێکیان هەڵیان بژارد بەڵکو بە بەیعەتی خەڵکی بوو، هەموو موسڵمانان بەیعەتیان بە عوسماندا کەس لە بەیعەت پێدانەکەی دوا نەکەوت)[1] بەهەمان شێوە خەلیفەی راشدی چوارەم عەلی (خوای لێ رازی بێت) نەبوو بە خەلیفە مەگەر پاش گرێ بەستی بەیعەت نەبێ.

هەروەها ئەوانەشی لە لایەن ئیمامەوە خەلیفەیەتیان پێسپێرراوە تەنها بەو پێسپاردنە لە لایەن ئیمامەوە نابن بە ئیمام (خەلیفە) پاش وەفاتی کەسی یەکەم. (کە خەلیفەی پێشووە)، بەڵکو نابێ بە ئیمام

(١) سەرچاوەی پێشوو ١ / ١٤٢.

مەگەر دوای ئەوەی لە لایەن ئوممەتــەوە پــەیمانی بەیعــەتی پێبــدرێ، هــەروەك (أبــو يعلــى الحنبلــي) وتويــەتی: (ئیمامــەت گــرێ نــادرێ (دانامەزرێ) بۆ ئەو کەسەی پێی سپێردراوە بە خودی ئەو پێسپاردنە، بەڵکو بە گرێبەستی موسڵمانان دا دەمەزرێ)[1] هەروەها فەرمویەتی: (پێسپاردنی ئەو بۆ کەسانی تر گرێبەستی ئیمامەت نیــە)[2] بــەڵکو پاڵاوتنەو راوەستاوە لەسەر ئەو پەیمانەی ئوممەت پاشتر پێی دەدەن.

لەبەر ترسناکی و گرنگی ئەم بەیعەتە بــەردەوام تــەواوی خەلیفــەو پاشاکان پاشتر سوور دەبون لەسەر شەرعیەت پێدانی دەســەڵاتەکەیان بەوەی بەیعەت وەرگرن لە ئوممەت ئەگەر بەنابەدڵی و ناخۆشیش بووە؟! گرێبەستی (بەیعەت) وەکــو گــرێ بەســتەکانی ترەایــە، بــە کــورتی پوختەی هەمان ئەو مەرجانەی تێدایە کەلەو گرێ بەستانەدا مەرجن، ئەم گرێبەستە زیاتر بە گرێبەستی نوێنەرایــەتی (الوكالــة) دەچــێت، بەوپێیــەی ئوممــەت خــۆی رەســەن و ئەســڵە تێیــدا، ئــەو کەسەشــی هەڵدەبژێررێ بۆ ئەوەی ئیمام بــێ پــێی دەبێتــە نوێنــەری ئــەو (واتــە ئوممەت) بۆ راپەراندنی ئەو شتانەی خوا پێویستی کردووە موســڵمانان پێی هەستن، وەکو بەرپاکردنی دادگــەری و مــافو ســنورەکان و ئــەو بەرژەوەندیانەی ئیمام پێی هەڵدەسێ لە بری ئوممەت بە پێی ئەو گــرێ

(١) الأحكام السلطانية ل ٢٥.

(٢) سەرچاوە پێشوو.

بەستی بەیعەتەی پێی دراوە، ئەمــەش تەئکیــد لەســەر ئەوەدەکاتــەوە کەماف لێرەدا بۆ ئوممەتە لەگەڵ کێدا بیــەوێ گــرێی بــدا یــا هــەڵی وەشێنێتەوە دەیکا، کەس ناتوانێ بەرهەڵستی و ناســازی لەســەر بکــا لەم ڕووەوە، هەروەك ماوەردی فەرمویەتی: (ئەگەر بوو بە ناکۆکیان — لەسەر ئیمامەت-) هەریەکەیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد لــە پێــشترە، گوێ لە بانگەشەکەیان نــاگیرێو سوێندیــشیان نــادرێ، چــونکە ئــەو خاوەن مــاف نیــە تێیــدا، بــەڵکو ئــەوە مــافی تــەواوی موســڵمانانە، سوێندەکەی هیچ حوکمێکی نیە، کشانەوەکەشی ڕۆڵ نابینــێ، ئەگــەر یەکێکیان دانی نابە لە پێشتری ئەوەی تــر ئــەوا دانپێدانەرەکــە لێــی دەردەچێ، بەڵام ناچەسپێ بۆ ئەویتر، چونکە دانپێدانانەکەی لــە مــافی موسڵماناندایە)[1]

لێرەدا ماوەردی ڕوونی دەکاتەوە کە حوکمی گرێدانی بەیعــەت چــی دەبێ ئەگەر بەدووکەس درابوو بێئەوەی بزانرێ کامیان لــە پێــشترە، وە گوێ لە بانگەشەی کەسیان ناگیرێ بەوەی بۆی نیە لە شتێکدا سوێند بخوا کە مافی ئەو نیە، چونکە گرێ بەستی ئیمامــەت مــافی ســەرجەم موسڵمانانە، بەهەمان شێوە ئەگەر یەکێکیان دانــی نــا بەلەپێــشتری ئەوی تر، دان پێدانانەکەی پەسەند ناکرێ، بەڵکو بەو دانپێدانانەی لە ئیمامەت دەردەچێ بەو پێیەی لە پێشتر نیە، ئیمامەتەکەشی بۆ ئەوی

(١) الاحکام السلطانیة ل ١٠

تر ناچەسپێنرێ چونکە دان پێدانانی یەکێکیان بۆ ئەوی تریـان هـیچ کاریگەرییەکی نیە، لەبەرئەوەی خاوەن ماف لێرەدا ئوممەتە.

بەهەمان شێوە ئەگەر سیفەت و مەرجەکانی ئیمامـەت تـەنها لـە کەسێکدا بەدی هات، ئەوا تەنها لەبەر ئەوە نابێ بە ئیمـام، هـەروەك ماوەردی فەرمویەتی: (چونکە ئیمامەت گرێ بەستێکە بـە (عاقـد) بەدی دێت هەروەك چۆن ئەگەر قەزا ئەگەر تەنها کەسێك بۆی دەشـیا نابێت بە قازی تاوەکو دایدەمەزرێنن تیایدا)[1] (أبو يعلى الحنبلـي)ش هەروای فەرموە ئەوەتا دەڵێ: (بەهەمان شێوە گرێ بەستی ئیمامـەت بەدی نایەت بە خاوەنی گرێ بەستە (عاقـد) نـەبێ بەهـەمان شـێوە قەزا، کە نابـێ بـە قـازی تـاوەکو پێـی نەسـپێررێ، نابـێ بـە قـازی باسیفەتەکانیشی تیابێ، ئیمامەتیش بەهەمان شێوەیە)[2].

(قەلقشەندی) فەرمویەتی: (ئیمامەت دانامەزرێ مەگەر بە گـرێ بەستی حەلل و عەقد نەبێ، چونکە ئیمامەت گرێ بەستەو بە خاوەنی گرێ بەستەکە نەبێ بەدی نایەت، ڕای جـەماوەری زانایـانیش لەسـەر ئەمەیەو ڕافعیو نەوەوی تەنها ئەمەیان ووتووە هەردوکیان شایـستەی پشت پێبەستنن)[3].

هەموو ئەمانە تەئکید لەسەر ئـەوە دەکەنـەوە کـە گـرێ بەسـتی

---

(١) الاحكام السلطانية ل ٩ رامێنە لە ووتەی (ماڤ سەرجەم موسڵمانانە) بڕوانە چۆن ئەو مافە لە واقیعدا و بەناوی ئایینەوە دەستی بەسەردا گیراوە.؟!

(٢) الاحكام السلطانية ل ٢٤

(٣) مآثر الإناقة في معالم الخلافة ١ / ٤٧ – ٤٨.

ئیمامەت وەکو گرێ بەستەکانی تـرە، زیـاتر بەگرێبەسـتی وەکالـەت دەچێ، ئیمام تیایـدا نوێنـەری ئوممەتـە،[1] ئوممەتـە هـەڵی دەبـژێرێ و هەرئـەویش مـافی لەکارخـستنی هەیـە، ئـەم بنەمایـەش زۆر ڕوونو ئاشکرا بـووە لـە قۆنـاغی یەکـەمی قۆناغـەکانی گوتـاری سیاسـی ئیسلامی کە نمایندەی ڕێنومابیەکانی ئـاینی دابـەزێنراوە، تەنانـەت موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کە لە نێوان ساڵانی (٤١ ك بـۆ ٦٠ ك) فەرمانرەوایی کرد نەبوو بەخەلیفەو ئیمامی ئوممـەت تـەنها لەسـاڵی کۆمـەڵ (عام الجماعة)دا نەبێ، پاش ئەوەی ئوممەت کۆك بون لەسەری و هەمو بەیعەتیان پێیدا پاش ئەوەی حەسـەنی کـوڕی عەلـی -خـوای لـێ ڕازی بێت- بەیعەتی پێیدا، جارێك ئەبوموسلمی خـەولانی چـووە لای موعاویەو پێی ووت: (السلام علیکم ایها الاجیـر! سەلامت لـێ بێت ئەی کرێکار! پێی ووترا بڵێ ئەی ئەمیـر.

ئەویش فەرمووی بەڵکو تۆ کرێکاری...)[1]

ئەمەش تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گرێ بەستی ئیمامەت لە دیدی هاوەڵاندا -خوایان لـێ ڕازی بێت- گرێ بەستێکە زیاتر بە گرێ بەستی وەکالەت دەچێ، ئیمامیش وەك وەکیل یا کرێکارە، هـەر بۆیـە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خـوای لـێ ڕازی بێـت) کاتـێ موعـاویـە ویســـتی لە پاش خۆی خەلیفایەتی بسـپێرێ بە یەزیدو داوای کـرد

---

(١) نوێنەرایـەتی بـونی لـە بـری ئوممــەت نـاکۆك نیـە بـەوەی خـودی خەلافـەت نوێنەرایەتیکردنی پێغەمبەرە ﷺ لە پیادەکردنی شەریعەتدا.

(١) سەیری تهذیب تاریخ دیمضق (٧/ ٣٢٣) و سیر الأعلام (١٣/٤) بکە

له عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لەسەر ئەوە بەیعەت بدا ئەویش پێی ووت: (من پیاوێکم له موسڵمانان، دەچمه شتێکەوە موسڵمانان هاتبێتنه ناویەوە) وە فەرموی: (بەخوا، ئەگەر ئوممەت پاش تۆ کۆك بن لەسەر بەندەیەکی حەبەشی، ئەچمە نێو شتێکەوە کە ئوممەت بچێنە نێویەوە)[1] کارەکە دەداتە دەست ئوممەت و هەرشتێ ئەوان هەڵی بژێرنو پێی ڕازی بن ئەم لەگەڵیاندایە، کە ئەمەش تەئکیدە لەسەر ئەوەی مافی هەڵبژاردنی ئیمام تەنها مافی ئوممەتە.

هەروەها سووربوونی موعاویەش (خوای لێ ڕازی بێت) لەسەر وەرگرتنی بەیعەت بۆیەزید بەڵگەیە لەسەر زەرورەت و گرنگی گرێ بەستی بەیعەت، وە شەریعەتی هەر ئیمامێك بەبێ ئەوە بەدی نایەت و بە تەواو دانانرێ، وە ئەوەشی کە خەلیفەی موسڵمانانە دەسەڵاتی ئەوەی پێ نەدا مافی سەپاندنی کوڕەکەی هەبێ بەسەر ئوممەتدا، وە ڕاسپاردنی ئەویش بۆ کوڕەکەی بە بێ گرێ بەستی بەیعەت هیچ نرخێکی نیە، هەر بۆیە سووربوو لەسەر ئەو گرێ بەستە بۆ کوڕەکەی لەبەر گرنگیەکەی.

زانایان دەڵێن لەسەر ئەوە هەیە کە ئیمام بریکاری ئوممەتە، ئەوەتا لە کتێبی (كشف القناع عن متن الاقناع)ی فیقهی حەنبەلیەکاندا هاتووە کە (هەڵسوکەوتی -ئیمام- بەسەر خەڵکیەوە لە ڕێگەی ئەوەوەیە کە بریکاریانە، ئەو بریکاری موسڵمانانە ، بۆی هەیە خۆی لەکارخات ئەوانیش - واتە ئەهلی حەلل و عەقد- بۆیان هەیە لە کاری خەن ئەگەر داوای کرد لەکاری بخەن، لەبەرئەو فەرمودەی ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی لامبەرن لامبەرن

(١) إبن جرير الطبري ( ٣ / ٢٤٨).

وتیان: لات نابەین[1].

هەروەها هۆی ئەوەشیان روونکردووەتەوە کە ئیمام بە مردنی ئەهلی (حل وعقد) کە بەیعەتیان پێی داوە لە کارناخرێ و لانـابرێ بـۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو بریکاری ئوممەتە نەك کەسانی خاوەن (حل وعقـد) لە (کشف القناع)دا هاتووە: (لە کـار لانـابرێ بـە مردنـی ئەوانـەی بەیعەتیان پێی داوە چونکە ئەو بریکاری ئەوان نیـە بـەڵکو بریکـاری موسڵمانانە)[2].

هۆکاری دروستی داخوازیکردنی ئیمام بۆ ئەوەی ئوممەت لـە کـاری بخا بێ ئەوەی هۆکارێك هەبێ شایستەی ئەو لەکارخستنە بێ بـۆ ئـەوە دەگرنەوە کە ئەو بریکاری ئوممەتە، بریکاریش بۆی هەیە داوای لە کـار لابردنی خۆی بکا لە بریکارەکەی (ئەوەی کارەکەی پێسپاردووە —و-)، هەروەك ئەبویەعلای حەنبەلی، فەرمویەتی: (چـونکە ئـەو بریکـاری موسڵمانانەو بریکاریش دەتوانێ خۆی لەکار لابا).[3]

هەروەها هۆکاری لەکارنەخـستنی ئـەمیرو قـازی لـەکاتی مردنـی خەلیفەدا دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کـار پێسـپاردنی خەلیفـە بـۆ ئەمانـە نوێنەرایەتی کردنی موسڵمانانە لە ژیاندان، بە پێچەوانەی وەزیرەوە کە لە کاردەخرێ بە مردنی خەلیفە چونکە جێگرو نوێنەری ئەوە.[4]

(١) کشف القنـاع (٦/١٦٠) هـەروەها سـەیری (مطالـب اولـي النهـي فـي فقـة الحنابلـة (٦/٢٦٥) بکە.

(٢) دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

(٣) المعتمد في أصول الدين ل (٢٤٠).

(٤) الاحكام السلطانية ی ماوەردی ل ٣٧

٤- گرێبەســتنی بەیعــەت بــەبێ ڕەزامەنــدیی و ئارەزوومەنــدی ئوممــەت بەدی نایەت.

ئائەمە بریتیە لە بنەمای چوارەم لە بنــەماکانی گوتــاری سیاســی شەرعی دابەزێنراو، جا ئەگەر ئیمامەت جێبەجێ نەبێت مەگەر دوای گرێبەستی بەیعەت لە نێوان ئوممەت و ئیمامدا، لە کاتێکدا بەیعەتیش گرێبەســتێك بــێ وەك گرێبەســتەکانی تــر، ئــەوا دەبــێ رەزامەنــدی و ئارەزومەندی لە هەر دولای گرێ بەستەکەوە بەدی بێت، چــونکە هــیچ گرێ بەستێك لە گرێبەستەکان دروست دەرناچێ ئەگەر بە ڕەزامەندی و بە دوور نەبێ لە هەر زۆرو ناچارکردنێ، لە کاتێکــدا رەزامەنــدی لــە گرێ بەستی کڕین و فرۆشتن و سەوداگەریدا پایەیەك بێ لــە پایــەکانی گرێبەست یا مەرجێك بێت لە مەرجــەکانی دروســت بــونی هــەروەك خوای گەورە فەرمویــەتی: ﴿إِلاَّ أَن تَكُـونَ تِجَـارَةً عَـن تَـرَاضٍ مِّـنكُمْ﴾ (النساء/٢٩) ئەوا دەبێ لە گرێ بەستی ئیمامەتدا چۆن بێ؟!

لە نێوان هاوەڵاندا جیاوازی نیە لەوەدا کــە بــۆ دروســتی بەیعــەت پێویستە رەزامەندی و ئارەزوومەندی بەدی بێت بێ ئــەوەی زۆرلێکــردن یا ناچارکردنی تێدابێت، هەر بۆیە ئەبوبــەکر بــە هــاوەڵانی فــەرموو: (ئایا ڕازی دەبن بەو کەسەی دەیکەمە جێنشین بەسەرتانەوە؟ بەخوا من ئەوپەڕی بیری خۆمم بــۆ گوشــیوەو خــزم و کــەس و کاریــشم نــەکردووە بەسەرپەرشت، وە من عومەری کوڕی خەتتابم کردووە بەجێنشـــــــین،

گوێبیست و گوێڕایەڵی بن).

وتیان: (بیستمانو گوێڕایەڵی بوین) [1] ، لە گێڕانەوەیـەکی تـردا (ئایا بەیعەت دەدەن بەو کەسەی لەم نوسراوەدایە؟ فەرموویان بەڵــێ. هەندێکیان فەرمویان: زانیومانە، هەموو دانیـان پێیـداناو ڕازی بـون پێی‌و بەیعەتیان پێیدا) [2].

ماوەردی ئـەو جیاوازییـەی نێـوان زانایـان بـاس دەکـا کـە: ئایـا ڕەزامـەندی ئەهلی حەلل وعەقـد بـە مـەرج گـیراوە بـۆ کاتـێ ئیمـام کەسێك تر بۆ دوای خۆی دەکاتە جێنشین؟

(هەندێ لە زانایانی بەسـرە وای بۆچـوون کـە ڕەزامـەنـدی ئـەهلی ئیختیار (مـەبەستی حەلل وعەقدە —و-) لە بەیعەتەکەیدا مەرجە بـۆ ئەوەی ئوممەت پێوەی پابەند بێ، چونکە مافێکە پەیوەسـتە بەوانـەوە، پابەند نابن پێیەوە ئەگەر ڕەزامەندی ئەهلی ئیختیاری ئەوانی لەسـەر نەبێ)[3] ئا ئەمە بۆچونێکی دروســـتە بەدەر لە هەر بۆچونێکی تر، هاوەڵانیش (خوایان لـێ ڕازی بێت) لەسەر ئەم بۆچونە بوون.

هاوەڵانیش (خوایان لـێ ڕازی بێت) بەیعەتیاندا بـە هەریەکـە لـە ئەبوبەکرو عوسمانو عەلـیدا بێ هیچ زۆرلێکردن یـا ناچـارکردنێك،

---

(١) ئیبن جەوزیری تەبەری (٢ / ٣٥٢) بە سەنەدێك کە کەسـەکان جێی متمانەن، سەیری حاکم (٣ / ٩) بکە کە دەڵێ (فەرمودەکە سەحیحە بە پێی مەرجی موسلم).

(٢) ئیبن سەعد لە (الطبقات) ) ٣ / ١٤٩ لە چەند ڕێگەیەکەوە.

(٣) الاحکام السلطانیة ی ماوەردی ل ١١.

ناکرێ بڵێین گرێبەستی کڕین و فرۆشتن لە چارەکە دینارێکدا پڕوپوچ و دانەمەزراوە ئەگەر یەکێك لە لایەکان ناڕازی بوو، لـە هـەمان کاتـدا گرێبەستی ئیمامەت بە دروست ببیـنین لـە زۆرکردنـدا، ئەمـە دژو پێچەوانەیە بە دیدو تیۆڕوانینی گرێ بەستەکان (النظرية العقـود) لـە شەریعەتی ئیـسلامیدا کـە بـە مـەرجی گرتـووە بـۆ دروسـتی هـەر گرێبەستێك ڕەزامەندی هەردولا بەدی بێت، چونکە گرێبەستن (عقد) بە زۆرەملـێ نابێت.

لە کاتێکدا خوای گەورە گوێڕایـەڵیکردنی خـۆی بـە ئـەرك دانـاوە لەسەر بەندەکانی بەڵام ڕازی نیـە زۆریـان لێبکـا ناچـاریان بکـا بـۆ گوێڕایەڵیکردنی تـا ئـەوەی خـوای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿لاإكـراه في الدين﴾ (البقـرة ٢٥٦). ئەی چـۆن تەصـەوری ئـەوە دەکـرێ گرێبەسـتی ئیمامەت دروست بێ — کە دەخوازێ گوێڕایەڵی ئیمـامی پێبکـرێ — بێئەوەی ئوممەت ڕازی بێت، وە ناچار بکرێ بەوگرێ بەسـتیە و پاشـان پابەند بکرێ بە ناوەڕۆکەکەیەوە بە ناچارکردن؟!

هەر بۆیە ماوەردی بەدەق دەڵـێ: (ئەگـەر ئـەهلی حـەللو عەقـد-کەسێکیان بۆ دەست نیشانکردن پاش ئەوەی بە کۆششی و ئیجتهـادی خۆیـان گەیـشتنە ئـەوەی هەڵیبـبـژێرن، ئـەوا دەیخەنـە ڕوو، ئەگـەر بەدەمیانەوە هـاتن بەیعـەتی پێـدەدەن، بـە بەیعـەت پێـدانی ئـەوان ئیمامەتەکە دادەمـەزرێ، ئەگەر بەرهەڵستی بە ئیمام بونی کراو بەدەم (بەیعەت دانەکەوە) نەهاتن ناچار ناکرێن بۆ بەیعەت پێدانی، چـونکە گرێبەسـتێکە بـە ڕەزامەنـدی و ئارەزوومەنـدی دەبـێو زۆرلێکـردن و

ناچارکردنی تێدانیه).[1]

لەبەر ڕونی ئەم بنەمایە بووە مالك بەربەزەیی خواکەوێ -فتوایەکەی خۆیدا کە بەیعەتی زۆرلێکراو دانامەزرێ، ئەمەش لە کاتێکدا بووە (محمد بن عبدالله بن الحسن ذو النفس الزكية) ساڵی (١٤٥) ك دژ بە (أبو جعفر المنصور العباسي) ڕاپەڕی، ڕاپەڕین و دەرچونەکەشی لە مەدینەدا بوو، خەڵکی مەدینەش داوای فەتوای دەرچونیان کرد لەگەڵیدا، لەگەڵ ئەوەی پێشتر بەیعەتیان دابوو بە ئەبوجەعفەری مەنسور، مالکیش فەرمویی: (بەیعەتدانی ئێوە بە ناچاری بووە، ناچارکراویش سوێندی ناکەوێ، (دوای ئەوە –و-) خەڵکی بە خێرایی بەرەولای موحەممەد چون و مالکیش لە ماڵی خۆی دەرنەچوو.[2]

ئەگەر هەموو ئەمانە سەلما، وە ئیمامەت دانامەزرێ بە بێ گرێ بەستی بەیعەت، گرێبەستیش بەرەزامەندی هەردوولا دەبێت، وە ئەمەش گرێبەست و بریکارییە: کە ئوممەت تیایدا ڕەسەن و ئەسڵەو ئیمام بریکارە لەوەی هەستێ بە چەند کارێکی دیاری کراو بەپێی چەند دەربڕینێکی دیاریکراو کە ئەمە دەقەکەیەتی: (پەیمانمان پێتدا بە پەیمانێکی ڕەزامەندیانە، بەوەی دادگەری و ڕاستڕۆیی بەرپا بکەی و

---

(١) الاحكام السلطانية ی ماوەردی، ل (٨) سەرنج لەم هۆکارییەی ماوەردی بدە کە دواتر – لە قۆناغی دووەمدا- تەئکید دەکرێتەوە لەسەر پاشەکشەی گوتاری سیاسی لەم بنەمایەو بەتەئویلی خودی ماوەردی خۆی.

(٢) (ابن جـــري الطبـــري (٤ /٤٢٧)، ڕوداوەکـانی سـاڵی (١٤٥) ك، و (سـير اعـــلام النبلاء) (٨/٨٠).

پێداویستیەکانی ئیمامەت بەجێ بگەیەنی)[1] یاخود (پەیمانت پێدەدەین لەسەر کیتاب و سوننەت) بەو شێوەیەی هاوەڵان دەیانکرد، ئەگەر هەموو ئەمانە سەلما ئەوا گرێ بەستێك لە شەریعەتدا نامێنێتەوە کە پێویست و خوازیار بێ درێژەی پێبدرێ و نەکرێ هەڵبوەشێتەوە، بەڵکو تەواوی ئەو گرێ بەستانەی کە پەسەندی بەردەوامیو ماوەدرێژی دەکەن - وەك بەکرێدانو بریکاریو مارەبڕین- ئەکرێ هەڵبوەشێنەوە یانەهێڵرێن، بە تایبەت گرێبەستەکانی بریکاری، چون ئەم گرێ بەستانە فراوانترین گرێبەستی شەریعەتی ئیسلامین لەم رووەوە، کە هەردوولای گرێ بەستەکە بۆیان هەیە هەڵی بوەشێننەوە، چونکە خاوەنی ڕەسەن مافی ئەوەی هەیە هەرکاتێ بیەوێ بریکار لابا، چونکە ئەو خاوەنی مافە، (ئیبن جەوزی) لە وەڵامی ئەو کەسەی وا دەبینێ کە حوسەین هەڵەی کردووە لەوەدا کە دژ بە یەزید راپەڕیوە وتویەتی: (ئەگەر سەیری ژیاننامەو مێژوو (السیر) بکردایە دەیانزانی چۆن بەیعەتی پێدراوەو خەڵکی پێوە پابەند کرا، ئەگەر خەلافەتەکەش بەدروست دابنرێ ئەوا چەندین ڕەفتاری لێ بەدەرکەوتووە کە سەرجەمیان هەڵوەشاندنەوەی گرێ بەستەکە بە پێویست دادەنێن).[2]

گرێبەستی ئیمامەت وەکو گرێبەستی تر دەکرێ هەڵبوەشێنرێتەوە،

(١) الاحكام السلطانيةى (ابويعلى) ل٢٥ و(كشف القناع) ٦/١٦٠ و(مطالب اولي النهى ٦/٢٦٥).

(٢) سەيرى (الفروع) ى (محمد بن مفلح الحنبلي) ٦ / ١٦٠ بكە

ئەمەش ڕون و ئاشکرابووە لە قۆناغی یەکەمی قۆناغـەکانی گوتـاری سیاسی، هەروەك ئەبوبەکر لە وتارە بەناوبانگ‌و دروستەکەیدا فەرموی: (ئەی خەڵکینە من کرام بەسەرپەرشتیاری ئێوە بێئەوەی باشترینتان بم، ئەگەر چاکم کرد پشتیوانیم کەن، ئەگەر هەڵـەو لادانم هـەبوو راسـتم کەنەوە، گوێڕایەڵیم کەن تاوەکو گوێڕایەڵی خوا دەکەم لە نێوانتانـدا، ئەگەر بێ فەرمانییم کرد ئەوا گوێرایەڵ بونتـان بـۆم پێویـست نابـێ لەسەرتان).[1]

هەر ئەم بۆچونەش پاڵنـەری ئاژاوەگێرەکـان بـووە، ئەوانـەی دژ بـە عوسمان (خوا لێـی ڕازی بێت) راپەڕین کە سـوور بـن لەسـەر لـەکار لادانی، چونکە وایان دەبینی بۆیان هەیە داوای لەکار لادانـی بکـەن، عوسمانیش راوێژی کرد بە هـاوەڵانی تـرو ئـەوانیش ئـەوەیان پەسـەند نەکرد، هەر ئەمەش پاڵنەری عومەر بووە بۆ لە کار لادانـی سـەعدی کوڕی وەقاص لە کاربەدەستی کوفە کاتێ بینی خەڵکەکـەی سـکاڵای

(١) (محمد بن اسحاق) لە مێژووەکەیدا گێڕاویەتەیوە هەروەك لە (المختصر) ل (٣٠٣) دا هاتوە لە (الزهري)و ئەویش (انس)ە وە (خوای لێ ڕازی بێت). وە (عبدالرزاق ١٦/ ٣٣٦) لە (معمر)ەوە ئەویش بە (مرسل)ی لە (زهري) گێڕاوەتەوەو (ابن سعد)یش لە (الطبقات ) (١٣٦/٣) لە ڕێگەی (هشام بن عروة) ئەویش لە باوکیەوە لەبەسەرهاتی (بەیعەت)دا باسی دەکات، (ابو عبيد)یش لە (الاموال) ل (١٢) لە ڕێگەی (هشام عن ابيه عن عروة بن الزبير) و وە لە ڕێگەی (اسماعيل بن ابى خالد من قيس بن ابي حازم عن ابي بكر)ەوە هاتووە (ابن كثير)یش لە (البداية والنهاية): ( ٦٦ /٣٠٦)دا سەبارەت بە ڕچەکە (محمدی کوڕی (اسحاق) فەرمویەتی: (ئەمە ڕچەیەکی چاك (حسن) ە هەرواشە.

لێدەکەن، لەبەر حەزو داخوازی ئەوان لە کار لای برد ، چونکە بریکاری ئوممەتە تەنانەت لەسەر جێگەی مردنو لە سەرەمەرگدا فەرموی: (من سەعدم لەبەر بێ‌توانایی‌و ناپاکی لانەبردووە) وەك تەئکیدکردنەوەیەك لەوەی لە کار لابردنەکە بە پێی داخوازی خـاوەن مافـە، کـە خـەڵکی کوفەن و بە شێکن لە ئوممەت، هەر بۆیە عومــەر دوودڵ نـەدەبوو لـە لابردنی هەر ئەمیرێك کە خەڵکی وڵاتەکە سـکاڵایان لێـی بکردایـە تەنانەت ئەگەر ئـەمیریش لەســەر هـەق بوایـە، لەبـەر ڕونێتـی ئـەم بنەمایـە، کـە بریتیـە لـەوەی ئیمـام بریکـاری ئوممەتـە، هـەر بۆیـە فەرموویەتی: (شتێکی سوك و ئاسانە ئەگەر خەڵکێك بەوە بـاش بـن ئەمیرێکیان بۆ بگۆڕم بە ئەمیرێکی تر، حەسەنی کـوڕی عـەلی خـۆی لەکار لابرد لەگەڵ ئەوەی خەڵکی عێراق ساڵی (٤٠ ك) پاش کۆچـی دوایی بەیعەتیان پێیدابوو کە خەلیفەیان بێت، بەویست و ڕەزامەنـدی خۆی ئەم پایەیەی دابە موعاویەو خەڵکی عێراقیش بە دوای حەسەندا (خوای لـێ ڕازی بێت) بەیعەتیان بە موعاویەدا.

**٥- ڕەزامەندی بەدی نایەت ئەگەر ئیمامەت و کاروبـــاری ئوممەت بە ڕاوێژی نێوان موســڵمانان نەبێت.**

لە سەرەتاو کۆتاییدا ئوممەت سەرچاوەی دەســەڵاتە، هــەروەك خــوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَمْـرُهُمْ شُـورَى بَيْـنَهُمْ﴾ (الـشورى: ٣٨). لەمــەدا مەبەســت هەڵبــژاردنی دەســەڵاتە، هــەروەك عومــەر فەرمویــەتی (فەرمانداریێتی و ئەمیرایەتی بە ڕاوێژە لەنێوان موسڵماناندا) وە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩). ئەم ئایەتە کاروبارەکانی تریش دەگرێتەوە بەدەر لە هەڵبژاردنی دەســەڵات، ڕاوێــژ لەم قۆناغەدا لە بناغەکانی گوتاری سیاسی بوو، چەمکی ڕاوێــژ ئــەو گۆڕانکارییانەی بەسەردا نەهات کە دواتر هاتە سەری لەوەی: کە ئایا ڕاوێژ پێویست (واجب)ە یان نا؟ وە ئایا ڕاوێژ بۆ پابەندێتی (ملزمــە)ە یاخود تەنها بۆ ئاگاداری و زانین (معلمە)ە؟؟!

بەڵکو تەواوی هەڵس وکەوتەکانی هــــاوەڵان تەئکید لەسەر ئــەوە دەکەنەوە کە ڕاوێژ پێویستە و دەبێت پابەندێتی پێوە دەربڕێ، هــەروەك (أبوبکر بــن الجــصاص) لــە تەفــسیرەکەیدا بــۆی چــووە لــە ئایــەتی: (وشاورهم في الامر) کە تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە فەرمانەکــە لەم ئایەتەدا بۆ واجبێتییەو مەبەســتیش لــە ڕاوێــژ کارکردنــە بــەوەی ڕاوێژکاران پێی دەگەن. وەڵامــی ئەوانــەیش دەداتــەوە کــە پێــچەوانەی ئەمەیان وتووەو فەرمانی هاتووی نێو ئەم ئایەتەیان بە ئیشێکی باش و

چاك (الاستجباب) لێکداوەتەوە[1] (رازی)ش لە تەفسیرەکەیدا ئەمەی بە بەهێزتر داناوە ئەوەتانێ دەفەرموێ: (رووکاری فەرمانەکە بۆ واجبێتیە، فەرمودەی (وشاورهم) واجبێتی دەخوازێ)[2] زانایـانی ئەندەلوسـیش هەمان بۆچونیان هەیە، هەروەك (ابن عطیة-٥٤١ ك. ك) ووتویەتی: (راوێژ لە رێســاکانی شــەریعەت و بڕیـارو حوکمـە گرنگەکانـە، هەرکەسێ راوێژ بە زانایان و دینداران نەکا لە کار لابردنی پێویستە، ئەمەش جێی ناکۆکی نیە)[3]

(ابـن خویزمنـداد (٤٠٠ ك. ك) هـەروای فـەرمووە: (پێویـستە کاربەدەستان لەو شتانەی نایزانن راوێژ بە زانایان بکەن، یـا لـە هـەر شتێکی تـری ئاینیـدا کـە ئیشکالیان بـۆ دروسـت دەبێـت، وە لـە کاروباری جەنگیشدا راوێژ بە تایبەت مەنـدانی سـوپا بکـرێ، وە بـە کەسایەتیەکان لە بەرژەوەندیەکانی خەڵك دا، (وە راوێژ بکا -و-) بـە نوسـەر و وەزیـرو کاربەدەسـتە دیارەکـان لەوشـتانەی پەیوەسـتن بـە بەرژەوەندیەکانی وولات و ئاوەدان کردنەوەی).[4]

راوێژ لەم قۆناغەدا دوو کاروباری لە خۆ دەگرت: هەڵبژاردنی ئیمام، بەشداریکردن لە ڕاو بیـروبۆچونەکاندا.

(١) احکام القرآن ٢ / ٣٣٠
(٢) تفسیر الرازي ٩ / ٦٧
(٣) تفسیر القرطبي ٤ / ٢٤٩.
(٤) تفسیر القرطبي ٤ / ٢٤٩ – ٢٥٠

هاوەڵانیش کۆبوون لەسەر ئـەم بنەمایـە، وە لەسـەرئەوەی ئومـەت ئیمام هەڵدەبژێرێ، وە هەر ئـەویش بەشـداری بیروبۆچـونەکانی دەکـاو بەبێ ئەم هیچ کاروبارێك یەکلایی ناکاتەوە، هـەروەك پێغەمبـەر ﷺ وای دەکرد، لە هیچ کاروبارێکی گـشتیدا هـیچ مەسـەلەیەکی بـەبێ ڕاوێژی ئومەت یەکلا نەدەکردەوە، ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد لە هەموو کاروبارێکیاندا ئەگەر وەحی لەبارەوە دانەبەزیایە، هەروەك لە جـەنگی ئوحدا وای کرد بیروبۆچونی خۆی وابـوو لـە مەدینـەدا بمێنێتـەوە، ڕای زۆرینەش لەگەڵ ئەوەدا بوو دەربچن بۆ جەنگ، ئـەوەبوو بـە قـسەیانی کردو لە بۆچونەکەی خۆی دابەزی، (ابن کثیر) فەرموویەتی: (زۆرینەی خەڵك لەگەڵ دەرچوون بوون بۆ ڕووبەڕوی دوژمن، بە پێـی فـەرموودەو بیروبۆچـونی پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـەکرا) هــەروەك فەرموویــەتی: (خــەڵکی بــەردەوام هــانی پێغەمبــەری خوایــان دەدا تــاوەکو خــۆی ئامادەکردو جلی جـەنگی پۆشـی..... پاشـان چـووە ناویـانو خـەڵکی سەرزەنشتی خۆیان کردو ووتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ مـان ناچـارکرد بۆمان نەبوو وابکەین).[1]

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناچاری دەرچـوون کـرا، کەچـی وەك ڕێزێك بۆ ڕای زۆرینە کە سوور بوون لەسەر هەڵوێـستی خۆیـان، لەگەڵیان دەرچوو، ئایەتی (وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ) (آل عمـران: ١٥٩) لـەم جەنگەدا دابەزی، بۆئەوەی تەئکید لەسـەر زەرورەتـی ڕاوێـژ بکاتــەوە،

(١) البداية والنهاية (١٤/٤) ، سەیری فتح الباری (٣٤٦/٧) بکە.

هەرچەندە سەرەنجامەکان بەوشێوەیەش بـێ کەلـەم جەنگـە کەوتــەوە. (ابن جرير الطبـري) ئەم واتایەی لە هەندێ لە خـاوەن تەفـسیرەکانەوە باس کردووە، کەوتویانە: (لە نێوان خۆیانـدا ڕاوێژدەکـەن، پاشـان بـە سەرەنجامێك دەگەن کە کەسایەتیەکانیان کۆك دەبن لەسەری).[1]

(مـلأ)یش بریتیە لە کۆمەڵ بونی خەڵکیو سـەرکردەکانیان، هـەر بەم شێوەیەش خوای گەورە وەسفی باوەڕداران دەکاو فەرمویەتی: ﴿وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾(الشورى:٣٨)، ڕاوێـژی خستۆتە نێوان نوێژو زەکاتەوە کە هەردوکیان لە پایەکانی ئیـسلامـن، بەمەش تەئکید لە پلەوپایەی ئایینی ڕاوێژ دەکاو ڕوونی دەکاتەوە کـە یەکێکە لە فەرزەکانیو پایەیەکە لە کۆمەڵگەی مـسوڵمانو دیـارترین تایبەتمەندیەتی، پێغەمبەریش ﷺ لە هەموو کەس زیاتر ڕاوێژی دەکرد، لە کاروبارە گشتیەکانیشدا بۆ ڕاوێـژکردن کەسـی جیـا نەکردۆتــەوە، بەڵکو لە جەنگو ئاشتیدا ڕاوێژی بەتەواوی ئـەو مـــسوڵمانانە دەکـرد کە ئامادەی ئەو شوێنە بوون، گوێبیستی ڕاو بۆچونی عەبدوڵڵای کـوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو لە جەنگی ئوحددا[2] و حەزی بـە بۆچـونەکەی هەبوو سەرەڕای ئەوەشی دەیزانی دووڕوو دوژمنکارە، قورئانیش ئەم بارە وەسف دەکا هەروەك لە فەرموودەی خوادا هـاتووە ﴿وَإِنْ يَقُولُـوا تَـسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾ (المنافقون: ٤) ئەگەر شتێك بڵێن گوێیان لـێدەگرێ.

(١) التفسير ٤٩٦/٣..

(٢) سەیری البداية والنهاية ١٤/٤ بکە

ئەمەش لەبەرئەوە بـووە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە کاروبـارە گشتیەکاندا کەسی تایبەتمەند نەدەکرد بە ڕاوێـژ پێکردنـەوە، ڕاوێـژی کرد بە خەڵکی بۆ ئەوەی سەروەت و سامانەکانی (هوازن) بگێڕێتـەوە بۆیان، لەناویاندا وتارێکی داو فەرمووی: ((پاش سـوپاس و سـتایش، براکانتان بە پەشـیمانییەوە هاتونەتـە لامـان، مـن وادەبیـنم دەسـت کەوتەکانیان بۆ بگێڕینەوە، هەرکەسێ ئەمەی پێخۆشە بـا وابکـات، هەرکەســەش پێــی خۆشــە بەشــەکەی خـۆی لابـێ تـاوەکو یەکـەم دەستکەوتێ کە خوادا پێمانی دەدات پێی دەبەخـشینەوە باوابکـات)) خەڵکەکــەش وتیــان ئــەوەمان پێخۆشــە ئــەی پێغەمبــەری خــوا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئێمە نـازانین کـێ لەمــەدا ڕێی پێـداوین وەکـێش ڕێی نـەداوە، بگەڕێنـەوە تـاوەکو عەریفـەکانتان کاروبارتانمان بۆ بەرز دەکاتەوە))، خەڵکی گەڕانەوە، قـسەیان لەگـەڵ عەریفەکاندا کرد، پاشـان گەڕانـەوە بـۆلای پێغەمبـەری خـوا ﷺ و هەواڵیان پێدا کە ڕازی بوون).[1]

لە گێڕانەوەیەکی تـردا بەسـەنەدێکی بـاش (جیـد) لەگێڕانـەوەی موسای کوڕی عوقبەدا هاتووە: (هەرکەسە پێی خۆشە بێ زۆرلێکردن بیبەخشێت با بیکات، هەر کەسـەش پێـی ناخۆشـە بیبەخـشێ ئـەوا لەسەرمنە بریتی بـدەم)، خـەڵکی هـەر چـی یـان پێبـوو بەخـشیان، کەمێك نەبێ لە خەڵکی داوای بریتییان کرد، لە گێڕانەوەی (عمرو بن

(١) صحيح البخاري بە (فتح)ەوە ٨/٣٣ ف /٤٣١٩.

شعیب)دا هاتووه كه كۆچكەرەكان فەرموویان: (ئەوەی هی ئێمەیە بـۆ پێغەمبەری خوا ﷺ یە، پـشتیوانەكانیش هــەمان شــتیان فــەرموو، ئەقرەعی كوڕی حابس ووتــی: (مــن‌و بەنوتــەمیم شــتی وا ناكــەین)، عوینەش ووتی: (من‌و بــەنو زرارەش نــەخێر)، عەبباســی مرداســیش ووتی: (من‌و بەنو سولەمیش نەخێر)، بــەڵام بــەنو ســولەیم ووتیــان: (بەڵكو ئەوەی هەمانە بۆ پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (من تمسك منكم بحقه فله بكل إنسان ست فرائض مــن أول فيء نصيبه) ئیتر ژن‌و منداڵەكانیان بۆ خاوەنەكانیان گێڕایەوە).[1]

ڕاوێژی بە هەموو خەڵكی كرد، تیایاندا هەبوو نەومــسوڵمان بــوو تەنها لە دوای ڕزگاركردنی مەككەوە مسوڵمان بــوو یاچــەند ڕۆژێــك پێش ئەم ڕووداوە، تیایاندا هەبوو دوای كۆچی پێغەمبــەری خــوا ﷺ هەڵگەڕایەوەو ڕەخنــەیان لــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ ئــەگرت لــەوەی كەدەســتكەوتەكانی هــەوازنی گێڕابوویــەوە بۆیــان، لەگــەڵ ئەوەشــدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەوەندەی پێ‌فەرموون: (ئێمــە نــازانین كــێ ڕازییەو كێ ناڕازییە، بگەڕێنەوە تاكو عەریفەكانتان كاروبارتانمان بــۆ بەرز دەكەنەوە)، ڕازی بونیانی بە مەرج گرت، عەریفەكان بــریتین لــە نوێنەرو نمایندەكانی گەل لە چەرخی نوێدا، (ابن أثیــر) فەرموویەتی: (عُرفاء كۆی عریف)؟ كە بریتیە لە هەڵسەنگێنەری كاروباری هۆز یا كۆمەڵێك لە خەڵكی بۆ سەرپەرشتی كاروباریــان، فەرمانــدە لــەوەوە

(١) سەیری فتح الباری ٣٤/٨ بكە

کاروباری ئـەوانیتر دەزانێـت)،[1] (حـافظ ابـن الحجـر) فەرموویـەتی: (بریتیە لەوکەسەی کە کاروباری کۆمەڵێك لە خەڵکی بەڕێوە دەبـات. دەوتـرێ (عرفـت فأنـا عـارف وعریـف) ئەمـە واتـای ئەوەیـە: کـە سەرپەرشتی کاروباری بەڕێوەبەرییان و پاراستنیانم لە ئەستۆ گرتووە... لەبەرئەوەی ئاشنایە بە کاروباریان تاوەکو لە کاتی پێویستیدا سەروتر پێی ئاشنا بێت).[2]

بوخاری لەبابێکی لـەژێر ناونیـشانی (العرفـاء للنـاس)[3] لـەژێر (کتاب الأحکام)دا جێ‌کردووەتەوەو فەرموودەی پێویستی هێناوە، (ابن البطـال) فەرموویـەتی: (ئـەم فەرموودەیـە مەشـروعیەتی دانـانی عەریفەکانە، چـونکە ئیمـام هـەر خـۆی ناتوانـێ تـەواوی کارەکـانی ڕاستەوخۆ ببات بەڕێوە، پێویستی بە دانانی کەسانێکە کـە هاوکـاری بکەن بۆ ئەوەی بەکارەکانی هەستێ، ئەمرو نەهییش ئەگەر ئاڕاسـتەی هــەموو لایــەك کــرا هەنــدێکیان پــشتگوێی دەخــەن‌و لەوانەیــە کەمتەرخەمی تێدا بکرێت، بەڵام ئەگـەر هـەموو کۆمەڵـە خـەڵکێك عــەریفێکیان هـەبێت ئـەوا ناچـاردەبن فـەرمانی دەرکـراو جێبـەجێ بکەن).[4]

عەریفەکان ئەو سەرکردانەی خەڵکین کە کاروباریان هەڵدەسوڕێنن‌و

(١) النهاية في غريب الحديث (٢١٨/٣).

(٢) فتح الباري، (١٦٩/١٣).

(٣) صحيح البخاري به (فتح)ەوە (٣٢/٨) ف (٤٣١٩).

(٤) سەرچاوەی پێشوو (١٦٩/١٣).

خەڵکی بە دەمســپی خۆیانیان دادەنێن، یاخود بە شێوەیەکی ئاســایی کۆمەڵگە جیاکارییــان پێدەبەخــشن، شــاعیری ســەردەمی نــەفامیش وتویەتی: (أو كلما وردت عكاظ قبيلة بعثوا إلي عريفهم يتوسّم).

ئیبــنوجەریر دەگێڕێتەوە کە (عومەر ﷺ نوســراوێکی نوســی بــۆ ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ: (بــەردەوام خــەڵکی کەســایەتیان هەیــەو پێداویستیەکانیان بۆ دەگەیەنن، لای خۆتــەوە ڕێــز لــەو کەســایەتیانە بگرە، مسوڵمانی بێدەسەڵات ئەوەندەی لــە دادگــەری بەســە کــە لــە فەرمانڕەواییو سامان دابەشکردندا مافی خۆی بدرێتێ)[1].

هاوەڵانیش هەستیان بــە گرنگــی ڕاوێــژ کردبــوو لــە بــەڕێوەبردنی کاروباری ئوممەت دا، ناکۆك نەبوون لەسەر ئەوەی کــە کاروبارەکانیــان بەڕاوێــژە، یەکــەمو گــرنگترین کاروبــارێکیش کاروبــاری ئیمامــەتو هەڵبژاردنی خەلیفەیە، هەر بۆیە عومەر ﷺ لەسەر جێگای مردن بــە عەبــدوڵای کــوڕی عەبباســی ﷺ فــەرموو: (سێشــتم لێــوە تێبگــە، ئەمیرایەتی بە ڕاوێژە...)[2] لەدوا حەجیدا کاتێــك کــە لــە مینــا بــوو هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە پیاوێك وتویەتی: (ئەگــەر عومــەر ﷺ مرد بەیعــەت بــە فــڵان کــەس دەدەم، بــە خــوا بەیعــەتی ئەبوبــەکر

(١) تاريخ الطبري ٥٦٦/٢، بە ئیسنادێکی سەحیح لە (شعبة بن الحجاج عن ابي عمران الجوني) کە هەر یەك بە پێی مەرجی بوخاریو موسلمە.

(٢) مــصنف عبــدالرزاق ٣٠٢/١٠، بــە ئیــسنادێکی ســەحیح، قورتــوبیش فەرمویــەتی: (عومــەری کــوڕی خــەتتاب ﷺ خەلافــەت کــە گــەورەترین شــتێکە کردیــەتی بــە ڕاوێــژ ٢٥١/٤.

کوتوپڕی یەك بوو وە کۆتایی پێهات) عومەریش ﷺ فەرمووی: (بە خوا من — خوا حـەز کـات- ئـەم ئێوارەیـە لـە نێـو خەڵکیـدا دەبمو ئاگاداریان دەکەمەوە لەو کەسانەی ئەیانەوێ کاروباریـان زەوت کـەن) پاشان کاتێ گەیشتەوە مەدینە لە یەکـەم هەینیـدا هەسـتاو گوتـارە بەناوبانگەکەیدا سەبارەت بە خەلیفایەتی ئەبوبـەکرﷺ و فـەرمووی: (هەرکەسێ بەیعەت بـە پیاوێـك بـدات بێڕاوێـژی مـسوڵمانان ئـەوا نەخۆییو نە ئەوەشی بەیعەتی پێدراوە شوێن کەوتەیان نابێتو خۆیان ڕووبەڕووی کوشتن دەکەنەوە).[1]

ئەم وتارە دیارترینو دروسـت تـرین وتارەکـانی عومـەرە ﷺ و بـە ئامادەیی هاوەڵانیش ﷺ فەرموویەتی ئەمەش کۆك بونیان دەگەیـەنێ لەسەر ئەوەی مافی هەڵبژاردنی ئیمام بۆ ئومەتەو حەرامە ئـەم مافـە زەوت بکرێت، وە هەر کەسەش بەبێ ڕاوێژی موسـڵمانان بەیعـەت بـە کەسێك بدات ئەوا خۆی تووشی کوشتن دەکا).[2]

عومەریش ﷺ بە شەش کەسـەکەی ووت: (هەرکەسـێ لـە ئێـوە بەبێ ڕاوێژی موسڵمانان بوو بە ئەمیر ئەوا لە گەردنی دەن)، (ابن أبي شـيبة) ئـەم وتـارەی بـە ئیـسنادێکی سـەحیح گێڕاوەتـەوە، کـە لـە

(١) صحيح البخاري بە (فتح)ەوە ١٢/١٤٥ ف ( ٦٨٣٠ ).

(٢) سەیری (الفتح) ١٢/١٥٠ بکە

دواییەکەیدا هاتووە: (جێنشێتی کردن بەبێ ڕاوێژ نابێت).[1]

(ابن أبي شيبة) هــەمان ووتــاری بــە ئیـسنادێکی تـر لــە ڕێـی (زهــری)ەوە دەگێڕێتــەوە — هــەروەك بوخــاریش گێڕاویەتــەوەو لــە کۆتاییەکەیدا هاتووە (بەیعەتەکەی خۆیی و ئەوەشی بەیعــەتی پێــداوە دانەمەزراوە)[2]. واتە بەیعەتی کەسێك دانامەزرێ ئەگەر بەیعــەتی دا بەپیاوێك کەبەیعەتەکەی بە پێی ڕاوێژو ڕەزامەندی موسڵمانان نەبوو، لەبەرئەوەی ئەوە مافێکە لە مافەکانیان و حەرامە زەوت بکرێ.

(ابن کثیر)یش لە (البداية والنهاية)دا باسـی ئـەوە ئـەکات: کـە کاتێ هەر پێنج کەسی خاوەن ڕاوێژ (پاش هاتنەدەرەوەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف) ڕازی بوون یەکێك لە خۆیان هەڵبــژێردرێت، پاشــانیش پالاوتنەکە قەتیس ما لە نێوان عوسمان و عەلی دا (خوایــان لــێ ڕازی بێت): (عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف) ﷺ هەســتا بــە ڕاوێــژکردن بــە خــەڵکی ســەبارەت بــە هــەردووکیان و ڕای موســڵمانانی کـۆکردەوە، بیروبۆچونی کۆمەڵ و بەش بەش و تاك و جوتی وەردەگرت، بــە نهێنــی و

---

(١) طبقات ابن سعد بە ئیسنادێکی سەحیح بە پێی مەرجی بوخاری و موسلم، حافظ لە (فتح)دا دەڵـێ (ابـن سـعد) بـە ئیـسنادێکی صـحیح لـە فـەرموودەی (ابـن عمـر)ەوە هێناویەتی).

(٢) المصنف ٤٣١/٧، و(ابن ابی شیبة) لە (تاریخ المدینة)دا ٩٣٣/٣ بە پوختی و بە ئیسنادێکی سـەحیح هێناویـەتی (بەیعـەت بـە بێ ڕاوێـژ نابێـت ) وە لـە ٩٣٦/٣ بـە سەنەدێکی سەحیح هاتووە کە: هەرکەسـی داوای ئـەوەی کـرد بیکـەن بـە ئـەمیر بـەبێ ڕاوێژی موسڵمانان ئەوا دەبێ بیکوژن).

ئاشکرا، تەنانەت چووە لای ئافرەتان لە کەژاوەکانیاندا، بەنـدەکان لـە کاتی پەیمان پێدانی ئازادکردنیاندا (المکاتب)، تەنانەت پرسیاری لـەو سوارەو عەرەبە دەشـتەکیانەش دەکرد کە دەهـــاتنە مەدینەوە، ئەمـە سێ شەوو سێ رۆژی خایـــاند)[1].

ئەگەر ئەمە مافێك نەبوایە لە مافەکانی خەڵکی و حەرام نەبوایـە پێشێل بکرێ یا دەستی بەسەردا بگیـرێ یا لێیـان زەوت بکـرێ ئـەوا هیچ کات عەبدورەحمانی کوڕی عەوف بەو شێوەیە تێنەدەکۆشا تاوەکو ئەو هەموو هەوڵە بدات بـۆ پرسـیارکردن لـە خـەڵکی، (وەرگرتنـی بیـروبۆچونیان).

هاوەڵانیش کۆك بوون لەسەر ئەم بناغەو ئەسڵەو هیچیان نکوڵیان لێی نـەکردووەو بەیعـەتی ئەبوبـەکر ﷺ لـە سـەقیفە بەڕەزامەنـدی هاوەڵان بووە — هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە[2] — کە عومەر بەیعەتی پـێداو پاشـان کۆچـکەرانو پـشتیوانان لـە کـەپری بـەنی ساعیدەدا، پاشان موسڵمانانی تر لە مزگەوت دا، بـە هـەمان شـێوە بەیعەت پێدانی عومەریش بە ڕەزامەندی تەواوی موسڵمانان بـووە ﷺ پاش ڕاوێژ پێکردنیان وەك لە (ثقات ابـن حبـان)دا هـاتووە:[3] (کـە ئەبوبەکر چەند کەسێکی لە کۆچەرو پشتیوانەکان بانگهێشت کرد بۆ

---

(١) ابن كثير ١٥١/٧

(٢) فتح الباري ١٤٥/١٢ ف ٦٨٣٠

(٣) ١٩١/١.

ڕاویژ پێکردنیان سەبارەت بە عومەر)(*) پاشان بەیعەتی عوسمان دێت ئەوەبوو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بەیعەتی پێداو پاشان کۆچەرانو بەدوایدا پشتیوانانو فەرماندەی سەربازیو موسڵمانان، (بە گشتی)، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ بە عەلی کوڕی ئەبوتالیبی فەرموو ﷺ: (من ڕوانیمە بیروبۆچونی خەڵکی و بینیم کەس بە عوسمان ناگۆڕنەوە، ڕێ مەدە بەخۆت شتێکی ترت بۆ دروستبێ).[1] (ابن حجر) فەرموویەتی: (بێدەنگبوونی ئامادەبوانی خاوەن ڕاوێژ لە کۆچەرو پشتیوانانو فەرماندەی سەربازان بەڵگەی باوەڕبونیان بوو بە وتەکانی عەبدوڕەحمانو ڕازیبوونیان بە عوسمان).[2]

لێرەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هەڵبژاردنو ویستی خەڵکی کردە بەڵگە بۆ پارسەنگی لە نێوان پاڵێوراوانی جێنشینایەتی، کە بریتی بوون لە عوسمانو عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت)، عەلیش ﷺ پاش کوژرانی عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: (بەیعەت پێدانی من دەبێ بە ڕەزامەندی موسڵمانان بێت)، کاتێك کە چووە مزگەوتەوە کۆچەرو پشتیوانەکانیش هاتنە مزگەوتەوەو بەیعەتیان پێیدا پاشانیش خەڵکی بەیعەتیان پێی کرد)،[3] لە گێڕانەوەیەکی

(*) پاشتر لە لایەن موسڵمانانەوە بەیعەتی پێدەکرێ. (وەرگێڕ)

(١) صحیح البخاري بە(فتح)ەوە ١٩٤/١٣ ف (٧٢٠٢).

(٢) صحیح البخاري بە(فتح)ەوە ١٩٧/١٣ف (٧٢٠٢) سەیری تاریخ الإسلامي (ذهبي) سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین بکە ل ٣٠٥.

(٣) ابن جریر الطبري , ٦٩٦/٢

تردا هاتووه كه وتارێكی داوەو فەرمویەتی: (ئـەی خەڵكینـە، ئەمـە كاروباری ئێوەیەو هیچ كەسێ مـافی تیـا نیـە، مەگـەر ئێـوە پێـی بسـپێرن ئەگەر بتانەوێ شان دەدەمـەژێری، ئەگـەرنا هیـچم نابـێ بەسەر كەسەوە).[1]

لەگەڵ ئەمەشدا حەسەنی كوڕی وای دەبینی خەڵكی بەیعەت نـەدا تاوەكو لە هەموو وڵاتانەوە بەیعەتی پێدەدەن، بۆیە بە باوكی فـەرموو: (ئایا فەرمانم پێ نەكردی كە خەڵكی بەیعەتت پێنەدا تاوەكو خەڵكی هەموو وڵاتێك نوێنەری خۆیان ڕەوانە بكەن بـە بەیعەتەكەیـانەوە؟) ئەویش فەرمووی: (بەیعەت پێدانەكەم پێش ئەوەی بەیعـەتی شارانی تر بگا لەبەرئەوە بوو ترسام ئەم كاروبـاره لەناوچێ[2] و پاشـانیش ئاژاوەگێڕی ڕوویدا.

ئەمەش تەئكیدكردنەوەی مافی ئوممەتـە لـە تـەواوی وڵاتانـدا بـۆ هەڵبژاردنی ئیمام، هەر ئەمەش ئەسـڵە مەگـەر لـە كـاتی ناچـاریو بارودۆخی تایبەتیو جیاكار دانەبێ هەروەها ئومـەت مـافی ئەوەشـی هەیە مەرج لەسەر خەلیفە دابنێو پابەندی بكا بەو مەرجانـەی كـەم بێ فەرمانی تێدا نیە هەروەك چۆن عەبـدوڕەحمان ﷺ بەمـەرجی دانـا لەسەر عوسمانو عەلی كە كاربكەن بە كیتابو سـوننەتو ژیاننامـەو

ابن جرير الطبري، ٢/ ٧٠٠.

٢ سەیری (ابن كثير) ٢/٢٤٥، ابن جرير الطبري ٣/١٠، ١٩ بكە كە دەربڕینەكەی بەم شێوەیەیە (امرتك لاتبايع حتى يأتيك وفود اهل الأمصار والعرب وبيعة كل مصر).

ژیاننامەو ڕێوشوێنی (السیرە)ی هەردووخەلیفە ئەبوبەکرو عومەر، عوسمان ڕازی بوو، عەبدوڕەحمانیش پێی ووت: (بەیعەتت پێدەکەم لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ وە هەردوو خەلیفەی پاشی، ئیتر عەبدوڕەحمان بەیعەتی پێداو خەلکیش بەدوایدا بە کۆچەرو پشتیوان‌و سەرکردەکانی سوپاو موسلمانانەوە بەیعەتیان پێیدا).[1]

لە کاتێکدا کارکردن بەتەواوی ژیاننامە (سیرە)ی ئەبوبەکرو عومەر لە ئەسلدا واجب نیە، هەر بۆیە عەلی فەرمووی: (تواناو وزەی خۆم دەخەمەکار (أعمل طاقتي)، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە عەبدوڕەحمان وتویەتی: (لە عەلی یەوە دەستم پێ‌کردو پێم ووت: بەیعەتت پێ‌دەدەم لەسەر کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی‌و ژیاننامەی ئەبوبەکرو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت)، عەبدوڕەحمان دەلێ: عەلی فەرمووی (فیما استطعت) پاشان خستمە پێش چاوی عوسمان‌و پەسەندی کرد).[2]

هەروەك چۆن خەلکی میسر چەند مەرجێکیان لەسەر عوسمان ﷺ دانا کە ئەگەر پابەند نەبێ پێیانەوە ئەوا ئەمان گوێڕایەلی ناکەن.[3]

بەهەمان شێوە هاوەلان بەمەرجیان گرت عەلی ﷺ تۆلەی عوسمانیان بۆبسێنێ، (ابن جریر الطبري) وتویەتی: (تەلحەو زوبەیرو

(١) مسندإمام احمد ٧٥/١ سەیری فتح ١٩٧/١٣ بکە .

(٢) (صحیح البخاری) لە (الفتح)ەوە ١٩٤/١٣ ف ٧٢٠٧.

(٣) سەیری لاپەڕەکانی دواتر بکە.

کۆمەڵێك لە هاوەڵان لای عەلی کۆبونەوەو پێیـان ووت: (ئـەی عـەلی، ئێمە پیادەکردنی سنورەکان (حدود)مان بەمـەرج دانـاوە)[1] هـەموو ئەمانە تەئکید لەسەر ئەو مافەی ئوممەت دەکەنـەوە کـە بـۆی هەیـە مەرج دابنێ لەســەر ئیمام لە هەر مەرجێك کە دەیـەوێ پێش و پـاش بەیعەتیش، چونکە ئەو بریکاری ئوممەتە.

هەروەك چۆن ڕاوێژ لەئەسڵ دا بۆ هەڵبژاردنی ئیمامە، بـە هـەمان شێوە بۆکاروبارەکانی تری ئومەتیشە کە دەقیان لەبارەوە نیە، هەر چوار خەلیفەکە لەو شتانەی دەقیان لەسەر نەبوو هیچ شـتێکیان بێ ڕاوێـژی موســڵمانان نەدەبڕی یەوە،وەك شـوێن پێ هـەڵگرتنێکی پێغەمبـەری خوا ﷺ ئەبوبەکر ئەگەر شتێك ڕووی تێبکردایە دەیڕوانی یە کتێبـی خوا، ئەگەر شتێکی ببینایەتەوە بۆ قەزاوەت ئەوا کـاری پـێ دەکرد لـە نێوانیاندا، ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خواشدا بەدی بکرایـەکاری پێ دەکرد، ئەگەر نەیزانیایە دەچوو لـەبارەی سـوننەتەوە پرسـیاری لـە موسڵمانان دەکرد، ئەگـەر ئەوەشـی بـۆ نەڕەخسایە ئـەوا سـەرکردەو زانایانی موسڵمانانی بانگهێشت دەکردو ڕاوێژی پێ دەکردن، بە هەمان شێوە عومەر ﷺ وەهای دەکرد ئەگەر کۆبونایە لەسەر شتێك دەستیان پێوەی دەگرت[2] عومەر ڕاوێژی لە کاروبارەکاندا دەکرد تەنانـەت بـە

---

(١) تاريخ ابن جرير (٢/٧٠٠).

(٢) رواه البيهقي (١٠/١١٤ , ١١٥)، حافظ لە (الفتح) دا( ١٣/٣٤٢) , دەڵێ: بەیهەقی بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتی یەوە.

ئافرەتانیش، هەندێجار ڕایەکانی پەسەند دەکردن[1] عومەر کۆڕو ئەنجومەنێکی ڕاوێژی هەبووە گەورەو بچوکی زانایان ئامادەی دەبون.[2]

زهری فەرموویەتی: ( کۆڕی عومەر جمەی دەهات بە قورئان خوێنان، بەلاوو پیریانەوە، هەندێ جار ڕاوێژی پێدەکردن،[3] زۆربەی ئەو بڕیارانەی خەلیفەکانی ڕاشدین دایان و ئەوڕێو شوێنانەی گرتیانەبەر -لەو شتانەی دەقیان لەبارەوە نەبوو - پاش ڕاوێژو ڕا وەرگرتن ئەنجام دراون، هەروەك عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی: (عوسمان چی کرد؟ ئەوەی سەبارەت بە نوسخەکانی قورئان کردی بەبەرچاوو ئاگاداری ئێمەبوو،[4] ووشەی (ملأ) کەلەوتەکەی ئیمامی عەلی دا هاتووە (ما فعل عثمان؟ مافعل في المصاحف إلا عن ملأنا) لێرەدا کۆمەڵێك لە خەڵکیو زۆرینەیان دەگرێتەوە.

عومەریش ﷺ ڕاوێژی بەخەڵکی دەکرد سەبارەت بەوەقف کردنی زەوی یە ڕزگارکراوەکان، بەردەوام سێ ڕۆژ لە مزگەوت دا مشتومڕی لەگەڵ کردن، گفتوگۆی لەگەڵ دەکردنو گفتوگۆیان لەگەڵ دەکرد، تاوەکو قەناعەتی پێکردنو ڕایەکەیان پەسەندکرد.[5]

---

(١) البيهقي (١١٢/١٠) , بە ئیسنادێکی سەحیح .

(٢) سەیری (صحيح البخاري) بە (الفتح) (٣٣٩/١٣) بکە.

(٣) (شرح السنه)ی بغوی ( ١٢٠/١٠).

(٤) سەیری فتح الباری (٣٤٣/١٣) بکە, وتویەتی ئیسنادەکەی باش (حسن)ە, لەو شوێنەدا (حافظ) زۆر هەڵوێستی باس کردووە کە بەرەنجامی ڕاوێژکردن بوون.

(٥) سەیری (الخراج)ی ئەبو یوسف ل (٢٤ – ٢٧) بکە.

لەو وتانەی عومەر فەرمووی: (پاش ئـەوەی ڕاوێـژی بەکۆچـکەران کردو ئەوانیش جیاوازی یان تێ کەوت، پێنج کەس لە خەزرەج لە گەورەو دەم سپی یەکانی بانگکردو پێی وتن: (من بێزارتانم نـەکردووە، تـەنها مەبەستم بەشداری کردنتانە لەوسپاردەیەی بەسەرشانمەوەیەو کاروباری ئێوەیەو لە ئەستۆی منداییە، من کەسێکم وەکو ئێوە، ئـەمڕۆ ئێـوەدان بڕیار لەسەر هەق دەدەن و دەنێن و دەیچەسپێنن، (خۆتان دەزانن — و –) کێ لەگەڵم دایەو کێش جیاوازە لەگـەڵم، مـن نامـەوێ شـوێن حـەزو بۆچونەکانی من بکەون، کیتابی خواتان لەگەڵەو بـەڕەوا دێتـەگۆ....، هەموویان گوتیان: بۆچون بۆچونی خۆتە، جـوانترین قـسەت کـردووەو باشترین دیدو بۆچونت هەیە).[1] بەهەمان شـێوە لـەدانان و نوسـینی دیوانەکاندا ڕاوێژی پێ کردن.[2]

عوسمان بۆ کوشتنەوەی عوبەیدوڵڵای کوڕی عومـەر — پاش ئـەوەی ئەبو لوئلوئەی ئاگرپەرست و هورموزانی لە تۆڵەی باوکیدا کوشـت — ڕاوێژی بـە خـەڵکی کـرد - کۆچـکەران کۆبـوون لەسـەر پێویـستی کوشتنەوەی، زۆربەی خەڵکی پێچەوانەیان بوون و لەگەڵ کوشـتنەوەیدا نەبوون، عوسمانیش ڕای زۆرینەی پەسەند کردو لە ماڵی خـۆی خـوێن باییەکەی دا.[3]

(١) سەرچاوەی پێشوو.

(٢) سەرچاوەی پێشوو , (طبقات ابن سعد ٣/٣٢٤) یش.

(٣) طبقات ابن سعد (٣/٢٧١) , بە ئیسنادێکی سەحیح و بە پێی مەرجی هەریەکە لە بوخاری و موسلیم.

عوسمان نوسراوى كرد بۆكاربەدەستەكانى‌و پێى وتن: (عومەر ڕێو شوێنى بۆ داناون كە لێمان پەنهان نى يە، بەڵكو بە ئامــادەيى ئێمــە دايناوە.[1]

ڕاوێژ بە تەنها لەهەندێ خەڵك دا بەدەر لەوانى تر كورت نەبۆتــەوە، بــەڵكو هــەموو ئەوموســڵمانانەى ئامــادەى مزگــەوت دەبــوون بــە بۆچونەكانيان بەشدارييان دەكرد، پياوبوايە ياخود ئافرەت، گەورەبوايە ياخود بــچوك، بــە مــەرج دانــانى ڕاوێــژو ڕەزامەنــدى تــەنها كــورت نەدەبۆيەوە لە موسڵماناندا، بەڵكو ڕەزامەندى عامەى ناموسڵمانانيش مەرج بوو لەوگرێ بەستانەى لە نێوان ئەوان‌و موسڵمانان دا دەبەسترا، ئەبو عوبەيد دەفەرموێ: (بە هەمان شــێوە ئەگــەر گــەورەى هاوبــەش پەيداكەرانى شارێك گرێبەستێكيان ئەنجام داو ئاشتەواييەكيان لەسەر شتێك گرێدا، ئــەوا باشــترو جێمتمانــەتر ئەوەيــە پەيمانەكــە بەســەر گشتينەياندا تێنەپەڕێ ئەگەر ڕازى نەبوون پێى.

(مكحول) ووتويــەتى: ئەگــەر موســڵمانان دابەزينــە لاى شــورەى شارێك‌و دوژمن داواى سوڵح‌و ئاشتەوايى بكات لەگــەڵ موســڵماناندا بەوپێيەى ماڵەكانى نێو ئەو قەڵاو شورەيە بپــارێزن، ئەمــە ناگوجــێ‌و نابێ بكرێ تاوەكو فەرماندەى سوپا پياوێك دەنێرێ بــۆ نێــو شــوراكەو

---

(١) ئيبن‌و جەرير (٥٩١/٢) , ئەمەش تەئكيدە لەسەر ئەوەى لەوكاتەدا بڕياردەدرا بيروبۆچونى كۆمەڵ‌و زۆرينەى خەڵك بووە.

خەڵکەکەی کۆدەکاتەوەو زانیاریان پێدەدا سـەبارەت بـەو ڕێکەوتنـە، ئەگەر پێی ڕازی بوون ئەوا بەوپێیە ڕێك دەکەون لەگەڵیان ئەگەرنا لە شورای خۆیاندا دەهێڵرینەوەو ئاشـتەواییەکە ناکـەن.... سـەرکردەکانی سوپای موسڵمانان پێش عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ سەرکردەکە ڕێـك دەکـەوت لەگـەڵ کاربەدەسـتانو سـەرکردەکانی قـەڵا بـە پێـی ڕێکەوتنی هەردوولا، بێئەوەی دانیشتوانی تـری شـورەو قەڵاکـە (کـە ڕۆمـــی بـــوون) پـــێی بـــزانن، عومـــەری کـــوڕی عەبدولعـــەزیز ﷺ بەرهەڵستی ئەمـــەی لێ کـردنو فەرمانیـدا بەسـەرکردەو فەرمانـدەی ســوپاکانی کـەکاری پێنەکـەنو هەرکەسـێکیش ئـەوەیان بخاتـەپێش چاوپەسەندی نەکەن، تـاوەکو نوسـراوێك نەنوسـنو پـەیامنێرو چـەند شاهیدێك ئاراستەی سەرجەم خەڵکی قەڵاو شورەکەی نەکەن.

(ئەبوعوبەیـد) دەفـەرموێ: ئەمـە ڕووی ڕاسـتەقینەیە، مەگـەر لەکاتێکدا نەبێت کەشوێن کەوتووان مل کەچی سەرکردەکانی خۆیـان بن، ئـەو گرێبەسـتو ڕێکەوتنانـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەگـەڵ سەرکردەو سەرۆکەکانی خەڵکی نەجرانو جگەلەوانیش ئـەنجامی داون بـەم پێیـە دەخوێنرێنـەوە، وە ئەوانـە بـە ئاگـاداری خۆیـان بـووەو شوێنکەوتەکان لە بۆچونی نوێنـەرەکانیان دەنەچـوونو زۆریـشیان لێ نەکرابوو لەسەری.[1]

---

(١) الأموال ی، ئەبو عوبەید، ل (١٩١ – ١٩٢).

جا ئەگەر ئەمە هەڵسوکەوت بێ لەگـەڵ ناموســـــڵمانانداو، وە ڕازی بوون‌و ڕێککەوتنی هەموویانی پێویست بێ بۆ ئەو گرێبەستانەی کـە سـەرکردەکانیان لەگـەڵ موسـڵمانانـدا ئـەنجامی دەدەن بێئـەوەی زۆریان لێ بکرێ یاناچار بکرێن، ئەوا ڕەزامەنـدی گـشتی موسـڵمانان لەپێشترە، وە نابێ ئیمام بێئەوان هیچ بیروبۆچونێکی بسەپێنێ، وەهیچ ڕایەك بەبێ ڕێکەوتنی (ملأ) یان کەزۆرینە دەرنەبڕن.

عەلی ﷺ دوای ئەوەی کۆچەرو پـشتیوانان هاتنــەلای‌و دەیانویـست بەیعەتی پێبدەن پێی فەرموون: (شتی وا ناکەم، مەگەر لەپێش چاوی هەمووان‌و بەڕاوێژ بێت) [٢] وە پاش ئەوەی خەڵکی بەیعـەتیان پێیـدا فەرمووی: (ئەمـە بەیعەتی گشتی یە، هەرکەسێ بیداتە دواوە، ئـاینی موسڵمانانی نەویستووەو ڕێو شوێنی ئەوانی نەگرتووە). [٣]

کە ئەمەش تەئکیدە لەسـەرئەوەی ئـەم ڕێو شـوێنە بەشـێکە لـە ئایین‌و ڕێو ڕچەی باوەڕدارانەو پێویـستە لەمــەدا شـوێنیان بکـەوین، هەروەکو خوای بالادەست فەرموویەتی: (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيراً) (النساء: ١١٥) واتە ئەوەی دوژمنـایەتی پێغەمبـەر ﷺ بکات‌و لێی جیابێتەوە لە دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست‌و دروستی بۆ ڕوون بوەتەوەو ڕێبازێك بگرێتەبەر کە جیابێت لە ڕێگەو ڕێبازی ئیمانـداران

(١) ثقات ابن حبان ٢٦٧/٢.
(٢) ثقات ابن حبان ٢٦٨/٢

ئەوە ڕووی وەردەچەرخێنن بۆ ئەو ڕوگەو بەرنامەیەی هــەڵی بــژاردووەو ڕووی تیَ‌کردووەو (لەقیامـەتیشدا) دەیخەپنە ناو دۆزەخەوەو دەیسوتێنین کە ئەویش سەرەنجامێکی زۆر ناخۆش‌و سامـناکە.

وە دەست گرتن بەڕای گشتینەی خـەڵکی‌و پابەنـدێتی پێـوە —لـە شتێکدا دەقی تیا نی یە— لەڕێ‌و شوێنی خەلیفەکانی ڕاشـیدینە کـە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە شوێن کەوتنی و وازهێنـان لـە پێچەوانەکەی، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (عليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين المهديين مــن بعــدي، عــضّوا عليهــا بالنواجـذ، وإيّاكم ومحدثات الأمور فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة).[1]

ئەگەر خەڵکی جیاوازیان هەبوو لــە دوو ڕاو بۆچــوندا ئــەوا ئیمـام پێویستی بەزۆرینەی ڕەهایە بۆ بەهێزتر دانانی یەکێك لــەودوو ڕایــە، هەروەك عـومـەر وای کرد کاتیَ هاوەڵان سەبارەت بــەزەوی دەســتکەوت جیاوازی یان بۆ دروست بوو، ئەوەبوو دەکەســی لــە پــشتیوانان بـانگ کرد: پێنجیان لە ئەوس‌و پێنجیان لە خەزرەج، هەمان ڕێگەی گرتەبەر کاتیَ شەش سەرکردەی پاڵاوت بۆجێنشینی لەپاش خۆی، پــاش ئــەوەی موسڵمانان داوایان لــیَ‌کرد کەسێکیان بۆ بپــاڵێویَ کـە بەشایــستەی ئەو کارەی دەزانیَ، عەبدوڵڵای کوڕیشی کردە حەوتەم بە مـەرجیَ بــۆی نەبیَ خۆی بپاڵێویَ بۆ ئەو کارە، زیادکردنی ئەویش بۆ یەکلاکردنەوەی

---

(١) رواه ابـوداود ، ف ژمـاره (٤٦٠٧) و ترمـذي ، ف ژمـاره (٢٦٧٨) وابـن ماجـة ف ژماره (٤٢) فەرمویەتی فەرموودەکە (حسن صحيح)ە.

کارەکەبوو، لە کاتێکدا ئەگەر دەنگەکان یەکسان بـوون هـەروەك لـە (صحیح البخاری)دا هاتووە کە(عەبدوڵڵای کـوڕی عومـــەر چـاودێرو شاهێدە بە سەرتانەوەو لەم مەسەلەیەدا هیـچی بـۆ نـی یـە).[1] لـە گێڕانەوەیـەکی تـردا (واهـاتووە کـە عومــەر فەرمویـەتی) (ئـەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەگەر ئەم خەڵکە -واتە شـەش کەسـەکە- جیاوازی یان تێکەوت ئەوا لەگەڵ زۆرترەکەیاندا بە، ئەگەر سێ‌سـێش بوون ئەوا شوێن ئەو کۆمەڵە بکەوە کە عەبدوڕەحمانی تێدایە).[2]

لە گێڕانەوەیـەکی تـردا هـاتووە: (عومـــەری کـوڕی خـەتتاب ﷺ بـــەخاوەن ڕاوێـــژەکانی فـــەرمووە: لەکارەکانتانـــدا ڕاوێژبکـــەن، ئەگـــەر دوودوو بوون بگەڕێنەوە بۆڕاوێژکردن، ئەگەر چوارو دوو بوون، ئەوا لای زۆرینە بگرن)،[3] ئەو وتەیـەی دەڵـێ: (بگەڕێنـــەوە بـۆ ڕاوێـژکردن) تەئکیدکردنەوەیـــە بـــۆ بنـــەمای دووبـــارە دەنگدانـــەوە لـــە کـــاتی یەکسانبوونی دەنگەکاندا بۆ ئەوەی یەکلابێتەوە.

(ابن شیبە)[4] بە ئیسنادێك بە پێی مەرجی بوخاری فەرمودەیـەك دەگێڕێتەوە لە (موسی بن عقبە) لە نافع ئەویش لە (ابن عمر)ەوە کە عومەر بە(صهیب)ی فەرمووە: (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئامادەکەو

(١) سەیری فتح الباری ٦١/٧ ، ف (٣٧٠٠)بکە ، وە قسەی (حافظ) لە ٦٧/٧ دا.
(٢) تاریخ الطبري ٥٦١/٢.
(٣) طبقات ابن سعد ٤٥/٣.
(٤) تاریخ المدینة ٩٢٥/٣.

له خەلافەتیشدا هیچی بۆ نی یە، بەسەریانەوە پاسـەوان بـە، ئەگـەر پێنجیان بە پیاوێکیان ڕازی بوونو کەسێکیان ملی نەدا ئەوا بەشمشێر سەری بقرتێنە، ئەگـەر چـواریان ڕێککـەوتن لەسـەر ڕازی بـوون بـە یەکێکیان، دوانەکەی تریان ملیان نەدا ئەوا بدەن لەسـەریان، ئەگـەر سێ‌کەسیان بەکەسێك ڕازی بوونو ئەوسیانەی تر بە کەسێکی تر، ئەوا عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر بکەنـە دادوەر، هەرلایـەکیان عەبـدوڵڵا پـشتگیری کـرد بـا یـەکێك لـەوان هەڵبـژێرن، ئەگـەر بـە حـوکمی عەبدوڵڵاش ڕازی نەبوون، ئەوا لەگەڵ ئەوەیان بن کـە عەبـدوڕەحمانی کوڕی عەوفی لەگەڵدایە، ئەوانی تر بکوژن ئەگەر پشتیان دەکـرد لـە کۆدەنگی‌و جێ‌ڕای خەڵکی) .

له گێڕانەوەیەکی تری (ابـن سـعد)دا هـاتووە: (پاشـان لـە ڕۆژی سـێیەم دا دەم سـپی‌و نـاودارانی خـەڵکی‌و سـەرکردەی سـەربازان کۆبکەنەوەو یەکێك بکەن بە ئەمیر، هەرکەسە بەبێ ڕاوێژ ببێتە ئەمیر ئەوا لەملی دەن).(1)

عوسمان پابەند دەبوو بەکردنی ئەوەی خەڵکی گشتینە دەیانویستت، هەروەك لەنوسـراوەکەیدا بۆخـەڵکی کوفـە فەرمویـەتی، کاتـێ کـە داوایان لێی کرد ئەمیرەکەیان (سەعیدی کوڕی عاص) یان بۆ لـەکار بخات، فەرمووی: (پاش (سـوپاس‌و سـتایش) لـە ڕاسـتیدا کەسـێکم

(1) سەیری پێشتر ل ٣٥ – ٣٦ بکە.

کردووه به فەرماندەو ئەمیرتان کە خۆتان هەڵتان بـژاردووه، ســەعیدم لابرد بۆتان، بەخوا هەرچی شت هەیە کە پێتان خۆشــەو بێفــەرمانی خوا نی یە هــەمویتان داواکــردووه، هــەمور شــتێکی ناخۆشــیش کــە بێفەرمانی خوای تیا نی یە لەکۆڵ خۆتان کردۆتەوه، هەرچــی پێتــان خۆشە بۆتانی دەکەم، تاوەکو هیچ بەڵگەتان بەسەرمەوە نەمێنێ).[1]

پیاوە ناودارو خانەداکانی خەڵکی کوفە داوایان لــە عوسمــان کــرد ئاژاوەگێڕانیان بۆ دەرکا، ئەویش بۆی نوسین: (ئەگەر زۆرینەتان لەسەر ئەو ڕایە کۆبونەتەوه ئەوا بیانێرن بــۆلای موعاویــە)[2] وە کــاتێکیش داوایان لە موعاویە کرد کەواز لە ئەمیرایەتی شام بهێنــێ بــەوە (دەم کوتی کردن) بەڵگەی لەسەر هێنانەوه کە (ئەگەر ئەمــە ڕاوبۆچــونی فەرماندەی باوەڕداران‌و کۆمەڵی موسڵمانانە ئەوا لەوبارەوه نوســراویان بۆم دەناردو منیش وازم لەکارەکە دەهێنا).[3]

(قعقاع بن عمرو) ئەوەی کرد بو بە بەڵگە بەسەر (قیس الأرحبــي) — یەکێك لە سەرکردەی شۆڕشگێڕان — کە چۆن کەسە تایبەتەکان ئەبواردرێن لە کاروبارێك کە گشتینەو خەڵکی پێی ڕازی بوونە[4]؟!.

ئەو قسەیەی عومەر: (ئەوانی تــر بکــوژن ئەگــەر پــشتیان کــردە

(١) ابن جرير ( ٦٤٢/٢).

(٢) ابن جرير ( ٦٣٨/٢).

(٣) ابن جرير ( ٦٣٨/٢).

(٤) ابن جرير الطبري ( ٦٥٠/٢).

کۆدەنگیو جێڕای خەڵکی)، وە ئەو وتەیەی کە (لەگەڵ زۆرینەدا بن) و (زۆرینەتان لەسەرئەوە ڕێککەوتن)، هەموو ئەمانــە تەئکیـد لەســەر چەســپاوی ئــەم بنەمایــە دەکەنــەوە لــە گوتــاری سیاســی شــەرعی دابــەزێنراودا. جــا هــەروەکو چــۆن ئومــەت مــافی هەڵبــژاردنی دەسەڵاتدارانی هەیە ئەوانەی کاروبارەکانی بۆ دەبەن بەڕێوە بەو پێیەی بریکاری ئەون، بە پێی دیدی گرێبەستی بەیعــەت، وە مــافی ئــەوەی هەبێ لە ڕاو ئیجتیهاددا بەشــداریان بــێو بــەبێ ڕاوێــژو ڕەزامەنــدی ئومــەت هــیچ کاروبارێــك نەبرنــەوە، وە یــەك لایەنــەو بــەدەر لەئــەم کاروبارەکان یەکالانەکەن – بە هــەمان شــێوە ئومــەت مــافی لــەکار لابردنی ئیمامی هەیەو دەتوانێ لە دەسەڵات دایماڵێ، ئەمەش زانراوەو ئاشکرا بووە لای هاوەڵان ﷺ - لە قۆناغی یەکەمی گوتــاری سیاســی ئیسلامی، ئەمەش بە ئاشکرا لە ووتــارە بەناوبانگەکــەی ئەبوبــەکردا دەدرەوشێتەوە، کە هاتووە تیایدا: (ئەگەر خراپم کرد ڕاســتم بکەنــەوە، گوێڕایەڵم بن تاگوێڕایەڵی خوادەکەم لەنێوتاندا، ئەگــەر بێفــەرمانیم کرد ئەوا گوێڕایەڵیم پێویست نابێ لەسەرتان).(١)

شۆڕشگێڕەکان ئەوانەی دژ بە عوسمان ڕاپەڕین داوایــان لێــی کــرد خۆی لە خەلافەت داماڵێو دەست لــەکار بکێــشێتەوەو واز لەئومــەت بهێنێ کە کەسێکی تر هەڵبژێرێ، عوسمانیش ﷺ ئەشتەری نەخــەعی

(١) سەیری پێشتر بکە.

بانگ کرد که سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕان بوو ڕایەخ‌و سـەرینێکی بـۆ داناو پێی ووت: (ئەی ئەشتەر، خەڵکی چی لەمن دەوێ ؟ ووتی سـێ شت که دەبێ یەکێکیان هەربکەی، عوسـمان فەرمووی چین ؟ ئەشتەر ووتی: (سەرپشـــــکت دەکەن لەوەدا یـا دەبـێ کارەکـــەیان[1] بـۆ بـەجێ بهێڵـیو بڵـێی ئـەوە کاروبـاری خۆتانـە کێتـان دەوێ بـۆی هەڵبژێرن، وە لە نێوان ئەوەی تۆڵـە لـە خـۆت بـسێنی، ئەگـەر ڕێ ئەدەیت ئەوا ئەو خەڵکە شەڕت لەگەڵ دەکەن، عوسمانیش فـەرمووی: (یەکێکیان هەردەبێ بکەم؟ ئەویش ووتی: یەکێکیان هەردەبێ بکەی، عوسمانیش فەرمووی: ئەوەی که کاروبارەکەیان بۆ بەجێ بهێڵم، ئەوا من پۆشاکێك داناکەنم که خودا پێی بەخشیوم،[2] گێڕەرەوەکە (ابن عون)ە وتویەتی: کەسانی تر جگە لە حەسەن دەڵێن عوسمان وتویەتی: بەخوا، ئەگەر بچمە بەردەمیان‌و لە ملـم بـدرێ پـێم خۆشـترە لـەوەی واز لـە کاروباری ئوممەتی موحەممەد بهێنم‌و دەست درێژی بکەنە سـەریەکتری، (ابن عون) که گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیەیە لە حەسەنەوە دەگێڕێتەوە وتویەتی: (وتویانە: ئەمە زۆر بە قسەی عوسـمان دەچـێ، عوسـمان

(١) سەرنج لەوتەی (کارەکەیان بۆبەجێ بهێڵی, تخلع لهم امرهم) کە ئاماژەی بنەمای کاروبار بۆ ئوممەتەو خەلیفەکانیش تەنها بریکاریانە.

(٢) ئـەم گێڕانەوەیـە لـەوەوە نەسـەلماوە، چـونکە وەك پاشـتر باسـی دەکـەین کـە ئـەو ڕاوێژی بە هاوەڵان کردووە سەبارەت بەدەست لە کار کێشانەوەو خۆلابردنی, بەڵکو ئەوەی دروستە ئەوەیە کە ئەو ترساوە لـەوەی ئەگـەر خـۆی لاببـات خـەڵکی نـەتوانن لەسەر یەکێك کۆك بن‌و پاشان ئاژاوە ڕووبدات.

فەرموبوی: ئــەوەی تۆڵــە لــەخۆم بــسێنمەوە(*) بــەخوا دەزانم هــەردوو هاوڕێکەم تۆڵەیان لەخۆیان دەکردەوە بەڵام جەستەی من بەرگەی تۆڵە کردنەوە ناگرێ، ئەوەشی کە بمکوژن، بەخوا ئەگەر بمکوژن، هیچ کــات دوای من یەکتریتان خۆش ناوێو هەمووتان پێکــەوە نوێژناکــەنو لــە دوای منــیش هــەمووتان پێکــەوە شــەڕ لەگــەڵ دوژمــن ناکــەن)،(1) لەڕاستیدا عوسمان سەبارەت بەوداوایەی کە شۆڕشگێڕەکان بۆ لە کــار لابردنی ئەو خستیانەڕوو ڕاوێژی بە عەبدوڵلای کــوڕی عومــەر کــرد، ئەویش ئاماژەی بەوەدا کــە ئــەوە نــەکات(2) بــۆ ئــەوەی نەبێتــە بــاوو سوننەتێك، هەرکاتێك هەندێ لە خــەڵکی حــەزیان بــە ئەمیرەکــەیان نەکرد بچن بیکوژن یا لەکاری خەن، تەنانەت ئەگەر زۆرینەشی لەگەڵ بێت، هەروەك عوسمان (ﷺ) بەوشێوە بووە کە ئەو زۆرینــەی هــاوەڵانی ئەهلی حەللوعەقدی لەگەڵدابوو، وەکەمینــە بــۆی نیــە بیروبۆچــونی خۆی بــسەپێنێ بەســـــەر ئومــەت دا، هەربۆیــە عەبــدوڵلای کــوڕی

---

(*) نەسڵی ئەم گێڕانەوەیە نیبنوعەون لە حەسەنەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام لە ڕێگەی تریشەوە هاتووە وەك لە سەرەوە ئاماژەی پێکراوە(وەرگێڕ).

(1) (خلیفە بن خیاط) لە (تاریخ)ەکەیدا ل (170) و (ابن سعد) لە(الطبقات 53/3) و(ابن ابی شیبە) لە (المنصنف) (441/7) دا، لە (اسماعیل بن علیە عن ابن العون عن الحسن البصري) وتویەتی (وثاب مولی عثمان بن عفان) هەواڵی پێداوم ئەم ئیسنادە زنجیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زانا فەرموودەناسەکان، هەروەها (ابن جریر 664/2) بە هەمان سەنەد دەیگێڕێتەوە

(2) طبقات ابن سعد (48/3) و تاریخ الخلیفة ل (170)، احمد لە (الفضائل)دا (473/1) بە سەنەدێکی سەحیح.

عومـــەر ﷺ عوسمـــانی ئاگـــادارکردەوە لـــەوەی دانەبەزێتەســـەر حـــەزو ئارەزووەکانیـــان تـــاوەکو نەبێتـــە باووســـوننەت کەکەمینـــە ڕای خـــۆی بسەپێنیٚ بەسەر زۆرینەدا.

عوسمانیش ﷺ پێـشوازی لـە نوێنـەرەکانی میـسر کـردو وتوێـژو گفتوگۆی لەگەڵ کردن‌و ئەوانیش مشتومڕیان لەگەڵی کرد، عوسمان پێی وتن: (چیتان دەویٚ ؟ گێڕەرەوە وتویەتی: ئەوانیش پەیمانیان لـــیٚ وەرگرت‌و چەند مەرجێکیان لەســـەری نوســـی، ئـەویش پـەیمانی لـــیٚ وەرگرتن – کـە بیٚفـەرمانی نەکـەن‌و لـە کۆمـەڵ دانـەبڕیٚن مـادەم مەرجەکانیان بۆ ڕاپەڕێنیٚ – پاشان فەرمووی چـیتان دەویٚ؟ وتیـان: خەڵکی مەدینە بەخششیان پیٚنەدریٚ چونکە ئەم سامانە بۆکەسێکە لەســـەری جـەنگاوە، وەبۆئـــەم پیـــاوە بـــەڕێزو بەتەمەنانـــەی هـــاوەڵاتی پێغەمبەرە ﷺ، فەرمووی هەرهەموو بەوە ڕازی بوون) [1].

لەنێوانیشیاندا عـــەلی ﷺ و جـابری کـوڕی عەبـدوڵلای ئەنـساری هەبووە وەك ناوبژیوان، عەلی پێی فەرموون: (بـە کتـابی خـوا بـەڵێن

---

(١) احمد لـه (الفضائل ٤٧٣/١) و عبدوڵلای کوڕی لـه (زوائد)ەکەیدا کـه خستویەتیە سـەری، ٤٧٠/١و (ابـن ابـي شـيبة ١١٣٢/٣) و(ابـن جريـر ٦٥٥/٢)و ابـن حبـان لـه (صحيحه)ەکەیدا ف ژمارە ٦٩١٩، هەموویان له (معتمر بن سليمان عن ابية عن ابي نضرة عن ابي سعد مولى اسير الأنصاري، ئەمە سەنەدێکی (صحيح)ە (ابو نضرة) (منذر بن مالك العبدي)ە (ابو سعيد)یش هەندێك بەهاوەڵ باسیان کردووە،هەروەك لـه (الإصابة ٩٩/٤)دا ئامارەشـی بـەم فەرمودەیـە داوە، وە (ابـن شيبة ١١٣٨/٣) لـه ڕێگەیـەکی تـری (صـحيح)ەوە لـه (ابـو نـضرة)ەوە فەرمودەیـەکی لـەم شـێوەیە دەگێڕێتەوە.

دەدەن‌و سەرکۆنەی هەرشتێ دەکەن کە پێــی ڕازی نــین، پاشــان چــەند کەسێکی دیاریان لەگەڵی هاتن‌و لەسەر پێنج شــت ڕێــك کــەوتن: - دوورخراوە بگەڕێتەوە، بێبەشکراو پێی بدرێ، دەست کەوت زۆر بکرێ، لە دابەش کردندا دادگەری ڕەچاوبکرێ، کەسی ئەمیندارو خــاوەن ڕێــز کاربەدەستی پێبسپێردرێ، وە (ابن عمــر) بگەڕێنرێتــەوە بــۆ بەســرەو ئەبوموساش بۆ کوفە، ئەمەشیان لە نوسراوێکدا نووسی) [1].

لە گێڕانەوەیەکی تــرو لــە فــەرمودەی جــابری کــوڕی عەبــدوڵڵادا هاتووە کە عوسمان ﷺ پێــی ووت: (اعطهــم علــيّ الحــق) بێانــدەرێ‌و مافەکانیان لەسەر من، وە من پاشگەز دەبم لە هــەموو ئــەو شــتانەی ئومەت پێی ناخۆش بووە). جابر فەرموویــەتی: (لەســەر حــەق‌و ڕەوا ڕێکەوتین، لەسەرئەوەی هەموو دورخراوەیەك بگێڕینەوە، بەشی هەموو بێبەشکراوێك بدەین، وە لەناو گشتینەدا بە کیتــابی خــواو ســوننەتی پێغەمبەر ﷺ کار بکەین)[2].

(ابن جریر) لە (واقدی) مێژوونوسەوە دەگێڕێتەوە کە میسرییەکان جارێکی تر گەڕانەوە، پاش ئەوەی نوســراوێکیان دۆزی یــەوە فــەرمانی

(۱) (ابن خیاط) لە (تاریخ )ەکەیدا ل ۱٦۹ – ۱۷۰ گێڕاویەتیەوە لە ئیسماعیلی کوڕی عەلیە لە ئیبن‌و عەون ئەویش لە حەسەنی بەسرییەوە، ئەمەش ئیسنادێکە زنجیرەبەندە بە پێشەوا جێمتمانەکانەوە، وە (ابن شبە) ۱۱۳۷/۳ لە ڕێگەی ئیبن‌و عەونەوە هاووێنەی ئەمەی باس کردووە بە ئیسنادێکی (سەحیح) موحەممەدی کوڕی سیرینیش هاووێنەی ئەمەی باسکردووە

(۲) ابن شیبە ۱۱۳۵/۳ بە سەنەدێکی سەحیح.

سزادانی تێدابوو، عوسمانیش ﷺ نەریی ئەوەی کرد زانیاری بەشتێکی وەها هـەبێ، پێیـان ووت: (نـاکرێ بگەڕێینـەوە تـاوەکو لات نـەبین‌و یەکێکی تر لە هاوەڵانت نەخەینە شوێنت کە وەك تۆمان لــێ‌نەکات، جێنشینایەتییەکەمان بۆبگێڕەوەو واز لە کاروبارمان بێنە) [1].

ئەوان جێنشینایەتی (خلافة) و کاروبار (الامر)یان بـەهی خۆیـان دادەنا، کە ئەمەش تەئکیدکردنەوەی مافی نەتەوەیە لـە هەڵبـژاردنی خەلیفەو بەشداری پێ‌کردنی لەکاروبارەکاندا.

عوسمانیش پێی ووتن: (ئەگەر بینیتـان ڕەوایـە هـەردووپێم بخەنـە کۆتێکەوە ئەوا بیکەن)[2] لەبەرئەوەی بریکاری ئوممەتە، هەر ئەویـشە مافی دەسەڵات پێدانی پێ بەخشیوە، هەواڵەکان زۆرو زەوەندن لەسـەر ئەوەی عوسمان فـەرمانی دا بەوانـەی کەدەیانویـست شـەڕی بـەرگری لەسەر بکەن کە دەست بگرنەوەو شەڕ نەکەن.[3]

(عەلی)ش ﷺ پاش ئەوەی خەڵکی بەیعەتیان پێیـدا فـەرمووی: (ئەمە کاروباری خۆتانە مافی هیچ کەسێکی تێدا نی‌یە مەگەر ئێـوە

---

(١) الطبري ٦٦٧/٢ واقدی بە ئیسنادێك گێڕاویەتی‌یەوە کە کەسەکانیان جێ‌متمانەن جگە لە (سفیان بن ابي العوجاء) نەبێ کە هەندێ بە لاوازو هەندێ بەجێی متمانە باسیان کردووە.

(٢) احمد لە (الفضائل ٤٩٣/١) وعبداللەی کوڕیشی لە(زوائد)ەکەیدا ٤٩٦/١و (ابن ابی شـیبة) لــە (المـصنف ٥٢٢/٧)داو (خلیفـة بـن خیـاط) لــە (التـاریخ )ل ١٧١ بــە ئیسنادێکی سەحیح لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلم هێناویەتی.

(٣) خلیفة بن خیاط ل ١٧٣ – ١٧٤.

فەرمانی پێبدەن، دوێنــێ ئێــوارە لەســەر شــتێ جیابوینــەوە، ئەگــەر دەتانەوێ بەو شێوەیە، دەیکەم ئەگینا هیچم بەسەر کەسەوە نیە)[1].

هەموو ئەوشتانەی عوسمانو عەلی بەڵگەیە لەسـەرئەوەی لابردنـی خەلیفە مافی ئەو خەڵکەیە کـە هـەڵی بـژاردووە، عوسمـانیش کاتـێ داخوازیو وەسیەتەکانی ئاژاوەگێڕانی پەسەن نەدەکرد لەبـەر ئـەوەبووە ئەوان هەموو ئومەتو خەڵکی نـەبوون، بـەڵکو هـاوەڵانو گـشتینەی موسڵمانان لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کـە عوسمـان خـۆی لـە خەلافـەتو جێنشینی دامالێ، خۆیشی ترساوە لەوەی کـە ئەگـەر خـۆی دامالــێ لەوکارە ئەمـە سەربکێشێ بۆڕوودانی ئاژاوەی گـەورەو ئـەم ڕەفتـارەش پاشتر ببێ بەباوو هەر کۆمەڵۆچکەیەك بیروبۆچونێکی هەبێ بـەهێزی چەك بیسەپێنێ بەسەر ئومەتدا، بەمـەش کاروبـاری دەوڵـەت ڕێـكو ڕاست نەبێو کاروباری ئومەتیش بەم شێوەیە چاکساز نەبێ.

ئەگەر گەورە هاوەڵان داوایان لێی بکردایە واز لە دەسـەڵات بهێنــێ دوودڵ نەدەبوو تێیــدا، عوسمــان بەوانــەی (کــە داوای کــەنار خــستنی ئەویان دەکرد) نەیدەووت: (حەڵاڵ نی یە بۆتان ئەم داوایە بکەن، هــیچ یەك لەهاوەڵانیش وای نەووتوە، یەکەم ووتارێکیشی کە پاش بەیعــەت پێدان، دای ئەمە بو (پاش سوپاسو ستایش، لـە ڕاسـتی دا بـارێکی قورسم خراوەتە سەرشانو پەسەندیشم کـردوە، ئاگـادارین مــن شــوێن کەوتــەم نــەك بیدعەچــی، ئێــوەش پــاش کیتــابی خــواو ســوننەتی

(1) ابن جریر ۲/۷۰۰.

پێغەمبەرەکەی ﷺ سێ ئەرکتان لەسەرمە:

١/ شوێنکەوتنی ئەوانەی پێش خۆم، لە شتێکدا کە کۆبن لەسەری‌و بیگرنەبەر.

٢/ دانـانی ڕێو شـوێنی چـاکەخوازان لـەو شـتانەی بـە ئاگـاداری زۆرینەی ئێوە دانەنرێ.

٣/ وازتان لـێ بهێنم مەگەر شتێك خۆتان بە پێویستی بزانن)[1].

لێرەدا عوسمان پابەندبووە بەوەی شوێنی ئـەو شـتانە بکـەوێ کـە کۆبونەتـەوە لەسـەری‌و لەسـەردەمی هـەردوو خەلیفـە ئەبوبـەکرو عومەردا داهێنراون، وەڕێو شوێنە نوێیەکانیش کە لە ڕێی کۆمـەڵی هاوەڵان‌و بە ڕاوێژی ئەوان دادەنرێ، نابێ بەبێ ئەوان هیچ کارێك یەکلا بکرێتەوە، (ملأ) یش بریتی یە لە کۆمـەڵ‌و ئـەهلی حـەلل‌و عەقـدی ئەوان، ئەگەر هاوەڵان (خوایان لـێ ڕازی بێت) ڕێك بکەوتنایە لەسەر ئەوەی ئەو وازبهێنێ لە خەلافەت ئەوا عوسمان ﷺ وای دەکرد. عەلی- پاش ئەوەی بەیعەتیان پێیـدابینی هەنـدێ لـە خـەڵکی نـاکۆکن لـە سەری- بۆیـە فـەرموی: (ئـەم بەیعەتـەم لـەکۆڵ بکەنـەوە، کێتـان پێ‌خۆشە ئەوە هەڵبژێرن)[2].

---

(١) ابن جریر لە ٦٩٣/٢ گێراویەتی یەوە لە گێڕانەوەی ( سیف بن عمر التمیمی)ی مێژوو نووس لە ( قاسم بن محمد عن عون ابن عبدالله بن عتبة ؟!) دیارە لەم ئیسنادەدا کەوتن (سقط)ێك هەیە، چونکە (سیف) لە (قاسم)ەوە بە هۆی (سهل بن یونس )ەوە فەرمووده دەگێڕێتەوە، کە لێرەدا دیار نی یە).

(٢) ثقات ابن حبان ٢٧١/٢.

ئەبوبەکریش لە دووەم ووتاری پاش بەیعەتـدا فـەرمووی: (ئەمـە کاروبـــاری خۆتانـــە بۆخۆتـــان، کێتـــان پێخۆشـــە ئـــەوە بکەنـــە سەرپەرشـــتیارتان، وە من بەدەمتانەوە دێمو وەکـو یـەکێك لـە ئێـوە دەبـــم)[1].

عوسمـانیش بەعەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەری فـەرموو: (خـەڵکی خۆشیان لێم نایەت، منیش دەمەوێ لە خۆمی داماڵم یا لێی دەرچـم، عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر فەرمووی: وامـەکە)[2].

(١) ثقات ابن حبان ٢/١٦٠، سەنەدەکەی باس نەکردووە، (احمد)یش شتێکی لەم شێوەیەی لە (فضائل الصحابة ١/١٣١-١٣٢)دا باس کردووە، عەبدوڵڵای کوڕیشی لە (زوائد)ەکەیدا ١/١٣٣ لە چەند ڕێگەیەکەوە قسەی لەسەر هەیە، هێناویەتی.

(٢) ابن ابي شبة ٤/١٢٢٤ بە سەنەدێکی (جید).

٦- ڕاوێژ بەبێ ئازادی نابێ:

هەروەك چۆن ئوممەت مافی هەڵبژاردنی ئیمـامو بەشـداری کردنـی بیروبۆچونەکانیو مافی لەکار لابردنیشی هەیە، بەهەمان شێوە مافی ئەوەی هەیە ڕەخنەی لێ بگرێو ئامۆژگاری بکاو ڕێگری سیاسەتەکانی بکا، ئازادی سیاسی یەکێکە لەو دوو بناغەیەی گوتاری سیاسی لـەم قۆناغەدا لەسەری ڕاوەستاوە بەوپێیەی تەمـسیلی ڕێنوێنیـە ئایینیـە دابەزێنراوەکان دەکا.

ئازادی بە جوانترین شێوەو ڕوخسار لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەسـەردەمی خەلیفـەکانی ڕاشـدیندا ﷺ بەرجەسـتەبوو، قورئـانیش بنەمای- (لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ)(البقرة: ٢٥٦) زۆرکردن لە ئایینـدا نیەـی چەسپاندو بۆ ئـەوەی تەئکیـد لەسـەر بنـەمای ئـازادی بکاتـەوە لـە سەرجەم وێنەو شێوەکاندا، لە کاتێك دا ئەگەر خوای بەرزو بالاّ زۆر لە بەندەکانی نەکات بۆ ئەوەی باوەڕی پێبهێننو گوێ ڕایەڵی بکەن، چۆن وێنـای ئـەوە دەکـرێ بەنـدەکانی ناچـاربکرێن بـەوەی مـل کەچـیو گوێڕایەڵی مرۆڤەکانی تر بکەن ؟!

ئەمـەش مانای ووشـەی (لاإله إلاالله)یە، تەنها خوای گـەورە مـافی پەرستراوێتی هەیە، پاشان هەموو دروستکراوەکانی تر مـرۆڤنو هـیچ کەس مافی گوێڕایەڵیکردنی ئەوی تری نیە مەگەر لـە گوێڕایـەڵێتی خوادا بێت، هەربۆیە دەقەکان کاتێـك دێـن، گوێڕایـەڵیکردن کـورت

دەکەنەوە لـە گوێڕایـەڵی کردنـی خـوای باڵادەسـتو شـوێن کـەوتنی پێغەمبەرەکەی ﷺ ، هـەروەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویـەتی: (لاطاعة في معصية الله، إنما الطاعـة بـالمعروف)[1] گوێڕایـەڵی لـە بێفەرمانی خوادا نیە بەڵکو تەنها لە چاکەکاریدایە، وە فەرمویەتی: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)[2] واتە (لە بێ فـەرمانی خـوادا گوێڕایەڵی بۆ هیچ کەسێ ناکرێ)، بۆ ئەوەی بەمە تەئکید لەسەرئەوە بکاتەوە کە مافی گوێ ڕایەڵیکردن تەنها لە شتێکدایە کە بـە ڕوونو ئاشکرایی گوێڕایـەڵی کردنـی خوایـە، بـەم شـێوەیە ئیـسلام دەسـت پێشخەری بووە بەسەر سەرجەم یاساکانی تـردا لـەکۆتو بەنـدکردنی مـافی دەسەڵات لەگوێڕایەڵی کردنـدا، بـەوەی گوێڕایـەڵی بـۆکردنی ڕەهانیـیە، وەگـوێ ڕایـەڵیکردن لەبـەر خـودی دەسـەڵات خـۆی نیـە، کاتێکیش دەسەڵات فەرمانیدا بەخراپە یا ستەمی ئەنجام دا ئەو کاتـە مـــافی گوێڕایـــەڵی لەدەســت دەداو ونــی دەکــا، بـــەڵکو پێویـــستە ڕووبـەڕووی ببینـەوەو ڕاسـتی بکەینـەوە هـەروەك پێغەمبـەر ﷺ فەرمویەتی: (من رأى مـنكم منكـراً فلـيغيره بيـده، فـإن لم يـستطع فبلسانه...)[3] هەرکەسێ لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بـە دەسـتەکانی بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی ئەوا بە زمانی... هەروەها فەرمویـەتی: (إن

(١) رواه بخاري ف ژمارە (٧١٤٥) و مسلم ف . ژمارە (١٨٤٠).
(٢) ئەحمەد ریوایەتی کردووە ( ٦٦/٥ – ٦٧) بە سەنەدێکی سەحیح.
(٣) مسلم گێڕاویەتیەوە ف ژمارە (٤٩).

الناس إذا رأو الظالم فلم يأخذوا على يده عمهم الله بعقابه) [1] خەڵکی ئەگەر ستەمکاریان بینیو دەستیان نـەگرتو ڕێگریـان لێـی نـەکرد خوای گەورە بە گشتی سزایان دەدات، وە فەرمویـەتی (أفـضل الجهـاد كلمة الحق عند سلطان جائر) [2] چاکترین جیهادێك ووتنـی ووشـەیەکی ڕەوایـە لای سـوڵتانێکی سـتەمکار، هـەروەها فەرموویـەتی: (سـيّد الشهداء حمزة، و رجل قام إلى إمام جائر فأمره ونهاه، فقتلـه) [3] واتـە سەرکردەی شەهیدان حەمزەیـەو وە پیاوێکـە دەچـێتەلای ئیمـامێکی ستەمکارو فەرمانی پێدەکاو بەرهەڵستی دەکـا، ئـەویش ئـەیکوژێ، وەفەرمویەتی (إذا رأيت أمتي تهاب أن تقـول للظـالم: ياظـالم – فقـد تودع منها) [4] ئەگەر ئوممەتەکەم گەیشتە ئـەوەی بترسـێ لـەوەی بـە

(١) ئەحمـەد گێڕاویـەتی یـەوە /٧، (ابـوداود) ف ژمـارە (٧٣٣٨) (ترمـذی) (٢١٦٨)و فەرمویـەتی (فەرمودەیـەکی حەسـەنی سـەحیحە) و (٣٠٥٧) (إبـن ماجـة) ف ژمـارە (٤٠٠٥) (إبن حبان) بە(صـحيح)ی دانـاوە ژمـارە(٣٠٤) هەمووشـیان ئـەم فەرمودەیـە دەدەنە پاڵ ئەبوبەکر (خوای لـێ ڕازی بێت).

(٢) ئەحمـەد گێڕاویـەتی یـەوە (٥/ ٢٥١ و ٢٥٦ و ١٩/٣ و ٦١ و ٣١٥/٤) و ئـەبوداود ف ژمارە (٤٣٤٤)، ترمزی، ف ژمارە (٢١٧٥) وئیبنو ماجة، ف ژمـارە (٤٠١١) نەسـائی (١٨٧/٢) لـە ڕێگـەی کۆمـەڵێك لـە هاوەڵانـەوە، ئـەلبانی بـە (صـحيح)ی دانـاوە لـە (الصحيحه)دا ژمارە (٤٩١).

(٣) حاکم گێڕاویەتیەوە ١٩٥/٣ وە فەرمویەتی ( ئیسنادەکەی سەحیحە)، ئەلبانیش لـە (الصحيحه)دا بە ژمارە(٣٧٤) بە (صحيح)ی داناوە.

(٤) ئەحمەد گێڕاویەتی یەوە (١٦٣/٢ و١٩٠)، (هیثمی) لە (مجمع الزوائد) (٢٧٠/٧)دا دەڵـێ (ئەوانـەی گێڕاویانەتـەوە کەسـانێکن کـە فـەرموودی دروسـت (صـحيح) دەگێڕنەوە.

ستەمکار بلێ ئەی ستەمکار ئـەوا دەسـتی لێ بـشۆ، وە فەرمویـەتی (لتأخذن على يد الظالم، ولتأطرنه على الحق أطرا، ولتقصرنه على الحق قصراً، أو ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعض ثـم ليلعنـنكم كمـا لعنهم)[1] یان دەبێ دەستی سـتەمکار بگـرنو نـەهێڵن سـتەم بکـاو پابەندی دەکەن بە حەقو ڕەواوە یـا ئـەوەتانێ خـودا دڵتـان لەئاسـتی یەکتری تێك دەداو وەکو ستەمکارەکان بەرنەفرین دەکەون.

دەسەڵاتیش لەلایەن ئومەتـەوە لێپرسـراوو بەرپرسـە لـەو هـەڵسو کەوتانەی دەیکات هەروەك لە فەرمودەدا هاتووە: (كلكـم راع وكلكـم مسؤول عن رعيته، فالإمام راع وهو مسؤول عن رعيته)، قورئـانیش تەئکید لەسەر ئەم بنەمایە دەکاتەوە لەو فەرمودەیەیدا کە بـاس لـە تایبەتمەندێتی ویستی ڕەهایانەی خودا دەکا کە هاوبەشی نیـە، کاتـێ فەرمویەتی: (لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَـلُ وَهُـمْ يُسْأَلُونَ) (الانبياء: ٢٣)، تـەنها خوایە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێ لە شتێکدا کە دەیکا، بـەڵام جگـە لەو ئەوا هەموو کەس لێپرسراوە لەو شتانەی کـە دەیکـا لـە دونیـاو دوارۆژدا.

(١) ئـەبوداود گێڕاویـەتی یـەوە، ف ژمـارە (٤٢٣٦) و (٤٣٣٧)، و (ترمـذي)، ف ژمـارە (٣٠٥٠) و ئیبنو ماجـە، ف ژمارە (٤٠٠٦)، ئەحمـەد ٣٩١/١، لـە فـەرمودەی ئیبنو مەسعودەوەو ترمذي بە (حسن)ی داناوە، پاڵپشتێکی تری هەیە لە فەرمودەیەکی ئەبوموسـای ئەشـعەریدا، (هیثمـي) لـە (مجمـع الزوائـد) (٢٩٦/٧)دا ووتویـەتی: (طبرانـی) گێڕاویـەتی یـەوەو (گێڕەرەوەکـانی لـەو کەسـانەن فـەرمودەی دروسـت دەگێڕنەوە).

بۆیـە دەبیـنین ئـازادی لـە ڕوونترین شـێوەیدا لـەم قۆناغـەدا دەدرەوشێتەوەو بەدەردەکەوێ، ئەوەتانێ کەسانێك لە مەدینەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ناخەوە دوژمنایەتی یان دەکردو فـرتو فێڵیان بەرامبەری ئەنجام دەدا وەکو دووڕووەکـانی مەدینـە، پێغەمبـەر ﷺ دەیـانی ناسـی، بـەڵام هیـچی لـەدژ نـەکردن، لـەبارەی سەرکردەکەیانەوە (عبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) قورئان ئـەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾ (المنافقون: ٨) واتـە دووڕووەکـان ئـەڵێن: ئەگـەر گەڕاینـەوە بـۆ مەدینە ئەوا سەربەرزو بەڕێزەکانمان (مەبەستیان خۆیانـە) سەرشـۆڕو بێڕێزەکـان دەربـەدەر ئەکـەین (کـە مەبەسـتیان پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵەکانە)، ئەمەش نیازو بڕیارە بۆ ڕوخاندنی دەوڵـەتی ئیـسلامیو دەرکردنی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە، لەگەڵ ئەوەشـدا پێغەمبـەر ﷺ هیچی لێ نەکرد، بەڵکو پاش ئەوەی ئەم هەواڵەی عەبـدوڵلای کـوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی پێگەیشتو هەندێ لە هاوەڵان ویستیان بیکوژن، ئەو فەرمووی: (لا بل نحسن صحبته) (نەخێر بەڵکو هاوڕێیەکی بـاش دەبین بۆی) وە فەرمووی: (لايتحدث الناس أن محمداً يقتل أصحابه)[1] با خەڵکی نەڵێن موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت.

(ابـن سـلول) گەیـشتبووە ئاسـتێك، لـە ڕۆژی ئوحـدا سـێیەکی

(١) بوخاری، ف ژمارە (٤٩٠٥) و فتح الباري ٦٤٩/٨ – ٦٥٠.

سوپاکەی گەڕاندەوەو پێغەمبەری بەجێهێشت لـە کاتێکـدا دەیویسـت بەرەو جەنگ بڕوا[1]؟!

پیاوێك ڕەخنە لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەگـرێ لەکاتێکـدا کـە سەروەت‌و سامانی جەنگ بەشـدەکاو پـێی ئـەڵێ: (دادگەربـە ئـەی موحەممەد، تۆ دادگەریت نەکرد! ئەمجۆرە بەشکردنە لەبەر خوا نەبوو!) پێغەمبەریش ﷺ فـەرمووی: (دەك تیاچـی! کـێ دادپـەروەری دەکـا ئەگەر من نەیکەم؟) هـاوەڵان ویـستیان لێـی دەن پێغەمبـەریش ﷺ فەرمووی: (پەنا بەخوا لەوەی وای لـێ بێت خەڵکی بڵێن من هـاوەڵانم دەکوژم)[2].

پیاوێکی جولەکە بەپێغەمبەری خوای ووت – لەکاتێکدا ئەو لەناو کۆڕی هاوەڵانیدا بوو-: (ئەی نەوەی عەبدولموتتەلیب ئێـوە خـەڵکێکی قەرز کوێرن) واتە مافەکان نادەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سـەروەت‌و سامانێکی بەسـەلەم (سـەلەف) لـــێ وەرگرتبـوو، عومــەر ویـستی لەجولەکەکە بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئێمـە شـتێکی ترمان لە تۆ دەوێ ئەی عومەر، فەرمانی پێبکـەی بـە جـوانی داوای خۆی بکات، فەرمانیش بەمن بدەی بە جوانی بیدەمەوە)[3] عومەریش

(١) سەیری (البدایة والنهایة) ١٤/٣ بکە.

(٢) بوخاری گێڕاویەتی یەوە، ف ژمارە (٣١٣٨) بەکورتی، موسلم، ف ژمارە (١٠٦٣) و (١٠٦٤) بەدرێژی.

(٣) (إبن حبان) گێڕاویەتیەوە، ف ژمارە (٢٨٨)، حاکم ٦٠٤/٣ – ٦٠٥

لە ئاشتی حودەیبیەدا بەرهەڵستی پێغەمبەری خوا ﷺ ی کردوو پێی فەرموو: (بۆچی لە ئایین دا سەرشۆری قەبوڵ بکەین[1]؟! بە هەمان شێوە بارودۆخ لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین بەوشێوەیە بووە، موسڵمانان بەرهەڵستی سیاسەتی خەلیفەکانیان دەکردو ڕەخنەیان لە ڕەفتارەکانیان دەگرت، کەسیش بەهۆی ئەم بەرهەڵستی کردنانەوە تووشی ئازار نەدەبوو، ئەمەش بەڵگەی چەسپاندنی بنەمای ئازادی سیاسی یە، پاش ئەوەی ئەبوبەکرﷺ بوو بە خەلیفە ووتارێکی داو تیایدا فەرمووی: (ئەگەر چاکەم کرد هاوکاریم بکەن، ئەگەر هەڵەشم کرد ڕاستم بکەنەوە) بۆ ئەوەی تەئکید بکاتەوە لە بنەمای ئازادی سیاسیو مافی ئوممەت بۆ ڕەخنەکردنی سیاسەتی ئیمامو هەڵسەنگاندنی.

بەهەمان شێوە ئەو گفتوگۆو پەیڤینەی لە نێوان کۆچەرو پشتیوانان لە سەقیفەدا ڕویدا سەبارەت بە کاروباری خەلافەت نمونەیەکە تەئکید لەسەر مەودای ئەو ئازادی یە سیاسی یە دەکاتەوە کە هاوەڵان پیادەیان کردووە، ناکۆکیەکانی نێوان کۆچەرو پشتیوانەکان سەبارەت بەوەی کێ دەسەڵات دەگرێتە دەست لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕوونو ئاشکرابوو تاوەکو گەیشتنەئەوەی حەبابی کوڕی مونذری ئەنساری لەو ڕۆژەدا بڵێ: (ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە ئێوە) ئەبوبەکریش بەم

(١) بوخاری، ف ژمارە (٣١٨٢) .

وتەیە وەڵامی دایەوە: (ئێوە ئاشنان بەوەی ئەم هۆزی قورەیـشە پلـەو پایەیەکیان لەنێو عەرەبدا هەیە کە ئەوانی تـر نیانـە، خـەڵکی مـل کەچی بۆ کەسێ لەوان دەردەبـڕێ) لـە گێڕانەوەیـەکی تـردا هـاتووە: (عەرەب ئەم کارە بۆئەم هۆزی قورەیشە بەگونجاوتر دەبینێ)[1].

ئەبوبەکر ﷺ ئەوەی کرد بە بەڵگە کە عەرەب - واتە موسـڵمانان، چونکە ئەوکاتـە هـەر ئـەوان موسـڵمان بـوونو مـافی هەڵبـژاردنی دەسەڵاتیان هەبوو — ڕازی نابن بە جگە لە قورەیش بەهۆی ئـەو پلـەو پایەیەی کە هەیانبوو لـەناو عەرەبـدا، لـە دەرەوە قـورەیش، هـەموو عەرەب وەکو یەك یەکسان بوون.

عومـــەر بەرهەڵـستی ئەبوبـەکری کـرد کاتـێ ویـستی لەگـەڵ هەڵگەڕاوەکاندا بجەنگێ، بەردەوام ئەبوبەکر مـشتومڕی بـوو لەگـەڵ هاوەڵاندا تاوەکو توانی قەناعەتیان پێبکا[2].

پیاوێك هاتەلای ئەبوبەکرو زۆربەڕەقیو زبری قسەی لەگـەڵ کـرد، (أبو برزة الأسلمي) وتی: (لە ملی دەم ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ؟)، ئەبوبـەکر زۆر توڕەبـوو لـەم قـسەیەی ئەبوبـەرزە کـردی، وە فـەرمووی: (نـەخێر بـەخوا ئەمـە بۆکەسـێك ڕەوا نیـە لـە دوای

(١) سەیری ( صحيح البخاری) لەگەڵ (فتح)دا بکە ١٤٥/١٢، ف ٦٨٣٠، ١٥٢/١٢.
(٢) بوخاری گێڕاویەتی یەوە، ف ژمارە (١٣٩٩)

پێغەمبەری خوا ﷺ).[1]

بیلالی حەبەشـیو لەگەڵیـدا کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵان بەرهەڵـستی سیاسەتی عومـەریان کـرد سـەبارەت بەچـۆنێتی دابەشـکردنی ئـەو زەوییانەی بە دەستکەوت گیرابوون، داوایان دەکرد بەسەر ڕزگارکـەران (الفـاتحین)دا دابەشـی بکـات، عومـەریش دیـدو بۆچـونی لەگـەڵ وەقفکردنی بوو بۆ هەموو موسڵمانان، ئەوەندە مـشتومڕیان لەگـەڵی کرد تاوەکو کەوتە دوعاکردن لێیانو دەیوت ((خوایـە بـیلالم لـەکۆڵ کەیتەوە)).

لێرەدا خەلیفە هیچ هۆکارێکی نەبینیوەتـەوە بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی بەرهەڵستکارانی لەم کێـشەیەدا جگـە لـە گفتوگـۆو پاشـان دوعـا لـێکردنیان، بیلالیش لـە هـەموویان زیـاتر بەرهەڵـستی عومـەری دەکرد ، عومـەریش هـاوەڵانی کـۆکردەوەو پـێی ووتـن: (قـسەی ئـەو خەڵکەتان بیستووە کە وای بۆدەچن مـن مـافیـانم خـواردووەو سـتەمم لێیان کردوە، وە من پەنادەگرم بەوەی ستەم بکەمو ستەمکاربم، ئەگـەر ستەمم لـێ کردبێتن لە شتێکداو دابێتم بە خەڵکێکی تر ئەوا سـەرم لێ تێك چووەو خراپەم کردووە).[2]

---

(١) ئـەبو داود گێڕاویـەتی یـەوە، ف ژمـارە (٤٣٦٣) و نەسـائی ١٠٩/٧ – ١١١ بـە سەنەدێکی سەحیح، ئەبوداود فەرمویەتی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە مانای ئەم فەرمودەیەدا ووتویەتی:( واتە بۆ ئەبوبەکر نیە پیاوێك بکوژێ مەگەر بە یەکێك لەو سیانە نەبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویـەتی :( کفر بعد إیمان – وزنا بعد إحصان – او قتل نفس بغیر نفس).

(٢) (الخراج)ی ئەبو یوسف ل ٢٥ – ٢٦ و (اموال)ی (ابوعبید) ل ٦٣

له ڕاستیدا خه‌ڵکی ڕازی بوون به بۆچونه‌که‌ی عومه‌ر ﷺ و هاوه‌ڵان له‌سه‌ری کۆك بون‌و ئه‌وانه‌شی پێی ڕازی نه‌بوون دڵ‌و ده‌رونیان ئـارامی گرت.(١)

له‌کاتێکدا ئه‌گه‌ر به‌رهه‌ڵستی فه‌ردیانه‌و تاکه‌که‌سی بۆسیاسه‌تی خه‌لیفه‌کان له سه‌رده‌می ئه‌بوبه‌کرو عومه‌ردا شتێکی دیارو ئاشکرابێ، ئه‌وا کاری سیاسی‌و به‌رهه‌ڵستی سیاسیانه پاشتر چووه قۆناغێکی نوێتره‌وه‌و چه‌ند ڕه‌هه‌ندێکی ڕێکخستنانه‌ی زیاتری به‌خۆوه بینی، ئه‌وه‌بوو چه‌ندین کۆمه‌ڵی ڕێکخراوی به‌رهه‌ڵستکار به‌سیاسه‌تی عوسمان ﷺ ، به‌ده‌رکه‌وتن، ئه‌مه‌ش سه‌ره‌تا له به‌سره‌و کوفه‌و میسره‌وه‌بوو، پاشان زیاتر بڵاوبویه‌وه، توانیان چه‌ند هاوه‌ڵێکی پێغه‌مبه‌ریش به‌ره‌و ڕیزه‌کانیان که‌مه‌ندکێش بکه‌ن وێنه‌ی عه‌ماری کوڕی یاسر که عوسمان ﷺ ناردبووی بۆ زانینی هه‌واڵی ئه‌و نه‌یارێتییه له میسر، که‌چی چووه ڕیزیانه‌وه.(٢)

ئه‌و داخوازیانه‌ی به‌رهه‌ڵست کارانی سیاسه‌تی عوسمان داوایان

---

(١) الأموال ل (٦٧).

(٢) ابن جرير ( ٦٤٨/٢)، البداية والنهاية (١٧٨/٧)، هی تریشیان له‌گه‌ڵ بووه که به هاوه‌ڵ باسکراوه وه‌ك (عبدالرحمن بن عديس البلوي)، که له‌و که‌سانه بووه له‌ژێر داره‌که‌دا به‌یعه‌تی دا هه‌روه‌ك له (الإصابة)(٤١١/٢) دا هاتووه، وه (عمرو ابن الحمق الخزاعي) هه‌روه‌ك له الإصابة دا ٥٣٣/٢ هاتووه. وه (عدي بن حاتم الطائي ) هه‌روه‌ك له (ثقات ابن حبان ٢٦٠/٢) دا هاتووه، وه (جندب بن زهير الغامدي ) هه‌روه‌ك له (الإصابة) ٢٤٨/١ دا هاتووه وه (جندب بن كعب الأزدي) هه‌روه‌ك له (الإصابة) ٢٥٠/١، وه (عروة بن الجعد البارقي) هه‌روه‌ك له (الإصابة) ٤٧٦/٢ دا هاتووه. سه‌یری (ابن جرير الطبري) ٦٣٩/٢ و ٦٥٢/٢ بکه.

دەکرد چەند شتێکی دیاری کراو بوو کەلەم خاڵانەدا خۆدەنوێنن: -

١/ چاکـــسازی سیاســـی ئـــەویش بـــە هەڵبـــژاردنی کارەبەدەســـتو فەرمانبـــەرداری نـــوێ بـــۆ هەرێمـــەکانو لەکارخـــستنی ئـــەو کاربەدەستانەی خەڵکی سکاڵای لەدەستیان هـەبوو، وە ڕێکـەوتن لەسەر گەڕانەوەی سەرکردەی نەیارەکان بۆ وڵاتو شوێنی خۆیان کە دوورخرابونەوە لێی.

٢/ چاکسازی ئابوری، ئەویش بە دابەشکردنی دادگەرانەو بە شینەوەی شتومەكو سەروەتو سامانی دەست بەسـەراگیراو بـە شـێوەیەکی یەکسانانە.

٣/ چاکسازی بەڕێوەبەری، ئەویش بەخستنەکاری کەسانی ئەمیندارو خـــاوەن هێـــزو توانـــا لـــە نـــاو موســـڵمانان بـــۆ کاروبـــارە بەڕێوەبەرێتییەکانی دەوڵـەت، لـە جـێی خـزمو کـەسوکار، کـە ئەمـەش بنەمـای ڕەخساندنی هەلەکانە بۆ هەموو کەس.

لەسەر ئەم مەرجانە ئەوانو خەلیفەی ڕاشدی عوسمان (خوای لـێ ڕازی بێت) ڕێکەوتنیان گرێدا، بە ئامادەبوونی عەلی (خـوای لێ ڕازی بێت) بەڵگەنامەکە ڕێکەوتنی لەسەرکرا.[1]

عوسمانیش (خوای لێ ڕازی بێت) ستایـشی ئـەو نوێنـەرو وەفـدەی میسری کرد کە ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ گرێدان،[2] لـە گێڕانەوەیەکـدا

(١) سەیری پێشووتر بکە ل ٤٥.

(٢) (ابن جرير) ٦٥٥/٢ بە ئیسنادێکی سەحیح، وە (مصنف إبن ابي شيبة)دا ٥٣٠/٧.

هـــاتووه کـــه: ئەبوســـەعید مـــەولای ئـــەبو ئوســـەید وتویـــەتی: (بەرهەڵستکاران ووتیان: بەخوا ئەی فەرماندەی موسڵمانان شـتێکی باشت کرد – لەچەند شتێکدا پرسیاریان لیٚ کردبوو ئەویش پەشـیمان بونەوەو گەڕانەوەی خۆی بۆدەربڕیبـوون – پاشـان عوسمـان (خـوای لیٚ ڕازی بێت) هەستا ووتـارێکی دا ووتـی: (هـیچ کـاروانێکم نـەبینیوە باشتربیٚ لـەم کاروانـە، بـەخوا تـەنها قـسەی ڕاسـتو ڕەوایـان کـرد، پرسیاری ڕاستو ڕەوانیان کرد). (۱)

هەموو ئەمانە تەئکیـد لەسـەر مـەودای ئـەو ئازادییـە سیاسـیە دەکاتەوە کە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدی دا ڕەگی داکـوتی بـوو، عوسمـان هەڵنەسـا بـە ڕووبەڕووبونـەوەی ئـەو بەرهەڵـست کـاریو نەیارێتییە، هەروەك هەندیٚ لـە سـەرکردەکانی سـوپاکەی ئاماژەیـان پیٚیدا، بەڵکو ئەو دیدو بۆچونی وابو کە ئەوان شتێکیان ئەنجام نەداوە بەهۆیەوە خوێنیان حەلاڵ بکاو شایستەی کوشتن بـن، زۆر بـە ئاسـایی لەگەڵیان دانیشتو گفتوگۆی لەگەڵ کردنو داخوازی یەکانی بیـستنو وەڵامـی داواکارییەکانی دانەوە، عەلیش (خوای لیٚ ڕازی بێت) ئاماژەی بەم هەڵسوکەوتانەی عوسمان داوە.

خەلیفەو ئەوهاوەڵانەی لەگەڵی بوو هەستیان بە مەشروعیەتی ئـەو کارە کردبوو کـە بەرهەڵـستکاران لـە شـێوەی نـەیارێتی کۆمـەڵیـدا

(۳) ابن شبة ۱۲۹/۳ بە ئیسنادێکی دروست (صحیح).

بەرامبەر سیاسەتی دەسەڵات گرتبویانەبەر، هەر بۆیە عوسمان دانی نا بەو کارانەی ئەنجامیان دابوو، مەرجەکانیانی پەسەند کرد، بە هەمان شێوە هاوەڵانی تریش ئەمەیان پێ‌پەسـەند بـوو، ئەگـەر ئـەوەی پـێ‌ی هەسـتابوون شـتێکی خـراپ‌و نەشـیاو بوایـە، عوسمـان لەگـەڵیان دانەئەنیـشت‌و ستایـشی نـەدەکردن‌و گوێبیـستی مەرجەکانیـشیان نەدەبوو، وە عەلیش (خوای لێ ڕازی بێت) نەدەبووە نێوەنـدو هـاوەڵان‌و خەلیفەش دەست پێشخەر دەبوون بۆ نەهێڵانی ئەم خراپەیـەو لابـردن‌و ڕووبەڕووبوونەوەی، لەبەر ئەو فەرمودەیەی: ((من رأى مـنكم منكـراً فليغيره بيده))

لەڕاستی دا نەیارێتی یەکە لەم قۆناغەدا نەیارێتی یەکی سیاسـی ئاشـتیانەبوو، دروشمـی چاکـسازی سیاسـی بـەرزدەکردەوە، هەربۆیـە هاوەڵانیش (خوایـان لێ ڕازی بێـت) لەسـەر ئـەم بناغەیـە مامەڵـەو هەڵس‌و کـەوتیان لەگـەڵی دەکـرد، بەتایبـەت سـەرکردەو سـەرداری ڕابەرەکانی لە هاوەڵان[1] و گەورە تـابعین‌و ناودارەکانیـشیان لـەقورئان خوێنـان‌و پاڵـەوانانی ڕزگارکـاری یـە ئیـسلامی یـەکان بـوون،[2]

(١) سەیری پێشووتر بکە ل ٥٢.

(٢) لەوانـە ئەشـتەری مـالکی کـوڕی حارسـی نەخـەعی سـەیری (الإصـابة ٤٨٢/٣) و (طبقـات ابـن سـعد ٢٣٩/٦) بکـە وە (کومـەیلی کـوڕی زیـاد) هـەروەك لـە (الطبقـات ٢١٧/٦) و (الإصـابة ٣١٨/٣)دا هـاتووە وە (عـەمری کـوڕی ئەصـەم) هـەروەك لـە (الطبقـات ٢١٦/٦)دا هـاتووە وە (زەیـدی کـوڕی صـوحان) وەك لـە (الطبقـات ١٧٦/٦)دا هاتووە.

هەندێکیشیان پاشتر بوونە سەرکردەی سوپاکەی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) وێنەی ئەشتەری نەخەعی، کە عەلی دواتر کردیە والی میسر، هەروەها موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو زەیدی کوڕی سوحانو کەسانی تریشی تێدا بوون.

پاشان ئەم بزوتنەوە سیاسی یە لە هێڵی خۆی دەرچوو، پاش ڕێکەوتنی لەگەڵ خەلیفە بۆ چاکسازی کردن جارێکی تر گەڕایەوە مەدینە، لێرەوە لادان دەستی پێ‌کرد، بەبیانوی ئەوەی ئەوان نوسراوێکیان دەست کەوتووە کە لە عوسمانەوە بۆئەمیری میسر نێردراوە بەوەی سزایان بدات، ئەوانیش مەروانیان بەوناردنە تۆمەتبارکرد– پاش ئەوەی عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت) سوێندی بۆ خواردن کە نە نوسیویەتی‌و نە ئاگادارێتی– و داوای تەسلیم کردنی مەروانیان کرد، عوسمانیش ترسا لەوەی بەبێ بەڵگە مەروان بکوژن، بێ‌ئەوەی شتێکی وای کردبێ کە شیاوی کوشتن بێت.[1]

پاشان داوای لابردن‌و دەست لەکارکێشانەوەی خەلیفەیان کرد، سوور بوون لەسەر ئەمە، عوسمانیش (خوای لێ ڕازی بێت) ڕاوێژی بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرکرد، ئەویش ئاماژەی ئەوەی پێ‌کرد کە ئەم داوایەیان پەسەند نەکا، هۆکاری پەسەندنەکردنی ئەم داوایەش – هەروەك لە زۆربەی گێڕانەوەکاندا هاتووە– لەبەرئەوە بوو ترساوە لە ڕوودانی فیتنەو شەڕوشۆڕی نێوان ئوممەت، لە هەندێ گێڕانەوەش دا

(١) سەیری (ثقات ابن حبان) ٢٥٩/٢ – ٢٦٠ بکە.

هاتووه که پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریو وەسیەتی ئەوەی بۆکردووه که خۆڕاگر بیو خۆی دانەمالێ لە خەلیفایەتی، کەئەمەش لە ئەسڵدا بەڵگەی مەشروعیەتی ئەم جۆره داخوازییەو واز لە کارهێنان دەگەیەنێ، ئەگینا پێی دەوتن: ئەوەی ئێوه داوای دەکەن لەڕووی شەرعەوه حەرامەو دروست نیە بۆتان، وه لەمبارەیەوه ڕاوێژی بە عەبدوڵلای کوڕی عومەر نەدەکرد، وه که (مغيرة بن الأخنس الثقفي) ئەو ئامـاژەیەی نەدەدا بە بەعوسمان [1] ئەمانە بەڵگەن لەسەرئەوەی ئەم باسو خواسە مەسەلەیەکی ئیجتیهادییە، چونکە ئەگەر دەقێکی لەبارەوه هەبوایە ئەوا ڕاوێژی بەکەس نەدەکرد.

لەڕاستی دا بزوتنەوەکە لە ئامانجە چاکسازییەکانی خۆی لایدا، وه سنوری خوایی بەزاند، پاشانیش ڕێی هەڵەکرد، پەندو عیبرەت لە هەڵسوکەوتی نەیارەکاندا نیە، ئەوان سەرمەشقو پێشەنگ نەبوون، بەڵکو سەرمەشقیو پێشەنگێتی لەهەڵسوکەوتو مامەڵەی خەلیفەی ڕاشد عوسمانە ﷺ لەگەڵیاندا، وه لەوەدایە کەبەدروستی نەبینیوه بجەنگێ لەگەڵیاندا یا تەنگەتاویان بکا، لەبەرئەوەی دەیزانی تەنها لەبەر نەیارێتیان بۆ ئەم داواکردنیان بەوەی چاکسازی بکرێ لەو شتانەی وایان دەبینی پێویستی بە چاکسازیە دروست نیە بەوجۆره

(١) هاوەڵێکە لە (یوم الدار)دا کوژرا، سەیری (الإصابة) ٣/٤٥٢، (الاستیعاب) لە پەراوێزی (الاصابە ٣/٢٨٧)بکە، بڕوانە ئەو ئامازەیەی دەیدا بە عوسمان بۆ وازهێنان لە خەلافەتو خەلیفەیەتی لە کتێبی (طبقات ابن سعد ٣/٤٨) بە سەنەدێکی سەحیح، سەیری پێشووتریش بکە.

هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكا.

هەربۆیە عائشە ﷺ كاتێك كە لە مەككە دەبێو هـەواڵێكی درۆی پێدەگا، سەبارەت بەوەی عوسمـان ﷺ نوێنـەرانی میـسری كوشـتووە، دەڵێ (إنا لله وإنا إلیه راجعون) كەسانێك دەكوژێ كـە هـاتوون داوای ڕەوایان هەیەو ئینكاری ستەم دەكەن، بەخوا بەوە ڕازی نابین). (١)

هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێت نەیان دەزانی كاروبارەكان دەگاتە ئـەو ئاستەی پاشتر پێـی گەیـشت لـە هەڵكوتانـە سـەر مـاڵی خەلیفـەو كوشتنی، كە بە تاوانو جەریمەیەكی قێزەون دادەنرێ، دواتـر عوسمـان هەڕەشەی كوشتنی لـێ دەبیستن، بـەڵام ئـەو ئـەوەی بـە هۆكـارێكی تەواوو دروست دانەدەنا بۆ ڕووبەڕووبونـەوەیان، یـا تەنگـەتاوكردنیان، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر گوێی لە (مسور بن مخرمە) بوو لە بـازاڕدا دەیوت: بـەخوا دەیكـوژین، مەبەسـتی عوسمـان بـوو، ابـن عمـریش فەرمووی: (ئێوە ئەتانەوێ بیكەن بە هیـرقڵێتی، هەر كاتێك تووڕەبوون لە پاشایەك بیكوژن). (٢)

---

(١) (ابن جریر) ٣/٧ لە (ابن شبة)ی مێژوو نوسـەوە ئـەویش لـە (ابی الحسن المدائني) مێژوو نووسـەوە بە ئیسنادی خۆی لە عائیشەوە، (سحیم) مـەولای (وبرة التمیمي) تێدایە (ابن أبی حاتم) لە (الجرح والتعدیل) باسـی كـردووە بێئـەوەی هـیچ شـتێكی لەسەر بڵێ.

(٢) (ابـن شـبة) ٤/١١٧٥ بـە ئیـسنادێكی سـەحیح گێڕاویەتیـەوە كـە كەسـەكانی وەكـو ئەوانەی موسلیمە.

عوسمان ﷺ لەسەر هەمان ڕێوشوێنی ئەبوبەکر دەڕۆیشت کاتێ فەرمووی: (ئەگەر چاکم کرد هاوکاریم بکەن، ئەگەریش لام دا ڕاستم بکەنەوە)، هەموو ئەوبنەما ڕوونو چەساوانە لەژێر کەڵەکەبوونی زۆرێك لە گێڕانەوە مێژووییەکاندان کە پێویستیان بە لەبێژنگ دانو ڕەخنە کردنە، وون بوون، تاوەکو بزانین: بۆ ئەوەی ڕوویدا؟ وە چۆن ڕوویدا؟

عوسمان ﷺ بەوانەی ووت کە گەمارۆیان دابوو: (چیتان دەوێ؟ پێیان ووت: دەتکوژین یا لەکارت دەخەین، ئەویش فەرمووی: ئەی بۆ نەنێرین بۆ هەموو شوێنەکانو لە هەر ولاتێك باشترین کەسیان بهێنینو بیانکەینە دادوەر لە نێوان منو ئێوەدا، بۆ ئەوەی ئەگەر مافێکم پێنەداون پێتانی بدەم؟).(1)

ئەمەش تەئکیدکردنەوەیە لەسەر بنەمای گەڕانەوە بۆئوممەت لە کاتی ڕودانی ناکۆکی لە نێوان دەسەلاتو هەندێ لە چینو بەشەکانی کۆمەڵگەدا، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾(النساء: ٥٩) خوای گەورە لەم جۆرە ناکۆکییانەدا فەرمان دەدا بە گەڕانەوە بۆ ئوممەت، هەروەك لە فەرمودەی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى: ٣٨) ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩) ﴿فَأَصْلِحُوا بَيْنَ

(١) (ابن شبة) ٤/١١٩٢.

أَخَوَيْكُمْ﴾ (الحجرات: ١٠) .

لەکاتێکدا ئەگەر نەیارێتی کردنی دەسەڵات لە سەردەمی عوسماندا سنوورداربوو لە چەند کۆمەڵێکی دیاری کراو لە میسرو کوفەو بەسرە، ئەوا لە سەردەمی خەلیفەی ڕاشدی چوارەم (عــەلی کــوڕی ئــەبوتالیب ﷺ)دا بارەکە گەشەی سەند، ئەوەبوو لــە نــاوخۆی مەدینــەدا نــەیارو بەرهەڵســتکاری بۆ دروست بــوو، کــە مەدینــە پایتــەختی دەوڵــەتی ئیــســــلامی بــوو، بــە ســەرکردایەتیکردنی کۆمــەڵێك لــە گــەورە هاوەڵانیش ﷺ کە بریتی بوون لە (تەڵحەی کوڕی عوبیدوڵلاو زوبەیری کوڕی عەوام) کە هەردوکیان لە دەکەســی موژدەپێــدراوی بەهەشــتو ئەوشــەش کەســەش بــوون کــە عومــەر بــۆ ڕاوێــژ (شــوری) هــەڵی بژاردبوون، عائشە ﷺ و کۆمــەڵێك لــە هــاوەڵانیش پــشتیان گــرتن، بەمەش نەیارێتییەکە چووە قۆناغێکی نوێــوە، ئــەوەبوو پــاش ئــەوەی بەیعەت درا بە عەلی ﷺ هاتن بۆ لای‌و فەرمویان: (ئەی عەلی، ئێمە پیادەکردنی سنورەکانمان هەبووە، ئەو خەڵکەش بەشــداری کــردووە لــە خوێنی عوسماندا)، ئەویش پێی ووتن: (چی بکــەم لــە خــەڵکێك زاڵ بوون بەسەرماندا‌و دەسەڵاتمان نیە بەسەریاندا؟).[1]

داوای لێ کردن لەسەرخۆبن تا فیتنەکە کپ دەبێتەوە، بــەڵام ئــەوان دیدو بۆچونیان وابوو کە بێتوانایی ئیمام لەوەی هەســتێ بەوکارانــەی

---

(١) (ابــن جریــر) ٢/٧٠٢، البدایــة والنهایــة ٧/٢٣٩، تــاریخ الإســلام ی (الــذهبی) — سەردەمی خەلیفەکان — ل ٤٨٣.

له لایەن ئوممەتەوە پێی سپێردراوە تا لە جێی ئەوان ئەنجامیدا ئــەرك‌و واجبەکە لەکۆڵ ناخا، بەڵکو پێویستە ئوممەت پێی هەســتێ، چــونکە گوتارەکە لەئەسڵدا ڕووبەڕووی ئوممەتە، بەو پێیەی گوتــاری قورئــانی بەزۆری ڕووی لە ئوممەتە، هەربۆیە ووتیــان: (ئــەوەی لەســەر ئێمەیــە ئەنجامی دەدەین‌و دوای ناخەین)[1] هەموویان ﷺ ئیجتیهادیــان کــرد، کرداری تەڵحەو زوبەیر بەڵگەبوو لەسەر ئەوەی ئەوان وایان دەبینی کە گوێڕایەڵی‌و مل کەچی‌و بەیعەت دان بە ئیمام نابێتــە هۆکارێــك بــۆ ئــەوەی واجبێــك لەســەر ئوممــەت لابــچێت، ئەگــەر ئیمــام نــەتوانێت ڕاپەڕێنێ، دیدو بۆچونی عەلیش ﷺ وابوو کە ئەوان بۆیان نی یە ئەو تێپەڕێنن‌و بەبێ ڕەزامەنــدی ئــەو هــیچ کارێــك بکــەن، پــاش ئــەوەی بەیعەتیان پێی داوە.

تەڵحەو زوبەیرو عائــشەو ئەوانــەی لەگــەڵیان بــوون ڕووەو بەســرە ڕۆیشتن بۆ تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عوسمــان، هــەموو ئــەم کارانــە دەچێتە بازنەی کاری سیاسی‌و نــەیارێتی کۆمــەڵیانــەی ڕێکخــراوی دژ بەدەسەڵات، کە ناکرێ بانگەشەی ئەوەبکرێ کە ئەو هاوەڵانە دژایــەتی ئەسڵێك لە ئەســڵەکانی ئیــسلامیان کــردووە، یــاخود بیدعەیــەکیان لەئایین دا بەدیهێناوە کە خوا مۆڵەتی نــەداوە، بــەڵکو لــە کارێکــدا ئیجتیهادیان کردووە کە جێگەو بواری ئیجتیهادکردنــە، عــەلیش ﷺ

(١) ئیبن‌و جەریر ٢/٧٠٢.

پاشتر پاشگەزبونەوەی خۆی دەربڕی لەوشـەڕەی کەلەگـەڵیان کـردی، حەسەنی کوڕیشی ﷺ پێشتر نەهی کردبـوو لـە بـاوکی کـە بـەوکارە هەستێ[1] پاشـتر ناکۆکییەکـە گەشـەی کـرد، دوو کۆمـەڵو پـارتی سەرەکی لێ کەوتەوە کەبووە مایەی دابەشبونی دەوڵەتی ئیسلامـی بـۆ دووبەش: کۆمەڵو پارتی عەلیو شـوێنکەوتوانی لەخـەڵکی عـێراقو کۆمەڵو پارتی موعاویەو شوێنکەوتوانی لە خەڵکی شام، لە کاتێکدا زۆرینەی هاوەڵان لە مەدینەدا پەرگیریان لە هەردوو کۆمەڵەکە کـرد، هـەردولاش هەسـتیان بـەوە کردبـوو کـە جـەنگو شـەڕکردن هـیچ چاکەیەکی بـۆ ئومـمەت تێـدا نیـە، وە چارەسـەر بریتییـە لـە داوەری دانەدەست کیتابو سوننەتو ئومـمەت کردنـە دادوەر لـە نێوانیانـدا، تاوەکو هەڵبـژاردنو لەکارخـستن بەویـستی ئـەوبێ، خـەڵکی عـێراق ئەبوموساو شامییەکانیش عەمری کوڕی عاصیان هەڵبژارد، بۆ ئەوەی لە بارەکە بڕوانو ئەو بڕیارەشی دەیدەن (ئەوا ئوممەت پـشتیوانە لـەو بڕیارەدا)[2] کاتێکیش هەردوو دادوەرەکە لە (دومة الجندل)دا کۆبونەوە کۆمەڵێك لەو هاوەڵانـەی پـەرگیریان لـە هـەردوولا کردبـو ئامـادەی داوەرییە کە بوون، لە سەروی هەموویانەوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر،

(١) سەیری (البداية والنهاية) ١٤٥/٧ بکە وە (مصنف إبن ابی شيبة ٥٤٥/٧ و ٥٤٦) بە ئیسنادێکی دروست هێناویەتی لە حەسەنەوە کە باوکی لە ڕۆژی شەڕی (جەمەل)دا دەیوت: (ئەی حەسەن، حەزم دەکرد بیستساڵ پێش ئەمڕۆ بمردمایە).

(٢) سەیری (ابن جرير) ١٠٣/٣٢ ( ثقات ابن حبان ٢٩٣/٢، و ابن كثير ٢٨٨/٧) بکە.

هەردوو دادوەرەکە ڕێکەوتن (لەسەر ئـەوەی عـەلی‌و موعاویـە لـەکار بخەن، پاشان کارەکە بکەنە ڕاوێژ لەنێو خەڵکیدا، تـاوەکو باشـترینیان هەڵبژێرن، یابەدەر لەوان هەڵبژێرن). (1)

بەڵام هەردوکیان ڕێك نەکەوتن لەسەر کەسێك(2) (عەلی)یـش ﷺ ئەبوموسای ڕاسپادوو (وەك نوێنـەری خـۆی) هـەموو سـەڵاحیاتێکی پێبەخشیبوو وە پێی وتبوو: (بڕیارو حوکم بدە ئەگەر بە لەمل دانیشم بێ). (3)

لەڕاستیدا بەسەرهاتی دادوەریکردن (التحکیم) لـە خـودی خۆیـدا بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشکرایە لەسەرئەوەی کە ئوممەت داوەرو حەکەمـە لەدەست نیشانکردنی ئەوکەسەی هەڵی دەبژێرێ بۆ پێـشەوایەتیکردن، هـەروەك ئەوەشـی ڕویـدا لـە نێـوان هـەردولادا بەڵگـەی ڕیـشەداری حیزبیەتی سیاسی‌و دروستی ئینتیمـای سیاسـییە، کـە بریتییـە لـە حەزومەیل بوون لەگەڵ لایەك بەدەر لـەویتر، ڕای دروسـت‌و تـەواویش لـەوەدا بـوو ئوممـەت بکرێتـە دادوەر تـاوەکو ئـەوەی پـێی ڕازییـە هەڵیبژێرێ، چونکە ئەو خاوەنی مافە لە سەرەتاو کۆتاداو بۆهیچ کەس نیە بەزۆرو هێز خۆی بسەپێنێ بەسەریدا.

(1) سەیری ابن کثیر ۲۹٤/۷، وە سەیری (ابن جریر) ۱۱۲/۳ بکە.

(2) ئـەم ئەندازەیـە یـەك دەنگـی نێـوان گێڕانـەوە مێژووییەکانـە، بـەڵام بەسـەرهاتی فێڵکردنی عەمری کوڕی عاس لە ئەبوموسـای ئەشعەری هـیچ بناغەیـەکی دروسـتی نی یە.

(3) مصنف ابن ابی شیبە ٥٤٨/۷ بەدوو سەند یەکێکیان دروست(صحیح)ە.

به دڵنیاییــەوە کۆمــەڵگای موســڵمان توانــاو لێوەشــاوێتی فرەیــی سیاسی تێدا بەدەرکەوت هەر لە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ و کۆبونــەوەی هــاوەڵان لــە کــەپری بــەنی ســاعیدەو کێبــەرکێی نێــوان کۆچــەرو پشتیوانان لەسەر ئیمامەت، تا ئــەوەبوو حــەبابی کــوڕی (منــذر) ی ئەنــساری وتــی: (ئــەمیرێ لــە ئێمــەو ئــەمیرێ لــە ئێــوە)، بــەڵام یەکلاکردنەوەی ئەم ناکۆکییە بەگفتوگۆو پێڕازی بــوون بــەلادا خــرا، پاش ئەوەی ئەبوبەکر ﷺ تەئکیدی کرد لەسەر ئەوەی کــە عــەرەب - واتە مسوڵمانان- ڕازی نابن‌و مل کەچی دەرنابڕن مەگەر بۆ ئەم هۆزی قورەیشە نەبێ، عەرەبە مــسوڵمانەکانیش لەوکاتــەدا مــافی ئــەوەیان هەبوو ئەوەی دەیانەوێ هەڵی بژێرن، پــشتیوانانیش ئــەم ڕاستییەیان دەزانی کە ئەوکارە پێویستی بەڕاپرسی نییە، چونکە لەوکاتەدا ئەمــە شتێکی زانراوبــوو، بــۆ هــەموو عــەرەبێکی موســڵمان، عــەرەب لــە نەفامیدا مل کەچ‌و گوێڕایەڵی یەکتری نەدەبوون مەگەر بــۆ قــورەیش ئەویش لەبەرئەوەی خەڵکی ماڵی خوا (بیت الحرام) بوون.

هەموو ئەمانە تەئکید لەســەر مــەودای ئــەو ئازادییــە سیاســییە دەکەنەوە کە لەم ماوەیەدا هەبووە، ئەبوبەکر ﷺ بنــەمای (لــە ئێمــە ئەمیرێ و لەئێوە ئەمیرێ)ی ڕەفز نەدەکردەوە، کە بریتییە لــە بنــەمای ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات لە نێوان هێــزە کێبــەرکێ خوازەکــان، لەبەرئەوەی ئەمە بنەمایەکی نادروست بێ لە شەریعەتدا، یاخود لەبەر ئەوەی ئەمە ناکۆکە بە ئیسلام‌و ناڕێك بێ‌لەگەڵیدا، ئەگەر وابوایە ئەوا

ئەو بەڵگە شەرعیانەی باس دەکرد کە ئـەم جـۆرە بنەمایـەی یاسـاغ دەکرد، بەڵکو بەڵگەی ئەو بۆیان ناڕازی بوونی عـەرەب بـوو. پاشـان ڕودانی پەرتەوازەیی و فیتنە، لەوبارەیەوە فەرمووی: (ئێوە ئەوە دەزانن ئەم هۆزەی قورەیش پلەوپایەکیان لای عەرەب هەیە، کـە ئـەوانی تـر نیانە، عەرەب : .نها بەکەسێك لەوان ڕازی دەبـێ، تەقـــوای خواتـان هەبێ و درز مەکەنە ئیسلام).[1]

لە گێرانەوەیەکی تـردا هاتووەکـە (پـشتیوانەکان ووتیـان سـەرەتا پیاوێك لەکۆچەران هەڵدەبژێرین، ئەگەر مـرد کەسـێك لەپـشتیوانان هەڵدەبژێرین، ئیتر هەتاهەتایە هەروا، بەم شێوەیەش شـیاوترە ئەگـەر قورەیشی یەك هەڵەی کردو لایدا ئەنساری یەك بیهێنێتـەوە سـەر ڕێ، بەهەمان شێوەش بۆ ئەنساری یەکە.[2]

ئەمـــەش بەتـــەواوی بنـــەمای دەستاودەســـت پێکردنـــی ئاشـتیانەی دەســـەڵاتە لـــە نێـــوان دووپـــارتی سیاســـی دا، جارێکیـــان ئـــەمیان فەرمانڕەوایی دەکاو جارێکی تـر ئـەویان، تـاوەکو ئـەوەی لـە دەرەوەی دەسەڵاتە چاودێریێ بەسەر ئەوەی بەڕێوەی دەبا، لە گێرانەوەیەکی تـردا هاتووە: (کۆچکەرەکان کۆبونەوەو ڕاوێژیان کردو وتیان: پـشتیوانانیش لەم کارەدا بەشیان هەیە، گێڕەرەوە دەڵـێ: چوون بۆلایان، یەکێك لەوان

(١) فتح الباری ١٥٢/١٢.

(٢) فـتح البـاری ٣١/٧، ئەمـە گێڕانـەوەی مێـژوونووس (موسـای کـوڕی عقبـە)یـە لـە (الزهري)ەوە.

(واته له پشتیوانان) ووتی: ئەمیرێ له ئێمەو ئەمیرێ له ئێوه)، واتـه له کۆچکەران، عومەر پێی ووتن: کـێ ســێیەمی هەیـه وەك ئـەوەی ئەبوبەکر هەیـەتی ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ﴾ (التوبة: ٤٠) لـه گێڕانەوەیەکی تردا (پشـــتیوانەکان ووتیان: ئەمیرێ له ئێمەو ئەمیرێ له ئێوه، عومەریش هات بـۆ لایـانو پێـی ووتــن: ئایـا ئێـوه نـازانن پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا به ئەبوبەکر پێش نوێژی بۆ خەڵکی بکـا؟ کێتان پێی خۆشه پێش ئەبوبەکر بکەوێ؟...)[1].

بوخاریش له ڕوداوی (سەقیفە)دا فەرموودەیـەکی عومـەری کـوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوه، وه تیایدا هاتووه: (یەکێك لـه پـشتیوانەکان ووتی: ئەمیرێ له ئێمەو ئەمیرێ له ئێوەی قورەیش، ئیتر غەڵبەغـەڵب زۆربوو، دەنگ بەرزبویەوه...)[2] ئەم قسەیەی ئەوان لەدوای ئەو وتەیەی ئەبوبەکربوو که ووتی: عەرەب ئەم کاره بۆ ئـەم هـۆزی قورەیـشه بـه گونجاو دەبینێ.

بوخاریش فەرموودەیەك له عائیـشەوه ﷺ دەگێڕێتـەوه کـه تیایـدا هاتووه (ئەبوبەکر قسەی کردو ووتی: ئەمیر له ئێمەبێو وەزیر لەئێوه، حەبابی کوڕی (منذیر) ووتی: نەبەخوا واناکەین، له ئێمه ئەمیرێو له

(١) ئەحمەد به ئیسنادێکی حەسەن (٢١/١) له فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوه گێڕاویەتی یەوه.
(٢) سەحیحی بوخاری لەگەڵ فەتحولباری (١٤٥/١٢) ف (٦٨٣٠).

ئێوه ئەمیرێ، ئەبوبەکر ووتی: نا لە ئێمە ئەمیرو لە ئێـوە وەزیـر...)[1]
لە گێڕانەوەیەکی تردا: (ئەبوبەکر فەرمووی: ئێمە ئەمیرو ئێوە وەزیـر، ئەمەش لە نێوان ئێمەو ئێوەدابێ).[2]

پاشان پشتیوانەکان ڕازی بـوون بـە ئەبوبـەکر، هـەموو لایـەکیش بەیعەتیان پێیدا پاش گفتوگۆو ڕەزامەندی هەمولایەك.

لە ڕاستیدا بیرۆکەی فرەیی سیاسیو ئالوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەلات لە نێوان کۆچـەرو پـشتیوانانندا - وەکـو لـە سـەرەتادا پـشتیوانەکان خستیانەڕوو- بۆچونێکی دروستو ڕێکە بە بنەمای (وَأَمْـرُهُمْ شُـورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى: ٣٨) ووشەی (الأمر) لێرەدا مەبەست پێـی ئیمامەتـە، ئەمەش ئەسڵەو هەرچی شتی تر هەیە پاشکۆی ئەمانـەن[3]– ئەگـەر سروشتی ئەوکاتەی عەرەب وانەبوایە تەنها پەسەندی بوو گوێڕایـەڵی کەسێکی قورەیشی بێ، ئەمەش واقعی حاڵی ئەوان بوو لە نەفامێتیو سەرەتای ئیسلام دا-.

ئەوکەسەی بانگەشەی کرد بۆ بنەمای: (لە ئێمە ئـەمیرێو لـەئێوە ئەمیرێ) تووشی تەنگ پێهەڵچنین نەبوو، مافی دەربڕینی بۆچونەکەی

(١) سەحیحی بوخاری لەگەڵ فەتحولباری ١٢/١٤٥ ف ٦٨٣٠

(٢) فەتحولباری ٣١/٧.

(٣) هەر بۆیە عومەر لە سەرەمەرگدا بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی فەرموو :( ئەمـــــەم لێ وەرگرە : فەرماندەییو ئەمیرایەتی بە ڕاوێژ دەبێ لە نێو مسوڵمانانندا) سەیری پێشووتر بکە.

لـــێ زەوت نەکرا، تەسفیەش نەکرا بــە بیــانوی پاراســتنی ڕژێمــەوە، چونکە ئیسلام ئیقرار ناکا لەسەر ئەم جۆرە شێوازە ناشەرعیانە، چـۆن کەسێك تەنگەتاو دەکرێ کە داوای مافی خۆی دەکا لە ڕاوێژ، وە مافی خۆی لەوەداکە خۆی بپاڵێوێ تاوەکو ئوممەت ئەو یا جگە لەو بپاڵێون؟

هەروەها ڕووداوی (سەقیفە) ئەوەش تەئکید دەکاتەوە کە بە مــەرج دانانی قورەیشی بوون لە ئیمامەتدا شتێکی بـاوو زانـراو نـەبووە لــە نێوان هاوەڵانــدا، ئەگــەرنا پــشتیوانان ناکۆکیــان لەســەری نــەدەبوو، ئەبوبەکرو عومـەریش ئەو جۆرە بەڵگانــەیان نەدەهێنایــەوە، وە دەیــان ووت: لەڕاستیدا پێغەمبەر ﷺ ئەم مەســەلەیەی داوە بــە قــورەیش‌و حەرامە ناکۆکی لەسەر دروست بکەن، بەڵکو ئەوەیان کردە بەڵگە کە عەرەب پێی پەسەن ناکرێ، پشتیوانانیش هەستیان بەم ڕاســتییەکرد، ئەگینا ئەیان ووت: بەڵێ عەرەب پەسەندمان دەکــا، ئاشکراشــە کــە پشتیوانان لە (قحطان)ن و عەرەبی حیجازیش هەموویان (عدنان)ین‌و تەنها ڕازی دەبوون مل کەچی قورەیشی بکەن، لەڕاستیدا ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی‌و ڕای زۆرینە کە عەرەبەکان بــوون یەکلاکــەرەوە بــوو لــەم بابەتەدا، هەروەها عومەریش کردیە بەڵگەی هێنایەوە بۆ باشتــــرێتی ئەبوبەکر، هەموو ئەمانە تەئکید لەسەر دەرنەکەوتنی بانگەشەی بــە مەرج گرتنی قورەیشی بوون دەکەنــەوە ســەبارەت بــە ئیمامــەت لــەو

ماوەیەدا.[1].

هـــەروەك چـۆن ئــەم بنەمایــە جــارێکی تــر بەدەردەکــەوێ کاتێــك کێبەرکێ دەکەوێتە نێوان ئەو شەش کەسەی عومـەر هەڵیان دەبژێریو دەیان پاڵێوێ بۆئیمامەت، چون ئەم پاڵاوتنە بناغەدانانو چەسپاندنی

(١) سـەیری فـەتحولباری (١٣/١٩) بکـە حافظـ گومـانی لەسـەر ئەوەهەیـە کـە قورەیـشی بوون کۆڕای لەسەربێ، چونکە لـە عومـەر دەگێڕنـەوە کەویستویەتی موعـازی کـوڕی جەبەلو سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە بکاتە جێنشین، (ابن کثیر)یش ئـەم ئیشکالە لە (البدایة والنهایة)(٩/٥٨)دا دەخاتە ڕوو کەچۆن دەبێ زانایانی عێراقو باشـترینی تابعین بەیعەت بدەن بە (إبن الاشعث) کە قورەیـشی نیـەو لـە(کنـدە) بووە؟ لەوانـەش بەیعــەتیان پێیــدا (عــامری الـشعبی) و (سـعید بـن جـبیر)و زۆرێـك لـە قـورەیش هۆکارەکەشـی ئەوەیـە ئـەم کێشەیە لـە سـەدەی یەکەمـدا لـە ئەسڵدا دیـارو بەرچـاو نـەبووە، لـە سـەردەمی عەبباسیـشدا بـە پێـی حـوکمی ئـەمری واقیـع بانگەشـەی کۆڕابـوونی لەسـەرکراوە، ئەگـەرنا ئـەو دەقانـەی هـاتون زیـاتر بـە هـەواڵ گێڕانـەوە (اخبار) دەچن وەك لەوەی بڕیاڕو (احکام) بن پشتیوانانیش هـەروا تێگەشتبوون .
(ابن ابی شیبه)، لە(مصنف)دا لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:( ئەگەر زەید زینـدوو بوایـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەیکـردە جێنـشین، زەیـدی کـوڕی حاریـسەش قورەیشی بوو، ئەحمد لە(مسند)ەکەیدا (١/٢٠) لە ڕێگەی ئـەبو ڕافعـەوە لەعومـەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:( ئەگەر بگەیشتمایە بە یەکێك لە دووپیاوو ئـەم کارەشـم بسپاردایە پێیان ئەوا دەمسپارد بە/ سالمی مـەولای ئـەبو حوزەیفـەو ئـەبو عوبەیـدی کـوڕی جـەڕاح)، ئەحمـد شـاکر فەرمویـەتی ئیـسنادەکەی (صـحیح)ە، ئەحمـەدیش (١/١٨) لـە ڕێگـەی (شـریح بـن عبیـد راشـد بـن سـعد)و جگـە لـەم دووانەشـەوە گێڕاویەتیـەوە کـە عومـەر فەرمویـەتی :( ئەگـەر ئەجـەلم هـات ئـەبو عوبەیـد وەفـاتی کردبو ئەوا، موعازی کوڕی جەبەل ئەکەمـە جێنـشین، (حـافظ) لـە (فـتح)دا (١٣/١١٩) وتویـەتی (پیاوەکـانی جـێی متمانـەن، فەرموودەکـە (مرسـل)ە، بـەڵام لـە کۆمـەڵێك زانایانی تابعینی شامەوە باسکراوە بەهۆی ڕێگەکانی تری هاتنیەوە بەهێز دەبێ.

ئاشتیانەی بنـەمای ئـاڵوگۆڕی ئاشـتیانەی دەسـەڵاتەو جێگیرکردنـی بنەمای فرەییە، وەکردنەوەی دەرگایە لەبەردەم کێبەرکێی دروست بـۆ گەیشتن بەدەسەڵات، بەمەرجێ ئوممەت داوەرو یەکلاکەرەوە بێت بەهەر هۆکارێ ئەم مەبەستە بەدی بێنێو ئەم بنەمایە بچەسپێنێ.

ئەم هەستکردنەش بوو وای لە عەلیو موعاویە کرد ﷺ ڕێك بکەون لەسەر بنەمای داوەری کردن (التحکیم) کە بریتی یە لـە گەڕانـەوەی کاروباری دەسەڵات بۆ ئوممەت، بۆئەوەی یەکێك لەوان یا جگـە لـەوان هەڵبـژێرێ، ئـا ئەمــەش فرەلایـەنی سیاسـییە، هـەردوو داوەرەکـەش ڕێککەوتن لەسەر لەکار لابردنیانو گەڕانەوەی کاروبارەکە بۆئوممـەت، بۆ ئەوەی بەڕاویژ یەکێك لەوان یا جگە لەوان هەڵبژێرێ.

هەر لەبەر ئەمەش (خـەوارج) لـە فـەرمانی عـەلی ﷺ دەرچـوون لەبەرئەوەی ئـەو ڕازی بـوو بـە بنـەمای داوەری کـردن (التحکـیم) و گەڕانەوەی کارەکە بۆ لای ئوممەت.

لەڕاستیدا تەواوی ڕووداوە مێژووییەکان تەئکید لەسەر چەسـپاوی بنەمای ئازادییە سیاسییەکانی تاكو کۆمـەڵ دەکـەن لـە سـەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین دا، لەسەردەمی ئەواندا تـاك تـاکی کۆمـەڵگـەو کۆمەڵەو گروپەکانیش بیروبۆچونەکانی خۆیان بەدەرخستو نـەیارێتی خۆیـان بەوپـەڕی ئازادییــەوە بەرامبــەر بـە سیاسـەتی خەلیفـەکان دەخستەڕوو، بێئەوەی بترسن لە تەنگەتاوکردن، یا زەوتکردنـی مـافو

ئازادییەکانیان – هەرئەمەش ڕاڤەی بە ئاسان تیرۆرکردنی هەرسێ خەلیفەی ڕاشدینمان بۆ دەکا – ئەمەش بە جوانترین شێوە لەپاش بەدەرکەوتنی بزوتنەوەی خەواریج ڕوونو ئاشکراتر دەبێ کە بریتی بوون لە توندترین بزاوتی سیاسی توندڕەو، ئەگەر جیاوازییەکانی نێوان هێزە کۆمەڵایەتیو حیزبەکان پێش خەواریج جیاوازییەکی سیاسی بوونو پەیوەست بوبێتن بەبابەتی ئیمامەتو چۆنێتی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت، ئەوا بزوتنەوەی خەواریج دادەنرێ بە یەکەم بزوتنەوەی فیکری سیاسی نەیار، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بزوتنەوەیەکی چەکداربوون پاش داوەری کردن (التحکیم)ەکە دژ بە عەلی دەرچوونو دەستیان کرد بە بەکافردانان (تکفیر)ی عەلیو ئەو هاوەڵانەشی لەگەڵیدابوون، لەگوێڕایەڵی عەلی دەرچوون، لەکاتی وتاردانیدا لەسەر دوانگە (مینبەر)تانەو تەشەریان لێی دەدا، ئەویش لاقەی نەدەکردنو ئازاری نەدەدان، بەڵکو ئەو وتە بەناوبانگەی فەرموو کە پاشتر بویە ڕێسایەکی چەسپاو بۆ مامەڵەو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەی دژە ڕابوون لە بیرو بۆچوندا، ئەوەبوو فەرمووی: (ئەوان سێ شتیان لەسەرمانە: دەستپێشخەر نەبین لە شەڕکردن لەگەڵیان ئەگەر شەڕیان لەگەڵ نەکردین، ڕێگری مزگەوتەکانی خوایان لێ نەکەین کە یادی ئەوی تێدا بکەن، وە بێبەشیان نەکەین

له دەست كەوتەكان تائەوكاتەی دەستیان لەگەڵ دەستمان دایە).[1]

پاشـان لـه بەرامبـەر ئەمـەدا چـەند مـەرجێكی لەسـەردانان‌و فەرمووی: (بەمەرجێ خوێنی حەرام نەڕێژن، ڕێگری نەكەن، ستەم لـە پەناهەندە (ذمي)ەكان نەكەن)، عائشە ﷺ فەرمووی: (كەواتـە ئـەی بۆچی جەنگی لەگەڵ كـردن؟ عەبـدوڵلای كـوڕی شـەداد فـەرمووی: (سوێند بەخوا هەڵی نەكوتایە سەریان كەسی بۆ نەناردن تا دەسـتیان كرد بە ڕێگری‌و ڕشتنی خوێن‌و بە حەڵاڵ دانی خوێنی پەنادراوان).[2]

ئەمەش تەئكید لەسەر مەودای ئەو ئازادی یە فیكری‌و سیاسی یـە دەكاتەوە كە مسوڵمانان پیادەیـان دەكـرد لەسـەردەمی خەلیفـەكانی

(١) مصنف إبن ابی شیبة (٥٦٢/٧) بەسەنەدێكی (صحيح) لە ڕێگەی (سلمه بن كهيل) لە ڕێی (كثير بن نمر) ئەویش لە كاتی وتاردان لە عەلی بیستووە، ئەمیش مەرجی بوخاری‌یە بە (إسناد) دادەنرێ مەگەر (كثير) نەبێ كە (ابن حبان) لە (ثقات)ەكەیدا باسی كردووە، (إبن جرير) لە (تاريخ)(١١٤/٣) لە ڕێگەی (كثير)ەوە گێڕاویەتی یەوە، لە (١١٥/٣) بە ئیسنادێكی (صحيح) لە ڕێگەی (ليث بن ابي سليم) لـە هاوەڵانیەوە پاشان لە عەلی یەوە گێڕاویەتی یەوە، (ليث)یش پەسەند (مقبول) لە (المتابعات)دا.

(٢) ئەحمەد لە (المسند ٨٦/١ – ٨٧) و(ابو يعلى الموصلي ٣٦٧/١ ف ٤٧٤) و حاكم لـە (المستدرك) دا گێڕاویەتیـەوە (حـاكم) دەفـەرموێ (سـەحیحە لەسـەرمەرجی بوخاری‌و موسلم) هەرچەندە خۆیان نەیانهێناوە) (إبن كثير)یش لە (البداية والنهاية ٢٩٧/٧) دەڵێ: (سەنەدەكەی سەحیحە) هەرواشە وەك دەیڵێ، (هيثمي) لـە (مجمع الزوائد) ٢٣٥/٦ – ٢٣٧) دا وتویەتی (كەسەكانی جێی متمانـەن)، عائشە پـێی خراپ بـوو عـەلی شـەڕیان لەگەڵ بكـات تـا ئـەوەبوو بەسـەرهاتەكەیان بۆگێڕایـەوە، هـەروەك چـۆن ئـەوكارەی عوسمانیـشی پـێ‌خراپ بـوو، كاتێـك هـەواڵێكی درۆی پێگەیـشتبوو گوایـە عوسمـان ئـەو نوێنەرانـەی كوشـتووە كـە هـاتبوون بـۆ بەرهەڵستی‌و نەیارێتی سیاسەتەكانی، هەروەك چۆن ئەو ڕەفتارەی موعاویەشی بە خراپ دانا كاتێك (عدی بن حجر)ی كوشت (سەیری البداية والنهاية ٥٧/٨) بكە.

ڕاشدین دا، عەلی ﷺ هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەواریجدا کرد پێش ئەوەی شمشێر لە ئوممەت هەڵکێشن، بە هەمان ئەو ڕێو شوێن و مەونهەجەی عوسمان ﷺ گرتیەبەر لەگەڵ ئەوانەی لە دژی دەرچوون و تانەو تەشەریان لە بۆچونەکانی ئەداو ڕەخنەیان لە سیاسەتەکانی دەگرت، ئەوەبوو ئەو ڕووی لێ وەرگێڕان، چونکە وای نەدەبینی ئەم جۆرە نەیارێتی کردنە پێویست دەکا بیانکوژێ، یا بیانگرێ یاخود لێیان بدات، هەر ئەمەش نامەو ڕێبازی عومەر بوو لەگەڵ ئەوانەی پێچەوانەی بیروبۆچونەکەی بوون، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ستەمی لێ کردوون لە بەسەرهاتی ئەو زەویانەی بە غەنیمەت دەست کەوتبوون، هەر ئەمەش لای ئەبوبەکر چەسپابوو هەر بۆیە لە (أبو برزة الأسلمي) توڕە بوو کاتێك پێشنیاری کرد ئەو پیاوەی جنێوی بە ئەبوبەکرداوە بکوژرێ، وەنەیهێشت لێی بدرێ تەنها لەبەرئەوەی خەلیفەی توڕەکردبوو، چونکە ئەمە شتێکی تێدا نیە شیاوی کوشتن بێ.

(حافظ) إبن حجر پاش ئەوەی ئەو دەقانە لە عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: (ئەمانە ئەوەی لێ وەردەگرین کە نابێ شەڕ لەگەڵ کەسێکدا بکرێ کە باوەڕی بەدەرچوون هەیە لە گوێڕایەڵی بۆ ئیمام ئەگەر پەنا بۆجەنگ و کوشتار نەبا، یا خۆی بۆ ئامادە نەکا، لەبەر ئەو گوتەیەی کە فەرمویەتی: (ئەگەر دەرچوون کوشتاریان بکەن) (طبري)ش کۆڕا باس دەکات سەبارەت بەوکەسانەی بە هۆی بیروباوەڕیانەوە بە کافر دانانرێن، ئەوەش دەداتە پاڵ عومەری کوڕی

عبدالعزیز کە نوسراوی نوسیوە سەبارەت بە خەواریج ئەگـەر خـوێنی حەرامیان نەڕشت وازیان لێ بهێنرێ، ئەگەر بەوکارانەش هەستان ئەوا شەڕیان لەگەڵ بکەن ئەگەر کوڕەکەشم بووە.

لە ڕێگەی (إبن جریج)ەوە هاتووە کە دەڵێ ووتم بـە (عطـاء): لـەچ کاتێکدا کوشتاری خەواریج حەڵاڵ دەبێ؟ فەرمووی: (ئەگەر ڕێگریـان کردو ئاسایشیان تێکـدا) (طبـــري) ئـەوە دەداتــە پـاڵ حەســەن کـە پرسیاری لێ کرا سەبارەت بە پیاوێك کـە هــەمان بۆچـونی خـەواریجی هەیە بەڵام لەگـەڵیان دەرنەچـووە؟ فـەرمووی: (کـردەوە کاریگـەرترە لەسەر خەڵکی وەك لە بۆچون – العمل أملك بالناس من الـرأي)، [1] واتە تەنها لەسەر توندڕەوی بۆچونەکانیان نـاگیرێن تـا بۆچـونەکانیان نەکەنە ڕەفتارو پیادەکردن.

ئەم قسەیەش لە (خطـابي) دەگێڕنـەوە کـە ووتویـەتی: (زانایـانی ئیـــسلام کۆبونەتـــەوە لەســـەر ئـــەوەی خەواریجـــەکان – ســـەرەڕای گومڕابونەکەیان – گروپێکن لە گروپە ئیسلامییەکان، بـە کـافریش دانانرێن تائەوکاتەی پەیوەستو پابەندن بە ئەسڵی ئیسلامەوە. [2]

وە وتویەتی: (طبـري)ش بەسەنەدێکی (صحیح) لـە عـەلی یـەوە دەگێڕێتەوە کەباسی خەواریجی کردووەوو فەرمویەتی: ئەگـەر دژایـەتی ئیمامێکی دادگەریان کرد بجـەنگێن لەگـەڵیان، ئەگـەریش دژایـەتی

---

(١) فتح الباري ١٢(/١٩٩).

(٢) فتح الباري (١٢/٣٠٠).

ئیمامێکی ستەمکارو زۆرداریان کـرد کوشـتاریان مەکـەن، چـونکە بۆئەوە قسەی خۆیان هەیە). [1]

(حافظ) نوسیویەتی: (هەمـان شت دەوترێ سـەبارەت بـەڕووداوی حوسەینی کوڕی عەلی و خەڵکی مەدینە لە ڕوداوی (الحرە) داو دواتـر بۆ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو ئەو قورئان خوێنانـەی دژ بـە (حجـاج) دەرچوون، [2] عەلی ﷺ شاهێدی مسوڵمانێتی خەواریجی داوە کاتێـك کە پرسیاری لێ دەکەن (ئایا کافرن؟ فەرمووی: (لە کافرێتی ڕادەکەن، پێی وترا، ئەی دووڕوو (منافق)ن؟ فـەرمووی دووڕوەکـان بـە کـەمی یادی خوا دەکەن، ووتیـان ئـەی کەواتـە چـین؟ فـەرمووی (کۆمەڵـە خەڵکێکن دەست درێژی دەکەنو یاخی بوون لێمان). [3]

بەڵکو بەرهەڵستی جنێوو جنێو پێدانیشیانی کردوو (لەو بارەیـەوە فەرمووی): (جنێویان پێمەدەن، بەڵام ئەگەر دژ بە ئیمامێکی دادگەر دەرچوون کوشـــتاریان بکەن، خۆ ئەگەر دژ بە ئیمامێکی سـتەمکارو زۆردار دەرچوون کوشـــــــتاریان مەکەن، چـونکە بـۆ ئـەوە قـسەی خۆیان هەیە). [4]

عومەری کـوڕی عەبدولعـەزیزش هـەمان ڕێو شـوێنی عـەلی ﷺ

(١) فتح الباری ٣٠١/١٢.

(٢) فتح الباری ٣٠١/١٢.

(٣) مصنف إبن ابی شیبة ٥٦٣/٧ بە سەنەدێکی سەحیح.

(٤) مصنف إبن ابی شیبة ٥٥٩/٧، بە سەنەدێکی سەحیح.

گرتەبەر بەرامبەر بـە خـەواریج، ئـەوەبوو چـووبەگژیاناو مـشتومڕو گفتوگۆی لەگەڵ کردن، پاشان بەو پیاوەی کە ناردی بۆ لایـان وتـی: (ئەگەر کوشتاریان دەکردو خراپەکارییان ئـەنجام دەدا ئـەوا هەڵکوتـە سـەریانو کوشـتاریان بکـە، خـۆ ئەگـەر کەسـیان نەدەکوشـتو خراپەکارییان ئەنجام نەدەدا وازیان لـێ بهێنە).[1]

حەسـەنی کـوڕی سـاڵح لـە باوکیـەوە دەگێڕێتـەوە کەوتویـەتی: (نوسراوی عومـەری کوڕی عەبدولعزیزمـان بەسەردا خوێندرایـەوە کـە ئەگەر خوێنی حەرامیان ڕشتو ڕێگریان ئەنجام دا، ئەوا بەری بـە لـە حەروریو (خەوارج)، وە فەرمانده بە کوشتاریان).[2]

ڕای زۆرینەی زانایـانیش لەسـەر ئەمـە جێگیربـوو هـەروەك (ابـن قدامە) وتویـەتی: (ئەگـەر کەسـانێك بیروبۆچـونی خەواریجـەکانیان خستەڕوو وەکو بە کافردانانی ئەو کەسانەی کە گوناهی گەورە ئـەنجام دەدەنو واز لە جەماعـەت دەهێـننو خوێنوسـامانی مـسوڵمانان بـە حەڵاڵ دەزانن، بەڵام لـە سـایەی دەسـەڵاتی ئیمـام دا بـوونو خـوێنی حەرامیان نەڕشتبوو.. ئـەوا بـەو شـتانەیان دروسـت نیـە بکـوژرێنو کوشتاریان بکرێ، ئەمە وتەی ئـەبو حەنیفـەو شـافیعیو جـەماوەری ئەهلی فیقهـە.. کـردەوەی عەلیـشیان کردۆتـە بەڵگـە چـونکە ئـەو فەرمویـــەتی: (ئێـــوە ســـێ مافتـــان لەســـەرمانە: بەرهەڵـــستی

(١) مصنف إبن ابي شيبة (٥٥٧/٧)، بە سەنەدێکی سەحیح.

(٢) مصنف إبن ابي شيبة (٥٥٧/٧)، بە سەنەدێکی سەحیح.

مزگەوتـــەکانتان لێ نەکـــەین بـــۆ یـــادی خـــوا کـــردن تیایـــدا، دەستکەوتەکانتان بدەینێ تا ئەوکاتەی دەستتان لەگەڵ دەستمان دایە، وەدەست پێشخەری جەنگتان لەگـەڵ نەکـەین.... (عـدي إبـن أرطـأة) نوسراوی کرد بـۆ عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز کـە خەواریجـەکان جنێوتان پێدەدەن، ئەویش لەوەڵام دا بۆی نووسـی: (ئەگـەر جنێویـان پێمدا جنێویان پێبدەن یا لێیان ببورن، ئەگـەر چـەكو شـیریان لـێ هەڵکێشان بە ڕووتان هەمان شتیان لەگەڵ بکەن، ئەگـەر وەشـاندیان بیوەشێنن... لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ هیچی نەکرد لـەو دووڕوانـەی لە مەدینەدا لەگەڵی بوون، کەسانی تر لە پێشترن بۆئەوەی چـاکەیان لەگەڵ بکەن). [1]

لـە ڕاسـتیدا ئـەم سیاسـەتەی عـەلی ﷺ نماینـدەی ڕێنماییـە دابەزێنراوەکانی ئیسلامە لە جوانترینو دادگەریترین شێوەدا، چونکـە - سەرەڕای توندڕەویو زێدەڕۆییان- تەواوی ئازادییە عەقائیدیو بیریو سیاسیو مافە داراییەکانی بۆ نەیارانی بیروبۆچـونەکەی خـۆی دابـین کردووە، شەڕکردنی لەگەڵیان ڕێگرتن بـوو لەدەسـت درێژییـەکانیانو بەرگری بوو لە خراپەکارییەکانیان، نـەك لەبـەر خراپـی بیروبۆچـونو توندڕەویان یا لەبەرئەوەی لە بیروبۆچـوندا نـەیاری بـون، لەبەرئـەوەی زانیاری هەبوو بەوەی ئـەو ئاینـەی بنـەمای ((لا إكـراه في الـدين)ی هێناوە، قەڵسو تەنگەتاو نیە بە بـونی ئایینـەکانی تـر لـە سـایەی

(١) (مغني)ی (ابن قدامة) (١٠/٥٨ – ٦٠).

دادگەری ئیسلام دا، جا بۆیـە باشـترە قـەڵس‌و تەنگـەوتاو نـەبێ بـە جیاوازی بیروبۆچـون لـە نێـوان کەسـانی یـەك ئـایین دا لەوشـتانەی لێکدانەوەو بیروبۆچونەکانی جیاوازییـان هەیـە لەوبارەیـەوە، ئەمـەش کرۆکـی پێـوەری ئاشـکرا (القـایس الجلـي)ە کـە تـەواوترین جـۆری پێوانەکردن (القیاس)ە، وە ئەم ڕێو شوێنەی خەلیفەی ڕاشدی چـوارەم بەدی هێناو هاوەڵان (خوایان لـێ ڕازی بێت) کـۆك بـوون لەسـەری‌و خەلیفەی ڕاشد عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش پیادەی کرد: ئا ئەمە دواتر گەورەترین شوێنەواری هـەبوو لـە سـەقامگیرێتی کۆمـەڵگـەی ئیسلامـی سەرەڕای زۆری ئـەو کۆمـەڵو دەسـتە فیکـری‌و مەزاهیبـە فیقهـــی‌و حزبـــە سیاســـییانەی دەوڵـــەتی ئیـــسلامی‌و پایتەختـــە سەرەکییەکانی جمەیان دەهات پێیان.

موسڵمانان لە مێژووی خۆیاندا ئاشنا نەبوون بەجەنگەکانی تـەنگ پێ‌هەڵچنینی ئایینیانە یا لەڕیشە دەرهێنانی ئەو کۆمـەڵو تایەفانەی دژە ڕاوبۆچـون بـوون بەوشـێوەیەی لـە ئـەورووپادا ڕوویـدا، لەبـەر سەقامگیربوونی بنەمای ئازادی بە چەمکە گشتگیرییەکەی هـەر لـە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینەوە.

ئـا ئـەم ئازادییـە سیاسـییە- لەناویـدا وازهێنـان لەوانـەی دژی دەسـەڵات دەردەچـن بـە مـەرجی شـەڕنەکردن- جـوانترین‌و نایـابترین مومارەسەی سیاسی یە کە مرۆڤ پێی گەیشتووە لە هەر سیـستمێکی سیاسی نوێ‌دا؟!

٧- فەرمانڕەوایـــەتی و گوێڕایـــەڵێتی ڕەهـــا بـــۆ خـــواو پێغەمبەرەکەیەتی: -

کیتابو سـونەت دوو سەرچـاوەی تەشـریعنو ئـەو دەسـتورەن کـە پێویستە دادوەری یان ببرێتە لا، ئیسلام پێش تەواوی سستمو فەلسەفە زەمینیەکان کەوتووە لە چەسپاندنی بنەمای ئەو مەشـروعیەتەی کـە دەبێ هـەموو لا بـێ جیاکـاری ملکەچـی بـۆ دەربـڕن، فـەرمانڕەواو فەرمـانبەر وەك یەك.

ئـەوروپا تـەنها دوای شۆڕشـی فەرەنـسی سـاڵی ١٧٨٩ز ئاشـنای بنەمای مەشروعیەت بوو ، بەڵام پێش ئەوە پادشا خۆی دەوڵەت بـووە هـەروەك پاشـای فەرەنـسا لویـسی چـوارەم ووتـی: (مـن دەوڵـەتم) سەروەریو گوێڕایەڵی ڕەهاش بۆ ئەو بوو، هـەموولا ملکەچـی بـوون، ئەو ملکەچی کەس نـەدەبوو، بـەڵکو مەشـروعیەتی هـەر یاسـایەك لەوەدابوو کە پادشا دەری بکا بـۆ ئـەوەی ببێتـە ئـەو شـتە تـەواوەی مرۆڤەکان لە دەوڵەت دا پێوەی پابەندبن، هەرکەسەش سەرپێچی کرد سزا بدرێ! ئەمە بارودۆخی هەموو جیهان بووە پێش ئـەوەی دەوڵـەتی ئیسلامی بەرپاببێ لەمەدینەی منەوەرەدا، کـە یەکـەم دەوڵـەت بـوو

لەسەر بناغەیەکی دەستوریانە بەرپابوو.[1]

(١) سەیری (المبادئ الدستوریة العامة)ی (أ.د عادل الطباطبائي) – ڕاگری پێشووی کۆلیژی ماف – ل (٥٩) بکە کە دەڵێ: (ئەکرێ لێرەدا ئەوە باس بکەین کە یەکەم دەستوری نوسراو کە جیهان پێی ئاشنا بوبێ بریتی یە لەو بەڵگەنامەیەی پێغەمبەری بەرێز ﷺ ئامادەی کرد بۆ ڕێکخستنی کاروباری مەدینە پاش ئەوەی لە مەککەوە بۆی چوو، چونکە ئەو بەڵگەنامەیە پێشەکی یەکی تێدایە کە ڕاگەیاندنی بەرپابوونی یەکێتی یەکی سیاسی ئیسلامی یە، پێکهاتەکەی بریتی یە لە کۆچەرە مەککەیی و پشتیوانە مەدینەیی یەکان، سەرەڕای کەمینەکانی تری دانیشتوی مەدینە، کە ئامادەییان دەربڕی بۆ سازدانی ئەو یەکێتی یە سیاسی یە نوێیە سەرەڕای ئەوەی ئەو گەلاڵەنامەیە چەندین دەق لە دابینکاری کۆمەلایەتی و بەرپاکردنی دادگەری و ڕێکخستنی قەزا لەخۆ دەگرێ، هەروەها چەند بنەمایەکی سزایی گرنگی تێدایە وەکو بنەمای کەسێتی سزا (شخصیە العقوبە)و بنەمای تۆڵە سەندنەوە بۆ کوشتنی دەست ئەنقەستی دوژمنکارانە، هەروەها جۆرەها تاوانکاری ژماردووە کە ڕووبەڕووی نەفس و سامان و دارایی دەبێتەوە.

لە هەمان کاتدا ئەو بەڵگەنامەیە پێغەمبەری خوا دەکاتە فەرمانڕەوای باڵای دەوڵەت و دادوەر لەنێو خەڵکی دا، هەروەك چەند دەقێکیش پایەو حەقی کەمینە ئایینی یەکانی لە دەوڵەتی ئیسلامی نوێدا ڕوونکردۆتەوە، لە کۆتایشدا بەچەند دەقێکی تر ئەوماف و ئازادیانە ڕوونکراوەتەوە کەئیسلام دابینی کردووە، هەر لەوێدا باسی مافی ژیان و ئازادی بیروڕاو مافی موڵکداری و ئاسایش و خانوبەرەو گواستنەوەو مافی یەکسانی و مافی هاریکاریکردنی داراییانەی تاکی کردووە، بەمەش ئیسلام دەبێتە یەکەمین چەسپێنەری پایەکانی ئازادی یە ئابوری و کۆمەلایەتی یەکان، هەروەها بەڵگەنامەکە باسی مافی کۆبونەوەی لەسەر بناغەی هۆز یاخود لەسەر بناغەی ئایین کردووە وە مافی ڕادەبڕینی داوە

لەو خستنەڕووەی پێشەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو حوکمانەی لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە بڕبڕە پشتی هەر بەڵگەنامەیەکی دەستوری نوێشە، بەمەش ئیسلام پێشڕەوێتی خۆی تەئکید دەکاتەوە بەسەر ڕێکخستنە نوێکانیشدا تەنانەت لەم بوارەشدا.

ئەو مەرجەعیەتەی تێدا دەستنیشان کرا کە دادگایی بۆ لادەبرا لە نێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەردا لەکاتی جیاوازیو ناکۆکیدا، قورئانیش فەرمانڕەواییو دادوەریکردنی تەنها بەخوا بەخشیوە، ئەوە بە تەنها مافی لە یاسا دانانی ڕەهای هەیە بۆبەندەکانی، وەهەر خۆیشی مافی گوێڕایەڵی ڕەهای هەیە، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاّ تَعْبُدُوا إِلاّ إِيَّاهُ﴾ (یوسف:٤٠) واتە: بەڕاستی حوکمو فەرمان ڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نیە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، باوەڕبوون بە تاکێتیو وەحدانیەتی خوا لە فەرمانڕەوایەتیدا ئەو بناغەیەیە کە یەکتاپەرستی ئەوی لەسەر بنیات دەنرێ لە پەرستشو گوێڕایەڵی کردنیدا، ئەو (أمر)ەی لە ئایەتەکەدا هاتووە بەشێکە لە (الحکم)و جۆرێکە لە جۆرەکانی، وە لەبەرئەوەی فەرمانڕەوایەتی بۆ خوایەو مافێکە لە مافەکانیو هیچ کەسێ لەوەدا ڕکابەری ناکا، هەر بۆیە فەرمانی داوە تەنها خۆی بپەرسترێ، یەکتاپەرستی لە هاوبەش پەیداکردنو گوێڕایەڵی لە بێفەرمانیو ئیمان لە کوفر جیاناکرێتەوەو ناناسرێ مەگەر بە پێی فەرمانو حوکمی خوا نەبێ، هەرکەسێ ئەم بناغە ئیمانییە گەورەیەی لانەچەسپێو جێگیرنەبێ - یەکتاپەرستی ڕەها تەنها بۆ خوا لە حاکمیەتدا- ئەوا یەکتاپەرستی خوای لە پەرستشو گوێڕایەڵیدا بۆ ساغ نابێتەوە، چونکە پەرستشو گوێڕایەڵیکردنی خوا نازانرێ تەنها لە ڕێگەی حوکمو شەرعی خواوە نەبێت، وە پابەندێتی بە حوکمی خوا

دەرنابڕدرێ مەگەر بە دانپێداهێنانو باوەڕبوون نەبێ بەوەی تەنها ئەوە فەرمانڕەوایەتی (حکم)و تەشریعو کاروبار(الأمر)ی بەدەستە: ﴿أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ﴾ (الأعراف: ٥٤) واتە: ئاگادربنو بزانن هەرچی دروســـت کردنو بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە.

بەمەش جگە لە خوا دادەماڵرێ لە مافی گوێڕایەڵی ڕەهـا، کـاری گرنگی پێغەمبەرانیش تەنها بریتیە لە ڕوونکردنـەوەو پێڕاگەیانـدن، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ (النـور: ٥٤) خوای گەورە گوێڕایەڵی پێغەمبەری بە گوێڕایـەڵی کردنـی خۆی داناوە لەبەرئەوەی ناوەندو گەیەنەری نێوان خـواو بەندەکانیـەتی، خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ (النسـاء: ٥٩)، لەم ئایەتـەدا خوای گەورە گوێڕایەڵیکردنی خۆیيو پێغەمبەرەکەی سـەربەخۆو جیـا باسکردووە، بەڵام گوێڕایەڵی کاربەدەستو فەرمانڕەوایانی کـردووە بـە پاشـکۆ، هەربۆیـە بـە (واو) (عطـف)ی کـردووە بێئـەوەی فرمـانی (وأطیعوا – گوێڕایەڵی بکەن) دووبارە بکاتەوە، بـۆ ئـەوەی تەئکیـد لەسـەر ئـەوە بکاتـەوە کـە گوێڕایـەڵی کاربەدەسـتو فـەرمانڕەوایان کۆتبەندە بـە گوێڕایـەڵیکردنی خـواو پێغەمبەرەکەیـەوە، لەبەرئـەوە فەرمویەتی (فإن تنازعتم في شـيء) واتـە ئێـوەو کاربەدەسـتەکانتان (ئەگەر ناکۆك بوون لە شتێکدا) یاخود فەرمانڕەوایانو کاربەدەسـتان لە نێوان خۆیاندا ئەوا (فردوه إلی الرسول) بۆئـەوەی تەئکیـد لەسـەر

مەشروعیەت بکاتەوەو مەرجەعیەت دەست نیشان بکا، بۆ ئەوەش لـە هەموو بارەکاندا دەبێ بگەڕێنەوە بۆ قورئان.

هەروەها لە ووتەی ((وأولي الأمر منكم) سێ ئاماژە هەیە: -

یەکەم: دەبڕینەکە بەکۆ هاتووە (أولي الأمر) نەیفەرمووە (ولي الأمر) بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی (أولي الأمر) بریتین لە کۆمەڵی (ئـەهلی حەللو عەقد) لە زانایانو سەرۆکەکانو سەرکردەکانی کۆمەڵگا، ئەوانە بریتین لەوانەی پێویستە گوێڕایەڵیان بۆ بکرێ ئەگەر کـۆك بوون لەسەر ڕایەك کە پێچەوانەی کیتابو سوننەت نەبێت، ئەگەر جیاوازو ناکۆکیش بوون لەنێوان خۆیانـدا، یـاخود نـاکۆکی یەکـە کەوتە نێوان ئـەوانو ئوممەتـەوە پێویـستە بگەڕێنـەوە بۆکیتـابو سوننەت.[1]

دووەم: ئەم ئایەتە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئـەکرێ نـاکۆکی لـە نێـوان کاربەدەستو فەرمانڕەوایان، یاخود لـە نێـوان ئـەوانو ئوممـەت دا ڕووبدات، لەوکاتەدا پێویـستە دادوەریەکـە ببرێتـەوە بـۆ کیتـابو سـوننەت، کـەس هـیچ کـەس پابەنـد ناکـا بـە بـیرو بۆچـونو ئیجتیهادەکانیەوە.

سێیەم: لە فەرمودەی (منكم)دا ئاماژە هەیە بۆ ئەوەی کە پێویـستە کاربەدەستو فەرمانڕەوایان نوێنەری هەموو ئوممەت بن، بەهـەموو

---

(١) سەیری (فتح الباري) ١١٢/١٣ بکە.

چینو توێژو کۆمەڵو گروپەکانیەوە نەك یەکێکیان، قورئان بەم ئایەتە تەئکید لەسەر بنەمای مەشروعیەتو مەرجەعیەت دەکاتەوە، هەروەك چۆن پێغەمبەر ﷺ ئەمەی تەئکید کردەوە لە یەکەم چونە نێو مەدینەدا، ئەوەبو بەڵگەنامەی مەدینە (صحیفة المدینة) [1]ی دانا کەبەیەکەم دەستوور[2] دادەنرێ کە جیهان پێی ئاشنابووە، کە تیایدا مافو ئەرکەکانی سەر مسوڵمانانو ئەو کیتابیانەی لەگەڵیان بوون دەست نیشانکراوە، (ابن اسحاق) فەرمویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی نووسی لەنێوان کۆچەرو پشتیوانەکاندا، پەیمانو بەڵێنیبوو بۆجولەکەکانو دانی نابوو بە ئایینو سەروەتو داراییاندا، مەرجی پێدانو مەرجی لەسەر دانان: بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان: ئەمە نوسراوێکە لە موحەممەدی پەیامبەرەوە بۆ نێوان باوەڕدارانو موسڵمانانی قورەیشو یەسرب، لەگەڵ ئەوانەی شوێنیان کەوتوونو لەگەڵیاندانو جیهادیان لەتەکدا کردوون: ئەوانە هەمویان یەك ئوممەتن جیا لە خەڵکی.

هەموو کۆمەڵێکیان بە چاکەو دادگەرانە بریتی دیلەکانیان دەدەن،

(١) (السیرة)ی (ابن هشام ٥٠١/١)و (الأموال)و (ابو عبید ٢١٥) (سنن البیهقی ١٠٦/٨) بەدرێژی.

(٢) دەستوور ئەو بەڵگەنامە سیاسییەیە کە کاروبارەکانی دەسەڵاتو مەوداو سەلاحیەتەکانی رێك دەخاو پەیوەندی تاکەکان بەومافانەی کە هەیانەو بەو ئەرکانەی لەسەریانە دیاری دەکا.

وه باوەڕداران ڕێ نادەن کەسێك لە نێوانیاندا بکەوێتە ژێرباری قەرزەوە بێ‌ئەوەی بریتی‌و خوێن بایی بۆ نەدەن، وە باوەڕداران دژی ئەو کەسانەن کە لە نێوان خۆیاندا یاخی دەبن یاستەمکاری‌و دوژمنایەتیان دەوێ‌و فەسادو خراپەکاری دەخەنە نێوان بڕوادارانەوە، دەبێت بە هەموویان دژی بن ئەگەر کوڕی یەکێك لەوانیش بێت، ئەو جولەکانەی لەگەڵمان دێن ئەوا پشتیوانی‌و چاکەیان لەگەڵ دەکرێ‌و ستەمیان لێ ناکرێ‌و کەس زاڵ ناکرێ بەسەریاندا، ئاشتی باوەڕداران یەکە.... وە ئێوە لە هەر شتێکدا جیاوازیتان بۆ دروست بوو ئەوا دەگەڕێنەوە بۆ خوای گەورەو بۆ موحەممەد ﷺ، وە جولەکەکان لەگەڵ باوەڕداراندا دەبەخشن تاوەکو جەنگاوەرن، وەئەوان لەگەڵ باوەڕداراندان، جولەکە ئایینی خۆیان هەیەو مسوڵمانانیش ئایینی خۆیان... دەبێ چاکە ئەنجام درێ‌و خراپە نەکرێ... جولەکەو مسوڵمان هەریەکەیان بەخشینی خۆیان لەسەرەو دەبێ پشتگیری یەکتری بکەن لەگەڵ هەرکەسێکدا کە دژایەتی ئەم نوسراو (صحیفە)یە بکا.. هاریکاری‌و پشتگیری بۆستەم لێکراوە.. وە ئەگەر لە نێوان ئەوکەسانەی بەم نوسراوە ڕازین ڕووداوێ یا ناکۆکییەك ڕوویداو ترسی خراپتربوونی لێ دەکرا ئەوا گەڕانەوەی بۆ لای فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەبێ...[1]

ئەم نوسراوە دەستوری یە زۆرێك بنەمای دەستوری لەخۆ دەگرێ وەکو

(١) بە کورتی یەکی زۆر پوخت، سەیری سەرچاوەکانی پێشوو بکرێ، شێخی ئیسلام لە بارەی ئەم (صحیفە)یەوە لە (الصارم المسلول ل٦٤) دەفەرموێ (زانایان بەم نوسراوە ئاشنان ) وە بە بەڵگەوە دەیهێنێتەوە.

دەستنیشـان کردنی ئەو هەرێمەی دەوڵەتەکـەی تێـدا بـەرپاکراوە کـە مـەدینەی مـنەوەرەیە، وە دەست نیشانکردنی گەلو کۆمـەڵو هۆزەکانی، وە ڕێکخـستنی پەیوەنـدی نێـوان تـاكو کۆمەڵـەکانی، وە پەیوەنـدی هەمویان بەودەسەڵاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەرایەتی دەکا، ئـەو بریتیە لەو مەرجەعیەتەی خەڵکی مەدینە داوەری بـۆ دەبـەن تـاوەکو فەرمانڕەوایەتی لەنێوانیاندا بکا بەوپێیەی خوای گەورە دایبەزانـدووە، هەروەك خوای گـــــەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾ (المائدة: ٤٩) .

مەرجەعیەتی هەموو موسڵمانێ بە تەواوی دەستنیـشان کـراوە بـە پێی ناوەڕۆکی شاهێدیدان بەوەحدانیەتی خواو پەیامدارێتی موحەممەد ﷺ، بەڵام لە مەدینەدا چەندین کۆمەڵی جولەکە هەن نـە باوەڕیـان بەکیتابەو نە بە سوننە، هەربۆیـە دەبـێ بەڵگەنامەیـەکی دەسـتوری دابنرێ کە مافو ئەرکەکانی تێدا دیاری بکرێو مەرجەعیەت بێ بـۆ کـاتی نـاکۆکیو جیـاوازی، تـاوەکو پابەنـدبون پێـوە لـە بـەرەنجامی گرێبەنـدیو ڕەزامەنـدی هـەردولا بێـت، بـۆ ئـەوەی زۆرلێکـردن یـا سەپاندنی تێدا نەبێت.

لــە دەســت نیــشانکردنی مەرجەعیــەتو چەسـپاندنی بنــەمای مەشروعیەتی یاساییدا پاراستنی مــافو ئازادییــەکانو دامرکانــدنی هەڵــچونەکانی دەســەڵات هەیـە بـۆ ئـەوەی مــەوداو ســەلاحیتەکانی تێنەپــەڕێنێ، ملکەچــیو گوێڕایــەڵیکردنی پابەنــدە بــە یاســای

شەریعەت، هــەروەك پێغەمبــەر ﷺ فەرمویــەتی: (گوێڕایــەڵی لــە بێفەرمانی خوادا نیە، گوێڕایەڵی لە چاکەکردنایە)[1] وە فەرمویەتی: (گوێڕایەڵی مەخلوق ناکرێ لە بێفەرمانی خوادا).[2]

بەم شێوەیە فەرمان ڕەوا سەلاحیاتو دەسەلاتی لەدەست دەدا ئەگەر پێچەوانەی حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی بوو -کە دەستوری بالایە لــە دەوڵەتی ئیسلامیدا- خەلیفەکانی ڕاشــدینو هــەموو مــسوڵمانانیش ئەمەیان زانیوە، ئەبوبەکری صدیق لە یەکەم وتاریو لەپاش بەیعــەت فــەرمووی: (گوێڕایــەڵیم بکــەن تــا ئەوکاتــەی گوێڕایــەڵی خــواو پێغەمبەرەکەی دەکــەم، ئەگــەر بێفــەرمانیم کــرد ئــەوا گوێڕایــەڵیم پێویست نیە لەسەرتان)، هاوەڵان (خوایان لــێ ڕازی بێت) بەیعــەتیان بەخەلیفەکان دەدا لەسەر کارکردن بە کیتــابو ســوننەو پابەنــدبوون پێیانەوە، هەروەك لە بەیعەت پێدانی عوسماندا باسمان کرد.[3]

پاش ئەوەی موسڵمانان کۆبونەوەو بەیعەتیان دا بــە عەبدولمــەلیکی کوڕی مەڕوان، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر نوسی: (مــن دان دەنــێم بــە گوێبیــستیو گوێڕایــەڵیکردنی بەنــدەی خــوا: عبــدالملك، ئــەمیری

---

(١) صــحیح البخــاری، هــەروەك لــە فــتح ( ١٢٢/١٣) ف (٧١٤٥)دا هــاتووە، وە مــسلم ١٤٦٩/٣، ف (١٨٤٠) هاتووە.

(٢) ئەحمەد گێڕاویەتیەوە (٦/٥ – ٦٦) بە سەنەدێکی سەحیح.

(٣) سەیری (صحیح)ی بوخاری لەگەڵ فتح بکە (١٩٤/١٣)، ف (٧٢٠٧).

باوەڕداران لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەرەکەی بەپێی توانام).[1]

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (گوێبیستو گوێڕایەڵ بن، هەرچەندە بەندەیەکی حەبەشیش بکەنە فەرماندەتان)[2] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (گوێبیستیو گوێڕایەڵی بکەن تا ئەوکاتەی کیتابی خوا پیادە دەکا لە نێوانتاندا).[3]

سوننەتی پێغەمبەر گوێڕایەڵی دەسەڵاتداری پابەند کردووە بە سێ مەرجو کۆتەوە: -

١/ کۆتی یەکەم: بەرپاکردنی نوێژ کە کۆڵەکەو دروشمی ئایینە، جا کاتێ فەرمان ڕەوا وازی لەنوێژ هێناو بانگەشەی نەکرد بۆکردنو بەرپاکردنی، ئەوا گوێڕایەڵی بۆکردنی نامێنێو مەشروعیەتی بەردەوام بوونی لە دەسەڵاتدا لەدەست دەدا، لەبەر فەرمودەی: (خراپترینی ئیمامەکانتان ئەوانەن ڕقتان لێیانەو ڕقیان لێتانە، نەفرینیان لێدەکەنو نەفرینتان لێدەکەن) وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بەشیر توریان دەین؟ فەرمووی: (نەخێر، تا ئەوکاتەی نوێژتان لەنێودا دەکەن،[4] کاتێ وازهێنرا لە نوێژ، جا ئیتر بوترێ وازهێنانی نوێژ کوفرە یاخود بوترێ فیسقە جیاوازی نیە.

---

(١) صحیح البخاری بە (فتح)ەوە ١٣/١٢١، ف (٧١٤٢)

(٢) صحیح البخاری بە (فتح)ەوە ١٣/١٢١، ف (٧١٤٢)، مسلم ٣/١٤٦٨، ف (١٨٣٨).

(٣) رواه احمد ٦/٤٠٢، حمیدی، ف ژمارە(٣٥٩)، (ترمذي) ف ژمارە (١٧٠٦) بە سەنەدێکی سەحیح کە لە (صحیح مسلم) ف ژمارە ١٨٣٠ فەرمودەیەکی وا هەیە.

(٤) صحیح مسلم، ف ژمارە ١٨٥٥.

٢/ کۆتی دووەم: بەرپاکردنی کیتاب‌و فـەرمان ڕەوایـەتی پـێ‌کردنی، لەبەر فەرمودەی: (اسمعوا وأطیعوا ولـو عبـد حبـشي مـا أقـام فیکم کتاب الله)،[1] مەشروعیەت‌و مافی گوێڕایەڵی دەسەڵاتی کۆتبەند کردووە بەوەی تاوەکو فەرمانڕەوایی بە شـەریعەت بکـا، جا ئەگەر لەکاری خـست ئـەوا مەشـروعیەتی بـەردەوام بـوونی لەدەســـت دەدا، جـــائیتر وەك یەکـــە بـــوترێ لەکارخـــستنی فەرمـانڕەوایـــەتی بـــە کیتـــاب کـــوفرە، یـــاخود بـــوترێ فیـــسق‌و گوناهباریە.

٣/ کۆتبەندی سێیەم: - دەرنەکەوتنی کوفری ئاشکرا لە دەسـەڵاتەوە کە پێکداداان لەگەڵ شەریعەت دا بکا، لەبەر ئـەو فەرمودەیـەی دەفەرموێ: (کێبەرکێ لەگەڵ کاربەدەستاندا نەکەین سەبارەت بە فەرمـانڕەوایەتییەکەیان، مـەگەر کوفرێکی ئاشکرایان لـێ ببینین، کە لە لایەن خواوە بەڵگەو بورهانمـان لەسـەری هـەبێ — وان لا ننازع الأمر اهله إلا أن تروا کفـراً بواحـاً عنـدکم مـن الله فیـه برهان)،[2] واتـە ئەگـەر وابـوون ئـەوا لەوکاتـەدا نـاکۆك بـن لەگەڵیان‌و فەرمان ڕەوایەتییەکەیان لەدەست دەربکـەن، جـائیتر دەرکەوتنی کوفرەکە بە حەڵاڵ زانین بێ یا بە پێچەوانەوە بێ، بەم شێوەیە شەریعەتی ئیسلامی‌دانی ناوە بە مافی ئوممەت لە چاودێری

(١) سەیری پێشووتر بکە.

(٢) صحیح مسلم ژمارە (١٧٠٩) و صحیح الخاری ژمارە (٧٠٥٦).

کردنی دەسەڵات، وە مـافی ئـەوەی پـێدراوە بـەرگری لەولادانــە بکات کە لە دەستوری دەوڵەتو سستمە گشتییەکەیدا ڕوودەدت، جا ئەگەر دەسەڵات بناغە گشتییە قەتعییەکانی پاراست، ئەوەش لەڕێی پیادەکردنی دروشمەکانی ئیسلامو پایە دیارەکانیو فەرمان ڕەوایەتی کرد بە کیتابو یاساکانی ناویو کـوفرێکی ئاشـکرای لـێ نەکەوتەوە، ئەوا پێویستە بەچاکی گوێڕایەڵی بکرێ لەشـتە باشەکاندا وەلەوشتانەی بێفەرمانی خوای تێدا نیـە، تەنانـەت ئەگەر ئیمامیش بـەهۆی سـتەمێکەوە یـا کەمتەرخەمییەکـەوە سنوری دادگەریشی بەزاند، ئەگەر ستەمەکەی گەیشتە تاکەکان ئەوا خوای گەورە مافی بەرگری دەسـت درێژییـەکانی دەسـەڵاتی پێبەخشیون، بەوەی بەرگری بکەن لەخوێنو نامووسو سەروەتو سامانیان.

هـــاوەڵانیش ﷺ ئــەم بناغەیـــەیان دەزانـــی، ئــەویش بنـــەمای مـەشروعیەتی بڕیارەکانی ئیمامە، وە ئەو بڕیارانە دەبێ دروسـت بـنو دژایەتی کیتابو سوننە نەبن، ئەگینا بەهاکەی وون دەکـاو پێویـستە پەسـەند نـەکرێو جێبـەجێ نـەبێ، چـونکە گوێڕایـەڵی لــەکارە چاکەکاندایە، هەرئەم هۆیەش بوو وایکرد لە تەڵحەو زوبەیرو عائیشە ﷺ پێچەوانەی خەلیفەی ڕاشد عەلی کوڕی ئەبو تالیـب بکـەنو لــە فەرمانی دەربچن، لەبەر ئەوەی وایان دەبینـی وازهێنـان لـە بکـوژانی عوسمان ﷺ حەرامە، وە ئەم واجبەش دەبێ بـەرپا بکـرێ، جـا ئەگـەر

ئیمام نەیتوانی ئەنجامیدا ئــەوا ئەرکەکــە دەگەڕێتــەوە ســەر ئوممــەت بەوپێیەی حوکمە شەرعییەکان لە سەرەتادا ئاراستەی ئوممەت دەکرێ، ئیمامیش بەپێی گرێبەسـتی بەیعــەت وەك بریکــارێ هەڵدەســێ بــە ئەنجامدانی ئەم حوکمانە.

ئەو هاوەڵانە وایان دەبینی کە نابــێ گوێڕایــەڵی ئیمــام بکــرێ لــە دواخستنی جێبەجێکردنی بڕیارو حوکمەکانی خــوای گــەورەدا، هــەر بۆیە دەست پێشخەرییان کرد بۆ جێبەجێکردنی، هەروەها هەستکردن بوو بەم بنەمایە کە پاڵی نا بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسو چەندانی تر لە هاوەڵان ئەوانەی خۆیان بەدوور گرت لە فیتنەو لەعەلیش خۆیان کــەنارگرتو گوێڕایەڵییان نەکرد کاتێ کە فــەرمانی پێــدان لەگــەڵی دەرچــن بــۆ جەنگ کردن لەگەڵ تەڵحەو زوبەیر، چــونکە دیــدو بۆچــونیان وابــوو گوێڕایەڵیکردن تەنها لە چــەکەکردن دا دەبــێ، ئــەو جەنگــەش ڕووی ڕەوایەتی بەدەرنەکەوتووە، بەڵکو بــە بۆچــونی ئــەوان ئەمــە جــەنگی فیتنــەو شــوبهەو گومانــە، هەربۆیــە ڕەوا نیــە ئیمــام – هەرچــەندە هاوێنەی عەلی کوڕی ئــەبو تــالیبیش بــێ لــە زانــستو خۆپــارێزیو ئیجتیهــاددا– خــەڵکی پابەنــدکا بــە گوێڕایــەڵیکردنی خۆیــەوە لــە شتێکدا کە چاکە نیە.[1] تــەنها ئەوانــە لەگــەڵی جــەنگان کــەوایان

(١) سەیری (فتح الباري) ١٣/٣١، ٣٣-٣٤ و ٤٧ بکە.

دەبینی لەسەر ڕەوایەو ئەوەی فەرمانی پێدەکا بەشێکە لەچاکە، هەربۆیە عەلی ﷺ ناچار بوو وازیان لێ بهێنێو پابەندیان نەکا بە بیروبۆچونەکانی خۆیەوە.

هەموو ئەمانە تەئکید لەسەر چەسپاوی مەشروعیەت دەکەنەوە، کە بریتیە لەوەی فەرمانەکانی دەسەڵات لە دەوڵەتی ئیسلامیدا دەبێ پێچەوانەو دژ نەبی لەگەڵ یاساو دەستوری بەرزو باڵادا، کە بریتیە لە کیتابو سوننەت کە هەریەکە لە ئوممەتو ئیمام وەکویەك ملکەچ دەبن بۆیو لەکاتی جیاوازیو ناکۆکیدا بۆی دەگەڕێنەوە، گوێڕایەڵی دەسەڵات پێویستە ئەگەر فەرمانیدا بە ڕەواو دادگەری یا چاکەو بەرژەوەندی، مافی گوێڕایەڵیش لەدەست دەدا ئەگەر فەرمانیدا بە ستەمو نارەوا یا زیانو خراپەکاری.

هەربۆیە ئەبوبەکر لە یەکەم وتاریدا فەرمووی (ئەگەر خراپم کرد ڕاستم بکەنەوە) عومەریش فەرمووی: (خەڵکی بێتوانا نین لەوەدا یەکێك لە خۆیان بکەنە کاربەدەست، جا ئەگەر ڕێكو ڕاست بوو شوێنی بکەون، ئەگەریش لایدا بیکوژن، تەڵحە فەرمووی: چیە ئەگەر بڵێی: ئەگەر لاربوو لەکاری بخەن؟ عومەر فەرمووی: نەء، کوشتن جێ پەندە بۆ دوای خۆی؟) [1] ئەشعەس بەخۆییو کۆمەڵێك لەخەڵکی کوفەوە هاتنەلای عومەرو داوایان لێکرد سەعدی کوڕی ئەبی

(١) ابن جرير الطبري (٥٧٢/٢) لە فەرمودەی موسای کوڕی عوقبەی مێژوونوسەوە لە عومەرەوە بە(مرسل)ی.

وەقاسیان بۆ لابەرێ کە ئـەمیری کوفـەو پاڵـەوانی قادسـیەو خـاڵۆی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، عومەریش بەپێی ویـستو حـەزی ئـەوان لەکار لایبـرد.

سەرەڕای متمانە بونیـشی بـە سـەعد، پاشـان عومـەر پرسـیاری لێکردن‌و وتی: ئەگەر ئیمامەکەتان ستەمی کردو مافەکانتانی زەوت کردو بە خراپی مامەڵەی لەگەڵ کردن چی لەگـەڵ دەکـەن؟ وتیـان: ئەگەر زۆرداریيەکمان لێبینی خۆ ڕادەگرین؟ عومەر فەرمووی: نە بەو خوایەی هیچ پەرستراوێکی تری نیە، نابنە شاهێد لەسەر زەویدا تاوەکو واتان لـێ نەیەت ڕایان بگرن چۆن ڕاتـان دەگـرن‌و لـە پێنـاوی ڕەوادا لێیان دەدەن وەکو چۆن ئەوان لێتان دەدەن ئەگەرنا نابێت).[1]

هەروەها دەسەڵات مەشـروعیەتی بـوون‌و بـەردەوامێتی لەدەسـت دەدات ئەگەر بیـەوێ حوکمـەکانی دەسـتوری دەوڵـەت کـە کیتـاب‌و سـوننەیە لـەکارنخا، ئـا لەوکاتـەدا پێویـستە لـە دژی ڕاپـەڕی‌و لـە فەرمانی دەرچی، ئەوەبوو هاوەڵان پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەك لە فەرمودەی سەحیح دا هاتووە: (ألا ننازع الأمر أهله إلاّ أن تروا كفراً بواحاً عندكم من الله فيه برهـان)[2] وە لەسـەر ئـەوەی لـە

(١) ابن شبة (٨١٦/٣) بە سەنەدێکی (جید) بە پێی مەرجی بوخاری تا دەگاتە هارون ی کوڕی عەبدوڵلای حەزرەمی، کەلە (ثقات)ی (ابن حبان)دا هەیە- لە (عفیف بن معدیکرب) کە بە (هاوەڵ) ژمێردراوە هەروەك لە (الإصابة)دا هاتووە.

(٢) البخاري بە(فتح)ەوە (٥/١٣)، ف ژمارە (٧٠٥٦) ومسلم ١٤٧٠/٣ ف ژمارە (١٧٠٩).

هەرکوێیەك بوون قسەی ڕەوا بڵێن یابەکاری ڕەوا هەستن و لـە پێنـاوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسن ((علی أن نقول (أو نقوم) بـالحق أينما كنّا، لا نخاف في الله لومة لائم)).[1]

ئەم فەرمودەیە سێ بنەمای سیاسی سەرەکی لەخۆدەگرێ: -

١/ پێویستە گوێڕایەڵی دەسەڵات بکـرێ تائەوکاتـەی بەئەرکـەکانی خۆی هەڵدەسێ و لەوڕووەوە کێبەرکێی لەگەڵدانەکرێ.

٢/ مافی ئوممەتە لایبەرێ و لە دژی دەرچێ ئەگەر سنوری (مـا أنـزل الله)ی بەزانـد، وە کـوفری ئاشـکرای دەرخـست کـە بریتیـە لـە ســـەرپێـچی ئاشـکرا وەك لـە هەنـدێ گێڕانـەوەدا هـاتووە،[2] نەوەوی فەرمویـەتی: (مەبەسـت لـە کـوفر لێـرەدا تاوانکـاری و سەرپێچیە)،[3] ئەمە ئەگەر ڕەخساو خراپەکاری لـێ نەکەوتـەوە، (داودی) فەرمویـەتی: (ڕای زانایـان سـەبارەت بـە فەرمانـدە ستەمکارەکان ئەوەیـە کـە ئەگـەر تـوانرا لابـرێ بـەبێ ئـاژاوەو ستەمکاری ئەوا پێویستە، ئەگینا خۆڕاگری پێویستە).[4]

بەڵام ئەگەر ئیمام کوفری کردو بێباوەڕبوو، یـاخود شـەریعەتی لەکارخست ئەوا بەکۆڕا پێویستە لە دژی دەرچن، (قاضي عياض)

(١) سەرچاوەی پێشوو.
(٢) سەیری (فتح الباري) بکە ٨/١٣.
(٣) شرح مسلم ٢٢٩/١٢.
(٤) فتح الباري ٨/١٣.

فەرمویەتی: (زانایان کۆن لەسەر ئـەوەی کـە ئەگـەر کـوفرێکی بەسەر داهات یا شەرعی گۆڕی یابیدعەکاری دەکرد ئـەوا مـافی سەرپەرشـتێتیو کاربەدەسـتێتیو گوێڕایـەڵی لەدەسـت دەداتو پێویستە لەسەر مسوڵمانان لە دژی ڕاپەڕنو لەکاری بخەن ئەگـەر توانیان ئیمامێکـی دادگەر دابنێن، ئەگەر ئـەوە بـەدی نـەهات تەنها بۆ کۆمـەڵێکیان نەبێ ئـەوا پێویـستە لەسـەریان کافرەکـە لابـــەن). [1]

ئیبنوحەجەر فەرمویەتی: (ئەگەر بێباوەڕبوو بە کۆڕا لادەبـرێو پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێ بەوکارە هەستێ). [2]

٣/ بنەمای ئازادی بیروڕاو مافی دەربڕین (وأن نقول الحق أينمـا كنـا) ڕاستو ڕەوا بلێین لە هەرکوێیەك بووین، بێئەوەی ترسو بـیم لـە دەسەڵات هەبێ، حەرامیشە لەسەر دەسەڵات مافی بیروڕا دەربـڕین زەوت بکا.

ئـەم بەیعەتـەش لەشـەوی عەقەبـەدابوو لـە مەککـەو لـە پـێش کۆچـکردنی پێغەمبــەر ﷺ، ئــەو گــرێ بەســتەش بریتیــە لــەو بەڵگەنامەیەی کە لەسەر بناغەی ئەو دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینەدا دەمەزرا، کە ئەمەش تەئکیدە لەسەر ئەوەی ئەو بەیعەتە لـە پێنـاوی

---

(١) (شـرح مـسلم)ی نـەوەوی ٢٢٩/١٢ کـە ووتـەی (او بدعـە)ی بـە ( بیدعـەی کافرکـەر لێکداوەتەوە).

(٢) فتح الباري ١٢٣/٣.

بەرپاکردنی ئایینو دەوڵەت دا بووە پێکەوە، تیاشیدا گرنگترین مـــافو ئەرکە بنەڕەتییەکان دەست نیشان کرا.

(عوبـــادە) ی کـــوڕی (صـــامت) لـــە شـــام دا ئـــەم فەرمودەیـــەی دەگێڕایەوەو بە ئاشکراش هەندێ ڕەفتاری موعاویەیو بە خراپ دادەنا، ئەم فەرمودەی بەیعەتەشی بە بەڵگە دەهێنایەوە، موعاویەش نوسراوی بۆ عوسمان کردوو تیایدا نوسی: (لەڕاستیدا عوبادەی کـوڕی صـامت شامو خەڵکی شامی لـێ تێکدام) کاتێك عوبادە هات بۆ لای عوسمان پێی فەرموو: گوێم لە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو دەیفـەرموو: (إنـه سيلي أموركم بعدي رجال يعرفونكم ما تنكرون، وينكرون عليكم مـا تعرفون، فلا طاعة لمن عصى الله تبارك وتعالى، فلا تعتلوا بربكم).[1] واتە: (لە دوای من کەسانێك کاروبارتان دەگرنە دەست شتانێك بەباش دەزانن کە ئێوە بە خراپی دەزانن، هەندێ شتان لـێدەکەن بە خراپ کە بە چاکتان زانیوە، گوێڕایەڵی بۆ کەسانێك نیە کـە بێفـەرمانی خـوا دەکەن، کەواتە (خۆتان تاوانبار مەکەنو گوێڕایەڵیان مەبن).[2]

(١) مسند احمد (٣٢٥،٣٢٩/٥)، وە حاکم (٣٥٦/٣-٣٥٧) لـە چـەند ڕێگەیەکـەوە بـە کورتیو بە (صحيح)ی داناوە، سەیری (تهذيب ابن عساكر ٢١٤/٧-٢١٦) و ئەلبانی بە (صحيح)ی داناوە ژمارە (٥٩٠)، ئیبنو ئەبو شەیبە لە (المصنف ٥٢٦/٧)دا (حاکم)یش بـە پێـی مـەرجی بوخاریو موسلم بـە (صحيح)ی داناوە ٣٥٧/٣ لـە عوبادەوە بـە دەربڕینـی: (ستكون عليكم امراء يأمرونكم بما تعرفون ويعملون ما تنكرون، فليس لأولئك عليكم طاعة).

(٢) (ابن ابو شيبه)و (طبراني) گێڕاویانەتەوە، ئەلبانی بە (صحيح)ی داناوە،هەروەك لە (الجامع ژمارە ٣٦٦١)دا هاتووە.

(ابن عبــاس) فەرمویــەتی پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمویــەتی: (سيكون أمراء تعرفون وتنكرون، فمن نابذهم نجا، ومن اعتزلهم سلم، ومن خالطهم هلك).[1] لەمەولا چەندین ئەمیرتان دەبێ هەندێ شتیان بە باش دەزانن‌و هەندێ شتیش بــە خــراپ، هەرکەســێ بەرهەڵــستیان بکات ڕزگاری دەبێت، هەرکەسەش خۆی کەنار بگرێ لێیان سەلامەت‌و پارێزراو دەبێــت، هەرکەســێکیش تێکــەڵیان بــێ تیادەچــێ) ووشــەی (المنابذة) لە فەرمودەکەدا بەرگری‌و ڕووبەڕووبونەوەی لادانەکانە.

هاوەڵان ﷺ ڕووبەڕووی لادان‌و ناڕێکی دەبونەوە ئەگەر لە خەلیفــەو ئەمیرەکانیشەوە بوایە، هەندێکیان ئینکاری بە دانیــشتنەوە وتــاردانی مەڕوانی کوڕی حەکــەمیان کــرد، ئەبوســەعیدی خــودری فــەرمووی: ئەمە (ئەو پیاوەی ئینکاری کرد لە مەڕوان) ئەرکی سەرشــانی خــۆی جێبەجێکرد، لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیــستووە فەرمویــەتی: (مــن رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يــستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان).[2] نەوەوی لــە شــرۆڤەو شــەرحی ئــەم فەرمودەیەدا دەڵێ: (کیتاب‌و سوننەو کۆڕای ئوممەت پێکەوە واجبێتی فەرمان بە چاکەو بەرهەڵستیکردنی خراپــە دەســەلمێنن، ئەمــەش بــە هەمان شێوە بەشێکە لەو ئامۆژگاری (نصیحە)یەی لە ئایین دا هەیە، زانایان فەرمویانە: فەرمان بە چاکەو بەرهەڵستی لە خەراپە تایبــەت

(١) مسلم گێڕاویەتی یەوە ١/٦٩ ف ژمارە ٤٩٥.

(٢) موسلیم گێڕاویەتی یەوە ١/٦٩ ف ژمارە ٤٩.

نیه به کاربەدەستان، بەڵکو ئەوە بۆ تاکەتاکەی مسوڵمانان دروستە، ئیمامی حەرەمەین فەرمویەتی: بەڵگەش کۆڕای مسوڵمانانە، چونکە جگە لە کاربەدەستانیش لە سەرەتای ئیسلامو چاخی دواتریش فەرمانیان بەچاکە دەکردو بەرهەڵستی خراپەیان دەکرد، مسوڵمانانیش دانیان بەکارەکانیاندا دەنا بێ‌ئەوەی کاربەدەست بو بێتن).[1]

ئیبن‌و مەسعودیش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (هەر پێغەمبەرێك خوا ناردبێتی بۆ ئوممەتەکانی ئەوا لە ئوممەتەکەیدا حەواری و هاوەڵی هەبووە، کە دەستیان بە سوننەتەکەیەوە گرتووەو شوێنی فەرمانەکانی کەوتوون، پاشان کەسانێك دواتر دێن ئەوەی دەیڵێن نایکەن وەشتانێك دەکەن کە فەرمانیان پێ‌نەکراوە، هەرکەسێ بەدەستی جیهادیان بکات باوەڕدارە، هەرکەسی بەزمانی جیهادیان بکات باوەڕدارە، هەرکەسێ بەدڵی جیهادیان بکات باوەڕدارە، لە دوای ئەوەوە هێندەی تۆوی خەرتەلەیەك باوەڕی نیە)،[2] لە گێڕانەوەیەکی تردا: (ئەمیرە دووایینەکان کەسانێکن ئەوەی دەیڵێن نایکەن، وەئەوەی دەیکەن فەرمانیان پێ‌نەکراوە)،[3] ئیبن‌و ڕەجەبی حەنبەلی فەرمویەتی: (ئەمە بەڵگەیە لەسەر

(١) شرح النووی علی المسلم ٢/٢٢ – ٢٣.
(٢) مسلم ١/٧٠ ف ژمارە ٥٠.
(٣) مسند احمد ١/٤٦٢ بە سەنەدێکی سەحیح بە پێی مەرجی موسلم.

جیهادکردنی فەرمانده‌کان بەدەست — ئەحمەد ئەم فەرموده‌یه‌ی بەتەواو دانەناوه.... وەلامیش بۆ ئەمه ئەوەیه کە گۆڕانکـاری بەدەسـت جـەنگ ناخوازێ، هەروەها ئەحمـەدیش دەقـی هەیـه لەبارەیـەوه فەرمویـەتی: (گـۆڕان بەدەسـت نـەك بـە شـیرو چـەك، ئـا لەوکاتـەدا جیهـادی فەرمانده‌کان بەدەسته.... بریتیه لەوەی بەدەستی ئـەو سـتەمانه پـوچ بکاتەوه کە فـەرمانی پێدەکـەن ئەگـەر توانـای هـەبوو لەسـەرئەوه، هەموو ئەوانه دروسته، بەلام ئەمه لەڕووی شەڕکردنەوه نیه لەدژیانو دەرچوون لێیان). [1]

شێخ عەبدوڵلای کوڕی موحەمـەدی کوڕی عەبـدولوهاب سـەبارەت بەڕونکردنەوەی ئەم مەسەلەیه فەرمویەتی: (ئەهلی سوننەو جەماعه لەم مەسەلەیەدا جیاوازیان تێدایه هـەروەك لای ئالوبـەیتیش هەیـه، هەندێ لە ئەهلی سوننه کە هـاوەڵانو دواتریـشی تێدایـه هاووێنـەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسو ئوسامـەی کوڕی زەیدو موحەمـەدی کوڕی مەسلەمەو عەبدوڵلای کوڕی عومـەر ﷺ و جگە لـەوانیش، هـەروەها ئەمه قسەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو کۆمەڵێك لە زانایانی فـەرموده ناسیشه، کەفەرمویانه: (کە فەرمان بەچاکەو نەهی کردن لە خەراپـه بە زمان دەکرێ ئەگەر توانرا، ئەگینا تەنها بە دڵه، وەنابێ بەدەسـتو ڕاکێشانی شیرو دەرچون بـێ دژ بـە ئیمامـەکان، ئەگەرچـی ئیمـامی

(١) جامع العلوم الحکم  لا ٣٢١.

زۆرداریش بن.

لەلایەکی تـرەوە کۆمــەڵێك لــە هــاوەڵان ﷺ وە لــەپاش ئــەوانیش هەندێك لــە تــابعین و پێشەوایانی دوای ئــەوان بۆچــونیان وایــە کــە شیرهەڵکێشان لە فەرمان بەچاکەو نەهی کردن لە خراپــەدا پێویــستە ئەگەر خراپەکە تەنها لادەبرا، ئەمە گوتەی عەلی کــوڕی ئــەبوتالیب و هەموو ئەو هاوەڵانەیە ﷺ کە لەگــەڵی بــوون وەکــو عــەماری کــوڕی یاسرو عەبدوڵلای کوڕی عــەبباس و ئــەبو ســەعیدی خــودری و جگــە لەوانیش، وە ئەمە وتــەی دایکــی بــاوەڕداران و ئــەو هاوەڵانەشــە کــە لەگەڵیدا بوون وەکو عەمری کوڕی عــاص و نوعمــانی کــوڕی بەشــیرو ئەبو عادیەی سولەمی و جگەلەوانیش، وەگوتەو بۆچــونی عەبــدوڵلای کوڕی زوبەیرو حوســەینی کــوڕی عــەلی یــە، وەقــسەی هــەموو ئــەو کەسانەشە کە ڕاپەڕین دژ بە حەجاجی فاسـق، لەوانــە عەبــدوڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلاو سەعیدی کوڕی جوبەیر، ئەبو بوختــەری (طــائي) و (عطا)ی سولەمی و حەسەنی (بصری) و شــەعبی و هەنــدێ لەوانــەی بەدوایاندا هاتن، هاوڕێنەی خواناسی خاوەن فــەزڵ عەبــدوڵلای کــوڕی عبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومــەرو عوبەیــدوڵلای کــوڕی حەفسی کوڕی عاسم وە هەموو ئەوانــەی لەگــەڵ موحەممــەدی کــوڕی عەبدوڵلای کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالب دا دەرچــوون بە هاوڕێیەتی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵلای برایــی و هەشــیمی کــوڕی

بەشیـــرو وەڕاق‌و جگەلەوانیش).[1]

هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە: (ستكون أمراء فتعرفون وتنكـرون، فمن عرف برئ، ومـن أنكر سلم، ولكن مـن رضي وتـابع) قـالوا: أفـلا نقاتلهم؟ قال: (لا، ما صلوا)،[2] لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (خير أئمتكم الذين تحبونهم ويحبونكم، وتصلون علـيهم، ويـصلون علـيكم، وشرار أئمتكم الذين تبغضونهم ويبغضونكم، وتلعنـونهم ويلعنـونكم، قالوا: أفلا ننابذهم السيف يا رسـول الله؟ قـال ﷺ : لا مـا أقـاموا فيكم الصلاة)،[3] باشترینی پێشەواکانتان ئەوانەن خۆشـتان دەوێـن‌و خۆشتانیان دەوێن، بۆیـان دەپاڕێنـەوەو بۆتـان دەپاڕێنـەوە، خراپترینـی پێشەواکانتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانـەوە ڕقیـان لێتانـە، نـەفرینیان لـێدەکەن‌و نەفرینتان لێدەکەن، فەرمویان ئایا بەشیر دەریان پـەڕێنین ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ فـەرمووی نـەخێر تـاوەکو ئەوکاتـەی نوێـژ لەناوتاندا دەکەن)

هەموو ئەم دەقانە تەئکیـد دەکەنـەوە لەسـەر مـافی ئومـەت لـە لابردنی ئیمام‌و ڕوبەڕووبونەوەی لادانی دەسەڵات ئەگەر بەهێزیش بووە، ئەگەر لادانەکەی گەیشتە ڕادەی لەکارخستنی دروشـمەکانی ئیـسلام‌و حوکمە فەرزەکان، (عیاض) کـۆڕای بـاس کـردووە لەسـەر پێویـستی

---

(١) جواب اهل السنة ل (٧٠ – ٧١).

(٢) رواه مسلم (١٤٨٠/٣)ف (١٨٥٤) لە فەرموودەی ئومو سەلەمە (خوا لـێی ڕازی بێ).

(٣) صحيح مسلم ١٤٨١/٣، ف (١٨٥٥) لە فەرموودەی عەوفی کوڕی مالیکەوە.

لابردنی فەرمان ڕەوا ئەگەر شەرعو ئاینی گۆڕی یا کـافربوو،[1] (ابـن حزم) یش فەرمویەتی: (گوێڕایەڵیکردنی ئیمام واجبە تائەو کاتەی بە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی سەرکردایەتیمان دەکات، ئەگەر لایدا لە شتێکی نێو کیتابو سـوننەت ڕێگـری لـێدەکرێ، حـەددو حەقی بەسەردا پیادە دەکـرێ، ئەگـەر ئـازارو ئەزیّتـەکانی تـەنها بـە لابردنی بەدی دەهات ئەوا لادەبرێو کەسی تر دەخرێتە جێی)

هەروەها فەرمویەتی: (واجب وایە ئەگەر شتێك لە زۆرداریو نا دادی ڕویدا هەرچەندە کەمیش بێ لەوبارەیەوە قـسە لەگـەڵ ئیمـام بکـرێو ڕێگری ئەو کارەی لێبکرێ، ئەگەر خـۆی گـرتو گەڕایـەوە بـۆ دواوەو ملکەچی دەربڕی بۆ تۆڵە دانەوەی ئەو ئازارانـەی بـە پێـستو لاشـەی خەڵکی گەیاندووە یاخود ئامـادەبوو حـەددی زینـاو تۆمـەتبارکردنو عەرەق خۆری بەسەردا جێبەجێ بکرێ ئـەوا بـواری لابردنـی نیـە، وە ئیمامەو دروست نیە لەکار لابرێ، ئەگەر ئامـادە نـەبوو شـتێك لـەم واجبانە جێبەجێ بکرێ بەسەریداو بەخۆدا نەچووەوە، پێویستە لابرێو کەسێکی تر لە جێی دابنرێ کە ڕەوا جێبەجێ بکات).[2]

(عبدالقاهر)ی (بغدادی) وتویەتی: (هەرکاتێ کاروبـاری دیـاری ئیمام بە پێی شـەریعەت بـوو، ئـەوا کاروبارەکـانی لـە ئیمامـەت دا ڕێکخراوە، وەهەرکاتێ لەوەلایدا ئەوا ئوممەت پێوەرە بەسەریەوە بۆئەوەی

(١) النووي شرح مسلم، (١٢/٢٢٩).

(٢) الفصل في الملل والنحل (٤/١٧٦).

له هه‌ڵه‌كه‌ی ڕاستی كه‌نه‌وه، یاخود بیخه‌نه سه‌ر ڕێگه‌یه‌كی تـر، ڕێو شوێنی ئوممه‌ت له‌گه‌ڵ ئـه‌ودا وه‌كـو ئـه‌و ڕێو شـوێنه‌یه كـه خه‌لیفـه له‌گه‌ڵ بریكارو قازیو كاربه‌ده‌ستو فه‌رمانبه‌ره‌كانیـدا هه‌یـه‌تی، جـا ئه‌گه‌ر ئه‌مانه له سوننه‌ت لایاندا ئه‌وا یان دادگه‌ریان پێ ئـه‌نجام ده‌دا یاخود كاری پێیان نامێنێو ده‌یانگۆڕێ)، [1] واته ئوممه‌ت له سـه‌رووی ئیمامه‌وه‌یـــه هـــه‌روه‌كو چـــۆن ئیمـــام لـــه ســـه‌رووی وه‌زیـــرو كاربه‌ده‌سته‌كانیه‌وه‌یه، بۆی هه‌یه ئه‌گه‌ر ئیمام لایدا بیگه‌ڕێنێته‌وه بـۆ هه‌قو ڕه‌وا یاخود پێویستی پێی نه‌مێنێو له‌كاری بخـاتو كه‌سـی تـر هه‌ڵبژێردرێت هه‌روه‌ك چۆن ئه‌و واده‌كات له‌گه‌ڵ ژێرده‌سته‌كانیدا.

بـــه‌م شـــێوه‌یه ئیـــسلام بنـــه‌مای مه‌شـــروعیه‌ت ده‌چه‌ســـپێنێ، مه‌شروعیه‌تیش بریتیه له‌وه‌ی كـه هه‌ڵس‌وكه‌وتـه‌كانی ده‌سـه‌ڵات لـه سنوره‌كانی شه‌ریعه‌تو یاسای ده‌وڵه‌ت دابنو له‌ســه‌ر ئـه‌و بناغه‌یـه‌و پابه‌ندبوون پێیه‌وه ئوممه‌ت گرێبه‌ستی (به‌یعه‌ت) ئـه‌نجام ده‌دا له‌گـه‌ڵ ئیمام دا، جا ئه‌گه‌ر له (قطعیات)ی ئه‌و په‌یمانه لایدا ئـه‌وا پێویـسته له‌سه‌ر هه‌موو ئوممه‌ت به به‌رپرسیارێتی خۆی هه‌ســتێو دژ بـه ئیمـام ڕاپه‌ڕێو لاییباتو ئیمامێكی دادگه‌ر له شوێنی دانـێ، كـه ئه‌مـه‌ش ته‌ئكیده له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئوممه‌ت بریتیه له‌سه‌ر چـاوه‌ی ده‌سـه‌ڵات، وه هه‌ر ئه‌و ئه‌سڵه‌و ئیمامیش بریكاری ئوممه‌ته.

---

(١) اصول الدين ل (١٧٨).

تەواوی هەڵوێستەکانی هاوەڵان لەقۆناغی یەکەمدا تەئکید لەسەر ڕوونیو چەسپاوی ئەم بنەمایە دەکەنەوە، هەربۆیە هاوەڵان ڕێگرییــان نەدەکرد لەخەڵکی ئــەو وولاتانــەی هــاتبوون بــۆلای عوسمــان ﷺ بــۆ گفتوگۆو مشتومڕ لەگەڵ کردنیو ڕەخنە گرتن لەو لادانــەی ئــەمیری هەرێمەکان تێی کەوتبوون، چونکە ئەمـەیان بەمافی ئەوان دەزانی.

هەروەها هەر ئەم بنەمایەش بــوو پــاڵی نــا بــە تەڵحــەو زوبــەیرو عائـــشەوە ﷺ بـــۆ سەرپێـــچیکردنی عـــەلی ﷺ و دەرچـــوون لـــە گوێڕایـــەڵیکردنی، چـــونکە ڕایـــان وابـــوو کوشـــتنی عوسمـــان ﷺ خراپەیەکەو پێویستە تۆڵەی بۆبسێنرێ لەوکەسانەی پێی هەستاون.[1]

هۆکاری ڕاپەڕینو دەرچوونی حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ ش لەگـەڵ خەڵکی عیراقدا بە پێی هەمان بنەما ڕاڤەدەکرێ، دەرچوونی خــەڵکی مەدینە کە زۆربــەیان کــوڕی هــاوەڵان بــوون لــە ڕووداوی (الحـره) داو ڕاپەڕینی عەبدوڵڵای کــوڕی زوبــەیرو خــەڵکی لەگوێڕایــەڵی کردنــی یەزیدو لەکارلادانی بەهۆی ئەو هەموو ستەمو لادانانەی لەســەردەمی ئەودا ڕوویدا لەژێر سایەی هەمان بنەمادا جێی دەبێتەوە.[2]

شێخی ئیسلام (ابن تیمیــه) فەرمویــەتی: (دەســەڵاتدارو ســوڵتان بەرپرسە لەو دەستدرێژیو کەمتەرخەمیانــەی لــە مافەکانــدا ئــەنجام

(١) سەیری (ابن جریر ١٥/٣) بکە.

(٢) سەیری قۆناغی دووەم بکە کە پاشتر باسی دەکەین.

دەدرێ، ئەگەر لە توانـای ئـەودابوو)، [1] هەربۆیـە شەرعناسـان لـە کتێبەکانی فیقهداو لە دەروازەو بـابی تاوانـەکان (الجنایـات)و تۆڵـە سەندنەوەکان (القصاص)و دەعواو قەزادا جیاوازییان نەدەخستە نێوان فەرمـان ڕەواو خەڵکی (الحاکم والمحکوم)دا.

هەموو ئەو بنەما باسکراوانەی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو لە ڕونترین شێوەو وێنەدا لە ڕوداوی (السقیفە)دا بەدەردەکەوێ لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ، ئەوەبوو دەست پێـشخەری هـاوەڵان بـۆ یەکلاییکردنەوەی بابەتی ئیمامەت ڕوونکردنەوەی زەرورەتی دەوڵەت بوو بۆ ئایین وە بەوەی کە ئاین بێ‌دەوڵەت نابێ، هەروەها کۆبونەوەشیان لەسەر یەك ئیمام بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەوڵەت بەبێ ئیمامەتو دەسەڵاتێك بونی نیە، هەروەها گرێ دانی بەیعەتیش بۆ ئەبوبەکر لـە سـەقیفەداو پاشان لە مزگەوتدا بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئیمامەت بەبێ گرێبەستی بەیعەت بـەدی نایـەت، لـە ڕێککـەوتنو گفتوگۆکـانو پاشـان ڕازی بونەکانیان ئەوە بەدەردەکەوێ کە بنەمای گرێبەست بەبێ ڕەزامەنـدی نابێو ڕازیبونیش بەبێ ڕاوێژ نابێ، ڕادەربڕینی هەرلایەك بـۆ بۆچـونی خۆی بەبێ هیچ ترسو بیمێك بنەمای (ڕاوێژ بەبێ ئازادی نابـێ)مـان بۆ دەخاتە ڕوو، هەروەك چۆن بەیعەت پێدانیان بـە ئەبوبـەکر لەسـەر

---

(١) مجموع الفتاوی (٢٠/٥٤).

کیتابو سوننه[1] بنەمای (مەشروعیەتمان بۆ دەخاتە ڕوو وەدەری دەخا شەریعەت بریتیە لەمەرجەعیەت هەروەك چۆن ئەبوبەکر لەو وتـارەی کە ڕاستەوخۆ دوای بەیعەت پێدانی تەئکیدی لەسـەر ئـەم بنەمایـە کردەوە.

(١) سەیری (السنة)ی خـلال لا ١٠٣ و(مصنف عبدالرزاق ٣٣١/١١) بکە لە باسی بەیعەت دانی خەڵکی بە ئەبوبەکر بە پێی کیتابو سوننەت.

٨- هێنــانەدی هەردوو بنەمای دادگەری‌و یەکســانی

دادگەری لە قەزاو یەکــسانی لــە بەخــشیندا، لــە گــرنگترین ئــەو بنەمایانەن کە گوتاری سیاسی لە قۆناغی یەکەمدا لەسەری بنیــات نراوەو نمایندەی ڕێنماییە ئایینیە دابەزێنراوەکان دەکەن، قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتیدا تەئکیدی لەسەر ئەو دوو بنەمایــە کردووەتــەوە وەکــو لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾ (النساء: ٥٨) واتە: ئەگەر داوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا بەدادگەرانــە بیکەن، ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَـوْمٍ عَلَـى أَلاَّ تَعْـدِلُوا اعْـدِلُوا هُـوَ أَقْـرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ (المائدة: ٨) دوژمنــی‌و قینــی دەســتەیەك هــەڵتان نــەنێ بــە هەقانەت ڕەفتار نەکەن، بە یەکــسانی‌و بێجیــاواز لەگــەڵ خەڵکیــدا ڕەفتار بکەن چونکە ئەوە دەبێتە هۆی پــتر نزکبونــەوە بــە پارێزکــاری، بــەڵکو خــوای گــەورە مەبەســتی نــاردنی پێغەمبــەران‌و دابەزانــدنی کتێبەکانی بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجــە دانــاوە، هــەروەك خــوای گــەورە فەرمویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ (الحديد: ٢٥) ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بــە چــەند بەڵگەی ئاشکراوەو لەگەڵیدا کتێب‌و تەرازوی هەڵــسەنگاندنمان نــاردە خوار تاوەکو خەڵکی لە نێوان خۆیاندا بەدادگەری هەستن.

قورئان داوای دابەشکردنی سامان‌و دارایی دەکا بۆ ئــەوەی ڕێگــری بکا لەبەردەم زاڵبوونی چینی سەرمایەدار بەســەر ســامان‌و داراییــدا،

هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿كَـيْ لا يَكُـونَ دُولَـةً بَـيْنَ الْأَغْنِيَـاءِ مِـنْكُمْ﴾ (الحـشر: ٧) واتـــە بۆئـــەوەی ســـەروەتو ســـامان تـــەنها لای دەوڵەمەندەكان كۆنەبێتەوەو دەستاودەستی پێبكرێ.

هەروەها قورئان هاتووە بۆئەوەی ڕێگری بكا لـەوەی دەسـەڵات كـە مەترسی دارترە لە ماڵو سامان، تەنها لە نێوان چین یـان خێـزان یـا حیزبێكی دیاریكراودا نەبێو دەستاو دەستی پێبكرێ، هەربۆیـە دانـی نـاوە بـە بنـەمای ڕاوێـژداو (وَأَمْـرُهُمْ شـورَى بَيْـنَهُمْ) لەدەسـەڵات دا بچەسپێ، تاوەكو لە نێوان ئوممەتدا دەسـتاو دەسـتی پێبكـرێ بـەپێی ڕەزامەندی ویستو هەڵبژاردەی خۆی، بێئەوەی هیچ كەسێ هـەژمونی هەبێ بەسەریدا، یاخود مافی ئوممەت زەوت بكـا، وەبۆئـەوەی ڕێگـری بكرێ لە بەرپابوونی دەسـەڵاتێكی زۆردار كـەخۆی بـسەپێنێ بەسـەر ئوممەت دا لەڕووی سیاسییەوە.

هەروەها دانی ناوە بەبنەمای: (كَيْ لا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُم) لە سەروەتو ساماندا بۆ ئەوەی لە نێوان تەواوی تاكەكانی كۆمەڵگادا دەستاو دەستی پێبكرێ، وە ڕێگری بكـرێ لـەوەی سـەرمایە دارەكـان بتوانن هەژمونی خۆیان بسەپێنن بەسەر توانا ماددیەكانی ئوممەت لە ڕووی ئابوورییەوە.

پێغەمبـــەر ﷺ تەئكیـــدی لەســـەر ئـــەم بنەمایـــە كردۆتـــەوەو فەرمویەتی: (ما أعطاكم ولا أمـنعكم، إنما أنـا قاسـم أضـع حيـث

أمرت). [1] واته نه پێتاندەبەخشمو نــه لێتــان قەدەغــە دەکــەم، مــن تەنها دابەشکارم، لەشوێنێکدا دای دەنێم کــه فــەرمانم پێکــراوە)، وە پێی وتوون: (ئەی خەڵکینه، بەشی من لەم ماڵو داراییەدا تەنها پێنج یەکە، پێــنج یەکەکــەش بۆخۆتــان گەڕاوەتــەوە)، [2] وە فەرمویــەتی: (هەرکەســێ ســامانو داراییــەکی لــێ بــەجێماوە ئــەوا بــۆ میراتگرەکەیەتی، هەرکەسیش پەککەوتەو خاوو خێزانــی لــێ بــەجێ ماوە ئەوا لەسەر منەو لە ئەستۆی دەگرم) (من تــرك مــالاً فلورثتــه، ومن ترك كلاً وعيالاً فإلي وعليّ). [3] پێغەمبەر ﷺ یەك بەشی دەدا بەرەبەن، بەڵام دووبەشی دەدا بەکەسی خێزاندار. [4]

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا هەرکەسی کاروبارێــك راپــەڕێنێت بــۆ بەرژەوەندی مسوڵمانان ئەگەر رەبــەن بــوو ژنــی بــۆ بهێنــرێ، ئەگــەر خانووبەرەو جێگەی نەبوو بــۆی دابــین بکــرێ، ئەگــەر ئــاژەڵو ئــاژەڵی سواری نەبوو بۆی دابین بکرێ، [5] ئەمانەشی بە مافی خۆیان داناوە لە (خانــەی ســامان) (بیــت المــال)دا لەبەرئــەوەی بەرژەوەنــدی ئوممــەت رادەپەڕێنن.

---

(١) البخاري، ف ژمارە (٣١١٧).

(٢) ئەبوبەکر گێڕاویەتی یەوە ف ژمارە (٢٦٩٤) و مالك لە (الموطأ) ٢/٤٥٨.

(٣) بوخــاری ٨/٥١٧، ژمــارە (٤٧٨١)، موسـلم لــە ٢/٥٩٢ گێڕاویــەتی یــەوە، ف ژمــارە (٨٦٧)، وە ئەبوداود ٣/٣٦٠ – ٣٦١، ف(٢٥٩٤) و ( ٢٩٥٥)

(٤) ئەحمەد لە (المسند)دا ٦/٢٥ و ئەبوداود ٣/٣٥٩، ف ژمارە (٢٩٥٢)، (ابن حبــان ابن حبان ١١/١٤٥، لە ف ژمارە (٤٨١٦) بە سەحیحی داناوە.

(٥) الأموال لا ٢٧٩.

هــاوەڵانیش ﷺ هەسـتیان کردبـوو بەبنـەمای واجبـی پاراسـتن‌و پارێزگاری‌کردنی سامان‌و دارایی گشتی‌و پێویستی سـەرف کردنـی بەپێی ناوەڕۆکی دادگەری‌و یەکسانی، هەربۆیە هاوەڵان ﷺ لـە (بیـت المال)دا بە پێی دابینکردنی پێویستییەکانیان پارەیان بۆ ئەبوبـەکرﷺ بڕیـەوە، لـە گێڕانەوەیەکـدا هـاتووە: (کاتـێ ئەبوبـەکر کاروبـاری پێ‌سـپێردرا هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمویان: بـەپێی بێ‌نیازوبوونی لە خەڵکی بۆی بڕنەوە، ووتیان: باشە، جـل‌و بـەرگ بـۆ کردنی ئەگـەر کـۆن‌و بێ‌کـەڵك بـوون‌و داینـان‌و جـل‌و بـەرگی تـری هـەڵگرت، دابینکردنــی ئـاژەڵی سـواری لـەکاتی سـەفەرکردنیدا، بەخـشین‌و نەفەقـەکردن بـۆ مـاڵ‌و منـاڵی هـەروەك چـۆن پـێش بـە خەلیفەبوونی بۆخۆی دەیکرد، ئەبوبەکر فەرمووی ڕازیم).[1]

عومەر کە لە سەردەمی ئەبوبەکردا قازی بـوو — وە ئەبوعوبەیـدە کە لەسەر (خانەی سـامان) (بیـت المـال) بـوو هەسـتان بـە دانـان‌و بڕینەوەی بڕی نەفەقەی خەلیفە لە (خانەی سامان)ی مـسوڵمانان بـە ڕەزامەندی هاوەڵان ﷺ.[2]

هاوەڵان شەش هەزار درهەمیان بۆ ئەبوبەکر بڕیەوە لـە سـاڵێکدا، کاتێکیش لەسەرەمەرگ دا بوو فەرمانیدا ئەو سامانە زیادەیـەی کـە هەیەتی بگەڕێتەوە بـۆ خانـەی سـامانی مـسوڵمانان، عومـەر لـەم

(١) طبقات ابن سعد ١٣٧/٣، بە سەنەدێکی سەحیح لە حەمیدی کوڕی هیلالەوە.

(٢) طبقات ابن سعد ١٣٧/٣، بە سەنەدێکی سەحیح لە (عطاء)ی کوڕی (سائیب)ەوە.

بارەیـــەوە فـــەرمووی: (ئەبوبـــەکر پـــاش خـــۆی مانـــدووکرد بـــەم هەڵس‌وکەوتانەی). [1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (کاتێ ئەبوبـەکر کەوتـە نەخۆشـی مەرگییەوە، فەرمووی: سەیر بکـەن چـەندێك لـە سـەروەت‌و سـامانم زیادی کردووە لـەو کاتـەوەی چـوومەتە نێـو ئەمیرایەتییـەوە، پاشـان بینێرن بۆ خەلیفەی پاش خۆم). (۲)

ئەبوبەکر لە بەخشینی خانەی سامان (بیت المال)دا یەکسانی‌و وەك یەکی ڕەچاودەکرد لـەنێوان خەڵکیـدا، عائـشە فەرمویـەتی: (بـاوکم سامان‌و دارایی دابەش دەکرد دەیدا بە ئازادو دەیدا بە کۆیلەو دەیدا بە ئافرەت‌و دەیدا بەکەنیزەك، پاشان لە سـاڵی دووەمـدا بیـست بیـستی پێ‌دەدان). [3]

لـە گێڕانەوەیەکـدا هـاتووە: (ئـەو یەکـسانی ڕەچـاو دەکـرد لـە دابەشکردنی سامان لەنێو خەڵکیدا، بە ئـازادو کۆیلـەو نێـرو مـێ‌و گەورەو بچوکەوە، وەکو یەك). [4]

---

(۱) طبقات ابن سعد (۳/۱۳۷)، لەچەند ڕێگەیەکی ترەوە.

(۲) طبقات ابن سعد (۳/۱٤۳)، بە سەنەدێکی سەحیح بەپێی مەرجی بوخاری‌و موسلم، لە چەند ڕێگەیەکی زۆرتریشەوە کە هەموویان سەحیحن گێڕاویەتی یەوە، ئەمەش تەئکیدکردنەوەی مافی ئوممەتە لە چاودێری دارایی‌و گێڕانەوەی ئەو سامان‌و دارایی یە کە لە ماڵی خەلیفەدا هەیە بۆ (خانەی سامان).

(۳) سەرچاوەی پێشوو ( ۳/۱٤٤).

(٤) سەرچاوەی پێشوو (۳/۱٥۹ – ۱٦۰).

هەر هـــاوەڵان ﷺ پێداویـستییەکانی خەلیفـەی دووەم (عومـــەری کوڕی خەتتاب)یان بڕییەوە پـاش ئـەوەی ڕاوێـژی پـێکردن سـەبارەت بەوەی چی لە خانـەی سـامان بەردەکـەوێو بـۆی دروسـتە، ئـەوانیش کۆبونەوە لەسەرئەوەی خۆراکی ڕۆژانەو ئەنـدازەی پێویـســــتیەکانی بۆ هەیە.(١)

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: (عومەر خەڵکی کۆکردەوەو پێی ووتـن: (سەرقاڵتان کردووم بە کاروبارەکانتانـەوە، چـۆن دەبیـنن‌و چـەند بـە دروست دەزانن بۆمن لەم سـامان‌و داراییـەدا؟ عـەلی ﷺ فـەرمووی: ئەوەی کاروباری خۆت‌و ماڵ‌و منداڵتی بە باشی پێ دەڕوا بـەڕێوە لـەم سامانەدا، هیچی ترت بۆ نیە، خەڵکەکەش وتیان: قـســـە قـســـەی عەلی یە).(٢)

هەنـدێ لـە هـــاوەڵان ﷺ پـاش ئـەوەی عومـــەر بـوو بـە خەلیفـە پرسیاریان لێی کرد: کە چـەندەی بـۆ دروسـت‌و حەڵاڵـە لـە خانـەی مسوڵمانان؟ ئـەویش فـەرمووی: (پۆشـاکێکی هاوینـەو پۆشـاکێکی زستانە، ئەوەشی حەج‌و عەمرەی پێدەکەم، خواردنی خۆم‌و ماڵ‌و منالم هاووێنەی خواردنی پیـاوێکی قورەیـشی، نــە دەوڵەمەندەکـەیان‌و نـە هەژارەکەیان، پاشان منیش پیاوێکم وەك مسوڵمانەکان، وەکـو ئـەوان

(١) سەرچاوەی پێشوو ٣/ ٢٣٣ – ٢٣٤.

(٢) (ابنء جرير الطبري) ٤٥٢/٢ لە گێڕانەوەی مێژوونووس سەیف بن عمر بن اسحاق بە سەنەدێك بە پێی مەرجی بوخاری موسلم.

تووشی بەسەرهاتو ڕووداو دێم.[1]

عومەر ﷺ سێجار سوێندی دەخواردو دەیفەرموو: (بە خـوا، هـیچ کەس مـافی زیاتری نیە لەم سامانەدا لە کەسێکی تر، منـیش مـاف دارترینیانم تێیدا، بـە خـوا، هـەموو مـسوڵمانێ بەشـی هەیـە لـەم سامـانەدا، بە خوا ئەگەر بمێنم بۆیان شوان دێ بـۆ بەشـی خـۆی لـەم سامانە لەکاتێك هەر لە شوێنی خۆی شوانێتی خۆی دەکا).[2]

عومەر هەرکاتێ پێویستی بوایە لەخانەی سامان قـەرزی دەکـرد، کاتێکیش بەخشیشەکەی خۆی وەردەگرت قەرزەکەی دەدایەوە بە خانەی سامان،[3] وە دەیفەرموو: (دەزانن منو ئێوە وەك کێواین؟ منو ئێـوە وەکو کەسانێکین سەفەرێکیان کردووەو پارەی مەسروفاتی خۆیـان داوە بە کەسێکیانو پێی دەڵێن: بۆمانی سەرف بکـە، ئایـا بـۆی دروسـتە بۆخـۆی هەنـدێکی هـەڵگرێ؟ فـەرمویان نـەخێر ئـەی فەرمانـدەی مسوڵمانان، فەرمووی: دەی کەواتە منو ئێوەش واین.[4]

پاشان فـەرمووی: مـن کاربەدەسـتانم دانـەناوە لەسـەرتان تـاوەکو قەمچی ڕیزتان کەن، یا تەشەر لە ناموستان بدەن، وەیاخود سەروەتو سامانتان ببەن، بەڵکو بـۆ ئـەوە دامنـاون کیتـابی خـواو سـوننەتی

---

(١) ابن سعد (٢٠٩/٣) بە سەنەدێکی سەحیح، الأموال (ابو عبید) ل (٢٨١).

(٢) ئەحمـەد گێڕاویـەتی یـەوە (٤٢/١) و ئەحمـەد شـاكر فەرمویـەتی: سـەنەدەکەی سەحیحەو ئەبوداود ف ژمارە (٢٩٥٠).

(٣) ابن سعد (٢٠٩/٣) بە سەنەدێکی سەحیح و الأموال ی (ابو عبید) لا (٢٨١).

(٤) ابن سعد (٢٠٩/٣) بە سەنەدێکی سەحیح و الأموال ی (ابو عبید) لا (٢٨١).

پێغەمبەرەکەتان ﷺ فێرکات، هەرکەسێ کاربەدەستەکەی ستەمی لێکرد ئەوا مۆڵەت دراوە با بەرزی کاتەوە بۆ منو پێمی بگەیەنێ تا تۆڵەی بۆ بکەمەوە، عەمری کوڕی عاص فەرمووی: ئەی ئەگەر ئەمیرەکە تەمێی یەکێك لە خەڵکەکەی خۆی کرد، ئایا تۆ تۆڵەی لێ دەکەیتەوە؟! عومەر ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی تۆڵەی لێ ناسێنم، لەکاتێکدا بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەی لە خۆی سەندووە؟

عومەر ﷺ نوسراوی کرد بۆ فەرمانـدەی سەربازەکانو تیایدا هاتبوو لە مسوڵمانان مەدەنو ڕیسوایان مەکەن، بێبەشیان مەکەن بەهۆی ئەوەوە بێباوەڕ (کافر) بن)،[1] عومەر دیوانەکانی دانا کە لە فارسو ڕۆمەوە وەری گرتبوو، بەمەش بناغە ئیدارییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دانا، هیچ یەکێك لە هاوەڵان ﷺ لەسەر ئەمە بەرهەڵستیو ڕێگری لێ نەکرد، وەك کارکردنێ بە فەرمودەی (ئێوە شارەزاترن لە کاروباری دونیاتان) (أنتم أعلم بأمور دنیاکم)

پاش ئەوەی سەروەتو سامان زۆر بوو ڕاوێژی کرد بە هاوەڵان بۆ دانانی دیوانەکان، عەلی ﷺ فەرمووی: هەموو ئەو سەروەتو سامانەی لە ساڵێکدا کۆدەبێتەوە هەمووی دابەش بکرێو هیچی لێ هەڵنەگیرێ، عوسمان ﷺ فەرمووی: وادەبینم سەروەتو سامان گەلێك زۆربووەو بەشی

---

(١) ابن سعد (٣/٢١٢-٢١٣) بە سەنەدێکی سەحیح بە پێی مەرجی موسلم، وە ئەحمەد (١/٤١) ئەحمەد شاکر فەرمویەتی: ئیسنادەکەی باش -حسن-ە، وە ئەبوداود ف ژمارە (٤٥٣٧) وە نەسائی (٨/٣٤).

هەموو خەڵکی کردووە، جا ئەگەر نـەژمێردرێن تـاوەکو بزانـرێ کـێ وەریگرتووەو کێ وەرینـەگرتووە، ئەترسـم ئـەم مەسـەلەیە بـە خراپـی بڵاوببێتەوە (واتە بێ ئەوە ناکرێ ڕێکخرێو بزانـرێ کـێ وەریگرتـووەو کێ وەرینەگرتووە)

وەلیدی کوڕی هیشام ووتی: ئەی ئـەمیری بـاوەڕداران، لەشـامەوە هاتوومەتـــەوە، لـــەوێ دەمبینـــی پادشـــاکانیان دیوانیـــان دانـــابوو، سەربازەکانیان ناونوسو ڕێکخستبوو، عومەریش ﷺ فەرمووی: پلـەو پایەی هەرکەســێ بنوسن، لە خزمــە نزیکـەکانی پێغەمبـەرەوە ﷺ دەست پێبکەنو پاشان ئەوانی تر بنوسـن، زیـاتری دا بەپێـشینەکانو فەرمووی: بەخوا ئەوکەسەی لەگەڵ پێغەمبەری خـوا ﷺ جـەنگی کردووەو ئەوەی جەنگی پێغەمبەری خوای کردووە یەکسان ناکەم.(١)

لەخانەی ساماندا مووچەی سـاڵانەی بڕیـەوە بـۆ پیـاوانو ژنـانو منـاڵانو کۆیلەو منـاڵە دۆزراوەکـان، پێـی ووتـرا: لەڕاسـتیدا سـامان زۆربووە لەدەستی خەڵکیدا تاوای لـێهاتووە سـەرف دەکـرێ لەشـتی باشو خراپ دا، ئەویش فـەرمووی: (ئـەوە مـافێکی خۆیانـە وەریـان گرتووە، من دڵخۆشترم لەخۆیان بەوەی وەریان گرتـووە، سوپاسـی مـن مەکەن لەسەری، بەڵام من زانیم ئـەو سـەروەتو سـامانە زۆرە، بـەڵام ناکرێ لێیان بگرمەوە).(٢)

---

(١) ابن سعد ٢٢٤ – ٢٢٦.

(٢) ابن سعد ٢٢٦/٣ – ٢٢٧.

وە دەیفەرموو: (بەوکەسەی هیچ پەرستراوێك جگە لەو نیە، هەموو کەسێك مافی لەم سامانەدا هەیە، پێ‌ی بدەم یان پێـی نـەدەم، هـیچ کەس مافەکەی لەوی تـر زیـاتر نیـە تێیـدا، منـیش هـەروەك تاکـە کەسێکی ئەوانم، بەخوا ئەگەر مام ئـەبێ شـوان لـە سـەنعاوە بێـتو بەشی خۆی ببا لەم سامانەو هەرلە شوێنی خۆیشیدا بێ)، [1] جارێك گوێی لە گریانی منالێك بوو، پرسیاری کرد بۆ وا دەگری؟ پێیان ووت: ئەوە لەشیر دەیبڕنەوە، تاوەکو لە خانەی سـامان موچـەی بـۆ ببڕنــەوە، ئەویش بانگکەرێکی ناردە نێو خەڵکی‌و پێی ووتن: ئێمـە موچـە بـۆ هەمـوو منـاڵێك دەبڕینەوە کە لەدایك دەبێ (إنا نفرض لكل مولـود في الإسلام) لەوبارەیەشەوە نوسراوی بۆ وڵاتانی تر کرد. [2]

لەکۆتایی ژیانیدا هاتە سـەرئەوەی شـوێنی سـوننەتی ئەبوبـەکر بکەوێ لەوەك یەك پێدانی بەخـشینەکان، پـاش ئـەوەی زیـاتری دەدا بەهۆی لە پێشینەیەتی‌و زۆر ڕۆڵ بینین‌و توش هاتنەوە، وە فـەرمووی: (ئەگەر بمێنم خوارترینی خەڵك دەگەیەنم بە پایەدارترینیان). [3]

بنەمای (ئەمەت لەکوێ بووـمـن أیـن لـك هـذا؟)ی چەسـپاند، کاتێك کەسێکی دەنارد بۆ شارێك سامانەکەی دەنوسی، کاتێکیش لای دەبرد ماڵەکەی دەکرد بەدوو بەشەوەو نیوەکەی دەگێڕایەوە بـۆ خانـەی

(١) ابن سعد ٣/٢٢٧.

(٢) ابن سعد ٣/٢٢٨، وە (فتوح البلدان) ی (البلاذري لا ٦٤٣).

(٣) ابن سعد ٣/٢٢٩، لە ڕێگەی مالك لە (الموطا) دا.

سامـانی مسـوڵمانان.[1]

عومـەر یەکەم کەس بوو چاودێری دارایی دانا لەسەر والییەکان، وە هەر کاتێ خەڵکی وڵاتێ سکاڵایان لە ئەمیرەکەیان بکردایە لایـدەبرد، وە دەیوت: (شتێکی ئاسانە ئەگەر خەڵکێك چاك بـبن بـەهۆی ئـەوەی ئەمیرێکیان بۆ بگۆڕمو یەکێکی تر لەشوێنی دابنێم)،[2] ئەگەر خزمو کەسو کارەکەی شـتێکیان بکردایـە کـە ئـەم بەرهەڵـستی خـەڵکی لێدەکرد ئەوا سزاکەی چەندانە دەکردەوە لەسـەریان)،[3] لـە هـەموو کاربەدەستێتییەك بێبەشی دەکرد لە ژیانیداو لە پاش مردنیشی، لـە ساڵی (الرمادە)دا پاش ئەوەی گرانی ڕووی لە خەڵکی کردوو برسـێتی بڵاوبویەوە ویستی لەگەڵ هەرماڵێکدا مـاڵێکی هـەژاری وەك خۆیـان دابنێ تاوەکو گرانییەکە نامێنـێ)،[4] وە فـەرمووی: (ئەگـەر ئـەوەی ڕووبەڕووم دێ وەك ئەوەبێ کە پشتم تـێکردووەو بـەجێم هـێڵاوە ئـەوا زیـــادەی ســـامانی دەوڵەمەنـــدەکانم وەردەگـــرتو بەســـەر هـــەژارە کۆچەرەکاندا دابەشم دەکرد).[5]

کاتێکیش لە سەرەمەرگدا بوو وەسیەتی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی کـرد کە قەرزەکانی بۆ بداتەوە بەخانەی سامان، کە هەشـتا هـەزار درهـەم

(١) ابن سعد ٣/٢١٤ – ٢٢٣، و الأموال ل ٢٨٢.

(٢) ابن سعد ٣/٢١٥ بە سەنەدێکی سەحیح لە حسنو ئەویش لە عومەرەوە (ﷺ).

(٣) ابن سعد ٣/ بە ئیسنادێکی سەحیح

(٤) ابن سعد ٣/ ٢٤٠.

(٥) ابن جریر ٢/٥٧٩ بە ئیسنادێکی سەحیح بە پیێی مەرجی بوخاریو موسلم.

بوو، ووتی: (ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، بڕوانە بزانە چەندێك قەرزم لەسەرە، ژماردیان بینیان هەشتا هەزارە، فەرمووی: ئەگەر سامانی آل خطاب بەشی کرد ئەوا بیدەن، ئەگینا داوا لەبەنی عەدی کوڕی کەعب کەن، ئەگەر بەشی نەکرد داوا لە قورەیش بکەن‌و داوا لە کەسی تر مەکەن، لە جێی من ئەو سامانە بدەن). [1]

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ئاماژەی دا بەوەی کە ئەو بڕە پارەیە قەرزی خانەی سامان بێ تا ئەوکاتەی عەبدوڵڵا دەتوانێ بیداتەوە، عومەر ﷺ ڕازی نەبوو، کاتێك کۆچی دوایی کرد عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پارەکەی هێنای بۆلای عوسمان‌و شاهێدەکانی ئامادەکردو دایەوە بە خانەی سامان. [2]

عومەر ﷺ هەموو ئەوبەندە عەرەبانەی لەخانەی سامان ئازاد کرد کە لە نەفامیدا بە کۆیلە کرابوون، [3] لە دوا وتاریشیدا ئامۆژگاری کردوو فەرمووی: (ئاگاداربن وا من ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی تەقوای خواتان هەبێ لە فەرمانڕەواییداو دادگەربن لە دابەشکردندا)، [4] نوسراوێکی نوسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری کە قازی ئەوبوو لە عێراق دا: (مسوڵمانی لاواز ئەوەندەی لە عەدل بەسە کە دادگەر بێ

(١) ابن سعد ٣/ ٢٥٧ بە ئیسنادێکی سەحیح، بوخاریش لە الفتح دا ٧/٦٠ ف (٣٧٠٠)، دەبڕینەکەش هی بوخارییە.
(٢) ابن سعد ٣/ ٢٧٣، الأموال ی ابو عبید ل ٢٨٢.
(٣) ابن سعد ٣/ ٢٧٤ بە ئیسنادێکی حەسەن، وە الأموال لا ١٤٧ – ١٤٨.
(٤) ابن جریر ٣/٤٥

له حوكم‌و دابه‌شكردندا). [1]

وه به كاربه‌ده‌ست‌و والـی یه‌كانی ده‌ووت: (هه‌ركه‌سێ ئه‌میره‌كـه‌ی سته‌می لـێ بكا ئه‌وه ئیتر لای منه‌وه مافی ئه‌میری نامێنێ)، [2] لـه وتارێكیدا بۆ خه‌ڵكی فه‌رمویه‌تی: (خوایه‌گیان، مـن تـۆ ده‌كـه‌م بـه شاهێد به‌سه‌ر ئـه‌میری شـارو ولاته‌كانـه‌وه كـه مـن تـه‌نها بـۆ ئـه‌وه ده‌یاننێرم تاوه‌ك خه‌ڵكی فێری دین‌و سـوننه‌تی پێغه‌مبه‌ره‌كـه‌یان ﷺ بكه‌ن، وه ده‌سـتكه‌وته‌كانیان بۆبـه‌ش بكـه‌ن، وه دادگـه‌ر بـن، ئه‌گـه‌ر شتێكیان لـێ ئاڵۆز بوو بۆمی به‌رز بكه‌نه‌وه). [3]

وه به‌كاربه‌ده‌ستانی ده‌ووت: (بۆیه ئێوه‌م كـردووه بـه كاربه‌ده‌سـتیان تاوه‌كو نوێژیان پێ‌بكه‌ن، به ڕه‌وا قـه‌زاوه‌تیان لـه نێوانـدا بكـه‌ن‌و بـه دادگه‌ری به‌شیان بده‌ن...عومه‌ر تۆڵه‌ی له كاربه‌ده‌ستانی ده‌سه‌ند، ئه‌گه‌ر كه‌سێك سكالای لـه ده‌سـتی كاربه‌ده‌سـتێكی بكردایـه كاربه‌ده‌سـت‌و سكالاكاره‌كه‌ی كـۆده‌كرده‌وه ئه‌گـه‌ر شـتێكی له‌سـه‌ر بـچه‌سپایه كـه پێویست بوایه تۆڵه‌ی بكردایه‌ته‌وه تۆڵه‌ی لـێ‌ده‌كرده‌وه). [4]

دوا ئامۆژگارییه‌كانی كه له‌سه‌ر جێگه‌ی مردن‌و لـه سـه‌ره‌مه‌رگدا ئه‌وه‌بوو كه فه‌رمووی: (وه‌سیه‌تم هه‌یه بۆ خه‌لیفه‌ی دوای خۆم كه‌چاوی

(١) ابن جرير (٥٦٦/٢ ) به ئیسنادێكی سه‌حیح.

(٢) ابن جرير (٥٦٦/٢) به ئیسنادێكی سه‌حیح.

(٣) ابن جرير (٥٦٧/٢) به ئیسنادێكی سه‌حیح.

(٤) ابن جرير (٥٦٧/٢) بـه ئیسنادێكی سه‌حیح لـه عوسمانی كوڕی (عاصم)ه‌وه كه عومه‌رو عوسمان له تابعی یه جێ‌متمانه‌كانن به‌ڵام به عومه‌ر نه‌گه‌یشتووه.

لــه كۆچــەره یەكەمینــەكان بــێ، مافیــان بزانــێ، ڕێزیــان بپــارێزێ، وەسیەتی ئەوەی بۆ دەكـەم كەچـاكە لەگـەڵ ئەنـسارییەكان بكـا.. وە وەسیەتی بۆ دەكەم كە لەگەڵ خەڵكی وڵاتان چاك بێت، چونكە ئەوانە بەرگریكەرو پارێزەری ئیسلامن، كۆكەرەوەو هێنەری سامانو دارایـیو ڕق دەخەنە دڵی دوژمنەوە، وە هیچیان لـێ وەرنەگرێ مەگـەر زیـادەی ماڵەكـەیان، ئـەویش بــە ڕەزامەنـدی خۆیــان، وە وەسـیەتی بۆدەكـەم چاكەكاریێ لەگەڵ عەرەبە بیابان نشینەكاندا چونكە ئەوانـە ڕیـشەی عەرەبو كەرەسەی ئیسلامن، وە لە پاشـكۆی ماڵـەكانیان وەربگـرێو بیگەڕێنێتەوە بۆ هەژارەكانیان، وەوەسـیەتی بـۆ دەكـەم چـاكەكار بـێ لەگەڵ ئەوانەی لە ئەستۆی خواو پێغەمبـەر ﷺ دانو (ذمـي)ن، وە ئەمەكداری بە بەڵێنەكانیان بكرێو لە پێناویاندا جەنگ بكرێ وە لە توانای خۆیان زیاتر نەدرێ بەسەریاندا)، [1] كاتێك عوسمان ﷺ لەپاش عومەر كاروباری گرتەدەست نوسراوێكی نوسی بۆ ئەمیرەكانیو تیایدا هاتبوو: (ڕەفتارو هەڵسوكەوتت ڕاستو ڕێك بێو سـەیری كاروبـاری مسوڵمانان بكەنو بزانن چی پێویستە لەسـەریان تـاوەكو سـەروەتو سامانی خۆیانیـان پێبـدەنو ئەوشـتەی پێویـستە لەسـەریان لێیـان وەربگرن، پاشان ستایشو چاكەكاری لەگەڵ (ذمـي)یەكانـدا بكـەنو مافەكانیان پێ بدەنو ئەوەشـی لەسەریانە لێیان وەرگرن، پاشان ئـەو

---

(١) بوخاری بە فەتحەوە (٦١/٧) ف ژمارە (٣٧٠٠).

دوژمنەی گومان لەپەیمان شکێنیان دەکرێت داوای پاراستنی بـەڵێنو وەفاداریان لــێ بکەن). [1]

وە بۆ کاربەدەستی خەراجی نوسی: (خوا دروســتکراوەکانی بەهــەق دروستکردووە، تەنها هــەقو ڕەواش پەســەند دەکـا، دەســت بـە ڕەواوە بگرن، بە هۆیەوە مـافو ڕەوا پەخش بکەن، ئەمەکدار بــن، ئەمەکـدار بن ستەم لە بێباوكو بەڵێن پێدراوو پەنابەر مەکەن، خــودا دو ژمنـــی ئەو کەسانەیە ستەمیان لــێ دەکەن). [2]

وەکاتێکیش ئاژاوەگێڕی هەڵگیرسا، خەڵکی تۆمەتباریان کرد بەوەی کەسوکارەکەی خۆی دەباتە پێشەوە لە خانــەی ســامانی مــسوڵمانان، فەرمووی: (من سەروەتو سامانی مسوڵمانان بۆخۆم بە حەڵاڵ نازانم، وە بۆ هیچ کەسێکی تر لــە خــەڵکی، تــەنها پێــنج یــەکیش هاتۆتــە بەردەستم، هیچی بۆ من حەڵاڵ نیە، مسوڵمانان سەرپەرشتی دەکــەنو لە شوێنی خۆیدا دایدەنێنو بەکەسی خۆی دەدەن). [3]

ئەمەش تەئکیدکردنەوەی مافی ئوممەتە لە چاودێریکردنی سامانی گشتیو لێپرسینەوەی ئیمامو پرسیارکردن لە شێوازی سەرف کردنــی، لە کاتی گەمارۆدانەکەشی دا، نوسراوێکی نووسی بۆ وڵاتان، ، تیایدا باسی لەوە کردووە کە ئەو پابەند بووە بــەو بەڵێنانــەی داویــەتی بــەو

(١) ابن جرير ( ٢/٥٩٠ – ٥٩١).

(٢) ابن جرير ( ٢/ ٥٩١).

(٣) ابن جرير ( ٢/٦٥١).

کەسانەی هاتوونەتە لای‌و چەندین مەرجیان بۆی دانابوو، تیایدا هاتبوو: (وانازانم شتێکم نەکردبێ لەو شتانەی بەڵێنم پێیان دابوو، ئەوان وای بۆدەچوون کە دەیانەوێ حدودەکان پیادەبکرێ، منیش ووتم: پیادەی کەن بەسەر هەرکەسێکدا کە دەزانن دەست درێژی کردۆتە سەرکەسێك، پیادەی کەن بەسەر هەرکەسی دوورو نزیکدا کەستەمی لێ‌کردوون، وە وتیان: بێ‌بەش بەشی درێ، سامان بدرێت بەکەسی خۆی، لە پێنج یەك‌و سەدەقەدا دەست درێژی نەکرێ، کەسی بەهێزو ئەمیندار بکرێتە ئەمیر، مافەخوراوەکانی خەڵکی بدرێتەوە، ڕەزامەندیم لەسەر ئەوانە دەربڕی‌و ئارامگر بووم بۆی، هەموو ئەوانەم کردووە).[1]

هەروەها تیایدا هاتووە: (ئەوان لە نێوان یەك لەم سێ شتەدا هەڵبژاردن‌و ئیختیارم پێ‌دەدەن، یا ئەوەتا تۆڵەی هەمووئەوکەسانەم لێ ئەستێنن کە سزام داون هەڵە بوبێتم یا پێکابێتم، یا ئەوەتا دەبێت خۆم لەکارخەم‌و کەسێکی تر بکەنە ئەمیر، یا ئەوەتا نامە دەنێرن بۆ تەواوی سەربازان‌و ئەو خەڵکانەی مەدینە کە گوێڕایەڵییان دەکەن تاوەکو هەموو ئەوکەسانەی خوای گەورە بیستن‌و گوێڕایەڵی منی لەسەر فەرزکردوون وەلابخەن‌و لێیان بەری بن.. منیش وەکیلی ئەوان نیم، پێشتریش زۆرم لێ نەکردوون بۆ بیستن‌و گوێڕایەڵی کردنم، بەڵکو

(١) ابن جریر ٢/٦٨٦

ئارەزوومەندانە ملکەچیان دەربڕیوە، ئەو ئیختیارەی داویانەتە دەستم هەمووی ناکۆکیو خۆخۆیەتیو کردنە ئەمیرییە، خۆمم ڕاگرتووە بەوانەشەوە لەگەڵمدان، ڕێو شوێنی خراپو پەرتەوازەیی ئوممەتو خوێن ڕشتنم پێخراپ بوو، بۆ خوا داواتان لێدەکەم کە شوێنی ڕەوا بکەونو هەرچی لەسەرمە لێمی وەرگرن، بە دادگەرییەوە ناوەندێتیمان بکەن). [1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (من بانگەشەتان دەکەم بۆلای کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، کێتان پێخۆشە بیکەنە ئەمیرتان، ئەمە کلیلی سامانی خانەکەتان، بیدەن بەدەستی ئەوکەسەی دەتانەوێ)، [2] عەلی ﷺ پێش ئەوەی بەیعەتی خەلیفایەتی پێبدرێ فەرموی: (ئاگاداربن، شتێك بێئێوە ناکەم، ئاگاداربن کلیلی سامانتان لای منە، ئاگاداربن بێئێوە بۆم نییە درهەمێکی لێ دەرکەم، ئایا ڕازین؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی خوایە شاهێدبە، لەسەر ئەوە بەیعەتیان پێی دا). [3]

هەروەها عەلی ﷺ لە کاتی خەلیفایەتیدا فەرمووی: (گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (خەلیفە لە ماڵی خوادا تەنها

(١) ابن جرير (٦٨٦/٢ – ٦٨٧)، ئیسنادەکەی لاوازە بەڵام بە بەڵگەکانی تر بەهێز دەبێ، إبن ابی شیبە لە تاریخ المدینة (١١٦٤/٤ – ١١٦٥) بە ئیسنادێکی تر گێڕاویەتییەوە.

(٢) ابن ابی شیبة (١١٩٣/٤ – ١١٩٤).

(٣) ابن جرير (٢/ ٦٩٧).

دوو تەشت خواردنی بۆ هەیە، یەکێکیان بۆخۆیو ماڵو منالی دەیخوا، خواردنی دووەمیش دەیخاتە بەردەستی خەڵکی).[1]

موعاویەش لەنێو خەڵکیدا وتاری داو وتی: (لەخانـەی سـاماندا زیاد لە پێ‌بەخشـــینەکانی ئێوە هەیە، من ئەوەتـــــان لـە نێوانـدا بەش دەکەم، ئەوە سـامانی ئێمـە نیـە، بـەڵکو دەسـتکەوتێکە خـوا پێمانی داوە).[1]

هەموو ئەوانەی باسکران تەئکید دەکەنەوە لەسەر دادگەریکردن لە کێشەکانو یەکسانی لە دابەشکردندا، وەخانەی سامان حورمەتی خۆی هەیەو ئوممەت بۆی هەیـە لێپرسـینەوەی ئیمـام بکـات لەسـەر ئـەو سەرفکردنەی لەخانەی ساماندا دەیکا، هەروەها پێداویستی یەکانی بۆ دیاری دەکاو ئەندازەکەی دەت نیشان دەکات، وە مافی ئیعتیراز گرتنی هەیە لە سیاسەتە داراییەکانیو لێپرسـینەوە لـەکاتی لادانەکانیـدا، چونکە خانەی سـامانی مـسوڵمانان هـی موسـڵمانانە نـەك ئیمـام، ئەمەش بە کۆڕای هاوەڵان ﷺ و کۆڕای هەر هەموو مسوڵمانانە.

پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و مـشتومڕو قـەزاوەتی قەرزێکـــی خۆی لەگەڵ دەکردو بەزبری قـسەی لەگـەڵ پێغەمبـەی خوا ﷺ دەکـرد، هـاوەڵان ﷺ ویـستیان لـێی بـدەن، ئـەویش ﷺ

(١) ئەحمـەد گێڕاویـەتی یـەوە لـە (المـسند)دا (٧٨/١)، ئەحمـەد شـاکر فەرمویـەتی (ئیسنادەکەی سەحیحە).

(٢) الأموال ابو عبید ل (٢٦٥).

فەرمووی: (دعوه فإن لصاحب الحق مقالاً – وازی لـێ بێـنن چـونکە خاوەن مـاف قسەی خۆی هەیە). [1]

لەڕاستیدا دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم دەوڵەتێکە لە مێژوودا ئاشنای سـستەمی دابینکـاری کۆمەڵایـەتی بوبـێو بڕێـك دارایـی تایبـەتی بەردەوامی بۆ هەر مرۆڤێك بڕیبێتەوە، جا ئیتر کەسەکە پیاو بوبێ یـا ئافرەت، گەورە بوبێـت یـا بـچوك، ئـازاد بوبـێ یـا کۆیلـە، عومـەر دیوانەکانی بۆ پیادەکردنی ئەم بنەمایانـە دانـا، دیـوانێکی دانـا بـۆ هۆزەکانی عەرەبو ئەوانەی پەیوەسـت بـوون پێیانـەوە، هـەروەها بـۆ خەڵکی شارەکانیش چەند دیوانێکی دانا کە ناوەکانیانی تێـدا تۆمـار کردوو موچەکانیانی بە یەکسانی دیاری دەکرد لە نێوان هەموو تاقمو کۆمەڵەکاندا، بە پێی پێویستی.

شافعی (٢٠٥ ك. ك) دەفەرموێ: (دەبێ ئیمام هەموو جـەنگاوەری وولاتان ئامار بکا – کە بریتین لەو کەسانەی باڵغ بوونەو لە پیاوانـدا پانزەساڵیان تەواو کردووە – وە خاوو خێزان دەژمێردرێ – کـە بـریتین لەوانەی نەگەیشتونەتە باڵغ بوون وە ئافرەتان بەگەورەو بچوکیانەوە وە ئەنـدازەی خەرجییـەکانو پێدوایـستییە حەیاتییـەکان بزانـرێ، بـە ئەنـدازەی هاوژیـانیو هاوگوزەرانیـان لـە وولاتـی خۆیانـدا، هـەموو ساڵێکیش جەنگاوەرەکان بەخشینی خۆیان پێبدرێ، ئەو بەخشینەشی

[1] صحيح البخاري به (الفتح)ەوە ٥/٦٥ ف(٢٣٩٠) و ٥/٦٢ ف (٢٤٠١).

له دەستكەوت دەدرێ تەنها بۆ ئەو باڵغانەیــە كــە توانــای جیهادیــان هەیە، پاشان خاوو خێزانو ئافرەتان جلو پۆشاكو خەرجییان پێبــدرێ كە ئەوەندەی بەشی ساڵێكیان بكات، ئەگەر پاش ئەم وەسفەی كردمان ماڵی زیادە مایەوە، ئەوا ئیمام دایدەنێ بۆ چاككردنی قەڵاو قولەكانو زیادكردنی ئەسپو وڵاخی بەرزە وە هەرشــتێ كــە مــسوڵمانان بــەهێز دەكــا، ئەگـــەر مـــسوڵمانانیش پێویـــستیان پێـــی نـــەماو هـــەموو بەرژەوەندییەكانیان كامڵ بوو، ئەوەی دەمێنێتەوە لە نێوان هەموویاندا بە پێی مافیان لەو سـامانەدا دابەشــی دەكــەن، وە فەرمویــەتی: لــە دەستكەوتو موچەو ڕۆزی فەرمانڕەوایانو كاربەدەســتی ڕووداوەكــانو هەركەسێ هەستاوە بــە ســەروكاریكردنی دەســتكەوت نمونــەی والیو نوسەرو ســەرباز كــە نــاكرێ بێئــەوان دەســتكەوتەكە ڕێــك بخــرێ — ئەمانیش بە پێی هاوشانی خۆیان پێیان دەدرێ). (١)

سیاسەتی داراییانەی ئەبوبەكر ﷺ بریتی بوو لــە بەشــینەوەی وەك یەك لە نێوان خەڵكیدا بە گەورەو بچوكو ئازادو كۆیــەو نێــرو مێــوە، هەندێ لە هاوەڵان پێیــان ووت: تــۆ خــەڵكیت یەكــسان كــردووە لــە كاتێكدا ئەوانە خــەڵكی پێــشینەو خــاوەن فــەزڵی تێدایــە؟ ئــەویش فــەرمووی: (ئــەو پێــشینەو خــاوەن فەزڵــەی باســی دەكــەن ئــەوە پاداشــتەكەی لای خوایــە، بــەڵام ئەمــەیان گوزەرانــەو پێبەخــشینی

(١) الخطابي لە پەراوێزی (سنن ابی داود)دا ٣/٣٦٠.

یەکسان باشترە لە خۆخۆیی‌و فەزڵ دانــی هەنــدێك بەســەر هەنــدێکی تردا).[1]

کاتێك عومەریش هات زەوییە دەستکەوتووەکانی وەقــف کــرد بــۆ بەرژەوەندی موسڵمانان‌و چەند ئایەتێکی سورەتی (حجـرات)ی کـردە بەڵگە: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ، لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ، وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾(الحشر: ٧– ١٠).

عومەر فەرمووی: (ئەم ئایەتە هەموو خەڵکی دەگرێتەوە، هیچ کەسێ نەماوە لە مسوڵمانان کە بەش‌و مافی نەبێ تیایدا)،[2] بەوانەشی ووت کە بەرپەرچی ئەم سیاسەتەیان دەدایەوە کە: خوای گەورە ئەوانەی بەشدار کردووە لەم دەستکەوتەدا کە بە دوای ئێوەدا دێن، ئەگەر بەشی بکەم (بەسەر ڕزگارکەرەکاندا) هیچ نامێنێتەوە بۆ

(١) الخراج ی ئەبو یوسف ل ٤٢، الأموال ی (ابوعبید) ل ٢٧٧.

(٢) ئەبو دواد ٣/٣٧٥ ف (٢٩٦٦) الخراج، ئەبو یوسف ل ٢٦، الأموال ی ئەبو عوبەید ل ٢٢.

دوای خۆتان، ئەگەر بمێنمەوە شوان لە (صـنعاء)دا لـەم دەسـتكەوتەی پێدەگات بێئـەوەی دڵۆپـێ خـوێنی بـڕژێو مانـدوبێ).[1] هـەروەها فـەرمووی: (بـە خـوا ئەگـەر بمێـنم وادەكـەم بێوەژنـەكانی عێـراق پێویستیان بە هیچ ئەمیرێكی دوای من نەبێ).[2]

عومـەر بۆ منـاڵی شـیرەخۆرەو كۆرپـە موچـەی جـێگیری بڕیـەوەو فەرمووی: (بەو خوایەی هیچ پەرستراوێكی نیە، هەموو كەسـێك لـەم سامانەدا مافی هەیە، منیش تیایدا وەكو یەكێك لە ئێـوەم، بـە خـوا ئەگەر بمێنم شوان لە شاخی (صنعاء)ەوە بەشی خۆی لەم سامانە دەباو هەر لە شوێنی خۆیدایە پێش ئەوەی ڕووی سوور هەڵگەڕێ، بۆ منـاڵی كۆرپـە هـەر بـە لـە دایكبـوونی سـەد درهـەمی پـێدەدرا، ئەگـەر پێگەیشتایەو گەورە بوایە دەیگەیاندە دووسەد، كاتێكیش دەگەیشتە بلوغ زیادی دەكرد، پاشان فەرمووی: (ئەگەر بژیم هەموو خەڵكی وەك یەك لـێدەكەم تاوەكو لە پێبەخشیندا وەك یـەك بـن)،[3] حەسـەنی كوڕی عەلی ﷺ فەرمووی: (بەشی مناڵی كۆرپە لەو كاتەوە پێویـست دەبێ كە دەست دەكات بە قیژەقیژ).[4]

ئەم سیاسەتەی عومەر ﷺ بـووە ڕێگـر لـەوەی لـە نێـو دەوڵـەتی

(١) الخراج ی ئەبویوسف ل ( ٢٤ و ٤٦).

(٢) الخراج ی ئەبو یوسف ل (٣٧).

(٣) الخراج ی ئەبو یوسف ل (٤٦)، الأموال ی ئەبو عوبەید ل (٢٢٦ – ٢٢٧).

(٤) الأموال ی ئەبو عوبەید ل (١٣٩)، واتە بەوەی تەنها بە زیندوویی لە دایك بێ ئەوە پێویست دەبێ بۆی.

ئیسلامیدا دەرەبەگایەتی بەرپابێ، وەمافی تەواوی تاکەکان بپارێزێ، لە ســـەرەتاوە عومەر وەك یەکی نەدەدا بە خەڵکی، پاشـان گەڕایـەوە بـۆ یەکسـانییەکەی ئەبوبـەکر، هـەروەها عـەلیش ﷺ ئەمـەیانی گرتەبەر.(١)

ئەبوبەکر وای دەبینی کە هەموو مسوڵمانان کوڕو نەوەی ئیسلامن، ئەم سامانەش میراتییە بۆ ئەوان، هەربۆیە وەك یەك بەشدارن تیایـدا، هەرچەند هەنـدێکیان لـە ڕووی پێـشینەیەتی‌و سەرخـستنی دینـەوە باشترن لە هەندێکی تریان.(٢)

دابینکارییە داراییە کۆمەڵایەتییەکان تەنانەت نا مـسوڵمانەکانی نێو دەوڵـەتی ئیـسلامی گرتبـۆوە، لـەم قۆناغـەدا کـە نمایندەیـەتی ڕێنماییەکانی ئیسلامی دابـەزێنراوی دەکـرد، عومــەر جولەکەیـەکی هەژاری بینی داوا لە خەڵکی دەکا، پێی ووت: (چی ناچـاری ئەمــەی کردووی؟ ووتی: سەرانەو پێویـستی پیرێتـی، عومــەر ﷺ فـەرمووی: بەخوا دادگەرو بە ویژدان نەبووین لەگەڵیـدا، کـاتی لاوێتییەکـەمان بردووە، پاشان لە پیرێتییەکەیدا ڕیـسوای دەکـەین،: (إنمـا الـصدقات للفقراء والمساکین)، ئا ئەمە لە هەژاری خاوەن کیتابەکانـە، سـەرانەی لەسەر ئەوو هاوشێوەکانی لابرد، بە خەزێنەدارەکەی فـەرموو: چـاوت

---

(١) الأموال ی ئەبو عوبەید ل ٢٧٨.

(٢) الأموال ی ئەبو عوبەید ل ٢٧٨.

لەمەو هاووێنەکانی بێ)، [1] فەرمانیدا ڕۆزیان بۆببڕێتەوە. [2]

خالیدی کوڕی وەلید ﷺ سـولْحی لەگـەلْ حیرەییـی یەکانـدا کـرد لەسەر ئەوەی کە: (هەر پیرێك توانای کارکردنی نـی یـە، یـا تووشـی بەلاو ئافەتێك بووە، یاخود دەولْەمەند بووەو هـەژار کـەوتووەو خـاوەن قەرزەکانی خێری پێدەکەن، ئەوا سەرانەی لەسەر لابـرێ، لـە خانـەی سامانی مسولْمانان خۆیی‌و خاوو خێزانی یارمـەتی دەدرێـن، تـا ئـەو کاتەی لە وولاتی کۆچ‌و لە وولاتی ئیسلامدا جێگیرە، ئەگـەر دەچـوون بۆ دەرەوەی وولاتی کۆچ‌و وولاتی ئیـسلام ئـەوا بـەخێوکردنیان لەسـەر مسولْمانان نیە). [3]

عەلی کوڕی ئەبوتالیب‌و موعاویە ﷺ چەندین برە پارەی تایبـەت‌و موچەیان بڕیبووەوە بۆ گیراوەکـان لـە بەندینخانەکانـدا وە پۆشـاکیان دەدانێ‌و نەفەقەیان دەکردن)، [4] بەهەمان شێوە عەلی ﷺ بـڕە پـارەی تایبەت کرا‌ی ئەو کەسانەی دەدا کە دژی ڕاپەڕیبوون‌و لـە فـەرمانی دەرچـوو بـوون، وە مافـە دارییـەکانی نـەبڕیبوون، لەگـەلْ ئـەوەی

---

(٣) الخراج ی ئەبو یوسف ل (١٦٢)، وە کەسی سەنەدەکەی جێی متمانـــەن، الأموال ل (٤٦و٥٠).

(٤) سەیری الدرر المنثوری سیوطي بکە لە ڕاڤەی ئایەتی ژمارە (٦٠) لە سورەتی تەوبـە ( إنما الـصدقات للفقـراء والمـساكين) هـەروەها ابـن جریـری طـبري لـە تەفسیرەکەیدا، الأموال ی ئەبو عوبەید ل (٤٦).

(١) الخراج ی ئەبو یوسف ل (١٤٤).

(٢) الخراج ی ئەبو یوسف ل (١٤٩ – ١٥٠).

نوێنەرایەتی حیزبێکی نەیاری سیاسەتەکانی ئەویان دەکـرد، نـەیاری فیکرو بیروباوەڕیشی بوون، چونکە ئەوان بەکافریان دادەنا، عەلی پێـی وتن: (سێ مـافیان لەسەرمانە... لە دەستکەوت بەشیان بدەین تا ئەو کاتەی دەسیان لەگەڵ دەستماندایە). [1]

ئەبوعوبەید فەرمویەتی: (عەلی دیدی وابوو کە خـەواریج مـافیـان هەیە لەم دەستکەوتەدا تا ئەو کاتـەی بـە ئاشـکرایی دژبـە خـەڵکی دەردەچن، ئەو لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی جنێوی پێ دەدەن، بەڵکو زیـاتر لە جنێویشی پێدەدەن، (واتە کافری دەکەن) لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەوان لەکاروبارو هەڵس‌وکـەوتو دانیـشتنیاندا لەگـەڵ مــسوڵمانان بـوون تاوەکو پاشتر بە تەواوی دەرچوون). [2]

ئەم موچە تایبەتانە مـانگانەبوو، هەروەك عومـەری کوڕی خـەتتاب وای کرد، ئەوەبوو موچەو ڕۆزی مانگانەی دەدایە خەڵکی بـە پیـاوان‌و ئافرەتانەوە، [3] عومـەری کوڕی عەبدولعەزیز موچـەو بەخـشینەکانی خەڵکی دەدا، جا ئەگەر لە خانەی سامـاندا زیادە بمایەتەوە، ئەوا قەرزی قەرزارەکانی پێدەدایەوە، ئەگەر لـەوەش زیـاتر بوایـە دەیـدا بەوانـەی دەیانویـست کـچە عـازەب مــارە بکــەن بــە ئەنــدازەی پێویـستی هاوسەرگیریان، ئەگەر زیاتر بوایە فەرمانی دەکرد بە سەلەم (تسلیف)

(١) الأموال ل (٢٤٥) بە سەنەدێکی سەحیح.

(٢) الأموال ل (٢٤٥).

(٣) الأموال ل (٢٤٥).

بدرێ بە پەککەوتووەکانی ئەهلی ذیـمە تاوەکو بتـوانن بـەو سـامانە کشتیاری زەوییەکانی پێبکەن، بـۆ ئـەوەی کـشتوکاڵ بکـەن، مـاوەی دانەوەشی ساڵێك یا دووساڵ بوو.[1]

لە هەمـوو ئەمـانەدا عومـەری کوڕی خەتتاب ﷺ سەرمەشقی بـوو، زوهری نوسراوێکی نووسی بۆ عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز کـە بـە درێژی باسی زەکاتو ئەوانەشی پێی دەشێت کردبوو، لەوانـەش باسـی نەخۆشی درێژ خایەنو پەککەوتەو هەژارانی کردبوو، تاوەکو ڕێبوارانو ئەوانەی خانوبەرەو کـەس‌وکاریان نیـە، بـۆ ئـەوەی جـێی حەوانـەوەو خواردەمـەنییان بۆ دابین بکرێ لە خانوبەرەی دیاریکراودا بە شـێوەیەك ئەگەر ڕێبوار پێیدا تێپەڕی پەنای بۆ ببا).[2]

هەمـوو ئەوەی ڕابورد تەئکید لەسەر چەسـپاویو ڕونێتـی هـەردوو بنەمـای عەدالەت لە قـەزاو یەکـسانی لـە بەخـشیندا دەکەنـەوە، وە تەئکیدن لەسەر ئەوەی ئەم دووانە دیارترین بنەمـای گوتـاری سیاسـی بوون لە قۆناغی یەکەمدا.

لەڕاستیدا هەڵوێستی خەلیفەکانی ڕاشدین لە دارایـی سـامان، وە سیاسەتی ئەوان لە سەرفو خەرج کردنیدا بەم شێوەیەی کـە هـەبووە لەسەر بناغەی دادگەریو یەکسانی دامەزرابوو: کە بەڵگـەن لەسـەر ڕیشەداری مـافی ئوممەتو حەققانیەتی ئەو لەوەی لەخانـەی سـاماندا

(١) الأموال ل (٢٦٥).
(٢) الأموال ل (٥٧٤).

هەیــە ، وە ئیمـــام بریکـــاری ئوممەتــە بـــۆ ســـەرفکردنی بـــە پێـــی بەرژەوەندیەکانی، هەروەك شێخی ئیسلام ئـیبنو تەیمیــە فەرمویــەتی: (کاربەدەستی سامانەکان بۆیان نیە بە پێی ئارەزووی خۆیــان دابەشــی بکەن، هەروەك چۆن خاوەن مــاڵ موڵکەکــەی خــۆی دابــەش دەکــات، بەڵکو ئەوان ئەمیندارو نوێنەرو بریکارن، خاوەن موسـ نین).[1]

(١) السیاسة الشرعیة ل (٣٩)، ڕامێنە، لە واقعی جیهانی ئیسلامیو عەرەبی بە تایبەت، وە چـۆن یـاری بـە سـامانی ئوممـەت دەکرێ، یـە هـەمان ئـەو شـێوەیەی یـاری بـە ئازادیو کەرامەتی دەکرێ ؟!!!

٩- پارێزگـاری کـردن لـه مـاف‌و ئـازادی‌یـه مرۆیـی‌یـه فـه‌ردی و کۆمه‌ڵیه‌کـان‌و پاراسـتنیان:

له‌ڕاستیدا گوتاری سیاسی شه‌رعی دابـه‌زێنراو بنـه‌مای ڕێزگرتنـی مرۆڤی چه‌سپاندووه، ته‌ئکیدی له‌سه‌ر هه‌ره‌پێویستی پاراستنی مـاف‌و ئازادییه مرۆییـه‌کان کردۆتـه‌وه، هـه‌روه‌ك لـه قورئـان‌و سـوننه‌ت دا هاتووه، له‌وانه‌ش: -

أ/ مافی مرۆڤـ له ژیاندا، وه پاراستنی لـه ده‌سـتدرێژی، مـسوڵمان بێت یان نامسوڵمان، قورئان حه‌رامی کردووه ده‌ست درێژی بکرێته سه‌ر خودی مرۆڤـ به حه‌رامیێکی قه‌تعی‌و یه‌کلا، مه‌گـه‌ر لـه‌باری تۆڵه‌کردنه‌وه‌و ڕه‌تدانه‌وه‌ی ده‌ست درێژیدا، هه‌ر بۆیـه خـوای گـه‌وره فه‌رمویه‌تی: ﴿وَلا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾(الأنعام: ١٥١) واته: هیچ که‌سێك مه‌کوژن که خوا حه‌رامی کردووه مه‌گه‌ر به هه‌ق‌و ڕه‌وا نه‌بێت، ﴿ مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاس جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَـا النَّـاس جَمِيعـاً﴾ (المائـدة: ٣٢)، ئه‌وه‌ی که‌سێك به ناهه‌ق بكـوژێ‌و لـه جیـاتی کوژراوێـك نـه‌بێت یاخود گونـاهو خراپـه‌کاری ئـه‌نجام نـه‌دابێت لـه زه‌ویـدا، (وه‌کـو جه‌رده‌یی‌و ڕێگری و.... هتد) ئه‌وه وه‌ك ئه‌وه وایـه هـه‌موو خـه‌ڵکی کوشتبێ، ئه‌وه‌شی که‌سێك له مه‌رگ ڕزگار بکـات هـه‌روه‌ك ئـه‌وه

وایە هەموو خەڵکی ڕزگار کردبێو ژیانی پێ بەخشیبێ.

لێرەدا کوشتنی تەنها مرۆڤێك وەك کوشتنی تەواوی خـەڵکی وایـە لە ڕووی حەرامێتییەوە، وە ژیاندنەوەو زیندو ڕاگرتنی وەك ژیاندنـەوەو زیندو ڕاگرتنی تـەواوی خەڵکییـە، پێغەمبـەر ﷺ هـەواڵی ئـەوەی پێداوین کە کوشتنی نەفسێك کە خـوا حـەرامی کـردووە ئەگـەر بـە شێوەیەکی ڕەواو لە تۆڵەدا نەبێ لە حەوت گوناهە بە هیلاك بەرەکانە، هاووێنەی هاوبەش پەیداکردنە بۆ خوا [1] سزای کوشـتنی نـەفس بـە ستەمو دەست درێژی، تۆڵەسەندنەوەیە، چونکە تۆڵە سەندنەوە ژیـانی هەمو لایەکی تێدایە، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَكُـمْ فِـي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُـمْ تَتَّقُـونَ﴾ (البقـرة: ١٧٩) بەوپێیـەی سڵەمینەوەیە بۆ مرۆڤـ لـەوەی پەنابەرێتـە بەرکوشـتنی ئـەوانی تـر، بەمەش دەستەبەربوونی ژیانی ئەوانی تر بەدی دێ، لە هـەمان کاتـدا تۆڵە سەندنەوە هۆکاری زیندو ڕاگرتنی ئەو کەسانەشە کـە دەیانـەوێ کەسـێکی تـر بکـوژن بـەهۆی ئـەوەی دەسـڵەمێتەوەو دەترسـێ لـە تۆڵەسەندنەوە، بەمەش ژیان بۆ هەمولا دەستەبەر دەکرێ.

شەریعەت ئەو تاوانانەی دیاری کردووە کە حەدەکەی کوشـتنەو بـە شێوەیەکی سنوردار کورتی کردۆتەوە، کە ناکرێ تێپەڕێنرێت، دەسەڵات لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ناتوانێ ئەو چـەند شـێوەیە ببـەزێنێ، نـاکرێ

(١) بوخاری ف ژمارە (٢٧٦٦)و موسلم ف ژمارە (٨٩).

مرۆڤـ بکوژرێ لەبەر نەیارێتیکردنی بۆ دەسـەڵات، تەنانـەت ئەگـەر هەوڵیشیدا دەسـت درێـژی بکاتـە سـەر پیـاوانی دەسـەڵات لـەخوار کوشتنەوە، هەربۆیە دەوڵەتی ئیسلامی لە قۆناغی یەکـەمی گوتـاری سیاسیدا کە ئایینی دابەزێنراوی تێـدا بەجەرسـتەیە ئاشـنا نیـە بـە ڕووداوی کوشتنی سیاسی ئەوکەسـەی نـەیارێتی دەسـەڵاتی کردبـێ، پێغەمبـەر ﷺ پەسـندی نـەبووە هـیچ شـتێك بکرێـت بەرامبـەر بەرهەڵـستکارانی خـۆی لـەناو مەدینـەدا، ئەوانـەی ئیـسلامەتیان دەردەخستو لە هەمـان کاتدا هانی دەرکردنی پێغەمبـەریان ﷺ دەدا لە مەدینـەدا، نـەك هـەر ئەوەنـدە بـەڵکو نەخـشەیان دەکێـشاو بـە جیدییەوە کاریان لەسەری دەکرد، هـەروەك قورئـان هـەواڵی پـیلان‌و نەخشەکاریەکانیانمان پێدەدا لە فەرمودەی: ﴿ يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَـا إِلَـى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾ (المنافقون: ٨)، ئـەوان پیـادەی ژیـانی سیاسیانەی خۆیانیان دەکردو لـە کاروبارەکـانی دەوڵـەتی ئیـسلامیدا بیروڕای خۆیانیان دەردەبڕی، قورئانیش وەسفی حـاڵی پێغەمبـەر دەکـا لەگەڵیاندا لە فەرمودەی: ﴿وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾ (المنافقون: ٤) .

پیاوێك قسەی ناشرینی بە خەلیفە ئەبوبەکر ﷺ ووت، (أبو بـرزە) ویستی بیکوژێ، ئەبوبەکر زۆر توڕەبوو لە (أبـو بـرزە)، و پێـی ووت: (نەخێر بـەخوا شـتی وا لـە دوای پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ کـەس

نابێت)، [1] پیاوێك مشتی گرتبوو لە عوسمـان ﷺ دەیویـست تـیرۆری بکات، یەکسەر گرتیان، عوسمانیش ڕاوێژی بەهاوەڵان کرد ﷺ (کـەس ڕای لەسەر کوشتنی نەبوو، بۆیە بەڕەڵڵای کرد)،[2] لەگێڕانەوەیەکـدا هـاتووە کـە هـاوەڵان فـەرمویان: (شـتێکی خراپـی کـردووە، بـەڵام نەتیکوشت، ئەگـەر بتیکوشـتایە دەکوژرایـەوە، عوسمـان ﷺ ئـازادی کرد)، [3] لـە گێڕانـەوەیکی تـردا عوسمـان ﷺ فـەرمووی: (ویـستی بمکوژێ، بەڵام خـوا نەیویـست، وازی لـێ‌هێناو نەیکوشـت)، [4] لـە گێڕانەوەیکی تردا هاتووە عوسمـان پرسـیاری لـێ‌کرد، ئەمـە چـیە؟ پیاوەکە ووتی: ویستم بتکوژم، عوسمان پێی ووت: سوبحانەڵلا، تیاچی، لەسەر چـی دەمکـوژی ؟، کـابرا ووتـی: کاربەدەسـتەکەت لەیەمـەن ستەمی لـێ‌کردووم، عوسمـان پێـی ووت: ئـەی بۆچـی سـتەم لێکردنەکەیت بۆم بەرز نەکردۆتـەوە ؟ ئەگـەر بـە ویـژدان نەبومایـە لەگەڵتا یا بتم گێڕایەتـەوە بـۆ لای کاربەدەسـتەکەم، ئەوسـا ئـەوەت بویستایە لە من، پاشان عوسمـان فـەرمووی: بەندەیـەك هاتـە دڵیـا گوناهێك بکات، بەڵام خوا پاراستی لێم. گێڕەرەوە دەڵێت، بەخوا تەنها

---

(١) سەیری پێشووتر بکە ل (٥٠).

(٢) ابن ابی شبة (١٠٢٦/٣) بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٣) ابن ابی شبة (١٠٢٦/٣) بە ئیسنادێکی حەسەن.

(٤) سەرچاوەی پێشوو (١٠٢٧/٣).

قامچییەکی لـێ نەداو بۆ ڕۆژێکیش نەیگرت.[1]

عوسمان ﷺ عەممار ی کوڕی یاسری نارد بۆ لای خەڵکی میسر کاتێ نەیارێتی سیاسەتی عوسمانی ﷺ تێدا دەرکەوت، عەممار ﷺ چووە پاڵ نەیارەکان، خەڵکی زیاتر دابەزینە سەر عوسمـان ﷺ، ئـەمیری میـسر ئیبن‌و ئەبی سەرح نوسراوێکی نوسی بـۆ عوسمـان کـە مۆڵـەتی بـدا عەممارو هاوڕێیانی سزابدا یـان بیـانکوژێ، عوسمـانیش بـۆی نوسـی: (خراپترین بۆچونت بووە، بەوەی مۆڵەتت بدەم سزای عەممارو هاوڕێیانی بدەی).[2]

لە گێڕانەوەیەکدا هـاتووە: (بـە چـاکی هاوەڵێتیـان بکـە، ئەگـەر هاوەڵێتیان کردی، ئەگەر ویستیان بڕۆن‌و سـەفەر بکـەن پێداویـستی ڕۆشتنیان بۆ دابین بکە، خۆ بپارێزە لەوەی پێچەوانەی ئەمەم پێبگا کە بۆتم نووسی).[3]

پیاوێك پیاوێکی هێنا بۆ لای عەلی ﷺ لە کاتێکـدا کـە خەلیفـە بوو، وە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەم پیاوەم بینی قسەی ناشـرینی پێدەوتی، ئەویش فەرمووی: تۆش جنێوی پێبدە، هەروەك بە منـیدا،

(١) سەرچاوەی پێشوو، بـە ئیسنادێکی حەسـەن‌و بـە مورسـەل، هەرئەمـەش ڕاڤـەی تیرۆرکردنـی هەرسـێ خەلیفـەی ڕاشـدینمان بۆدەکـا، کـە بریتـی بـوو لـەو ئـازادی‌و خۆنەپارێزییەی خەلیفەکان، یاخود نەبوونی حەرەسی ئاسایش پارێز نەك بە هۆی ستەم‌و زۆرداریەوە کوژرابێتن، وەك هەندێ داخ لە دڵ‌و کینە بازەکان دەیڵێن.

(٢) سەرچاوەی پێشوو ١١٢٣/٣ بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٣) سەرچاوەی پێشوو ١١٢٣/٣ بە ئیسنادێکی حەسەن.

کابرا ووتی: هەڕەشەشی لــێ دەکردی (واتە بە کوشــتن)، عەلـــی ﷺ فەرمووی: (کەســێ ناکوژم کە نەمی کوشتبێ).[1]

تەواوی ئەوەی ڕابورد جەخت دەکاتــەوە لەســەر بنــەمای ڕێــزداریو شکۆمــەندی نەفسی مرۆیی، وەدەسەڵات لە دەوڵەتی ئیسلامیدا مــافی ئەوەی نیە کوشتنی کەسێك حەڵاڵ بکا یا سزای کەسـێك بـدا یـاخود تەنگ هەڵچنێ بە نەیارە سیاسییەکانی تەنها لەبەرئــەوەی نــەیارێتی فەرمان ڕەواو سیاسەتەکانی ناکەن یاخود ڕەفزی بڕیارەکانی دەکەن.

(١) ابــن ابــی شــیبة لــە (المــصنف ٤٦٤/٧)دا، الأمــوال ی ئــەبو عوبەیــد ل ٢٤٥ بــە ئیسنادێکی سەحیح.

## مافـــی مرۆڤ له ئازادی دا

ئەمه لەکاتی دەرکەوتنی ئیسلام دا ڕوونو ئاشـکرابووە بەوپێیـەی ئیـسلام بانگەشـەیەك بـووە بـۆ ئـازادی مرۆڤـەکان بـە چـەمکە گشتگیرەکەی، شایەتی دانی ئەوەی هیچ کەس جگە لە خـوا شـایەنی پەرستن نیـە، (شـهادة أن لاإلـه إلا الله) نـەرێ کردنێکـی ئاشـکرای سەرجەم جۆرەکانی کۆیلەیەتیو مل کەچیە بۆ جگە لە خوای گـەورە: ﴿وَلا يَتَّخِذ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾(آل عمران:٦٤).

تەواوی خەڵکی لەمرۆڤایەتی بوونو ئازادیدا یەکسانن، بەندایـەتی تەنها بۆخوایە، کەس سەروەرێتی بەسەر کەسـی تـردا نیـە، گـەورەی ڕاستەقینە تەنها خوای گەورەیە، هەرئەوە، ڕێـزی مرۆڤـی گرتـووە، : ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الاسـراء: ٧٠)، وە مرۆڤی کـردووە بەجێنـشینی خۆی لەسەر زەویدا: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرة: ٣٠) .

هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ لە زۆر فەرمودەیدا تەئکیـد لەسـەر ئـەم واتایە دەکاتەوە، هەروەك لە فەرمودەیەکیدا ﷺ هاتووە (الـسيد الله تبارك وتعالى)، [1] بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی سـەروەرێتی ڕەهـــا هی

(١) ئـەبو دواد گێڕاویـەتیـەوە (١٥٤/٥)، ف (٤٨٠٦)، وە ئەحمەد(٢٥/٤،٢٤) لـه الفـتح (١٧٩/٥)، وتویـەتی: کەسـەکانی جێمتمانـەن زیـاد لـە یـەکێکیش بـە سـەحیحی داناوە، خـەتابی وتویـەتی هـەروەك لـە پـەراوێزی ئـەبودود دا دەڵێ:( السید خوایە، مەبەست لەوەیە گەورەیەتی ڕاستەقینە هی خوایە).

خوایە، مرۆڤەکان هەموویان بران هیچیان گەورەتر نین لەوانیتریان.

هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (کەستان نەڵێ: بەندەکـەم، کەنیزەکەکەم، هەمووتان بەنـدەی خـوان، هـەموو ئافرەتـەکان (إمـاء الله)ن، بەڵکو بڵێن: ڕۆڵەکەم، کچەکەم، کوڕەکەم)،[1] خەتتابی دەڵێ: (هۆکاری نەهێشتنەکە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی مرۆڤ دروسـتکراوەو ڕێی بۆ ئاسانکراوە تاوەکو بە دڵسۆزییەوە یەکتاپەرستی خوا ئەنجام بداو واز لەهاوبەش بۆدانانی بهێنێ، هەربۆیە باش نیە لەناویشیدا وەك یـەکی پیشان بدرێ، بۆئەوەی نەچـێتە نێـو واتـای هاوبەشـی پەیداکردنـەوە، ئازادو کۆیلە لەمەدا جیاوازی نیە)[2] ئەسڵ ئازادییە لە مرۆڤــ دا – تەنانەت ئەگەر کرابە کۆیلەش، هەربۆیە فەقیهەکان ڕێسای ئەسڵ لــە مرۆڤدا ئازادیە -الأصل في الانسان الحرية- یان بڕیـاردا، ئیـسلامیش کە هات بانگەشەی کرد بـۆ ئـازادکردنی کۆیلـە، ئەوەشـی کـرد بـە گەورەترین هۆکاری نزیك بونەوە لە خوای گەورە، هەروەك کردیە هـۆی سڕینەوەی زۆرێك لە گوناهەکان، وەفەرمانی بە موکاتەبەدا[3] بۆ ئـەو کەسـانەی دەیانـەوێ ئـەنجامی بـدەن لـە پێنـاوی ئازادبوونیـان لـە کۆیلەیەتی، هەروەها خـوای گـەورەش فـەرمانی داوە بەگـەورەکانیان

(١) بوخاری ٥/١٧٧ ف ٢٥٥٢، موسلم ٤/١٧٦٤، ف ٢٢٤٩، دەربڕینەکە هی موسلمە.

(٢) فتح الباری ٥/١٧٩.

(٣) موکاتەبە گرێبەستێك بووە لە نێوان گەورەو کۆیلەکەیدا، لەسەر ئەوەی کۆیلە سامانێکی دیاریکراو بدا بۆ ئەوەی ئازاد بێت.

هاوکاری داراییان بکه ن لەوڕووەوە تاوەکو بتوانن خۆیان ئازاد بکـەن، هەروەك خوای گەورە فەرمویـەتی: ﴿فَكَـاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْـتُمْ فِـيهِمْ خَيْـراً وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾ (النور: ٣٣) زۆرێك لە زانایان وای بۆ دەچن کە واجبە خاوەن کۆیلە موکاتەبـە بکـا بـۆ کۆیلەکـەی ئەگـەر کۆیلە داوای کرد وە پێویستە لە سامانی خۆی هاوکاری بکات تاوەکو ئازادبێ). [1]

عومـــەر هە ســتی بەمەبەســتەکانی ئیـــسلام کردبـــوو لـــەم بانگەشــەیەدا، هەربۆیــە ئـــازادکردنی تـەواوی کۆیلـە عەرەبــەکانی ڕاگەیاند هەر لە سەردەمی نەفامی یەوە تاکو ئەوکاتە، ئەمەش یەکەم بڕافی ئازادکردنی کۆیلەبوو، کە جیهــان پێــی ئاشــنا بــووە، عومــەر بڕیتیەکی دەدا بۆ هەرکەسێ کە کۆیلەیەکی عەرەبی لابوو وە پابەندی کردن بەوەی ئازادیان کەن [2] بەمەش تەواوی عــەرەب ئـــازاد بــوون، پاش ئەوەی هەر لە ســـەردەمی نەفامییــەوە کۆیلـەیان تێـدابو، بـە هۆی جەنگــەکانی نێوان خۆیــانو دیلێتییــەوە، ئیــسلامیش هــاتو ئازادی کردن.

بەمەش عەرەبە مسوڵمانەکان یەکەم نەتەوەن لـەناو خۆیانـدا لـە کۆیلەیەتی ڕزگاریان دەبێ، بەڵام دەوڵەتی ئیسلامی ئەم سیاسەتەی بە

---

(١) سەیری (جامع القرطبي) ١٢/٢٤٥ – ٢٥٢ بکە.

(٢) سـەیری الأموال ی ئـەبو عوبەیـد ١٤٧ – ١٧٨ بکـە، وە (مـسند)ی ئەحمـەد ١/٢٠، ئەحمەد شاکر ووتویەتی (ئیسنادەکەی سەحیحە).

شــێوەیەکی ئیلزامـــی بـــۆ ناعەرەبـــەکان پیادەنـــەکرد ، لەبەرئـــەوەی نەتەوەکانی تر لە بارودۆخی جەنگدا بوونو هەردیلێکیان لـە عــەرەب بگرتایــە دەیــانکرد بــە کۆیلــە ، بارروودۆخەکــەش هــەڵسو کــەوتی هاوبەرامبەری دەخواســت، هــەر بۆیــە ئەگــەر مــسوڵمانان پــەیمانیان لەگەڵ ئوممەتێکدا هەبوایە کـە نابـێ کۆیلـەیان لـە نێوانـدا هـەبێ، ئەبوایە پابەندێتی پێوە دەرببــڕیایەو حەرام دەبــوو کەسـیان لــێ بـە کۆیلە بکرێ، هەربۆیە قاسم لـە مالکـەوە دەگێڕێتـەوە کـە: (ئەگـەر پەیمان لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەبوو، ئەوان لە وولاتی خۆیاندا بــوون کە لەگەڵیان نەجـەنگێینو وە کۆیلـەیان لـــێ نـەگرین، ئـەوەش لـە بەرامبەر پێدان یا نەدانی شتێکدا بوو، ئەوا لەم بارەدا دروسـت نیـە (کۆیلە ) یان لـێ بکرین، هەروەها ئەگەر ئەوان کۆیلـەی سـوپایەکی جەنگ کەری تریان گرت کەئێمـە پـەیمانمان لەگـەڵیان نـەبوو، ئـەوا حەرامە ئەو کۆیلانەیان لـێ بکڕین ئەگەر لە نێــوان ئێمــەو ئەوانــدا پەیمان هەبوو کە نابێ کۆیلەکردن لە نێوانماندا هەبێ).[1]

ئیسلام بە تەواوەتی بە کۆیلەکردنی حەرام کردووە چ بە فرۆشتن بــێ یاخود لە بری قەرزاربوون، زانایان کۆن لەسەر حەرامیو یاساغی ئەم

(١) المدونــة ٢٧٤/٤، لەســەر ئــەم بناغەیــە پێویــستە پابەنــدێتی بــەو بەڵگەنامــە نێودەوڵەتیانــەوە دەربــبڕین کــە ڕێگــری لەکۆیلەیــەتی کــردن دەکــەن، چــونکە ئــەو بەڵگەنامانــە ڕێــکو ڕاســتە بــە مەبەســتەکانی شــەریعەتی ئیــسلامی کــە خواســتو شەیدای ئازادکردنی مرۆڤە لە کۆیلایەتی.

کاره، لەبەرئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ که فەرمویەتی: (قال الله تعالی: ثلاثة أنا خصمهم یوم القیامة: رجل باع حراً فأکل ثمنه، ورجل استأجر أجیراً فاستوفی منه ولم یعطه أجره...)،[1] واته خوا فەرمویەتی سێ کەس من له دوارۆژدا دوژمنیانم: پیاوێك کەسێکی ئازاد بفرۆشێو نرخو بەهاکەی بخوات، وه پیاوێکی تر کرێکارێك بەکرێ بگرێتو کارەکەی پێبکاتو پاشان کرێکەی نەداتێ.....)

هەروەك خوای گەوره یەکێك لەو هەشت بەشەی شایستەی پێدانی زەکاتنو زەکاتیان پێدەدرێ بۆ ئازادکردنی کۆیلەو بەندەیە: (وفی الرقاب) واته له پێناوی کڕینی کۆیلەو ئازادکردنیدا لەسامانی زەکاتو له خانەی سامانی مسوڵمانانی پێدەدرێ).[2]

هەموو ئەمانه تەئکید دەکەنەوه لەسەر گرنگی ئازادی لەشەریعەتی ئیسلامیدا، چونکه مەبەسته بەندایەتی بۆهیچ کەس نەکرێ تەنها بۆ خوای تاكو تەنها نەبێت، هەربۆیه عومەر ﷺ ووته بەناوبانگەکەی فەرموو: (له کەیەوه خەڵکیتان کردووه به کۆیله له کاتێکدا به ئازادی لەدایك بوون)،[3] ئەمەی وەك بەرگرییەك ووت له (قبطي)یەکی مەسیحی که له سایەی دەسەلاتی ئەودابوو.

ئازادی مرۆڤ خوازیاری ئەوەیه که کۆتو بەند لەسەر هەڵسو

(١) البخاري (٤/٤١٧) ف (٢٢٢٧).

(٢) سەیری الأموال ی ئەبو عوبەید ل (٥٧٣ – ٥٧٤) بکه.

(٣) مناقب عمری ابن الجوزي ل (٧٢).

کەوتەکانی نەبێ، وە دەسەڵات بۆی نەبێ ڕێگـری لـە هــەرکارێ بکـا مـەگەر کارەکە یاساغ بێ یاخود سەربکێـشێ بـۆ زیـان گەیانـدن بـە بەرژەوەندی گشتی یاکەسانی تر.

هەروەك چۆن حەرامـە مرۆڤـ بە هـۆی قەرزارییـەوە بکرێتـە کۆیلـە بەهەمان شێوە حەرامە بەهۆی قەرزارییـەوە بگیرێـت ئەگـەر توانـای دانەوەی نەبو لەبەر فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ (البقرة: ٢٨٠) واتە: ئەگەر قەرزارەکە نەداربوو ئەوا مۆڵەتی بدرێ تادەرووی لـێ دەکرێتەوە، زانایانیش کۆکن لەسەر ئەمـەو لەگەڵ ئەوەدان دروست نیە کەسێ توانای قەرزدانەوەی نەبێ حەبس بکرێت بە پێچەوانەی کەسێکەوە کە هەیەتیو دوای دەخاو قەرزکوێرە، ئەمە ئەو شتەیە کە بەڵگە نامەکانی مافەکانی مرۆڤـ لە هــەوڵ دان بۆئــەوەی پێی بگەنو بڕیاری لەسەردەن، بەڵام نەیان توانیوە !

لەڕاستیدا ئازادی مرۆڤـ دەخوازێ هیچ کۆتێك لەسەر ئازادییەکـەی دانەنرێو هیچ جۆرێك لەجۆرەکانی زۆرلـێکردن نەیگرێتەوە، هەربۆیە ئیسلام دانی ناوە بە بنەمای (لا إكراه في الدين) زۆرکردن لە ئـایین دا نیە، ئایینیش بە چەمکە گشتییەکەی واتای گوێڕایەڵیو مـل کەچـی دەگەیەنێ.

دروســـت نیـــە دەســـەڵات تاکـــەکانی بـــەهێزو زۆر، ملکەچـــی گوێڕایەڵیکردنی بکا، یـاخود پابەنـدیان بکـا بـە بۆچـونێك یـاخود تێڕوانینێکەوە، بەڵکو مرۆڤـ ئازادە لەوەدا کـە بـاوەڕ دێنـێ یـان نـا،

﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف: ٢٩) واتـە: ئـەوەی دەیـەوێت باوەڕ بهێنێـتو ئـەوەی دەیـەوێت باكـافرو بێباوەڕبێت، ﴿أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (يونس: ٩٩) واتە: ئایا تۆ دەتەوێت زۆر لە خەڵك بكەیت بۆ ئەوەی بـڕواداربن وە ئـازادی هەیە لەوەدا شوێنی ئەو ئایینە بكەوێ كەمل كەچەو گوێڕایەڵە بـۆی ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ (الكافرون: ٦) [1] واتە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتانو ئاینی خۆم بۆخۆم.

هەروەها مرۆڤی مسوڵمان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بۆی هەیـە لـە كاروبارە تایبەتیەكانی كۆمەڵو تائیفەكـەی خۆیـدا داوەری ببـات بـۆ شەریعەتی تایبەتی خۆی لەبەر فەرمودەی خوای گەورە: ﴿فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ (المائدة: ٤٢) [2] واتە: ئەگەر كێشەیەكمان هێنایەلات ئەوا حوكمیان بكە یاخود گوێیان پێمـەدەو بیـدە دەسـتی خۆیان، هەروەها مرۆڤ لە سایەی شەریعەتی ئیسلامیدا مافی ئازادی موڵكداریو كڕینو فرۆشتنو بازرگانیو گواسـتنەوەو كـارو وەرگرتنـی كرێی گونجـاوی كـاری هەیـە، لەبـەر فـەرمودەی خـوای گـەورە كـە

(١) ئازادی بیروڕا ئەوە ناگەیەنێ مسوڵمان مافی ئەوەی هەبێت هەڵگەڕانەوەی خۆی بە ئاشـكرا ڕابگەیـەنێ، چـونكە ئـەم ڕاگەیاندنـە تەشـەرەدانی ئاشـكرایە لـە ئـایینی ئیـسلامیو دەسـت درێـژی كردنـە بـۆ سـەر بیروبـاوەڕی ئوممـەت، بـەڵام ئەگـەر كافربونەكەی بە پەنامەكی بوو، ئەوا دەسەڵات هیچی بەسەریەوە نابێ بە هـەمان شێوەی دووڕووەكانی مەدینە.

(٢) سەیری تفسير القرطبي بكە (١٨٥/٦).

دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ (هود: ٨٥) شتی خەڵکی بەکەم مەگرنو بەکەمی مەزانن، وەلەبەر چەندین فەرمودەی تری وەك: (أعطوا الأجير أجره قبل أن يجف عرقه) [١] کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی عارەقی ووشك بێتەوە، هەروەها ئازادی ڕادەبڕینو ڕەخنەگرتنی دەسەڵات (وأن لصاحب الحق مقالاً) خاوەن ماف قسەی خۆی هەیە، (وان نقول الحق أينما كنا، لانخاف لومة لائم) [٢] وە ڕەواو هەق بڵێین لە هەر کۆییەکدا بووین، لە سەرزەنشتی سەرزەنشت کاران نەترسین، وەبۆی هەیە هەر فەرمانێکی دەسەڵات پەسەند نەکا ئەگەر پێچەوانەی بیروباوەڕی بوو وە بە حەرامی دەزانی لەبەر فەرمودەی: (إنما الطاعة بالمعروف – گوێڕایەڵی کردن لە چاکەدایە) هەروەها مافی ئەوەشی هەیە سەروەتو سامانی بە حەزو ئارەزووی خۆی ببەخشێ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايحل أخذ مال أمرئ إلا بطيب نفس منه) [٣] واتە حەڵاڵ نیە سامانی هیچ کەسێ ببردرێ ئەگەر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێ، وە لەبەر ئەو فەرمودەیەی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾(النساء: ٢٩) واتە: ماڵو سامانی یەکتر بە ناهەقو بەبێ

(١) ابن ماجة گێڕاویەتی‌یەوە، ف ژمارە (٢٤٤٣)، والبيهقي (١٢١/٦) وە ئەلبانی لە (الإراء)دا بە (صحيح)ی داناوە (١٤٩٨).

(٢) سەیری پێشوتر بکە

(٣) ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە، وە ئەلبانی لە (الأرواء)دا ئەم فەرمودەیەی بە (صحيح) داناوە بە ژمارە (١٤٥٩).

بەرامبەر مەخۆن لە نێوان خۆتاندا، مەگەر بازرگانییەك بێتو لەسەر ڕەزامەندی هەموولایەکتان بێت

هەروەها مافی ئەوەی هەیە سەر بە هەر حیزب یا کۆمەڵێك بێت کە دەیەوێ، جا ئەگەر دروست بێ بۆ نامسوڵمان لە سایەی شەریعەتی ئیسلامیدا ئینتیما بکا بۆ ئاینەکانی ترو داوەری ببات بۆ شەریعەتو ڕێسا ئاینییەکانو سەرکردەکانیان، ئەوا ئینتیماکردن بۆ کۆمەڵە فیکریو سیاسییەکان لە ڕوویەکی ترەوە لەپێشترە، هەرلەبەر ئەم هۆیەیە عوسمانو عەلی ﷺ ڕێگر نەبوون لەوەی ئینتیما بکرێ بۆ کۆمەڵە سیاسیو فیکرییەکانی وەك خەواریج، ئەوەبوو عەلی ﷺ وای نەدەبینی کە بۆی هەبێ ڕێگری ئەم جۆرە ئینتیماکردنە بکا، تا ئەوکاتەی پەنا نەبەنە بەر هێز دژ بە دەوڵەت، لەبەر ڕوونی بنەمای (لاإكراه في الدين)، مەبەستیش لە دروستی (الجواز) و ماف (الحق) لێرەدا دروستیو مافی قەزائین، کە دەسەڵات ناتوانێ زەوتیان بکاتو دەستیان بەسەردا بگرێ، نەك دروستی لە ڕووی دیانەتو فەتواوە، چونکە حەرامە ئینتیما بۆ خەواریجو گروپە بیدعەییەکان بکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا هاوەڵان هیچ ڕێو شوێنێکیان بۆ خۆیانە نەدیەوە کە ڕێگری ئەم جۆرە ئینتیماکردنە بکەن، لەبەر فەرمودەی خوای گەورە (لاإكراه في الدين)، وە لەبەر کۆڕای هاوەڵان ﷺ لەسەر ئەوەی دەستکاری خەواریجەکان نەکرێ تاوەکو ئەوان بەشیر هەڵنەکوتنە سەر خەڵکی.

ئەوا لەپێشترە، بوترێ دروستو ڕەوایە ئینتیما بکرێ بۆ ئەو کۆمەڵە سیاسیانەی بەرنامەی چاکسازی ئەخەنە ڕوو، وە هەوڵ دەدەن بگەنە دەسەلآت لە ڕێو شوێنی ئاشتیانەوە بێ ئەوەی پێکدادانیان هەبێ بۆ ئایینی دەوڵەت، ئەمەش وەك ئەو مافەی مرۆڤ وایە کە لە ماڵی خۆیدا چی بیەوێ دەیکا، وە دروست نیە دەوڵەت جاسوسی لەسەر بکا یاخود ئەو مافەی لێ زەوت بکا، هەرچەندە لە ڕووی دیانەتو ئاینداریيەوە حەرامە لە ماڵی خۆیدا ئەو شتانە ئەنجام بدا کە لە ڕووی شەرعەوە حەرامە.

هەروەها مرۆڤ مافی پەسەندنەکردنی ستەمو بەرهەڵستیکردنی هەیە، تەنانەت ئەگەر لە دەسەلآتیشەوە بێت، لەبەر فەرمودەی: (من قتل دون ماله فهو شهيد)[1] واتە هەرکەسە بۆ بەرگریکردن لە سامانەکەی بکوژرێ شەهیدە.

هاوڕێی بەڕێز، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ ئەم فەرمودەیەی کردە بەڵگە، لەوکاتەی ئەمیری مەککەو طائف عەنبەسەی کوڕی ئەبوسوفیان جۆگەیەکی ئاوی ڕاکێشابوو تاوەکو زەوییەکەی پی ئاو بدات، بەمەش لە بێستانو باخەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر نزیك ببویەوە، عەبدوڵڵاش ڕێگری کردو چەكو پشتیوانو هاوپشتەکانی خۆی هێناو بە ئەمیری ووت: (بە خوا تاکە کەسێکمان

---

(١) بوخاری بە (الفتح)ەوە (١٢٣/٥ ف ٢٤٨٠)، وە موسلم ١٢٤/١ ف ١٤١.

مـابێت ناهێڵین دیواری بێـستانەکەمان کـون بکـەن، خالیـدی کـوڕی عاص چوو بۆلاییو ئامۆژگـاری کـرد ، عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمریش فەرمودەی (من قتل دون ماله فهو شهيد)[1]ی کردە بەڵگـە ، پرسـیار لە پێغەمبەر کرا ﷺ سەبارەت بەدەسـت درێـژیکردنی دەسـەڵات لـە وەرگرتنی زەکات دا ، ئەویش فەرمووی: (من أدّی زکاة مالـه، فتعـدی عليه الحق فأخذ سلاحه فقاتل فهو شهيد) [2] هەرکەسێ زەکاتی ماڵی خۆیدا ، بەڵام ستەمیان لێکردو زیادەیان لـێ وەرگـرت ئـەویش شـەڕی لەگەڵ کردن، ئەوا شەهیدە.

پیاوێـك پرسـیاری لـە پێغەمبـەر ﷺ کـردو فـەرمووی: (ئـەی پێغەمبەری خوا ئەگەر پیاوێك هاتو دەیویـست سـامانەکەم ببـات؟ فەرموی: سامانەکەتی مەدەرێ، ووتی ئەی ئەگەر شەڕی لەگەڵ کردم؟ فەرمووی: شەڕی لەگەڵ بکە ، ووتی: ئەی ئەگەر کوشتمی؟ فـەرمووی تۆ شەهیدی، ووتی: ئەی ئەگەر کوشتم؟ فەرمووی: لە ئاگردایە. [3]

سەعیدی کوڕی زەید — کە یەکێکە لەوانەی مـوژدەی بەهەشـتیان پێدراوە — فەرمـوودەی: (من قتل دون ماله فهو شهيد)ی کردە بەڵگە کاتێك کۆمەڵێك لە قورەیشییەکان هاتنو سـەبارەت بـە بەشـێك لـە

(١) سەیری دوو سەرچاوەکی پێشوو بکە.

(٢) ئەحمەد گێڕاویەتی یەوە ٦/٣١٠ وە ابن حبان ف ژمارە ٣١٩٥، و حاکم ١/٤٠٤ وە بە سەحیحی داناوە، زەهەبیش ڕێکە لەگەڵی دا، هەیسەمیش لە (مجمع زاوئد)دا ٣/٧٢ وتویەتی (سەرجەم کەسەکانی کەسی فەرمودەی سەحیحن).

(٣) مسلم ١/١٢٤ ف ١٤٠.

زەوییەکەی قسەیان لەگـەڵی کـرد، ئـەویش فـەرمووی: (گوێبیـستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: (من قتل دون ماله فهو شهيد، ومن قتل دون دينه فهو شهيد، ومن قتل دون دمه فهو شـهيد، ومـن قتل دون أهله فهو شهيد)، له گێڕانەوەیکی تردا هـاتووە: (مـن قتـل دون ماله فهو شهيد، ومن قتل دون دمه فهو شـهيد، ومـن قتـل دون أهله فهو شهيد).[1]

(ابن المنذر) فەرمویەتی: (زانایان لەسەر ئەوەن پیـاو بـۆی هەیـە بەرگری لەوشتانە بکا کەباسمان کرد، ئەگەر بەستەم دەیانویست لێـی داگیرکەن...)[2] لە گێڕانەوەیکی تردا هاتووە: (من أريد ماله بغير حق فقاتل فقتل فهو شهيد)[3] هەرکەسـێ بـەناڕەوا سـامانەکەیان بـوێ، ئەویش بجەنگێ لەسەری و بکوژرێ ئەوا شەهیدە.

خەتتابی فەرمویەتی: (ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی هەرکەسـێ بەرگری لە سامانەکەی یاخود خاووخێزانو کەس‌وکارەکەی یاڻاینەکەی بکاو بکـوژرێ، ئـەوا پاداشـت دەدرێتـەوەو پلەوپایـەی شـەهیدەکانی

---

(١) ئەحمـەد گێڕاویـەتی یـەوە (١/١٨٧و١٩٠)، وە ئـەبوداود، ف ژمـارە (٤٧٧٢) وە ترمذي ف ژمارە (١٤٢١)، وە نەسائی (٧/١١٦)، وە ئیبنو ماجە ف ژمارە (٢٥٨٠) بە سەنەدێکی سەحیح.

(٢) فتح الباري (٥/١٢٤).

(٣) ابـوداود ف ژمـارە (٤٧٧١)، وە ترمـذی ف ژمـارە (١٤٢٠) وە فەرمویـەتی فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

دەستگیر دەبێ). [1]

ئەبوبەکری سدیق نوسراوی زەکاتی بۆ ئەنەسی کوڕی مالك ئەمیری بەحرەین نوسیو تیایدا هـاتبوو: (ئـا ئەمـە فـەرزی سـەدەقەیە، کـە پێغەمـبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانانی داناوە، ئەوەی خـوای گـەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ هەرکەسێ لە مسوڵمانان لەڕێی خۆیەوە داوای کرد با پێـی ببەخـشرێ، هەرکەسـەش سـەرووی ئـەوەی داواکرد باپێی نەدرێ). [2]

(ابن حجر) فەرمویەتی: (واتە هەرکەسێ لەوە زیاتری لـێ داواکرا لە ڕووی تەمەن یـا ژمـارەوە ئـەوا زێگـری لـێدەکری، (رافعـی)ش یەکدەنگی بەهێزی ئـەم ڕایـەی گێڕاوەتـەوە)[3]، دەسـەڵات بـۆی نیـە سامانی خەڵکی بە ناڕەوا ببات، ئەگـەر کـردی ئـەوا دروسـتە بۆیـان بەرگری لـێ بکەنو لە گوێڕایەڵی دەرچنو بەرگری لەخۆیان بکەن.

(ابن حزم)- پاش ئەوەی فەرمودەکەی عەبدوڵڵای کـوڕی عـەمرو بەسـەرهاتەکەی بـاس کـردووە فەرمودەکـەی ئەبوبـەکری سـەبارەت بەزەکات هێناوە فەرمویەتی: (ئەوەتا پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمان دەدا بەوکەسەی زۆری لـێ دەکری بە ناڕەوا سامانەکەی ببرێ، کەنەیـدا پێیان، وە فەرمانی داوە لـە پێناویـدا بجـەنگێ، ئـیتر یـا بـە ڕاسـتو

(١) سەیری حاشیە ابو داود (١٢٨/٥) بکە.
(٢) البخاري بە (الفتح)ەوە (٣١٧/٣) ف (١٤٥٤).
(٣) سەرچاوەی پێشوو (٣١٩/٣).

ڕەوانیو ســەرکەوتوویی دەجــەنگێ، یابــەپاکیو شــەهیدی دەکــوژرێ، پێغەمبــەریش ﷺ ســامانێکی لــە سامانێکیتـــر جیانەکردۆتـــەوە، لەمەش دا ئەبوبەکرو عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەســەڵاتو جگــە لە دەسەڵاتیش (لەو مەسەلەیە)دا وەك یەك دەبینن).[1]

هەروەها (ابن حزم) لە ڕوونکردنــەوەی جیــاوازی نێــوان کوشــتاری یاخی بووانو ئەوانی تردا دەڵێ: (هەرکەسێ تەنها لە پێناوی دونیــادا ڕاپەڕێ بەو شێوەیەی یەزیدی کوڕی موعاویەو مەڕوانی کوڕی حەکــەم کردیان وە عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانیش دژ بــە عەبــدوڵلای کــوڕی زوبەیریش وای کرد، مەڕوانی کوڕی موحەممەدیش لە هەستانیدا دژبــە یەزیدی کوڕی وەلید بەو شێوەیە بوو، هــەروەها ئەوانــەش کــە دژ بــە مەڕوان هەستانەوە هەروابوون، ئەمانە بیانویان نیە، چونکە بــە هــیچ شێویەك تەئویلیان نــەبووە، بــەڵکو دەســت درێــژیو یــاخی بــونێکی ئاشکرایە، بەڵام ئەوانەی بانگەشە دەکەن بۆ فەرمان بە چاکەو نــەهی کــردن لــە خراپــەو سەرخــستنی قورئــانو ڕێو شــوێنی باشــانو فەرمانڕەوایەتی بە دادگەری، ئەوە دەست درێــژیو یــاخی بــوون نیــە، بەڵکو یــاخی بــوان ئەوانــەن دژایــەتییان کــردوون، بەهــەمان شــێوە هەرکەسێ دەویستڕا ستەمی لــێ بکرێو ئەویش بەرگری لە خۆی کــرد جا ئیتر ئەوەی دەیویست ستەمەکەی لــێ بکا ئیمام بوو یا کەسی تــر، ئەمەیان جێی جیاوازی و ناکۆکییە، تاقمێك دەڵێن: دەسەڵات لەمەدا

(١) المحلی ١١/٣٠٩.

وەکو ئەوانی تر نییە، دژایەتی دەسەڵات ناکرێ هەرچەندە بیەوێ ستەم بکا، بەڵام کۆمەڵێو تـاقمێکی تـر نـاکۆکن لەگەڵیانـدا، وە وتویانـە: دەسەڵاتو جگە لە دەسەڵاتیش لەمەدا وەکویەکن، هەروەك لەڕێگـەی (عبدالرزاق) و لە (معمر)و ئەویش لـە (أیـوب)و (أبـی قلابـة) ەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێ: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کاربەدەستێکی نارد کە (وهط)[1] وەرگرێ، ئەمە گەیشتەوە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کـوڕی عـاص، ئـەویش خـۆی بـە چـەكو پـشتیوانو هاوپـشتو غولامەکانیەوە ئامادەکرد، ووتی: (من گوێبیـستی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بووم کە دەیفەرمووە: (من قتل دون مالە مظلوماً فهو شهید) لە ڕێگەی (عبدالرزاق عن جریج)ەوە هاتووە کە وتویەتی عەمری کـوڕی دینار هەواڵی پێم دا، کە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عـاص لـە پێناوی (وهط)دا خۆی ئامادەی جەنگ کردو پاشان فەرمووی: (بۆچی لە پێناویدا ناجەنگێم لە کاتێکدا گوێبیستی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بووم کە دەیفەرمووە: (من قتل دون مالە فهو شـهید)، (ابـن جـریج) وتویەتی (سلیمان الأحول) هەواڵی پێم داوە کـە فەرمویـەتی: کاتـێ ئەوەی لە نێوان عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عـاصو عەنبەسـەی کوڕی ئەبوسوفیاندا ڕویداو هشامی کوڕی موغـەیرەی مەخزومیـە – چوبۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عـاصو دەسـتی کـرد بـە ئامۆژگاریکردنی، عەبدوڵلای کوڕی عـەمری کـوڕی عاصـیش پێـی

(١) الوهـط : باخچەو زەوی عەمری کوڕی عاص بووە لە (طائف).

ووت: ئایا نازانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (هەرکەسێ لە پێناوی بەرگری لە ماڵەکەیدا بکوژرێ شەهیدە؟).

(ابن حزم) دەفەرموێ: (ئا ئەوە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصە کە پاشماوەی هاوەڵانەو بەئامادەیی ئەوانی تریان ﷺ دەیەوێ جەنگی عەنبەسەی کوڕی ئەبوسوفیانی کاربەدەستی موعاویەی برای بکا کە ئەمیری باوەڕدارانەو کە فەرمانی دابوو (وهط)ی لێ بسەنرێ، عەبدوڵلای کوڕی عەمریش وای دەبینی کە لێسەندنی واجب نیە، موعاویەش – بەر بەزەیی خوا بکەوێ – ناچێت بە ئاشکراو بە ستەمکاری ئەو (مافەی) داگیربکا، بەڵکو بێگومان جۆرێك لێکدانەوەو تەئویلی هەبووە لەو ڕووەوە، عەبدوڵلای کوڕی عەمریش وای دەبینی کە ئەمە ڕەوا نیەو جلی شەڕی پۆشیو لە ناو هاوەڵانیشدا ﷺ کەس ناکۆكو دژی نەبوو، بە هەمان شێوە لە ئەبوحەنیفەو شافعیو ئەبوسولەیمان و هاوەڵانیانەوە هاتووە کە ئەگەر کەسێك دەرچوو دژ بە ئیمام پرسیاری هۆکاری دەرچونەکەیان دەکرێ، ئەگەر باسی ستەم لێکراویەکەیان کرد ئەوا مافیان پێدەدرێ، ئەگینا داوای گەڕانەوەیان لێدەکرێ، ئەگەر گەڕانەوە ئەوا هیچیان لەسەر نیە، ئەگەر بەرهەڵست بوون شەڕیان لەگەڵ دەکرێو دەکوژرێن، ئەمەیان تەنها وتەی مالکە، کاتێکیش جیاواز دەبن هەروەك باسمان کرد پێویستە ئەو جیاوازییەیان بگێڕنەوە بۆ لای خوای گەورە ئەمەش فەرزێکەو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى

اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ (النساء: ٥٩)، گەڕاینەوە بۆ قورئان دەبینین خوای گـەورە جیاوازی ناکا لەوەدا پێویستە شەڕی کۆمەڵو گروپی یـاخیو دەسـت درێژکار بکرێ، دەسەڵاتداربێ یا دەرەوەی دەسەڵات، بەڵکو خوای گەورە فەرمانی داوە بـە شـەڕکردن لەگـەڵ هەرکەسێکدا کـە دەسـتدرێژی دەکاتە سەر برای مسوڵمانی بەگشتی تا ئەو کاتـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ فەرمانی خـوای گـەورە، خـواش هیـچی لـێ وون نابـێ، فـەرمودەی پێغەمبەری خواش ﷺ (من قتل دون مالە فهو شـهید) بـە هـەمان شێوەو بۆ گشتیو هەموانەو دەسەڵاتی لەویتر جیانەکردتەوە.

لە قورئانو سوننەتو ئیجماعو قیاس دا هیچ جیاوازیەك ناکرێ لە نێوان ئەوەی بیەوێ سامانی کەسێك ببات یـا خـوێنی برێـژێ یـاخود دەست درێژی بکاتـە سـەر نامووسـی، یـاخود تـەواوی ئەوانـەی لـە موسڵمانان بوێ، دەست بەرەڵلاکردنیش لە ئاسـت ئەمانـەدا دروسـت نیەو تیاچوونی دینو خەڵکی تێدایەو خـوای گـەورەش یارمـەتی دەرو پاڵپشتە). [1]

لە نێوان حوسەینی کوڕی عەلیو وەلیـدی کـوڕی عوتبـەی کـوڕی ئەبوسوفیاندا ناکۆکییەك دروست بوو لە پێناو سامانێکدا کەلەنێوان هەردوکیاندا بوو لـە (ذي المروة) وە وادەردەکـەوێ کەوەلیـد بـەهۆی دەسەڵاتیەوە ویستبێتی مافێکی حوسەینی کوڕی عەلی بۆ خۆی ببات، حوسەین پێی ووت: سوێندم بە خوا، یـا ئـەوەتا دادگەرانـە مافەکـەم

(١) المحلی (١١/٩٨ – ٩٩).

پێدەدەی، یاخود شیرەکەم هەڵدەگرم، پاشان لە مزگەوتی پێغەمبــەری خوادا ﷺ دەوەستین، دواتر بانگەشەو داوای (حلف الفضول) دەکەین؟ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش کاتێ گوێی لەم قسەیەی حوسەین بوو — ووتی منیش سوێند دەخۆم بەخوا، ئەگەر بانگەشەی بۆ بکـا شـیرەکەم هەڵدەگرم، پاشان لەگەڵی دا دەوەستین تاوەکو مافەکەی بۆ دەگەڕێتەوە یاخود هەموومان دەمرین، ئەمە گەیشتە (مسور بن مخرمە بـن نوفـل (الزهري) ئەویش هەمان قسەی کرد، وە گەیشتە عبدوڕەحمانی کـوڕی عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای تەمیمی هــەمان ووتــەی ئــەوانی دووبـارە کردەوە، کاتــێ ئەمــە گەیـشتەوە وەلیــدی کــوڕی عوتبــە مافەکــەی حوسەینی جێبەجێکرد. [1]

لە تەواوی ئەم مافانەدا جیاوازی نـاکرێ لــە نێــوان مــسوڵمانانو نامــسوڵماناندا لــە دەوڵــەتی ئیــسلامیدا، پێغەمبــەری خــواش ﷺ فەرمویەتی: (لقد شهدت في دار عبدالله بن جدعان حلفاً، ما احب أن لي به حمر النعم، ولو أدعى به في الإسلام لأجبـت، تحـالفوا أن يـردوا الفضول على أهلها) [2] دیارە پەیمانی (الفضول)یش لەسەر پشتیوانی کردنو ســەندنەوەی مــافی ســتەم لێکــراوان بــووە لــە ســتەمکارانو

---

(١) ابن اسحاق لـە السیرە ١/١٥٥ دا گێڕاویـەتی یـەوە لـە ڕێی ئـەوەوە (ابـن جریـر) لـە (تهذیب الآثار) دا لە ((مسند عبدالرحمن بن عوف) ل ٢١ – ٢٢) دا هێناویـەتی، وە ئیسنادەکەی (صحیح)ە.

(٢) فەرمودەکە بەیهەقی ٦/٣٦٧ بە سەنەدێکی صحیح بە مورسەلی گێڕاویەتی یەوە، بە پێی چەند بەڵگەیەکی تر سەحیحە، سەیری (البداية والنهاية) ٢/٢٧٠ – ٢٧١ بکە.

سەندنەوەی مـافی بێدەسەڵاتان بووە لە خاوەن هێزەکانو مـافی ڕێبواران لە نیشتەجێکان.

(زیاد بن جدیر) – باج گربوو لەسەر ڕوباری فورات – ویستی لـە بازرگانێکی زمی نەسـرانی دووجـار لـە هـاتنو گەڕانەوەیـدا نیـوەی دەیەکی لـێ وەرگرێ، بازرگانەکـەش بـە کـاروانی خـۆی گەیانـدەلای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و سـکاڵای زیـادی بـردەلای، عومـەریش نوسی بۆ زیاد: کە تەنها یەك جـار نیـوەی دەیـەکیان لـێ وەبگـرێ، نەسرانیەکەش هاتەوە لای عومەر پێی ووت: من ئەو کابرا پیـر(شیخ)ە نەسرانی یە بووم کە سەبارەت بە زیاد قسەم لەگەڵ کردی، عومـەریش وەڵامی دایەوەو ووتی: منیش ئەو کابرا پـیر (شـیخ)ە حەنیفییـەم کـە پێداویستییەکانتم بۆ جێبەجێ کرد.[1]

هەنـدێ لـە خەلیفـەکانی بـەنو ئومەییـە ویستیان هەنـدێ لـە کەنیسەکانی ئەهلی ذیمە بڕوخێننو بیگۆڕنە (شتی تر)، ئەهلی ذیمەش بەرهەڵستی ئەمەیان کرد، پەیمان نامەی ئاشـتەوایی نێـوان خۆیـانو مـــسوڵمانایان دەرکـــرد، کـــە تیایـــدا هـــاتبوو نابێـــت دەســـتکاری پەرســتگاکانیان بکـرێ، هـەروەها فەقیهـەکانیش بەرهەڵـستی ئـەم کارەیان کردو نەنگیان دایە پاڵ ئەو کەسانەی ویستبویان کەنیـسەکان بڕوخێنن یا بیگۆڕنە شتی ترو ئیمزای ئەبوبـەکرو عومـەرو عوسمـانو

(١) الخـراج ل ١٣٥ – ١٣٦ی ئـەبو یوسـف، الخـراج ی یحیـی بـن آدم ل ٦٧ – ٦٨، لـە چەند ڕیچگەیەکەوە کە هەندێکیان سەحیحن.

عەلی ﷺ یان کردە بەڵگە بۆ پەیمانی ئاشتەوایی یان، وەدانیان نـا بـەو مـەرجانەی کە لە بەرژەوەندی ئەهلی ذیمە بوو.[1]

لە (فتوح البلدان)دا هاتووە کە: (کاتێ موعاویـەی کـوڕی ئـەبو سوفیان بوو بە والی ویستی کەنیسەی یوحەننا لە دیمەشـق بداتـە دەم مزگەوتـەوە، نەسـرانییەکان نـەیانهێڵاو ئـەویش وازی هێنـا، پاشـان عەبدولمەلیکی کوڕی مـەڕوان لـە سـەردەمی خۆیـدا داوای کـرد بـۆ زیـادکردنی مزگـەوت، وە سـامانێکی زۆری پێبەخـشین، بـەڵام ڕازی نەبوون بیخەنە بەردەستی، پاشـان وەلیـدی کـوڕی عەبدولمـەلیك لـە سەردەمی خۆیدا کۆی کردنەوەو ماڵێکی زۆری پێبەخشین بەومەرجەی کەنیسەکەی پێبدەن، بەڵام ڕازی نەبوون، ئەویش ووتی: ئەگەر وانەکەن ئـەوا دەیـڕوخێنم، هەنـدێکیان ووتیـان: ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران، هەرکەسێ کەنیسەیەك بڕوخێنێ شێت دەبێتو تووشـی بـەڵاو ئافـەت دەبێ، قسەکەی کاری لێی کرد، داوای پاچو پێمەڕەیەکی گەورەی کردو دەستی کرد بە ڕوخاندنی هەندێ لە دیوارەکانی بە دەستی خۆی، لـەو کاتەدا عەبایەکی خـەززی زەردی لەبـەردابوو، پاشـان فەرمانیـدا بـە کرێکـارو ڕوخێنـەرەکان کـە هەسـتن بـە ڕوخانـدنیو خـستیە نێـو مزگەوتەکە، کاتێکیش عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو بە جێ نشین نەسرانیەکان سکاڵایان بردەوە لای سەبارەت بەوکارەی وەلید کـردی بـە کەنیسەکەیان، ئەویش نوسراوی کرد بۆ کارەبەدەسـتەکەیو فـەرمانی

(١) الخراج ی ئەبو یوسف ل (١٤٧).

پـــێدان ئـــەوەی خـــستویانەتە نێـــو مزگەوتەکـــەوە بـــۆ زیـــادکردنی بیگەڕێننەوە، خەڵکی دیمەشق ئەمـــەیان پێنـــاخۆش بـــوو، دەیـــان وت: مزگەوتەکەمان بڕوخێنین پاش ئەوەی بانگمان تێداداوەو نوێژمان تیادا کردووە بکرێتەوە بیعە؟!! لەوڕۆژەشدا (سلمان بـن حبیـب المحـاربی) و زانایـــانی تریـــان لـــەناودابوو، چـــوونە لای نەســـرانییەکان و داوایـــان لـــێکردن کە سەرجەم ئەو کەنیسانەی (غوطة) کە بەزۆر دەســـتخراون دەدرێتەوە پێیان، بەومەرجەی لە کەنیسەی یوحەننا خۆش بـن‌و داوای نەکـەن، ئـەوانیش ڕازی بـوون لەسـەری‌و زۆریـشیان پـێخۆش بـوو، لەمبارەیەشەوە نوسراویان نوسی بۆ عومەر، ئەویش دڵخۆش بوو پێی‌و کارەکەی بەڕێخست.[1]

هەروەها پێویستە دەوڵەتی ئیسلامی دیلەکانی ڕزگار بکا، جا ئـیتر مسوڵمان بن یان ئەهلی ذیمە و لە خانەی سامانی مسوڵمانان بریتیان بۆبدرێ، (أبو عبید) ووتویەتی: (هەروەها لە پێناوی ئەهلی ذیمەش دا جیهاد دەکـرێ، دیلـەکانیان بریتـی دەدرێ، کـاتێکیش ڕزگـار کـران دەگەڕێنەوە حاڵەتی زیمی بوون‌و بارودۆخی پێـشوویان بـە شـێوازێکی ئازادانە، لەم بارەیەوە چەندین فەرمودە هەیە......).[2]

هەمەلایەنی‌و گشتگیرێتی فەرمودەی: (فكوا العـاني- أي الأسـير وأطعموا الجائع)[3]ی بە بەڵگە هێناوەتەوە، کـە واتـای ئەوەیـە: دیـل

(١) فتوح البلدان ١٧١ – ١٧٢.

(٢) الأموال ل ١٣٩.

(٣) البخاري، ف ژمارە ٣٠٤٦.

ڕزگارکەن‌و برسی تێرکـەن، وە وەسـیـەتی عومــەری کـوڕی خـەتتابی کردۆتە بەڵگە کە تیایدا هاتووە: (وەسـێتم بـۆ جێنـشینی دوای خـۆم ئەوەیە چاکەکاربێ لەگەڵ ئەهلی ذیمەداو لە پێناوەیاندا بجـەنگێ‌و لـە توانای خۆیان زیاتریان نەخاتە سەرشان).[1]

ئەمیری شام (صالح کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس) مامەی خەلیفەی عەبباسـی ئـەبو جەعفـەری مەنـسور، هەسـتا بـە دوورخستنەوەو کۆچ پێکردنی هەندێ لە نەسرانییەکانی شاخی لوبنان (جبل لبنان)، پـاش ئـەوەی گرفـت‌و ڕووداوی نـەخوازراویان دروسـت کردبوو، ئیمامی ئەوزاعی بەرهەڵستی کردو نامەیـەکی بـۆ نوسـی‌و پڕوپوچی ئەم ڕەفتارەی ئەمیری تێدا ڕوون کردبۆوە، وە وتبـوی: (كيـف تؤخذ عامة بعمل خاصة؟! مما لم يكن تمالأ عليه خروج من خرج مـنهم، ولم تطبق عليه جماعتهم، فيخرجـون مـن ديـارهم وأمـوالهم؟!! وأحـق الوصايا بأن تحفظ وصية رسول الله ﷺ وقوله: من ظلـم معاهـداً أو كلفه فوق طاقته فأنا حجيجه، من كانت له حرمة في دمه فله في مالـه والعدل عليه مثلها[2] فإنهم ليـسوا ببعيـد، ولكـنهم أحـــرار أهـل

(١) البخاري، ف ژمارە ٣٧٠٠.

(٢) ئەمە بنەمایەکی گەورەی ئیمامی ئەوزاعی یە لە ڕوونکردنەوەی حەرامێتی خوێنی مرۆڤ کە دەخوازری سامان‌و ناموسی بپارێزرێ‌و حەرام بێ لەوانی تر، وە مرۆڤ هـەمان ئـەو مافانـەی هەیـە کـە مـسوڵمان لـە دەوڵـەتی ئیـسلامی دا هەیانـە، بـە شێوەیەکی کورت‌و پوخت.

الذمة)[1] واته: چۆن هەمویان لەبەر هەندێکیان سـزا ئـەدەیت، کـە پشتگیری ئەوانیان نەکردووە کە دەرچوونو ڕازی نەبوون لەسەر ئـەوەی کردویانــە، بەمــە مــاڵو حاڵیــان لـــێ تێــك دەدەیــت ؟!! باشــترین ئامۆژگارییەك ئەوەیە وەسیەتی پێغەمبەری خـوا پیــادە بکـەیت کـە دەفەرموێ: هەرکەسێ ستەم لە پەنادراوو بەڵێن پێـدراوێك بکـاو لـە توانا بەدەریان بەسەردا بسەپێنێ ئەوا من ناحەزیم، هەرکەسێ خوێنی پارێزراو بێت سامانیشی دەپارێزرێت، دادگەریش لەگەڵیاندا هەروایە، ئەوانە کۆیلەنین، بەڵکو ئازادەکـانی ئـەهلی زیمــەن، وەلیــدی کــوڕی عەبدولمەلیك خەڵکی قوبرسی گواستەوە بۆ شام، فەقیهـ و مسوڵمانان ئەم کارەیان زۆر پێنەشیاوو ناشایـستەبوو، لایـان گــەورەبوو، کاتێــك فەرمانڕەوایەتی کەوتە دەست یەزیدی کـوڕی وەلیـد گەڕانینیــەوە بـۆ قــوبرس، فەقیهــەکان ئەمـــەیان زۆر پێبــاش بــوو، بــە دادگــەریو عەدالــەتیان دانا.[2]

هەمو ئەوانەی ڕابوورد تەئکید لەسەر مەدای چەسپاوێتی بنــەمای پاراستنی مافو ئازادی یــە تاکەکەسـی یــەکان دەکاتــەوە لــەگوتاری سیاسی شەرعی لەو قۆناغەدا.

(١) الأموال ی ئەبوعوبەید لا (١٨٣ – ١٨٤).
(٢) الأموال ی ئەبوعوبەید لا (١٨٧).

## ١٠- پێویســـتی تێکۆشـــان له پێناوی خـــوادا:

ئەمە بریتیە لە بنەمای دەیەم لـەی بنـەماکانی گوتـاری سیاسـی شەرعی دابەزێنراو، خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیق ﷺ لە یەکـەم وتاریداو لەپاش ئەوەی هەڵبژێردرا بە خەلیفە تەئکیـدی لەسـەر ئـەم بنەمایە کردەوەو تیایدا هاتووە: (هەر خەڵکێ وازبهێنێ لـە جیهـادی ڕێی خوا، ئەوا خوا تووشی ڕیسواییان دەکـا)، [1] هـەر بۆیـە ئـەو و هاوەڵان کۆبوون لەسەر جـەنگی هەڵگـەڕاوەکان کـە بریتـی بـوو لـە جیهادی بەرگری بۆ پاراستنی ئایینو دەوڵەتو ئوممەت لەو مـەترسی یە ناوخۆییانـەی هەڕەشـەی لـە یـەکێتی سیاسـیو تەشـریعی دەکـرد، لەبەرئـەوە جـەنگان لەگـەڵ ئەوانـەی لـە ئیـسلام پاشـگەزبونەوەو بەرهەڵســـتی زەکات دانیـــان دەکرد تاوەکو ئەبوبەکر فەرموی: (بـە خوا ئەگەر زەکاتی ساڵێکم پێنەدەن، کە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکەم چونکە زەکات مافی سامانە) [2] هـەروەك کۆبـوون لەسـەر جیهـادی ڕزگـاری خـوازی بـۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلامو ئازادکردنی نەتەوەکان لە بەندایەتیکردنی جگە لـە خـوا، وە لـە سـتەمو زۆرداریو بڵاوکردنـەوەی یەکتاپەرسـتیو دادگەریو ئازادیو بەدیهێنانی یەکسانیو برایەتی، چـونکە پـەیامی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو جیهانو خەڵکی یە، هەروەك چـۆن ڕوبعـی

(١) سەیری پێشوتر بکە

(٢) صحیح البخاری فەرمودەی ژمارە (١٤٥٦).

کوڕی عامر بۆ ڕۆستەمی دەربڕی بەوەی کە ووتــی: (لەڕاســتیدا خــوا ناردومانیێتی بۆ ئەوەی بەندەکان لە بەندایەتیکردنی بەنــدەکان دەربــاز بکەین‌و بۆ پەرستشی خوای بەندەکانیان ئامادە بکەین، وە لە ستەمی ئایینەکانەوە بیانگەیەنینە دادگەری ئیسلام، وە لە تەســك‌و تروســکی دونیاوە بیانگەیەنینە بەرینی‌و فراوانی دونیاو دوارۆژ) مسوڵمانان کۆن لەسەر واجبێتی تێکۆشــان لــە پێنــاوی خــوادا بــە هــەردوو جیهــادی بەرگری‌و ڕزگاریشەوە هەروەك (ابن عطیة) فەرمویەتی: (ئەوەی کــۆڕا لەسەری چەسپاوە ئەوەیە کە جیهاد لەسەر هەموو ئوممەتی موحەممــەد ﷺ فەرزی کیفایەیە، جا ئەگەر هەندێك لە مسوڵمانان پێی هەستان ئەوا لەسەر ئەوانی تر دەکەوێ، مەگەر دوژمن بێتە گۆڕەپانی ئیسلام، ئا لەو کاتەدا دەبێتە فەرزی عــەین)[1] شــێخی ئیــسلام ئیبن‌وتەیمیــە فەرمویەتی: (جەنگی بەرگری سەختترین جۆرەکانی بەرگری کردنە لــەو هێرش‌و هەڵکوتانانەی دەکرێتە سەر ئەو شتانەی پێویستە بپارێزرێن‌و ڕێزدار بن وە دەکرێنە سەر ئاین، کە ئەمە بــە کــۆڕا واجبــە، چــونکە دوژمنی هێرشبەر کە دین‌و دونیا گەندەڵ‌و خراپ دەکا هیچ شتێك نیە پاش باوەڕهێنان لەو بەرگری کردنە پێویستر بێــت، بۆیــە مــەرجی بــۆ دانەنراوەو بە پێی تواناو بۆ لوان بــەرگری ئــەنجام دەدرێ)[2] وە لەبــەر ڕوونــی‌و چەســپاوێتی ئــەم بنەمایــە دەبیــنین تەنانــەت لــە قۆنــاغی دووەمیشدا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە هەروەك پاشتر ڕوونی دەکەینەوە.

---

(١) تفسیر القرطبي ٣/٣٨.

(٢) الفتاوی المصریة ٤/٥٠١.

# بەشـــی دووەم
# قۆناغی گوتاری ســـیاسـی شـەرعی تەئویلکـراو

ڕوخسارو ئەدگارەکانی ئەم گوتارە لەوکاتـەوە دەسـتی پـێکرد کـە جێنشینێتی لە راوێژەوە گۆڕا بۆ پاشایەتی یەکی تورکی (عضوض)،(*) پێغەمبـەریش ﷺ سـەبارەت بەمـە هـەواڵی پێـداوین، ئـەوەتا فەرمویەتی: (تكون النبوة فيكم مـا شـاء الله أن تكـون، ثـم تكـون خلافة على منهاج النبوة، فتكون ما شاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكون ملكاً عاضاً، فيكون ما شاء الله أن يكـون، ثم يرفعها إذا شاء، ثم تكون ملكـاً جبريـة، فتكـون مـا شـاء الله أن تكون، ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها، ثم تكـون خلافـة علـى منهـاج النبوة)(١)، واتە پێغەمبەرایەتی دەبێ ئەوەندەی خوا بیەوێ لەناوتانـدا دەمێنێ، پاشـان دەبێتـە جێنـشینایەتییەك کـە بـە پێـی بەرنامـەی پێغەمبەرایەتییە، ئەمەش ئەوەندەی خوا بیەوێ بەردەوام دەبێ، پاشـان کاتێ بیەوێ هەڵی دەگرێو نایهێڵێ، پاشـان دەبێتـە پادشـایی یـەکی

(*) ووشـەی تـورکی مـان بۆ (عضوض) بەکارهێناوە، لـە کاتێکدا ووشـەی (عضوض) وەرگێڕانی پیت بەپیتی دەکاتە گازگر یا بەکەسێك دەگوترێ قەپ بکات بە شتێك داو بەری نەدا (وەرگێڕ).

(١) ئەحمەد لە (المسند)دا ٢٧٣/٤ گێڕاویەتی یەوە، فەرمودەکە سەنەدەکەی سەحیحە، سەیری (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ف ژمارە٥ بکە.

تورکی، ئەمەش ئەوەندەی خوابیەوێ بەردەوام دەبێ، پاشان کاتێ بیەوێ هەڵی دەگرێو نایهێڵێ، پاشان دەبێتە پادشاییەکی زۆرداری خۆسەپێن، ئەمەش ئەوەندەی خوا بیەوێ بەردەوام دەبێو پاشان کاتێ کە دەیەوێ هەڵی دەگرێو لایدەبات، پاشان دەبێتەوە جێنشینایەتیەك کە بەپێی ڕێو شوێنو بەرنامەی پێغەمبەرایەتییە.

پادشایەتی تورکی (الملك العضوض) ئەو پادشایەتییەیە کە ستەمو توندوتیژی تێدایە وەکو لە ڕژێمە بۆماوەییو پشتاوپشتەکان دا دەیبینین، وەپادشایەتی زۆرداری خۆسەپێن (الملك الجبری)ش بریتیە لەو پادشایەتییەی لوت بەرزو خۆسەپێنو ناچارکەرە، هاووێنەی ڕژێمە سەربازییەکانی ئەمڕۆ.

چاخو سەردەمی خەلیفە ڕاشدییەکان ساڵی (٤٠)ك کۆتایی پێهاتو سەردەمی ئەمەوی دەستی پێکردو لەگەڵیدا ئەو گوتاری سیاسی یەی نمایندەی ڕێنمایی یەکانی ئایینی دابەزێنراوی دەکرد دەستی کرد بە پاشەکشەو ئەوگوتارە سیاسییەی نمایندەی ڕێنمایی یەکانی ئایینی تەئویلکراوی دەکرد دەستی پێکرد، ئەوەبوو دەست کرا بە بەڵگە هێنانەوە بە دەقەکان نەك لەسەر ئەو شێوە دروستەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ویستویانە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمویەتی: (یەکەم کەسێ کە سونتەتو ڕێو شوێنی من دەگۆڕێ

پیاوێکە لە ئومەوی یەکان).[1]

ئەم قۆناغەش لەدوای سەردەمی خەلیفەی ڕاشد عەبدوڵڵای کــوڕی زوبەیرەوە ساڵی (٧٣) ك دەست پێدەکـات، کـە ئەمــە دوا خەلیفــەی هاوەڵە، ئەم ماوەیە درێژ بویەوە تاکەوتنی خەلافــەتی عوسمــانی، ئــەم قۆناغەش لە ڕووی پاشەکـشەوە لــە بنــەماکانی تــەعالیمی ئــایینی دابەزێنراوو لە ڕووی گوتاری سیاسیەوە بە پێی چاخە جۆراو جۆرەکانی جیاوازی تێدا هەیە، بەڵام دیارترین ئادگارو تایبەتمەندی ئەم قۆناغەش بریتیە لەوەی کە دێ: -

١/ دەســت بەســەراگرتنی مــافی ئوممــەت لــە هەڵبــژاردنی ئیمـامو گۆڕینـی فەرمان ڕەوایی لە ڕاوێژەوە بۆ پشتــاو پشـتی:

لەڕاستیدا ئەم پاشەکشێیە دیارترین ئادگارو تایبەتمەنــدی یــەکانی ئەم قۆناغەیە، ئەوەبوو ئوممەت مافی خۆی لەهەڵبژاردنی ئیمام دا لــە دەســتداو ئــەم مافــەش بــە زۆر دەســتی بەســەردا گــیراو دەســت کــرا بەبانگەشــەی لەبــەرتری‌و شــیاوێتی لــە ئیمامــەت داو ئەمــەش ڕێو شوێنی خۆی بینییەوە لە گوتــاری سیاســیدا تــاوەکو ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ زیاتر ڕیشەی خۆی دادەکوتا.

(١) سەیری (سلسلة الأحادیث الصحیحة)ف ژمارە (١٧٤٩) بکە، ئەلبانی فەرمویەتی: (لەوانەیە مەبەست لەم فەرمودەیە گۆڕینی سستمی هەڵبژاردنی خەلیفەو کردنی بێ بە پشتاوپشتی بێ، ئەمەش دیارترە).

پاش ئەوەی ئەبوبەکر لە یەکەم گوتاری دا دەیفەرموو: (مــن کــراوم بە سەرپەرشتیارتانو باشترینتان نیم، ئەگەر چــاکەم کــرد هاوکــاریو پشتیوانیم بکەن، ئەگەر خراپەشم کرد ڕاســتم بکەنــەوە)، عومــەریش دەیفەرموو: (میرایەتی بەڕاوێژی نێوان مسوڵمانانە، هەرکەسی پەیمان (بیعە) بدا بەپیاوێك بێ ڕاوێژی مسوڵمانان نە شوێنی خۆی دەکەونو نــە ئەوەشــی ئــەو بەیعــەتی پــێداوە) . عــەلیش دەیفــەرموو: (ئــەی خەڵکینە، میر ئەوکەسەیە ئێوە میرایەتیتان پێبەخشیوەو کردوتانە بە ئەمیر) .

کەچی لە پڕێکدا گوتاری سیاســی دەگۆڕێــتو موعاویــەی کــوڕی ئەبوسوفیان دەڵێ: (هەرکەسێ دەیــەوێ لــەم کاروبــارەدا قــسەبکا بــا بکۆکێ،(*) بزانە ئێمە لەخۆیی و باوکی شیاوترنین بۆ ئەم کارە(**))،(۱) وە دەیوت: (کێ لە ئێمە شــــیاوترە بەم کارە؟ کێ دوبەرەکیمان لەگەڵ دەکات؟).(۲)

بەم شێوەیە پاش ئەوەی کارەکە مافی ئوممەت بوو، حەرام بــوو ئــەو مافەی ئوممــەت زەوت کــرێو کێبــەرکێی لەگەڵــدا بکــرێ، هــەروەك عومەر فەرمووی: (مــن خــەڵکی بــەئاگا دێــنم لەوانــەی ئەیانــەوێ

(*) لـە دەقەکەیدا دەڵێ (فلیطلع لناقرنـە، واتـە باشـاخی خۆیمـان بۆدەرخـا)، بـەڵام لـە کوردیدا دەبڕینێکی لەوەی سەرەوە لە هەندێ ناوچەدا بەکاردێ.

(**) مەبەستی خەلیفایەتیو خەلافەتە (وەرگێڕ).

(۱) صحیح البخاري، ف ژمارە (٤١٠٨

(۲) سەیری فتح الباري ٤٠٤/٧ بکە.

مـافەکانیان زەوت بکەن‌و دەستی بەسەردا بگرن) — کەچی بانگەشەی باشترێتی‌و لەبەرتری پاش سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشـدین لـەگوتاری سیاسیدا بەدەردەکەوێت، بەنو ئومەییە ئەم بانگەشەیەیان دەکـرد بـە بیـانوی ئــەوەی ئــەوان خــاوەن مــاف‌و کــەس‌وکاری عوسمــانن، ئــەو خەلیفەیــەی بەســتەملێکراوی کــوژرا، عەبباســی‌و عەلەویــەکانیش هەمان بانگەشەیان دەکـرد بـەبیانوی ئـەوەی کـەس‌وکارو میراتگـری پێغەمبەرن ﷺ ، تەنانەت ئەبو عەبباسی سەففاح یەکـەم خەلیفـەی عەبباسی لـە یەکـەم گوتاریـدا لـە سـاڵی ١٣٢ ك لەکوفـە ووتــی: (ســەبەئیەکان گومانیــان وابــووە کــە شــیاوترن بــە ســەرۆکایەتی‌و سیاسەت‌و خەلافەت لە ئێمە، بۆیە ڕویان شێواو ڕەش بوو... هتد).(١)

داودی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی مامیشی لە ووتارەکەیدا وتویەتی: (ڕێزو سەروەریمانی ژیاندەوە، ماف‌و میراتیمـانی گەڕاندەوە... بزانن ئەم کارە لەناو ئێمەدا دەبـێ‌و ناچـێتە دەرەوەی ئێمـە تاوەکو دەیدەینە دەستی عیسای کوڕی مەریەم).(٢)

بەئەوزاعی ووت: (ئایا خەلافەت بەوەسیەتی پێغەمبەری خـوا ﷺ مافێکی ئێمە نی یە؟!!.)(٣)

بەم شـێوەیە گوتـاری سیاسـی لـەڕێی ئـەم بانگەشـەو بیانوانـەوە

---

(١) تاريخ ابن جرير (٣٤٦/٤).

(٢) تاريخ ابن جرير (٣٤٨/٤).

(٣) مقدمة الجرح والتعديل (٢١٢/١).

پاشاکشەیەکی مەترسی‌داری کردو مـافی هەڵبـژاردنی ئیمـامی لـە خەڵکی زەوت کرد، بۆ ئەوەی ببێتە مافێکی وا کە دواتر هەریەکە لـە ئومەوی و عەبباسیی و عەلەویـەکان بـە چـەندەها جـۆری جیاجیـای تەئویلکردنی دەقەکانی قورئـانو سـوننەت، بانگەشـەی خۆیـانی بـۆ بکـــــەن !!

لەڕاستیدا گوتەزای بوونی دەق لەسەر ئیمامەت یەکـەم لاوازی یـە کە هاتۆتە سەر گوتاری سیاسی و دەرگای بـۆ ئـەم جـۆرە بانگەشـانە خستۆتە سەرپشت، ئەم داواو بیانوو بانگەشانە لەسەردەمی عەلی یەوە ﷺ بەدەرکەوتنو ئەویان ناچارکرد بەوەی ووتاربدات بۆ ڕوونکردنـەوەی ئەوەی لەوبارەیەوە هیچ وەسیەتێکی بۆ نەکراوەو ئەم کارە بـۆ کۆچـەرو پشتیوانەکان بەجێ‌هێڵراوە، بـەلاّم تـەواوی ئەمانـە بێ‌ئاکـام بـوو لـە کپکردنەوەی ئاژاوەی بوونی دەقو بانگەشەی لەبەرتری لەگـەڵ ئـەوەی لە ووتارێکیدا دەڵێ: (هاتونەتە لام دەڵێن: بەیعەت بەیعەت! دەسـتان ڕاخستبوو من چنگم نوقاند، دەستم بە ڕوتاندانا ئێوە ڕاتان کێـشا)،[1] وە دەفەرموێ: (ئەگەر ئیمامەت دانەمەزرێ تاوەکو خەڵکی بە گـشتی ئامادە نەبێت، ئیتر هەر ئەبێ ئەوە بکـرێ، بـەلاّم خـەڵکی ئامـادەبوو فەرمان دەکەن بەسەر ئەوانەی کە ئامادەی نەبوونە، پاشان ئامـادەبوو بۆی نیە پاشگەز بێتەوە، ئامادە نەبوش بـۆی نیـە هەڵبـژێرێ)،[2] وە

(١) نهج البلاغة بە لێکدانەوەی موحەممەد عەبدە (٢/٢٠).

(٢) نهج البلاغة (٢/٨٦).

فەرمویەتی: (بە خوا حەزم بـە جێنـشینایەتی نیــە، سەرپەرشــتیاریم پــێخۆش نیــە، بــەڵام ئێــوە منتــان بــۆی بــانگ کــردو پێتانــدام(*) و ئەوئەرکەتان خستە سەرشانم).(١)

وەك حوججەیەکیش لەسەر موعاویە ﷺ فەرمووی: (ئــەو خەڵکــە بەیعەتی پێدام کە بەیعەتیان دابوو بە ئەبوبــەکرو عومــەرو عوسمــان لەسەر هەمان ئــەو شـــتانەی بەیعــەتیان بــەوان دابــوو، ئامــادەبوو شتێکی تری بۆ نیەو نەهاتوش بۆی نیە پەسەندی نەکاو ڕەتیکاتەوە، - راوێژیش بۆ کۆچەرو پشتیوانەکانە، ئەگەر کۆبونەوە لەسەر کەسـێكو ناویان نا بەئیمام ئەوە بۆ خوای گەورەش جێی ڕەزامەندییە).(٢)

لە ژیانی خۆیدا گوتەی شیاوترێتی (الأحقیة)ی ئەو بۆ خەلافەت لە لایەن هەندێ لە هەواداریانەوە بڵاوبویەوە،(٣) پاشــان لــەنێو خــەڵکی شامدا کەسی تر هــەمان ئیــدعای دەکــرد، پاشــان بــەردەوام هــەموو تاقمەکان دەقەکانیان تەئویل دەکرد بۆ پشتگیری داواکانیــان، تــاوەکو کارەکە گەیشتە لوتکە لە دەرکەوتنی تائیفەکانی عەقائیــدی لەســەر بناغەی داوای شیاوترێتی ئەم بنەماڵــە یــان ئەویــدیو کێـشەکە لــە

---

(*) پێمتانــداو ئـەو ئەرکـەتان خـستە سەرشـانم وەرگێڕانــی دەربڕینــی ( وحملتمــوني عليـها)یە کە ماناکەی بەم شێوەیەش دێ ( ئێوە منتان خستە سـەری) بەڵام ئـەوەی سەرەوە گونجاوتر دیارە (و).

(١) نهج البلاغة (١٨٤/٢).

(٢) نهج البلاغه (٧/٣).

(٣) سەیری صحیح البخاري ف ژمارە (١٧٤١) و فتح الباري (٥/ ٣٦١ – ٣٦٢) بکە.

کێشەیەکی سیاسـی شـەرعی بەرژەوەندییـەوە گـۆڕا بـۆ کێـشەیەکی عەقائیدی (ئایدۆلۆژی) ؟!

لەڕاستیدا ئەم جۆرە بیـانوو بانگەشـانە چـەند کێـشەیەکی زەروری بـوون بـۆ دابـڕین و پۆشـینی شـەرعیەت بـە بـاڵای فـەرمان ڕەوایـی میراتگری و پشتاوپشت دا، جائەگەر بابەتی ئیمامـەت و دەسـەڵات لـە بواری مافە تایبەتی یەکاندابن، کەواتە گونجاوە بۆ میراتگرێتـی وەکـو ئەو مافانەی تر کە دەکرێ بە میراتی وەربگیرێن ؟

ئەمەش سەرەنجامێکی حەتمی ئەم جۆرە بانگەشەکردنانەیە، یەزیـد یەکەم خەلیفەبوو لەڕێگـەی میراتگـری یـەوە گەیـشتە خەلافـەت، [1] هەرچەندە ئەم بنەمایە بەڕوونی لە دەوڵەتی ئومەویـدا بەدەرنەکـەوت بەوشێوەیەی لە دەوڵەتی عەبباسی و عەلەویدا بـەدەر دەکـەوێت، ئـیتر واقع چەمکە نوێکانی خۆی سەپاند بەسەر فیقهی ئیسلامیداو تەئویل کردنیش ڕێگەی گرتەبەر بـەرەو دەقـەکانی گوتـاری سیاسـی، ئەگـەر دروست بێ بۆ ئەبوبەکر ﷺ کاری فەرمانڕەوایەتی دوای خۆی بـسپێرێ بەوکەسەی بە شیاوو گونجاوی دەبینێ، بە پێوان لەسەر ئەوە — دروستە خەلیفایەتی بسپێردرێ بـە کـوڕو نـەوەکان ؟ بێ ئـەوەی ڕەچـاوی ئـەو جیاوازییە بکرێ لە نێوان سپاردنی ئەبوبـەکر بـۆ عومـەرو سـپاردنی ئەوانی تر بۆ کوڕو براکانی خۆیان.

---

(١) یەزید ڕاستەوخۆ بە بیانەی میراتگرییەوە نەگەیشتە خەلافەت، بەڵکو لە ڕێگەی تەئویلکردنی میراتگرییەوە بوو ئەویش لە ڕێی بیردۆزەو تێڕوانینی سپاردن بە کوڕو نەوە (العهد للأبناء) ؟!!.

لەڕاستیدا سپاردنی (عەهدی) ئەبوبەکر بۆ عومەر لەبواری پالاوتن بوو پاش ڕاوێژو ڕەزامەندی، بێ زۆرلێکردن یا پابەنـدکردن، هـەروەها لە نێوانیاندا نزیکی یا خزمایەتییەك نەبوو گومانو دوودڵی بوروژێنێ لە مەبەسـتی ئـەم پالاوتنـە، هـەروەها ئـەو بارودۆخـەی چـواردەوری دەوڵەتی ئیسلامی نوێی دابوو - کە تازە لە جەنگە نـاوخۆیی یـەکان دەرباز ببوون - جەنگی هەڵگەڕاوەکان - دەستیش کرابـوو بەجـەنگی هەردو ئیمپراتۆریـەتی فـارسو ڕۆم - هـەموو ئەمانـە ئەبوبـەکریان ناچارترکرد ئـەم جـۆرە ڕێو شـوێنە بگرێتەبـەر، بـە تایبـەت ڕوداوو مشتومڕی سەقیفەی دێتەوە یاد کە لەوانەیە لـە دوای وەفـاتی خـۆی یەکلانەبێتەوە، هـەر هـەموو ئەمانـە پـاڵی پێوەنـا تـاوەکو ئـەمجۆرە هەڵسوکەوتە ئەنجام بدا کە ڕۆژانو ڕووداوەکانو سـەرکەوتنە گـرنگو ئاشـکراکان ڕاسـتیو دروسـتی دیـدو بۆچـونەکەی ئـەویان سـەلماند، سەلماندی ئەبوبـەکر چـەند بیرتیـژ بـووەو عومـەریش شـیاو بـووە بـۆ پێشەوایەتیو سەرکردایەتی دەوڵەتی نوێ.

لەڕاستیدا تەواوی ئەم ئیعتبـارو جیـاوازی یانـەی نێـوان سـپاردنی ئەبوبەکر بۆ عومەرو سپاردنی ئەوانیتر بۆ نەوەکانیان هەڵوەشێنرایەوە، تاوەکو گەیشتە ئەوەی زانایانی شەرعناس (فقهاء)و زانستی فیقهـ ئەو پێوانە (قیاس)ە بێئیعتبارو خراپە پەسەند بکاو شەرعیەت ببەخشێتە ئەو سپاردنانەی مافی هەڵبـژاردنی ئیمـام لـە ئومـەت دەسـەنێتەوە، لەڕاستیدا هاوەڵان هەستیان بە مەترسی ئەم پاشەکشە ترسناکە کـرد

له گوتاری سیاســی پــاش خه‌لیفــه‌كانی ڕاشــدین‌و ئینكاریــان كــرد، عه‌بدوڵڵای كــوڕی عومــه‌ر ئینكــاری كــرد، ویــستی ڕه‌دی قــسه‌كه‌ی موعاویه بداته‌وه: (كێ له ئێمه شیاوتره بۆ ئه‌م كــاره ؟!) عه‌بــدوڵڵای كوڕی عومه‌ر فه‌رمووی: (ترسام قسه‌یه‌ك بكه‌م په‌رته‌وازه‌یی بخاته نێــو خه‌ڵكی یه‌وه‌و خوێنی تیا بڕژێ).[1]

كاتێ موعاویه ویستی خه‌ڵكی به‌یعه‌ت بده‌ن به یه‌زیدی كوڕی لــه ساڵی (٥٦) ك و له دوای خۆی خه‌لیفایه‌تی بسپێرێ بــه ئــه‌و، گــه‌وره هاوه‌ڵان‌و فه‌قیهه‌كانی ئه‌و ماوه‌یه كه بریتی بوون له عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌رو عه‌بــدوڵڵای كــوڕی زوبــه‌یرو عه‌بــدوڵڵای كــوڕی عــه‌بباس‌و عه‌بدوڕحمانی كوڕی ئه‌بوبه‌كرو حوسه‌ینی كوڕی عه‌لی ڕێگریان لــێ‌كرد.

عه‌بــدوڕحمانی كــوڕی ئه‌بوبــه‌كر لــه هــه‌موویان زیــاتر دژی بــوو، ووتاره‌كه‌ی به موعاویه بڕی‌و پێی ووت: (به خوا تۆ حه‌ز ئه‌كه‌ی ئێمــه بتكه‌ینه بریكار له كاروباری كوڕه‌كــه‌ت داو بتده‌ینــه ده‌ســت خــوا،[*] به‌خوا ئێمه واناكه‌ین، به‌خوا یا ده‌بــێ ئــه‌م كــاره بگه‌ڕێنیتـــــه‌وه بــۆ ڕاوێژی نێوان مسوڵمانان یاخود ده‌یكه‌ینه جه‌نگ له‌گـــــه‌ڵت پاشــان ده‌رچـــــوو ڕۆی).[2]

---

(١) رواه البخاري ف ژماره (٤١٠٨).

(*) واته هیچ ڕه‌فتارێك به‌رامبه‌رت نه‌نوێنین (وه‌رگێڕ).

(٢) تاریخ خلیفه بن خیاط ل ٢١٤ به سه‌نه‌دێكی (صحیح لغیره) چونكه (نعمان بن راشد)ی تێدایه كه ڕاستگۆیه، به‌ڵام لاوازی تێدایه، ڕووداوه‌كه له چه‌ند ڕووی تره‌وه به‌هێزه.

کاتێکیش مەڕوانی کوڕی حەکەم سەبارەت بەبەیعەتی یەزید ووتی: (بەپێی ڕێو شوێنی ئەبوبەکری ڕاشدی ڕێنمونی کراوە (سنة أبوبكر الراشدة المهدية)، عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر ڕەتی دایەوەو ووتی: (ئەمە ڕێو شوێنی ئەبوبەکر نیە، ئەبوبەکر کەس وکارو هۆزی ختسەلاوە وە چوو بەلای پیاوێکی بەنی عەدی یەوە، چونکە بینی شایستەی ئەو کارەیە، بەڵام ئەمەی ئێوە هرقلیەتە)،[1] لە گێڕانەوەیکی تردا هاتووە کە پێی ووت: (بەخوا کردوتانە بە هرقلیو کیسرایی).[2]

مەروان ئەوکاتە ئەمیری مەدینەبوو لەلایەن موعاویەوە، موعاویە داوای لێ کردبوو بەیعەت پێدانی یەزیدیان بۆباس بکات، مەڕوانیش ووتاری داو داوای بەیعەتدانی بە یەزید کرد، لە ووتارەکەیدا هاتووە: (خوای گەورە بۆچونێکی باشی خستۆتە دڵی ئەمیری باوەڕدارانەوە سەبارەت بەیەزید، ئەگەر بیکاتە جێنشین ئەوا ئەبوبەکریش عومەری کردە جێنشین)،[3] لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە ووتویەتی: (سوننەتی ئەبوبەکرو عومەرە)،[4] عەبدوڕەحمانیش ڕەتی داوەتەوەو پێی وتووە:

---

(١) تاريخ الإسلام للذهبي ساڵی (٥١)ك، ل (١٤٨).

(٢) ابن كثير (٩٢/٨) لە ڕوداوەکانی ساڵی (٥٨) ك، ئەمە لەگێڕانەوەی(عبدالرزاق بن عمر)ە لە (الزهري عن المسيب عبدالرحمن بن أبي بكر)ەو ئیسنادەکەی (صحيح)ە.

(٣) سەیری فتح الباري (٥٧٦/٨)، ف ژمارە (٤٨٢٧)ە.

(٤) سەیری فتح الباري (٥٧٧/٨) بکە.

(بــەڵکو ســـوننەتی هیرقــڵو قەیـسەرە)،[1] لەگێڕانەوەیــەکی تــردا: (هرقلیەتتان هێناوەو بەیعەت بۆکورەکانتان دەستەبەر دەکەن)،[2] لــە گێڕانەیەکی تردا هــاتووە: عەبــدورەحمانی کــوڕی ئەبوبــەکر هەســتاو ووتی: (بەخوا درۆت کرد، ئەی مەروان، موعاویەش لەگــەڵت دا درۆی کرد، شتی وا نابێت، ڕێو شوێنو سوننەتی ڕۆمان لەناودا دامــەهێنن، هەرکاتێ هرقلیك مرد هرقلێکی تر لەجێگەی دانێن).[3]

پاشان عەبدورحمن ووتی: (ئەی کۆمەڵی بەنو ئومەییە، بۆ مەسەلەی خەلیفایەتی یەك لەم سێ ڕێیە بگرنەبەر، یا ڕێو شوێنی پێغەمبــەری خوا ﷺ یاڕێو شوێنی ئەبوبەکر یا ڕێو شــوێنی عومــەر، ئــەم کــارە پێشتر بەدەستی پێغەمبەری خوابووە، لە کەس‌وکاری پێغەمبەردا ﷺ هــی وا هــەبووە ئەگــەر پێــی بــسپێردرایە شــیاوی ئــەوەبوو، پاشــان ئەبوبەکر هات لە کەس‌وکاری ئــەویش کەســی واهــەبوو ئەگــەر پێــی بسپێردرایە شیاوی ئەوەبوو، کەچی عومەر لە دوای ئەبوبــەکر گرتیــە دەستو، پاشان لە کەس‌وکاری عومەردا کەسی واهەبوو ئەگــەر پێــی بسپێردرایە شیاوی ئەوکارەبوو، کەچی ئەو بۆ ئەم کارە چەند کەسێکی

(١) ســەیری پێـشوو، وە ســەیری (الــدرر المنثــوری ســیوطی ١١/٦) بکــە لەبارەیــەوە ووتویــەتی :( لــە عبــد بــن حمیــــد)وە لــە (النــسائي وابــن المنــذر وحـــاکم)ەوە گێڕاویەتی‌یەوە وە (حاکم) بە(صحیح)ی داناوە.

(٢) فتح الباري (٨/٥٧٧).

(٣) قـال لـە (الأمـالي) (٢/١٧٥) دا گێڕاویــەتی یــەوە لــە ڕێگــەی (ابـن شـبە) مێـژوونوس خاوەنی (تاریخ المدینة) بەسەنەدێکی (صحیح)ی (مرسل).

لەنێو مسوڵمانان‌دا دەستنیشان کرد، ئاگاداربن ئێوە دەتانەوێ بیکەنـە قەیسەریەت هەرکاتێ قەیسەرێك مرد یەکێکی تـر دەبێتـە قەیـسەر، مەڕوانی کوڕی حەکەم تووڕەبوو). [1]

پاشان کاتێ موعاویە حەجی کرد ڕۆیشتە مەدینەو باسی یەزیـدی کوڕی کردو دواتر لەگەڵ سەرکردەی نەیارەکانی وەك: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و عەبدەڕەحمانی کـوڕی ئەبوبـەکرو حوسەینی کوڕی عەلی‌و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ کۆبـووەو بیـانوو هۆکاری ئەم دیاری کردنەی گەڕاندەوە بۆ ئەوەی ئەترسێ لـەپاش خـۆی ئومەت بەبێ ئیمام بەجێبهێڵێ، [2] وە پێی ووتن: (تـەنها ئـەوەم دەوێ بە ناوی خەلافەوە پێشی بخەن، دواتـر ئێـوەن کـە لادەبـەن‌و دادەنـێن، کۆدەکەنەوەو دابەشی دەکەن، [*] ئەو لەم شتانەدا هیچ دەست وەردانێـك ناکات بەسەتاندا). [3]

موعاویـە ﷺ دەیویـست مەلیکیـەتی ڕاوێـژو -مەلەکیـەتی دەستوری- بێـت‌و جێنـشینایەتی بـۆ یەزیـد بێـت‌و دەسـەڵاتی (حـل

---

(١) الـذهبي لـە تـاريخ الإسـلام ل (١٤٨) دا لـە (ابـن أبـي خيثمـة)ی مێـژوو نوسـەوە بـە سەنەدێکی صحيح هێناویەتی.

(٢) سـەیری ابـن جريـر (٢٧٤/٣) سـاڵی (٥٦) ك بـە ئیـسـنادێکی صـحيح دەگـاتەوە (عبدالله بن عون).

(*) مەبەست دانان لادانی کەسەکانە بۆ ئەمیرایەتی‌و کۆکردنەوەو دابەشکردنی سامانی زەکات‌و هتد (وەرگێڕ).

(٣) تـاريخ خليفـه بـن خيـاط ل (٢١٦) ئەمـە بـە پاڵپـشتی یـەکانی تریـەوە(صـحيح)ە، سەیری تاريخ الذهبي ل (١٥١) بکە.

والعقد )یش بۆ ئەوانە بێت کە سەرکردەو سەروەری خەڵکن، یەزید هیچ فەرمانو کارێکیان هەڵنەوەشێنێتەوە بەبێ ئەوانیش تاك لایەنـە هـیچ کارێك نەبڕێنێتەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ووتی: (لە ڕاسـتیدا خەلیفـەکانی پـێش تۆش کوڕیان هەبووە، کوڕەکەی تۆ لە کوڕەکـانی ئـەوان چـاکتر نیـە، لەگەڵ ئەوەشدا بیرو بۆچونیان بەرامبەر کوڕەکانیان بەوشـێوەیە نـەبوە کە تۆ هەتە بۆ کوڕەکەت، ئەوەی بەباشیان دەزانی ئەوەیان هەڵدەبـژارد بۆ مسوڵمانان، تـۆ ئاگـادارم دەکـەیت لـەوەی یـەکڕیزی مـسوڵمانان بپارێزم، وە هـەوڵ بـدەم بـۆ چاکـسازیو نـەهێڵانی نـاکۆکی یـەکانی نێوانیان، منیش شتی واناکەم، من تەنها یەکێکم لە مـسوڵمانان جـا ئەگەر کۆك بوون لەسەر کارێك ئەوا منیش یەکێکم لەوان). [(١)]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فـەرمووی: (پاش تۆ ئوممەت لەسەرکێ کۆك بون منیش لەگـەڵیان دەبم، ، ئەگـەر خەڵکی پاش تۆ کۆبون لەسەر بەندەیەکی حەبەشی ئـەوە مـن دەچـمە نێو ئەو شتەی خەڵکی دەچنە نێـوی)، [(٢)] عەبـدوڵڵای کـوڕی زوبـەیر چووە لای موعاویەو پێی ووت: (ئەگەر تۆ لە میرایـەتی وەڕەس بـووی ئەوە وازی لێ بێنە باکوڕەکـەت بێـتو بەیعـەتی پێبـدەین، گـوێ بـۆ

(١) تـاریخ الخلیفـه بـن خیـاط ل (٢١٣ – ٢١٤)، بـه سـەنەدێکی (صـحیح لغیره) و تـاریخ الذهبي ل (١٤٩) وە سەیری پێشتر بکە.

(٢) ابن جرير الطبـري (٢٤٨/٣) ئیسنادەکەی (صحیح لغیره)ە.

کامتان بگرین؟! گوێڕایەڵی کامتان بین؟! بەخوا هیچ کات بەیعەت بە هەردوکتان نادەین). [1]

هەموویان چونە لای موعاویەو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریان کردە قسەکەر بەناوی خۆیانەوە، ئەویش بە موعاویەی ووت: (ئەی ئەمیری باوەڕداران، سەرپشکت دەکەین لە سێ ڕەفتاردا، هەرکامیان دەکەیت ئارەزووی خۆتە: ئەویش فەرمووی: (بیانخەرە ڕوو، خوا باوکت ببەخشێ! [*] فەرمووی ئەگەر دەتەوێ ئەوەبکە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردی، ئەگەر دەتەوێ ئەوەبکە کە ئەبوبەکر کردی، ئەو پاش پێغەمبەری خوا ﷺ باشترینی ئوممەت بوو، ئەگەر دەتەوێ ئەوەبکە کە ئەبوبەکر کردی، ئەویش لەپاش عومەر باشترینی ئوممەت بوو، فەرمووی: خوا باوکت ببەخشێ ئەوان چیان کرد؟ فەرمووی پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی کێشراو ئەم کارەی بە کەس نەسپاردوو کەسیشی نەکرد بە جێنشین، مسوڵمانان بە ئەبوبەکر ڕازی بوون، ئەگەر دەتەوێ ئەم کارە بەجێبهێڵە تاوەکو خوای گەورە قەزای خۆی دەکاو مسوڵمانانیش کەسێك بۆخۆیان هەڵدەبژێرن؟ ئەویش ووتی: ئەمڕۆ لەناو ئێوەدا کەسێکی وەکو ئەبوبەکر نیە، لەڕاستیدا ئەبوبەکر پیاوێك بوو خەڵکی ملی خۆی لەسەری دەدا بە بڕین، منیش دڵنیانیم لەوەی جیاوازیتان تێناکەوێت، فەرمووی: ڕاست دەکەی، بەخوا

---

(٣) تاريخ خليفة ل (٢١٤) بەبەڵگەکانی ترەوە (صحيح)ە بإسناد صحيح في الشواهد.

(*) لله أبوك واتایەکی نزیك لەو وەرگێڕانەی سەرەوە دەبەخشێ نەك پڕاوپڕی.

حەزناکەی بەسەر ئەم ئوممەتــەوە بــەجێمان بهێڵــی، دەی ئەوەبکــە کــە ئەبوبەکر کردی، فەرمووی: خوا لە باوکت خۆش بیـــت، ئەبوبەکـــــر چی کرد؟ فەرمووی ڕووی کردە پیاوێکی دوور لە قورەیش کەلــەباوانو بنەچەو کەسە نزیکەکانی نەبوو، کردی بــە جێنــشین، ئەگــەر دەتــەوێ بزانە کێ هەیە لە قورەیش کە لە بەنو عەبدوشەمس نەبێو پێی ڕازی بێت؟ فەرمووی: خوا باوکت ببەخشێ! سێهەمیان کامەیە؟ فەرمووی ئەوەبکە کە عومەر کردی، فەرمووی عومەر چی کرد؟ فەرمووی: ئەم کارەی کرد بەڕاوێژ لە نێوان شەش کەسی قورەیش، کوڕو براو خزمــی خــۆی تیانــەبوو، فــەرمووی: جگــە لەمانــە پێــشنیاری تــرت لایــە؟ فــەرمووی: نەخێــــر، فــەرمووی: ئــەی ئێــوە؟ فەرمــــویان ئێمــەش هەروەها). [1]

پاشان موعاویە چووە سەر دوانگەو ووتاری بۆ خــەڵکی داو ووتــی: (ئەمانە گەورەو سەروەرو باشــەکانی مــسوڵمانن، بێئــەوان تاکرەوانــە هیچ کارێك نابڕینەوە، هیچ کارێك بێ ڕاوێژی ئەوان ئەنجام نادەین)، [2] خــەڵکی وای بۆچــوون ئــەوان ڕازی بــوون، بۆیــە خــەڵکی مەدینــە بەیعەتیان دا بەیەزید؟!

---

(١) تـاریخ خلیفـة ل (٢١٦) ئیسنادەکەی (صـحیح)ە، بەپاڵپـشتەکانی تریـەوە، سـەیری تـاریخ الـذهبي ل (١٥١ -- ١٥٢) بکـە، (علـی القـالی) لـە الأمـالي (١٧٥/٢ – ١٧٦) دەیگێڕێتەوە لە ڕێگەی (ابن شبة)ی مێژوو نوس بە ئیسنادێکی صحیح.

(٢) تاریخ خلیفة ل (٢١٧) بە پاڵپشتو بەڵگەکانی ترەوە ئیسنادەکەی (صحیح)ە.

لەڕاستیدا کارەکە ڕوون‌و ئاشـکرابوو بـۆ ئـەو هاوەڵـە فەقیهانـە، ئەوانەی ڕەفزی ئـەوگوتارە سیاسـیەیان کـرد لەسـەر تـەئویل بنیـات نرابوو، ڕەفـزی ئـەوەیان کـرد بەیعـەتی موعاویـە بۆیەزیـد بپێـوریّ بەسپاردن (عهد)ی ئەبوبەکر بۆعومەر، هەستیان بـە مەترسـی ئـەم گوتارە کرد، بۆیە پایەندبوون بەبنەماکانی گوتـاری سیاسـی ڕاشـدی، ئەویش بریتیە لەوەی ئەم کارە بەدەسـتی ئوممەتـە بـە کـێ ڕازی بێـت هەڵیدەبژێریّ بۆ سەرکردایەتیکردنی، وە ئەم کـارە بـە ڕاوێـژی نێـوان مسوڵمانان خۆیانـە، وە ئـەوەی ئومەویـەکان هێناویانـە ڕێ‌وشـوێن و سونەتی هرقل‌و قەیسـەرە، نەك ڕێ‌و شوێن‌و سـونەتی پێغەمبـەری خوا ﷺ و ئەبوبەکرو عومەر، ئەوانەی ژیاننامـەیان بریتـی بـوو لـە نمونەیەکی پیادەکراوی بنەماکانی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو.

(إبن کثیر) فەرمویەتی: (کاتێك بەیعەت وەرگـیرا بـۆ یەزیـد لـە ژیانی باوکیدا، حوسەین یەکێك بـوو لەوانـەی بەیعـەتی نـەدا، ئـەوو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرو عەبـدوڵڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس). [1]

بەڕاستی ئەو هاوەڵە فەقیهانە هەستیان بە مەترسی هەڵوێـستەکە کردبوو، بە ناشەرعیان دەزانی بەیعەت بۆ (ولی عەهد) وەربگیریّ لـە ژیـانی ئیمـام دا، وە بەیعـەت پـاش کۆچـی دوایـی ئیمـام یـاخود

(١) ابن كثير (١٥٢/٨) لە بەسەرهاتی حوسەینی کوڕی عەلی‌و هۆکارەکانی دەرچونی.

لەکارخستنی وەردەگیرێتو ئەنجام دەدرێ، بەلاّم کاتێ ئەو لە ژیاندا بــێ ئەوە شتێکە نابێ بکرێت.

خەڵکی بەیعەتیان بە یەزیــددا لــە ژیــانی باوکیــدا ﷺ، ئــەو وای دەبینی کۆکردنەوەی خەڵکی لە دەوری یەك ئیمام، وە یــەك کەلیمــەیی ئوممەتو نەگەڕانەوە بۆ کوشتو کوشتارو ئاژاوەگێڕی گرنگترە لە هــەر شتێکی تر، ئەوەبو دەیفەرموو: (من ترسام لەدوای خۆم خەڵکی بەجێ بهێڵم وەکو مەڕو ماڵاتی ڕۆژی باراناوی کە شوانی نەبێ). [1]

ئەوەی لەبیر چوو ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ سورترو بە بەزەیی تر بوو لە ئەو بۆ ئوممەتەکەی، لەگــەڵ ئەوەشــدا وازی لـــێ‌هێنان تــاوەکو دوای خۆی کەسێك هەڵبژێرن کە پێی ڕازی بن، لەواز لێ هێنانەکەیدا بەرژەوەندی خۆیانی تێدابوو، ڕووداوەکانو ڕۆژانی دواتر ئەوەیان سەلماند ئــەوەی ئــەو لێــی دەترســا (ئــەو شــتەبوو کــە یەزیــد پــاش خــۆی ئارەزوومەندانە ئەنجامیدا، نەك ڕێو شوێنەکەی پێغەمبەری خوا ﷺو ئەبوبەکرو عومەر بەجێیان هێشتبوو، ئەوەبوو هەر کــە موعاویــە ﷺ کۆچی‌دوایی کرد یەکسەر سەر لەنوێ توندوتۆڵی‌و یەکریزی‌مسوڵمانان هەڵوەشایەوە، دەوڵەت لە سەردەمی یەزیددا بە شێوەیك شێوا کە شتی وا پێشتر ڕووی نەدابوو، خەڵکی عێراق لەگەڵ حوسەینی کوڕی عــەلی لە دژی ڕاپەڕین، خەڵکی مەککەش لەگەڵ عەبدوڵلاّی کوڕی زوبــەیرو

---

(١) ابن كثير (٨/ ٨٣).

خەڵکی مەدینە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەلەی غەسیلو خەڵکی نەجدیش لەگەڵ نەجدەی کوڕی عامر لەدژی ڕاوەستان.

پاش ئەوەی خەڵکی شام بەیعەتیان بـە یەزیـددا، یەزیـد نوێنــەری نارد بۆ لای ئەمیری مەدینەو داوای لێ کرد بەیعەت لەوانە وەرگرێ کە پێــشتر بەیعــەتیان نــەدابوو، ئــەمیری مەدینــەی ڕاســپارد بــۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەویش ووتی: (خەڵکی بەیعەتی دا منیش دەیدەم)، کابراش پێی ووت: (چی وات لێ دەکات بەیعەت نەدەیت؟ تۆ دەتەوێ خەڵکی ناکۆكو جیــاواز بــنو بجــەنگێن؟! عەبــدوڵڵای کــوڕی عومەر فەرمووی: پێم خۆش نیە بجەنگێنو ناکۆك بنو تیابچن، بــەڵام ئەگەر خەڵکی بەیعەتی داو کەسی تر نەمایەوە ئەوا بەیعت دەدەم).[1]

ئا لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بەیعــەتی نــەداو چــاوەڕێی ئەوەی کرد بزانێ خەڵکی لەسەرچی کۆك دەبن، چــونکە مــاف مــافی ئەوانە، کاتێك لە وولاتانەوە بەیعەت بە یەزید درا، ئــەویش بەیعــەتی داو عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیش بەیعەتی دا).[2]

سەبارەت بە حوسەینی کوڕی عەلی ئــەوەبوو بــە نهێنــی نوســراوی خەڵکی عێراقی بۆ هــات، داوایــان لێ کردبــوو کــە بێــت بــۆ لایــان، بەیعەتدانی خۆیانیان پێ‌گەیاندبوو، ئەویش لە مەککەوە چو بۆ لایان، کە پێشتر لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا لە مەدینەوە ڕایان کرد بۆ

(١) ابن جریر ٢٧٢/٣ ساڵی ٦٠ی کۆچی.

(٢) ابن جریر ٢٧٤/٣ – ٢٧٥ وسەیری تاریخ ابن کثیر ١٥٣/٨ – ١٥٤ بکە.

مـەککە،[1] یەزیدیش سوپایەکی بۆ ناردو جەنگان لەگەڵیداو لەساڵی ٦١ی کۆچی ﷺ شەهیدکراو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش لە مەککەدا مایەوەو بەیعەتی نـەدا بـە یەزیـدو بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە (جێنشینایەتی دەبێ بە ڕاوێژی نێوان خەڵکی بێ).[2]

بەهەمان شێوە خەڵکی مەدینە لە دژی یەزید ڕاپەڕینو بەیعەتیان هەڵوەشاندەوەو بەیعەتیان دا بە عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەڵەی غەسـیل، کە پیاوێکی بەڕێزو خاوەن فەزڵو خانـەدانێکی خواپەرسـت بـووە،[3] پێشتر بە نوێنەرایەتی چوو بۆلای یەزید، کاتێ حـاڵی یەزیـدی بینـی گەڕایـەوە مـەدینـەو بانگەشـەی لابردنـی کـردو خـەڵکی مـەدینـەش بەیعەتیان پێدا، بانگەشەی ئەمانیش بـۆ (ڕەزامەنـدێتیو ڕاوێـژ)[4] بوو، عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەلەش لە هاوەڵە بچوكو کەم تەمەنـەکان بووە،[5] لە جەنگی (الحرة)دا کوژرا، چەند هاوەڵێکی تریـشی لەگـەڵ کوژرا لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی عاصـمی ئەنـصاری[6] و عەبـدوڵڵای کوڕی سائیبی مــەککی قورئـان خـوێن،[7] مەعقـەلی کـوڕی سـنانی

(١) ابن جرير ٢٧٤/٣ – ٢٧٥، وە سەیری تاريخ ابن كثير ١٥٣/٨ – ١٥٤ بكة.
(٢) تاريخ خليفة ل ٢٥٨، ابن جرير ٣٥٩/٣.
(٣) تاريخ خليفة ل ٢٣٧، ابن جرير ٣٥٩/٣.
(٤) تاريخ خليفة ل ٢٣٧، تاريخ الذهبي ل ٢٤، ڕوداوەکانی ساڵی ٦٣ك .
(٥) تاريخ الذهبي ل ١٤٤
(٦) تاريخ الذهبي ل١٤٥ ئەمە گێڕەرەوەی فەرمودەی دەستنوێژە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە لە بوخاریو موسلم دا هاتووە.
(٧) تاريخ الذهبي ل ١٤٦.

ئەشــجەعی هەڵگـــــری بەیــداخی هۆزەکــەی خــۆی بــوو لەگــەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی ڕزگارکردنی مەکە، مەعقەلیش چــووبویە لای یەزید. کاتێ بارودۆخەکەی بینی گەڕایەوە مەدینەو دەســتی کــرد بــە بانگەشــەی دەرچــوون دژ بــە یەزیــدو ڕۆژی (الحــرة)ش هــەڵگری بەیداخی کۆچکەران بوو.[1]

(إبن کثیر) دەفەرموێ: (لەم ســاڵەدا خــەڵکێکی زۆری بــەناوبانگو خانەدان لە هاوەڵانو جگە لەوانیش کۆچــی دواییــان کــرد لــە ڕوداوی (الحرة)دا، لەو هاوەڵە بەناوبانگانە: عەبدوڵلای کوڕی حەنزەڵە ئەمیری مەدینە لەڕوداوی (الحرة)دا، وە مەعقەلی کوڕی ســنانو عوبەیــدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصم وەمەسروقی ئەجدەع).[2]

لە مالیکی کوڕی ئەنەســەوە باســکراوە کەوتویــەتی: (لــەڕووداوی (الحرة)دا (حەوسەد لە هەڵگرانی قورئان[*] کوژران)،[3] پاشان کاتــێ سوپای یەزید ڕووی کــردە مەککــە بــۆ کوشــتاری عەبــدوڵلای کــوڕی زوبەیرو ئەوانــەی لەگەڵیــدابوون، نــەیانتوانی بــچنە نێــو مەککــەوە، عەبدوڵلاو هاوڕێکانی شکستیان پێهێنان، لەم نێوەندەدا یەزید مردو

(١) تاريخ الذهبي ل (٢٥١)، سەیری تاريخ خليفة ل (٢٣٧) بکە

(٢) البداية والنهاية (٢٢٧/٨)، خەلیفە کوڕی خەیات لە ل (٢٠٤ – ٢٥١)ی مێژووەکەیدا ناوی ئەو کوڕو نەوانەی یاریدەدەرو کۆچکــەرانی هێناوە کە لە کــاتی دەرچونیان دژ بە یەزید کوژراون.

(*) مەبەستی ئەوانەیە قورئانیان لەبەر بووە، – وەرگێڕ – ).

(٣) الجامع ی (ابن أبی زید القیروانی ل (١٨٣) و تاريخ الذهبي ل (٣٠).

فەرمانڕەوایەتیەکەی بە سەقامگیری نەما، هەروەها پاش کوژرانی حوسەینیش، لە نەجددا (نجدە بن عامر الحنفي) خەڵکی یەمامە ڕاپەڕیو یەزیدی لەکار خست).[1]

تەواوی کاروباری ئوممەت شێوا بەهۆی ئەو گوتارە سیاسیە نوێیەوە کە مافی هەڵبژاردنی ئیمامی لە ئوممەت سەندەوە، هەر بۆیە بانگەوازی خەڵکی مەدینە بۆ (ڕەزامەندیو ڕاوێژ) بوو، بە هەمان شێوە بانگەوازی خەڵکی مەککەش لەگەل کوڕی زوبەیردا بۆ (ڕەزامەندیو ڕاوێژ) بووە، چونکە ئەم دووانە بریتین لەو دوو بنەما سەرەکی یەی سستمی سیاسی یان لەسەر بنیات دەنرێ، لە ئیسلام دا، هەروەك لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین دا زۆر بەڕوونی دەردەکەوێ، ڕاوێژیش بەو شێوەیەی هاوەڵان تێی گەیشتوون دوو مەسەلە دەگەیەنێ: مافی ئوممەت لە هەڵبژاردنی ئیمام دا، هەروەك عومەر فەرمویەتی: (ئیمارەت بە ڕاوێژە)و ڕاوێژ فەرمانڕەوایەتی پشتاو پشتی نیە هەرچەندە دادگەریش بێت، وە مافی بەشداریکردنی ئوممەتە لەگەڵ ئیمام دا لە بیرو بۆچونەکانی دا، وە بەبێ ئومەت هیچ کارێك یەکلایی نەکرێتەوە، ڕاوێژ لەگەڵ زۆرداریو ناچارکردنی سیاسیدا بونی نیە، ئەم دوو مافە سەر بە دروشمی (ڕەزامەندیو ڕاوێژ)ە، خەڵکی مەدینەو مەککەو عێراقو نەجد لە پێناوی ئەم دوبنەمایەدا جەنگان بەهۆی

---

(١) (ابن كثير (٢١٨/٨) وە سەیری ابن جرير الطبري (٣٥٠/٣) لە ڕوداوەکانی ساڵی (٦٢) ك بکە.

ئەو پلەوشوێنەی لەئیسلام دا هەیانە، چونکە ئەم دووانە لـە ئەسـڵو فەریزەو عەزیمەکانی ئیسلامەو گەرەکە بەرپابکرێو بەرگری لێ بکرێ، زانای سەرمەشق (ئەبوحازم سەلمەی کوڕی دینار) بە سولەیمانی کـوڕی عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوانی فەرموو: (لەڕاستیدا باوو باپیرانت ئـەم کاروبـــــارەیان زەوت کـرد)، واتـە (جێنـشینایەتی)و بـە زۆری شـیر وەریـــانگرت بێئـــەوەی ڕاوێـــژو کۆبونـــەوەو ڕەزامەنـــدی خـــەڵکی لەسەربێ)[1].

هەموو ئەمانە پێش ئەو پاشەکشە ترسناکە بووە کـە لـە چـەمکی ڕاوێژدا بەدی هات لەقۆناغی دووەم دا، ئەوەبوو واتای ڕاوێـژ دابڕدابـڕو کەلەوپاچە کرا، ڕاوێژ کورت کرایەوە بۆبەشداری کردنـی خـەڵکی لـە ڕاو بیروبۆچون لەگەڵ ئیمام دا؟ پاشـان کـورتو کـەم کرایـەوە تـابووە ئەوەی بریتی بێ لە ڕاوێژپێکردنی ئیمام بە ئەهلی حەلل‌و عەقـد بـێ ئەوە پابەندبێ پێیەوە؟ پاشان بۆجـاری سـێیەم کـورت کرایـەوەو وای لێهات ڕاوێژ بریتی بێ لە کارێکی ناواجـب، بـەڵکو لـە شـتە بـاش‌و موستەحەبەکان بێ، ئەگەر ویستی بیکاو ئەگـەرنا وازی لـێ بێنـێ؟ ناشکرێ ئەگەر بارەکە وابێو ئەمە حوکمی ڕاوێژ بـێ خـەڵکی تـەنها لەبەر نەکردنی کارێکی موستەحەب لەگەڵ ئیمام دا بجەنگێن؟

ناکرێ لەم چـەمکە بگـەین مەگـەر لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ڕوداوە

---

(١) حلية الأولياء (٣/٢٣٥) سەیری پەراوێزی إحياء علوم الدين (٢/١٣٠) بکە.

سیاسیانەی لە سەردەمی هاوەڵاندا ڕویانداوەو ئـەو هەڵوێـستانەی لـە بەرامبەر بەیعەت دان بەیەزیدەوە هەیانبوو، ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس مەرجیان ئەوەبوو هەموو ئوممـەت بێنە ناو ئەم کارەوەو ڕازی بن بەوەی یەزید خەلیفـەیان بێـت، چـونکە ئوممەت خاوەنی مافەکەیەو ئەوان بەشوێنیا دێن، لـە کاتێـکدا دیـدو بۆچونی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و عەبـدوڕەحمانی کـوڕی ئەبوبـەکرو حوسەین ئەوەبوو کە ناکرێ بچیتە نێو بەیعەتێکەوە تـا ئـەو ڕەگـەزی ناچارکردنی ماددی یامەعنەویە لە ئارادا بێت بـا هـەموو خـەڵکیش بەیعەت بدەن، عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر لە سەردەمی موعاویەدا کۆچی دوایی کرد، هەر ئەویش پێی وتبوو: (یا دەبێ لەم کارەدا ڕاوێـژ بگێڕیتەوە نێو مسوڵمانان، یا ئەوەتانێ بە کۆڕپەیی لە باری دەبەین)، کە ئەمەش تەئکید کردنەوەیە لەسەر سوربونی لەسەر ئەوەی بجـەنگێ لە پێناوی بەرگریکردن لە بنەمای ڕاوێـژ، بـەلای ئـەوەوە گوێڕایـەڵی دروست نیە بۆ ئیمام ئەگەر مافی ئوممەتی زەوت کرد، ئەم بۆچونەشـی لــە لایــەن حوســەینی کــوڕی عــەلیو عەبـدوڵڵای کـوڕی زوبـەیرو عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەلەی کوڕی غەسیلەوە پیـادەکرا بـەوەی لەگـەڵ یەزیدا جەنگانو لە دژی ڕاپەڕین، لەژێر دروشمـی ڕەزامەنـدیو ڕاوێـژ (الرضا والشوری)دا، لەمەشدا بەسەدان زانایان لەگەڵ بوو لـە کـوڕو نەوەی هاوەڵانو تابعین.

هــەموو ئەمانــە ڕوویــان نــەدەدا ئەگــەر بابــەتی ڕاوێـژ ئەوەنــدە

مەترسیدارو گرنگ نەبوایەو بنچینەیەك نەبوایە لە بنچینەكانی ئیسلام‌و شایستەی ئەو گرنگی دانە نەبوایە، لە هەمان كاتدا دەوڵەتیش تووشی ئەو شێواویە نەدەبوو كە لە پاش بیست ساڵ لە سەقامگیری‌و كۆك بوون لەسەر موعاویە توشی هات، ئەگەر ئەم گۆڕانە مەترسیدارە لە گوتاری سیاسی ڕوی نەدایەو ڕێ‌و شوێن‌و سوننەتی هیرقل‌و قەیسەر لەنێو مسوڵمانانندا بەدەرنەكەوتایە، هەر كە قەیسەرێك مرد قەیسەرێكی تر فەرمان ڕەوایی دەكرد بە دوایدا، موعاویە ﷺ دەیویست خەلافەت بكاتە پادشاییەكی دەستوری: ناوی خەلافەتەكە لە كەس‌وكاری ئەودا بێت‌و حەلل‌و عەقدیش بۆ ئوممەت بێت، خەلیفە دەست نەخاتە كاروبارێكەوە كە ئەوان بڕیاری لەسەر دەدەن، بەبێ ئەوان هیچ كارێك نەبڕێتەوە، وەك سووربونێك لەسەر یەكێتی ئوممەت‌و گومانیشی وابوو ئەم پەیڕەوكردنە باشترە بۆ ئوممەت لەوەی بەبێ سپاردن‌و ئیمام بەجێیان بهێڵێ؟!

بەڵام سوننەت هەمووی هەرچاكەو خێردارە، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ ئوممەتی واز لێهێنا تاوەكو كەسێك هەڵبژێرێ كە خۆی پێی ڕازییە (ذهبي) مێژونووس سەبارەت بە موعاویە ﷺ وتویەتی: (خۆزگایە ئەوكارەی نەسپاردایە بە یەزیدی كوڕی‌و كارەكەی بۆ ئوممەت خۆی بەجێ بهێڵایە).[1]

(١) سير الأعلام ١٥٨/٣.

موعاویه ﷺ خۆی جەنگا لەگەڵ خەلیفەی ڕاشد عەلی کوڕی ئـەبو تالیب ﷺ دا لەسەر بنەمای ڕاوێژ، وەلە گوێڕایەڵی دەرچوو بـەبیانوی گێڕانەوەی کارەکە بۆ ئەوەی بکرێتە ڕاوێژ لە نێوان ئوممەت دا، تـاوەکو ئەوکەسە هەڵبژێرن کە ئوممەت کۆدەبنــەوە لەســەری و هەڵیدەبـژێرن، هەروەك (الزهري) دەڵێ: (کاتــێ موعاویــە هــەرەس‌و شکــستی ڕۆژی ووشترەکە (الجمل)و سـەرکەوتنی عــەلی پێگەیـشت، خـەڵکی شـامی بانگهێشت کرد بۆئەوەی لە پێناوی ڕاوێژ (الشوری)و داخوازی خـوێنی عوسماندا هاوسەنگەری بن‌و لەگەڵی بجەنگێن، ئەوانیش لەسەر ئەمــە بەیعەتیان پێیدا وەك ئەمیرێك نەك وەك خەلیفە). [1]

لەڕاستیدا بنەمای ڕاوێژ پلەوپایەو گرنگییەکی وای هەبوو، تا ئـەو ڕادەیەی هاوەڵان ﷺ بۆ بەرگریکردن‌و پاراستنی،شیرەکانیان هەڵکێـشا، (ڕاوێژو ڕەزامەندی)ش جگە لە ئـازادی سیاســی بەچـەمکە فـراوان‌و گشتگیرەکەی، شتێکی تر نیە.

هەربۆیە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر – پێش کۆچی دوایــی یەزیــد – بەبێ ئەهلی حــەللو عەقــدو ســەرکردەکانی خــەڵکی مەککــە هــیچ کارێکی نەدەبڕیەوە، لە تەواوی کاروبارەکانیانــدا ڕاوێـژی پــێدەکردن‌و بەبێ ئەوان هیچ شتێکی یەکلا نەدەکردەوە، دروشمی (فەرمان ڕەوایــی‌و حوکم تەنها بۆ خوایە (لاحکم إلا لله)ی بەرزکردەوە، لە مـەککە حەجی

(١) سير الأعلام ٣/ ١٤٠.

به خەڵکی دەکردو نوێژی جومعەی بۆ دەکردن بەبێ ئـەوەی دەســەڵاتی ئەمارەتو خەلافەتی تێدا بێت، پاش ئەوەی کاربەدەستەکانی یەزیـدی لە مەککە وەدەرنا.[1]

هەموو ئەمانە تەئکیدن لەسەر گرنگـیو پـڕ بایـەخێتی بنـەمای ڕاوێژو ڕەزامەندی، چونکە نەمانی ئەم دوو بنەمایە سـەری کێـشا بـۆ ئەوەی بارەکە ئاڵۆزو ناجێگیر بێت هەر ئوممەت ڕێك نەکەونو ڕێك نەبن لەسەر یەزید کە تەنها چوارساڵ فەرمان ڕەوایەتی کرد، ئەویش پڕبـوو لە ئاژاوەو جەنگی ناوخۆیی، لە پاش کۆچی دوایی یەزید سـاڵی ٦٤ك عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادی میری بەسرە ووتاریداو سەرخۆشی یەزیـدی پێڕاگەیاندنو پێی ووتن: (بۆخۆتان هەڵبژێرن).[2]

موعاویەی کوڕی یەزیدیش لە شـامدا هەسـتابویەوەو ووتـاری بـۆ دابون پاش ئەوەی بەیعەتیان پێی دابوو کە خەلیفەبێ لـەو بۆنەیـەدا وتی: (ئەم کارەم بۆخۆتان بەجێهێڵا، کـێ باشـە بۆتـان ئـەوە بکەنـە سەرپەرشتیارو کاربەدەستی خۆتان).[3]

خەڵکی لە مەککەدا بەیعەتی خەلیفایەتیان بە عەبدوڵڵای کـوڕی

---

(١) تاریخ الإسلام ٣/٤٤٤ و سير الأعلام النبلاء ٣/٢٧٣ وتهذيب تاريخ دمشق ٧/٤١٤، ئەو ئەم دەبرینەی هێناوە (ئەو لە هەموو کاروبارەکانیدا ڕاوێژی پێدەکردن، نیشانی دەدان کە ئەم کارە بەڕاوێژە لەنێوانیاندا، بەبێ ئەوان هیچ کارێکی نەدەبڕیەوە)

(٢) تاريخ ابن خياط ل ٢٥٨.

(٣) تاريخ ابن كثير ٨/ ٢٤١.

زوبێردا، خەڵکی هەموو شارو وولاتانیش بەیعەتیان پێ‌ی دا جگـە لـە خەڵکی دیمەشق، بە خەلیفایەتی مایەوە تا ئەو کاتەی لە سـاڵی ٧٣ك داکوژرا پاش ئەوەی دەساڵ حەجی بە خەڵکی کرد، عەبدوڵلا، ڕەوشت‌و ڕەفتارو جوان بوو، کاروباری بە باشی بەڕێوە بـردووە، دادگـەرو بـەداد بووە لەڕووی ژیاننامەو ڕەفتارەوە زیاتر لە خەلیفەکانی تـر هاوشـێوەی چوار خەلیفە ڕاشدییەکان بووە، وە دواهەمینی ئەو خەلیفانـەبووە کـە ئوممەت بە ڕاوێژو ڕەزامەندی هەڵیبژاردوون دوای ئـەم چـاخێکی نـوێ دەست پێ‌دەکات کـە سـەردەمی عەبدولمـەلیکی کـوڕی مەڕوانـە کـە یەکەم خەلیفەیە بەهێزی شـیرو جـەنگ خەلافـەتی بۆخـۆی ڕاکێـشاو دەستی بەسەرداگرت، ئەمەش پاشـتر گـەورەترین شـوێنەواری دەبێـت لەسەر فیقهی سیاسی، جا ئەگەر موعاویە پـاش ئاشـتەوایی کردنـی لەگەڵ حوسەینی کوڕی عەلی‌و کۆبونەوەی ڕەزامەندیانەی ئوممـەت لـە ساڵی (الجماعة)دا بوبێتە خەلیفە، وە ئەگەر یەزیـدی کـوڕی لەلایـەن خەڵکی شارو وولاتانەوە لەژیانی باوکیدا وەپاشان دوای باوکی بەیعەتی پێ‌درابێ، وە ئەگەر عەبدوڵلای کوڕی زوبـەیر لـەپاش وەفـاتی یەزیـد کەلەمەککـەدا بـوو لەلایـەن گـشتینەی وولاتانـەوە بەڕەزامەنـدی‌و هەڵبژاردن بەیعەتی پێ درابێ، ئەوا عەبدولمەلیك یەکەم خەلیفەیە کە دەست بەسەر خەلیفایەتیدا دەگرێ‌و داگیری دەکاو خەڵکی بەناچـاری‌و ناحەزی‌یەوە بەیعەتی پێ‌دەدەن پاش ئەوەی عەبدوڵلای کوڕی زوبـەیری کوشـت، بەمـەش چـاخ‌و سـەردەمی خەلیفـەی خۆسـەپێنەر (الخليفـة

المتغلب) دەست پێدەكات، كە پێشتر ئوممەت ئاشـنای بـارو ڕەوشـێكی لەوشێوە نەبووە.

هاوەڵان ﷺ كۆبوون لەسەر ئـەوەی ئیمامـەت تـەنها بەگرێبەنـدی بەیعەت بەدی دێت پاش ڕاوێژو ڕەزامەندی ئوممـەت، هـەروەها دانـانی جێنشینیان بەدروست دەبینی بۆ ئەو كەسەی ئیمام دەیپاڵێوێو هـەڵی دەبژێرێ بەمەرجی ڕاوێژو ڕەزامەندی ئوممەت، وە بەو مەرجەی لـەدوای كۆچی دوایی ئیمامی ئوممـەت بـێ زۆرلێكـردن، گرێبەسـتی بەیعـەتی پێڕەوا ببینێو بەیعەتی پێبدا.

هەروەها كۆش بوون لەسەرئەوەی دروست نیە، كاری جێنـشینایەتی بە پشتاوپشتی بێ یاخود بـەهێزو زۆرداری دەسـتی بەسـەردا بگـیرێو وەربگیرێت، ئەگەر بەم شێوەیە بەدەسـت خـرا ئـەوا بـە سـتەم (ظلـم) دادەنرێ كە لە شەرعدا حەرامە.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: (جیاوازی نیە لەنێوان هیچ كەس لەئەهلی ئیسلام لەوەدا كە دروست نیە ئەم كارە بە پشتاوپشت بێ).(١)

بـەڵام ئـەمری واقـع وورده وورده دەسـتی كـرد بەخۆسـەپاندن، وای لێهات هەندێ لە فەقیهەكانیش – بە حوكمی ناچاری دەسـتیان كـرد بـە تـەئویلكردنی دەقـەكانی شـەرعیەتدان – بـە پـشتاو پـشتی و خۆسەپاندن، تاوای لێهات ئەم دوو شێوەیە بە تێپـەڕینی كـات بوونـە

(١) الفصل (٤/١٦٧).

ئەو دوو ئەسڵەی لەسەر زەمینەی واقع پیادە دەکران، جگە لەم دوانەش بیردۆزەن‌و هیچ بوارێکیان نیــە لــە پەیکــەڵکردنی کرداریــدا؟! وە وای لێهات ڕێ‌و شوێنی هرقــل‌و قەیــسەر بوونــە جێگــرەوەی ڕێ‌و شــوێنی ئەبوبەکرو عومەر ﷺ؟!!

سودەیفی کوڕی مەیمونی ئــەدیب، گوتاربێــژی شۆڕشــگێڕی دژ بــە ئەمەویەکان، باس لەم پاشەکشێیە دەکاو بە جــوانی دەری دەبــڕێ لــەو وتەیەیدا کە دەڵێ: (خوایە گیان دەستکەوتەکانمان پاش ئەوەی دابــەش دەکران قۆرخ کراون، ئەمیرایەتیمان بووەتە ســەپاندن، دوای ئــەوەی بــە ڕاوێژ بوو، سپاردن‌و عەهدمان بووەتە میرات‌و پشتاوپشتی پاش ئەوەی بەویست‌و هەڵبژاردن بوو...)[1]

ماوەردی - قازی قازی یەکان لە دەوڵەتی عەبباسی دا- ووتویــەتی: (بەش: سەبارەت بە دامەزرانی ئیمامەت بە سپاردنی پێش خۆی، ئەوە لەو شتانەیە کە کۆڕا (إجماع) لەسەر دروستێتی هەیــە، لــەدوو ڕووەوە ڕێکەوتن لەسەر دروستی‌و تەواوێتی هەیە کە بە هۆی ئەم دوو خاڵەوە مسوڵمانان کاریان پێی کــردووەو ئینکاریــان نــەکردووە، یەکــەمیان: ئەبوبــەکر ﷺ ئــەوکارەی ســپارد بــە عومــەر ﷺ ، مــسوڵمانانیش ئیمامەتی ئەویان بەو سپاردنەی ئەو سەلماند.

دووەم: عومەر ﷺ ئەوکارەی سپارد بە ئەهلی ڕاوێژ، (جماعە)ش بە

(١) سەیری (طبقات الشعراء)ی ابن المتز: ل (٣٧ – ٣٨) بکە.

پەسەندیان زانی بچنە ناو ئەوکارەوە، ئەوانیش خانەدان‌و پیاو ماقولاّتی سەردەمەکەبوون، لەبەر باوەڕبونیان بەوەی دروستە ئەوکارە بەو شێوەیە ئەنجام درێ، هاوەلاّنی تریش هاتنە دەرەوەی ئەم پالاّوتن‌و دەست نیشان کردنەوە، (*) عەلی بە عەبباسی فەرموو ﷺ (کاتێ کە عەبباس سەرزەنشتی کرد لەسەرئەوەی چوبویە ناو ڕاوێژەکەوە): ئەوە کارێکی گەورەی ئیسلام بوو، بەخۆم ڕەوا نەبینی لێی دەرچم، بەم شێوەیە سپاردن (عهد) بۆ جێنشینایەتی بووبە (إجماع)ێك لە گرێبەستی ئیمامەت دا، جا ئەگەر ئیمام ویستی جێنشینایەتی بسپێرێ ئەوا پێویستە هەوڵێکی زۆربدا بۆ دۆزینەوەی ئەوکەسەی شیاوترە بۆی‌و بە زۆرترین مەرجەکانی هەڵدەسێ‌و تیایدا بەدی، جا کاتێك ئیجتیهادەکەی کەسێکی بۆ دیاری کرد دەبێ سەیرکرێ، ئەگەر کوڕ یا باوك نەبوو دروستە خۆی گرێبەستی بەیعەتی پێبداو کاروباری جێنشینایەتی پێڕاسپێرێ، هەرچەندە ڕاوێژیشی نەکردبێ بەو کەسانەی ئەهلی هەڵبژاردن‌و (اختیار)ن، بەلاّم جیاوازیان هەیە لەوەدا: کە ئایا ڕەزامەندی ئەوان مەرجە بۆ تەواوێتی دامەزراندنی بەیعەتەکەی یاخود نا؟ هەندێ لە زانایانی بەسرە وای بۆچوون کە ڕەزامەندی ئەهلی ئیختیار بۆ بەیعەتەکەی ئەو مەرجە بۆ ئەوەی بۆ ئوممەت ببێتە شتێکی پێویست‌و پابەند، چونکە مافێکە پەیوەندی

(*) لەبەرئەوەی تەنها شەش کەس بوئەو پۆستە پالێورابوون، بەمەش هاوەلاّنی تر کەوتنە دەرەوەی پالاّوتنەکەوە، هاوەلاّنیش بەمە ڕازی بوون – و –

پێیانەوە هەیە، ئەگەر ڕەزامەندی ئەهلی ئیختیـاری تێدانـەبو نابێـت پابەندبین پێیەوە.

ڕای دروست ئەوەیـە بەیعەتەکـەی دادەمـەزرێ، ڕەزامەنـدی ئـەوان موعتەبەر نیـە، چـونکە بەیعـەتی عومـەر ﷺ نەوەسـتابوو لەسـەر ڕەزامەندی هـاوەڵان، وە لەبەرئـەوەی ئیمـام خـۆی لـە هـەموو کـەس شـیاوترەو باشـتر لێـی دەزانـێ، هەربۆیـە هەڵبـژاردنی ئـەو گونجـاوو لەبارترەو قسەی زیاتر دەڕوا، بەڵام ئەگەر (ولی عهد)ەکە کوڕ یا بـاوك بوو ئەوا سەبارەت بە حوکمی گرێدانی بەیعەت بـە تـەنها لـە لایـەن ئیمامەوە بۆی سێ ڕێبـاز هەیـە، یەکـەمیان: دروسـت نیـە بەتـەنها گرێبەستی بەیعەت ئەنجام بدرێ بۆکوڕ یا باوك بەبێ ڕاوێژ بـە ئـەهل ئیختیار، جا ئەگەر ئەوان بە شایستەیان بینی بۆ ئـەوکارە ئـەو کاتـە دروستە گرێبەستی بەیعەتی بۆ ئەنجام بـدرێ، چـونکە ئـەوە بـۆ ئـەو ئەستۆ پاکیەو جێگـەی شـاهێدی بـۆدان دەگرێتـەوە، گرتنـە دەسـتی کاروباری ئوممەتیش لە لایـەن ئـەوەوە هـەمان ڕێو شـوێنو (حکـم)ی هەیە، دروستیش نیە کوڕ بۆ باوكو باوك بۆ کـوڕ شـاهێدی بـدا لـەم کارەدا یان یەکێکیان بۆ ئەوی تریان لەبەر ئەو تۆمەتەی لـەم کـارەدا هەیەو لە سروشتی مرۆڤ دا ئەو حەزە هەیە کە یەکێکیان بـۆ ئـەوی تریان دەیەوێ.

ڕێبازی دووەم: دروستە بە تەنها بۆ کوڕ یـا بـاوك ئـەوگرێ بەسـتە ئەنجام بدرێ، چونکە ئـەمیری ئوممـەت قـسە ڕۆیـشتووەو کاروفرمـانی

ڕادەپەڕێنرێ، بۆ ئەوان‌و خۆشیان، بەمەش حوکمی پلـەو پایەکـەی زاڵ دەبێ بەسەر حوکمی نەسەب‌و خزمایەتیدا، لێرەوە ڕێدەگیرێ لەوەی لـە ئەمانەتیدا تۆمەتبار بکرێ‌و ڕێگەبدرێ نەیاریێتی بکرێ، لەم کارەشـدا سپاردنی بەکوڕ یاباوکی وەکو ئەوە وایە بیسپێرێتە کەسانی تـر بـەدەر لە کوڕو باوکی، ئایا ڕەزامەندی ئەهلی ئیختیار پاش دروستی عەهدو سپاردنەکە موعتەبەرە بۆئەوەی ئوممەت پێوەی پابەند بێ یان نا؟ ئـەوا بەو شێوەیەیە کەپێشتر خـستمانەڕوو لـەدوو ڕووەوە)،[1] مـاوەردی بـۆ گەیشتن بەم حوکمە تەئویل کراوە هەموو ئەو پیـشەکیانە دەهێنێتـەوە کە خۆی لەخۆیدا تەئویلی ڕووە ڕاست‌و دروستەکەیە، لەوانەش: -

١/ دروستی دانانی جێنـشین‌و پێ‌سپاردن بـە پێـی ئـەو کردەوەیـەی ئەبوبەکر لەگەڵ عومەردا بە کۆی هاوەڵان کردی.

٢/ بەهۆی گرێبەستی (استخلاف)و (عهد) بەبێ ڕاوێژو ڕەزامەنـدی مسوڵمانان کەسێك دەبێتە ئیمام، ئەگەر کەسەکە بـاوك یـاکوڕی ئیمامی ئەوکاتە نەبێت، بە بیـانوی ئـەوەی ئەبوبـەکر عومـەری هەڵبژارد، هەڵبژاردنی عومەر لەلایـەن ئەبوبـەکرەوە نەوەسـتابوو لەسەر ڕەزامەندی هاوەڵان؟!!

ماوەردی هۆکاری بەهێزی ئەم بۆچونە دەگێڕێتەوە بۆئەوەی کـە: (ئیمام خۆی لەهەمووکەس شیاوتردو باشتر لێی دەزانێ، هەربۆیـە

---

(١) الأحكام السلطانية، ل (١١).

هەڵبژاردنی ئـەو گونجـاوو لەبـا رترەو قـسەی زیـاتر دەڕوا)، (ڕای دروسـت ئەوەیـە کـە بەیعەتەکـەی دامـەزراوەو ڕازی بـوون پێـی موعتەبەر نیە)؟!!

٣/ جا ئەگەر ئەوکەسەی ئەم کارەی پێدەسپێرێ باوك یـا کـوڕی ئـەو کەسـەبوو ئـەوا ڕای بـەهێز -لای مـاوەردی- بـە هـەمان شـێوە دروستییەتی، بە قیاس کـردن لەسـەر کـەس‌و خـەڵکانی تـر، وە لەبەرئەوەی ئیمام (ئەمیری ئومەتەو قسە ڕۆیشتووەو کارو فرمانی ڕادەپەڕێنری بۆ ئەوان‌و خۆشیان، بەمـەش حـوکمی پلەوپایەکـەی زاڵ دەبی بەسەر حوکمی نەسەب‌و خزمایەتیدا، لێرەوە ڕێ دەگـیرێ لەوەی لـە ئەمانەتیـدا تۆمـەتبار بکـرێ‌و ڕێگەبـدرێ نـەیارێتی بکـرێ) ؟!!

بەم شێوەیە تەئویل دەکرێتە هۆکارێك بۆپاسـاودانی ئـەمری واقـع‌و پەردەپۆش کردنی شەرعیەتەکەی؟ لەڕاستیدا مـاوەردی زیـاتر دەربـڕی واقعی چـاخەکەی خۆیـەتی وەك ئـەوەی دەربـڕی بنـەماکانی گوتـاری سیاسی ئیسلامی بێت، ئەم جیاوازییـەش زۆر بەئاشـکرایی دیـارە لـە نێوان تەئویل‌و تەفسیرکردنی ئەو بۆ ڕوداوی سپاردنەکەی ئەبوبەکر بـۆ عومەرو تێگەیشتنی دروستانەی هاوەڵان بۆ ئەم ڕوداوە کە ڕێك‌و سـازە بە ڕێنمایی یەکانی ئایینی دابەزێنراو.

لەڕاستیدا ماوەردی —لە کاتێکدا کە تەعبیر لە فیقهـی سـەردەمی عەبباسی دەکا- بێ‌ئەوەی هەست بکـا دەقـەکان وەگـەڕدەخاو بـەکاری

دەهێنێ بۆ خزمـــەتی واقـــع، بـــە پێـــچەوانەی هاوەڵاتـــەوە کـــە واقعیـــان دارِشتەوە -یا ویستیان دایرِێژنـــەوە- بەوپێیـــەی لەدەقەکانـــدا هـــاتووە، واتە وای لێهات واقع چەمکەکانی خـــۆی شـــۆرِکردەوەو دەیـــسەلماند بـــە شێوەیەك پێویست بـــێ لـــە پێناویـــدا تـــەئویلی دەقـــەکانی شـــەریعەت بکرێ، لە پێناوی شەرعیەت پێبەخشینی نەك بە پێچەوانەوە؟!!

وای لێهات ئەوەی لـــە نیـــوەی ســـەدەی یەکـــەمی کۆچـــیدا پەســـەند نەدەکراو رِەفز بوو بە بیـــانوی ئـــەوەی رێو شـــوێنو ســـونەتی هیرقـــلو قەیسەرە، کەچـــی لەســـەدەی ســـێهەم دا بـــوو بـــە شـــتێکی دروســـتو مەشروع، بە پێوانو قیاس لەسەر رِوداوی بە جێنشینکردنی ئەبوبەکرو عومەر، ئەمە لەگەڵ بـــونی کـــۆرِای ئـــەهلی ئیـــسلام — بـــە تایبـــەتی سوننە- لەسەر ئەوەی دروست نیە ئەم کارە بەپشتاوپشتی بێت[1]؟!!

لە کاتێکدا ئەگەر بیرۆکەی بـــە جێنـــشینایەتی کـــردن ســـەنەدێکی شەرعی تەئویل کراوی هەبوبێ بۆئەوەی رِێگەیەکی دروستو مەشـــروع تاوەکو ئیمامەت بەپشتاوپشتی بۆ کورِەکان بەجێ بمێنـــێ، بـــە بیـــانوی دروستی پێسپاردن (العهد) بۆ ئەوان، وەکو بۆجگە لەوانیش دروستە، ئەوا بیرۆکەی دەست بەســـەراگرتنی زۆردارانـــەش پـــاش عەبدولمـــەلیکی کورِی مەرِوان رِێی خۆی بینیـــەوەو بـــەدیهات تـــاوەکو ببێتـــە رِێگـــەی سێهەم -لای زۆرێـــك لـــە فەقیهـــەکان- کـــە بـــە هۆیـــەوە گرێبەنـــدی ئیمامـــەت دادەمـــەزرێ، بـــەڵام ئـــەم رِێگەیـــە لـــەرِووی زەرورەتـــەوە بـــە

(١) سەیری (الفصل) ی ابن حزم) (١٦٧/٤) بکە.

دروستیان بینیوه، ئەگینا کۆك بوون لەسەر حەرامێتییەکەی، ڕەوایەتی پــێدانی تــەنها لــە ڕووی ڕەچــاوکردنی بەرژەوەندییــەکانی ئوممــەتو پاراستنی یەك ڕیزییەکەی بووە؟!

هەربۆیــە ئیمــامی نــەوەوی -٦٧٦ ك ك- فەرمویــەتی: (ڕێگــەی سێهەم بریتییە لە ڕێگەی زۆرداریو دەست بەسەراگرتن، کاتێك ئەگەر ئیمام مرد کەسێك خۆی هەڵقورتاند بــۆ ئیمامــەت کــە مەرجــەکانی ئیمامی تێدابوو بەڵام بێئەوەی کرابێتە جێنشین یا بەیعەتی پێــدرابێ، بەڵکو بەهۆی هێزو سەربازییەوە خەڵکی بەزاندو ناچاریانی کرد، ئەوا جێنشینیەتەکەی دادەمــەزرێ، بۆ ئــەوەی یــەکڕیزی مــسوڵمانان بــەدی بێت، جا ئەگەر هەر هەموو مەرجەکانی تێدانەبوو وەك ئــەوەی فاســق بێت یانەزان بێت، ئەمە دووڕووی هەیــە:- تــەواوترینیان ئەوەیــە کــە دادەمەزرێ لەو ڕووەوە کە باسمانکرد، هەرچــەندە بــەوکارەی گوناهبــار دەبێ). [1]

بەردەوام ئەم ڕێگەیە جێگەی جیاوازییەکی کۆنی نێوان فەقیهــەکان بووە، لە ئەحمەدی کوڕی حەنبــەل دوو گێڕانــەوە دەگێڕنــەوە -ئــەو لــە زانایانی ســەدەی دووەمو ســێیەمی کۆچــییە- گێڕانەوەیــەکیان دەڵــێ ئەگەر کەسێك بەزۆری هێز دەســتی بەســەراگرتو خــەڵکی لــەدەوری کۆبونــەوە ئــەوا بــەوە دەبێتــە ئیمــام، کۆبونــەوەو ســەقامگیریو یەکلابونەوەی بارەکەی بە مەرج داناوە.

---

(١) روضة الطالبين ٤٦/١٠، ومێ پر الإناقة ٥٨/١.

گێڕانەوەی دووەم: ئەوەیە کە بەدەست بەسەراگرتن نابێت بە ئیمـام، چونکە کاتێك دەبێت بەئیمام کە بەیعەتی پێبدرێ یـا جێنـشینایەتی پێبسپێردرێ، هەندێ لـە ئیمامـەکانی مـەزهـەب ئـەم بۆچونــــەیان بەهێز داناوە.[1]

قورتوبی مالکی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: ((ووتراوە: ئەمە (دەسـت بەســەراگرتن) دەبێتــە ڕێگەیــەك))،[2] کەچــی ئــەوەی کەجێگــەی تێڕوانینو جیاوازی بوو پاشتر بووە جێگــەی کـۆڕاو کـۆك بــوون، وەوای لێهــات ئــەم ڕێگەیـە بــوو بــە ڕێگەیــەکی دروســت بــۆگرێ بەنــدی ئیمامـەت؟!

بەم شێوەیە وای لێهات واقع چەمکەکانی خـۆی دەسـەپاند بەسـەر فیقهـ و فەقیهەکاندا، زەرورەتو بەرژەوەندی گشتی خوازیـاری پاسـاو هێنانەوە بوون بۆ گرتنەبەری ئەم ڕێو شوێنانە بێئەوەی هەست بکرێ بەو مەترسـیانەی لــە داهــاتودا بەدیـدێن، وەزۆرداریو خۆسـەپاندنی زۆردارانە بەسەر مافی ئوممەتدا – هەرچــەندە بەرژەوەندییــەکی کـاتی بەدی دێنێ – بەڵام لە داهاتوودا سەردەکێشێ بۆ لاوازبوونی ئوممـەتو کاولکردنی هێزو یەکێتییەکەی، هــەروەك ئەمــە بــارو بــاوی هــەموو زۆرداریيەکە لەتەواوی سەردەمو وولاتە جیاجیاکاندا، وە مـەترسی ئـەو

---

(١) سەیری حاشیە المقنع ٤/١٤٧ ی سلیمان کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بکە هـەروەها (الأحکام السلطانیة)ی ئەبو یـەعلای حەنبـەلی ل ٢٣ و (الانصاف)ی (المرداوی ١٠/٣١٠).

(٢) الجامع لأحکام القرآن ١/ ٢٦٩، ئەوەی کە دەڵێ: ووتراوە (قیل) بە لاواز دانانی ئەم بۆچونەیە لای ئەو.

ناکۆکیەی لە نێوان مسوڵمانانداا لە سەرەنجامی ڕاوێژەوە بەدیدێ باشترە لەو یەکێتی و یەکڕیزی یەی بەهۆی زۆرداری یەوە بەدیـدێ ئەگـەر بـۆ مـەودایەکی دوور تێی بڕوانین، ئەمڕۆش ئەوە بەدی هاتووە؟!

لەڕاسـتیدا ئـەو وتەیـەی عومـەری کـوڕی خـەتاب ﷺ سـودی لـێوەرنەگیرا کاتێ فەرمووی: (لەڕاستیدا ئەمارەت بە ڕاوێژی نێـوان مسوڵمانان دەبێ)، [1] وە ئـەو وتەیـەی کـە فـەرموی: (هەرکەسـێ بانگەشەی کرد بۆ میرایەتی خۆی بێ ڕاوێژی مسوڵمانان ئەوا چـارتان نیە تەنها کوشتنی نەبێ)، [2] یا ئەو وتەیەی (هەرکەسـێ بەیعـەت بداتە کەسێك بێڕاوێـژی مـسوڵمانان ئـەوا خـۆی‌و کەسـی بەیعـەت پێسپێردراویش شوێنیان ناکەوترێت‌و دوور نیە بکوژرێن)، [3] هەستی کردبوو زەوتکردنی مافی ئومەت چەند مەترسیدارە، هەربۆیە ڕێگـەی گەیشتنی بە ئیمامەت تەنها لە ڕێگەیەکدا کورت کردبـۆوە، ئـەویش ڕێگەی ڕاوێـژو ڕەزامەنـدی ئومـەت بـوو بـەدەر لـە ڕێگـەکانی تـر، لەڕاستیدا یەکەم و ترسناکترین لادانێك لە مێژووی مسوڵماناندا لادان بووە لەم دەروازەیەوە، لەوبارەی سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین لەسەری بوونە.

---

(١) عبدالرزاق (المصنف) ٥/٤٤٦ بە ئیسنادێکی (صحیح) گێڕاویەتیـەوە، سـەیری پێشووتر بکە ل ٣٦.

(٢) سەرچـاوەی پێـشوو ٥/٤٤٥ ئیـسنادێك حەسـەنە بـە پاڵپـشتەکانیەوە، سـەیری (السنة)ی خلال ژمارە١٠٦و پێشتر بکە.

(٣) سەرچاوەی پێشوو ٥/٤٤٥ بە ئیسنادێکی سەحیح، سەیری پێشووتر بکە ل ٣٦

هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لارێیی و لادان لە بابەتی ئیمامــەت لــە خەلافــەتی ڕاشــدی یــەوە بــۆ پادشــایەتی تــورکیو وازنەهێنــەر (عضوض)ی بە سەرەتای لادان داناوە لە ســوننەتو داهێنکارییــەکی خراپ بووە لە ئایین داو سەرەتای دەرکەوتنی ئاژاوەگێڕی بووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆترسناکی بابەتی ئیمامەتو ئیمامەکان.

بەڕاستی هاوەڵان ﷺ ڕووبەڕووی ئەم لادانە بوونەوە، لــە گــەورەترین بزوتنەوەی نارەزایی دا بــە ئاشــکرا ڕەفزیــان کــرد، ئــەوەبوو حوســەین لەگەڵ خەڵکی عێراقو عەبــدوڵڵای کــوڕی زوبــەیر لەگــەڵ خــەڵکی مەککەو عەبدوڵڵای کوڕی غەسیل لەگەڵ خەڵکی مەدینەدا ڕاپــەڕین دژ بــەم لادانــەو بانگەشەشــیان بــۆ (ڕاوێــژو ڕەزامەنــدی) دەکــرد، لەوکاتەشدا هــیچ لادانێکــی بیروبــاوەڕی (عقائــد)ی لــەبیر (فکــر)ی دەوڵەتدا ڕووی نەدابوو، بەڵکو تەنها لادانەکــە لــە بــواری سیاســەتی شەرعی دابوو، ئەوەش تەنها بەس بوو بۆ ڕاپەڕینو جــەنگان هــەروەك عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر بە موعاویەی ووت: (بەخوا یا ئەوەتا ئــەم کارە دەگێڕینەوە بۆ ڕاوێژی موســـــڵمانان، یــا ئــەوەتا دەیکــەین بــە جەنگ لەگەڵتدا)

لەڕاستیدا هەرلە ژیانی هاوەڵاندا ﷺ چەندین لادانو خواروخێــچی فکری ڕوویاندا، هاوێنەی فیکری خەواریج لــە ســەردەمی عــەلی دا، بەڵام هاوەڵان بەئەندازەو وێنەی لادانە سیاسیەکە ڕووبەڕووی نەبوونەوە کە لە بواری ئیمامەت دا ڕوویدا لەبەر مەترسیو هەستیاری یەکــەی،

بەڵكو خەواریج لە مەككەدا بەدەوری عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیردا بوونو نوێژیان لەگەڵی دەكردو پشتیوانیان لێدەكرد، ئەویش دەستكاری نەدەكردنو ڕووبەڕوویان نەدەبویەوە[1] بەوشێوەیەی ڕوو بەڕووی لادانی دەسەڵات بۆیەوە.

## جەنگی ئەوان لە پێناوی ڕاوێژدا بوو لەبەر چەندین هۆكاری دروستتو مەشروع:

یەكەم: وەك بەرگری یەك لەو مافەی خوای گەورە پێی بەخشیون وەك لە فەرمودەی خوای گەورەدا هاتووە: (وأمرهم شورى بينهم) لێرەدا (الأمر) كە هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایە – داوێتیە پاڵیان، بە شێوەیەك كە شایستەیی دەگەیەنێ، ئەوانیش دیدیان وابوو كە بۆیان هەیە لە پێناوی ئەو هەقو ڕەوایەدا بجەنگن، هەروەك چۆن دەجەنگن لە پێناوی خوێنو سەروەتو ناموسیان، هەركەسێ لە پێناوی ئەوانەدا بجەنگێ ئەوا شەهیدە، لە فەرمودەیەكدا هاتووە لە سەعدی كوڕی ئەبو وەقاصەوە كە باشترین مردن ئەوەیە پیاو لە پێناوی مافی خۆیدا بمرێ (نعم الميتة أن يموت الرجل دون حقه).[2]

---

(١) سەیری تهذيب تاريخ دمشق (٤١٥/٧) و تاريخ الإسلام (٤٤٢/٣) بكە.

(٢) ئەحمەد لە المسند (١٨٤/١)و تەبەرانی لە الأوسط وە هەروەها لە مجمع البحرين (١٤٥/٥) گێڕاویانەتەوە، (هیثمي) لە (مجمع الزوائد) (٢٤٤/٦) باب فيمن يقتل دون حقه ووتویەتی :( ئەو پیاوانەی ئەحمەد كەسی فەرمودەی (صحيح)ن، بەڵام ئەبوبەكری كوڕی حفص لە سەعدی نەبیستووە)، ئەلبانی لەفەرمودە(صحيح)ەكاندا بە ژمارە (٦٩٧) بە (صحيح)ی داناوە بە پاڵپشتەكانی تریەوە وەهایە.

دووەم: ئەم داگیرکردنە خـراپو سـتەمەو پێویـستە لابـبرێت، لەبـەر فەرمودەی: (من رأى منكم منكراً فليغيره) وەفەرمودەی: (لتأخذن على يد الظالم ولتأطرنه على الحق أطراً) هەربۆیە لە عومەرەوە ﷺ بە (صحيح)ی هاتووە کە فەرمویەتی: (هەرکەسـی داگـیری بکـا: (بیکـــوژن)

سـێیەم: وەك دەســت گرتنێــك بەســوننەتو ڕێنمــایی یــەکانی خەلیفەکانی ڕاشـدین لــە بـواری ئیمامەتـدا، لەبـەر فـەرمودەی: (عليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين من بعدي، عـضوا عليهـا بالنواجذ، وإياكم و محدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة)

هاوەڵانیش ﷺ هەسـتیان کردبـوو کـەزەوت کردنـی ئیمامـەت یاخود بە میرات گرتنو پشتاوپشتێتی لـە ڕێو شـوێنو سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ و خەلیفـەکانی ڕاشـدین نیـە، بـەڵکو داهێنـان کارییە لە ئاین داو لادانـە لـە سـوننەتی گـەورەی پێغەمبـەرانو ئەبوبەکرو عومەرەوە بۆ سوننەتی هرقلو قەیسەر.

لەڕاستیدا ئەو هاوەڵانەی ئەوکات جەنگان لە پێنـاوی بـەرگری کردن لە ڕاوێژ بریتی بوون لە هاوەڵە فەقیهـ و زاناکانو باشـترینی هاوەڵان بوون لەوکاتەدا لەڕووی زانستو کردارو ئاینو خۆپارێزیو وەرعەوە، هەستانیشیان بەوکارە لە ڕووی گوێڕایەڵییـەوە بـووە بـۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەوانەشیان جەنگیان نەدەکردو خۆیـان دەپاراست بەڵام بەزمان یا دڵی ئینکاری ئەو بارودۆخـەی کـردووەو

بەلاّم دیدو تیڕوانینی وابوو خۆڕاگری باشترە لە جەنگان، لەگەلّ ئەوەشدا پەسەندیان نەبوو مافی ئومەت زەوت بکرێ لە هەلّبژاردنی ئیمام دا، کەچی بیروبۆچونی دووەم — لەگەلّ ئەوەی ژمارەیەکی کەم لە هاوەلاّن لەگەلّیدابوون هاوڕێنەی عەبدوللاّی کوڕی عومەر — ئەوە پاشتر بووە باوو سوننەت، بەلّکو بوو بە ئەسلّێك لە ئەسلّەکانو وای لیّ هات ئەوەی پێچەوانەی بێت بە بیدعەچی دابنرێت؟

هەموو ئەمانەش لەژێر پەستانی ئەو واقعەدا بوو کە وردە وردە دەستی کردبوو بە سەپاندنی چەمکەکانی خۆی نەك تەنها بەسەر فیقهەوە بەلّکو بەسەر بیروباوەڕەکانیشەوە.

چوارەم: ئەوان هەستیان بەوە کردبوو کە هاتنە ناوەوەو بەدیهاتنی کەلێن لەبابەتی ئیمامەت دا سەردەکێشێ بۆئەوەی کەلێنەکان خۆیان بئاخننە نێو تەواوی کاروبارەکانی ژیانەوە، چونکە بە شێوانو خراپ بوونی کۆمەلّگەش شێواو خراپ دەبێ، بە چاکسازبوونیشی کۆمەلّگە چاکساز دەبێت هەروەك ئەبو موسلیمی خەوەلانی بە موعاویەی ووت: (ئیمام وەکو کانیەکی گەورەو ڕوون وایە، ئاوی لێوە دەچێ بۆڕوبارێکی گەورە، خەلّکیش خۆ هەلّدەدەنە نێو ڕوبارەکەوەو لیّلّی دەکەن، لەبەر ڕوونیو پاکی کانیەکە گوێیان لەلیّلّی ڕوبارەکە نیەو بە پیسی نازانن، بەلاّم ئەگەر لیّلّییەکە لە سەرچاوەو کانیەکەوەبوو ڕوبارەکە پیس دەبێو تێك دەچێ)، وەپێی

ووت: (ئەی موعاویە، ئێمە گوێمان لە لێڵی ڕووبارەکان نیە، ئەگەر سەرچاوەکە بە پاکی‌و ڕوونی بمێنێ).[1]

لەگەڵ ئەوەی ڕێگەی دەست بەسەراگرتن‌و بۆ ماوەیی‌و پشتاوپشتی بە بیانوی بەجێنشینێتی دان (الإستخلاف)ەوە هەر لەسەردەمی بەنو ئومەییەوە خۆی سەپاند، کەچی فەقیهەکان بەردەوام لەبارەی ڕێگەی یەکەمەوە بیروڕایان دەردەبڕی و تیۆریزەیان دەکردو بەدرێژی قسەیان لەسەری دەخستەڕوو، ڕێگەی یەکەمیش بریتی بوو لە بەیعەت بە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئەهلی حەللوعەقدو مەرجەکانی یەوە، بە هەمان شێوە تەئویل هاتە نێو ئەم ڕێگەیەشەوە لەگەڵ ئەوەی تیۆری بوو نەك واقعی؟ مشت‌و مڕو قسەو باسێکی زۆر ڕوویداو سەبارەت بە ژمارەو مەرجەکانی ئەهلی حەللوعەقد.

دەستەیەك وای بۆچوون کە گرێبەستی بەیعەت بە ڕێگەی هەڵبژاردن، کاتێ بەدی دێ کە تەواوی ئوممەت لەسەری کۆڕابن، ئەمەش گێڕانەوەیەکە لە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە، پرسیاری فەرمودەی (من مات ولیس له إمام مات میتة جاهلیة)ی لێ‌کرا، ئەحمەد فەرمووی: (ئەزانی ئیمام کێیە؟ ئیمام ئەوکەسەیە کە مسوڵمانان لەسەری کۆدەبنەوەو هەموویان دەڵێن: ئەوە ئیمامە، ئەوە واتاکەیەتی).[2]

---

(١) تهذیب تاریخ دمشق ٣٢٢/٧.

(٢) (الاحکام السلطانیة)ی ئەبو یەعلا ل ٢٣و منهاج السنة ١١٢/١

بەڵام ئەگەر لەسەر یەك ئیمام کۆنەبونــەوە ئــەوە ســەردەمی ئــاژاوە (فتنە)یە، گۆشەگیری‌و دوورە پەرێزی‌و بەیعەت نەدانی تێدا دروســتە، ئەمە مەزهــەبی عەبـدوڵڵای کـوڕی عومەریـشە، ئـەو دەیفـەرموو: (بەخوا لە پەرتەوازەییدا بەیعەت بەکەس نادەم، بەڵام لە کاتی بـوونی (جماعة)دا بەیعەت دەدەم‌و ڕێگر نابم).[1]

هەربۆیــە لەســەردەمی پەرتەوازەییــدا بەیعــەتی نــەدەدا تــاوەکو مسوڵمانان لەسەریەك پیاو کۆدەبونــەوە، کـاتێکیش لەســەر کەسـێك کۆدەبونەوە بەیعەتی دەدا، ئەگینا بەیعــەتی نــەدەدا، هەربۆیــە کاتــێ بەیعەتی دا بە موعاویە کە لەگـەڵ حەســەندا ئاشــتەوایی‌و ســوڵحی کرد، وە لە مەککەش دا بەیعەتی بە عەبـدوڵڵای کـوڕی زوبێــر نــەدا لەبەرئەوەی مەروان ناکۆك بوو لەگەڵیدا.[2]

ئەوکاتەی هەریەکە لە حوسەینی کوڕی عەلی‌و عەبـدوڵڵای کـوڕی زوبەیر لە گوێڕایەڵی (إطاعــة) یەزیـد دەرچـوون عەبـدوڵڵای کـوڕی عومەر پێی فەرموون: (خواتان بیردەخەمەوە لەوەی بگەڕێنەوەو بـچنە نێو ئەوکارەی خەڵکی بەباشی دەزانێ، وەچاوەڕێ بکەن، ئەگەر هــەموو خەڵکی لەسەری کۆبونەوە ئــەوا ئێــوەش ڕیزپــەڕ مــەبن‌و، ئەگـەریش نــاکۆك‌و پەرتــەوازە بــوون لەســەری ئــەوا ئــەوە ڕوودەدات کــە ئێــوە

(١) فـتح البــاري (١٣/١٩٥)، ئــەوەی ئــەمڕۆ تێیــدا دەژیــن ســەردەمی پەرتــەوازەیی‌و ئاژاوەیەو نەئیمامی تێدایەو نەبەیعە.

(٢) فتح الباري (١٣/١٩٥).

دەتانەوێ)، [1] ئەمەش تەئکیـد لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کەبۆچـوون‌و بیروڕای ئەو چونە نێو هەرشتێکە کە ئوممەت بـچێتە نـاوی‌و خـەڵکی لەگەڵدابێ، ئەگەر کۆبونەوە لەسەر ئیمامێك ئەوا بەیعـەتی پـێ‌دەدا، ئەگینا بەیعەت نادا.

کاتێ ئەم ڕێبازە کۆبونەوەی خەڵکی بە مەرج دەگـرێ ئەمـە واتـای ئەوە نی یە کە دەبێ هەموو کەسێك لە مـسوڵمانان پێـی ڕازی بێـت، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەس ڕێگر نەبێ یاخود کەسێکیان نـاکۆکی‌و ململانێی لەگەڵدا نەکا، جا کاتێ کۆمەڵ پێی ڕازی بوون ئەوا دەبێتـە ئیمامی گشتی.

دەستەیەکی تری فەقیهەکان کۆبونەوەی ئـەهلی حەللوعەقـد بـە مەرج دادەنێن نەك کۆبونەوەی هەموو ئوممەت، ئەبو یەعلای حەنبـەلی دەڵـێ: (کۆبونـەوەی ئـەهلی حەللوعەقـد بـە ئیجمـاع دادەنـرێ بـۆ دامەزراندنی، بە هەمان شێوە لەپێ‌دانی گرێ‌بەستی ئیمامەت دا)، [2] ئەهلی حەللوعەقدیش سەرکردەو کاربەدەستانی خـەڵکن لـەزانایان‌و ئەمیرەکان‌و ئەوخانەدان‌و کەسایەتیانەی خەڵکی شوێنیان دەکەون.

دەستەی سێ‌هەم وای بۆچون کە ئیمامەت دانامـەزرێ مەگـەر بـە هۆی جەماوەری ئەهلی حەللوعەقدی هەر شـــارو وڵاتێکەوە نەبێت، بـۆ ئـەوەی بەگـشتی پـێ‌ی ڕازی بـن‌و بـە ئیجمـاع گوێڕایـەڵی بـۆ

---

(١) ابن کثیر ٨/ ١٦٤ – ١٦٥ سەبارەت بە وەسفی چۆنێتی دەرچوونی حوسەین.

(٢) المعتمد في اصول الدين ل ١٣٩.

ئیمامەکەی دەربــــڕن.[1]

ماوەردی ڕەخنەی لەم بۆچونە گرتووە بە بیانوی ئــەوەی لەبەیعــەتی ئەبوبەکردا چاوەڕێی ئەوە نــەبوون ئەوانــەی لــەوێ نــین ئامــادەبن،[2] مەبەستی ماوەردیش لەمەدا بەهێزکردنی ئەو گوتەزایەیە کــە دەڵــێ: ئیمامەت دادەمەزرێ بە ژمارەی ئەو کەسانەی ئامادەی کۆڕی بەیعەت دانەکە دەبن هەروەها ئەمە ووتەی زۆربەی شافعییەکانە.[3]

ئەمەش ڕێبازی چوارەمە، کە بریتیە لەوەی گرێ بەستی بەیعــەت دروست دەبێ بە ئەو کەسانەی ئامادەی کۆڕی گرێبەستەکە دەبــن لــە ئەهلی حەللوعەقد لەکاتی بەیعەت دانەکەدا، تەنانەت ئەگەر گــرێ بەست (عقد)ەکە یەك کەسیش بێت بەمەرجێ ئەوکەسە گوێ لێگیراوو گوێڕایەڵکراو بێت، بە بیانوی ئەوەی کە بەیعەتی ئەبوبەکر بــەدیهات بە بەیعەت پێدانی عومەر بۆی کە ئــەویش یــەك کــەس بــوو؟! ئــاوڕ نادرێتــەوە بــۆ شــارو وولاتــە دوورەکــان، بــەڵکو کاتــێ کــە هــەواڵی بەیعەتەکەیان پێدەگات واجبە ڕازی بنو بەیعەت بــدەن،[4] ئەمــەش ووتەی ئەشعەری یە.[5]

---

(١) الأحكام السلطانيةی ماوەردی ل ٧.

(٢) الأحكام السلطانيةی ماوەردی ل ٧.

(٣) مآثر الإناقة ٤٤/١.

(٤) مآثر الإناقة ٤٤/١.

(٥) ســـەیری (اصـــول الـــدین)ی بەغـــدادی ل٢٨٠-٢٨١و (تەفـــسیر القـــرطبي) ٢٦٩/١ هەروەها (غیاث الأمم)ی (جوینی) ل٦٩ بکە.

ئەبو یەعلای حەنبـەلی‌و شـێخی ئیـسلام ئـیبن‌و تەیمیـەو ئیمـامی حەرەمەینی جوینی ڕێبازی سێ‌هەم بە باشترو بـەهێزتر دادەنـێن، ئـەو ڕێبازەی ڕازی بوونی زۆرینەو جەماوەری ئەهلی حەلل‌وعەقدی بە مەرج داناوە، ئەبو یەعلا ئەم مەزهەبەی داوەتەپاڵ یەکێك لـەو گێڕانەوانـەی دەگەیەنرێتە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.[1]

شـێخی ئیـسلام ئیبن‌وتەیمیـە ڕەددی ئـەو ڕێبازانـەی تـر دەداتـەوە کەبەیعەتی ئەبوبەکر دەکەنـە بەڵگـەو دەڵـێ: (لەڕاسـتیدا ئـەو بـە بەیعەت پێدانی جەماوەری هاوەڵان بوو بە ئیمام.ئەوانەی خاوەنی توانـاو هێزبـوون، هەربۆیـە دواکـەوتنی سـەعدی کـوڕی عوبـادە ﷺ هـیچ زیانێکی نەگەیاند، چونکە ئەمە تەشەر نـادا لەمەبەسـتی ولایـەت، ئەوکارەش بەڕازی بوونی جەماوەر بەدیهات).[2]

ڕەدی ئەوانەش ئەداتەوە کە دەست خسـتنە ناو دەسـتی عومـەریان بۆ ئەبوبەکر کردووەتە بەڵگە دەری دەخا کـە بەیعەتەکـە بـەو دەسـت خستنە ناودەستە بـەدی نـەهاتووە، بـەڵکو بـە بەشـوێن داهـــاتنی هاوەڵانی‌ترو ڕازی بوون‌و موافەقەکردنیان بەو هەڵبژاردنە بەدی هـات، چونکە لە هەموو بەیعەتێکدا دەست پێشخەرو بەدواداهاتوو هەیە،[3] پەندیش لە تەسلیم بـوون‌و ڕەزامەنـدی‌و بـەدیهاتنی هێزدایـە کـە بـە

---

(١) الاحكام السلطانية ل (٢٣)

(٢) منهاج السنة (١٤١/١).

(٣) منهاج السنة (١٤١/١).

هۆیــەوە مەبەســتی ئیمامــەت جێبــەجێ دەبــێ، ئەگــەر وا دابنــێین، هاوەڵانی تر لەمەدا بەدوای عومــەر نەکەوتنایــە لــە بەیعەتــدان بــە ئەبوبەکر ئەوا بــەو کــارەی عومــەر ئەبوبــەکر نــەدەبوو بــە خەلیفــە، (الجوینی)ش مەیلی هەیە بە لای ئەم بۆچونەدا[1].

لەگەڵ ئەم درێژیو دەوڵەمەندی یە فیقهییەی لــەم بابەتــەدا هەیــە کەچی بەردەوام ئەمە باسو خواسێکی تیۆری دوور لە واقــع بــووە کــە بیردۆزەی دەست بەسەراگرتنی زۆردارانە زاڵ بــووە بەســەریدا، ئەمــەش بریتی بووە لەو ڕێگەی کــە هەنــدێ لــە ڕووی ناچــاریو ڕەچــاوکردنی بەرژەوەندی یەوە بەدروســتیان بینیــوە، کەچــی دواتــر دەبێتــە ئەســڵو بنەمایەك بۆ گەیشتن بەدەسەڵات لە ماوەی هەزارو ســێ ســەدو پــەنجا ســـــاڵدا؟!!

عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان بەوە وازی نەهێنا کــە بــە زۆری شــیر دەستی گرت بەسەر خەلافەت دا، بەڵکو ســوننەتی دوو بەیعــەتی بــۆ هەر دووکوڕەکەی لەپاش خۆی داهێنا، ئەوە بوو لە ساڵی٨٥ك بۆ دوای خۆی خەڵکی پابەند کرد بە بەیعەتی وەلیدەوە پاش ئەو بۆ ســولەیمان، خەڵکی بەیعــەتی بەهــەردوکیان دا، کــاتێکیش هەواڵەکــە گەیــشتە مەدینــەو هەنــدێ لــە خەڵکەکــەی بەیعــەتیان دا، ســەعیدی کــوڕی موسەییەب پێشەوای تابعینی سەردەمی خۆی بەیعەتی نــەداو ووتــی:

---

(١) غیاث الأمم ل ٧٠ – ٧١

(تاوەکو ئەوکاتەی شەووڕۆژ بەدوای یەکدابێن‌و لێك جیاواز بن بەیعەت نادەم بە دوو کەس)، فەرمودەی: (نهى عن بيعتين في بيعة)[1]ی کـردە بەڵگە، ئەوانیش ئەوەیان خستە پێشچاو کە دەرچێ لە مەدینەو بـچێ بۆ عەمرە تاوەکو خـەڵکی مەدینـە بەیعـەت بـدەن، ئـەویش ووتــی: (جەستەی خۆم ماندوو ناکەم‌و دارایی خۆم نابەخشم بۆ شتێك کە نیازم تیایدا نیە، پێیان ووت: لە ماڵەکەی خۆتدا دانیـشە تـاوەکو کارەکـە کۆتایی دێت، فەرمووی: من گوێم لەبانگ بێ‌و (حي على الصلاة حي على الفلاح) ببیستم‌و نەیـەم ؟! شـتی واناکـەم، پێیــان ووت: باشــە، کاتێك والی نوســراوەکەی بەســەرتا خوێنــدەوە نــەخێرو بــەڵێ مەکــە، فەرموی: خەڵکی بڵێ: سەعیدی کـوڕی موســەییەب بەیعــەتی داوە، شتی واناکەم، پێی ووترا: لەم دەرگایــەوە چــویتە ژوورەوە لــەوی تــرەوە دەرچۆ، فەرمووی: بە خوا ئیتر کەس شوێنم ناکــەوێ. فــەرمان درا بــە لێدانی‌و سوڕاندنەوەی‌و گرتنی‌و شمشێر پێشاندانی، کەچی لەڕایەکـەی پەشیمان نەبویــەوە،[2] عومــەری کــوڕی عەبدولعــەزیز دەیفــەرموو: خۆزگە بە کەسێك ناخوازم لەوکارەدا تووشی ئازار نەبوبێ.[3]

کۆمەڵێك چوونە لای سەعید کاتێك کە لــە ســجن دابــوو، پێیــان

(١) سەیری صحيح الجامع ژمارە (٦٩٤٣)و (إرواء الغليل) ژمارە (١٣٠٧) بکە.

(٢) تاريخ خليفة ل ٨٩ المعرفة والتاريخ ی للبسوي ٤٧٢/١ – ٤٧٤، جامع ی (ابن ابي زيد القيرواني ل ١٨٤) و(حلية الأولياء ٢/ ١٧٠ – ١٧٢) (تاريخ ابن كثير ٦٤/٩).

(٣) المعرفة والتاريخ ٤٧٤/١ والجامع ل ١٨٤.

ووت: لەخوا بترسە، ئێمە لە خوێن ڕشتنت دەترسین، ئەویش پێی ووتن: لام بچنە دەرەوە، وادەبینن گاڵتەو یاری بە ئاینەکەم دەکەم وەکــو ئێــوە گاڵتـــەتان بـــە ئاینەکـــەتان کـــردووە،(١) هـــەروەها ووتـــی: ئەگـــەر عەبدولمەلیك دەیەوێ بەیعەت بە وەلید بدەم با خۆی لە کـار داماڵـێ‌و واز بهێنێ.(٢)

لەگەڵ بەناوبانگی ئەم ڕووداوە کەچی ماوەردی ئیدیعای ئەوە دەکـا کە گرێبەست‌و پەیماندان بۆ ئەم دوو بەیعەتە لـە سـەردەمی هـەردوو دەوڵــەتی ئومـــەوی‌و عەبباســـیدا کـــاری پـــێ‌کراوەو هـــیچ زانایـــەکی سەردەمیش ئینکاری نەکردووە؟!! بەڵکو ئەگەر خەلیفـە خەلیفایـەتی بسپێرێ بە زیاتر لـە دووکـەس دروسـتە؟! مـاوەردی ڕووداوی سـوپای (مؤتە) بە بەڵگە دێنێتەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ سێ ئـەمیری بـۆ سوپاکە یەك لەدوای یەك دیاری کرد، : (جـا ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ لە ئەمیرایەتیدا کاری وای کردبێ ئەوا هەمان شت لە جێنشینایەتیشدا دروستە)(٣)؟! بە وێنەی ئەم تەئویل‌و پێوانە خراپ‌و بێ‌ئیعتیبارە کـە دژ دەوەستێ بە سوننەتە ئاشکراو زانراوەکانی پێغەمبـەر ﷺ لەوانـە وازهێنان لـە ڕاوێـژی نێـوان مـسوڵمانان‌و سـونەتی هیرقلیـەت‌و قەیسەرییەت بە ناوی ئایینەوە شەرعیەتی پێ دەبەخشرێ ؟!!

(١) الجامع ل ١٨٤.

(٢) تاريخ خليفة بن خياط .

(٣) الأحكام السلطانية ل ١٥

وەك ئەوەی ماوەردی ئەو بەرهەڵستیو ئینکارەی سەعیدی کوڕی موسەییەبی لەم ڕووەوە نەبیستبێ، لە کاتێکدا سەعید پێشەوای تابعینی سەردەمی خۆیەتی؟! وەك ئەوەی نەیارێتی عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عەبدوڵلای کوڕی عەبباسو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرو عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرو حوسەینی کوڕی عەلی نەبیستبێ بەرامبەر موعاویە کاتێك کە دەیویست ئەوکارە بە کوڕەکەی بسپێرێ؟! ئیتر وازبێنە لە سێ کورو زیاتر؟! لە ڕێی هاوشێوەی ئەم فیقهەی ماوەردییەوە زۆرداری سیاسی بڵاوبوویەوەو سونەتو ڕێوشوێنی هرقلو قەیسەر سەقام گیربوو، هەروەك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا: ((لتتبعن سنن من كان قبلكم شبراً بشبر وذراعاً بذراع، فقيل يارسول الله كفارس وروم؟ قال: (ومن الناس إلا أولئك؟))،[1] واتە: شوێنی ڕێو شوێنو سونەتەکانی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بست بەستو گەز بەگەز، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو فارسو ڕۆم؟ فەرمووی ((ئەی خەڵك کێیە ئەگەر ئەوان نەبن؟!))

ئیبن‌وحەجەر فەرمویەتی: (کاتێ فەرمویەتی (الفرس والروم) هاوبەڵگە (قرينة) هەیە لەسەر ئەوەی ئەم فەرمودەیە پەیوەستە

---

(١) بوخاری گێڕاویەتییەوە، ف ژمارە (٧٣١٩) لە فەرمودەیەکی ئەبوهورەیرەوە، هەروەها بە ژمارە (٧٣٢٠)یش گێڕاویەتییەوە، وە مسلم بە فەرمودەی ژمارە (٢٦٦٩) لە فەرمودەی ئەبوسەعیدی خودری بە هەمان شێوە هێناویەتی لە کۆتاییەکەیدا هاتووە (اليهود والنصارى؟ قال فمن؟).

بـــەحوکمی نێـــوان خـــەڵکیو سیاســـەتی بـــەڕێوەبردنی خەڵکـــەوە، وە کاتێکیش فەرمویێتی: (الیهود والنـصاری) هـــاوەڵ بەڵگەیـــە هەیـــە لەســـەر ئـــەوەی پەیوەســـتە بـــە کاروبـــاری دیانەتـــەکانو ئەســـڵو فەرعەکانییەوە)

ئەمەش تەئکید لەسەر مەودای ئەو پەیوەندی‌یە دەکاتـــەوە کـــە لـــە نێوان ڕوودانی ئینحراف لە ئیمامەتو ڕوودانی ئینحراف لـــە ئـــایین دا هەیە، وەیەکەم هۆکارێکە بۆ دووەم، پێغەمبەر ﷺ هانی داوین دەست بگرین بە سوننەتی ئەوو سوننەتی جێنشینە ڕاشدینەکانی پاش خۆی، زانراویشە خاڵو پەیوەندی هاوبەشی نێوان خەلیفەکانی ڕاشدین بریتی بـــووە لـــە بـــەڕێوەبردنو ســـەرۆکایەتی کردنـــی کاروبـــاری ئومـــەت، مەبەستیش لە سوننەتی ئەو ڕێنمایی ڕێو شوێنی ئەوە بەتایبەت لـــە بـــواری سیاســـەتی شـــەرعی دا، ئـــەگینا تـــەواوی هـــاوەڵان شایـــستەی سەرمەشقین لە کاروباری ئایین دا.

عومـــــەری کـــــوڕی عەبدولعـــــەزیز لـــــە بـــــواری بـــــەڕێوەبردنو سەرۆکایەتیکردنی ئومەتدا سوننەتی خەلیفەکانی ڕاشدینی ژیانـــدەوە، لەپاش کۆچی دوایی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك لـــە ســـاڵی ٩٩ ك نوسراوەکەی خوێندرایەوە، کە تیایـــدا کاروبـــاری بەعومـــەری کـــوڕی عەبدولعەزیزی ئامۆزای ســـپاردبوو، عومـــەریش هەســـتا ووتـــاری بـــۆ خەڵکی داو فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، سوێن بەخوا من لـــە نهێنـــیو ئاشکرادا هیچ کات داوام لەخوا نەکردووە بۆ کارێکی وا، هەرکەسـێك

لە ئێوە پێی ناخۆشە ئەوا کاروباری بەدەست خۆیەتی). [1]

هەروەها فەرموی: (ئەی خەڵکینە، من قازی نـیم جێبەجێکـەرم، بیدعەچی نیم شوێن کەوتەم، ئەگـەر خـەڵکی شـارو وولاتـانی دەورو پشتان گوێڕایەڵ بوون ئەوا من سەرپەرشتکارتانم، ئەگەر نەیانویـست ئەوا سەرپەرشتکار نیم). [2]

لـە گێڕانەوەیکـدا هـاتووە کـە فەرمویـەتی: (ئـەی خەڵکینـە، لەراسـتیدا خـوا هـیچ پێغەمبـەرێکی لـە دوای پێغەمبەرەکەتانـەوە نەناردووە، وەهیچ کیتابێکی لەپاش ئەو کیتابە دانەبەزانـدووە کـە بـۆ ئێوە دابەزیوە، هەرشتێ خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیـەوە حەڵاڵی کردبێ ئەوا تاوەکو ڕۆژی قیامەت حەڵاڵە، هەر شتێکیش خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی حەرامی کردبێ ئەوە حەرامـە تـا ڕۆژی قیامەت، ئاگاداربن لەراستیدا من بیدعەچی نیم بەڵکو شـوێن کەوتەم، وەقازی نیم بـەڵکو جێبـەجێکارم، لەکەسیـشتان باشـترنیم، بەڵکو لە هەموتان بارم گرانو قورسترە، ئاگاداربن هیچ کەس بۆی نیە لە سەرپێچیکردنی خوادا گوێڕایەڵی بکرێ). [3]

کاروباری خەلافەتی گەڕانـدەوە بـۆ ئومـەت، ڕازی بـوونی خـەڵکی وولاتانی بۆ ئیمامەتەکەی بە مەرج دانـا، ئـەگینا خـۆی دوور دەگـرێ

(١) المعرفة والتاريخ ٦١٧/١، حلية الأولياء ٢٩٩/٥، بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٢) تاريخ الذهبي ١٩٣/٥، ابن كثير ١٩١/٩ بە پێی مەرجی موسلم

(٣) طبقات ابن سعد ٢٦٢/٥، المعرفة والتاريخ ٥٧٤/١.

لێی، بەهۆی ئەوەی دەیزانی مافەکە هی ئەوانەو دروست نیــە دەســتی بەســەردا بگــیرێ، هەربۆیــە بــۆ دوای خــۆی کەســی ڕانەســپارد بــۆ جێنشینێتی وەك شــوێن کــەوتنێك بــۆ ســوننەت، هــەوڵێکی زۆری دا تاوەکو شوێن ژیاننامەی خەلیفەکانی ڕاشــدین بکــەوێ تــاوەکو وەکــو یەکێك لەوان دانراو حسێبی بۆ کرا.

بەڵام ئــەو چاکــسازییە سیاســییەی عومــەر لــە ســەرەتاکانی ئــەم قۆناغەوە دەستی پێ‌کرد تــەواو نــەکرا، ئــەوەبوو کاروبارەکــان لــەپاش کۆچی دوایی خۆی گەڕایــەوە ســەرباری پــێش هــاتنی، ســەردەمەکەی درێژەی نەکێشا، ئەوەبوو ساڵی (١٠١)ك دونیــای بەجێ‌هێــشت پــێش ئەوەی ئەو چاکسازییە تەواوبکا کە دەیویــست ئــەنجامی بــدا، ئــەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی هاوکارو پشتیوان بۆ ئەوەی لەگەڵی دا بەوکارە چاکسازییە هەستن، هەروەك چۆن هاوەڵانی عومــەری کــوڕی خــەتتاب لەگەڵی دابوون، هەر بۆیە کارەکــەی عومــەری کــوڕی عەبدولعــەزیز هەوڵێکی تاکەکەسی بــوو نــەك کۆمــەڵی بەوشــێوەیەی لــە مەدینــە هــەبوو، ئــەوەبوو کۆچــکەرو پــشتیوانان خەلیفــەیان ڕاســت کــردەوەو چاوێریان کرد.

## ٢- دەست بەســـەراگرتنی مافـــی ئوممەت لە بەشداری کردنـی ڕاو ڕاوێژدا:

ئەم لادانو پاشەکشێیە دیـارترین مەشـخەڵو نیـشانەی قۆنـاغی دووەمە، جا هـەروەکو چـۆن مـافی هەڵبـژاردنی ئیمـام لـە ئوممـەت زەوتکـراو سـەنرایەوە کـە بناغـەی سـەرەکی چـەمکی ڕاوێـژبوو لـە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین دا، بە هەمان شێوە ڕۆڵی ئوممـەت لـە بەشـداریکردنی بـڕیوڕادا پـەراوێزخرا، بـە پێـچەوانەی ئـەوبارەی لـە سەردەمی ڕاشدین دا لەئارادابووە.

هەربۆیە حەسەنی بەسری - پێشەوای تابعین - نامەیەکی نوسی بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو هانی دا کار بە ڕاوێژ بکاو ئامۆژگـاری ووتەی زۆر بەنرخی تیایدا نووسـی بـوو، لەوانـە پێغەمبـەر ﷺ لـە کاتێکدا وەحی بۆ دابەزی هەموو ئەمانـە ڕێگرنـەبون لـەوەی لـەوەی خوای گەروە فەرمانی ڕاوێژکردنی پێبکا.[1]

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێ بوو بە ئەمیری مەدینـە سـاڵی ٨٧ ك کۆڕێکی ڕاوێژی هەبوو لە فەقیهەکانو گەورە زانایانی مەدینە، کە بریتی بوون لە عوروەی کوڕی زوبە یری کوڕی عەوامو عەبـدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کـوڕی عوتبـەو ئەبوبـەکری کـوڕی عەبـدوڕەحمانو

[1] تاريخ الذهبي ١٩٨/٥ ئیسنادەکەی (صحيح)ە بەپێی مەرجی موسلم.

ئەبوبەکری کـوڕی سـولەیمانی کـوڕی خەیسەمەو سـولەیمانی کـو یەسارو قاسمی کوڕی موحەممەدی کـوڕی ئەبوبەکری صـدیق‌و سـالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب و عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبدوڵڵای کوڕی عـەمری کوڕی عاص‌و عەبـدوڵڵای کـوڕی ڕەبیعـەو خارجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت، لە یەکەم ڕۆژدا کۆیکردنەوەو پێی ووتن: (نامەوێ بێ‌ئێوە هیچ بڕیارێك بـدەم، ئەگـەر بینیتـان کەسـێك دەست درێژی دەکا یاستەم دەکا پێمی بگەیەنن).[1]

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پاش ئەوەی بوو بە خەلیفـە سـووربو لەسـەر ئـەوەی کـەکاروباری خەلافـەت بگێڕتـەوە بۆڕاوێـژ لـەنێوان مسوڵماناندا،[2] ئەگەر مردن پەلەی نەکردایە ئەو کۆمەڵێك خەڵکی خـاوەن بـیروڕای کۆکردبـۆوەو ئامـادەی کۆڕەکـانی دەبـوون‌و بـە بۆچـونەکانیان هاوکـاری‌و یارمـەتیان دەداو گوێبیـستیان دەبـوو[3] لەکارو باری خەڵکیدا بیروبۆچونیان دەخستە پێش دەستی.[4]

هەروەك چۆن قازی عوبەیدوڵڵا کوڕی حەسەنی عەنبەری بەسری بـۆ خەلیفەی عەبباسی (المهدي) نوسـراوێکی دووروودرێـژی سـەبارەت بـە سیاسەتی شەرعی نوسی‌و تیایدا ئیمامی پێوە پابەند کـردووەو باسـی

---

(١) ابن جرير الطبري (٣/٦٧٣).

(٢) طبقات ابن سعد (٥/٢٦٥).

(٣) طبقات ابن سعد (٥/٢٨٥) کەسەکانی جێی متمانەن بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٤) طبقات ابن سعد (٥/١٩٨).

ڕاوێژی کردووەو وتویەتی: (ئەگەر میری بڕواداران پێـی بـاش بـوو لـە خزمەتیا خەڵکێکی هەڵبژێردراوی وڵاتان هەبن، خەڵکێکی ڕاستگۆو شـارەزا بـە سـوننەتو چـاوکراوەو ژیـرو خۆپـارێز بـۆ ئـەو کاروبـارو حوکمانـەی خـەڵکی دێتەبەردەسـتیان، یـا ئـەو بەشـخوراوی‌و سـتەم لـێ‌کراوییەکەی بۆیان بەرزەکرێتەوە = بیکـات، چـونکە لەراسـتیدا میری مسـوڵمانان، هەرچـەندە خـوای گـەورە بەخـشش‌و فـەزڵی خـۆی ڕشتووە بەسەریدا بەهۆی ئەو سودەی لەزانستەوە بـەکیتاب‌و سـوننەوە پێـی گەیـشتووە، بـەڵام کاروبـاری ئـەم ئومەتـەی بەسـەرەوەیەو بـە ڕۆژهـەڵات‌و ڕۆژئـاواوە، بـەدووری نزیکیـەوە بـۆلای ئـەو دەگەڕێتـەوە، هەریەکە لەمانە سەرقاڵی دەکا لـەوی تـر، ئەمـەش دەبێتـە پـشت‌و پەنایەکی ڕاست‌و دروست سەبارەت بـەوبارەی تێیدایـە (إن شـاءالله)، خوای گەورەش بە پێغەمبەرەکەی ﷺ (فەرمووە لە کاتێك ئەو وەحـی بۆ دابەزی باشترین‌و خواناس‌و شارەزاترین کەسێك بووە: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (آل عمران: ١٥٩)، لە کاروبارەکاندا ڕاوێژیان پێ‌بکە، کـاتێکیش بڕیـاری کردنـی کارێکت دا ئەوا پشت بەخوا ببەستە، چونکە لەراستیدا خـوای گـەورە ئەوکەسانەی خۆش دەوێ کە پشتی پێ‌دەبەستن، وە بەو خەڵکـە دەڵـێ، لە کاتێکدا جوانی کارو کردەکانیانـت دەخاتـەڕوو: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ (الشورى: ٣٨)، کاروبارەکانیان بـە ڕاوێـژی نێوانیانە، هەموو ئەمەش لەبەر ئەوەیە خەڵکی پێیان خۆشـە ببیـستن

میری باوەڕداران خۆی دەخاتـە پـێش چـاویانو پێداویـستیەکانیان بـۆ ئەنجام دەدا، وە هیوایان وایـە خـوای گـەورە ئـەوە بڕەخـسێنێ بـۆمیری باوەڕداران، بەوەی خۆی ڕاستەوخۆ دەست بەکاربێ بۆیانو ئـارام بگـرێ لەسەریان، وەخوای گەورە هێـزو ویـستو بـەردەوامی پێبەخـشێ بـۆ کاروباریان، چونکە ئەمانـە نیـشانەو مەشـخەڵی دادگـەرین، وە لـەو کارانەن کاربەدەست لەپێناوی کاروبـاری خەڵکیـدا پـێی هەڵدەسـێ، وەدەیگەیەنێ بەوەی دەیەوێ تیایدا ڕابچێو بەئەنجامی بگەیەنێ، خوای گەورە ئەوەی بۆ میری باوەڕداران تـەواوو ئاسـان کـردووە، هیـوام وایـە کارکردنی دادگەرانەی ئەووو ئایینو هێزو تیروانینی ئەو بۆخودی خـۆی بەو سەرەنجامەی بگەیەنێ، هەڵبژاردنی ئەمەش هەڵبژاردنی باشـترینو جوانترین کاروبارە، وە ئەو دەزانـێ چـی ووتـراوە سـەبارەت بـە دەرگـا داخستن لەڕووی نەدارو هەژارو لانەوازاند.

لەخودا دەپاڕێمەوە بۆ میری باوەڕداران کە بەزەییو فراوانی و نەزلی خۆی پێببەخشێ، وە ویلایەتو کاربەدەسـتێتییەکەی دادگەرانـە بـێو ساغو سـەلامەتی پێببەخـشێو سـۆزو نـەرمو نیـانیو بـەزەیی پێداهاتنـەوەی ئـەوان بخاتـە دڵیـەوەو بیـستێو گوێڕایـەڵی ئـەوانیش بەدەست بهێنێو قسەیان جۆرکاو ئالۆزیان نەهێڵێ). [١]

لەم نامە بەپێزەدا بانگەشـەیەکی ئاشـکرا هەیـە بـۆ هەڵبـژاردنی

---

(١) (أخبار القضاة)ی وکیعی کوڕی جەڕاح (٢/١٠٧)

کۆمەڵێك لە خەڵکی وولاتان تاوەکو بەشداری خەلیفە مەهدی بکـەن بـۆ ڕووبـەڕوو بونـەوەی کاروبـارو دادو حـوکمو بەشـخوراوی و سـتەم لێکراوییـەکانی ئوممـەت، وەك شـوێن کـەوتنێکی پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵانیﷺ، کە کاروبارەکانیان بـە ڕاوێـژی نێوانیـان بـووە، هـەروەك قورئان ئەمەی بە باشترین سیفاتیان باسکردووە، قـازی عەنبـەری لـە گوتارو بانگەشەکەیدا ئەم شتانەی خوارەوەی دیاریکردووە: -

١/ سروشتی کۆڕەکەو شێوازی هەڵبژاردنەکەی، ئەوەش دەبێ بەڕێگەی هەڵبـژاردن بـێو هـەموو ولاتـان بگرێتـەوە، لـەو ووتەیەیـدا: (هەڵبژێراو بن —منتخبون-) ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کە مەبەست لێی هەڵبژاردنیان بێ لەلایەن خەڵکی وولاتان خۆیانـەوە، ئـەگینا دەیفەرموو بە مەهدی: (تۆ هەڵیان دەبژێری (تنتخبهم)).

٢/ هەروەها ئەرکەکانی دیاری کردووە، وەکاریـان لـەوەدا بەرجەسـتە دەبێ چارەسەری ئەو کاروبارو گرفتانەبکەن کە لە لایەن خەڵکـەوە بۆیان دێو ئەو ستەم لێکراویو حوکمانەی دەخرێتە بەردەستیان.

٣/ هەروەها پاڵپشتی شەرعی بۆئەم جۆرە پـرۆژە چاکـسازییە دیـاری کردووە، کە بریتیە لە فەرمانی قورئـانی (وأمـرهم شـوری بیـنهم) (وشاورهم في الأمر) و ئەو ڕێو شوێنەی پێغەمبەر ﷺ و هـاوەڵان ﷺ لەسەری بوونە.

٤/ بەهەمـان شێوە سیفاتی ئەوکەسە هەڵبژێردراوانەی دیاری کردووە، وە دەبێ ئەو کەسانە خاوەنی دادگەریو ژیریو ئەزموونداری بن.

پێش تریش حەسەنی بەسری ئەم داوایەی لە خەلیفەی دادگــەری ئەمـــەوی (عومـــەری کــوڕی عەبدولعــەزیز) کردبــوو، ئــەوەتانێ عوبەیدوڵڵای کوڕی حەسەنی عەنبەری قازی بەسرە پاش پەنجا ساڵ هەمان بانگەشە بۆ خەلیفەی عەبباسی دادگــەر (مەهــدی کــوڕی مـەنسور) دووبارە دەکاتەوە، دیاریشی دەکا کە چۆن ئــەم بنەمایــە پیادە بکا.

وادەردەکەوێ خەڵکی بەسرە بەردەوام چاویان لەوەبووە کە ڕاوێژ بەرپا بکرێ بە پێی ئەو تێڕوانینە سیاسیەی هەیانبووەو بەردەوام نزیکترینی تێڕوانین بووە لەوبنەمایانەی لــەگوتاری سیاســی ســەردەمی ڕاشــدیدا هەبووە، هەربۆیە فەقیهەکانیان وایان دەبینی (کە ڕەزامـەندی ئــەهلی ئیختیـار بۆ بەیعەتی وەلی عەهد مـەرجە بۆئەوەی ئەو بەیعەتە لەلایەن ئوممەتەوە پابەندێتی پێــوەبکرێ، چــونکە مافێکــەو پەیوەنــدی هەیــە پێیانــەوە، ناچــارنین پابەنــدبن پێیــەوە مەگــەر ڕەزامەنــدی ئــەهلی ئیختیاری لەسەربێ).[1]

ماوەردی وەڵامیــان دەداتــەوەو تەئکیــد لەســەرئەوە دەکاتــەوە کــە بەیعەتەکەی دروستەو ڕەزامـەندی ئەوان ئیعتباری بۆناکرێ[2]؟!! بــەڵام ئەو بانگەشەیەی دەکرا بۆ کارکردن بە ڕاوێــژو دەنگدانەوەیــەکی زۆری هەبوو لە دەورپشتی بەسرەدا ڕۆشنایی بەچاو نەبینی، هیچ یــەك لــە

---

[1] الأحكام السلطانية ی ماوەردی ل ١١

[1] الأحكام السلطانية ی ماوەردی ل ١١

خەلیفەکان هەڵنەسان بەجێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە، پاشان زۆری نەخایاند ئەو بانگەشەیە کۆتایی پێهات دوای ئەوەی زەمەنێکی زۆری بەسەردا تێپەڕی، وە پاش ئەوەی فیقهی سیاسی تەئویل کراو زیندەبەچاڵ کردو تاوەکو ئێستاش ئەم فیقهە دەقەکان بۆ خزمەتی واقیع وەگەڕدەخاو شەرعیەت دەبەخشێتە هەموو لادانێکو بۆتە هۆی شاردنەوەی مەشخەڵەکانی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو؟!!

لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی ئیسلامی بە تایبەت لە مەغربو ئەندەلوسدا خاڵی نەبووە لە چەند هەوڵدانێك بۆ جێبەجێکردنی هاوێنەی ئەم پرۆژەیە.

خەلیفە (الناصر لدين الله الأموي) ئەندەلوسی (٣٥٠) ك.ك کۆڕێکی ڕاوێژی لە فەقیهەکان هەبووە، بە ڕادەیەك پلەوپایەو دەسەڵاتیان هەبووە، تا کار گەیشتە ئەوەی خەلیفە داوای لێکردن کە وەقفێك لەو وەقفانەی پێبفرۆشن کە تەرخان بووە بۆ نەخۆشخانەی قورتوبەو هاوشانی کۆشکەکەی بووە بەو مەرجەی بەهاکەی بە چەندقات بدات، سکاڵای بردەلای (ابن بقی) قازی قورتوبەو داوای لێکرد لەوبارەیەوە قسە لەگەڵ فەقیهەکاندا بکات، ئەوانیش داواکەیان پەسەند نەکرد چونکە وەقف کرابوو، حورمەتو ڕێزی وەقفی هەبوو، خەلیفە توڕەبوو، فەرمانیدا بە وەزیرەکان دەست وەردەنە کارەکەوە تاوەکو پەستان بخەنە سەر فەقیهەکان (لە نێوانیاندا گفتوگۆو مشتومڕێکی زۆر بوو، بەڵام لەگەڵیان نەگەیشتە

چارەسەرێك...).[1]

هەروەها لە ژیاننامەی سوڵتانی دادگەر عەلی کوڕی یوسفی کـوڕی تاشفین پادشای مورابیتەکان لە مـەغرب (٥٣٧ ك)دا هـاتووە: (ئـەو هـیچ کـارێکی لەتـەواوی مەملەکەتەکەیـدا نەبڕیوەتـەوە بێڕاوێـژی فەقیهەکان، هەرکاتێکیش کاری سپاردبێ بە یەکێك لـە قازییـەکانی یەکێك لە ڕاسپاردەکانی ئەوەبووە کە هیچ کارێك نەبڕێتـەوە، وە هـیچ فەرمانێك کۆتایی پێنەهێنێ بچوك یاگـەورە، مەگـەر بـە ئامـادەیی چوارکەس لە فەقیهەکان).[2]

بەردەوام زانا مالیکی یەکانی ئەندەلوس دەیان ووت: (ڕاوێژ واجبـە لە تەواوی کاروبارەکانی ئوممەت دا هەروەك (ابن خویز منداد المـالکی ــ ٤٠٠ ك.ك) فەرمویەتی: (پێویستە لەسەر کاربەدەســـتان ڕاوێـژ بە زانایان بکەن لەو شتانەی کە نایزانن، وە لەو کاروبارانەی ئـایین دا کە ئاڵۆز بـووە لێیـان، لـە کاروبـاری جـەنگ دا ڕاوێـژ بـە کەســـە دیارەکـانی سـوپا بکـەنو لــە بەرژەوەندیەکانیـشدا ڕاوێـژ بـە کەســـایەتیو پیاو ماقوڵان بکەن، لەو کاروبارانەشدا پەیوەستە بە بەرژەوەندییەکانی ووڵاتو ئاوەدان کردنەوەیەوە ڕاوێژ بە نوسەرو وەزیـرو کاربەدەستانەوە بکەن).[3]

(١) (الإعتصام) ی شاطبي، ل (٣٩).

(٢) المعجب في تلخيص اخبار المغرب، ل (١٧١).

(٣) تفسير القرطبي (٤/٢٤٩ ــ ٢٥٠).

(ابن عطية الأندلسي) ڕاڤـەکار – (٥٤١)ك. ك- فەرموویـەتی: (ڕاوێژ لـە ڕێـساکانی شـەریعەتو بڕیـارو حوکمـە زۆر گرنگەکانـە، هەرکەسێ ڕاوێژ بە ئەهلی زانستو دین نەکات لابردنی واجبە، ئەمـە جێی ناکۆکی نیە)،[1] واتە لە نێـوان زانایـانی ئەندەلوسـدا یـاخود لەنێوان فەقیهەکانی مەزهەبی مالکیدا.

لەوانەیە ئەمە هۆکاری پابەندبوونی هەندێ لە خەلیفەو پادشاکانی ئەندەلوسو مەغرب بێ لەوەی کار بە ڕاوێژ بکەن لەبەرئەوەی لە دیدی فەقیهەکانی ئەو وڵاتەدا واجـب بـووە، لـە کاتێکـدا لـە ڕۆژهەڵاتـدا کەسێك نەمابوو ئەم بۆچوونو دیدەی هـەبێ، هەربۆیـە مـاوەردی لـە (الأحكام السلطانية)دا باسی هۆکارانە ناکات کـە بـە هۆیـەوە ئیمـام لادەبرێ ئەگـەر جێبـەجێی نـەکرد هـەروەك (ابـن عطيـة) دەڵـێ، وە پێویستییەکانی سەرشانیشی دیاری ناکا هەروەك (ابن خـويز منـداد) دەفەرموێ، ئەمە لەبەر بڵاوبونەوەی ئەو بیروبۆچـونو وتەیـە بـووە لـە نێوان زانایـانی ڕۆژهەڵاتـدا کـە ڕاوێـژیان بـە سـوننەت دادەنـاو بـە پێویستیان نەدەزانی، ئەمـەش سـەری کێـشا بـۆ ئـەوەی زۆرێـك لـە خەلیفەکان بەسوك سەیری بکەنو پابەندی نەبنو کاری پێنەکەن، بـە پێچەوانەی ئەوبارەی لە ئەندەلوسو مەغرب دا هەبووە.

زۆرێك لە خەلیفەو پادشاکان خەڵکی چاكو دادگەرو خـاوەن فـەزڵ

(١) تفسير القرطبي (٤/٢٤٩).

بوونـــەو ســـووربوون لەســـەر شـــوێنکەوتنی حوکمـــەکانی شـــەرعو جێبەجێکردنی، بـەڵام ئـەوان لـە زانایـانو فەقیهـەکانی سـەردەمی خۆیاندا تەنها گوتاری سیاسی شەرعی تەئویلکراویان بـەدی کـردووە، کە بابـەتی ڕاوێـژی پـەراوێز دەخـستو بـە خـراپترین شـێوە کـەناری دەخست، ئەمەش سەری کێـشا بـۆ بڵاوبونـەوەی دیـاردەی (دادگـەری زۆردارو خۆسەپێن – العادل المستبد) لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا.

## ٣/ وون بـــوونی ڕۆڵـــی ئوممـــەت لـــە چـــاودێری‌کردنـــی خانـــەی ســـاماندا (*)

هەروەکو چۆن مافی ئوممەت لەم قۆناغەدا لە بەشداری پـێ‌کردنی بیروڕاو بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی دا پەراوێز خرا، بە هەمان شـێوە مافی ئەوەشی لـێ زەوت کرا کە چاودێری خانەی سامان و ڕێکخستنی کاروباری ئابووریدا بکا، لەکاتێکدا هاوەڵان لە سەردەمی خەلیفـەکانی ڕاشدین دا بە پێی پێویستی و کەم‌وکوڕی موچەیان لە خانـەی سـامان بۆ خەلیفە دەبڕیەوە، خەلیفەش پاش ڕاوێژکردن و زانینی بیروبۆچـونیان ئەسەرۆکی تێدا دەکرد وەکیلی خانەی سامانیشی دەدایە ئـەو کەسـەی ڕازی بوون بکرێتە وەزیری دارایـی، کەچـی پـاش سـەردەمی ڕاشـدین باروەزعەکە گۆڕا، وای لێهات خەلیفە لە خانەی ساماندا بـە ئـارەزوی خۆی دەیبەخشی و دەیگرتەوەو ئاڵوگۆڕی پێ دەکـرد بـێ لێپرسـینەوەو چاودێری، مەگەر تەنها ویژدانی خۆی، وای لێهات لـەم ڕووەوە تـەواوی ئازادی هەبوو.

ئەم لادانـە لـە سـەرەتای سـەردەمی ئومەویـەوە دەسـتی پـێ‌کرد، موعاویە لە نوێژی هـەینی دا ووتـاری دەداو دەیـوت: (ئـەم دارایـی و سامان و دەستکەوتانە هـی ئێمەیـە، کـێ ڕیانـەوێ دەیـدەینێ و کـێش ڕیانەوێ نایدەینێ، کەس وەڵامی نەدایەوە، کاتێك جومعەی دووەم هـات

---

(*) خانەی سامان = بیت المال = وەرگێڕ =.

هەمان ووتەی پێشووی دووبارە کردەوە، هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە، کاتێکیش جومعەی سێیەم هات، هەمان ووتەی دووبارە کردەوە، کەسێك لەوانەی لە مزگەوتەکەدابوو هۆی ڕاوەستا و ووتی نەخێر، بەڵکو ئەم دارایی و سامان و دەستکەوتە هی ئێمەیە، هەر کەسەش ڕێگری لە نێوان ئێمە و ئەودا بە شیرەکانمان حوکمی دەکەین، کاتێك نوێژەکەی کرد لەرماییدا پیاوەکەیان هێنایە ژوورەوە، لەسەر جێگە لەگەڵ خۆیدا دایبیشاند، پاشان ڕێیدا بێنە ژوورەوە بۆلای، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە، من لە جومعەی یەکەمدا قسەم کرد و کەس وەڵامی نەدامەوە لە دووەمیشدا کەس وەڵامی نەدامەوە، کاتێکیش سێهەم جومعە هاتەوە ئەمە ژیاندمیەوە، خوا بیژیەنێت، گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: (ڕۆژێك دێت خەڵکێك قسە دەکەن و کەس ڕەدیان ناداتەوە، وەکو مەیمون کە لە گۆمەڵ دەبن و خۆ فڕێدەدەنە ئاگرەوە) ترسام خوای گەورە من وەکو ئەوانە لێ بکا، کاتێك ئەم پیاوە وەڵامی دامەوە ژیاندمیەوە، خوا بیژیەنێ، هیوام وایە خوای گەورە لەم کات بەوانە). [1]

هەروەها پیاوێك هات بۆ لای سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و پێی وت: (گوێم لە مەڕوانی کوڕی حەکەم بوو وای بۆدەچوو کە سامانی

---

(١) (ابو يعلي الموصلي) گێڕاویەتیەوە، ف ژمارە (٧٣٨٢) لە (مجمع الزوائد)دا دەڵێ: کەسەکانی جێ متمانەن، ئەلبانی لە (الصحیحە)دا بە ژمارە (١٧٩٠) بە (صحیح)ی داناوە.

خوا سامانی خۆیەتی، هەرکەسێ ویستی پێی دەبەخشێو هەرکەسەش نەیەوێ ڕێگری لــێ دەکا، سەعد پێی ووت: ئایا تۆ گوێت لـــێ بـــوو وای دەوت؟ ووتی بەڵێ، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصیش کــە ســەعیدی کوڕی موسەییەبو حارسی کوڕی بەرصــائی لەگەڵــدابوو، چــووە لای مەڕوان کە ئەو کاتە ئەمیری مەدینەبوو لەلایەن موعاویەوە- و پێــی ووت: ئەی مەڕوان تۆ وات داناوە کــە ســامانی خــوا ســامانی خۆتــە، هەرکەسێ بتەوێ پێی دەبەخشیو هەرکەســەش بتــەوێ ڕێگــری لـــێ دەکەی؟ ووتی بەڵێ، سەعد پێی ووت: کەواتە دژت دەپاڕێمەوە،هەردوو دەستی بۆ پاڕانەوە بەرزکردەوە، مەڕوان یەکــسەر پــەلاماری داو پــێی ووت: سوێندت دەدەم بە خوا لەوەی کــە داوا بکــەی ســامان ســامانی خوایەو کێ بیەوێ پێی دەبەخشێو کێ بیەوی پێی نابەخشێ.(١)

کاتێ موعاویە ﷺ ویستی بەیعەت بدرێ بە یەزید ئەوەی بە مەرج دانا کە هاوەڵان خۆیان (سامان کۆ بکەنەوەو هــەر ئــەوانیش دابەشــی بکەن)، (٢) مسولْمانان کۆبوون لەسەرئەوەی کە ســامانو دارایــی لــە خانەی سامانی مسولْماناندا مافی ئوممەتە، ئیمــام بــۆی نیــە دەســتی تێوەربدا مەگەر بە پێی ئەو ڕێو شوێنانەی شەرع دیاری کردووە وە بە شێوەیەبێ کە بەرژەوەندی گشتی مــسولْمانان بــەدی دەهێنــێ، بەشــی ئیمام لە خانەی ساماندا تەنها بەپێی پێداویستیو موچەی هاوشێوەی

---

(١) حاکم لە (المستدرك) (٣/٥٠٠ – ٥٠١) بە ئیسنادێکی (صحيح) گێڕاویەتی‌یەوە.

(٢) سەیری پێشووتر بکە.

خۆی دروسته بۆی تەرخان کرێ.

ئــەمیر ســدیق خــان وتویــەتی: (خەلیفــە تاکێکــە لەتاکــەکانی مــــسولّمانان، وەکــو هــەر خــەڵکێکی تــر مــافی هەیــە لەخانــەی سامانیاندا، ئەو ئەوەندەی کەسێکی هاوپلەی خۆی پــێ‌ی دەدرێ‌و وەری دەگرێ، تایبەتمەندییەکی زیاتریشی هەیە، ئەویش بریتیــە لــەوەی بــە چەند بەرژەوەندییەك هەڵدەسێ کەسی تــر پێــی هەڵناســێ، موچــەی کارکردنیشی پێ‌دەدرێ لەخانەی ساماندا، لەراستیدا خــوا بەدروســتی داناوە کارمەندی سەدەقە بەشــێکی هــەبێ تیایــدا، بەهــەمان شــێوە موچەی هاوشێوەی خۆی پێ‌دەدرێ، ئەگــەر بیــەوێ خۆیــشی لــەگوناه رزگاربکــا ئــەوا لــەکاتی دابەشــکردنی دەســتکەوت‌و بەخــشینی مسلّماناندا ئەوەندەی بەشی کەسێکی هاوشێوەی خۆی، لە ئازایــەتی‌و جیهادو زانست دا پێ دەبەخشرێ بــە پــێ‌ی جۆراوجــۆری هۆکارەکــانی شایستەیی، پاشان موچەکەی خۆی وەردەگــرێ، بــە پــێ‌ی پێویــستیش خێزان‌و خزمەتگوزاری دەبێ، نەك بە پێی ئەندازەی حەزی خۆی).[1]

لە کتێبی (الإقناع)ی فیقهــی حەنبەلییەکانــدا هــاتووە: (خانــەی سامــان موڵکی مسولّمانانە، هەرکەسێ بــەفیڕۆی بــدا دەبــێ دابینــی بکاتەوەو زەمانەتی بکــا، بــەبێ مۆڵــەتی ئیمــامیش حەرامـــە لێــی ببرێت)،[2] ئەو گوتەیەی کە دەڵێ خانەی ســامان مــوڵکی ســەرجەم

(١) إكليل الكرامة ل ١٢٧ – ١٢٨.

(٢) كشف الإقناع ٣١٠.

مسوڵمانانەو ئیمامیش تەنها بەپێی ئەوەی شەرع هێناویەتی دەتوانێ بــەکاری بهێنـــێو تەســەڕوفی تێــدا بکــا لەبەرژەوەنــدی گــشتی مسوڵمانانداو دابەشی بکا لە نێوان ئەوکەسانەی شایستەی پــێدانن، وە هــەر مــسوڵمانێك مــافی هەیــە تێیــدا، ئەمــە جــێی کــۆڕای فەقیهەکانی هەموو مەزهەبەکانە، تەنانەت وتراوە هەرکەسێ بیروڕای وابێت کە ئەو داراییو سامانەی لە خانەی ساماندایە هی دەســەڵاتو ســوڵتانە ئــەوا بــەم بیروبــاوەڕەی کــافر دەبــێ، هــەروەك لــە کتێبــی حەنەفیەکاندا باس کراوە.

لــە چــۆنێتی ڕێکخــستنی داهاتــەکانی خانــەی ســامانو ســەرف کردنەکانیو ڕوونکردنەوەی مافی هەموو تاکــەکان تیایــداو چــۆنێتی دابەشکردنی و.. هتد فیقهی ئیسلامی گەیشتووەتە پلەیەك تەنانــەت یاساکانی هاوچەرخیش پێی نەگەیشتووە، خــاوەن مافــەکان دەتــوانن داوای مافەکانی خۆیان بکــەن لــە خانــەی ســاماندا، ئەگــەر خانــەی سامان بێتوانابوو ئەوا دەبێتە قەرزێکی ئەمان لەسەر خانەی سامان، هەرکاتێ داهاتی تێهات شیاوی دەبنو بۆ ئەمانە... هتد).(١)

کەچی ئەم تێڕوانینە فیقهی یە لەسەر زەمینەی واقــعو لــەقۆناغی دووەمــدا بــەهای خــۆی لەدەســت دا پــاش پــەراوێز خــستنی ڕۆڵــی چاودێرانەی ئوممەت، وای لێهات خەلیفە هیچ چاودێریکی لەسەر نەما

(١) سەیری الأحکام السلطانیة‌ی ماوەردی ل ٢٢٦و دواتری بکە.

جگەلە ویژدان‌و دەروونی خۆی نەبێت هەرئەمەش بوو سەری کێشا بـۆ تەسەڕوف کردن لە سـامانی ئوممەتـدا بـەپێی پێویـست‌و حـەزەکانی زۆرێك لە خەلیفەو پادشاکان.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هات هەوڵ‌و تێکۆشانێکی زۆریدا بۆ چاکسازیکردنی ئەو زیادە ڕۆییانەی بەنوئومەییە لە دارایـی‌و خانـەی سامانی مسولّمانانـدا کردبویان، لەخۆیـەوە دەسـتی پـێ‌کردو سـەیری مولّکە تۆمارکراوەکانی باوکی کرد، هەرچـی زەوی‌و زارێکـی هـەبوو گەڕاندیەوە بۆ خانەی سامانی مسولّمانان،[1] پاشان نـەوەی مـەڕوانی کۆکردەوەو ووتارێکی بۆدان‌و فەرمووی: (من وادەزانم نیوەی دارایی ئەم ئوممەتە لە دەستی ئێوەدایـە، ئـەوەی لـەو داراییـە لـەژێر دەسـتانایە بیگێڕنەوە، پیاوێکیان ووتی: نە بـەخوا، شـتی وا هـیچ کاتـێ نابێـت مەگەر سەرمان لەلاشە جیاکەیتەوە، بەخوا ناسوپاس گوزارو بێ‌بـاوەڕ نابین بە باوو باپیرانمـان‌و کـوڕو نـەوەکانمان هـەژار ناخـەین، عومـەر فەرمووی: جابزانن ئەگەر هاوکاریم نەکەن لەوەدا ئەم مافانە بۆمـاف دارەکانی بسێنم، ئەوا گەردنتان پێ‌کەچ دەکەن).[1]

پاشان لەناو خـەلّکی دا هەسـتاو وتـارێکی داو فـەرمووی: (ئـەم خەلّکە -واتە بەنو ئومەییە- هەندێ بەخشیشیان پـی دایـن، بـەخوا نەدەبوایە پێمان بدەن، وە نـەدەبوو ئێمـەش وەری بگـرین، وەوا دەبیـنم

(١) المعرفة والتاريخ ٥٨٧/١ بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٢) المعرفة والتاريخ ٦١٥/١ بە ئیسنادێکی سەحیح.

ئەوەی گەیـشتووە بـەمن لای خـوای گـــــەورە لێپرسـینەوەم لەسـەر دەکرێ، ئاگاداربن وا من گەڕاندمەوەو لە خۆمو خانەوادەکەمەوە دەستم پێکرد). [1]

لـــە سـەرەمەرگیدا پـێی ووتــرا: منداڵـەکانت بـەبێ سـامان بەجێهێشت؟! ئەویش فەرمووی: (نەدەبوو شتێکیان پێبدەم کـە هـی ئەوان نەبووە، وە مافێکم لـێ زەوت نەکردوون کە هـی خۆیـان بوبـێ، کەسێك دەکەمە سەرپەرشتیاریان کەئەرکی سەرپەرشتی پیاوچاکان لە ئەستۆ دەگرێ، ئەوان یەکێك لەم دووکەسەن، یا کەسێکن گوێڕایـەڵی خوا دەکەن، یا بێفەرمانی خوا دەکـەنو فـەرمان بـەرداری لەدەسـت دەدەن). [2]

لە دابەشکردنی خانەی سامانی مسوڵماناندا ڕێو شوێنو سوننەتی خەلیفەکانی ڕاشدینی زیندوو کردبووەوە، وە دەیفەرموو: (لەم سامانەدا تەنها چەند پێگەو شوێنێکم تیایدا هەیە خوا بۆمی ئـەنجام داوە)، [3] وە فەرمویەتی: (من چەند کاربەدەستێکم بەسەرتانەوە دانـاوە، نـاڵێم باشترینتانن، هەرکەسێ کاربەدەستەکەی ستەمی لێکرد ئەوا مۆڵـەتی منی نیە، ئەگەرنا با نەیبینم، سوێند بەخوا ئەگەر مـن خـۆمو مـاڵو

(١) المعرفـة والتـاريخ ١/٥٨٧ بەئیـسنادێکی سـەحیح، سـەیری بـە حـەرام دانـانی وەرگرتنـی بەخـشینو دیـاری مـیرە سـتەمکارەکان بکـە لـە لایـەن عومـەرو فـەتوای هاوچەرخ سەبارەت بە دروستیو جائیزبوونی ؟!!

(٢) المعرفة والتاريخ ١/٥٨٧ بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٣) المعرفة والتاريخ ١/٥٧٠.

منالّم لەم سامانە گرتبێتەوە پاشان ڕەزیلیم کردبێ تیایـدا بـۆ ئێـوە، کەواتە من کەسێکی ڕژدو ڕەزیلم)، [1] وە هەستا بـەبرینی دەرماڵـەی هاوڕێو هاوکارانی بەنوئومەییە، [2] سامانو دارایی ئومەویەکانی بـە سامانو دارایی مافخۆری و سـتەمکاری نـاودەبردو دەیگەڕانـدەوە بـۆ خانەی سامان. [3]

یەکێکیان پێی ووت: ئایا لەم سامانەدا مافمان نیە؟

عومەر پێی فەرموو: ئێوەو دورترین کەسی مسوڵمان لای من لـەم سامانەدا وەکویەکن، مەگەر کەسێك لە مـسوڵمانان بـە هـۆی دوورو درێژیو بێچارەیی یەوە دەستمان پێی نەگات. [4]

هەر ئەو نوسراوێکی نووسی بۆ قازییەکەی لە مەدینە ئەبوبـەکری کوڕی حەزمو فەرمانی پێکرد سەیری دیوانەکان بکاو پـاکی بکاتـەوە تەواوی ئەو ستەمو زۆرداریانەی خەلیفەکانی پێش خـۆی کردویانـە، چ مافی مـسوڵمانێك بێت یاخود مافی پەیمان پێدراو (معاهد)ێك بێت، وە مافەکانیان بۆ بگەڕێندرێتەوە، ئەگەر مردوش بێت بیگەڕێنەوە بـۆ کەسو میراتبەرەکانی، [5] وەکو یەکیش شتی بەسەر خەڵکیـدا دابـەش

(١) المعرفة والتاريخ (٥٧٦/١).
(٢) المعرفة والتاريخ (٥٧٤/١ و ٥٩٨) و ابن سعد بە ئیسنادێکی (صحيح).
(٣) تاريخ الذهبي (١٩٦/٥).
(٤) تاريخ الذهبي (١٩٨/٥).
(٥) ابن سعد لة الطبقات (٥/ ٢٦٤).

دەکردوو زیاتری نەدەدا بەکەس.[1]

نوسراوێکی نوسی بۆ خەڵکی وولاٌتانو تیایدا فەرمانی پێکردبوون کە ناوی منداڵە لـەدایك بووەکـانی تێـدا بنوسـرێ تـاوەکو لەخانــەی سامـاندا بەشیـان بۆ ببڕێتەوە، وەناوی مردووەکانیان بنوسن تـاوەکو لـە خانەی سامـاندا ناویان بسڕدرێتەوە، لە کۆتایی نوسـراوەکەدا هــاتووە: (لەڕاستی دا ئەمە تەنها سامانی خۆتانەو دەیگڕێینەوە بۆتان).(٢)

عەبدوڵلاٌی کوڕی عەلاء هاتەلای عومەر، یەکێك بووە لە یاخیــانو لە گوێڕایەڵی دەرچووبو، بەوبۆنەیــەوە لــە بەخـشین بێبــەش کرابــوو، عومەر فەرمـانیدا بەخــشینەکەی پــێ بدرێتــەوەو بەخــشینی ســالاٌنی پێــشووشی بــۆ بگێــڕدرێتەوە،[3] وە فـــەرمانی دەرکـــرد بەخـــشینی گیراوەکان بدرێت بە خۆیان،[4] هەربۆیە بەشی خۆیان مانگ بە مانگ وەردەگرت لەگەڵ پۆشتەنی هاوینو زستان.[5]

وە فەرمانیدا بەهەواڵ پرسینی بارودۆخی ئەوانەی کە نەخۆش بوون، وە ئەوانەی بێکەسو سامانو دارایی بوون، تاوەکو بەدەمیانەوە بنو ئەوەندەیان بۆ دەستەبەر بکرێ لە خواردنو پێخۆر کە کاروباریان پێ

(١) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٦٦).

(٢) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٦٧).

(٣) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٦٥).

(٤) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٦٩ – ٢٧٥).

(٥) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٥٧).

بچێت بەڕێوە،[1] وە فەرمانی دا بەوەی بریتی گیراوو دیلی مسوڵمانانو ئەهـلی ذیمـە بـدرێ، پیاوان بن یا ژنان، ئازادبن یان کۆیلـــە.[2]

موچەو پێبەخـشینی بـە عــەرەبو مــەوالی وەك یــەك دەدا،[3] وە فەرمانیدا هیچ کەس لە کاربەدەستان –کارمەنـدان- موچـەو ڕزقــی گــشتیو تایبــەتی نــەبێت، هەرکەســەش شــتێکی وەرگرتــووە بــا بیگێڕێتەوە.[4]

بۆ یەکێك لە کاربەدەستەکانی نووسی: (پـاش سـوپاسو سـتایش، بڕوانە بارودۆخی ئەهلی ذیمــە و نەرم بە لەگەڵیان، ئەگەر کەسێکیان پیربوو وە سامانی نەبوو ئەوا نەفەقەی بکێشە، ئەگــەر خـزمو کـەسو کاری هەبوو فەرمانیان پێ بکە ئەوان نەفەقەی بکێشن).[5]

وە نوسراوێکی نووسی بۆ والیەکەی لە عێراق داو فەرمانی پـێکرد موچەو ڕۆزی خەڵکی دابەش بکا بەسەریاندا، ئەگەر شتێکی زیـادبوو ئەوا با قەرزی قەرزارانی پێبدرێتەوە بێ زیادەڕۆیی‌و سەرشێتی، ئەگەر لەوەش زیادبوو با مارەیی ئەوانەی پێ بدرێ کە دەیانەوێ هاوسەرگیری ئەنجام دەنو سامانو داراییان نیە، ئەگەر شتێك زیادبوو بـا بـە سـلفە بدرێتە ئەو ئەهلی ذیمــیانەی توانای سەرف کردنیــان نیــە لــە زەوی‌و

---

(١) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٧٦ و ١٩٤) بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٢) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٨٦ و ٢٧٣).

(٣) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٩٢).

(٤) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٩٤) بە ئیسنادێکی سەحیح.

(٥) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٩٦) بە ئیسنادێکی سەحیح.

زارەکانیانداو ناتوانن بیکەنە کشتوکاڵ.[1]

خاوەنی دیوان پارەیەکی بڕیەوە بۆ ئەوانەی نەخۆشــی درێژخایــەنیان هەیە یاخود پیرو پەککەوتەن هەروەك چۆن بۆ تەندروستو ســاغەکانی لە خانەی ساماندا بڕیبویەوە، عومەریش ڕەزامەندی دەربڕی لەسەری[2]

مەیمونی کوڕی مەهران سکاڵای توندوتیژی فەرمانڕەوایی‌و ســامان کۆکردنەوەی بردە لایو ئەویش نوسراوێکی بۆ نوسی: (بــە شــێوەیەکی ڕەوا سامـان کۆکەنەوە، بە پێی ڕوونبونەوەی ڕاســتو ڕەوایــی قــەزاوەت بکە، ئەگەر شتێکت لێ ئاڵۆسکاو شێوا بۆمی بەرزکەرەوە، جا ئەگــەر خەڵکی هەربەوەی کارێکیان لەسەر قورس بــور وازی لێ بهێــنن ئــەوا کاروباری دینو دونیا بەڕێوە ناچێ، کەواتە خەڵکی سەرکەش مەکەنو هەڵیان مەخلیسکێننو بارگرانیــان مەکــەن)،[3] وە فەرمانیــدا ئــەو شوێنانەی سنوردار کرابوون بۆ خەڵك والاّ بکرێو ڕێگری کــرد لــەوەی ئەو کانو کانگانە دەرکرێن کە سوودو قازانجەکەی تایبەتەو زیانەکەی دەکەوێتە سەر هەموو خەڵکی بــە گــشتی)،[4] بۆهەریەکــە لــەپێنج یــەكو دەســتکەوتو زەکــاتو ســەدەقە خانــەی ســامانی ســەربەخۆو تایبەتی دانا[5] بۆ ئەوەی زەکــاتو پێــنج یــەك یاخـــود دەســتکەوت

---

(١) (الأموال) ی ئەبوعوبەید ل (٢٦٥).

(٢) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٩٦).

(٣) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٩٦).

(٤) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٢٩٨)(صحيح)بەپێی مەرجی هەریەکە لەبوخاریو موسلم.

(٥) ابن سعد لە الطبقات (٥/ ٣١٢).

تێکەڵ بەیەك نەبن.

عومەر هەوڵێکی زۆری دا بۆئەوەی چاکسازی ئەو شتانە بکا کە هەندێ لە خەلیفەکانی پێش خۆی تێکیان دابوو، تاوای لێهات – لەسەردەمی ئەودا – سەروەتو سامان بە شێوەیەك زۆربوو کەکەس نەدەبینرا زەکات وەربگرێ لەبەر دەوڵەمەندیان،[1] کەچی دواتر کەسانی تر هاتن کە کاروبارەکانیان وەکو ڕەوتی یەکەجاری لێ کردەوە، سەرەڕای ئەوەی فەقیهەکان لە کتێبەکانی (الأحکام السلطانیة)دا بە دوورو درێژییەکی زۆرجوان باسیان لە ڕێکخستنی کاروباری خانەی سامانو حوکمەکانی دارایی کردووە بە شێوازێك شتی وا لای نەتەوەکانی تر بەدی ناکرێ، بەڵام وونبوونی ڕۆڵی چاودێریانەی ئوممەت دەرگای خستە سەرپشت بۆ یاریکردن بە دارایی‌و سامانی ئوممەتو تەسەڕوف پێوەکردنی بە پێی حەزو ئارەزووەکانیان، سەرەڕای بوونی کۆڕای فەقیهەکان لەسەر حەرامێتی ئەمجۆرە ڕەفتارانە وە ڕوونکردنەوەی ئەوەی خانو دارایی یەکەی ناوی مافی مسوڵمانانە نەك خەلیفەو ئەمیرەکان یان نوێنەرو وەزیرەکانی، بەڵام بە تێپەڕینی کاتو سەردەم سەری کێشا بۆ ئەو بیروباوەڕەی کە ئەو سامانو دارایی یەی لە خانەی ساماندا هەیە هی ئیمامەو بە ئارەزووی خۆی‌و بێ‌لێپرسینەوەو چاودێری کاری تێدا دەکا، تاوای لێ هات دارایی و سامانی تایبەتی

(١) المعرفة والتاريخ ١/٥٩٩ و تاريخ الذهبي ٥/ ١٩٧ بە ئیسنادێکی سەحیح.

ئیمام تێکەڵ کرا بەدارایی‌و سامانی گشتی ئوممەت، بە ئارەزووی خۆی لێیان دەبەخشێ‌و بەویستی خۆیشی ئەوەی بیەوێ بێبەشی دەکا.

مەنسوری عەبباسی لە وتارێکیدا کە بۆ خەڵکی دەدا وتی: (ئـەی خەڵکینە، من بریتیم لە دەسەڵاتی خوا لەسـەر زەمینـەی ئـەودا، بـە پـێی یارمـەتی‌و ویـستی ئـەو دابەشـی دەکـەم‌و بـە مۆڵـەتی ئـەو دەیبەخشم، خوای گەورە منی کردووە بە کلیلی سەر دەرگاکەی، ئەگەر ویستی دەمکاتەوەو ئەگەر ویستی دام دەخا). [1]

ئەوەش مەودای ئـەو لادانـە ڕوون دەکاتـەوە کـە بەسـەر چـەمکی جێنشینایەتی‌و چەمکی مافی ئوممـەت لـە خانـەی سـاماندا هـات، ئەوەبوو دەسەڵات بوو بە سێبەری خوا لە زەوی دا پاش ئەوەی نوێنـەرو جێگری ئوممەت بوو، وە سـامانیش بـوو بـە سـامان‌و دارایـی خـواو خەلیفە بە ویستی خۆی چی بیەوێ دەیکا، پاش ئـەوەی ئەمـە مـافی ئوممەت بوو ؟!!

---

(١) البداية والنهاية ١٢٥/١٠.

## ٤- پاشەکشێی ڕۆڵی ئوممەت لە ڕووبەڕووبونەوەی ستەمو لاداندا

ئەم قۆناغی دووەمە پاشەکشەیەکی ترسناكو گەورەی بەخۆوە بینی سەبارەت بە ڕۆڵـی ئومـەت لـە ڕەخنـەکردنی لادانـەکانی دەسـەڵاتو هەڵسەنگاندنی، بە تایبەت لە چـەرخی عەبباسـی دا، سـەرەتای ئـەم قۆناغە بزوتنەوەی حوسەینی کوڕی عەلیو خەڵکی عێراقو بزوتنەوەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو خـەڵکی مەککـەو بزوتنـەوەی عەبـدوڵڵای کوڕی غەسیلو خەڵکی مەدینەی بەخۆوە بینـی، هـەروەها سـەردەمی ئومەوی بزاوتـە نـارەزایی خـوازە سیاسـی یـەکانی دژ بـە سیاسـەتی خەلیفەکانو لادانەکانیانی بەخۆوە بینی، کە لەوانەیە کاریگـەرترینو مەترسـی دارترینیـان بزوتنـەوەی قورئـان خوێنـان بوبـێ لەگـەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئەشعەسدا لە عێراقو دژ بە حەجاجو عەبدولمەلیکی کـوڕی مـەڕوان لـە سـاڵی (٨١)ی کۆچـی، ئـەوەبوو بەیعـەتی عەبدولمەلیکیان لە خۆیان داماڵیو بەیعەتیان دا بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەشعەس لەسـەر کیتـابو سـونەو لابردنـی ئیمامـە گومڕاکـان.[١] عەبدوڵڵای کوڕی ئەشعەس توانی زاڵ بێت بەسەر ناوچـەی فارسـداو، پاشان بە سوپاکەیەوە دابەزی یە عێراقو حەجاجی تێك شکاندو پاشان حەجاج بەسەری بەجێهێشت، کاتێکیش عەبدوڵڵای کـوڕی ئەشـعەس

---

(١) ابن جـرير (٣/ ٦٢٢ ٦٢٤).

چـــووه ناویـــەوه هـــەموو خەڵکەکـــەی بـــەزانایانو ســـەرکردەکانیەوه بەیعەتیان پێ‌ی‌دا لەسـەر لابردنـی حـەجاجو عەبدولمـەلیکی کـوڕی مـەڕوان.[1]

قورئان خوێنانیش کەبریتی بوون لە زانایانی هەردوو شاری -کوفەو بەسرە- هەمویان کۆبونەوه لەگەڵ جەنگاوەراندا بۆ کوشتاری حـەجاج، ئەوکاتە سەدهەزار کەس بوون.

عەبدولمەلیکی کـوڕی مـەڕوانیش کۆبویـەوه لەگـەڵ ڕاوێـژکارانو ســـەرکردەکانی خەڵکی شام داو ئەوانیش پێیان ووت: (ئەگەر تـەنها بە لابردنی حەجاج خەڵکـــی عێـراق ڕازی دەبـن، ئـەوا لابردنـــی حەجاج ئاسانترە لە جەنگ کردن لەگەڵ خـەڵکی عێـراق دا، لاییـەرە گوێڕایەڵی تەواوت بۆ دەکـەنو خـوێنی ئێمـەو ئـەوانیش دەپـارێزی، بابەخشینو ڕزقو ڕۆزیـشیان بەسـەردا دابـەش بکـرێ هـەروەك چـۆن دەدرێت بە خەڵکی شام).[2]

بەڵام خەڵکی عێراق ئەم پێشنیارەیان پەسەند نەکرد، لەوکاتەش دا لـە پێـشەوا فەقیهـەکانیش کەسـانی وەك ئەنەسـی کـوڕی مالـكو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عامری شەعبیو ئەبو ئیسحاقی سـوبەیعیو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلاو ئـەبو بوختـەری تـائیو عەبـدوڵڵای کوڕی شەدادی کوڕی هادو حەسەنی بەصریو موسلمی کوڕی یەسـارو

(١) ابن جرير ٦٢٥/٣

(٢) ابن جرير ٣/ ٦٣٠ وابن كثير ٤٣/٩.

نەزرى كورِى ئەنەسى كورِى مالكو ئەبوعوبەيدەى كورِى عەبـدوڵلاى كورِى مەسعودو تەڵحەى كورِى مەسرەفى يەمامىو زوبەيـدى كـورِى يەمامىو موحەمەدى كورِى سەعدى كـورِى ئـەبووەقاصو چـەندانى تريان لەگەڵ بوون لە زانايانى هەردوو شار.(١)

ئەوەبوو ئەوانو حەجاجو سوپاكەى هەشتاويەكجار بەيەك گەيـشتنو بەيەكياندادا، سەركەوتنيش ياوەرى ئەوان بوو، تادوا رِووداو كە بريتى بوو لە رِۆژى (دير الجماجم ى ساڵى ٨٣ ك)، لەو جەنگەدا فەقيهـەكان وتاريان بۆ خەڵكى داو هانيان دەدان بۆجەنگان، عەبدورِەحمانى كـورِى ئەبولەيلا هەستاو ووتى: (ئەى كۆمەڵى قورئان خوێنان، رِاكـردن لـە هيچ كەسێ ناشرين نيە بەورِادەيەى لە ئێوە ناشرينە، من گوێبيـستى عەلى بووم — خوا پلەى لەنێو پياوچاكاندا بەرزكاتەوەو باشـترين پلـەو پاداشتى شەهيدانو رِاستگۆيانى پێبەخشێ — لەورِۆژەى رِووبـەرِووى خەڵكى شام بوينەوە دەيفـەرموو: ئـەى بـاوەرِدارن، هەركەسـێ بينـى دەستدرێژى يەك هەيەو كارى پێدەكرێو خراپەيەك هەيە بانگەشەى بۆ دەكرێو بەدڵ بێزارى لـێدەربرِى ئـەوە سـەلامەتو سـاغو دەرچـووە، هەركەسـەش بـە زمـان ئينكـارى كـرد ئـەوە پاداشـتى هەيـەو لـە هاوەڵەكەى ترى باشترە، هەركەسەش بە شمشێر ئينكارى كرد بۆ ئەوەى ووشەى خودا بەرز رِابگيرێو ووشەى ستەمكاران لە ژێـرەوە بـێ، ئـەوە

(١) سەيرى تاريخ خليفه بن خياط بكه ل ٢٨٦ – ٢٨٧ و ابن جرير ٦٣١/٣

کەسێکە ڕێی ڕێنمونیی پێکاوەو ڕوناکی دڵنیـــایی‌و ئـارامیی لــەدڵی دایە، دەی لەگەڵ ئەمانەدا بجەنگێن کە چەند کاریان بۆخۆیـان حـەڵاڵ کــردووەو بیدعەچـــی خراپـــە داهێنـــەرن، نـــەزانن‌و نائاشـــنان بـــەڕەواو دەستدرێژی دەکەن‌و ئینکاری ناکەن.

وە ئەبولبەختەریش فەرمووی: (ئەی خەڵکینـــە، لــە پێنـــاوی دیـن‌و دونیاتانـــا بجـــەنگێن، بـــەخوا ئەگـــەر بەســـەرتانا زاڵ بـــن ئایینەکـــەتان لـــێ‌تێك دەدەن‌و دەســـت بەســـەر دونیاکەشـــتانا دەگـــرن)، شـــەعبیش فەرمووی: (ئەی ئەهلی ئیسلام، بیانکوژن، دڵ لەدڵ مەدەن‌و نارەحەت مەبن لە کوشتاریاندا، بەخوا نەمزانیوە لەسەر پانایی ئـەم زەوی یـەدا کەسانێك هەبن وەك ئەمانە کاراتربن لە ستەمداو ســتەمکارتربن لــە فەرمان ڕەوایی دا، با بەمانە دەست پێ‌بکرێ‌و لێردوە بناسرێن).

سەعیدی کوڕی جوبەیریش فـــەرمووی: (بجـــەنگێن لەگـــەڵیان‌و بـــە دڵنیایی یەوە شەڕیان لەگەڵدا بکەن، گوناهیان لەملی من، بیانکوژن لەســـەر ئـــەو زۆرداری یـــەی لـــە فـــەرمان ڕەوایـــی دا هـــەیانبووەو ئـــەو زۆرداریيـــەی بەرامبـــەر بـــە دیـــن کردویانـــەو سەرشـــۆڕی یـــەی بەســـەر هەژاراندا هێناویانەو ئەو مراندنی نوێژەی کردویانە بەخوو).[1]

(۱) ابن جریر (۶۳۵/۳) و ابن کثیر (٤٢/٩).

لـەم ووتـارانـەوە زۆر بـە ئاشـكرايى هــۆكارو پاڵنەرەكانـــى دەرچونو ڕاپەڕینمان بۆ ئاشكرا دەبێت، كە بریتین لە: -

- زۆرداری لەفەرمان ڕەوایی‌و ستەمكاری لە دابەش كردندا.
- خۆبەگەورەزانی‌و سەپاندن‌و چەوساندنەوەی لاوازو بێدەسەلاتان.
- بەرگری كردن لە ئایین‌و پاراستنی لەگۆڕان‌و تێكدان.
- بـەرگری كـردن لـە دونیـاو ژیـانی خـەڵكی‌و پاراسـتنی لـەوەی گاڵتەجاڕی‌و خراپەكاری پێبكرێ.

ئەحمەدی كوڕی حەنبەل فەرموویەتی: (ئەبوبەكری كوڕی عـەییاش هـەواڵی پـێ دایـن‌و فـەرمووی: زانایـان دەفـەرموون: هـیچ كەسـێ ڕانەپـەڕیوەو دەرنەچـووە باشـتربێ لەوانــەی (الجمــاجم) و (الحـرّة)[1] ئەوانیش بریتی بوون لەو زانایانەی لە مەدینەدا دژ بەیەزیـد ڕاپـەڕین لە ڕۆژی (الحرّە) لە ساڵی (٦١) ك و ئەو قورئان خوێنانەی لە عـیراق داو لە ساڵی (٨١) ك دژ بە عەبدولمەلیك ڕاپـەڕین، ئـەو شكـستەش كاریگەری یەكی گەورەی هەبوو لەسەر فكـری سیاسـی‌و عەقائیـدی، ئـەوەبوو لـە لایەكـەوە گوتـەزای (الإرجـاء)و (الجـبر) پـەرەی سـەندو بلاوبووە، لە لایەكی ترەوە واجبی گوێڕایەڵی‌و ملكەچـی بـۆ ئیمـامی ستەمكاری كەوتەوە، با وەكو حەجاجیش بێت، چونكە وەها بلاوبویـەوە خوا خۆی زاڵ‌و سەردەستی كـردوون‌و ئـەم بەڵایـەش تـەنها بـە دوعـا

---

[1] العلل ی ئەحمەد گێڕانەوەكەی عەبدوڵلا (٣/١٦٨).

لادەچێ، بەڵاکەش بریتیــە لــەو (قــضاء)ەی پێویــستە ملکەچــی بــۆ دەرببڕدرێ و ئارامی لەسەر بگیرێ؟!!!

حەسەنی بەسری – بــەر بــەزەیی خــوا بکــەوێ - بــانگخوازی ئــەم فیکرەیە بوو- پێی ووترا: ئایا دەرناچی بیگۆڕی؟ ئــەویش دەیفــەرموو: لەراستیدا خوا ئەمە بە گەڕانەوەو تەوبە دەگۆڕێ نەك بە شمشێر[1]؟!!

پێدەچێ ئەم بۆچونەشی -وەك دەردەکەوێ- پاش ئەو شکستە بــوو، چونکە پێشتر بیروڕای وابوو کــە دەبــێ دژ بــە پێــشەوایانی ســتەمکار دەرچی هەروەك یونس لەبارەیەوە وتویەتی: -بەخوا- حەسەن لە ئاژاوەو خوێنرێژی یەکاندا یەکێك بوو لە زانا سەرکردەکان.[2]

پرسیاری لــێکرا سەبارەت بە جەنگکردن لەگــەڵ ئــەو حەجاجــەی خوێنی حەرامی ڕشتووەو بــە حــەرام ســامانی دەســتکەوتوە؟ ئــەویش ووتی: (بیروڕام وایە جەنگی لەگەڵ نەکەن، چونکە ئەگــەر ئــەو ســزاو تۆڵەیەك بێت لەلایەن خواوە ئەوا ئێوە ناتوانـــــن سزاو تۆڵەی خــوا بە شـــیرەکانتان بگێڕنەوە، ئەگــەریش بەڵایەك بێت ئەوا ئارام بگرن تا خــوا بڕیــارو حــوکمی خــۆی دەدا، چــونکە خــوای گــەورە باشــترین بڕیاردەرێکە).[3]

---

(١) ابن سعد لە الطبقات دا ١٢٧/٧.

(٢) ابـن سـعد ١٢٠/٧ بەئیـسنادێکی (صـحیح) بـە پـێی مـەرجی بـو خـاریو موسـلم، گێڕانـەوەکان جیاوازیـان تێدایـە سـەبارەت بـە دەرچوونی لەگـەڵ عەبدوڵڵای کـوڕی ئەشعەس دا.

(٣) ابن سعد ١٢٠/٧ بەئیسنادێکی صحیح.

بە سەعیدی کوڕی ئەبوحەسەنی بـرای – کـە لەگـەڵ عەبـدوڵڵای کوڕی ئەشعەس دا خەڵکی هان دەدا دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە بەخوا خوای گەورە وەك سزایەك حەجاجی بەسەرتانا زاڵ کـردووە، بـە شمـشێر ڕێگری لە سزای خوا مەکەن، بەڵکو ئارام بن‌و لە خوا بلاڵێنـەوە)،[1] وە دەیفـــەرموو: (ئەگـــەر خـــەڵکی لەکاتێکـــدا لەلایـــەن دەسەلأتدارەکانیانەوە تاقی دەکرێنەوە خۆیـان ڕابگرتایـە ئـەوا زۆر بـە زوویی ڕزگاریان دەبوو، بەلأم پەنا بۆ شمشێر دەبەن، ئیتر دەدرێنە دەست ئەوان، بەخوا ڕۆژێکی چاکیان تووش نایەت).[2]

لەگەڵ ئەوەشدا دیدو بۆچونی لەگەڵ بەرگری سلبیانە دابوو بـەوەی هاوشـانی دەســەلأتداری زۆردار دەرنەچـیت‌و خـۆتیش بپـاریزی لـە پشتگیری کردنی لەکاتی ڕودانی ئاژاوەگێڕی (الفتنە)دا،[3] پێی وتـرا: بۆ ناچیتە لای میرەکان‌و فەرمانیان پێ‌بکەی بە چـاکەو نـەهی خراپـە کردنیان لێ بکەی؟ ئـەویش فـەرمووی: (مـسوڵمان بـۆی نیـە خـۆی سەرشۆڕ کا، شمشێرەکانیان پێش زمـانی ئێمـە دەکـەوێ)،[4] لـەپاش شکست ئەم بۆچونە سیاسی یـە فکریانـە دەنگـۆی خـۆی هـەبوو لـە دەرونی خەڵکی بەسرەداو بلأویش دەبویەوە لەبەرئەوەی حەســەن خـۆی

---

(١) ابن سعد ١٢١/٧ بە ئیسنادێکی صحیح.

(٢) ابن سعد ١٢٠/٧ بە ئیسنادێکی صحیح.

(٣) ابن سعد ١٢٠/٧ بە ئیسنادێکی صحیح.

(٤) ابن سعد ١٢٠/٧ بە ئیسنادێکی حەسەن.

لەوێبوو، بانگخوازی ئەم جۆرە بیروبۆچـونە بـوو، کەچـی دەنگۆیـەکی گەورەی نەبوو لەنێو زانایانی کوفەدا، ئەوانەی لەگەڵ ئەوەدا بوون کـە دژ بە پـێشەوایانی زۆردار ڕاپەڕنو دەرچـنو هـەر ئەمـەش بۆچـوونو مەزهەبی ئەوان بوو.

ئەم شکستە شوێنەوارو کاریگەری دەرونیو فیکری هەبوو، چـونکە زۆرێك لە زانایانی هەردوو شاری بەسرەو کوفە لەسەر دەستی حەجاجی زۆردارو ستەمکاردا لەناوچوون، ئەمەش هیچ ڕاڤـەو لێکدانەوەیـەکی لای زۆربەی خەڵکی نەبوو ئەوەنەبێ کە ئەمە سزایەکە لەلایەن خواوە، وە ئەمە ویستی خوایەو پێویستە ڕێی لـێ نەگیرێ یا بەرگری نەکرێ، بـەڵکو ملکـەچ بیـتو ڕازی بیـت پێـی، ئاوڕیـان نەدایـەوە لـەوەی هۆکارگــەلی ســەرکەوتنی ئــەمان زۆر لەدوایــە، بــەهۆی خراپــی نەخشەکێـشانیەوە، وە بــەهۆی توانــا ســەربازی یــەکانی حەجاجــەوە، هەربۆیە قەتادە وتویەتی: (ئیــرجـاء لــە دوای شکـستی عەبـدوڵڵای کوڕی ئەشعەسەوە داهێنرا) واتــە لــە دوای ئـەو ڕووداوە بەدەرکـەوتو بڵاوبویەوە، وە شافعیش دەفەرموێت: (ئیــرجاء لەدوای شکستی قورئان خوێنەکان بەدەرکەوت)، هــەروەها زوهــدو تەســووفو کــەنارگیری لــە ژیانو کاروبارەکانی - لەوانەش کاروبارە سیاسی یەکان - لەپاش ئەمە بڵاوبویــەوەو تەشــەنەی کــرد لــە دوای ئــەوەی قورئــان خــوێنو خواپەرستەکان سەرکردایەتی بزوتنەوەی بەرگری دژە لادانیـان دەکـرد، وای لـێ هات بەسرە بووە بەناوبانگترین بنکەی بزوتنـەوەی تەسـەوفو

کەنارگیری لەکاروبارەکانی دەوڵەت).[1]

بەردەوام فەقیهەکان بەرهەڵستی لادانەکانی دەسەڵاتیان دەکردو ڕووبەڕووی دەبونەوە، حەجاج (إبراهیم تیمی) سجن کرد لەبەرئەوەی هانی ئەوانەی ئەدا کە لەگەڵی بوون بەوەی ئارامبگرنو موژدەی ڕزگاربوونو لاچونی ناخۆشیو نارەحەتی پێدەدان، هەر بۆیە لە سجنی حەجاج دا بە ئارامگریو خواپەرستی کۆچی دوایی کرد.[2]

سەعیدی کوڕی جوبەیریش بەردەوام لە مەککەدا خۆی پەنهان کردبوو لە دەستی حەجاج هەڵهاتبوو، چووە لای زوهری کە لەگەڵ ئەمیری مەدینە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا بۆ حەج هاتبوو، لە زوهری پرسی: ئایا دەترسی هاوڕێکەت بەم دیدارە بزانێت؟ زوهری ووتی: نا بەڵکو دڵنیاو ئارام بە،[3] ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو سۆزداری یەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەیبوو لەگەڵ سەرکردەی نەیارە سیاسی یەکان دا.

عومەر لە یەکەم ووتاری دا پاش جێنشینایەتی ئاماژەی بۆئەم مەسەلەیە کرد، ئەوەبوو فەرمووی: (لەراستیدا ئەو پیاوەی لە پێشەوای ستەمکاران هەڵهاتووە ستەمکار نیە، ئاگاداربن کە پێشەوای ستەمکار خۆی گوناهبارو تاوانکارە، ئاگاداربن

(١) سەیری تاریخ الذهبي (٥/٢) بکە.
(٢) (العلل)ی ئەحمەد گێڕانەوەی عەبدوڵلا (١/ ١٣٧ - ١٣٨).
(٣) (العلل)ی ئەحمەد گێڕانەوەی عەبدوڵلا (١/ ١٨٦).

گوێڕایەڵیکـردنی خەڵکی نابێت لە بێفـــەرمانی و ســـــەرپێـچی خوا دابێت).[1]

ئەمـــەش دەگەڕایـــەوە بـــۆ زۆری نـــەیارانی دەســـەڵاتو ئەوانـــەی دەسەڵاتیان پێپەسەند نەبوو بەهۆی لادانو ستەمکارییەکانیەوە لـەو کاتەدا، حەجاج ئیبراهیمی نەخەعی - فەقیهی تابعین لە کوفـەدا -ی دەرکـرد بـە هـۆی ئـەوەی دژایـەتی دەسـەڵاتی دەکـرد،[2] ئیـبراهیم دەیفەرمـوو: (ئەوەندە کوێری بەسـە پیـاو خـۆی لـە ئاسـت کاروبـاری حەجاج دا کوێرو کەنەفت بکات،[3] ئەو وای دەبینـی دروستە نـەفرین لە حەجاج بکرێو جنێوی پێبدرێ.[4]

ئیبراهیمی تەیمی لەسەردەمی حەجاج دا داوای لە خەواریجەکان کرد بێنە ژێربەیداخی گوێڕایەڵی کردنـەوە، کەچـی ئیبراهیمـی نەخـەعی بەرهەڵستی ئەوکارەی لـــێ کـردو پێـی ووت: بـۆ لای کـێ بانگیـــان دەکەی؟ بۆ لای حەجاج[5]؟!

بەهەمان شـێوە سـەعیدی کـوڕی موسـەیـەبیش لـە مەدینـەدا بەنـــدکرا، لەبەرئـــەوەی ئامادەنـــەبوو بەیعـــەت بـــە وەلیـــدی کـــوڕی عەبدولمەلیك بـدات، لـە بەرامبـەردا ئەشـکەنجەو ئـازار دراوو بـەناو

---

(١) تاريخ ابن كثير ٩/٢٠٧.

(٢) ابن سعد ٦/٢٩١، العلل ی ئەحمەد ١/ ١٢٧ – ١٢٨.

(٣) ابن سعد ٦/٢٨٦ بەئیسنادێکی سەحیح.

(٤) ابن سعد ٦/٢٨٦ بەئیسنادێکی سەحیح.

(٥) ابن سعد ٦/٢٨٧ بەئیسنادێکی سەحیح.

خەڵکی دا دەیانسوڕاددوە.[1]

خالیدی کوڕی عەبدوڵڵای قەسری میری مەککە لە (٨٩ -١٠٦)ك لە سەردەمی بەنو ئومەییەدا چەندین شەرعناسـی مەککـەی گـرتو بەندی کرد، لەوانە: عطای کوڕی ئەبو ڕەباحو عـەمری کـوڕی دینـارو طەلقی کوڕی حەبیبو صوهەیبی مـەولای کـوڕی عـامرو سـەعیدی کوڕی جوبەیر.[2]

تەواوی ئەم ڕووداوانە تەئکید لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لە سەرەتای ئەم قۆناغەدا - فەقیهـەکان هەسـتاون بـە ڕووبەڕووبونـەوەی سـتەمو لوتکەی ئەم ڕوو بەڕووبونەودیەش لـە بزوتنـەوەی نهێنـی ئالوبەیتـدا خـۆی دەنوێنـێ کـە لـە هـەوڵی ڕوخانـدنو خـستنی دەوڵـەتی ئومەوییەکاندا بوو، ئەم بانگەشەیە بە نهێنیو لە سـاڵی (١٠٠)ك دا دەستی پێ کرد، کاتێك کە موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبـدوڵڵای کوڕی عەبباس نوێنەرەکانی نارد بۆ عێراقو خوراسان تاوەکو بانگەشە بکەن بۆ ئالوبەیتو خستنی ئومەییـەکان، لـە سـاڵی (١٠٣)ك لـە حەفتاکەس دوانزە نەقیبی هەڵبژارد[3]و نوسراوێکی بۆ نوسین کـە بـە پێی ئەو نەخشەیە هەنگاو بنێنو ناوەڕۆکەکەی جێبەجێبکەن.[4]

---

(١) سەیری پێشووتر لا (١٢٨) بکە.

(٢) العلل ی ئەحمەد گێڕانەوەی عەبدوڵڵا (٤٦٨/٢) و سیر أعلام النبلاء (٤٢٩/٥).

(٣) ابن جریر (٣٢٠/٤).

(٤) ابن جریر (٦٦/٤) و ابن کثیر (٩/ ١٩٧ – ١٩٨)، ئەمەش دەری دەخات کە کاری سیاسی لە ڕووی ڕێکخستنو نهێنیو کارکردن بە پێی نەخشەو بەرنامەی کاری ڕوون گەیشتبووە ئاستێك.

موحەممەدی کوڕی عەلی ویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بکاتە سەرمەشق لەوەدا کە بەیعەتی لە پشتیوانان وەرگرت لە عەقەبەداو لە عەقەبەی دوەمیش لەنێو حەفتا پیاودا دوانزە نەقیبی هەڵبژارد، وەك شوێن کەوتنێکیش بۆ سوننەت لە بانگەشەکەیدا پابەندبوو بە نهێنیی و پەنهانییەکەیەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ کاروباری ئەم بەیعەتدانەی بە نهێنی هێشتەوەو هیچ کەس پێی نەزانی.

بانگەشەو بانگەوازەکەش بەنهێنی مایەوە، تا ئەو کاتەی هەندێ لە بانگەشەکارانی لە خوراسان ساڵی (١١٧)ك دەستیان بەسەر داگیراو هەندێکیان کوژران‌و هەندێکیشیان بەند کران.[١]

لە ساڵی (١٢١)ك پێشەواو فەقیهی ئالوبەیت زەیدی کوڕی عەلی کوڕی (زین العابدین) کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە کوفەدا ڕاپەڕی، پاش ئەوەی خەڵکەکەی بەنهێنی بەیعەتیان پێ‌ی دابوو لەسەر لابردنی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك. ئەویش بەیعەتی پێدان لەسەر (کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، وەبەرگری کردن لەلانەوازو چەوساوەکان‌و بەشدانی بەش خوراوان‌و دابەشکردنی دەست کەوت لە نێوان خەڵکی دا وەکویەك‌و ڕەتدانەوەی ستەمکاران)،[٢]

---

(١) سەیری پێشوتر بکە.

(٢) ابن جریر(١٩٩/٤)، سەرنج دەدرێ لێرەدا بابەتی جێبەجێکردنی دادگەری کۆمەڵایەتی‌و دابەشکردنی سامان بە یەکسانی و ڕووبەڕووبونەوەی ستەم لە دیارترین ئەو بنەمایانەبوون کە بزوتنەوەکانی ڕاپەڕینی سیاسی ئەوکاتە جەختی لەسەر دەکردەوە.

زەید پاش چەند مانگێك لە بەیعـەت ڕاپـەڕیو لـە سـاڵی ١٢٢ك دا کوژراو یەحیای کوڕی هەڵهات بۆ خوراسان کـە لـەوێ بانگەوازەکـەی بڵاو ببویەوە.(١)

بانگەوازی نهێنی عەبباسی لە مەککـەدا دەرکـەوتبوو، وە تیایـدا بڵاوببویەوە، میـری مەکە ساڵی ١٢٤ ك کۆمەڵێکی بەندکرد، لەوانە عاصمی کوڕی یونسی عجلی بە تۆمەتی بانگەشەکردن بۆ نـەوەکانی عەبباس.

هەرلەم ماوەیەداو لە ساڵی ١٢٦ ك یەزیـدی کـوڕی عەبدولمـەلیك ڕاپەڕی دژ بە کوڕەمـامی خەلیفـە وەلیـدی کـوڕی یەزیـد بـە هـۆی خراپـەکاری و کـارە ناڕەواکانیـەوە، دواتـر کوشـتیو پـاش بەیعـەت ووتارێکی بۆ خەڵکی داو ووتـی: (ئـەی خەڵکینـە، بـەخودا مـن لـە پێناوی برسێتیو تێرنەخۆریو ناڕەزایی دونیاویستی دا دەرنەچـووم، وە مەبەستیشم حەزکردن نیـە لـە پادشـایەتی، شـانازیش بـە گـەورەیی نەفسی خۆمەوە ناکەمو من ستەمم لە نەفـسی خـۆم کـردووە ئەگـەر پەروەردگارم بەزەیی پێمدانەیەتەوە، بەڵکو دەرچوونم تووڕەبوون بووە لـە پێناوی خواو پێغەمبەرو ئاینەکەی، وەك بانگخوازێـك بـۆ لای خـواو کتێـبو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی ﷺ ، لـە کاتێکـدا مەشـخەڵو نیشانەکانی ڕێنمایی ڕوخێنرانو ڕوناکی خاوەن تەقواکان کوژێنرانەوەو

---

(١) ابن جرير ١٢١٩/٤.

ستەمکاری سەرکەش بەدەرکەوت، کەهەموو ڕێزو حورمەتو حەرامکرارێکی دروستو حەلاڵ کردبوو، لەگەڵ هەموو بیدعەتکارییەك دابوو، لەگەڵ ئەوەدا بەخوا کیتابی بەڕاست دانەدەناو باوەڕی بەڕۆژی لێپرسینەوە نەبوو، لە ڕاستیدا ئەو کوڕە مامم بوو لە حەسەبدا، لە نەسەبیشدا پشتو پەنام بوو، کاتێك ئەوانەم لێ بینی سەبارەت بە کاروباری ئەو ئیستیخارەم بەخوا کردو داوام لێکرد نەم داتەدەستی خۆم، بۆ هەمان شت هاوکارو پشتیوانانم بانگهێشت کرد کە بەدەممەوە هاتن، وە هەوڵم بۆی دا تاوای لێهات خوای گەورە بەهێزو دەسەڵاتی خۆی نەك هێزو دەسەڵاتی من، خەڵكو خاكو بەندەو ولاتانی لێ ڕزگارکرا.

ئەی خەڵکینە، لەڕاستیدا مافتانە لەسەرم کە بەردێك لەسەر بەردێكو خشتێك لەسەر خشتێك دانەنێمو هیچ ڕوبارێ جۆماڵ نەکەمو هیچ سامانێك زیاد نەکەمو نەیبەخشمە ژنو ڕۆڵەیەك، وە هیچ سامانێك لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر نەگوێزمەوە — تاوەکو کەمو کورتی یەکانی ئەم وولاتەو پێداویستی یە تایبەتی یەکانیان دابین نەکەم، تاڕادەی هاوکاریو پشتیوانی کردنیان، ئەگەر شتێك زیادبوو بیگوازمەوە بۆ ئەو وولاتانەی پاش ئەوەدێ، لەوانەی زۆر پێویستیان پێیەتی، بە کەلەبەرو قولەکاندا کۆتان ناکەمەوە بە شێوەیەك خۆتانو خاووخێزانتان تووشی ئاژاوەو فیتنە بکەم، دەرگام لەسەرتان داناخەم، تاوەکو بەهێزتان لاوازتان نەخواو سەرانە بە ڕادەیەك لەسەر ئەوانەتان

دانانیم کە ئەگەر سەرانەیان لــێ وەربگیــرێ ببێتە هۆی هەڵکەندنیان لە وڵاتەکەیانو بنــەبڕکردنی وەچەوســانەوەیان، پێبەخشینی هــەموو ســـاڵێکتانو ڕزقو ڕۆزی مانگانــەتان لەســـەرمە، تـــاوای لـــێ دێ گوزەرانی نێوان مسوڵمانان دەگوێزرێتەوەو خول دەخواو سەرو خواریـــان وەکویەکی لــێ دێ، ئەگەر ئەمەکداربووم بەرامبەر ئــەوەی ووتم، ئــەوا گوێڕایــەڵو ملکەچم بــنو بەباشــی پــشتگیرو هاوکــارم بــن، ئەگــەر ئەمەکداریش نەبوومو وەفــام پێنــەکرد ئــەوە بۆتــان هەیــە لامبــەرن، مەگەر داوای پەشیمان بونەوەم لێ بکەن، ئەگەر پەشیمان بوومەوە لێم پەسەند بکەن، ئەگەر زانیتان کەسێك هەیە بــە چــاکەخواز ناســراوەو هەمان ئەو شتانەتان پێدەبەخشێ لای خۆیەوە بەو شــێوەیەی کــە مــن پێتان دەبەخشمو ویستان بەیعەتی پێبــدەن، ئــەوا مــن یەکــەم کەسم بەیعەتی پێدەدەمو گوێڕایەڵی دەکەم.

ئـــەی خەڵکینــــە، لەڕاســــتدا گوێڕایــــەڵیکردنی خــــەڵکی لــــە بێفەرمانیکردنی خوادا ناکرێ، ئەمەکداریش لە شــکاندنی پــەیمان دا نابێ، گوێڕایەڵی تەنها گوێڕایەڵیکردنی خوایە، گوێڕایەڵی بکــەن تــا ئەوکاتەی گوێڕایەڵی خوادەکا، جــا ئەگــەر سەرپێــچی خــوای کــردوو بانگەشەی کرد بــۆ خراپــەکاری ئــەوە ئــەو شایــستەی ئــەوەدەبێ کــە بێفەرمانی بکرێو بکوژرێ، ئەم ووتانە دەڵێمو داوای لــێخۆشبوون لە

خوادەکەم بۆ خۆم‌و ئێوە).[1]

ئەو ڕوداوانە مـەودای ئەو لادانانە ئاشکرادەکا کەتووشی دەســەڵات هــاتبوو کەلەخەلیفــە وەلیــدی کــوڕی یەزیــدا خــۆی دەنوانــد ئــەو خەلیفەیەی کە تۆمـەتبار بوو بە زەندەقەو خراپــەو ســتەمکاری، ئــەم ووتارە چەندین بنەمـای لەخۆ گرتــووە ڕەنگدانــەوەی گوتــاری سیاســی ڕاشدییە، لەوانە سەلماندنی مـافی ئوممەت لەم کارەداو مـافی ئــەو لــە لابردنی ئیمام کاتێ لادان‌و خراپەکاری ئەنجام دەدا، وە مـافی ئەو لەوەی بەیعەت بدا بە کەسێ کە پێی ڕازییــەو دەیــەوێ، گوێڕایــەڵی کەســێ ناکرێ لە بێفەرمـانی‌و سەرپێچی خواداو گوێڕایەڵی خەڵکی ناکرێ لە بێفــەرمـانی خــوای گــەورەدا، ئــەم ووتــارە مــاف‌و بەشــی تاکــەکان دەچەسپێنێ لە خانەی ســـــاماندا لە پێبەخشینی ساڵانەوە بــۆ ڕزق‌و ڕۆزی دانی مـانگانە.

یەزیدی کــوڕی وەلیــد نوســراوێك دەنوســێ بــۆ خــەڵکی عێــراق‌و هۆکــاری دەرچــوون‌و کوشــتنی وەلیــدی تیــادا بــاس دەکــا، ئــەوەش لەبەرئەوەی گۆڕانی بەســەر نیــشانەو مـەشـخەڵەکانی ئــایین‌و یاســاو بەرنامەکانیدا هێنابوو، وە بە هــۆی ئــەو ســـــتەم‌و زۆرداریــــەی بــە ئاشکرا هەیبوو، وە چۆن باس لەوە دەکات ئەو سوپایەکی بۆ نــاردووەو داوای لـــێکردووە ئــەم کــارە بەڕاوێــژی نێــوان مــسوڵمانان بــێ، وە

---

(١) ابن جریر ٤/٢٥٥ – ٢٥٦

مسوڵمانان بڕواننە خۆیانو بزانن کێ باشەو ڕێك دەبن لەسەری، بۆ ئەوەی ئەم کارەی پێبسپێرن، وەلید ملەجیڕێی کردوو خۆی بە گەورە زانی، خوای گەورەش کلۆکۆی دامرکاندەوە، وە لە نوسراوەکەیدا باسی ئەوەی کردووە کە ئەو بە فەرمانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانداریان دەکاو شوێنی پێشینانی خۆی لە باشترینی خەلیفەکان دەکەوێ،[1] وە ئەوەشی کردۆتە مەرج کە هیچ کەسێ بەبێ هاودەنگی ئومەت نەکاتە جێنشین بەسەریانەوە.[2]

هەموو ئەو شتانەی کە یەزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك خستیەڕوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو تائەوکاتەش بەردەوام سەدای تایبەتی خۆی هەبووە لەنێو ژیانی سیاسی ئەو سەردەمەدا، وە بەردەوام ململانێ هەبووە لە نێوان هەردوو گوتاری دابەزێنراوو تەئویل کراو، بۆیە دەبینین هەر سێ خەلیفەی ئومەوی موعاویەی کوڕی یەزیدو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو یەزیدی کوڕی وەلید لەوانەبوون کە باوەڕیان هەبووە بە زەرورەتی گەڕانەوە بۆ کارکردن بە پێی بنەماکانی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو، وەکو گەڕاندنەوەی کاروبارەکان بۆ ڕاوێژی نێوان مسوڵمانان خۆیان، وە بەبێ ڕەزامەندیو ڕاوێژی ئەوان کەس نەکرێتە جێنشینو بەبێ ئەوان هیچ کارێك یەکلا نەکرێتەوەو سامانو دارایش

---

(١) ابن جرير ٢٥٥/٤ – ٢٥٦.

(٢) ابن جرير ٢٦٠/٤.

بە یەکسانی بەسەریاندا دابەش بکرێ.... هتد، بەڵام ئەم خەلیفانە زۆر بەخێرایی ناهێڵرێن و لەناودەبرێن؟!!

هەر لەم ساڵەدا کە ساڵی (١٢٦ ك)یـە، موحەممـە کـوڕی عـەلی دامەزرێنەری بانگەوازی نهێنیانەی عەبباسـی پـاش (٢٦) سـاڵ لـە کاری ژێرزەمینی وەك حیزبێکی سیاسی نەیار، کۆچی دوایی کرد، لـە شـوێنی ئـەو کوڕەکـەی ئیبراهیمـی کـوڕی موحەممـەدی ئیمامیـان هەڵبژارد، ئیبراهیمیش وەسیەت و ژیننامەی خۆی نارد بۆ ئەو نەقیبانەی لە خوراساندا شوێن کەوتەی بوون، ئەوانیش بە ئیمام پەسەندیان کردو نەفەقەیان بۆ نارد،[1] پاشان سـاڵی (١٢٧) ك هـاتن بـۆ مەککـەو چاویان کەوت بە ئیبراهیم و پێنج یەك (الخمس)یان پێ ی دا.[2]

لە ساڵی ١٢٧ ك لەکوفەدا عەبدوڵڵای کـوڕی موعاویـەی کـوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ڕاپـەڕی، پاشـان ڕووەو ڕەیی و ئەسـبەهان و ڕۆیشت و دەستی گـرت بەسـەریاندا، لـە سـاڵی (١٢٨) ك ئیبراهیمـی کـوڕی موحەممـەدا ئیمـام ئەبوموسـلیمی خوراسانی بـە نهێنـی وەك ئـەمیرێك نـاردە لای شـوێنکەوتوانی لـە خۆراساندا، وە فەرمانی پێدان گوێڕایەڵی و ملکەچی بکەن،[3] وە لە ساڵی (١٢٩ ك)دا ئیبراهیمی ئیمـام فـەرمانی دا بـە ئەبوموسـلمی

(١) ابن جریـر (٤/٢٧٠).
(٢) ابن جریر (٤/ ٢٩٠).
(٣) ابن جریر (٤/٣٠٠).

خوراسانی کە دەعوەی عەبباسی ئاشکرا بکا.[1]

ئیبراهیم لە مەککەو لەکاتی حەج دا بە نەقیبەکان دەگەیشت،[2] بـەردەوام نامـەی بـۆ دەنوسـین، کـاتێکیش نـاکۆکی کەوتـە نێـوان ئومەویەکانـەوە بارودۆخیـان ئـاڵۆزی تێکـەوت، فـەرمانی دا بـە شوێنکەوتوانی بانگەوازو گوێڕایـەڵییان بـۆ عەبباسـیەکان ئاشـکرا بکەن، ئەوەبوو ئەبوموسلم ساڵی (١٢٩ ك) لـە (مـەرو)ی خۆراسـان خـۆی ئاشـکراکردو لـە هـەموو لایەکـەوە خـەڵکی بـۆ لای هـاتن‌و بەیعـەتیان پـێی داو ئالآیـان هـەڵکردو بانگخوازانیـان لـە گـشت شوێنێکدا بلاوکردەوە.[3]

لەم ساڵەدا مەڕوانی کوڕی موحەممەد ئیبراهیمی گرت‌و لە دیمەشقدا بەندی کرد، پاش ئەوەی نامەیەکی وەڵامدانەوەی دۆزیەوە کە بۆ ئـەبو موسلمی ناردبوو[4]، لە ساڵی(١٣٠)ك ئەبو موسلیم‌و شوێنکەوتوانی دەستیان گرت بەسەر خۆراساندا‌و پاشان ڕووەو عێراق هاتن‌و لە ساڵی (١٣٢) ك زاڵ بوون بەسەر کوفەدا،[5] لەم ساڵەدا بەیعەتی خەلافەت درا بە ئەبو عەبباسی سەففاح عەبدوڵلای کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی

---

(١) ابن جریـر (٤/ ٣٠٥).

(٢) ابن جریر (٤/ ٣٠٦).

(٣) ابن جریر (٤/ ٣٠٧ ـ ٣١٠).

(٤) ابن جریر (٤/ ٣١٥).

(٥) ابن جریر (٤/ ٣٥٤ – ٣٥٥).

عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە مەدینەدا.[1]

ئەوان بانگەشەیان دەکرد بە ڕازی بوون بە کەسێك لـە ئالوبـەیت، ناوی کەسێکی دیاری کراویان نەدەبرد تا ئەوکاتـەی بەیعەتیانـدا بـە سەففاح،[2] کاتێك ئیبراهیمی ئیمام دەسـتگیرکرا بـە نهێنـی بۆپـاش خۆی کارەکـەی بـە سـەففاح سـپاردبوو، وە فـەرمانی دەرکردبـوو بـە شوێنکەوتووانی کەگوێڕایەڵیو ملکەچی بن، وە فـەرمانی پـێکردبوو کەسوکارو خێزانەکەی بهێنن بۆ کوفـە،[3] کاتێـك هـەواڵی ئـەوەیان پێگەیشت کە مـەڕوان ئیبراهیمـی لـە سـجندا کوشـتووە، بـەڕوونی بانگەوازیان بۆ سەففاحی برای ئاشـکرا کـرد،[4] هـەر لـەو سـاڵەدا بەیعەتی خەلیفایەتی پێدرا، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی عەلی مامی لە لای زابدا گەیشت بە مەڕوانی کوڕی موحەممـەدو سـەرکەوتن یـاوەری بوو،[5] مەڕوان بەرەو شـــــام هـەڵهاتو عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بە سـوپاکەیەوە شـوێنی کـەوت تـا ئەوەبوو شامی گرتو مـەڕوانی کوشـتو دەسـتی کـرد بـە کوشـتنی ئومەویەکان.[6]

---

(١) ابن جرير ٣٤٣/٤.

(٢) ابن جرير ٣٤٤/٤.

(٣) ابن جرير ٣٤٥/٤.

(٤) ابن جرير ٤/ ٣٤٨ – ٣٤٩.

(٥) ابن جرير ٣٥١/٤.

(٦) ابن جرير ٣٥٤/٤ – ٣٥٥.

بەم شێوەیە دەوڵەتی عەبباسی یەکان لەسەر داروپــەردوی دەوڵــەتی ئومەویەکان بەرپابوو، تاپوچیو بێسودی دیدو تێڕوانینەکەی حەسەنی بەسریو ئەوبانگەشەیەی بسەلمێنێ کەوای دەردەخست بەهێز نــاتوانرێ گۆڕان ئەنجام بدرێو پەشیمانی وتەوبــە تــەنها ڕێگەیەکــە بۆگــۆڕینی واقعو لابردنی ستەم، وە ئەوتێڕوانینەشـــی بەهەڵــە دەرچــێ کــەوای دەبینی هیچ گەلێك سەرکەوتوو نابــێ ئەگــەر لــە دژی ئیمامەکــەیان ڕاپەڕنو دەرچن.

لەراستیدا جیاوازی یەکی ڕوونو ئاشکراو مەودایەکی بەرینو فراوان هەبوو لــەنێوان ئــەو بزوتنەوانــەی گــۆڕان خــوازی ســەرپێیی بــوونو نەخشەو ئامانجیان دیاری کراو نەبوو – بەو شێوەیەی کوڕی ئەشعەسو قورئان خوێنانی هاوەڵی کردیان – وەلەنێوان بزاڤی عەبباسی یەکانــدا کە لە ساڵی (١٠٠ ك) دەستیان پێکردوو ماوەی سی ساڵ بــە نهێنــی کاریــان کــرد وەك پــارتێکی سیاســی ڕێکخــراوی نــەیار، کەچــەندین نەقیبو لقی هەبوو لەتەواوی هەرێمەکانداو بە درێژایی سی ســاڵ بــە نهێنی لە مەککەدا کۆڕیان گرێ دەداو ساڵی (١٣٢ ك) توانی بگاتــە ئامانجی خۆی.

لەراستیدا سەرکەوتنی ئەم بزوتنەوەیە ئاماژەیەکی بەئاگاهێنــەرێو بەتاڵ کەرەوەی تیۆرەکەی حەســەنی بەســری بــوو کــە بــرەوو مــوژدەی پێدەداو لە پێنــاوی ســەلماندنی دا چــەندەها ئایــەتو فــەرمودەی بــۆ تەئویل دەکرد.

لە کاتێکدا ئەگەر بیروبۆچونە سیاسی یەکانی ئەو بۆ ماوەیەك لـە بەســـرەدا دەنگدانـــەوەی هـــەبوبێ، ئـــەوا کوفـــەو مـەدینـــەو شـــارە ســـەرەکییەکانی تـــر لـــە ســـەرەتای ئـــەم قۆناغـــەوە دوور بوونـــە لـــە دەنگدانەوەی بیروبۆچـونەکانی، ئـەوەبوو زۆری نەخایانـد (ذو الـنفس الذکیة) موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵای کـوڕی حەســـەنی کـوڕی عــەلی ساڵی (١٤٥ ك) لە مەدینەدا ڕاپـەڕی‌و ئـەبو جەعفـەری مەنـسوری عەبباسی کرابو بە خەلیفە – پێـشتر بەنوهاشـم کـە ئەبوجەعفـەری مەنسوریشیان لەگەڵ بوو بـە نهێنـی لـە مەککـەدا پـێش کـەوتنی دەوڵەتی ئومەویەکان بەیعەتیان بە حەسەن دابوو،[1] ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەسەن برای (ذو النفـــس الذکیـــة)ش لـــە بەســرە ڕاپەڕی.[2]

خەڵکی مەدینەش داوای فەتوایان لە مالکی کوڕی ئەنەس کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ (ذو النفس الذکیة)دا دەرچن، ئەویش فـەتوای دروســتی ئەو کارەی بۆدان، چونکە بەیعەتـدانیان بـە ئەبوجەعفـەری مەنـسور لەژێر زۆرو ناچاریدا بووە، زۆر لـێ کـراویش بەیعـەتی لەسـەر نیـە، کاتێکیش فەتوای بۆدان خەڵکی چوون بۆلای موحەمـەد (ذو الـنفس الذکیة)و بەیعەتیان پێی داو لەگەڵیدا بونە هاوسەنگەری، لەبەر ئەم

(١) ابن جریـر (٤/ ٤٠٢) و ابن کثیـر (١٠/٥٨).
(٢) ابن جریر (٤/ ٤٢٢) و ابن کثیر (١٠/٩٣).

هۆیەش مالك سزادرا.[1]

لە فەقیهەکانی مەدینەش عەبدولعەزیزی دراوردیو ئەبوبەکری کوڕی ئەبوسەبرەو عەبدولحەمیدی کوڕی جەعفەر[2] و عەبدوڵڵای کوڕی هورمزو موحەممەدی کوڕی عەجلان دەرچوون،[3] لە فەقیهەکانی عیراقیش چەندین کەسی وەك عیسای کوڕی یونسو موعازی کوڕی موعازو ئیسحاقی کوڕی ئەزرەقو موعاویەی کوڕی هیشامو کۆمەڵێکی زۆر لە فەقیهە و زاناکان لەگەڵ ئیبراهیم دەرچوونو ڕاپەڕین،[4] سوفیانی سەوری و ئەبوحەنیفەش فەتوای دروستی دەرچونیان لەگەڵ ئیبراهیم دا، هەر بۆیە خەڵکی کوفە بەخێرایی چوون لەگەڵی.[5]

بەردەوام زاناو فەقیهەکانی ئوممەت لە سەرەتای سەدەی دووەمەوە ڕووبەڕووی لادانو خراپەکاری یەکانی دەسەڵات دەبوونەوە، هەیانبوو بانگەشەی دەرچوونی دەکرد لە دژیان، هەیان بووە لەگەڵ بەرگریکردنی سلبی دابووەو نەچووەتە ژێرباری هیچ کاروبارێکیانەوە، زۆرێك لە زانایان لەو ماوەیەدا قەزایان نەگرتۆتە دەست لەبەر هەمان هۆ، خەلیفەکانیش هەستیان بەوەدەکردو دەیانزانی.

---

(١) سەیری پێشتر بکە.

(٢) ابن جریر (٤/٤٥٢).

(٣) ابن جریر (٤٤٨:٤).

(٤) ابن جریر (٤/ ٤٦٨) و ابن کثیر (٩٨/١٠).

(٥) تاریخ بغداد (٢٩٧/١٣ - ٢٩٨).

(الثوري) بە یـەکێك لـەو هاوەڵانـەی کـە ئەبوجەعفـەر ئـەرکی (قضاء)ی پێسپاردبوو دەڵێ: (تیاچی! بەبێ چەقۆ سەریان بڕیت، چی دەکەی ئەگەر ڕۆژی دوایی وترا: ئەبوجەعفـەرو شـوێنکەوتوانی چـۆن بوون؟ وا تۆ کاریان بۆ ڕادەپەڕێنی؟).(١)

هەربۆیە کاتێك سوفیان دەچێتە لای مەنسور بە تونـدی لەگـەڵی هەڵسوکەوت دەکاو پێی دەڵێ: ڕقت لە ئێمەو بانگەوازەکەمانە، ڕقت لە نـەوەو خزمـانی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ؟ (الثـوري)ش وەڵامـی دەداتەوەو ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ﴾ تـا ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾.(٢)

زانایان بۆ کارنەکردنیان لەگـەڵ ئـەو خەلیفانـەدا ئـەم ئایەتـەی خوارەوەیان تەئویل دەکرد: ﴿وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ (هود: ١١٣) بیروڕایان وابو وەرگرتنی (قضاء) بۆیـان خۆخستنە پاڵو نزیکبونەوە لێیان، بەخشینی شەرعیەتە بە دەسەڵاتەکەیان، هەر بۆیە خەلیفەو ئەمیەکان زۆریان لەوانە ئازارو ئەشکەنجەدا کە قەزایان نەدەگرتە دەست، ئەوەبوو (ابـن هـبیرة) مـیری عـیراق لـە سـەردەمی ئومـەویەکاندا هەستا بە ئـازارو ئەشـکەنجەدانی ئەبوحەنیفـە، لەبـەر ئەوەی پەسەندی نەبوو ئەرکی قەزایان بۆ ڕاپەڕێنێ(٣)، هەروەك چۆن لە

(١) مقدمة الجرح والتعديل (١/١١٤).
(٢) مقدمة الجرح والتعديل (١/١١٤).
(٣) تأريخ بغداد (٣/٣٢٦ – ٣٢٧).

سەردەمی ئەبوجەعفەری مەنسور -خەلیفەی دووەمــی عەبباســی دا- تووشی هەمان ئازارو ئەشکەنجەدان هات.[1]

ئەبوجەعفەری مەنسور سوێندی خوارد کە ئەبێ ئەبوحەنیفە قەزای بۆ بگرێتەدەست، ئەبوحەنیفەش نەیکردو ووتــی: (بــۆ ئــەو شـــــوێنە ناشــێم، ئــەبو جەعفــــــەریش پــێی ووت: پــشت هەڵدەکــەی لـــە کاروبارمانو پێت باش نیە[2]؟!

هەموو ئەمانەش لەگەڵ ئــەوەدابوو کــە قــازی ســەربەخۆیی یــەکی تەواویشی هەبوو لە قەزادا، کەچی ئەبوحەنیفە بـیرورای وابــوو ئــەوان پێــشەوای زۆردارنو نابێــت بــچێتە نێــو کاروباریانــەوە بــۆ ئــەوەی شەرعیەت نەبەخـشێتە دەســەڵاتیان، هەرئەمــەش وای لــە خەلیفــەو میرەکــان کــرد زانایــان ناچــار بــە قــەزا بکــەن ئەگــەر بــە لێــدانو بەندکردنیش بووە بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەن بەدەسەڵاتیان.

ئەبوحەنیفە لە سجن دا مایەوە تا ئەوەبوو ساڵی (١٥٠ ك) تیایـدا مرد ،[3] هەروەها ئەوەش لەبەرئەوەبوو کــە لەگــەڵ ئیبراهیمــی کــوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەسەن دا بوو،[4] سوفیانی سەوریش نەدەچووە لای سوڵتانو دیدو بۆچونیشی لەگەڵ ئەوەدابوو کە نەچنە لایــانو کاریــان

(١) تأريخ بغداد ٣/ ٣٢٨ – ٣٢٩.

(٢) تأريخ بغداد ٣٢٨/١٣.

(٣) تأريخ بغداد ٣٢٨/١٣.

(٤) تأريخ بغداد ٣٢٩/١٣، سەیری الملل والنحل ی شهرستانی بکە ل ١٥٨.

بۆ نەکەن، ئەوەبوو داوایان لێ کرد قەزایان بۆ بکا بەڵام ئەو هەڵهاتو خۆی وون کرد لێیان، پاشتریش لەسەردەمی خۆحەشاردانیدا لە بەسرە کۆچی دوایی کرد.[1]

لە حەجو لەکاتی مینادا بردیانە لای مەنسورو پێی ووت: لە خوا بترسە، تۆبە هۆی شمشێری کۆچکەرو پشتیوانانەوە گەیشتوی بەم پلەوپایەو بەم شوێنە، کەچی لەولاوە نەوەو رۆڵەکانیان لە برسانا دەمرن، عومەر حەجی کردو تەنها بیستوپێنج دیناری سەرف کرد، وە دەچووە بن سێبەری دارەوە، تۆش سەروەتو سامانەکانی خانەی سامانت لە حەجەکەتدا سەرف کردووە، مەنسوریش پێی ووت: ئەتەوێ وەکو تۆبم؟! (الثوري)یش پێی ووت: نا، بەڵام کەمتر لەوەی تۆ تیایدای و لەسەرو ئەوەشەوە کە من تیایدام.[2]

وە بە مەهدی ووت: لەخوا بترسە، زەویت پڕکردوە لە ستەمو زۆرداری، لە خوا بترسە کوڕو نەوەکانی کۆچەرو پشتیوانان لەبەر دەرگان، مافەکانیان پێ بدە.[3]

(الثوري) بە نەنگی داناکە شورەیکی قازی چووەتەوە نێو قەزاوەو سەرکۆنەی کرد، ئەویش بیانوی هێنایەنەوە کە خەڵکی بێ قەزا

---

(١) سەیری طبقات ان سعد ٦/٣٥٠ – ٣٥١ و سیر اعلام النبلاء ٧/٢٦٦ – ٢٤٤ بکە.

(٢) الجرح والتعديل ١/١٠٦ وسير اعلام النبلاء ٧/٢٦٣.

(٣) سیر العلام، تاريخ بغداد ٩/٦٠ الأولياء ٦/٣٧٧ و سەیری الجرح والتعديل ١/١١ بکە.

کاروباریان ناڕوا، دەبێ قازیان هەبێ.

(الثوری)ش وەڵامی دایەوە ووتی: خەڵکی دەبێ پۆلیسیشیان هەبێ[1] وای چواندوە کە قەزاوەت کردن بۆیان وەك ئەوە وایە کاری پۆلیسیان بۆ ئەنجام بدەی.

مەنسور دەربارەی خۆی لێ پرسی کە من چۆنم؟ ئەویش پێی ووت خراپترین پیاوی.[2]

وە فەرموویەتی: ئەبو جەعفەر چی لە من دەوێ ؟ بەخودا ئەگەر لە بەردەمیدا بوەستم پێ ی دەڵێم: لە شوێنی خۆت هەستە کەسانی تر لە تۆ لە پێشترن بۆ ئەو شوێنە[3] سوفیان بە مەهدی ووت: بڕوانە عومەری کوڕی خەتاب ئەویش ووتی: عومەر هاوەڵی هەبوە.

سوفیان ووتی: دەی عومەری کوڕی عبدولعەزیز ووتی: ئەگەر نەتوانم.

سوفیان ووتی: دەی لە ماڵەکەتدا دانیشە.[4]

ئەمەش ئەوە تەئکید دەکاتەوە کە بانگەوازی سەلەفی چاکسازی خواز ئەوەی کە لەسەر بناغەی گەڕانەوە بۆ رەفتاری پێشین: هاوەڵان و خەلیفەکانی راشیدین بە تایبەتی ئەبوبەکرو عومەر بەرپا بووە لە

(١) حیلة الأولیاء ٤٧/٧

(٢) حیلة الأولیاء

(٣) الجرح والتعدیل ١١٣/١

(٤) حیله الأولیاء ٣٧٨/٦

سەرەتاوە بانگەوازێك بووە بـۆ چاكـسازی سیاسـی بـەوەی ئـەو كـارە بگەڕێتەوە بۆ راوێژی نێوان موسڵمانانو شوێنكەوتنی هەڵسو كەوتو سوننەتی هەریەكە لە ئەبوبەكرو عومـەر لـە سیاسـەتی شـەرعیدا، چونكە لەوكاتەدا لادانی عەقائیدی رووی نەدابوو، ئەو بانگەشەیە لە كۆتایی یـەكانی سـەردەمی هاوەڵانـدا دەسـتی پێكـرد پـاش ئـەوەی گۆڕانكاری هات بەسەر گوتاری سیاسیدا، پاشان بەردەوام زانایان لـە سەدەی دووەمدا داوایـان لـە خەلیفـەكان دەكـرد بگەڕێنـەوە ڕێـڕەوو ڕەفتاری ئەبوبەكرو عومەر هەروەك چۆن سوفیانی سـەوری داوای لـە مەهدی عەباسی كرد مەهدیش پێی ووت: (ببە هاوەڵم تـا بـە پێـی ژیاننامەی هەردوو عومەرەكە هەڵسوكەوت بكەم و هەنگاو بنێم)[١] كە سووربونی ئوممەت دەگەیەنێ لەسـەر گەڕانـەوە بـۆ سـەر ڕێبـازی هەریەك لەو دووانە لە گوتاری سیاسیدا.

عەبدولمەلیكی كوری مەروان گوێی لـێبوو هەندێ لـە هـاوەڵانی باسی ژیاننامەی عومەری كوڕی خەتاب دەكەن، ئەویش ووتی: (نەهی دەكەم لە باسكردنی عومەر چونكە تاڵ چێژی یە بۆ میرەكانو خـراپ كردنو تێكدانی خەڵكی یە).[٢]

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسـەر ئـەوەی بانگـەوازی چاكـسازیانەی پێشین لە بناغەدا بانگەشە بووە بۆ چاكـسازی سیاسـی هـەروەك لـە

---

(١) حیلـة الأولیاء (٦/٣٧٨).

(٢) البدایة و النهایة (٩/٧١)

هەردوو سەردەمی یەکەم‌و دووەمی کۆچیدا بینرا.

یەکێکی تر لـە زانـا نـەیارەکانی ئـەم ماوەیـە پێـشەوای شـارەزا موحەمەدی کوڕی ئەبو زیئبی قورەیشی مەدینەی یە (١٥٩ ك . ك)، کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە مالك باشتری دادەنا، لەبەر ئازایـەتی‌و ڕەوا خوازی و فەرمان کردنی بە چاکە.[1]

لەبارەیەوە دەیووت: بە سەعیدی کوڕی موسەییەب دەچـێ[2] واتـە لە ڕەوا خوازی و ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاریدا.

مەهدی کوری مەنسور حەجی کرد ڕۆیشتە مزگەوتی پێغەمبەرەوە، خەڵکی لەبەری هەستان، موحەمەدی کوڕی ئەبو زەیئـب هەڵنەسـا، پێی وترا: هەستە ئەوە میری باوەڕدارانە، وەڵامی دانەوە ووتی: خەڵکی تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانەکان هەڵدەسنەوە، مەهـدی ووتـی: وازی لـێ بهێنن هەرچی مووی سەرمە گرژ بووە.[3]

مەنسور حەجی کرد، لەو کاتەدا محمدی کوڕی ئەبو زیئب‌و مـالکی لە مەککەدا بانگ کرد، پرسیاری لەمحمدی کوڕی زیئب کرد سەبارەت بە حەسەنی کوڕی زەیدی کوڕی حەسەنی کوری فاتیمە؟

ئەویش پێی ووت: بەڕاستی وێڵی دادگـەری بـوو، ئـەبو جەعفـەر ووتی: ئەی چی بەمن دەڵێی؟ فـەرمووی: بـەخوای ئـەم خانەیـە تـۆ

(١) تأريخ بغداد (١٣/٣٢٨).

(٢) تأريخ بغداد (٢/٢٩٨).

(٣) تأريخ بغداد (٢/٢٩٨).

کەسێکی زۆردارو ستەمکاری.[1] وە بە مەنسوری ووت: خـەڵکی تیـا چوون، ئەگەر لەو دەستکەوتەی لاتـەو لـە دەسـتت دایـە هاوکاریـت بکردنایە؟ مەنسور پێی ووت: دادو هاوار بـۆت، ئەگـەر مـن قـەڵاو قوولەکانم توندو تۆڵ نەکردایەو سوپاو لەشکرم نەخستایەتە رێ، لـە ماڵەکەتدا دەهاتنە سەرت و سەرتیان دەبڕی.

موحەمەدی ئەبو زینب ووتی: پێشتریش قەڵاو قولەکان توندو تـۆڵ کران و سوپاو لەشکریش بەرێ خراو وولاّتان ئازادکراو خەڵکیش بەشی خۆیان پێدرا لە لایەن کەسێکی باشتر لە تۆوە.

مەنسور ووتی: ئەوە کێ بوو؟ هاوار لە دەستت!

ئەویش فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب.[2]

میری مەدینە عەبدولسەمەدی کوڕی عەلی - مـامی مەنـسور - پیاوێکی بەند کردبوو، لە گرتووخانەدا تەنگـەتاوی کردبـوو، کـەس و کارەکەی سکالاّیان بردە لای مەنسور، مەنسوریش نێردراوێکـی نـارد فەرمانیشیدا کۆمەڵێك لە زانایانی مەدینەش بەیاوەری خۆیان ببەن و بچنەلای پیاوەکە لە گرتوخانەکەداو شایەتی خۆیان تۆمار بکەن بـەو شـێوەیەی بینیویانـە[3]. کاتێـك عەبدولـسەمەد بەمـەی زانـی بارودۆخەکەی لـێ گوشاد فراوان کردو گرتوخانەی رێك کـردو پـاکی

(١) تأريخ بغداد (٢٩٨/٢).

(٢) تأريخ بغداد (٢٩٩/١٣).

(٣) ئەوە لیژنەیەکی پاراستنی مافی مرۆڤ بووە.

کــردەوە، زانایـــان مـــالیکی کـــوری ئەنـــەس و کـــوری ئـــەبو ســـوبرەو موحەمـەدی ئـــەبو زەیئـــب چـــونە لای، موحەمـــەدی ئـــەبو زەیئـــب بـــە نێردراوەکەی ووت: شاهێدی من مەنووسە، من خۆم دەینوسم، نووسی: گرتوخانەیەکی تەنگو باریکی توندم بینی و دەستی کرد بە نووسینی توندوتیژیەکانی گرتنەکە.[1]

کاتێ مـەنسور حەجی کرد موحەمەدی ئەبو زئـب باسـی سـتەمی عەبدولسەمەدی بۆی کرد، بــە مەنــسوریان ووت: موحەمـــەدی ئــەبو زیئب لە کەس رازی نیە، لە بارەی خۆتەوە لێی بپرسە، مەنسوریش لە بارەی خۆیەوە لێی پرسیو سوێندی لەسەر خوارد کە دەبێ پێی بڵــێ: موحەمەدی ئەبو زیئبیش ووتی: پەروەردگارم، بەخوا ئەوەی زانیبێــتم کەسێکی زۆردارە[2]!!!

ئەهلی قەدەر لە مەدینەدا پەنایان بــۆ دەبــرد لــە ترســی زۆرداری مەهدی کاتێ فەرمانی دابوو بــە لێـدانی ئـەهلی قـەدەرو دەربــەدەر کردنیان لە مەدینە.

ئەوانیش خۆیان لای ئـەو دەپاراســت و دەری نـەدەکردن، ســەردانی نەخۆشیانی دەکرد، بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە لەگەڵ ئەوەی بۆچـونیانی لە قەدەردا پێ پەسەند نەبوو، وە نەنگی لێ دەگرتن.[3]

---

(١) تأريخ بغداد ٢٩٩/١٣

(٢) تأريخ بغداد ٣٠٠/٢

(٣) تأريخ بغداد ٣٠٠/٢

پرسیاری هەریەکە لە مالیكو موحەمـــەدی ئـەبو زیئـب کـرا لــە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئەویش ووتی: کوڕی ئەبو زئیب لە دینـــی دا چاکترەو وەرعو خۆپارێزی زیاترەو لای دەسەڵاتداران حەقبێژ ترە، کـوڕی ئەبوزیئب چووە لای ئەبو جەعفەرو لێی نەترسـا لــەوەی حــەقو ڕەوای پێی بڵێو وتی: ستەم بڵاوە لەبەردەم دەرگاکەتداو ئەبوجەعفــەر هــەر ئەبو جەعفەرە[1]؟!!

هەروەها مـالیکیش پەسەندی نەبووە قەزا بگرێتەوە دەست لەســەر ئەوە بەندکرا، ساڵی(١٤٧) ك ئەشکەنجەدرا بە هۆی ئــەو بۆچــوونەی هــەیبوو ســەبارەت بــە بەیعــەتی زۆرلێکــراو، وە ســور بــوو لەســەر بۆچوونەکەی کە بەیعەتی زۆرو ناچاری پەسەند نیە.[2]

وە دەیفەرموو: (لەسەر هەمان ئەو شتە لێدرام کە سەعیدی کوری موسەیب و موحەمەدی کوری مونکەدرو رەبیعــە لێیــان درا، چــاکەو خێر لە کەسێکدا نیە لەسەر ئەو کارە ئازار نەدرێ) .[3]

وە ئەو هەرکاتێ پرسیاری لــێکرا بێ سەبارەت بە جـەنگ لەگـەڵ خەلیفەکاندا دژ بەوانەی لە فەرمانیان دەردەچـن، دەیفــەرموو ئەگــەر

(١) تـأريخ بغـداد (٣٠٢/٢) واتـای (ئـەبو جەعفـەر هـەر ئـەبو جەعفـەرە ) واتـە کاروبـارو زۆرداری ئەبو جەعفەر لای کەس شاراوە نیە، وەکێ دەتوانێ ئەمەی بە ئاشکرا پێ بڵێ؟ هەر بۆیە ئەحمەد ئەم هەڵوێستانەی کوڕی ئەبو زەیئبی لە لا گەورە بوو.

(٢) (العــلل) ی ئەحمــەد – رواية المروزي – ل (١٨٦).

(٣) تأريخ الذهبي (٣٣١/٩) واتە چاکەکە لە کەسێکدا نیە لە پێناو خوادا ئازار نەدرێ چونکە ئەمە میراتی پێغەمبەرانە

وەکو خەلیفە عومەر کوری عەبدولعەزیز بێت ئەوا لەگـەڵی بجەنگـە، ئەگەر وەکو ئەم ستەمکارانە بێت، ئەوا لەگەڵیان جـەنگ مەکـە،[1] مەنسور فەرمانی دا بە موحەمەدی کوڕی عمران مـیری مەککـە کـە سوفیانی سەوریو کوڕی جورەیجو عوببادەی کـوڕی کەسـیرو چـەندین فــەقیهی تــر بەنــدبکا لەوانــەی دژایــەتیو نــەیاری سیاســەتی ئەبوجەعفەری مەنسور دەکەن.[2]

ئەوزاعیش پەسەندی نەبوو لەدەوڵەتی عەبباسـی دا قـەزا بگرێتـە دەست و- ئەو لەوکەسانە بوو دیدو بۆچـونیان لەگـەڵ بـەرگریکردنی سلبی دابوو- عەبدوڵڵای کوڕی عەلی -مـامی سـەففاحو مەنـسور- پاش ئەوەی زاڵ بوو بەسەر شام داو ئەمەویـەکانی کوشـت لـە سـاڵی (١٣٢ ك) ئەوزاعی بانگ کرد، کە ئەوکات فەقیهو ئیمامی خـەڵکی شام بوو، کاتێ ئامادەی کۆڕەکەی بوو عەبدوڵڵای کوڕی عـەلی لــێی پرسی: چی دەڵێی سەبارەت بـەم دەرچـونەمان؟ ئایـا شـوێنو پێگـەو ڕەوتــی کارمــان تێکۆشــانە لـە پێنـاوی خـوادا؟ ئـەوزاعی ووتـی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (إنما الأعمـال بالنيـات....) بەمـە تورەیی عەبدوڵڵای کوڕی عەلی زیاتربوو، هەربۆیە ووتی: چـی دەڵێـی سەبارەت بەخوێنی ئومەویەکان؟ ئەوزاعی فـەرموی: پێغەمبـەر ﷺ فەرمویەتی: (لايحل دم إمرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث، النفس بـالنفس،

(١) سەیری تبصرة الحكام ٩٦/٢ بکە.

(٢) ابن جرير الطبري ٥١٥/٤ ساڵی ١٥٨.

وزنا بإحصان، وكفر بعد إيمان)

عەبدوڵڵا توڕەییەکەی زیاتربوو، پێی ووت: (سەبارەت بە خەلافەت هەواڵم بدەرێ، ئایا ڕاسپاردە (وصیە) نیەو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ ئێمە جێماوە، عەلیش لە (صفین)دا جەنگی لەسەری بەرپا نەکرد؟ ئەوزاعی وتی: ئەگەر ڕاسپاردە بوایە ڕێی نەدەدا کەس پێشی بکەوێ وە ڕازی نەدەبوو بەدوو داوەرەکە، ووتی: سەبارەت بە سەروەتو سامانی ئومەویەکان هەواڵم بدەرێ ئایا حەڵاڵ نیە بۆمان؟

ئەوزاعی فەرمووی: ئەگەر بۆ ئەوان حەڵاڵ بوبێت بۆ تۆ حەرامە، ئەگەر بۆ ئەوان حەرام بێت ئەوا بۆ ئێوە حەرامترە، لەمەوە عەبدوڵڵا فەرمانیدا دەری بکەن.[1]

زەهەبی مێژوونوس ووتویەتی: (عەبدوڵڵای کوڕی عەلی پادشایەکی زۆردارو خوێنرێژو زۆر بەتینو توانا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا پێشەوا ئەوزاعی تاڵاوی هەقی پێدەچەشت هەروەك دەبینی، نەك وەك کۆمەڵێك زانای خراپ، ئەوانەی ئەو ستەمو زۆرداریانەی میرەکان بە چاك نیشان دەدەنو بە هەڵەشەیی خۆی تێهەڵدەقورتێنن، پڕوپوچو نارەواکانیان بەڕەوا هەڵدەگێڕنەوە -خوا لەناویان ببات- یاخود بێدەنگ دەبن لەگەڵ ئەوەی توانای ڕوونکردنەوەی هەقو ڕەوایان

(١) العلل ی ئەحمەد – گێڕانەوەی المروزي ل ٢٨٨ – ٢٩٠ والجرح والتعديل ٢١١/١ – ٢١٢ و سير اعلام النبلاء ١٢٣/٧ – ١٢٥ لە چەند ڕێگەیەکی زۆرەوە بەسەرهاتەکە ڕاستو دروستە.

هـــــەیە).[1]

ئـەوزاعی سـاڵی (١٢٥ ك) نوسـراوێکی سـەبارەت بـە کاروبـاری خەڵکی مەککە نوسـی بـۆ خەلیفـەی مەهـدی: (پاشـان پیـاوێکی خەڵکی مەککـە نوسـراوێکی بـۆم هێنـاوە باسـی ئـەوگرانی و نـرخ بەرزییەی تێدادەکا کە خەڵکی تیایدا دەژین‌و ئەو کـەم درامەتییـەی تیایاندایـە لەوکاتـەوەی دەریایـان لـێگیراوەو گـەنمیان ووشـك بـوەو مـــەڕومالآتیان لـەڕولاواز بـووە، دوومـشت گـەنم بـە درهەمێکـەو دومشت‌ونیو گەنمەشامی بەدرهەمێکەو مشتێ زەیت بە درهەمێکـە، ڕۆژ بە ڕۆژیش گرانی یەکە زیاتر دەبێت، لەراستیدا ئەگەر خوای گەورە زوو دەرویەکیان لێ نەکاتـەوەو پـێش گەیـشتنی ئـەم نوسـراوەی مــن زۆربەیان یان هەندێکیان لەبرسا دەمرن، ئەو خەڵکە فەرمانبـەرداری میری باوەڕدارانن – خوا چاکسازی کا – و ئەو بەرپرسیارە، کەسێك کە گوێی زوهری بووە هەواڵی پێمدا کە دەیفەرموو: لەراستیدا عومـەری کوڕی خەتتاب لە ساڵی (الرمادە)دا – کەساڵێکی گرانـی‌و نـەداری بوو – پـاش ئـەوەی هــەوڵێکی زۆریـدا بـۆ هاریکـاریکردنی بیابـان نشینەکان بە ووشترو گەنم‌و زەیت لەسەرجەم لادێ نشینەکانەوە تاوەکو ووشك هەڵهاتبوو ئەوەندە ماندو ببـوو، هەسـتاو داوای لـە خـواکردو فــەرمووی: خوایـەگیان، ڕزق‌و ڕۆزیـان بخەبانەکانـەوە، خـوای گـەورە

---

(١) سیر اعلام النبلاء (١٢٥/٧) ئەوە لەسەردەمی زەهەبیدا بوو، چۆن دەبوو ئەگەر سەردەمی ئێمەی ببینیایە ؟!!!

پاڕانەوەکەی لە ئـەوو لـە مـسولْمانانی وەرگـرت، هـات بـە هانـای بەندەکانیەوە، عومەر فەرمووی: بەخوا ئەگەر خـوای گـەورە دەروازەی والاّ نەکردایە هەرمالێك کـە توانـاو بـواری هەبوایـە ژمارەیـەك لـە هەژارەکانم دەبردە سەریان، چونکە دووکـەس تیاناچـن ئەگـەر بەشـی یەکێکیان پێ‌بدرێ، پێمان گەیشتووە تەنها لە میسرەوە هەزار هـەزار ڕبە بارکراوەو نێردراوە بۆ عومەر.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتووە کە فەرمویەتی: ئایا نزیکـە واتـان لـێ بێـت کـە منداڵـەکانی خۆتـان بـە تێـری بهێنننـەوەو دراوسێکەشتان بە برسێتی لە تەنیشتانا ژیان بگوزەرێنێ؟ ئەگەر میر پێی باش بوو – خوا ئیسلاّحی کا – ئەوا باسووربێ لەسەرئەوەی داوا لـە مـیری بـاوەڕداران بکـا بـۆ بـەهاناوە هـاتنی خـەڵکی مەککـەو مسولْمانانی دەوروبەری لە دەشتاییو دەریاوە بەوەی خواردنو زەیتیـان بۆ بنێرێ، پێش ئەوەی هیچ کەسێکیان بە برسێتی تیابچێت –.

داودی کوڕی عەلی هەواڵی پێدام کـە عومـەری کـوڕی خـەتتاب فەرمویەتی: ئەگەر کاوڕێك لەکەناری فوراتدا ون ببێ گومـان دەبـەم خوای گەورە پرسیاریم لێ بکـا).[1] هـەروەها ئـەوزاعی نوسـراوێکی نووسی بۆ یەکێك لە میرەکان کە تیایدا ئەیترسێنێو نەهی لێ دەکات لەوەی ستەم لە مسولْمانان بکا یادەست درێژیان بکاتە سـەر یـاخود

---

(١) مقدمة الجرح والتعديل (١/ ١٩٢، ١٩٣).

بەرامبەر خراپەکاریەکانیان زیادە ڕەوی بکا لــە ســزادانیانا، هــەروەها ئەیترسێنێ‌و نەهی لێ دەکا لەوەی ستەم لە ئەهلی ذیمــە بکاو هــەواڵی پێدەدا کە ئەو کارانە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی لــە نێــوان خۆیانــدا ڕق‌و کینەیان بەرامبەری هــەبێ، وەکاتــێ هەنــدێ لــە ژیــرو هۆشــیارەکان بۆچونێکی وایان بۆ دروست بووە کە واز بهێنن لەوەی جیهادیان لەگەڵ بکەن هۆکارەکەی بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە.

ئەوزاعی ڕێگری کرد لە میری شام ســاڵحی کــوڕی عــەلی کــوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس -برای عەبدوڵڵای کوڕی عەلی- لەوکاتەی کە ویستی هەندێ لە نەسرانییەکانی شاخی لوبنــان ڕاگــوێزێ، پــاش ئەوەی هەندێ کەسیان مەیلیان دابــوو بــە لای ڕۆمەکانــەوەو تــەکبیرو پیلانگێڕیان سازدا، وە بۆی نوسی: (چۆن بــەهۆی گونــاهی تایبەتــەوە هەمویان تووش دەکەیی‌و تەڕو ووشك پێکەوە دەســوتێنی، تــا بگاتــە دەرکردنیان ووڵات‌و ماڵ‌و مندالّیان؟ کەچی خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ (الأنعام: ١٦٤) ئەمە ڕەواتــرە لــە ئاســتیا بوەســتی‌و بیکەیتە سەرمەشقی خۆت، وە ڕەواترین سپاردەو ئامۆژگارییەك ئەوەیە ئەو سپاردەو ئامۆژگارییەی پێغەمبەری خوا ﷺ لــەگوێ بگــری کــە فەرمویەتی: (من ظلم معاهداً أو كلفه فوق طاقته فأنا حجيجه...) (١) هەرکەسێ ستەم لە پەنادراوو پەیمان پێدراوێك بکات یاخود بەدەر لــە

(١) فتوح البلدان للبلاذري.

توانای خۆی تەکلیفی لێ بکات ئەوا من دەبمە ناکۆکو ناحەزی...

هەروەها بەرگری لە مافەکانی خەڵك دەکرد، داوای لە خەلیفـەکان ئەوەبوو کە بەویژدان بن لەگەڵیانو مافەکانیان بە باشی بدەن هەروەك لەو پەیامەیدا بۆ مەهدی هاتووە، ئەوەبوو تیایدا هـاتبوو: (ئـەمیری باوەڕداران —خوابیپارێزێ — بـۆ خـەڵکی کـەنار (الـساحل) هـەموو ساڵێك لە پێشەکی بەخشینەکانی خۆیان دە دیناری دانـاوە، ئـەمیری باوەڕداران —خوا ساڵحی کا— ئەگەر بڕوانێتە ئەوە ئەزانی ئەو دەدینارە بۆ خێزانێکی دەکەسی کەمتر یازیاتر، بەش ناکا..

ئەگەر ئەمیری باوەڕداران — خـوا بیپـارێزێ — پـێی بـاش بـو بـا فەرمان بکات بە ئەندازەی پێویست پێیان بدرێتو هەمو سـاڵێکیش ئەمەیان پێببەخشرێت، ڕێو شوێن وابووە کە بەردەوام دەیـەکیان بـۆ هاتووە، کەچی ئێستا بە شێوەیەکی ترەو پێداویستییەکانیان زۆر بووە، زیانەکانی دیاری داوە لێیـان، لەکاتێکـدا ئـەوان خـەڵكو ڕەعیـەتی ئەمیری باوەڕدارانو ئەو لێپرسراوە لێیـان، لەراسـتیدا ئـەو شـوانەو هەموو شوانێکش لێپرسراوە لە مێگەلەکەی، پێمـان گەیـشتووە کـە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لەڕاستی پێم خۆشە کاتێك دونیا بـەجێبهێڵم کـە کەسـێکتان داوای مافخوراوییـەکی خـۆیم لێ نـەکا سەبارەت بەخۆییو سامانو دارایی یەکەی.

خـــوای گـــەورە بەخشـــشەکانی خـــۆی بـــۆ ئـــەمیری بـــاوەڕداران بەجێبگەیەنێو لەگەڵ خەڵکەکەیدا سەر ڕاستی کا، نێردراوی ئەمیری

باوەڕداران بە بەخشینەکانیەوە هاتەلامان بەو نەفەقەو جلوبەرگەوە کە ئەمیری باوەڕداران — خوا لەش ساغی کا — فەرمانیدا بەسەر خەڵکی کەنار — الساحل — دا دابەش کرێ، ئێمەش دابەشمان کرد، بۆ هەر پیاوێك دینارێك، دوو دینار، سامانەکە بۆ هەتیوو بێوەژنەکان کەم بوو، هیچیان بەسەردا دابەش نەکرا، هەتیوو بێوەژنو هەژارەکان کە لە کیتابی خوادا سێ‌جۆر بەشیان هەیە، لە سەدەقاتو پێنج یەکی دەست کەوتەکان، وە لەو دەستکەوتو دەستهاتانەی خوای گەورە دەیداتە پێغەمبەرەکەیی‌و باوەڕدارانی خەڵکی شارو لادێکان، جا ئەگەر ئەمیری باوەڕداران — خوا ئیسلاحی کا — ڕای وابوو شتێکیان بۆ بنێرێ تا لە نێوانیاندا دابەش کرێ، با بیکات.

خوای گەورە ئەمیری باوەڕداران بچوێنێ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ لە دڵ نەرمی‌و بەزەیی هاتنەوەی بە باوەڕدارانداو بەخشش‌و لەش ساغی پێ ببەخشێ، والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) .[1]

زانایان پاشتریش بەردەوام بوون لە بەرهەڵستیکردنی لادانەکانی دەسەڵات، لە سەرەتای سەدەی سێ‌هەمەوە مەئمون ویستی بیروباوەڕی خۆی سەبارەت بە خەلقی قورئان ڕاگەیەنێ‌و خەڵکی بە زۆر بهێنێتە سەرئەو بۆچونە، بەڵام لە ترسی بەرهەڵستیکردنی یەزیدی کوڕی هارون کە شێخی ئیسلامی سەردەمی خۆی بوو جورئەتی نەکردو

[1] مقدمه الجرح والتعدیل ١/١٩٤ — ١٩٥.

نەیوێرا ئەوە بکات، وەدەیوت: ئەگەر پلەوپایەی یەزیدی کوڕی هــارون نەبوایە گوتەی خەلقی قورئانم ئاشــکرا ئــەکرد، پــێی ووتــرا: یەزیــد کێیــە ؟! تــاوا خــۆتی لێ بپــارێزی ؟! ووتــی: خــۆمی لێ ناپــارێزم لەبەرئەوەی دەسەڵاتی هەیە، بەڵام ئەترسم ئەگــەر ئــەوەم کــرد وەڵامــم بداتەوەو خەڵکی ناکۆکی تێبکەوێو ئاژاوە ڕووبدات.

پێی ووترا: کەسێك بنێرە تا هــەواڵو بۆچــونی ئــەوت بــۆ بهێنــێ، ئەویش پیاوێکی نارد ئەو هەواڵە بە یەزیدی کوڕی هــارون بگەیــەنێ، چوو بۆ کۆڕو مەجلیسەکەیو هەواڵەکەی پێدا، یەزیــد ووتــی: درۆت بەدەمی ئەمیری باوەڕدارانەوە کــردووە، ئــەمیری بــاوەڕداران شــتێ بــە خەڵکی ناکا کە نایزانن چیەو کەسیش پێشتر شتی وای نەووتووە.

یەزیدی کوڕی هارون ئەوەی ئاشکرا کردبوو کە ئەو بۆچونە کوفرە، لەگەڵ ئەوەی دەیزانی مەئمون بیروڕای وایە؟ مــەئمون ئــەو بۆچــونەی ڕانەگەیاند، دوای ئەوەنەبێ یەزیدی کوڕی هارون لە ســاڵی (٢٠٦ ك) مرد، کە ئەو لەو کەسانە دەژمێردرا کە بەردەوام فــەرمانیان بەچــاکە دەکردو بەرهەڵستی خراپەکاری بوون.[1]

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی قوتابیشی هەنگاوەکانی ئەوی هەڵگرت - ماوەیەکیش هۆگری بووەو لەگەڵیدا ژیاوە- کــاتێکیش ئــەو بیروبــاوەڕە ڕاگەیەنرا، ئەحمەد ڕووبەڕووی بویەوەو وەڵامی دایەوە، بەهۆی ئەوەشەوە

(١) تاریخ بغداد ٣٤٢/١٤ – ٣٤٦، السیری ذهبی ٣٦٢/٩ – ٣٦٤.

بەندکراو لێی دراو هەڕەشەی کوشــتنی لێکــرا، شمــشێری پێــشان درا، کەچی پەشیمان نەبووە لەوەی ئەو بۆچونە کوفرە، لێیان دەویست تەنها لەبەر خەڵکی و خۆپارێزی وەڵامیان بە ئەرێ بداتەوە، بــەڵام ئــەو ئــەم فەرموودەیەی بۆ بــاس دەکــردن: (إن مــن کــان قــبلکم ینــشر أحــدهم بالمنشار لایصده ذلك عن دینه) لەپێش ئێوەدا کەسانی واهەبوون کــە بە مشار لەت دەکرا بەڵام ئەوە وای لــێ نەکرد لە ئایینەکەی پاشگەز بێتەوە.

لە بەندینخانە ئازاد کــرا، هەڕەشــەیان لێ کــرد کــە نابــێ لەگــەڵ کەسدا کۆبێتەوە، وە نابێ لە بەغدا بمێنێتەوە، هەر بۆیە بــە پــەنهانی مــایەوە، وە دەیفەرموو پێغەمبەری خوا ﷺ ســێ ڕۆژ لــە ئەشــکەوتدا خۆی حەشاردا، گونجاو نیە لــە خۆشــییەکاندا شــوێنی ســوننەتەکانی پێغەمبــەری خــوا ﷺ بکــەوین و لــە ناخۆشــی و تەنگانــەدا وازی لــێ بهێنین، لە سەردەمی موعتەسەم و پاشان (واثق)یشدا بەوشــێوەیە مــایەوە تاوەکو (متوکل) هات و ئەو فتنەو ئاژاوەیەی هەڵگرت.

فەرموودەناسان و فەقیهەکان لە بەغدا کۆبونــەوە بــۆ لەکارخــستنی (واثق) لەبەرئەوەی دەیویــست لــە قوتابخانەکانــدا ئــەم بیروبــاوەڕە بــە منداڵان فێربکا، ئەحمەدیش فەرمانی پێدان ئارام بگرن و لێی ڕانەپەڕن.

پاشانیش لە تەواوی ئەوانە بوورا کە ئازاری دابــوون، وە نەیهێــشت (متوکل) ئەشکەنجەی موعتەزلە بدات، هەربۆیە دەیانوت: لەوکاتەی توانامــان هەبوو بەسەر ئەحمەددا ئازارو ئەشکەنجەمــاندا، کاتێکیش ئەو

توانای شکا بەسەرماندا لێمـــان بورا[1]؟!

ئەو دیدو بۆچونی وابوو ئەوانە هەرچەندە خـاوەنی ئـەو بیروبـاوەڕەن بەڵام مسوڵمانی تەئویلکارن، هەرچەندە ئەو بیروباوەڕە لەخودی خۆیدا کوفر بێت، لەبـەر پێـدا کێـشانو نـاکۆك بـوونی بەدەقـەکان، هـەر لەبەرئەوە نەیهێشت لە (واثق) ڕاپەڕن، بۆچونیشی وابوو گوێڕایەڵیان واجبەو پێویستە لە جیهادکردنـدا هاوکاریـان لەگـەڵ بکـرێ، هـۆی ڕەفزکردنی دەرچونیشی دەگەڕاندەوە بۆ ترسی ئاژاوەگێڕیو خوێن ڕشتنو لەدەستدانی مافەکانو ڕێگریو شکاندنی سنوری حەرام کراوەکان.

پێیان ووت: ئایا ئێمە لە فیتنەو ئاژاوە گێڕانین؟ فەرمووی: ئەمـە فیتنەو ئاژاوەیەکی تایبەتە، ئەگەر شـیر وەشـێندرا فیتنـەو ئاژاوەکـە هەموان دەگرێتەوەو ڕێو بانەکان دادەخرێن،[2] ئەم ڕوداوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەقیهەکانی بەغدای ئەهلی سونە دەرچوونو ڕاپەڕینیان پێباش بووە، ئەگەر ڕەفزکردنی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نەبوایە.

لەمبارەیەوە ئەحمەدی کوڕی نەسری خوزاعی –پێشەوای شەهید[3]– خۆی کۆکردەوەو ئامادەسازی کردو خەڵکی بەنهێنی بەیعـەتیان پێـدا لەسەر لەکارخستنو لابردنی (واثق)و فەرمانکردن بەچاکە لـە سـاڵی (٢٣١ )ك، بـەڵام زاڵ بـوون بەسـەریداو (واثـق) لـەبارەی خـەلقی

(١) سەیری بەسەرهاتی ئەم ڕوداوی میحنەیە لە کتێبی سیر أعلام النبلاء (١١/٢٣٢)بکە.
(٢) سیر أعلام النبلاء (١١/١٦٦) (ذهبي) مێژوو نوسیش بەو شێوەیە وەسفی کردووە.
(٣) سیر أعلام النبلاء (١١/ ١٦٨).

قورئانــەوە تــاقی کــردەوە، کەچــی ئــەو وەڵامــی نەدایــەوە، بەمــەش فەرمانیدا لــەخاچ بــدرێ، ئەحمــەدی کــوڕی حەنبــەلی – هــاوڕێی – لەبارەیەوە دەیفەرموو: (بەربەزەیی خوا بکەوێ، خۆی کردە قوربانی).[1]

زەهــەبیش لەبارەیــەوە فەرمویــەتی: ئەحمــەدی کــوڕی نەســر زۆر فەرمانی دەکرد بەچاکەو قسەی ڕەوای گەلێك زۆربوو،[2] (ابن کثیر)یش فەرمویەتی: (ئەو لــەو پێــشەوایانەی ســوننەبوو کــە زۆر فــەرمانیان بەچاکە دەکردو نەهیان لە خراپە دەکرد)، هەروەها فەرمویــەتی: (لــە گەورە زانا کاراکان بووە)، یەحیای کوڕی موعینیش دەیفەرموو: (خوا بە شاهەدەت کۆتایی بەژیانی هێنا).[3]

لەراستیدا بەرهەڵستیکردنی ئیمامی زۆردار لەو ســەردەمانەدا لــە بەناوبانگترین باس‌و خواسەکانی خەڵکی بووە، تەنانــەت ئــیبن‌و حــەزم بانگەشەی ئــەوەی دەکــرد کــە ئــەوە ڕێبــازی پێــشەوایانی مەزهەبــە بەناوبانگەکانی سەدەی دووهەم بووە، ئەوەتا وتویەتی: (تەواوی ئوممەت ڕێکن لەسەر واجبێتی فــەرمان دان بەچــاکەو نــەهی کــردن لەخراپــە بێئەوەی کەسێك ناکۆك بێت لەمەدا.... وەچــەند کۆمــەڵێکی ئــەهلی سوننەو تەواوی موعتەزیلەو خەوارج‌و زەیدییەکان لەگەڵ ئەوەن کەشیر هەڵکێشان لە فەرمان بەچاکەو نەهی کردن لە خەراپە واجبە، ئەگــەر

(١) سير اعلام البنلاء ١٦٦/١١

(٢) سير اعلام البنلاء ١٦٦/١١

(٣) البداية والنهاية ٣١٧/١٠ – ٣١٩.

نەکرا خراپەکە بەبێ ئەمە بەرهەڵستی‌و ڕێگری لێ بکرێ)

پاش ئەوەی باسی واجبێتی بەکارهێنانی هێز دەکـات بـۆ لابردنـی خراپە، لە خراپەیەکدا ئەگەر بەهێز نەبێ لانەچێ، ئەوا ئـەم بۆچـون‌و گوتەیە دەداتە پاڵ ئەو هاوەڵانەی جیاوازو ناکۆك بوون لەگـەڵ عـەلی کـوڕی ئەبوتالیبـدا، وە ئەوانـەی ڕاپـەڕین لـە دژی یەزیـدی کـوڕی موعاویە، هاوڕێنەی حوسەین‌و عەبـدوڵلای کـوڕی زوبـەیرو کـوڕانی کۆچکەرو پشتیوانان لە مەدینە، وە ئەوانەی دژبە حـەجاج ڕاپـەڕین، وەکو ئەنەسی کوڕی مالیك، وە دەڵێ: (پاشان دوای ئـەمان کەسـانی تریش هەبوون لەوانەی دوای تابعین هـاتن، وەکـو عەبـدوڵلای کـوڕی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو عەبـدوڵلای کـوڕی عومـەری کـوڕی عەبدوڵلاو موحەممەدی کوڕی عەجلان‌و ئەوانەی لەگـەڵ موحەممـەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حەسەندا دەرچوون‌و هـەروەها هـاشمی کـوڕی بشرو مەتەری وەڕاق‌و ئەوانە لەگـەڵ ئیبراهیمـی کـوڕی عەبـدوڵلادا ڕاپەڕین، گوتەو قسەکانی زانایانیش هەر بەڵگـەی ئـەم بۆچـونانەن، لەوانـە ئـەبو حەنیفـەو حەسـەنی کـوڕی حـەی و شـورەیکی کـوڕی عەبدوڵلاو مـالیك‌و شافعی‌و داودو هاوەڵانیان، تەواوی ئەوانەی باسمان کرد لە کۆن‌و نوێ، یا ئەوەتا بە فـەتوا قـسەی کـردووە لەوبارەیـەوە، یاخود بە هەڵکێشانی شمشێر بەشداریکەربووە لـە بەرهەڵـستیکردنی ئەو شتانەی بە خراپی زانیوە).[1]

---

(١) الفصل (٤/١٧٤ -- ١٧٢).

(ابن حجر) وەك جیاكردنەوەیەك لــە نێــوان دەرچــوونو ڕاپــەڕینی خەوارجو یاخی بووانو ئەوانەی لەسەر ڕەواو هەقن ووتویەتی: (بەشێك ڕاپەڕینو دەرچونیان وەك توڕەبوونێك بووە لە پێنــاوی ئــاینو ســتەمو زۆرداری كاربەدەســتانو وازهێنانیــان لــە ڕەفتــاركردن بــە ســونەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەوكەسانە خاوەنی هــەقو ڕەوان، لەوانــە حوســەینی كوڕی عەلیو خەڵكی مەدینە لە (الحرة)و ئەو قورئان خوێنانەی دژبە حــەجاج دەرچــوون، بەشــێكی تریــان دەرچــونیان بــۆ داواكــردنو دەستكەوتنی پادشایەتیو دەسەڵات بووە كەئەمانــە یــاخی یــەكانن) ئەمیش بەدەق دەڵێ دەرچوون دژبە ستەمكاران ڕێبازو پەیڕەوی پێشین بووە، لەژیاننامەی حەسەنی كوڕی حەی دا دەڵێ: ئەو لەگەڵ دەرچوندا بووەو (ئەمەش ڕێبازی دێرینی سەلەفە).[1]

(أبــوبكر الجــصاص)یــش وتویــەتی: (ڕێبــازی ئــەو - مەبەســتی ئەبوحەنیفەیــە- بەریــەزەیی خــوا بكــەوێ بەناوبانگــە ســەبارەت بــە كوشتاری ستەمكارانو نیمامە زۆردارەكان.... باسوخواســی ئــەو لــە مەسەلەی زەیدی كوڕی عەلی دا بەناوبانگە، لەوەی سامانو دارایی بۆ بردووە، وە بە نهێنی فەتوای بــۆ خــەڵك داوە بــەوەی پــشتگیری زەیــد بكرێو لە هاوشــانی دا جــەنگ ئــەنجام درێ، كاروبــاری ئــەو لەگــەڵ موحەممەدو ئیبراهیم كە هەردوو كوڕی عەبدوڵلای كوڕی حەسەن بوون

(١) فتح الباري (٢٨٦/١٢) وتهذيب التهذيب (٢٨٨/٢).

نارشـــێوەیە)،[1] ئەمـــەش ڕێبـــازی حـــەمادی کـــوڕی ئەوبوســـولەیمانی مامۆستاکەشیەتی،[2] کە پێشەواو ئیمامی خەڵکی کوفەبوە لە چاخی خۆیدا، (ابن العربی) وتویەتی: (لە گێڕانەوەی سەحنون دا هــاتووە — لە ئیبن قاسم ئەویش لە مالکەوە — کە زانایانمان فەرمویانــە- تــەنها لە پەنای ئیمامی دادگەردا جەنگ دەکرێ، جا ئیتر یەکەم بێت یــاخود ئەوەیان بێت کە لە دژی دەرچووە، جا ئەگەر هیچیان دادگەرنەبوون واز لە هەردوکیان بهێنە، مەگەر خۆت یاسامانەکەت بووبەنیشانو دەست درێژییان کردیەسەر یا ستــەم لــە مــسوڵمانان کــرا، ئــەوجا بــەرگری لەوەبکــە..... ئەوانــە بەیعــەتیان حــسێب نــاکرێ ئەگــەر بەیعــەت پێدانەکەیان لەترسابوبێ).[3]

زوبەیدی وتویەتی: (دەرچــوون دژ بــە ئیمــامی زۆردارو ســتەمکار مەزهەبی کــۆنو دێرینــی شــافعی یــە،[4] لەمەزهــەبی ئەحمەدیــشدا گێڕانەوەیەکی بێهێز (لاواز) هەیە سەبارەت بە دروستی دەرچــوون دژ بە ئیمامی زۆردارو ستەمکار، بنیات لەسەرئەوەی لەوەوە گێڕدراوەتەوە کە ئیمامــەتی خۆسەپێن دانامەزرێ -هــەروەك پێــشتر باســکرا- (ابــن رزین)یش ئەم بۆچونەی هەیەو لە (الرعایە)دا خستویەتی یە ڕوو کــە

(١) احکام القرآن ١/٧٠.
(٢) تاریخ بغداد ١٣/٣٩٨.
(٣) احکام القرآن ی (ابن العربی) ٤/١٧٢١.
(٤) إتحاف السادە ٢/٢٣٣

له کتێبی حەنبەلییەکانە، له پێشەوایانی مەزهەبیشدا (ابن عقیـلو ابن الجوزی) وتویانە دروستە دژ بە ئیمامی زۆردار دەربچیت).[1]

ئەم پرسە لەسەر پرسی هەڵوەشاندنەوەی گرێ بەستی ئیمامەت بە فیسقو گوناهکاری بنیات دەنرێ، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا پرسێکە جێی جیاوازی یە، (قرطبـي) فەرمویەتی: (سیانزەهەم، ئەگەر ئیمام دانرا پاشان فاسق بویەوە دوای دامەزرانی گرێ بەستەکە، جـەماوەری زانایـان وتویانـە: لەراسـتیدا ئیمامەتەکـەی هەڵدەوەشـێتەوە بـە فیسقێکی روونو ئاشکرا، لەکاردەخرێو لادەبرێ، چونکە سـەلماوە کـە ئیمام بۆ ئەنجامدانی حدودەکانو جێبەجێ کردنی مافەکانو پاراستنی سەروەتو سامانی هەتیور شێتەکانو تێڕوانینی کاروباریانو چەندین خاڵیتر کە پێشتر باسکرا دادەنرێ، کاتێکیش کە فیسقی تێدایە ئەمـە وای لـێدەکات نـەتوانێ بـە کاروبارەکـانی هەسـتێو ڕایانپـەڕێنێ، ئەگەر وا دابنێین فاسقێك ببێتە هۆی پوچەڵکردنەوەی ئەوەی کە بـۆی دانراوە، ئایا باشتر نیە هەرلە سەرەتاوە دروست نـەبێ بدرێتـە دەسـت کەسی فاسق، لەبەرئەوەی سەردەکێشێ بۆ پوچکردنەوەی ئـەو شـتەی بۆی دانراوە، ئەمەش بەو شێوەیەیە، هەندێکی تر وتویانە: تـەنها بـە کوفرو وازهێنان له نوێژ یاخود بەوەی واز له بانگکردن بۆ نوێژ بهێنێ یاخود بە وازهێنان له بەشێکی شـەریعەت لادەبـرێو لـەکار دەخـرێ

---

(١) (الانصاف) ی مرادی (١٠/٣١٠ – ٣١١).

گوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کـە لـە فـەرمودەی عوبـادەدا هــاتووەو دەفەرمویَ: (وألا ننازع الأمــر أهلــه (قــال) إلا أن تــروا كفــراً بواحــاً عندكم من الله فيه برهان).[1]

ماوەردی ئــەم مەســەلەیەی بــاس کــردووەو هــیچ جیــاوازی یــەکی نەخستۆتەڕوو، جا ئەگەر دەرچونەکەی سنوری دادگــەری (العدالــة)ی بەزاندبیَ بەهۆی شــوێنکەوتنی ئارەزوکانیــەوە لــە فیــسقو زۆرداریو بەزاندنی سنوری قەدەغــەکراوەکانو ئەنجامــدانی خراپــە کارییــەکانو شوێنکەوتنی حەزەکان، ئەمە فاسقی یەو دەبێت لە ســەرەتاوە ڕێگــری لــیَ بکریَ لەوەی گریَبەستی ئیمامەتی بۆ بەدی بێت، وەنابیَ درێــژەی پیَبدریَ ئەگەر شتێکی لەوجۆرە بەسەر ئیمــام دا هــات، بەمــەش لــە ئیمامەت دەردەچیَ.[2]

لەگەڵ بەناوبانگی ئەم پــرسو مەســەلەیە -واتــە دەرچــوون دژبــە پێــشەوای ســتەمکارو زۆرداروبەرهەڵــستیکردنی سەرکەشــییەکانی دەسەڵاتو ڕووبەڕووبونەوەی لادانو خراپەکارییــەکانی- لــە ســەرەتای یەکەمی سەردەمی هــاوەڵانو تــابعینو شــوێن کەوتوانیانــدا، کەچــی سەردەمی گوتاری فیقهی سیاسی تەئویل کراو پەرەسەندنێکی فیکری نویَی بەخۆوە بینی، کە زیاتر دەربڕی واقع بوو، وەك لەدەقەکان، ئەوەتا (ابن مجاهد البــصري الأشــعري) -مامۆســتای بــاقلانی- بانگەشــەی

(١) الجامع لأحكام القرآن ٢٧١/١.

(٢) الأحكام السلطانية ل ١٩.

کۆڕای ئومەت دەکات سەبارەت بە حەرامی دەرچـوون دژ بـە ئیمامـە زۆردارەکان، (ابن حزم)یـش ئـەم بانگەشـەیە ڕەت دەکاتـەوە، زۆر بـە نەشیاوێکی گەورەی باس دەکات، (ابن حزم) ووتویـەتی: (سـوێن بـێ لەسەرم، زۆر گەورەیە کاتێ ئەو دەزانێ کـە پێـچەوانەکردنی ئیجمـاع کافر بوونە، کەچی ئەم بۆچونە فڕێ بداتە سەر خەڵکی، دەشزانێ کـە باشترینی هاوەڵانو خەڵکانی تریش لە ڕۆژی (الحرە)دا دەرچوون دژ بـە یەزیدی کوڕی موعاویە، وە عەبدوڵڵای کـوڕی زوبـەیرو ئەوانـەی کـە شوێنی کەوتبوونو لە باشترینی مسوڵمانان بـون، بـە هـەمان شـێوە دەرچـوون، حەسـەنی بەسـریو گـەورە تابعینـەکانیش دژبـە حـەجاج جەنگان، ئایا بیروڕای وایـە ئەوانـە بێبـاوەڕو کـافربوون؟! سـوێندبێ لەسەرم، ئەگەر ئەمە جیاوازییەکی شاراوەو پەنهان بوایە بیانویەکمان بـۆی دەدۆزییـەوە، بـەڵام ئەمـە مەسـەلەیەکی بەناوبانگـەو زۆربـەی عەوامی بازاڕیش دەیزانێو کچانی نێو پەردەو کەژاوەکانیش دەیـزانن، لەبەر بەناوبانگی یەکەی).(١)

پاشان زۆری نەخایاند ئـەم بانگەشـەیەی (ابـن المجاهـد البـصری) موتەکـەلیم لـەنێو فەقیهەکانـدا بـرەوی پەیـداکرد، وەك دەربـڕی کاریگەری واقعی ئەوچەرخە لەسەر فیقهـ و دەقـە شـەرعی یـەکان، تاوەکو نەوەوی (٦٧٦ ك . ك) لە سەدەی حەوتەمـدا بانگەشـەی بـۆی

(١) مرتب الاجماع ل ١٩٩.

کرد، ئەوەتا دەڵێ: (سەبارەت بەدەرچوونو جەنگ کردن دژیان ئەوا بـە کۆڕا (اجماع)ی مسوڵمانان حەرامە، هەرچەندە فاسـقو سـتەمکاریش بن، سوننیەکانی کۆن لەسەر ئەوەی سـوڵتان بـەهۆی فیـسقەوە لـەکار لانادرێ، ئەوەشی لە هەندێ کتێبی هاوەڵاندا هاتوە کە لەکار لادەبـرێ ئەوە هەڵەی ئەو کەسەیە کەوتویەتیو پێچەوانەی ئیجماعـە).[1] بـە هەمان شێوە (قاضي عياض)یش هەمان بانگەشەو ئیـدیعا دەکـا.[2] هەروەك چۆن ئەم بانگەشەیە -لەژێر پەسـتانی واقـع دا- لـە کتێبـی شەرعناسو فەقیهەکاندا بڵاوبویەوە، بە هەمان شێوە لـە کتێبـەکانی بیروباوەڕ (الإعتقاد)یش دا بڵاوبویەوە، پاشـان زۆری نەخایانـد بـو بـە ئەسڵێك لە ئەسڵەکانی بیروباوەڕ (العقیدە)؟!!

شێخی ئیسلام (ابن تيمية) وتویەتی: (بیروڕای ئەهلی سوننە بـەوە گەیشتووە کە دەبێ لەکاتی فیتنـەو ئـاژاوەدا واز لەجـەنگو کوشـتار بهێنـرێ، لەبەرئـەو فـەرمودە سـەحیحانەی لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە، ئەمـەشیان لە کتێبـەکانی بیروباوەڕیانـدا باسـکردووەو فەرمـانیش دەکەن بە ئـارامگری لەسـەر زۆرو سـتەمی ئیمامـەکانو

---

(١) سەیری شەرحی ئەوبکە بۆ صحیحی موسلم ١٢/٢٢٩ تەنها بە بانگەشەی (إجماع أهل السنه)ەوە نەوەستاوە تەنانەت کۆڕای هەموو مسوڵمانان (إجماع المسلمین)ی بە هەموو کۆمەڵو دەستەکانەوە ئیدیعا کردووە، لە کاتێکدا دەرچوون دژ بە پێشەوا زۆردارەکان لە (أصول)ی موعتەزیلەو خەوارجو زەیدیە؟!!.

(٢) سەرچاوەی پێشوو.

وازهێنانی جەنگ لەدژیان).[1]

(ابـن أبـو العـز) ڕاقـەکاری (العقیـدة الطحاویـة) لـە پرسـی گوێڕایەڵیکردنی ئیمامی زۆرداردا وتویەتی: (سەبارەت بـە پێویـستی گوێڕایەڵی کردنیان هەرچەندە زۆرداریو ستەم بکەن، لەبەرئەوەیە کـە دەرچوون لە گوێڕایەڵییان بەرەنجامی خراپەکارییەکانی چەند قاتی ئەو زۆرداری یەیە کە بە هۆی ئەمانەوە ڕوو دەدات، بەڵکو خۆڕاگری لەسەر زۆردارییەکانیان هۆکـاری سـڕینەوەی گوناهـەکانو چـەندانە بـوونی پاداشتەکانە، چونکە خوای گەورە بەهۆی خراپی کارو کردەوەکانمانـەوە بوو ئەمانەی زاڵ کردوە بەسەرماندا، سـزاش بـەپێی ڕەگـەزی کارەکـە دەبێت، هەربۆیە پێویستە لەسەرمان داوای لێخۆشـبونی زۆر بکـەینو تەوبە بکـەینو کـارو کردەوەمـان چاکـساز بکـەین، خـوای گـەورەش فەرمویەتی: ﴿ وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُـو عَنْ كَثِيرٍ ﴾ (الشورى: ٣٠) وەفەرمویەتی: ﴿ أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْـتُمْ أَنَّـى هَـذَا قُـلْ هُـوَ مِـنْ عِنْـدِ أَنْفُـسِكُمْ ﴾ (آل عمران: ١٦٥) وەفەرمویەتی: ﴿ مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ ﴾ (النساء: ٧٩) وەفەرمویەتی: ﴿ وَكَذَلِكَ نُـوَلِّي بَعْـضَ الظَّـالِمِينَ

(١) (منهاج السنة)٢/٢٤١، لەگەڵ ئەوەش دا ئەم ئەسڵەی لە (العقیدة الواسطیة)دا باس نەکردووە لەگەڵ ئەوەی بۆ ڕونکردنەوەی (اصول اهل السنة) داینـاوە وەك ئـەوەی ڕەچاوی ئەو ناکۆکیو جیاوازی‌یە کۆنانەی کردبێ لەم پرسەدا لە نێوان سـەلەف دا هەبووە.

بَعْضاً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (الأنعام: ١٢٩)، جـا ئەگـەر خـەڵكی بیانـەوێ لەستەمی ئەمیری ستەمکار ڕزگاریان ببێ، باواز لەستەم بهێنن، لـە مـالکی کوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە لە هەندێ کتێبی خـوادا هـاتووە کە خوای گەورە فەرمویەتی: (من خـوام، پادشـای پادشـاکانم، دڵـی پادشایان بەدەستمە، هەرکەسە گوێڕایەڵیم بکا، پادشاکانی بە بەزەیی دەکەم، هەرکەسەش بێفەرمانیم بکا پادشاکان دەکەمە هۆکاری تۆڵە سەندنەوە لێی، خۆتان سەرقاڵ مەکەن بە جنێودان بـە پادشـاکانەوە، بەڵکو پاشگەزبنەوەو تەوبە بکەن، بەسۆزترین کەس دەبن بۆتـان).[1]

بەم شێوەیە دۆزو کێشەکە لەدۆزو کێشەیەکی خیلافی ئیجتیهادییەوە گۆڕا بۆ دۆزو کێـشەیەکی ئیجمـاعیو بـڕاوە، وە لـە مەسـەلەیەکی فیقهییەوە گۆڕا بۆ بنچینەیەکی عەقائیدی کە بەجۆرە ئیسرائیلیاتانە بەڵگەی بۆبهێنرێتەوە.

بەم شێوەیە گوتاری سیاسی فیقهی چـووە قۆنـاغێکی نوێـوە، کـە تیایدا زانایان هەستان بە تەئویلکردنی دەقەکان بۆ بەخشینو پۆشینی شەرعیەت بەسەر واقیعو ڕیشەدارکردنیدا، جارێك بەناوی ئەوەی ئەمە دەلالەتی دەقەکانەو جـارێکی تـر بـەناوی ئـەوەی بەرژەوەنـدی ئەمـە

---

(١) شرح العقیدة الطحاویة ل (٤٣٠)، ئەلبانی لە پەراوێزی ئەم (اثر)ەدا فەرمویەتی: ئەمە ئیسـرائیلیاتە، هەندێ لە وانەی شـارەزاییان کەمە بەرزیان کردۆتەوە بۆ پێغەمبـەر ﷺ و گەیاندویانـە بـەو، الطبرانـي لـە(الأوسـط)دا لـە (أبـودرداء)ەوە گێڕاویەتیەوە، (الهیثمي)(٢٧٩/٥) وتویەتی (ئیبراهیمی کوڕی ڕاشدی تێدایە کە واز لە فەرمودەی دەهێنرێ– متروکە).

دەخوازێو دەرچونیش تەنها خراپەکاری لێ دەکەوێتەوە.... هتد.

بێئەوەی خوێندنەوەیەکی دروستی واقع بکرێ، وە بێئەوەی هەست بەوە بکرێ ئـەو بەرژەوەندییـەی واگومـان دەکـرێ تـەحریمی بـەرگری سەرکەشـییەکانی دەسـەڵاتو لادانـەکانی پـێدەکرێ بریتیـە لـە بەرژەوەندییـەکی ئێـستاییو کـاتی، چـونکە زۆر ناخایـەنێت ئـەو سەرەنجامانە خراپتر دەبن لەوەی کە لە بەرەنجامی دەرچونەوە بەدی دێت، چونکە ئومەت بەرەو لاوازیو لێکترازانو شی بونەوەو پاشان کـەوتنو گلان دەبا بەو شێوەیەی لە سوننەتو ڕێو شوێنە کۆمەڵایەتی یەکاندا بەدی دەکرێ، هەرئەوەش ڕویدا، هەرکە ئەم جۆرە لە گوتـاری سیاسـی تەئویل کراو بڵاوبویـەوە - خـەرمانێك لـە قودسـیەتو پـیرۆزی کـرا بەبەردا تاوەکو گەیـشتە ئەوپـەڕی لادانو زۆرداریو خۆسـەپێنی - و کارەسات بەسەر ئوممەت داهات، ئەوەبوو و یەکسەر داگیرکاری تەتاری بە سوپا دڕندەو هەمەجیەکەیەوە پایتـەختی دەوڵـەتی ئیـسلامی لـە ساڵی (٦٥٦ ك) دا ڕوخاند، لە گەورەترین کارەسـاتێکی مێژوویـیدا، کە مسوڵمانان بەخۆیانەوە بینیویانە، هـەر ئەمـەش لـە ئەنـدەلوسو هەرێمەکانی تردا ڕوویدا، پاشان سەرەنجامی ئوممەت بەوە گەیشت کـە لەبـەردەم هـەژموونو زاڵێتـی ڕۆژئـاوای کۆلۆنیـاڵی خـاچ پەرسـتدا بەچۆکدا هاتو تێکشکا، بەهۆی وون بوونی ڕۆڵی ئوممەتو گەنـدەڵی سـستمەکانو بڵاوبونـەوەی ئـەم گوتـارە سیاسـییە تـەئویلکراوەی شەرعیەت دەبەخشێتە بوونی خۆی بەڵکو هـەوڵی خۆپـارێزی دەدات،

ئیتر فەسادەکەی لە هەر ڕادەیەکـدابێت، کەمتەرخـەمی کردنـی بـە بەرژەوەندییەکانی ئوممەت گەیشتبێتە هەر ئاستێك، گرنگ پاراسـتنی بەرژەوەندی تەختو پایەگاکەیەتی؟!!

ئەوانەی خاوەنی ئەم گوتـارە تـەئویلکراوە بـوون بـە تێڕوانینێکـی سلبیو لەیەك لاوە دەیـان ڕوانییـە بزاڤـەکانی نارەزایـەتی سیاسـی، ئەویش ئەو بەرەنجامو ئاژاوەو فیتنەیەیە کە بەهۆیـەوە هەنـدێ کـەس بڕێك سـامانو دارایـی تێیـدا دەچـوو، بێئـەوەی بڕواننـە زەرورەتـی بەرپاکردنو دروستبونی ئەم بزاڤانە کە دەبونە ڕێگر لەوەی دەسـەڵات ستەمو زۆرداریو سەپاندنو لادان ئەنجام بدا کە لەوانەیە سەریکێشێ بۆ ئەوەی ئوممەت بە تەواوی بکەوێتـە ژێـر دەسـەڵاتی دوژمنێکـی دەرەکی یەوە ؟!

ئەمەش بە فیعلی ڕویدا، کاتێك ئەوەی لێی ترسان ڕوویدا، ئەوکاتە بوو ئوممـەت توانـای بـەرگریکردنی لـەخۆی نامێنـێ، پـاش ئـەوەی تێکشکێنراو و مافی لـێ زەوت کرا، دواتر ڕۆڵـی نـەماو ژیـانی لـە پەراوێزی ڕوداوەکانی واقع دا دەبردەسەر، لێرەوە خەڵکی چاوەڕوان بوون دەسـەڵات هـەموو شـتێ لـەبری ئـەوبکات، تەنانـەت لەخۆڕاسـت کردنەوەشدا – دەسـەڵات خـۆی خـۆی ڕاسـت بکاتـەوە –و بەخۆیـدا بچێتەوەو ڕەخنە لە سیاسەتەکانی خۆی بگرێت؟

لەراستیدا ترسناکترین شتێ کەلەم گوتارەدا هەبوو ئەوەبوو ڕێگەی بڕی و بووە کۆسپ، تەنانەت لەو خەلیفەیەو پادشایانەشی مەبەستیان

بوو چاکسازی ئەنجام بدەن، چونکە ئەگەر بوترایە واجبە ئیمامەت بـە ڕاوێژ بێت، وە بوترایە حەرامە میراتو پشتاوپشتی بەدی بێتو واجبـە ڕاوێـــژی ئوممـــەتی تێـــدابکرێو بـــەبێ ئـــەو هـــیچ کارێـــك یـــەکلا نەکرێتەوەو...هتد، لەوانەبوو هەندێ لەو خەلیفانەی کەدەهاتن بـاوەڕو ئیسلاح خوازییەکەی وای لـێ بکردایە کـاری پێبکـاو بیـچەسپێنێ، تاوەکو ئوممەتیش ژیانێکی سەرلەنوێ دەست پێبکات، بەهـەمان ئـەو ڕێو شوێنەی لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین دا بەسـەریان بردبـوو لە کاروبارە سیاسییەکاندا، بەڵام ئەم گوتارە تـەئویل کـارە دەقـەکانی بەوپێیە تەئویل دەکرد کـە واقـع دەیخواسـت، کـارێکی نـەکرد واقـع پەلکێش کا بۆ ئەو مەبەستەی کە دەقەکان بـۆی هـاتوون، وای لـێ هات کاتێ کە خەلیفە چـاكو پادشـا دڵسۆزەکان دەهـاتن شـتێکیان نەدەبینی کە پێویست بێ لەسەریان ئەنجامی بدەن جگـە لەدادگـەری، ئاوڕیان نەدەدایەوە بۆ لای هیچ شـتێکی تـر لـە بنـەماکانی گوتـاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو کە زانایـەك مـابێ لەسـەردەمی خۆیانـدا بانگەشەی بۆ بکا یـا مـوژدەو مزگێنـی پێبـدا، بـەڵکو گوتـارێکی تەئویل کراویـان دەبینـی کـەپێی وابـوو ڕاوێـژپێکردنی ئوممـەت لـە کاروبارەکـانی خۆیـدا کـارێکی بـاشو موسـتەحەبەو گەڕانـەوەی کاروبارەکان بۆ لای خەڵکی کارێکی دروستو موباحە؟

لەراستیدا ئەو هــۆكارانەی ســەری كێشـا بـۆ بڵاوبونـەوەی ئـەم گوتـــارە تەئویل كراوە زۆرن، گرنگتـرینیان ئەمانەن: -

١/ خاوەنی ئەم گوتارە تێڕوانینێكـی جـوزئیو یـەك ڕوو ناتـەواویان هەبووە بۆڕووداوەكانی مێژوو، نەك تێڕوانینێكی گشتیو هەمەكی، بۆیـە گومانیـــان وابـوو هــەموو دەرچـوونو یـاخی بونێـك تـەنها خراپەكاری لێ دەكەوێتەوە، (ابن القيم) ووتویەتی: (ئینكاریكردنی پادشایانو دەرچوون لە دژیان بناغەی هەموو خراپــەو ئاژاوەیەكـە تاكۆتایی دونیا).[1] نەیان دەڕوانییە ئـەو ڕووداوانــەی زۆرێـك لــە چاكسازی بەدوای خۆیدا دەهێنا، عەبدوڵڵای كوڕی زوبـەیر دژ بـە یەزید ڕاپەڕی، سەردەمەكەشـی باشـتربوو لـە سـەردەمی یەزیـد، عەباسییەكان دژبە ئومەویەكان ڕاپــەڕین، - لـەكۆی گـشتیدا — سەردەمی ئەمان لە ســەردەمی ئومەویــەكان باشـتربوو، ئەحمــەدی كوڕی حەنبەل بە باشتری دادەنانو دەیوت: (نوێژیان بـەجێ هێنــاو سوننەتیان زیندوو دەكردەوە)، ســەلاحەددین دەوڵــەتی فاتمیــەكانی ڕوخاندو سەردەمی ئەو لە سەردەمی ئەوان باشتربوو، شێخی ئیسلام موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب بەدەركەوتو لەگەڵ موحەممــەدی كوڕی سعوددا دەوڵــەتی خۆیانیـــان بـەرپاكرد، ســەردەمی ئــەمان لەسەردەمی پێش خۆیان باشتربوو...... هتد.

(١) اعلام الموقعين ٣/٤، ڕامێنە ؟بزانە ئـەم دەربڕینـە چ زیادەڕۆییو ڕۆچوونێكی تێدایـە بۆ پلەوپایەی دەسەڵاتو سوڵتان؟.

ڕووداوەکانی مێژوو ئێجگار زۆرن، بەڵکو ئەوە مێـژووی تـەواوی گەلانی جیهانە تەئکید دەکاتەوە لەسەر ناڕاستی ئـەم بیدۆزەیـە، ئەمە چەند یاساو ڕێسایەکی کۆمەڵایەتین مسوڵمانانو ئەوانی تر تیایـدا یەکـسانن، لەراسـتیدا هۆکـاری ڕاپـەڕینی ئـەوروپاو گەشەسەندنو دەرچونیان لەو بارودۆخەی تیایدا بوون بریتـی بـوو لەو بزوتنەوە شۆڕشگێڕیانەی بەرەنگاری زیادەڕەویەکانی دەسـەڵات بونەوە تاوەکو کاروبارو بارودۆخی ژیانی دونیایان ڕێكو ساز بویەوە، بە هەمان شێوە هـەموو ئەوانـەی ئـەم ڕێگەیـەیان گرتەبـەر بـۆ بەرەنگاربونـــەوەو بـــەرگریکردنی زیدەڕەویـــەکانی دەســـەڵاتو ئازادکردنی گەلان لە زۆرداریو ستەمو توانیان پەرە بەخۆیان بدەنو بارودۆخیـان چـاك بکـەنو دادگـەریو بەویـژدانی لـە نێوانیانـدا بەدەرکەوت، کەشتی وا لای گەلانی تر بەدی نەدەکرا، بـەڵکو ئـەو دادگەریو سەقامگیریو ئازادیەی پـاش شـۆڕش بۆگـەلی ئێرانـی بەدیهات باشتربوو لەو بارودۆخەی لەسـەردەمی شـادا هـەیانبوو، ئەمەش بـارودۆخی زۆربـەی وڵاتانـە، کەواتـە ناگونجـێو نـاکرێ خۆبدەینـە دەسـت ئـەو بیدۆزەیـەی وادەبینـێ بەرەنگاربونـەوەی زیادەڕەویەکانی دەسەڵات تەنها زیانی لێ دەکەوێتەوە.

چۆن وایە؟ لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بـە فـەرمانڕەوا ستەمکارەکان دەفـەرموێ: (فمـن جاهـدهم بيـده فهـو مـؤمن) هەرکەسێ بەدەست دژیان تێبکۆشێ ئەوە باوەڕدرە، وەدەفـەرموێ: (إلا أن تروا كفراً بواحاً) وەگەر کوفرێکی ئاشکراتان لـێ بیـنین،

ئەگەر دەرچوون لەدژیان هیچ سودێکی نەبوایە ئـەوا بـۆ هەنـدێ بارودۆخیش خوای گەورە مۆڵەتی پێنەدەدا، بـەڵکو خـوای گـەورە هەواڵی ئەوەی پێداوین کـە سـتەمو زۆرداری هۆکـاری تیاچـونن، قورتوبی دەڵێ: فەرمودەی خوا ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى﴾ (هود: ١١٧) واتە: خوای گـەورە خـەڵکی هـیچ لادێو شـارێك لـەناونابا (بِظُلْمٍ) واتە: بەهۆی هاوبەشـی پەیـداکردن (شـیرك) و بێبـاوەڕی (کفر) ەوە (وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ) ئەگەر خەڵکەکەی لە نێوان خۆیاندا مافەکانی یەکتری بدەن، واتە تەنها بەهۆی کوفرەوە لـەناویان نابـا تاوەکو خراپەکاریو گەندەڵی بۆ زیاد نەکەن، هەروەك چـۆن گـەلی شوعەیبی بەهۆی گزیکاریکردن لە کێشانەو پێوانەدا لەناو بـرد، وەگەلی لـوتی بـە هـۆی هاوڕەگـەز بازییـەوە لـەناوبرد، ئەمـەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تاوانو خراپەکاری نزیکترە، بەهۆیەوە سزای تیاچوونی دونیایانە بەدی بهێنێ وەك هاوبەش پەیداکردن (الشرك)، هەرچەندە سزای هاوبەش پەیداکردن لە دوارۆژدا قورسترە.

لە (صحیح الترمـذي)دا فەرمودەیـەك هـاتووە کـە ئەبوبـەکری سدیق فەرمویەتی: ((گوێبیستی پێغەمبەری خودا بـوم ﷺ کـە دەیفەرموو: ((إن الناس إذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يده اوشـك ان يعمهم الله بعقاب مـن عنـده)).[1] واتـە: لەراسـتیدا ئەگـەر خەڵکی بینیان ستەمکار ستەم دەکاو دەستیان نەگرت نزیکە خوای گەورە سزایەکی گشتی لەلایەن خۆیەوە بۆ هەموان بنێرێ.

(١) تفسير القرطبي (١١٤/٩).

شەوكانی لە راڤەی ئەم ئایەتـەدا ووتویـەتی: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ (هـود: ١١٧) واتەدروسـت نەبووەو وەهاش نەسەلماوە کە خوای گەورە خەڵکی شارو لادێیەكانی تیا بردبێ تەنها بە هۆی ستەمێكەوە کە تێیەوە گلاون کە بریتیـە لە هاوبەش پەیداكردن، لە كاتێك ئەگەر خەڵكەكـەی لـە نێـوان خۆیاندا چاكساز بووبێتن و مافی یەكتریان دەسـتەبەر كردبێـت وە ستەمیان لە یەكتری نەكردبێ.

واتە: خوای گەورە تەنها بەهۆی هاوبەش پەیداكردنەوە لـەناویان نابات تا دەگاتە ئەوەی خراپەكاریش لەسەر زەویـدا ئـەنجام دەدەن‌و ئەمـەشی بۆ زیاد دەكەن، هەروەك چۆن گـەلی شـوعەیبی بەكـەم‌و كورتی لە كێشانەو پێوانەو بەكەم زانینی شتی خەڵك لەناو بـرد، وە گەلی لووتی بەهۆی ئەنجام دانی ئەو كـارە ناشـیرین‌و قێزەونـەوە لەناو برد، ووتراویشە: فەرمودەی ((بظلم)) (حال)ە لـە (فاعـل) ەكەوە بەمـەش واتای ئایەتەكە بەم شێوەیەی لـێ‌دێت: خوای گەورە بە ستەم خەڵكی شارو لادێكـان لـەناو نابـات ئەگـەر ئـەوان لـە حاڵێكی چاكسازدا بن‌و خراپەكاری لەسەرزەویدا نەكەن). [1]

---

(١) فتح القدير، هەربۆیە – وەك لە صحیح مسلم (٢٨٩٨) دایە فەرمودەیەك دەفەرموێت ((تقـوم السـاعة والـروم اكثـر النـاس – كاتێـك قیامـەت بـەرپا دەبێـت رۆم زۆرتـرین خەڵكـە، عـەمری كـوری عـاس بـۆ ڕوونكردنـەوەی هۆكـاری ئەمـە فەرمویـەتی: ( لـە راستی‌دا ئەوان چـەند سـیفەتێكیان تیادایـە پێنجـەمیان چاكەیەكی جوانـە كـە بریتی یە لەوەی لەهەموو كەس زیاتر ڕێگە دەگرن لە ستەمی پادشاكانیان (امنعهم من ظلم الملوك).

٢/ تێکەڵ کردنیان لە نێوان چەمکی دەرچونو راپەرینی سیاسـیانە (الخروج السیاسی) بۆ رووبەرووبوونەوەی زیادەڕەویەکانی دەسـەڵات وەك بەرگریەك لـە ئومـەت و لابردنـی سـتەم لێـی، وە چـەمکی دەرچوونی بیروباوەڕیانە (الخروج العقائیدی) کە دەرچـووان خوێنـو سامانی موسڵمانان حەڵاڵ دەکەنو بە کافریان دادەنێن و ئەمەیانە دەقەکان سەرزەنشتیان دەکەن.

شێخی ئیـسلام ئیبنـو تەیمیـە ئامـاژەی داوە بـەو تێکەڵییـەی زانایـانی دوایـین لـەم ڕووەوە تـێی کـەوتوون، کاتێـك کوشـتاری خەوارج و یاخی بووانو تەئویل کاران تێکەڵ بەیەك دەکەن، شێخی ئیسلام ئەم تێکەڵ کردنەی ئەوان وەك نەنگیو عەیبەیەك ئـەژمار دەکاو دەڵێ: ((جەماوەری زانایان (لەکۆندا) جیاوازییان خـستۆتە نێوان خەواریجو نێوان ئەوانەی لە جەمەلو سەفینو ئـەوانی تـرەوە لەوانـەی بـەیاخیو تـەئویل کـار دادەنـرێن، هـەر ئەمـەش لـەو هاوەڵانـــەوە زانـــراوەو گـــشتینەی فەرمودەناســـانو فـــەقیهو موتەکەلیمینیش لەسەر ئەم بۆچونەنو وتەی زۆربەی پێشەوایانی وەکو مالكو ئەحمەدو شافیعیو زانایـانی تـریش بەشـوێن کـەتوە کانیشیانەوە لەگەڵ ئەم جیاکردنەوەیەدایە)).[1]

هەروەها وتویەتی: (ئەوانەی لـە حوکمەکانـدا کتێبیـان دانـاوە

(١) مجموع الفتاوی (٣٥/٥٤)، سەیری پێشتر، ل (١٦٢) بکە.

کوشتار (قتـال)ى یاخییـانو خـەوارجیان هـەموو بـاس کـردووە، سەبارەت بەکوشتاری یاخی بوان لە پێغەمبەری خـواوە ﷺ هـیچ فەرمودەیەك نەگێڕدراوەتەوە جگە لە فەرمودەی (کوثر بـن حکـیم عن نافع) نەبێت، کە ئەویش هەڵبەستراوە، سـەبارەت بـە کتێبـە دانراوەکانی فەرمـودەی هاوڕێنەی (صحیح البخـاری) و (الـسنن) جگە لە کوشتاری هەڵگەڕاوەو خەواریج کە بە ئارەزووبازان (أهـل الأهواء)ناو دەبرێنو هیچ شتێکی تریان تێدا نابینی.. هەر ئەمەش لە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمـبەرەکەیدا ﷺ ڕێساو بناغەیەکی جێگیرو سەلماوە، ئەمـەشە ئـەو جیاوازییـەی لـە نێـوان کوشـتاری ئەوانەدا هەیـە کەدەرچـوون لـە شـەریعەتو سـوننەت، ئەمەیـە پێغەمـبەری خوا ﷺ فەرمانی کوشتاریانی داوە، بەڵام کوشـتاری ئەوانەی تەنها لە گوێڕایەڵی ئیمامێکی دیاری کراو دەردەچن ئەوا لە دەقەکاندا هیچ فەرمانێکی لەوشێوەیە (بۆکوشتاریان) نیە.(١)

پاشان باسی ئەو قەدەغەکراوانە دەکات کە ئەو فەقیهانـە تـێی کـەوتوون بـەهۆی ئـەم تێکەڵکرنـەوە کـە لـەم خاڵانـەدا خـۆی دەبینێتەوە: -

١- (بڕوا بونیـان) بەکوشـتاری هەرکەسـێ کـە لـە گوێڕایـەڵی پادشایەکی دیاریکراو دەردەچـێ، هەرچـەندە ئـەو کەسـە کـە

(١) مجموع الفتاوى (٤٥١/٤).

دەرچووە لە شوێنکەوتنی شەریعەتو سوننەتیشدا وەکـو ئـەو پادشایە وابێ یانزیك بێت لەوەوە ؟!

٢- بە یەکسان کردنی ئەوانەی کـە لـە گوێڕایـەڵی پادشـایەکی دیاریکراو دەردەچن لەگەڵ ئەوانەی پاشگەزبونەتەوە لە هەندێ یاساکانی ئیسلام؟!

٣- بە یەکسان کردنی ئەمانەو ئەوانەی دژ بە ئوممـەت دەردەچـنو خوێنو سەروەتو سامانی بە حەڵاڵ دادەنێن(١)؟!

بەهۆی ئەو تێکەڵیەی لەلایەن ئەو فەقیهانەوە ڕوویداوە (ئەبینی دەستەیەك لەو فەقیهانە بە پێی زۆرێـك لـە حـەزو ئارەزووەکـانی پادشاو کاربەدەسـتەکان، دەجولێنـەوە فـەرمان دەدەن هاوشـانیان کوشتار بکرێت دژ بە دوژمنانیان، لەسەر ئـەو بناغەیـەی ئـەوان دادگەرنو ئەوانی تـر یـاخی بـوون، ئـەمان لێـرەدا وەکـو ئەوانـە دەمـــارگیری یـــەی هەنـــدێ لـــە زانایـــان دەکـــەن لـــە بەرامبـــەر هاوشانەکانیان، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕەوا لەگەڵ ئەواندایـە، یاخود ئەوان زیـاتر لەگـەڵ حـەزو ویـستێکدان کـە تـەئویلێکی کەموکورتی تێدایە نەك ئیجتیهاد). (٢)

ئەمە لەکاتێکدایە زۆربەی زانایانی کۆن – ئەوکەسانەی دژ بـە ئیمامـە زۆردارەکان ڕادەپەڕین بە چاکەخوازو ئەهلی فەزڵ (خـاوەن

---

(١) مجموع الفتاوی ٤/٤٥١ – ٤٥٢.

(٢) مجموع الفتاوی ٤/٤٥١.

ڕەوا) ناودەبرد وەکو حوسەینی کوڕی عەلی‌و خەڵکی مەدینە کە دژ بـە یەزیـد ڕاپــەڕین‌و ئــەو قورئــان خوێنانــەی دژ بــە حــەجاج‌و عەبدولمەلیك ڕاپەڕین، زانایان لەوکاتەدا بەحـەرامیان دادەنـا کـە دژیان شەڕبکرێ، بەڵکو هەندێ لە پێـشەوایان بـە واجبـی دادەنـا لەگەڵیان دەربچی، هەندێکیـشیان ئـەم دەرچـونەیان بـە دروسـت (جواز) دادەنا، هەندێکی تریشیان دیدوبۆچـونی وابـوو لەگـەڵیان دەرنەچی، بـەڵام هـەموویان بـە حـەرامیان دادەنـا بجـەنگێی لـە هاوشانی ئیمامە زۆردارەکانەوە دژ بـە ڕاپـەڕیوەکان، کـە خـاوەنی ڕەوایەتی بوون).[1]

به هەمان شێوە بەحەرام دادەنرا کوشتاری ئەوکەسە بکرێ کە لە گوێڕایەڵی ئیمامێکی زۆردار دەرچووە کە دەیویست خوێنی بڕێـژێ یاسامانەکەی زەوت کا یا ناموسی سوك کا، وە بۆی هەبوو بە پێی توانای خۆی بەرگری لە خۆی‌و سامان‌و خاوو خێزانی بکا.[2]

هەروەها بە حەرام دادەنرا کوشتاری ئـەو خەوارجانـە بکـرێ کـە مسوڵمانیان بە کافر دادەنا لەکاتێکدا ئەوان دژ بە ئیمامی زۆردار دەرچوبێتن، ئەگەر مەبەستیان نەبوبێ کوشتارو جەنگی مسوڵمانان بکەن‌و هەڵ نەکوتنە سەریان.

عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) لە بـارەی خەوارجـەوە فەرمویـەتی:

(١) سەیری (فتح الباری) ١٢/٤٨٦بکە.

(٢) سەیری فتح الباری) ١٢/٣٠١ و پێشتری ل ١٦٢ بکە.

(ئەگەر ناکۆکیو دژایـەتیان هـەبوو لەگـەڵ ئیمـامێکی دادگـەر جەنگیان لەگەڵـدا بکـەن، ئەگـەر دژو نـاکۆکیش بـوون لەگـەڵ ئیمامێکی زۆرداردا شەڕیان لەگەڵ مەکەن، چونکە گوتەو بیروڕای خۆیان هەیە).[1] بە هەمان شێوە ئەو یاخییانـەی دژبـە ئیمـامی دادگەریش دەرچوون یەکسەر کوشـتاریان لەگـەڵ نـاکرێ تـاوەکو ئیمـام بۆڕێکـەوتنو چـاکەخوازی بانگیـان نـەکا، وەدەبـێ ئـەو ستەمکاریانەیان لەسەر هـەڵگرێ ئەگـەر سـتەمیان لێ کرابـوو، جائەگەر هەر ڕازی نەبوونوشەڕیان دەکرد ئەوکاتە ئیمامی دادگەر جەنگو کوشتاریان دەکاو پێویستە هاوپشتی بکرێ.[2]

زۆرێك لە پێشین وایان دەبینی وازبهێنرێ لەجەنگ لەکاتی ئـەو ئاژاوەیەی لە نێوان مسوڵماناندا بەرپا دەبێت، هەرچەندە ئیمامیش دادگەر بێت، سەرەڕای هەموو ئەمانە زانایانی دووایین – هــەروەك شێخی ئیسلام دەیڵێ – هــەموو ئـەم جۆرانـەیان تێکـەڵ بەیـەك کردووە، یەك بڕیارو حوکمیـان بۆدانـاون، وەك شـوێن کـەوتنێکی حەزو ئارەزووەکانی پادشایانو پشتگیری کردنیان، خێرابوون لە ڕازی کردنو پشتگیری کردنیاندا بە تەئویل کردنی دەقەکان، بەشێوازێك

---

(١) فتح الباري (٣٠١/١٢).

(٢) سەیری (المغني)ابن قدامە بکە (٥٣/١٠) لە باسی بە مەرج دانانی بانگەشەکردنی یاخی بوان بۆ ئیسلاحو لابردنی ستەم لێیان پێش ئەوەی لەگەڵ ئیمام دا جەنگیان بکرێ.

ئەو دەقانە واتای وا لەخۆ ناگرن‌و وەدەقەکانیان بە شێوازێك وەگەڕ دەخست کە لە خزمەتی دەسەلآتدار بن؟!

(ابن سلمون الكنانی) دەڵێ: (مالك وتویەتی: ئەگەر هاوشێوەی ئەم خاوەن ئارەزووبازانە دەرچوون دژ بە مسوڵمانان‌و خراپە کارییان کردو خوێنیان ڕشت، وادەبینم کە جەنگیان لەگەڵ نەکری مەگەر ئیمامەکە دادگەربێت، جا ئەگەر ئیمام دادگەر بوو ئەوا مافە لەسەر مسوڵمانان جەنگیان بکەن تاوەکو دەیانگێڕنەوە بۆ دادگەری‌و ڕەوا، بەلآم ئەگەر ئیمام دادگەر نەبوو ئەوا بۆ مسوڵمانان هەیە جەنگیان نەکەن، مالك وتویەتی: ئەگەر شتی وا ڕویدا ئەوا لە ماڵی خۆتدا دانیشە، ئەگەر ویستیان سامانەکەت ببەن بە شمشێرەکەت بجەنگێ لەگەڵیان، پاش ئەوەی داوایان لێدەکەی لەبەرخاتری خوا وازت لێ بێنن، (ابن القیم) وتویەتی: ئەگەر چوونە شارێکەوە تەنها ئیمامیان مەبەست بوو ئەوا جەنگیان لەگەڵ ناکرێ، ئەگەر هاتوو ئیمامەکە زۆردارو ستەمکاربوو، مەگەر بیانەوێ لەگەڵ ئەوەشدا زیان لە مسوڵمانان بدەن‌و سامان‌و دارایی یەکەیان داگیر بکەن، ئەوا هاوڕێنەی ئەمانە پاش خاتر خوایی جەنگیان لەگەڵ دەکرێ، ئەگەر هەر وازیان نەدەهێنا، عیسا لە (ابن القاسم)ەوە دەیگێڕیتەوە کە پرسیاری کاربەدەست (والی)یەك لە مالك کرا کە کەسێك دەیەوێ لە کاربەدەستی لایبەرێ: ئایا پێویستە بەرگری لێبکری؟ فەرمووی:

ئەگەر وێنەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو ئەوا شتێکی زۆرباش‌و شیاوە بەرگری لێ بکری بەڵام بەدەر لەوە وازی لێ بهێنەو ئەوەی دەیەوێ بابیکا، تاخوا تۆڵە لە ستەمکار بەستەمکار بکاتەوەو زاڵم زەواڵی بۆ پەیدا دەبێ، پاشان خوا تۆڵە لە هەردوکیان پێکەوە دەکاتەوە، یەحیا وتویەتی: بۆچونی ڕاست سەبارەت بە دەسەڵاتێك کە سەرزەنشتی لەسەرە ئەوەیە کە هیچ پشتگیری یەکی نەکرێ‌و لایەنگیری نەبی، هەرکەسەش ڕوو بەڕووی کەسێك بویەوەو ویستی دەستدرێژی بکاتە سەرخۆی‌و سامان‌و دارایی یەکەی با بەرهەڵستیان بکات)

(ابن القاسم)یش شتێکی هاوشێوەی ئەمە لە هاوەڵانی مالیکەوە دەگێڕێتەوە، لە (مختصر ابن شعبان)دا (ابن القاسم) لە مالیکەوە دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: ئەگەر خەڵکی بەیعەتی ئەمیرایەتییان بەخشی بە پیاوێك پاشان کەسێکی تر هەستاو بانگەشەی بۆبەیعەت پێدانی خۆی کردو هەندێکیان بەیعەتیان پێ‌ی دا، بەیعەت پێدراوی دووەم دەکوژرێ ئەگەر پێشوو دادگەر بوبێ، ئەگەی وێنەی ئەم (ستەمکارانەش) بێت ئەوا هیچ پابەندییەك بەبەیعەتەکەوە ناکرێ، ئەگەر بەیعەت پێدانەکەی لەترسا بوبێ‌و بەیعەت دانەکەش بۆ دووەمە ئەگەر دادگەر بێت، ئەگینا بەیعەتێکی وەهای نیە پابەندی پێوە بکری، (الأبهري) وتویەتی: ئەگەر کۆمەڵێك خەڵك گەلەکۆمەیان کرد لە

ئیمامێکی دادگەرو بەهۆی حەزو دەرمارگیری یەوە لەدژی دەرچوون - هەروەك خەڵكی شام كردیـان - ئـەوا هـەوڵیان لەگـەڵ دەدرێ تاوەکو دەگەڕێنەوە بۆ ڕەوا، جگە لەویش وتویەتی: هەردەسـتەیەك كۆبویەوەو ئیمامێکی بۆ خۆی داناو بەرهەڵستی کرد لـە فـەرمان ڕەوایی ئیمامێکی دادگەر ئەوە یاخی (باغی)یە.

لە (کتاب الإسـتغناء)دا هـاتووە کـە هەنـدێ لـە دواییـنـەکان وتویانە: ئیمامەکان چەند بەشـێکن، یـا ئـەوەتا ئیمامێکـە یـە ڕەزامەندی مسوڵمانان ئەم کارەی گرتووەتە دەستو هەموویان ڕازی بوون لە ڕەفتارو ڕەوشتیو لە دادگەری یەکەیدا، یاخود بەبێ ڕاوێژو تێ ڕوانینو جەنگ لەسەرکردن خزێنراوەتە نێو ئەو کاروبارەوەو پێی دراوە، مسوڵمانانیش کارو ڕەفتاریان بەدڵە لەوکاتـەوەی کارەکـەی پێدراوەو بەشـیاوی ئـەو کـارەی دەزانـن- پێویـستە مـسوڵمانان بەرگری لەم شێوە فەرمان ڕەوایە بکەن.

بەڵام ئەو کەسەی لە بـەرەنجامی زۆرو خۆسـەپاندنەوە ئـەم کـارە دەگرێتە دەست بـەبێ ڕاوێـژ، کارەکەشـی لەبـەر دەرواو دادگـەری ئاشکرا بە دەردەکـەوێ بەوشـێوەیەی لـە خەلیفـەکانی ڕاشـدیندا هەبووە - ئەوە پێویستە لەسـەر مـسوڵمانان ئامۆژگـاری بکـەنو گوێڕایەڵی بن، وە داوای چاکسازیو چاکەخوازی بـۆ بکـەن، بـەڵام ئەوکەسەی کاربەدەستێکەی بەخۆسەپانو بێڕاوێژ گرتۆتە دەستو داواش لە خەڵکی دەکا تاوەکو بەیعەتی پێ بدەن، لە هەمان کاتدا زۆرداری لـێ بەدەرکەوتوە لە سامانو خوێنو شتی تـردا، لەگـەڵ

ئەوەشدا کارەکەی بۆ چۆتە سەرو پادشـایەتی دەکـاو زاڵـە بەسـەر کاروباریدا، خەڵکیش لە سایەیدا پارێزراون لەو ئاژاوەیـەی ئـایین‌و سامانیان تیـا دەبـاو خوێنیـان لـە ڕشـتن دەپـارێزرێ‌و خـەڵکیش بەگشتی‌و تایبەتیانەوە بە عەوام‌و خەواسەوە ژیان دەگوزەرێنن.

وە دەشزانرێ گوێڕایەڵی‌و ملکەچیکردنی باشترە بۆ ئەوەی ڕێگری بکـرێ لـە خراپـەکاری‌و تیاچـوونی کەسـەکان- لـەم کاتـەدا گوێڕایەڵیکردنی پێویستە لەو حوکمانەی بانگەشەی بـۆ دەکـا، وە لە پێ‌دانی زەکاتـدا ئەگـەر داوای کـرد، هەرچـەندە زۆردارە، لـەم شتانەدا پێویستە بە ئیمامێکی گوێڕایەڵی کراو دابنرێ هەرچەندە ستەمکاریش بێت، بۆ خۆی مەی بخواتەوەو دەست درێژی هەبێ‌و لە خانەی سامـان ببـات، بـەڵام نابێـت جـەنگ بکرێـت لەگـەڵ ئـەو کەسانەدا کە بەیعـەتیان پـێ‌ی نـەداوە، پێویـستیش نیـە لەسـەر مسوڵمانان پشتیوانی لـێ بکەن‌و لەپێناویدا خوێنی خۆیان بڕێژن، ئەگەر هاتوو کەسانێك لێی ڕاپەڕین بەهۆی زۆرداریەکەیەکانیەوە وەکەسێکی تریان کرد بە ئیمامی خۆیان‌و بانگەشەیان بۆی دەکرد، پێـشەوا (أبـو المعـالي) فەرمویـەتی: ئەگـەر والی‌و کاربەدەسـت زۆرداری کـردو سـتەمی دەرکـەوت ئـەوا ئـەهلی حـەلل‌و عەقـد پێویستە ڕێگری لـێ بکـەن ئەگـەر بەشـیر هەڵکێـشان‌و جـەنگ بەرپاکردنیش بووە).[1]

(١) العقـد المنظم بحاشية تبصرة الحكام ٢/١٩٥ – ١٩٧.

٣/ یەکێکی تر لەوهۆکارانەی سەری کێشا بۆ بڵاوبونەوەی ئەم گوتارە سیاسی یە تەئویل کراوە بریتیـــە لـــە: بڵاوبونـــەوەی فـــەرمودەکانی فیتنەو ئاژاوەگێڕی (احادیث الفتن) کە تەئکید دەکەنـــەوە لەســـەر ئەوەی هەر سەردەمێك کە دێت ئەوەی پاش خۆی لەو خـراپترە، بـێ تێگەیشتن لە واتای دروستی ئەو فەرمودانە، وای لـێهات زۆربەی زانایانی دووایـن کاربکـەن لەســەر چەسپاندنو ڕیشەدارکردنی ئەمری واقعو بەرگری لێکردنی، لەترسی ئەو داهاتووەی کە خراپترە لە ئێستا، هەروەك دەقەکان تەئکید لەسەر ئەمە دەکەنەوە؟

(حافظ ابن الحجر) وەڵامدانەوەی هەیـە سـەبارەت بـەواتای ئـەو فەرمودەیـەی ئەنـەس کاتێـك کـە خـەڵکی دەهـاتنو سـکاڵای ئەوستەمەیان دەکرد کە لـە حەجاجـەوە توشـیت دەهـات ئـەویش پێیانی ئەووت: (اصبروا فإنه لا يأتي عليكم زمان إلا والذي بعـده شر منه حتى تلقوا ربكم).[1] واتە ئارام بگـرن چـونکە لەڕاسـتی هیچ سەردەمێکتان بەسەردا تێناپەڕی کە ئەوەی دواتری لەو خراپتر نەبێت، تا دەگەن بە پەروەردگاری خۆتان.

(حافظ) فەرمویەتی: (ئەم ڕەهایی یە ئاڵۆزیو ئیشکالی دروست کردووە لەگەڵ ئەوەی هەندێ کات زیانو خراپیتیان لە پێش خـۆی کەمترە، ئەگەر لـەم ڕووەوە هـیچ شـتێ نـەبێت تـەنها سـەردەمی

---

[1] رواه البخاري ف ژمارە (٧٠٦٨).

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە زۆر بەناوبانگەو بە پێچەوانەی ئەو ڕەهاییەیە، بەڵکو ئەگەر بوترێ: خراپە لە سەردەمی ئەودا پوکایەوەو تەنك بوو شتێکی دوور نیە ئیتر چ جای ئەوەی بوترێ سەردەمی ئەو لە پێش خۆی خراپتر بووە، حەسەنی بەسری دەڵێ: ئەمە بۆزۆرینەو زاڵێتی یە، پرسیاری هاتنی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی لێکرا لەپاش حەجاجەوە وتی: دەبێ خەڵکی هەناسەیەك بدەن، هەندێك واوەڵامیان داوەتەوە کە مەبەست لەم فەزڵ دانە فەزڵدانی کۆی سەردەمەکەیە بەسەر کۆی سەردەمێکدا، چونکە لە سەردەمی حەجاج دا زۆرێك لە هاوەڵان لە ژیاندا بوون، لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا بنەبڕ بوون، ئەو سەردەمەی هاوەڵانی تێدابێت باشترە لەوکاتو سەردەمشی بەدوایدا دێت، لەبەرئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ((خير القرون قرني)) ئەمەش لە (صحيح) دایە، هەروەها ئەو فەرموودەیەی دەڵێ: ((أصحابي امنة امتي فإذا ذهب أصحابي أتى أمتى ما يوعدون)) (أخرجه مسلم)، واتە: هاوەڵانم دەرگای ئاسایشی ئوممەتەکەمن ئەگەر هاوەڵانم ڕۆیشتن ئوممەتەکەم هەموو ئەو شتانەیان بەسەردادێ کە بەڵێنیان پێدراوە.

پاشان دەبینین عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود مەبەستەکە بە ئاشکرایی دەردەبڕێ، کە ئەو شایستەترە بە شوێن کەوتن، فەرمویەتی: (هیچ ڕۆژێکتان بەسەردا تێناپەڕێ ئەمەی دوایی

لەوەی پێشەوەی خراپتر نـەبێ تـا دوارۆژ بـەرپا دەبێـت، مەبەسـتم توشبوونی خۆشگوزەرانی نیە، یاخود شـتێ کـە کـەڵکی نـەبێت، بەڵکو هیچ ڕۆژێکتان بەسەر داتێناپەڕێ لەوەی پێش خۆی زانستی تێدا کەمتر نەبوبێتەوە، ئەگەر زانایـانیش ڕۆیـشتن خـەڵکی وەکـو یـەکیان لـێ دێو یەکـسان دەبـن، فـەرمان ناکـەن بـە چـاکەو بەرهەڵستی خراپە ناکەن، لە ئاوا کاتێکدا تیادەچـن، لـە ڕێگـەی ئەبو ئیسحاقەوە ئەویش لە (أبي الأحوص) لـە (ابـن مـسعود)ەوە هاتووە سەبارەت بەووتەی (شر منه) وتویەتی (ساڵێکی بـەپیتمان توش هات، (ابن مسعود) فـەرمووی: (مەبەسـتم ئەمـە نـی یـە، بەڵکو مەبەستم ڕۆیشتنو نەمانی زانایانە)، لە ڕێگـەی (شـعبی) یەوە ئەویش لە (مسروق)ەوە دەیگێڕنەوە کە عەبدوڵڵا فەرمویەتی: (هیچ سەردەمێك بەسەرتانا تێناپەڕێ ئەوەی دووایی لەپێش خـۆی خراپترو زیان بەخشتر نـەبێ، مەبەسـتم ئـەوە نـی یـە ئـەمیرێ لـە ئەمیرێکی پێشووتر باشتر یا ساڵێك لە ساڵێکی تر باشـتر نایـەت، بـەڵام زانـاو تێگەیـشتووەکانتان دەڕۆنو جێنـشینیان نابیننـەوە، خەڵکێکی تردێن بە بۆچـونی خۆیـان فـەتوا دەدەن) دەربڕینێکـی تریشی لەم بارەیەوە لـێ دەگێڕنەوە (ئەوە کەمو زۆری باران نـی یـە بـەڵکو ڕۆیـشتنی زانایانـە، پاشـان خـەڵکێك پەیـدا دەبـن لـە کاروبارەکانـدا بـە بۆچـونی خۆیـان فـەتوا دەدەنو نـاوی ئیـسلام دەزڕێننو کەلوکۆنی دەکەنو دەیـڕوخێنن)، (الـدارمي الأول) لـە

ڕێگەی (شعبی)ەوە بەم دەربڕینە هێناویەتی: (مەبەستم بە پیتی سالێك نی یە لە چاو سالێکی تردا) ئەویتری بە هەمان شێوەیە، لە جێی (شـــارەزاکانتان: وفقهاؤکم) (باشـــترینتان: خیـارکم)ی بـۆ زیاد کردووە.

ئەگونجێ مەبەست لەو سەردەمە باسکراوانە سـەردەمی هـاوەڵان بێت، بنیات لەسەر ئەوەی گوتارەکـە ڕووی لەوانـە بۆیـە تایبەتـە بەئەوانەوە، بەڵام ئەوانەی پاشتردێن ئەوا هەواڵەکـە نایانگرێتـەوە، بەڵام هاوەڵەکە (مەبەست ئەنەسە -ر-) بەگشتی تێی گەیشتووە، هەر بۆیە وەڵامی ئەو کەسەی کە سکاڵای حەجاجی لادەکـات بـەو شێوەیە دەداتـەوەو فـەرمانی ئارامگریـان پێدەکـات، کـە ئـەوان یازۆریان لە (تابعین)ن، (ابن حبان)یش لە (صحیح)ەکەیدا بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوەی فەرمودەکەی (أنس) لەســەر گـشتییەکەی نیە، بەهۆی بـوونی ئـەو فەرمودانــەی لـە بـارەی مەهـدی یـەوە هاتوونو باس لەوە دەکەن کە زەوی پڕدەکـات لـە دادگـەری پـاش ئەوەی پڕکراوە لە ستەمو زۆرداری).[1]

لەگەڵ ئەمەشدا چەمكو تێگەیشتنی ئەوەی (هـیچ سـەردەمێك نایەت ئەوەی دوای خۆی خراپتر دەبێ) لە نێوان هـەموو خەڵکیـدا بڵاوبویـەوە، ئەمـــەش ســـەری کێـــشا بـــۆ بڵاوبونـــەوەی گیـــانی

(١) فتح الباري (١٣/١٢).

نائومێدبوون لە چاکسازیو ترسان لە داهاتو و خۆخستنە باوەشی ئێستاو ئارەزوونەمان لەگۆڕانکاری بەو شێوەیەی قورئان هانی داوین لەو ئایەتەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ (الرعد: ١١) ئەوەتا قورئان هەواڵمان پێدەدا کە گۆڕانکاری لە دەروونو نەفسی مرۆڤەوە بەرەو باشتر یاخراپتر دەست پێدەکات، خوای گەورەش بە هیچ شێوەیەك ستەم لە بەندەکانی ناکات. هەرئەم گیانەش بووە هۆی ئەوەی دڵ بە داهاتوو خۆش نەکرێو موژدەی گەشبینی لەئارادا نەبێت سەرەڕای بوونی چەندین فەرمودەی (صحیح) کە موژدە دەدەن بە گەڕانەوەی خەلافەتی ڕاشدین بە پێی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، وەبەوەی جارێکی تر ئەم ئاینە سەرلەنوێ بەدەردەکەوێتەوەو زەوی سەراپا پڕدەبێت لە دادگەری پاش ئەوەی سەراپای ستەمو زۆرداری بووە..... هتد.

هەموو ئەمانە وازیان لێ هێنراو دایانە پاڵ فەرمودەکانی ئاژاوەو فیتنە، وەکارکرا لەسەر ئەوەی هەر سەدەمێك کە دێ ئەوەی پاش خۆی خراپترە، وەتێگەیشتن لەو فەرمودانە بە شێوەیەکی نادروستو دوور لە مەبەستی خۆی بەدی هات، بە شێوەیەك ئەم تێگەیشتنە بوە هۆی سوور بونی هەمولایەك بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ئەمری واقع بکەن، وەکو ترسێك لەداهاتوو، خۆیان هەڵواسی بە حەجاج دا لە ترسی کوڕەکەی؟!

ئەمە لە کاتێکدا مێژوو پێچەوانەی ئەم بانگەشەیەی سەلماندووە

ســەردەمی موعاویــە - کــە بیــست ســاڵ بــوو - ســەقامگیریو خۆشگوزەرانی زۆرترو زیاتر بوو لەســەردەمی عــەلی کــوڕی ئــەبو تالیب - خوایان لێی ڕازی بێت - سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مــەڕوان باشــتر بــووە لــە ســەردەمی یەزیــد کــە یەزیــد پــێش عەبدولمەلیك بووە، سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز باشــتر بووە لە پێش خۆی؟ سەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك — کە نیزکەی بیست ساڵ بووە - باشتر بووە لە سەردەمی ئومەویــەکانی پێش خۆی، چاخی عەبباسی یەکەم باشتر بووە لە کۆتــاییەکانی چــاخی ئومــەوی، ســەرەتاکانی جێنــشینایەتی عوسمــانییــەکان باشتربووە لە کۆتاییەکانی عەبباسی.... هتد.

٤- هەروەها تێگەیشتنی هەڵە لە فەرمودەکانی کە نــارگێری کردنــی ئاژاوەو فیتنە وەکو فــەرمودەی: (إذا رأيــت شــحا مطاعــاً وهــوى متبعا وإعجاب كل ذي رأي برأيه، فعليك بخاصة نفسك، ودع عنك أمر العامة).[1] و چەندەها فەرمودەی تر لەم بوارەدا — بووە هۆی بڵاوبونەوەی گیانی تاکێتی ون بوونی گیانی کۆمەڵ بونو وازهێنان لە فەرزە کیفائیەکان کە پێویستی بە کۆمەڵ بوو بــۆ ڕاپەڕانــدنی وەکو پشتیوان کردنی ســتەم لــێکراوو لابردنــی خراپــەکاری و.... هتد، کە ئەمە باڵی کێشاو دەستی گرت بەسەر گیانی کۆمەڵ داو

---

(١) أبـو داود بـە ژمـارە (٤٣٤١) ترمـذي بـە ژمـارە (٣٠٦٠) وابـن ماجـە ژمـارە (٤٠١٤) گێڕاویانەتەوە، سەنەدەکەی لاوازە، سەیری (سلسلة الصحيحة) ژمارە (٢٠٥) بکە.

بو بە هۆی بڵاوبونەوەی کەنارگیری - بەتایبەت لە نێوان زانایـانی ئوممەت دا کە بە تواناترین کەسێك بوون بۆ سـەرکردایەتیکردنی‌و ڕووبەڕووبونەوەی ستەم - کە ئەمە ڕێخۆشکەری کرد بـۆ زۆرداری سیاسی لە سایەی ونبوونی گیانی جەماعیەت دا کە هەوڵ دەدات بۆ گۆڕینی واقع بەرەو باشتر.

ئەم گیانە تاکی‌و فەردی یە کەنارگیرە هەر لە سـەدەی دووەمــەوە دەستی بە خۆدەرخــستن کـرد ، ســوفیانی ســەوری بانگەشــەی بــۆ کەنارگیری[1] و وازهێنان لە دونیای دەکرد ، وەدەیوت: (ترکوا لکم دیــنکم فــاترکوا لهــم دنیــاهم) [2]، واتــە: ئاینەکــەتانیان بــۆ جێهێشتوون، ئێوەش دونیایان بۆ بەجێ بهێڵن، لەگەڵ ئەوەی ئـەم وتەیەی لە چاخێکدا وتووە کە دونیا ویستەکان دین‌و شەریعەتیان پیادە دەکردوو بەجێیان دەهێنا ، هەرچەندە هەندێ لادانیش بوبێ - بەڵام ئەم فەلسەفەیە سەری کێشا بۆ باوەڕبوون بەوەی دەکرێ ئایین بەرپابکرێ‌و ئەنجام بدرێ بێ‌ئەوەی دونیاش هاوشانی بێ؟

وورده وورده بەهۆی بڵاوبونەوەی ئەم جۆرە فەلسەفە مەترســیدارە وە (ترکوا لکم دینکم فاترکوا لهم دنیاهم) بڕیارەکانی شــەریعەت لەکار خرا ، بێ‌ڕەچاوکردنی ئەو هەڵ‌و مەرج‌و دۆخەی تێیدا ووتراوە، کە بریتیە لە سەدەی دووەم، ئەوکاتەی زۆربــەی جێنــشینەکان لــە

---

(١) سەیری حلیة الأولیاء (٣٨٨/٦) بکە.

(٢) سەیری حلیة الأولیاء (٤٦/٦) بکە.

زانایانی تێگەیشتوو خەڵکی چاکەخواز بوون – هەرچەندە هەنـدێ ستەمیان ئەنجام دابێ – کەسانی وەکو مەنسورو مەهدیو ڕەشـیدو مەئمون.... هتد بوون، دینو دونیایان پێکەوە گرێدەداو پایـەداریان دەکرد، بە کەنارگرتنی هەرکەسێ کە بیویستایە کـەنارگری لـەو ماوەیەدا دینو دونیا بەوڕادەیە زیانی پێ نەدەگەیشت.

(عمـر بـن حوشـب)ی والی هەسـتی بەمـەکردبوو، چـووە لای سوفیانی سەوری و سەلامی لێکرد، سوفیان پشتی تێکرد، عومەر پێی ووت: ئەی سوفیان، بەخوا ئێمە لـە تـۆ سـود بەخـشترین بـۆ خەڵك، ئێمە کۆڵ هەڵگرو خوێن خۆش کـەرینو پێداویـستیەکانی خەڵکی ئەنجام دەدەینو ئاشـتەوایی نێوانیـان دەکـەین، تـۆ تـەنها پیاوی خودی خۆتیت، بەمە سوفیان ڕووی تێکردو قـسەی لەگـەڵ کردو بۆی کرایەوە.(١)

سوفیـان – لەگەڵ کەنارگیرییەکەیدا – دەیفەرموو: (هەر کەسـە بپارێتەوە بۆ مانەوەی ستەمکار ئەوە پێی خۆشە سـەرپێچی خوا بکرێ.(٢)

لەگەڵ ئەوەشدا ئـەم بانگەشـەیە سـەری کێـشا بـۆ کـەنارگیری کۆمەڵگەو وازهێنان لـە دونیـا لـە پێنـاوی مەترسـی پاراسـتنی ئاییندا، لەگەڵ ئەوەی پایـەدارکردنی ئـایین بـەبێ دونیـا نـاکرێ،

---

(١) سیر اعـلام النبلاء ٧/٢٤٦.

(٢) سەیری حلیة الأولیاء ٦/٤٦.

ناگونجێ ئیسلام بەبێ دەوڵەت بە پایان بگا.

ئەم بانگەشەیە دەروازەی خستە سەرپشت، ڕێگەی خۆش کرد بـۆ پەسەندکردنی ئەو گوتارە سیاسی یەی لە قۆناغی سێهەمدا بەدی دێت، واتە بانگەشــەکردنی عەلمانیەتو جیاکردنـەوەی ئـایین لـە واقعی ژیـــان؟

٥- یەکێکی تر لەو هۆکارانە بریتی بـوو لـە بڵاوکردنـەوەی گیـانی ناچاری (روح الجبـر) لە لایەكو ئیـرجاء لە لایەکی ترەوە، بە هۆی بڵاوبونەوەی ڕێبازی ئەشعەری کە هەردوو باوەڕی (جبر) و (إرجاء) لەخۆ دەگرێ، ناچاری (الجبـر): بریتیە لەوەی باوەڕت وابێ مرۆڤـ بە شێوەیەکی ڕاستەقینە بکەری کردارەکـانی خـۆی نیـە، بـەڵکو بەخوازەو واتە گۆڕی (مجاز) بکەریانە.

(الإرجاء)یش: بریتیە لەوەی باوەڕت وابێ کـە (ئیمـان) تـەنها بەڕاست دانان (تصدیق)ە، کوفرو بێباوەڕی تەنها بە ئینکاری کردن (الحجود)ە[1] نەك شتی تر، خەلیفەکان هەر لادانو خراپەکارییەك بکەن بەوانە لە بازنەی ئیسلام دەرناچن، مـادەم شـایەتمان دێـننو بەردەوامن لە داننان بـەو شـایەتمانەدا، ئـیتر بـا هەرچـی حـەرام کراوەکانە بۆ خۆیـانی حـەڵاڵ کـەنو هەرچـی گونـاهی ترسـناکە ئەنجامی دەن، چ خراپەیەك هەیە پێی هەڵسن..... هتد.

(١) (أصول الدین) ی بغدادی ل (٢٤٨).

ئەمەش ڕێك بەپێی حەزو ئارەزووی پادشاكانە هەروەك مەئمون وتویەتی: (الإرجاء دين الملوك) (إرجاء)و ئایین‌و بیروباوەڕی پادشاكانە؟

بڵاوبونەوەی ناچارێتی (الجبرية): كە بریتیە لەو باوەڕەی وادەبینێ مرۆڤ وەكو پەڕێك وایە لەبەردەم كونەبایەكدا، یاخود ئەو بكەری ڕاستەقینەی كردارەكانی نیە، ئەمەش بووە هۆی ملكەچ كردن‌و تەسلیم بوونی واقع‌و پاڵ لێ دانەوە بەبیانوی باوەڕبوون بەقەزاو قەدەر، بە پێچەوانەی كارو كردەوەی هاوەڵانەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - كە بە قەدەر ڕووبەڕووی قەدەرەكان دەبونەوە لە قەدەری خواوە بۆ قەدەری خوا هەڵدەهاتن.

تەواوی ئەمانە سەری كێشا بۆ ئەو بیروباوەڕەی كە ئەم واقعە بریتیە لەوەی خوا دەیەوێ، ئەم بیروباوەڕە بە هەمان شێوە لەنێو سۆفییەكانیش دا بڵاوبۆیەوە لەبەرئەوەی جیاوازییان نەدەكرد لە نێوان ویستی گەردونی‌و شەرعی خواوو ئەم دوو شتەیان تێكەڵ دەكرد، هەر بۆیە لایان دروست نەبوو بەرگری‌و بەرهەڵستی ویستی خوا بكەن، بەڵكو پێویستە ڕازی بن‌و ملكەچی دەربڕن ؟

وە پادشا ستەمكارەكان سزایەكن لەلایەن خواوە نێردراون، بەڵاش بە پاڕانەوەو دوعا بەری لێ دەگیرێ - هەروەك ئەمە بیردۆزەی حەسەنی بەسری بوو — نەك بەو هێزەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێداوە هەروەك فەرمویەتی: ((من رأى منكم

فلیغیره بیده ....) هەرکەسێ لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەستی بیگۆڕێ، وە فەرمودەی: (لتأخذن علی یـد الظـالم) دەبـێ دەسـتی زۆردارو ستەمکار بگرن، وە فەرمودەی: (إلا أن تروا کفراً بواحاً فیه عندکم من الله برهان) مەگەر کوفرێکی ئاشـکرای وا ببیـنن لـە لایەن خواوە بەڵگەتان لەسەری هەبێ، واتە: لەوکاتەدا هێز بـەکار بهێنن .... هتد.

جا ئەگەر کاتێ تـەواوی ئـەم بـیردۆزەو بـیرو بۆچـونانە پێکـەوە کۆببنەوە (ئیرجاء - ناچاری - کەنارگیری - ڕازی بـوون بـە بـەلاو بەرهەڵستی نەکردنی مەگەر بەپاڕانەوە...) ئەوا بەرەنجامەکان هـەر بـەو شـێوەیە دەبێـت کـە ئومـەتی ئیـسلامی لـە مـاوەی چـەند سـەدەیەکدا گوزەراندویـەتیو دەیگوزەرێنـێ، هـەرەس هێنـانو شکستی ئەم ئومەتە لەبەر پێی لەشکری تەتارەکاندا بەرەنجامێکی لۆژیکانەی سروشتی بلاوبونەوەی ئەم جۆرە بـیردۆزەو تێڕوانینانەیـە کە لە دوتوێیـدا تـۆوی مـردنو لەناوچـونی هـەر شارسـتانێتیو ژیارێکی تێدایە کە هەڵگری ئەم بۆچونانەبێو ڕەواجـی پێبـدا، وە بۆ هەر ئومەتێکی تریش کە ملکەچیان بێتو باوەڕیان پێ بهێنێت.

٦- لەو هۆکارانەش زیادەڕەوی کردن لە گەورەکردنی گوێڕایەڵی کردنی سوڵتانو دەسەلاتدارو داپۆشینی جۆرێك لە پیرۆزیو قودسیەت بـە بەریداو زەبەلاح کردنی پلەوپایەکەی، بە ڕادەیەك شتی وا باو نەبووە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین دا، ئەوانەی ئومەت بەشێوەیەك

مامەڵەی لەگەڵ کردوون کەئەوان نوێنەری ئەم بن‌و چەند تاکێکی خۆی بن، هیچ تایبەتمەندییەکی جیا لە خەڵکیان نیە مەگەر مافی گوێڕایەڵیکردن لە گوێڕایەڵیکردنی خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ، ئەم زیادە ڕەوی یە لەسەردەمی ئومەویەکان‌و لە شام دا بەدەرکەوت تا ئەو ڕادەیەی ووترا: لە بێ‌فەرمانی خوداش دا گوێڕایـەڵیکردنی خەلیفەکان دروستە[1]؟وە خوای گەورە لە گوناهەکانیان خۆش دەبێ هەرچیان کردبێ‌و لە تاوان‌و خراپەکاریەکانیان دەبورێ‌و .... هتد.[2]

هەرئەمـەش وایکـرد لـە عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز لـە وتارەکانیدا زۆر تەئکید بکاتەوە لەسـەر ئـەوەی لـە بێ‌فـەرمانی خوادا هیچ گوێڕایەڵیـەکیان نـاکرێ.[3] لەبـەر بڵاوبونـەوەی ئـەم بیروباوەڕە لە نێوان خەڵکی شام دا، پاشان زیاتر برەوی سـەند، وای لـێ‌هات زیادەڕەوی لە گوێڕایەڵیکردنی خەلیفەکاندا لە نێوان عامەو خاسەدا بڵاوبویـەوە، بـە بیـانوی ئـەوەی مانـەوەی ئـەو مانـەوەی بیروباوەڕو میللەتە، بە نەمانیشیان ئەویش نامێنێ، فەرمودەکانی پێویستی ملکەچـی‌و گوێڕایـەڵییان بـە ڕوکـاری دروسـتی خـۆی نەدەخوێندەوەو لێی تێ‌نەدەگەیشتن تاوەکو -بێ‌ئەوەی هەست بکەن-

---

(١) سەیری منهاج السنة (٢٣٢/١) بکە.

(٢) سەیری منهاج السنة (٢٣٢/١) بکە، وە البدایة والنهایة (٢٤١/٩) لە ڕووداوەکانی ساڵی (١٠٥)ك لە بارەی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیکەوە.

(٣) سەیری طبقات ابن سعد (٢٦٤/٥) وە البدایة والنهایة (٣٢١/٩) بکە.

پلەو پایە خوایەتیان پێ دەبەخشی کە پرسیاری لـێناکرێ لـەوەی دەیکا بەڵکو ئەمان لێپرسراون؟

لە سەردەمەکانی شکستدا کار لەگەڵ خەلیفەکاندا گەیشتەئەوەی زەویان لەبەردەم دەستو پێیدا ماچ دەکرد، بـە شـێوەیەك لەگـەڵیان دەدوانو نازناوی گەورەی وەهایان بەکاردەهێنا کە تەنها بۆخوا دەشێو شایستەی خوایە.[1]

وای لـێ هات دانـانی ئیمـامو پارێزگـاریکردن لـە بـونی کرایـە مەبەست پاش ئەوەی ئەمە خۆی هۆکارێك بـوو، فـەرمان ڕەوایـەتیو بڕیاری ئیمام بووبە پەرستشێکی ڕووت پاش ئەوەی لەگوتاری سیاسی دابەزێنراودا — بڕیاری بەرژەوەند خوازانەی هۆکار داربوو؟

لەگەڵ ئەوەی مەبەست لە ئیمامەت بریتـی بـوو لـە: (پاراسـتنو پارێزگاریکردن لە ئایینو بەڕێوەبردنی کاروباری دونیا)، کەچـی لـەم قۆناغەدا بوونی خودی ئیمـام بـوو بـە مەبەسـت، هەرچـەندە ئیمـام کەمتەرخەمیش بکا لەو ئەرکەی کە بۆی دانراوە، بەڵکو ئەگەر ئایین هەرەس پێبێنـێو تێـكوپێکی بـداو دونیـاش خـراپو وێـران بکـا، لەبەرئەوەی کافرنەبووە، ئەوا حەرامە کەنارخرێو لەکار لادرێ، تەنانەت ئەگەر خۆیشی بیەوێ خۆی لەکارلابباو دەست لەکار بکێشێتەوە؟!!

لەم قۆناغەدا ناکۆکی یەك سەبارەت بەم کێشەیە هاتە ئاراوە، کـە

(١) مالك فەرمویەتی:( چومەلای مەنسوری عەبباسی هاشمیەکان دەستو قاچیان ماچ ئەکرد، خوا لەوە پاراستمی) سیر اعلام النبلاء (٦٧/٨).

ئەویش بریتیە لەوەی: ئایا هەڵس‌وکەوتەکانی ئیمام بەرامبەر ئوممەت لە ڕێی بریکاری (وکالة) وەیە یاخود سەرپەرشتیاری (ولایة)ەوەیە؟

(المرداوی الحنبلی/٨٨٥ ك . ك) وتویەتی: (ئایا بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی لە لایەن ئیمامەوە بەوپێیەیە کە بریکاریانە یاخود وەکیل‌و سەرپەرشتی کارە؟ ئەمە دوو ڕووی هەیە ... قازی (أبو یعلی) ئەوەیانی هەڵبژاردووە کە ئیمام لەکاروباریدا بریکاریانە،لە (أحکام السلطانیة)دا دووگێڕانەوەی باسکردووە سەبارەت بە دامەزراندنی ئیمامەتەکەی ئەگەر هاتوو بەزۆر دەستی بەسەراگرتبێ، ئەمەش بەهەمان شێوە جێی ئەوەیە بکرێتە بناغە بۆ ئەو جیاوازییەی سەبارەت بە سەرپەرشتیاری (الولایة) و بریکاری (الوکالة) هەیە.

لەسەر ئەم جیاوازییە ئەوە بنیات دەنرێ، کە بە لابردن‌و کەنارخستن لادەبرێ، ئەگەر وتمان: ئەو بریکارە، ئەوە دەتوانێ خۆی کەنارخا، ئەگەریش ووتمان: ئەو سەرپەرشتیارو کاربەدەستە، بە لابردن‌و کەنار خستنیش لانابرێ. وە ئایا بۆیان هەیە کەناری خەن؟ ئەگەر لەسەر داوای خۆی بێت: ئەوا حوکمەکەی حوکمی خۆ کەنار خستنە، ئەگەریش خۆی داوای نەکا، ئەوا بە بێ جیاوازی دروست نییە لاببرێ).[1]

(١) الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف ١٠/ ٣١٠ – ٣١١.

بەم شێوەیە ووتنی ئەوەی ئیمامەت بە دەست بەسەراگرتنو زۆرداری دادەمــەزرێ، ســەری کێــشا بــۆ ووتنــی ئــەوەی هەڵسوکــەوتو کــار بەڕێوەبەریەکانی ئیمامــەت بــۆ ئومــەت بەسـیفەتی سەرپەرشـتیاری ولایەت وەکو سەرپەرشتیاری و ویلایەتی باوك وایە بەسەر کوڕە منداڵو بێدەسەڵاتەکەیەوە، نەوەك بەوسیفەتەی بریکاری ئەوانە، چونکە بەهێز گرتویەتی یە دەستو بێئــەوەی ویــستی ئــەوانی تێــدابێت، بەهــەمان شێوەی دەسەڵاتی سەرپەرشتیار (ولی)، بەڵام بریکــار وا نیــە، چــونکە بریکار بەبێ ویستی خاوەن کار ناتوانێ ئەو دەسەڵاتەی هەبێت.

کــاتێکیش ئــەم بیروڕایــە ووتــرا - واتــە هەڵسوکــەوتو کــار بەڕێوەبەرییەکانی بە سیفەتی ئەوەیە کە سەرپەرشتیارە — ئەوەی لێــوە هەڵدەگۆزرێ کە ناتوانرێ لەکار لاببرێ، چونکە منــاڵی بچوكو ئافرەت نــاتوانن سەرپەرشــتیارو وەلی خۆیــان لــەکار بخــەن، بــەو پێیــەی سەرپەرشتیارێتی باوك بەسەر منداڵەکانیەوە بەویستی خۆیان نیە، هەر بۆیە ناکرێ لەکاری بخەن، بە هەمان شێوە ئەگەر ئەمە سەلمێنرا ئــەوا بۆی نیە دەست لەکار بکێشێتەوەو خۆی لابەرێ ؟!!

بەم شێوەیە ئیمام لــە بریکارێکــەوە کــە دەکــرێ لــەکار لابــبرێ — هەروەك لە قۆناغی یەکەمی گوتاری سیاسی دا وابــووە — گــۆڕا بــۆ والییەك بەو شێوەیەی لەگوتاری دووەمی تەئویل کراودا وابــوو — کــە ناکرێ لەکار لاببرێ ؟!

ئەم بۆچونەش لەلای خۆیەوە سەری کێشا بۆووتنی ئەوەی ئیمامەت گرێبەستێکی بەردەوامەو ناکرێ کاتی دیاریکراوی بۆدابنێی، بـەڵکو ئیمام هەر بەئیمامی خۆی دەمێنێتەوە تاکو مردن.

بەم شێوەیە ئـەم گۆڕانکارییـە بەسـەر گوتـاردا هـات، بـە هـۆی زیادەڕەوی لە گەورەکردنی پلەوپایەی ئیمامو دەسـەڵاتەکانی ئـەودا، وە زیادەڕەوی لەوەدا کە ئوممەتو خەڵکی بە ئیمامەوە گرێدرا لـە جـێی ئەوەی ئیمام بە ئوممەتەوە گرێدرێ، ئەمـە لـە کاتێکـدا لـە گوتـاری یەکەم دا – بەڵکو لەسەرەتای قۆناغـەکانی گوتـاری دووەمیـشەوە – جیاوازییەکی وا نەدەبینرا لەوەدا کە ئیمام بریکـاری ئوممەتـە هـەروەك قورتـوبی -٦٧١ ك. ك- فەرموویـەتی: (ئیمـام دەڕوانێتـە کاروبـاری خەڵکی تر، هەربۆیە پێویستە فەرمانو بڕیارەکـانی بڕیـاری دادوەر – واتە قـازی – بێـت، کەواتـە بریکـاریش بـۆی هەیـە دەسـت لـەکار بکێشێتەوەو خۆی لاببات، لەراستیدا ئیمام بریکارو جێگـری ئوممەتـە، کـاتێکیش هـاوڕێکی هـەبوو لـەوەدا کـە بریکـارو دادوەرو هـەموو ئەوانەشی کەسی تر جێگەیان دەگرێتەوە لە شتێکدا بۆی هەیـە خـۆی لەکار لابەرێ، بەهەمـان شێوە ئیمامیش پێویستە بەو شێوەیە بێت).[1]

پێشەوا (الحـرمین الجـوینی الـشافعي)-٤٧٨ ك .ك- فەرمویـەتی: (لابردن بۆ ئەوکەسەیە کە گرێ بەستەکەی ئەنجام داوە (واتـە ئـەهلی

(١) تفـسیر القـرطبي ٢٧٢/١، سـەیری پێـشتر بکـە لـە ڕوونکردنـەوەی ئـەوەی ئیمـام بریکاری ئوممەتە .

حەلل و عەقد).[1]

پاشان فەرمویەتی: (ئیمام ئەگەر شتێکی وای نەکرد کە پێویست بێ لابرێ‌و لەکار بخرێ، ئەوانەشی گرێ‌بەستەکەیان بۆ ئەنجام دابوو دەیان ویست لەکاری خەن، ئەوا بە پێی یەکدەنگی پێشەوایان بۆیان نیە ئەو کارە بکەن، چونکە گرێ‌بەستی ئیمامەت پابەندێتی دەخوازێ‌و ناتوانرێ هەڵبوشێنرێتەوە ئەگەر هۆکاری پێویست لە ئارادا نەبێت بۆ هەڵوەشانەوەی .... بەڵام ئەگەر ئیمام ویستی دەستی لێ‌هەڵبگرێ‌و خۆی لابەرێ، لەم ڕووەوە ڕێبازی زانایان ئاڵۆزییەکی تێدا بەدی دەکرێ).

ئەو ئەوە بە باشتر دەزانێ، کە ئەگەر لابردنی خۆی بەرژەوەندی تێدا بێت ئەوە دەبێ خۆی لەکار لابەرێ، هەروەك چۆن حەسەنی کوڕی عەلی بەو شێوەیەی کرد کاتێ دەستی لە خەلافەت هەڵگرت بۆ موعاویە، و ڕێگریشی لێ‌دەکرێ ئەگەر سەری کێشا بۆ خراپەکاری‌و زەرەرمەندی.[1]

پاشان سەبارەت بەو گۆڕانکاری یەی بەسەر باری ئیمام دا هاتووە فەرمویەتی: (بەڵام ئەگەر بەردەوام بوو لەسەرکەشی دا، دەست درێژی بڵاوبویەوە، خراپەکاری ئاشکرابوو، ماف‌و سنورەکان لەکارخرابوون، پارێزگاری نەدەکرد، ناپاکی ئاشکرا بوو، ستەمکاران بێ‌ترس‌و بیم بوون، ستەم لێ‌کراویش کەسی دەست نەدەکەوت ستەم

---

(١) غـياث الأمم ل (١٢٦).

(٢) غياث الأمم ل (١٢٨ – ١٢٩).

لـێکراوییەکەی نەهێڵێ‌و مافی بۆ بسەنرێتەوە، کەلێن‌و کەمتەرخەمی ڕووی لەکارەگەورەکان کردبوو، قوللەو قەلاَکان لەکارکـەوتبوون، ئـەوا پێویستە خەمی ئەو بارە شپرزو ئالۆزە بخورێت، ئەمـەش لەبەرئەوەیـە ئیمامەت بۆ ئەوە دادەنرێ ئەم بارودۆخە ڕوونەدات‌و بەدی نەیەت، جـا ئەگەر بارەکە سەری کێـشا بۆپێـچەوانەی ئەوشـتەی سـەرکردایەتی‌و سیاسەت دەیخوازێ، ئەوا بێگومان پێویستە فریای بکـەوی، وازهێنـان لە خەڵك بەوەی سەرگەردان‌و بێ‌کەس بسوڕێتەوەو کەس نەبێت لەسەر ڕەواو ناڕەوا کۆیان بکاتەوە باشترە بۆیان لەوەی شوێنی کەسێك بکەون‌و بکەن‌و کەسێك بکەنـە سـەرکردەی خۆیـان لـەکاتێك دا ئـەو کەسـە هاوکاری ستەمکاران‌و پەناگـەی مـل هـوڕان‌و پـشت‌و پـەنای لـەڕێ دەرچوان بێت .... ئەگەر توانرا ئیمامێك دابنرێ کـە کۆکـەرەوەی ئـەو سـیفەتانە بێـت کـە جـێی ڕەزامەندییـە ئـەوا پەلـە دەکـــرێ بـۆ هەڵبژاردنی ..... ئەگەر زانیـشمان بـەبێ خـوێن ڕشـتن‌و پێـك دادان‌و تیاچونی خەڵکی‌و بەفیـڕۆدانی سامان‌و دارایی ئیمام دانانرێ ئەوا لەم کاتەدا ئەو سەرەنجامە دەپێـوری کـە خـەڵکی بـە ئاراسـتەیدا دەڕۆن‌و گوزەرانی تێدا دەکەن، جا ئەگەر ئەو واقعەی هەیـە زیـانی زۆرتربـوو لەوەی مـەزەندە دەکرێ ڕوبدات، ئەوا پێویستە بەرگـەی توشـهاتەکان بگیرێ لە پێناوی نەهێلانی گیروگرفتە هەنوکەییەکان بناغەی ئەمەش دەگەڕێتـەوە سـەر بـەدیهێنانی بەرژەوەنـدی مـسوڵمانان‌و گەڕانـەوەی زۆرترین سوودو قازانج بۆیان، وە بەرگـەگرتنی سـوکترین زیـان‌و زەرەر

ئەگەر نەدەکرا خۆتیان لـێ بپارێزی.... ئەوکەسەی ئیمامەتی بەدەستە ئەگەر خراپەکارییەکانی زۆرو زەوەندە بوونو خووە خراپەکانی فرەبوونو هەڵەو هەڵتــرازانی یەك بەدوای یەکدا دەهاتنو، ترسی لەدەست چونی کــرۆكو پایــەکانی ئیــسلام[1] هاتــە ئــاراوەو کەسیــشمان نەبینیــەوە بیکەینە ئیمام بۆئەوەی بەرهەڵستی ئــەو کەســە بکــا بــەو شــێوەیەی بەرهەڵستیو بــەرگری یــاخی بــووان دەکــرێ، ئــا لەوکاتــەدا ئەگــەر رێککەوت کەسێکی گوێڕایەڵی کراوی خاوەن کەسوکارو کۆمەڵ، لــە رێی خوادا هەڵدەسا بە فەرمان بە چاکەو بەرهەڵستیو نــەهی کــردن لە خراپە، بە کاروباری مــسوڵمانانیش هەڵدەســا ئەگــەر مــسوڵمانان هاوپشتی بکەن– با بەردەوام بێت لەوەدا خوای گەورە پشتیوانیەتی.[2]

لێرەدا ئیمامی (جوینی) تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کــەواجبێتی دانــانی ئیمــام وەك حــوکمێکی شــەرعی پاســاو دراوە بــە مەبەســتی پاراستنی وولاتو راپەڕاندنی بەرژەوەندییەکانی ئومــەت بــەوەی ئــایین بپــارێزێو کاروبــاری دونیــا بــەڕێوە بــبرێ، جائەگــەر بــوونی ئیمــام پێچەوانەی ئەم مەبەستەی دەدا بەدەستەوە، بە شێوەیەك سەری دەکێشا بۆ لەدەستدانی دەوڵەتو مافەکانی ئومــەتو بەرژەوەندییــەکانی، لــە رووی شەرعەوە پێویستە لەکار بخرێو ئیمامێکی بە توانا دابنــرێ بــۆ ئەوەی بەو کارانە هەڵسێ کە پێی سپێردراوە، چــونکە وازهێنــان لــە

(١) زۆربەی سستمە فەرمانڕەواکانی جیهانی ئیسلامیو عەرەبی ئێستا بەوشێوەیەیە.

(٢) غیاث الأمم ل ١٠٦ – ١٠٧ بە کورت کردنەوەوە.

خەڵکی بەبێ ئیمام باشترە لە ئیمامێـك ڕێگرییـان بكـاتو خوێنیـان بڕێـژێو حـەرام كراوەكانـان حـەڵاڵ بكـات، چـونكە ئیمامــەت بـۆ مەبەستێکی تر پێویست بووە، زۆربەی زانایانی پێشین لای کەمی ئـەو کارانەی ئیمامیان دیاری کردووە کە پێویستە ئیمام پێ هەستێ تاوەکو واجب بێگوێڕایەڵی بکەن، هەروەك عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی: (مافە لەسەر ئیمام بەوپێیە فەرمان ڕەوایـی بکا کە فەرمانی خوایە، وە سپاردە بگەیەنێت، ئەگەر ئەوەی کرد ئەوە مافە لەسەر مـسوڵمانان گوێبیـستی بـنو ملکەچـی بکـەنو بـەدەم داواکانیەوە بچن).[1] هەروەها فەرمویەتی: (ئـەی خەڵکینـە، تـەنها ئەمیری چاکەخوازو خراپەکار کاروبارتـان سـازدەکات، ووتیـان: ئـەوە چاکەکارەکەمان زانی، ئەی خراپە کارەکـە چـۆن؟ فـەرمووی کـار بـۆ بـاوەڕداران دەدۆزرێتـــەوەو مۆڵـــەتی خراپـــەکارانیش دەدات، خـــواش کارەکانی بۆ دەگەیەنێ، ئاسایـشی ڕێگاوبـان دەپـارێزێ، بازاڕەکانتـان گەرموگوڕ دەکات، دەسـتکەوتەکانتان بـۆ دابـەش دەکـات، جیهـادی دوژمـنانتان دەکات، تۆڵەی بێدەسـەڵات لـە بـەهێزو دەسـەڵاتدارەکان دەسێنێ).[2]

لێـرەدا عـەلی (خـوای لێ ڕازی بێـت) پاسـاوی زەرورەتـی میرایـەتی هەرچەندە ئیمامەکە خراپەکار (فاجر)یـش بێـت بـەوە دەداتـەوە کـە

(١) الخلال لە (السنة)دا ل ١٠٩ بە سەنەدێکی سەحیح.

(٢) مصنف ابی شیبة ٥٦٢/٧.

پارێزگاری کرۆکی ئیسلام بێتو جیهادی دوژمنان بکاتو دەستکەوت بەش بکـات، فـەرمانڕەوایی خـەڵکی بکـاو مـافی بێدەسـەڵات لـە دەسەڵات دار بسێنێو .... هتد، بەڵام ئەگەر بەم مەبەستانە هەڵنەسا ئەوا نەبوونی لە بونی باشترە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: (أيها الناس: اتقـوا الله، واسمعـوا وأطيعوا، وإن أمّر عليكم عبـد حبـشي مـا أقـام فـيكم كتـاب الله عزوجلّ)،[1] لە گێڕانەوەیەکی تردا (ما أقام لكم كتاب الله).[2] لـە گێڕانەوەیەکی تردا (ما قادكم بكتاب الله).[3] گوێڕایەڵیو ملکەچی کردۆتە مەرج ئەگەر کیتابی خوا پەیڕەوکرا.

شێخی ئیسلام دەفەرموێ: کیتـابو دادگـەری گـرێدراوی یـەکن، کیتاب ڕوونکەرەوەی شەرعە، هەرکەسەش بەدادگەری فەرمان ڕەوایی کرد ئەوا فەرمان ڕەوایی بەشەرع کردووە).[4]

هەرکاتێ عومەر کەسێکی بکردایەتە کاربەدەست لە پەیمانەکەیدا دەینوسی: (گوێڕایەڵی و ملکەچی بکەن تـا ئەوکاتـەی دادگـەریتان لەناودا پەیڕەو دەکـات.[5] بـۆ خـەڵکی کوفـە نوسـی: (هەرکەسێ

---

(١) ئەحمەد گێڕاویەتی یەوە لە (مسند)دا (٤/٧٠)، وە (٥/٣٨١) و (٦/ ٤٠٢ – ٤٠٣) بە ئیسنادێکی (صحيح).

(٢) الترمذي، ف ژمارە (١٧٠٦) فەرمویەتی (حسن صحيح).

(٣) ئەحمەد لە (المسند)دا (٦/٤٠٣) بە سەنەدێکی (صحيح)، لە (صحيح مسلم)دا ف بە ژمارە (١٧٠٦) هەیە.

(٤) مجموع الفتاوى (٢٥/٣٦٦).

(٥) (السنة)ی الخلال ل (١١٢) بە ئیسنادێکی صحيح لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە.

ئەمیرەکەی ستەمکی لـێکرد ئەوا لەلایەن منەوە ئەو ئەمیر نیە، پیاو هەبوو دەچووەلای (مغیرة بن شعبة) ئەمیری کوفە ئـەیوت: یـا ئـەوەتا مافی خۆمت لـــێ دەسـتێنم، یائـەوەتا میرایـەتیت بەسـەرم دا نیـەو ئەمیری من نیت). [1]

عومەر نوسراوێکی بۆ میری بەسرە ئەبوموسـای ئەشـعەری نوسـی (پـاش سـوپاسو سـتایش، بـەردەوام خـەڵکی کەسـایەتی – واتـە سەرکردە- یـان هەیـە پێداویـستییەکانی خـەڵکی دەخەنـە ڕوو، لای خۆتەوە ڕێز لەو کەسایەتیانە بگرە، مسوڵمانی کـەم دەسـەڵات ئـەوەی دەوێ کـە لـە فـەرمان ڕەوایەتیـدا دادگـەری لەگەڵـدا بکـرێو (لـە بەخشین)دا بەشی بدرێ). [2]

قازی (إیاس بن موعاویە – ١٢٢ ك . ك) بـاس لـە لانـی کـەمی ئەرکەکانی ئیمام دەکاو لەو بارەوە وتویەتی: (پێویستە سـێ شـت بـۆ خـەڵکی بکـرێ، ئـەبێ ئاسایـشی ڕێگـاو بانیـان بـۆ بپـارێزرێ، بـۆ فەرمانڕەوایەتی کردنیان کەسـێك هەڵبـژێردرێ تـاوەکو بـە دادگـەری فەرمانڕەوایەتییان لە نێواندا پیادە بکات، وەکاری ئەو نوێنەرانە ڕێـك بخا لە نێوان ئەوانو دوژمنانیاندایە، ئەگەر دەسـەڵاتدار ئـەم شـتانەی ئەنجامدا ئـەوا خـەڵکی ئـارام دەگـرن لەبـەردەم شـتەکانی تـری وەك

(١) (الـسنة)ی الخـلال ل ١١٨ بـە ئیـسنادێکی صـحیح، هـەروەها (الجـدد) لـە (المسند)ەکەیدا ف ژمارە (١١٩٩) و بەئیسنادێکی (صحیح) گێڕاویەتی یەوە.

(٢) (الـسنة)ی (خـلال) بـە ئیـسنادێکی (صـحیح)، هـەروەها (علـی بـن جعـد) لـە (مسند)ەکەیدا هێناویەتی –، ف ژمارە (١١٩٩) بە ئیسنادێکی (صحیح).

خۆخۆیی(*) و زۆر شتی تر کە پێیان ناخۆشە).(1)

قورتوبی فەرمویەتی: (ئیمام بۆ بەرهەڵستی دوژمنانو پاراستنی کرۆكو ناوەرۆکی ئیسلامو چارەسەرکردنی کەلێنو پێدانی مافەکانو پیادەکردنی سنورەکانو کۆکردنەوەی سامانو دارایی بۆ خانەی سامانو دابەشکردنی بەسەر کەسەشیاوەکاندا دانراوە).(2)

لەراستیدا ئەو چەمکانەی نمایندەی بنەماکانی گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراویان دەکرد ونبوون، چەمکی: (اسمع وأطع وإن أخذ مالك وضرب ظهرك).(3) واتەگوێبیستو ملکەچ بە ئەگەر

(*) ووشەی (خۆخۆ)یمان بۆ (أثرة) داناوە.

(1) (أخبار القضاة) (1/355) بە ئیسنادێکی صحیح.

(2) الجامع لأحكام القرآن (1/271).

(3) ئەم فەرمودەیە بەشێکە لە فەرمودەیەکی حوزەیفەی کوڕی یەمان سەبارەت بەفیتنە، خەڵکی ئەم فەرمودەیەیان لێ گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەم دەربڕینەی تێدا نیە جگە لەو گێڕانەوەیە نەبێ کە (أبو السلام الحبشی) لە (صحیح مسلم)دا بە ف ژمارە (52/1747) هێناویەتی، (دارالقطني) لە (الإلتزامات والتتبع) ف ژمارە (53) پێی ڕاگەیشتووە (استدرکه علیه) (واتە سەرنجی خۆی لەسەر تۆمار کردووەو ئەم کارەشی بۆ زۆر فەرمودەی تری بوخاریو موسلم کردووە - وەرگێڕ -) وە فەرمویەتی:( ئەمە لای من (مرسل)ە، ئەبو سەلام لە حوزەیفەی نەبیستووە)، (مقبل بن هادی)ی (محقق) لە پەراوێزیدا دەڵێ:( ئەم زیادەیە لاوازە چونکە لە ڕێگەیەکی پچڕاو (منقطع)ەوە هاتووە، هەروەها ئەم زیادەیە لە گێڕانەوەی (سبیع بن خالد) یان ( خالد بن خالد الیشکری)دا هاتووە هەروەك لای (أبوداود)یش هەیە ف ژمارە (4244) بەڵام (حافظ) لە بارەی ئەم ((سبیع)ەوە وتویەتی پەسەند (مقبول)ە، بەڵام ئەگەر هەرخۆی گێڕابویەوە وەك فەرمودەیەکی ئاوا بەناوبانگ(مشهور)ی حوزەیفەدا هاتووە ئەوەی لێی پەسەند ناکرێ، هەروەها ئەوەی لەمی دەگێڕێتەوە دیار نیەو نەناسراوە، ئەلبانی لە بارەی ئەم گێڕانەوەیە لە (سلسله الصحیحة 4/400)دا دەفەرموێ (ئیسنادەکەی لاوازە (إسناده ضعیف).

مـاڵەکەشتیان بردو دارکاریشتیان کرد ) بڵاو بویەوە، ئەم دەربڕینە بـۆ مـەبەستێکی ترو لەجێی خۆیدا بەکارنـەهێنرا، بـەڵکو پاشـتر بوبـە ڕێساو بنەمایەك لەبنەماکانی بیروباوەڕ، هەرئەمـەش بۆیـە سـوننەو کۆڕا، هەرکەسەشە موخالیف بوو بـە بیدعەچـی تۆمـەتبار دەکـرا؟! لەگەڵ ئەوەی فەرمودەکە دەشیا وەهـا لێـك بدرێتـەوە کـە پێویـستە گوێڕایەڵی ئیمام بکرێ تەنانەت ئەگـەر ئیمـام حـەددی لەسـەر ئـەو مسوڵمانانەش پیادە کردبێ، یاخود بە شێوەیەکی ڕەوا بڕیـارێکی بـۆ بەرژەوەندی نەیارەکەیدا لە ماڵو سامانەکەیدا، نـەك ئەمـە بکرێتـە بیانوی دەرچوون دژی، یاخود وازلە گوێڕایەڵی کردنی بهێنرێ لەهـەر شتێکدا گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ تێدایە، بـەم چـەمکە نوێیە کارەکە بەرەو هەڵدێرو نالەباری چوو، دەروازە خرایە سەرپـشت بۆ زۆرداری سیاسیو ستەمو لەکار خـستنی سـنوورو مافـەکان، ئـەم گوتارە نوێیە تەئویلکارە لەنێو ئەهلی سوننەدا برەوی پەیداکرد، جـا ئیتر ئەوانەیان فـەرمودەناس (أهـل الحـديث) بـوون یـاخود زانایـانی جـەدەلو بیروبـاوەڕ (مـتكلمين)، هێـشتا سـەدەی چـوارەم کۆتـایی پێنەهاتبوو تا ئەوەبوو ئیدیعاو بانگەشەی کۆڕا (إجماع) کـرا لەسـەر ئەم چەمکە نوێیەو هەموو ئەوانـەی پێـچەوانەی ئـەم ڕایـەبوون بـە بیدعەچی تۆمەتبارکران؟! بێ ئـەوەی ڕاڤەیـەکی دروسـت پێـشکەش کرێو بخرێتە پێش چاو، کەچۆن ئەمە ئەبێتـە بنـەماو ڕێسایەك لـە بنـەماکانی بیروبـاوەڕ، لـەکاتێك زوبێـرو تەڵحـە نـەیان بیـستبوو،

هەردوکیشیان لە (دە) مــوژدە پێدراوەکـەی بەهەشـت بـوونو دەسـت پێشخەربوون لە مسـوڵمان بوونو ئیسلامـەتی دا؟!

چۆن ئەم ڕێساو ئەسڵە لەعائیشەی دایکی باوەڕداران‌و شارەزاترینی ئافرەتانی جیهان شاراوو نادیار دەبێت؟ وە چۆن حوسەینی کوڕی عەلی‌و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر پێی نازانن؟!

چی بڵێین لە بەرامبەر کوڕانی هاوەڵاندا کاتێ ئەم ئەسڵە هــەبوبێ‌و ئەوانیش کــــۆك بوونە لەســــەرئەوەی دژ بە یەزیـد ڕاپــەڕن؟!! چـۆن ئەبێ کارو فرمانێ ئەرك‌و مــاف‌و دیـن بوبـێ لـە سـەدەی یەکـەمی کۆچی‌و نیوەی سەدەی دووەم، پاشان ئەبێتە حەرام‌و بیدعە لە سـەدەی سێیەم دا؟!!

لەراستیدا واقع چەمکەکانی خۆی سەپاند بەسەر خەڵکی ئەو چاخ‌و سەردەمەدا، بۆچونەکانیشیان زیاتر دەربڕی ئەو واقعــەبوو وەك لــەوەی دەربڕی دەقەکان بێت، هەر بۆیە ئیمــامی ئەحمــەد ئـەو فەرمودەیـەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی پەسەند نەدەکرد کە دەیفەرموو: (یکــون أمراء یقولون ما لایفعلون، فمن جاهـدهم بیـده فهـو مـؤمن) واتــە: (هەندێ ئەمیر دێن ئەوەی دەیڵێن نایکەن، هەرکەسێ بەدەستی دژیــان بکۆشێ ئەوە باوەڕدارە)، ئیمامی ئەحمەد دەیوت: (ئەم ووتەیە بەوتــەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ناچێ، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خۆڕاگرن تا بەمن دەگـەن (اصـبروا

حتى تلقـــوني).[1]

(ئەحمەد) خۆیشی ئەم فەرمودەیەی لە (مسند)ەكەیدا گێڕاوەتـەوە بەم دەبڕینە: (إنه لم یكـن نبـــي قـط إلا ولـه مـن أصـحابه حـواري وأصحاب یتبعون أثره ويقتدون بهديه، ثم يأتي من بعد ذلـك خوالـف أمراء يقولون مالا يفعلون ويفعلون ما لايؤمرون)،[2] بەڵام كۆتـايی فەرمودەكەی نەهێناوە كـە بریتیـە لـە: (فمـن جاهـدهم بيـده فهـو مؤمن)؟! ئەمە لە كاتێكـدا فەرمودەكـە ڕچـەكەی دروسـتەو هـیچ (علـة)یەكی نیە.[3]

لێرەوە ئەو جیاوازیە ڕوونو ئاشكرایەمان بۆ دەردەكەوێ كەلەنێوان دەقەكانی (قورئانو سوننەت)دا هەیەو بـۆ هـەموو كـاتو شـوێنێك هاتووە، لەگەڵ وتەی پێشەوایان كـە بریتیـە لـە تێگەیـشتنی ئـەو دەقانەو ڕەچاوكردنی چۆنێتی پیادەكردنی بە شـێوەیەكی دروسـت لـە

---

(١) (السنة)ی (خلال)، ف ژمارە (١٠٥).

(٢) (المسند) (٤٦١/١ – ٤٦٢)، هەروەها لە (٤٨٥/١) بە هەمان ڕچە لە ڕێگەیەكی تـرەوە هاتووە، كۆتایی فەرمودەكەی باس نەكردووە.

(٣) موسلم بە ف ژمارە (٥٠) گێڕاویەتی یەوە، ئەحمەدیش لە (مسند) (٤٨٥/١)،(٤٦١-٤٦٢) بە كورتی، ئەبوعوانەش لە موسلیمەوە (٣٦/١) هێناویـەتی، (ابن حبـان)یـش لە (صـحیح)ەكەیـدا بـە فـەرمودەی ژمـارە(٦١٩٤) و (الطبرانـي)یش لـە (الكبیر)دا بـە فەرمودەی ژمارە(٩٧٨٤) و (ابـن منـده) لـە (الإیمـان)دا بـە ژمـارە (١٨٤)(ابـن منـده) وتویەتی ئەم فەرمودەیە سەحیحە بوخـاری نـەیهێناوە بێئـەوەی (علـة)تێكـی هـەبێ، (عبدالله بن الحارث الجمحي) لە (سهیل بن علی بن أبی صـالح عن سهیل عن أبیـه عن أبی هریره) فەرمودەیەكی لەم جۆرە دەگێڕێتەوە.

سەردەمو چاخی خۆیاندا، ناگونجێو ناکرێ هــەر چــۆنێك ئیجتیهادیــان کردبێ ووتەکانیان وەکو دەقەکانی قورئانو سوننەی (صــحیح) ســەیر بکرێن، کە بریتیە لە نیگاو بۆهــەموو خــەڵکی هــاتووە لــە تــەواوی چــاخەکاندا لــە قورئــانو ســوننەتدا نــەوتراوە (لەگــەڵ کەســی زاڵو سەرکەوتەدابن -کونوا مع مــن غلــب) هــەروەك عەبــدوڵڵای کــوڕی عومـــەر وتویـــەتی: (نحـــن مـــع مـــن غلـــب – ئێمـــە لەگـــەڵ کەســـی سەرکەوتودا دەبین) ئیمامی ئەحمەدیش ئەمەی وتووە.[1]

ئەمە لەکوێو ئەو ووتەیەی عومەر لەکوێ کە بە ئامادەیی هاوەڵان فەرموی: (من دعــا إلى إمــرة مــن غــير مــشورة المسلمين فاضــربوا عنقه)؟![2] واتــە هەرکەســێ بانگەشــە بــۆ میرایــەتی خــۆی بکــات بێڕاوێژی مسوڵمانان ئەوا لەملـــی بدەن.

قسەکەی عەبدوڵڵای کــوڕی عومــەر بــۆ ســەردەمێك دەشــێو بــۆ سەردەمێکی تر ناشێ، بۆ خەڵکێك دەشێو بۆ ئەوانی تر ناشێ، بــەڵام دەقەکانی قورئانو فەرمودەی دروســت (نــصوص الــشارع) گونجــاویو سازبونی بەدەر لەکاتو شوێن، فەرمان دەکا بە بیــستنو گوێڕایــەڵیو ئارامگری هەروەك چۆن فەرمان دەکات بە هەقبێژیو لابردنی خراپــەو بەرگریکردنی مرۆڤ لەخۆییو سامانو ناموسی .... هتد.

ئەوەشی مەترسی ئەم بارەی زیاتر کردبوو بریتی بوو لەوەی ئەوانەی

(١) (الأحكام السلطانية)ی ئەبو یەعــلا ل ٢٣.

(٢) (السنة)ی (خلال)، ف ژمارە (١٠٦) بە ڕچەیەکی (صـحیح) سەیری پێشوتر ل ٣٥ بکە.

پابەندبوون بەم چەمکە نوێیانەوە بریتی بوون لە خەڵکانی چاکەخوازو خاوەن فەزڵ، کەچی تەماحکارو حەز ویستەکان هەڵیان دەکوتایە سەردەسەڵات بێ ئەوەی بترسن لە تۆمەتبارکردنیان بە بیدعەو فاسقێتی، مادەم پاش گەیشتن بە دەسەڵات دەبنە کاربەدەستو خاوەن فەرمانو گوێڕایەڵی کردنیان واجب دەبێو حەرامە لێیان ڕاپەڕیتو پێویستە بۆیان بپارێیتەوە ؟!

بەهۆی ئەم چەمکە مەترسی دارانەوە کەسانی وا گەیشتنە دەسەڵاتو جڵەوی کاریان گرتەدەست کە پێشتر بەزندیقو مولحید تۆمەتبار کرابوون، ستەمو خراپەکاری بڵاوبویەوە، کاروباری ئوممەتیش بەرەو لاوازیو شیازە پچڕاوی ڕۆیشتو تا کار گەیشتە ئەوەی کاروبار بکەوێتە ژێر دەستی کۆلۆنیاڵو ئیستعمارەوە.

لەراستیدا نەهێشتنو ڕێگری کردن لە ڕاپەڕینو دەرچوون، بڕیارێکی پاساو دراو بوو، ئەویش بۆ ئەوەبوو تاوەکو خەڵکی لە ئاسایش دابنو مافو سنوورو تێکۆشانو .... هتد بەرپابێ، جا ئەگەر هەموو ئەو مەبەستانە لەدەست چوون ئەوکات نەهێشتنی ڕوخانی دەسەڵات - ئەگەر ئوممەت توانی - واتایەکی نابێت - هەر بۆیە لێکۆڵینەوەی دروست، کۆکردنەوەو سازدانی دەقەکانە نەك پیکدادانیان، وەکار کردنە بە هەموویان بە پێی گونجانو ڕەخسان، لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە گشتییەکانو مەبەستە شەرعییەکان هەروەك عەلامە (المعلمی) فەرمویەتی: (ئەبوحەنیفە بەباشی دادەنا یاخود بە پێویستی دادەنا دژبە خەلیفە عەبباسییەکان ڕاپەڕی، ئەمەش پاش

ئەوەی ستەمیان لێوە بەدەرکەوت، وای دەبینی جـەنگ کـردن لەگـەڵ ئەمانەدا لە کوشتارو جەنگی کافـران لـەوەدا جیاوازییـان تێـدابوو، ئەوانەی پێیان باش بوو دژیان دەرچی ئەمەی بە فـەرمان بـە چـاکەو نەهی کردن لە خراپەو هەقبێژی دادەنا، ئەوانەشی پێیان بـاش نـەبوو وای دەبینی ئەمە لاوازکردنـی یـەکریزیو یەکـدەنگی مـسوڵمانانەو بەشبەش کردنی کۆمەڵو پەرتەوازەکردنی یەکێتیو یەکریزیانە، بـوار ڕەخساندنە بۆ ئەوەی بە کوشتاری یەکتری یەوە سـەرقاڵ بـن، بەمـەش بێهێز دەبنو دوژمنیـان لـە بەرامبـەردا بـەهێزدەبن، لێـرەوە قـەڵاو قوللەکان پشتگوێ دەخرێو دوژمنـان دەستی بەسـەردادەگرن ..... بـەم شێوەیە، ئەو دەقانەی هەریەك لە ڕێگرانو ئەوانەشـی مۆڵـەت دەدەن لای هەمووان ڕوونو ئاشکرایە.

زاناو توێژەرەوەکان هەمـوو ئەو دەقانـە کۆبکەنـەوە، بـەوەی ئەگـەر گومانی زاڵ ئەوەبوو کە ئەو و بەرەنجامە خراپەی لە دەرچوونو ڕاپەڕین دەکەوێتەوە کەمو سوکتر بوو لەوەی بەرگەی دەگیرێ، ئـەوا دەرچـوونو ڕاپەڕین دروستە ئـەگینا نـەخێر، ئـەم تێڕوانینـەش لەوانەیـە جـێی ناکۆکی بێ لەنێوان موجتەهیداندا.[1] لەگەڵ هەمـوو ئەمانەشدا، وە لەگـەڵ چەسـپانی بڵاوبونـەوەی ئـەو وتەیـەی کـە دەرچـوون دژ بـە

(١) التنکیل ل(٢٨٨ – ٢٨٩)، سـەرنج دەدرێ ئەوانـەی بەرهەڵستی دەرچـوون لـەدژی دەسـەڵات دەکـەن نەهێـشتنەکە بەوەپاسـاو دەدەن کەلەبەرئەوەیـە جیهـاد لـەکار نەخرێو وولات بپارێزرێو ئاسایشی ڕێگاکان پارێزراوبێو مافی بێدەسەڵاتەکان بسەنرێتەوە، ئەمانـەش حـوکمی پەرسـتـشیانەی ڕووت نـین، بـەڵکو بەرژەوەنـدی هۆکارداره، حوکمیش بەپێی بوونو نەبوونی هۆکارەکە دیاری دەکرێ.

دەسەڵاتدار بە حەرامو یاساغ دەزانێ، کەچی زانا خواناسەکان بـەردەوام بەرەنگاری ستەم دەبونـەوەو ئینکـاری خراپـەیان دەکـرد، بـە شـێوەی فەردیو جـەماعی، حـەق بێـژیان ڕادەگەیانـد، چـونکە ئـەوەیان بـە دەرچوونی ڕێلێگیراو (ممنوع) نـەدەزانی بـە بیـانوی کـوێراو دەلالـەتی دەقەکانەوە، هەروەك چۆن لە ساڵی ٤٦٤ك ڕوویـدا ئـەوەبوو زانایـانی ئەوکاتە پێکەوە دەرچـوون، شـەرعزانە حەنبـەلی یـەکان ڕاپـەڕین بـە پێشڕەوی شەریف ئەبوجەعفەرو شاغعیەکانیشیان لەگـەڵ بـوو، ئـەبو ئیسحاقی شـیرازی لـە پێـشیانەوە بـوو، هـەموویان ڕوویـانکردە (دار الخلافة) بۆ لابردنی خراپەکاری یەکان.[1]

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لەگەڵ شوێن کەوتوانی دا هەمان کـاری ئەنجام دەدا لە لابردنی خراپـەکاری یـەکانو بـەرگریکردن لـە ستەم لـێکراوەکان، لەوانە دەرکردنـی پێـشەوا (المزی) لەگرتوخانـە بـەبێ مۆڵـەتی سـوڵتان و پیـادەکردنی (حـدود) بەسـەر تاوانبارانـدا.[2] ڕووبەڕووی سوڵتانی پادشا ناسر کوڕی قلاوون بویەوە کاتێ کە ویستی هەندێ لەو قازیو فەقیهانە بکوژێ کە (ابن تیمیة) یان بەگرت دابوو، وە هاریکاریان کردبوو بۆ لابردنـی سـوڵتان ناسـرو بەیعـەت دان بـە جاشنگیر، ئـیبنو تەیمیـە ئـەو ویـستەی سـوڵتانی پەسـەند نـەکردو ئەوشتەی ئەوی پێخراپو ناخۆش بوو، لەوبارەیەوە پێی ووت: (ئەگەر

---

(١) سەیری ابن کثیر ١١٢/١٢و ذیل طبقات الحنابلة ١٨/٣ بکە.

(٢) سـەیری ابـن کـثیر ٣٥٥/١٣ سـاڵی ٦٩٣ك و ٢٠/١٤ سـاڵی ٧٠١ك و ٣٦/١٤ سـاڵی ٧٠٤ك و ٣٨/١٤ ساڵی ٧٠٥ك بکە.

ئەوانە بکوژی دوای ئـەوان کەسـی هاوشـێوەیانت دەسـت ناکـەوێ)، سولّتان پێی ووت: (ئەوان ئازاری تۆیـان داو چـەند جـار ویـستویانە بتکوژن)، پێی فەرموو: (ئـەوەی ئـازاری منـی داوە گـەردنیم ئـازاد کردووە)، بەردەوام هانی دا تاسولّتان لێیان خۆش بوو، تا ئەوەبو (ابن مخلوف) سەرسەختترین دوژمنەکانی ئیبنو تەیمیەو توندترین ناحەزی لە بیروبـاوەڕدا ووتـی: (کەسـی وەکـو ئـیبن تەیمیـەمان نـەدیوە، هـانی خەڵکماندا لە دژی بەڵام تواناکمان بەسەریدا نەشکا، کاتێ ئەو توانای بەسەرماندا شکا لێمان بوراو بەرگری لـێ کردین).[1] ئیبنو تەیمیـە هەمان ئـەو ڕەفتـارەی ئەنجامـدا کەپێـشتر ئیمـامی ئەحمـەد لەگـەڵ موعتەزیلەدا کردی.

(ابن القیم) بەربەزەیی خوا بکـەوێ، فەرمویـەتی: (هـیچ کەسـم نەدیوە کۆکەرەوەی هەموو ئەو خەسڵەتانە بێت بـە ئەنـدازەی شـێخی ئیسلام ئـیبنو تەیمیـە (خـوا ڕوحـی پیرۆزکـا)، هەنـدێ لـە هاوەڵـە گەورەکانی دەیانووت: حەزم دەکرد من بۆ هاوڕێکانم وەکو ئەو بومایە بۆ دوژمنو ناحەزەکانی، هیچ کات نەم بینیوە بپارێتەوە دژیان، بەڵکو بۆیان دەپاڕایەوە، ڕۆژێك هاتمە لایـیو مـوژدەی مردنـی یـەکێك لـە گەورەترین دوژمنو ناحەزەکانیم پێیدا کـە زۆر دوژمنایـەتی دەکـردو ئازاری پێدەگەیاند، پیاما هەڵشاخاو ئەوکارەمی پێ ناخۆش بوو (إنا

(١) ابن کثیر (٥٦/١٤) ساڵی (٧٠٩)ك.

لله وإنا إليه راجعون)ی کردو، پاشان یەکسەر هەستا چوو بۆلای خــاوو خێزانیو سەرەخۆشی لـێکردنو فەرمووی: (من لەجێی ئـەوم، هــەر پێویستییەکتان هەبێ لە خزمەتاندامو هاوکاریتان دەکەمو قسەی تری لەم شێوەیە، ئەوانیش یەکسەر دڵشادبوون پێی، بـۆی پاڕانــەوە، ئــەم کـــارەی ئــەویان زۆر لاگـــەورە بــوو، بــەر بــەزەییو ڕەزامەنـدی خــوا بکەوێ). (١)

ئەمەش تەئکید کردنەوەیــە لەســەر بنــەمای لێ بــوردەیی لەگــەڵ ئەوانەی هاوڕات نــینو حــەڵاڵ نــەکردنی خــوێنو مــاڵو ناموســیانە، هەرچەندە بیدعەکەشی کوفرو گومڕاییش بێت، چونکە مسوڵمانێکی تەئویل کارە، مافەکانی مسوڵمانێتی بەسەر مسوڵمانانەوە هەیە.

هـــەروەها زانایـــانی ئەزهـــەر لـــە ســـاڵی ١٢٠٩ ک – ١٧٩٤ز سەرکردایەتی شۆڕشێکی جەماوەرییان کـرد دژ بــە مەمالیکــەکان، عامەی خەڵکی بەشداربیان تێیدا کـرد کــە لــە دەوروبــەری قــاهیرەوە هاتبوون، پاش ئەوەی زانکۆی ئەزهەریان داخـست، فــەرمانیان دا بــە خەڵکی بۆ ئەوەی بازاڕو شـوێنەکانیان داخــەن، ئــەم ڕاپەڕینــەش لــە بەرەنجامی بڵاوبونەوەو پەرەسەندنی ستەمی مەمالیکەکان بــوو دژ بــە خەڵکی، سەرەنجام مەمالیکەکان ناچــار ملکەچــی داخــوازییــەکانی جــەماوەر بـــوون، زانایـــان چـــەند مـــەرجێکی نوســـراویان دانـــاو مەمالیکەکانیش لە بەڵگەنامەیەدا ئیمزاو تەوقیعیان لەسەری کـرد،

(١) مدارج السالكين ٢/٣٤٥.

که بریتی بوو له بەرپاکردنی دادگەری‌و نـەهێڵانی سـتەم‌و باجـەکان لەسەر تەواوی خەڵکی میسر، له سەرکردەکانی ئەو شۆڕە، (العرایشی) موفتی حەنـەفی‌و (الـشرقاوی) شـێخی ئەزهـەرو (شـیخ البکـری)و چەندینی تربوو.[1]

لـە راسـتیدا ئـەم شۆڕشـە جەماوەریـە کـە زانایـانی ئەزهـەر سەرکردایەتی یان کرد سەرەتای: (ئەو بێـداری‌و ڕاپەڕینـەبوو کـەدوای میسر تەواوی وڵاتی ئیسلامی گرتـەوە، ڕونـیش بویـەوە شـێخەکانی ئەزهەر پێشڕەوو سەرکردەی ئـەو ڕاپەڕینـەبوون، وە دەسـەڵاتی ئـەوان بەسـەر خـەڵکی‌و جـەماوەردا مەمالیکـەکانی تووشـی تـرس‌و بـیم کردبوو).[2] بەڵام تەواوی ئەمانە نەبونە ڕێگر لەبەردەم هەڵوەشانەوەی دەوڵەت‌و کەوتنی ئوممەت‌و تیاچوون‌و سەرگەردان بوونی وڵاتی ئیسلام لەسەر دەستی ئیستعماردا، ئەو ئیستعمارەی کاتێك کـە هـات چـەند گەلێکی بینی که واقعی خۆی لا ونکرابوو، چاوەڕێی سوڵتانێك بـوو بەرگری لـێ بکات، پاش ئەوەی ئـەم گەلانـە چـەندین سـەدەی دوورو درێژ به ناوی ئایین‌و سوننەوە وازیان له مافەکانی خۆیان هێنـابوو بـۆ ئەوان، تاوەکو هەلپەرستان‌و گاڵتە جاڕان یاری‌و بەزمی پێ‌بکەن؟!
شاعیرەکان ئەم گرفتەیان هەست پێ‌کردبوو، له هەمووشیان ڕاستگۆتر له دەربڕیندا سـەبارەت بـەواقعی گـەلان‌و ئەوکارەسـاتەی بەسـەریدا

---

(١) تاریخ الجبرتی ٢/٢٥٨ – ٢٥٩.

(٢) رسالة في الطريق إلى ثقافتنا، عەللامه محمود شاکر ل١٢٩.

هاتبوو لەنەشارەزاییو نەزانینی دینو زیـادەڕەوی کردنیـان لـەدونیادا (أبو الطیب المتنبـي) بوو هەروەك لەم دێڕانەدا بەدەر دەکەوێ:-

ســادات کل أناس من نفوسهم　　وســادة المسـلمین الأعبد القـزم
أغایة الدین أن تحفوا شواربکم　　یا امة ضحکت من جهلها الأمم[1]

واتە: سەرکردەو گەورەپیاوانی هەر خەڵکێك لـەخودی خۆیانـە، بـەڵام سەرکردەو گەورە پیاوانی مـسوڵمانان کەسـە نـزمو ڕیـسواکانە، ئایـا مەبەستی دینو دینداری تەنها سمێڵ کورتکردنەوەیە، ئـەی ئومـمـەتێك هەموو ئومەتەکان بە نەزانینو جەهالەتی تۆ پێدەکەنن.

ودهر ناســه ناس صـــغار　　وإن کانت لهم جثث ضخام
أرانــب غیر أنهــم ملـــوك　　مفتحــة عیونهم نیـــام[2]؟

سەردەمـانێك هەن کەسە بچوکەکان لەبیری خەڵکیان بردۆتــەوە، هــەر چەندە ئەوکەسانە بەلاشەو جەستە گەورەو زەبەلاحن، وەك کەروێشکن، بەڵام لەهەمان کاتدا پادشان، چاویان کراوەتەوە بەڵام نوستوون ؟!

وإنما النــاس بالمـلوك وما　　تفلح عرب ملوکها عجم
بکل أرض وطئتهـــــا أمم　　ترعی بعبد کأنها غنم[3]؟!

---

(١) دیوان المتنبي بحاشیة البرقوقي ٢٨١/٢، القزم / بریتین لە نزمترینو سوکترین کەس.
(٢) دیوانەکەی٢/١٩٠ – ١٩١.
(٣) دیوانەکەی ١٩١/١.

خەڵکی بەهۆی پادشاکانیەوە کەســەو دەناســرێتەوە، عــەرەب ڕزگــاری نابێ ئەگەر پادشاکانی لەخۆی نەبن‌و کەسانی تربن، هــەر زەوی یــەك ئوممەتەکانی تــری تێهـــاتبێ خەڵکـــی لــەپێش دەدەن وەك ئــەوەی مێگەل بن.

أكلما اغتال عبد السوء سيده — أوخانه فلهـو في مصـر تمهيـد
صار الخصي إمام الآبقين بهـــا — فالحرّ مسـتعبد والعبد معبود
نامت نواطير مصر عن ثعالبها — فقد بشمن وما تفني العناقيد[1]؟!

ئــەوە بــۆ دەبــی هــەرکاتێ بەندەیــەك خاوەنەکــەی تیرۆرکــرد، یــا ناپاکییەکی لێ کرد میسر ڕێخۆشکەربی بۆی، وای لێهاتووە خەساوێك بووە بە پێشەواوی بەندە یاخی‌بووەکان، ئازاد بووتە کۆیلــەو کۆیلــەش دەپەرستری‌و بووەتــە پەرســتراو، ئێــشك گرەکــانی میــسر لەبەرامبــەر بەرێوەبەریەکانــدا خــەویان لێ کــەوتووە، ئــەوانیش تێریــان خــواردووە چونکە هێشووەکان کۆتاییان پێ‌نەهاتووە؟!

وکم ذا بمصر من المضحكات — ولكنه ضحك كالبُكا[2]؟!

ئــای چــەند شــتی ســەیرو پێکــەنیناوی لەمیــسردا هەیــە بــەڵام پێکەنینێکی گریان ئامێز؟!

(١) دیوانەکەی ١/١٤٣ – ١٤٤.
(٢) دیوانەکەی ١/١٦٧.

قۆنـاغـی دووەم: - کە بریتیە لە قۆناغی گوتـاری سیاسـی تـەئویل کراو - لە نیوەی سەدەی یەکەمەوە بە نزیکی - درێژەی خایانـد تاوەکو کەوتنی خەلافەتی عوسمانی بەردەوام بوو، واتـە نیزکـەی هەزارو سێسەد سـاڵی خایانـد، پلـەکانی خـوارو خێـچی ئـەم قۆناغـەدا جۆراوجـۆر بـوون، لادان لەسـەرەتای ئـەم قۆناغـەوە سوکتربووە وەك لەکۆتایی یەکەی.

سەرەتای ئەم قۆناغە بەوێنەی ئەو وتەیەی (زیاد بن أبیه) دەستی پێکرد کە لە وتارێکیدا بۆخەڵکی کوفە لە ساڵی ٤٥ك وتی: (ئەی خەڵکینە، ئێمە بوینە بەڕێوەبەرو سیاسی ئێوەو بەرگریتان لێ دەکەین‌و دەتان پارێزین، بەڕێوەتان دەبەین بەو دەسـەڵاتەی خـوای گـەورە پـێی داوین، بـەرگریتان لێ دەکـەین بەودەسـتکەوتە خواییـەی کراوینەتـە نوێنەرو موخەوەلی، مافی ئێمە لەسەرتان ئەوەیە گوێڕایەڵی‌و مل کە چیمان بکەن لەوشتانەی پێمان خۆشە، مافی ئێوەشە دادگـەریین لـەو کاروبارانـــەی بەدەســـتمانە، بـــەهۆی ئامۆژگارییەکانتانـــەوە دەســـت کەوتەکانمان بۆخۆتان دەستەبەردەکەن، بشزانن مـن هەرچـەندە کـەم‌و کورتی تێدابکەم لەسێ ڕووەوە کەمتەرخەمی ناکەم، پەردەو دەرگـاوان لە ڕووی داخوازی کاری ئێوەدا دانانێم، ئەگەر بـە شـەویش بـدەن لـە دەرگام، لەگەڵ هـەبوون دا هـیچ ڕزق‌و ڕۆزییـەك گـل نادەمـەوە، بـۆ شوێنێکتان نانێرم هەڵتان قرچـێنێ، لـەخوا بپاڕێنـەوە بـۆ پێـشەواو ئیمامەکانتان، ئـەوان بەڕێوەبـەرو ئـەدەب دەری ئێـوەن، ئەشـکەوتی

پەناگەی ئێوەن، کەی ئێوە چاکەخواز بوون ئەوانیش چاکە خـوازدەبن، دڵتــان پڕنەکــەن لــەڕقیان، بەمــەش ڕقــاوی‌و کینــە لــەدڵ دەبــن‌و خەمباریتان بۆی درێژە بکێشێ، بەدوای شتێکدا مەڕۆن ئەگەر بۆتــان بلوێ‌و بێتە دەستتان زیانی خۆتانی تێدا بێت)

(ابن جرير الطبـري) دەڵێ: (زیــاد یەکــەم کــەس بــوو کاروبــاری سوڵتانی توندوتۆڵ کرد، پادشایەتی بـۆ موعاویــە تەئکیــد کــردەوە، خەڵکی پابەندی گوێڕایــەڵی کـردو سـزای دەداو شـیری هەڵدەکێـشاو بەگومان خــەڵکی دەگــرت‌و لەســەر شـوبهەش سـزای دەدا، خــەڵکی لەکاتی دەسەڵاتی ئەودا زۆر لێی دەترسان، لە یەکتری ئەمین بوون‌و لە ئاسایش دا دەژیان، تاوەکو ئەگــەر شــتێك لــە پیاوێــك یــا ئافرەتێــك بکەوتایــەو بەربوایەتــەوە کــەس ڕووی بەلایــدا نــەدەکردەوەو هــەڵی نەدەگرت، تا خاوەنەکەی دەهات‌و دەیبرد، ئــافرەت لــە مــاڵی خۆیــدا دەمایەوەو دەرگــای لەســەرخۆی دانەدەخــست، بەشــێوەیەك کاروبــاری خەڵکی دەبرد بەڕێوە کە شتی وا نەبینرابوو، خەڵکیش بــە شــێوەیەك سام‌و ترسیان لێی هەبوو کە پێشتر لە کەسی تر وا سام نــەیگرتبوون، بەخشینی زۆر بوو).[1]

خواروخێچی‌و لادانی سیاسـی گەیـشتە ئاسـتێك کـە نزیـك بـوو خەلیفــەی فــاتمی (الحــاکم بــأمرالله) بانگەشــەی پەروەردگــارێتی (الربوبية) بکات؟!!

(١) ابن جریـر (٣/١٩٧- ١٩٨) ساڵی (٤٥) ك.

لەگەڵ هەموو ئەمانەش هیچ سەردەمو وڵاتێك خـاڵی نـەبووە لـە خەلیفەو پادشای دادگەرو قازی خواویست، کـە ئەمانـە گـەورەترین کاریگەرییان بووە لە سەقامگیری شارستانێتی بۆ ماوەی هەزار سـاڵ، وەك کاریگەرییەك لەکاریگەری یـەکانی دادگـەری -کـە زۆرێـك لـە خەلیفەو قازییـەکان پـێی بـەناوبانگ بـوون- هەرئـەوەش هۆکـاری سەقامگیری‌و برەوو گەشەی کۆمەڵگاکان بوو، بەڵام تەنها ئەوە توانای نەبووە جارێکی تـرو سـەر لـەنوێ ئومـەت ڕاپـەڕێنێ، چـونکە ئـەو شارستانیەتەی دەتوانێ بەرپابێ‌و بۆ ماوەی هەزار ساڵ درێژە بکێشێ ئەم توانایـەی نـەبوو ئەگـەر بـەهێزی ئـەو بناغەیـەی نەبوایـە کـە لەسەرەتای دروست بونیەوە لەسەری ڕاگیرابـوو، ئـەو هێـزەی کـە لـە بنەماکانی ئەو گوتارە سیاسیەدا خۆی دەبینیەوە کە هاوڕێك بوو بەڕێ نماییەکانی ئـاینی دابـەزێنراو، هەرئەمـەش گـەورەترین کاریگـەری هەبوو لەوەی دەوڵەت لـە بەرامبـەر جـەنگی هەڵگەڕاوەکانـدا خـۆی ڕابگرێ، پاشان بەردەوام بێت لەوجەنگە ڕزگـاری یـەی لەسەردەسـتی هاوەڵاندا بەدی هات، هەموو ئەمانەش بەهۆی ئـەوبارە لـەبارەی لـەو ماوەیەدا باڵی کێشابوو بەسەر بارودۆخی سیاسیداو دادگەری‌و ئازادی‌و ڕاوێژ لەئارادابوو، هەرئەمەش وایکردبوو لەوکەسانە تاوەکو لەپێناوی ئەو دەوڵەتەو بنەما ئاسمانییەکانیدا قوربانی بدەن، لەڕاستیدا هەر ئەو بناغە پتەوە بوو وایکرد لە دەوڵەت بتوانێ بۆماوەی چەند سەدەیەکی دوورو درێژ سەرەڕای ڕوودانی لادانیش خۆی ڕابگرێ، لەبەر هەمان هۆ

ناکرێ دەوڵەتو ڕاپەڕینێکی نوێی تر بەدیبێت، بـەبێ گەڕانـەوە بـۆ بنەماکانی گوتاری سیاسی ڕاشدی، چونکە نـاکرێ گوتـاری سیاسـی تەئویل کراو بکرێتە بناغەیەك تاوەکو دەوڵەتو ڕاپـەڕینێکی نـوێی لەسەر بنیات بنرێ.

لەراستیدا هەمو هەوڵە چاکسازییەکان تێکـشکانو سـەرکەوتنی بەدەست نـەهێنا هاوێنـەی سـەلاحەددینی ئـەیوبیو یوسـفی کـوڕی تاشفینو (نظام الملك)و (ظاهر بیبرس)و چەندین پادشـاو وەزیـری تـر هەوڵیان دەدا بۆ ئەنجام دانی ڕاپـەڕینێکی گـەورە، ئـەوەبوو کەسـیان نەیان توانی وەکو سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفـەکانی ڕاشـدین ئوممەت بەشدارکەن لە کاروبارەکانیدا، ئەوەبوو لەسـەردەمی ئەوانـدا تەواوی ئوممەت کاری دەکرد لەپێناو بنیاتنانی ئەو دەوڵەتەدا تەنانەت ئەو دەشتەکیانەی لە بیابانەکاندابوون دەستێکی بالایان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە بنیاتنـانی ئـەو دەوڵەتـەو بەشـداریکردن تیایدا بە بیروڕا، وەها دەردەکەوتن کە خوای گەورە لە ڕوحی خۆی فوی پێدا کردبێتنو سەرلەنوێ بە شێوەیەکی بێوێنەو ناوازە لەدایك بوبێتن، ئەو کەسەی تاشنای مێژووی چـاخی پێغەمبەرایـەتیو ڕاشـدین بـێ ناتوانێ دەستەوەستان نەوەستێو سەرسام نەبێ لە توانـای پێغەمبـەر ﷺ و جێنشینەکانی پاش خۆی، لەو وزە گیانیـەی کرابـوو بـەگیانی پیاوو ژنو بیابان نشینی ئەم ئوممەتەدا، ئەتبینی هەموو کاردەکەن لە پێناو دەوڵـەتی خۆیانـدا نـەك دەوڵـەتی پێغەمبـەر ﷺ و دەوڵـەتی

جێنشینەکانی پاش خۆی، لەپێناوی ئـازادیو سـەروەریو مـافـەکانی خۆیاندا پێش کەسانی تر.

هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: (من لەم ماڵەدا تەنها پێنج یەکم هەیە، پێنج یەکەکەش بۆخۆتان دەگەڕێتەوە)، وەدەیفەرموو: (هەرکەسـێ سـامانێکی بـەجێهێڵاوە ئـەوە بـۆ میراتگرەکانیـەتی، هەرکەسەش قەرزاریو شەکەتی بەجێ هێڵاوە ئەوە بۆ منەو لەسەر منە)، وەدەیفەرموو: (ئاماژەو قسەی خۆتانم پێبڵێن ئەی خەڵکینە)، لەهەموو شتێ لەوشتانەی نیگای لەسەر دانەبەزی بوو، پێی دەفەرموون: (ئەی خەڵکینە، ئێمە نازانین کێ لـە ئێـوە ڕازی یـا ناڕازییـە، بگەڕێنـەوە تاوەکو عەریفەکانتان کاروبارەکانتانمان بۆ بەرزدەکەنەوە).

هەموو ئەمانە سووربوونی پێغەمبەرمان بـۆ ڕوون دەکەنـەوە کـە دەیویست ئوممەت بەشداری بکا لەکاروبارەکانی خۆیدا، وەهەست بکەن بەوەی تەواوی ئەوەی پێی هەڵدەسـن لـە بەرژەوەنـدی خۆیانـەو هـیچ بەرژەوەندییەکی خۆیی تێدا نیە.

زۆربەی پادشاو خەلیفـە ئیـسلاح خوازەکـانی پاشـتر بـەم کارانـە هەڵنەسـان، وە ئاوڕیـان بەلایـدا نەدایـەوە، گومانیـان وابـوو تـەنها دادگەری بەسە بۆ ئەنجامدانی ڕاپەڕینو بێداربونەوە -لـەکۆتایی ئـەم قۆناغەدا- دەوڵەتی پێشەوا موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بەرپابوو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدی هێنـا لـە ئیـسلاح کردنـی بیروبـاوەڕی مسوڵمانانو نوێکردنەوە مەشخەڵەکانی ئایین دا، بەڵام شکستی هێنا

لەوەی لە بواری ئیمامەت‌و بەڕێوەبردنی کاروبـاری ئوممەتـدا (سیاسـة الأمة) بگەڕێتەوە بۆ ئەو بارەی خەلیفەکانی ڕاشدین لەوڕووەوە لەسەری بوون، ئەوەبوو ئەو دەوڵەتـە لـەم ڕووەوە پابەنـدبوو بـەگوتاری سیاسـی تەئویل کراوەوە بـەو شـێوەیەی لـە کتێبـی (الأحكـام الـسلطانية) دا هاتبوو -وەك پابەندیەك لـەو ڕووەوە بـە ڕێبـازی حەنبـەلی- هەربۆیـە دەوڵەتەکەی لەسەر مۆرکی دەوڵەتی ئومەویـەکان یـا عەبباسـیەکان بوو، لێرەوە ئیمامـەت بووە پشتاوپشتی‌و بۆماوەیی، ڕاوێژیش وون بـوو یاخود لەچینێکدا قەتیس مابوو، ئومەتیش دوور خرابویـەوە لـەڕەوتی ڕووداوەکان، بێئاگابوو لەوەی لە دەوروبەریدا ڕووی دەدا، هەربۆیـە زۆر بەخێرایی لاوازی بەسەرداهات‌و لە یەکەم ڕووبەڕووبونـەوەی دەرەکیـدا تێکشکا، خەڵکیش پشتی لێیکرد بە پێچەوانەی ئەوەی لە سـەردەمی ئەبوبەکرو لەکاتی جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا ڕوویدا.

ئەگەر ئەو بزاڤە چاکسازییە هەڵبسایە بە نوێ کردنـەوەی گوتـاری سیاسی‌و ژیانەوەی ڕێو شوێن‌و ڕێبازی خەلیفەکانی ڕاشـدین لـەبواری ئیمامەت دا، بەوەی ئەو کارەی بکردایەتە ڕاوێژی نێـوان مـسوڵمانان، تاوەکو ئەوکەسەی دەیانەوێ هەڵیبژێرن‌و ئومـەتیش بەشـدارکەن لـە تەواوی کاروبارەکانیانداو بێخەڵکی هـیچ شـتێك یەکلانەکەنـەوە، وە خانەی سامانیش لەژێر سەروکاری‌و چاودێری ئەو دابوایـەو ..... هتـد، وە لە نەتەوەکانی تریشەوە هەرشتێ لە بەرژەوەنـدی ئـەودابوو وەریـان بگرتایەو بیانگواسـتایەتەوە بـەو شـێوەیەی کەعومـەر کـردی: ئـەوا

بــەرپابوونی ئــەو بزاڤــە دەبــووە ســەرەتای چــاخی ڕاپــەڕینو بێــداری ئیــسلامی نــوێ، وە دەبویــە ڕێنیسانــسێکی هەمەلایەنــەی تــەواوی بوارەکانی ژیان، بەڵام ئەمە ڕووی نــەدا، ئــەو کاریگەرییــە سیاســیو بیریو ژیارییەشی نەبوو کەهاوڕێنــەکانی ئــەو هــەیانبوو لــەو بزاوتــە کۆمەڵایەتییە گەورانەی جیهان کە لەو ماوەیەدا لە ئــارادابوون وەکــو شۆڕشی فەرەنسی لە ئەورووپادا.

ئەمە لەکاتێکدا بــارودۆخی خراپــی ئــەوکاتی جیهــانی ئیــسلامی نەگەیشتبووە ئەو بارودۆخەی ئەورووپا پــێی گەیــشتبوو، لــەو تــەنگ پێهەڵچنینە ئایینیەی لەنێوان دەستەو تاقمە مەسیحییەکانی ئەوێدا هــەبوو تــاڕادەی لەڕیــشە دەرهێنــان وەکــو لــەنێوان پرۆتــستانتو کاســۆلیکدا هــەبوو، ســوکایەتیکردن بــە مافــەکانی مرۆڤــ لێــرە نەگەیشتبووە ئەوبارو دۆخەی لەوێ پێی گەیشتبوون، چونکە گوتــاری سیاسی تەئویل کراو لەم قۆناغەدا توانیبووی بەردەوام لانی کەمی ئەو ئەندازەیەی مافو ئازادییەکان بپارێزێ کــە شــەریعەت پاراســتبووی، هــەروەها ســەربەخۆیی دەســەڵاتی قــەزائیو یاســایی کەلــە قــازیو فەقیهەکاندا خۆی دەنواند وایکردبوو ڕێگربێ لە بڵاوبونەوەی زۆرداریو ستەم بەو شێوەیەی لە ئەورووپادا بڵاو بوو، چونکە بەردەوام قەزا لەنێو خەڵکیــدا بــەپێی شــەریعەت دەچــوو بــەڕێوە، هــەر بۆیــە مــافو ئازادییەکانی تاك پارێزراوبوو، ئەم قۆناغە بە دیاردەیەك دەناســرێتەوە پێی دەوترێ (زۆرداری دادگەر (خۆسەپێنەر) – المستبد العادل –) کە پێویستی بە توێژینەوەیەکی دوورو درێژ هەیە.

## ( دیـــاردەی زۆرداری[*] دادگـــەر لەم قۆنـــاغەدا ):

لە رۆژهەلاتی ئیسلامی‌دا دیاردەی (زۆرداری دادگەر) بەدەرکەوت، زۆرداریی سیاســی و دەســەلات خوازییەکــەی نــەبوە رێگــر لەبــەردەم پیادەکردنی دادگەری و پاراستنی مافــەکانی تــاك و ئازادیــەکانیان و بونی پارتە فیکریە سیاسیە نــەیارەکان، ئەوانــەی کــەس دەســتکاری نەدەکردن ئەگەر هێزیان بەکار نەهێنایە بۆ رووخانی دەسەلات.

(ابن جریر الطبري) فەرمویەتی: (موعاویــە هــات، (المغــیرة بــن شعبة)ی کردە کاربەدەستی کوفە، شادی و خۆشگوزرانی پێ‌خۆش بوو، هەڵس وکەوت و رەفتاری جوانی لە نێو خەڵکیدا نواند، سەبارەت بــە خــاوەن بۆچــونە لادەر و حەزیــستەکان (أهــل الأهــواء) پــشکنین و بەدواداگــەرانی نــەدەکرد، ئــەهاتن بــۆ لای و پێیــات دەووت: فــلان بیروبۆچونی شیعەییانەی هەیــە و ئــەوی تــر خەواریجانــە، بــەلام ئــەو دەیوت: خوا بڕیاری وابووە کە بەردەوام جیاوازی و ناکۆکیمــان ببــێ، خوای گەورەش دادەوری و قەزاوەتی خۆی دەکات لــەو شــتانەی تێیــدا ناکۆکین . ئاسایش باڵی کێشا، خەوارجەکان یەکتریان دەبــینی، باســی بەسەرهاتی براو هاوڕێکانی خۆیانیان دەکرد لــە نەهرەوانــدا، وایــان

---

(*) المستبد= زۆردار، ستەمکار، ملهوڕ، خۆسەپێنی بۆ بەکاردێ. وەرگێر

دەبــینی دانیــشتن و بــێدەنگی مــافخوراویی‌و دەســتە پاچــەیی یــە، جیهادکردنی خاوەن قیبلەکان فەزل و پاداشتی تێدایە).[1]

عەبدولەلیکی کوڕی مەروان لە حەجی ســاڵی (٧٥)ك وتــاری دا وتـــی: (ئـــەی خەڵکینـــە، ئێمـــە بـــەرگری هـــەموو ناپەســـندی و بارقورسیەکتان دەگرین ئەگەر ئاڵاهـــەڵگری شـــەڕو هەڵکوتانـــە ســـەر مینبەری تێدا نەبێ).[2]

نوعمانی کوڕی بەشیر (خوای لێ ڕازی بێت) کە میری کوفەبوو لــە ساڵی (٦٠)ك دا، هەواڵی (مسلم بــن عقیــل بــن أبــی طالــب) پــێ گەیشتبوو وە دەیزانی بە نهێنی بەیعەت بــۆ حوســەینی کــوڕی علــی (خوای لــێ ڕازی بێت) وەردەگرێ، ئەوەبو نوعمان هەستا بۆ وتاردان و (سوپاسی‌و ستایشی خوای کردو پاشــان فــەرمووی: پــاش ســوپاس و ستایش، لەخوا بترسن بەندەکانی خوا، بە پەلە و خێــرا مەچــن بــەدەم ئاژاوەو دوبەرەکیەوە، چونکە ئەم دووە پیاو تیادا دەبــا و بــە هۆیانــەوە خوێن دەڕژێ‌و سامان زەوت دەکرێ، نوعمان کەسێکی دڵ نەرم‌و ئارام و خواپەرست بوو خوشگوزاری خەڵکی دەویست- فەرمووی: من کوشتاری کەسێك ناکەم کوشتارم نەکا، هەڵناکوتمە سەر کەسێ هەڵنەکوتێتــە سەرم، جنێوتان پێ نادەم و بێــزارتــان ناکـــــەم و بە هۆی گومان و تۆمەتەوە ناتانگـــرم، بەڵام ئەگەر خۆتـــان شیـــرتان هەڵکێـشـــا

(١) تاریخ ابن جریـر (١٧٤/٣) ساڵی (٤٢)ك.
(٢) ابن کثیـر (٦٨/٩).

لێم، بەیعەتتان هەڵوەشێننەوە و پێـچەوانەی پێـشەواکەتان بـن، بـەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێکی تری نیە تا لـە توانامدایـە بـەم شـێوە لێتان دەدەم، ئەگەر هیچ کەسیشتان پشتگیریم نەکەن، بەڵام هیـوادارم حەق ناسەکانتان زۆرتر بێت لەوانەی نارەوا توشی هەڵدێری دەکا.

ئەوەی رووداوەکە دەگێڕێتەوە دەڵـێ.لەو کاتەدا (عبدالله بن مـسلم بن سعيد الحـضرمي) هاوڕێـیەمانی ئەمـەوییکان بـەرەو رووی دەچـێ و دەڵـێ: ئەوەی تۆ دەیڵێی و لەگەڵ دوژمـناکانتـا دەیکـەی بیروبۆچـونی کەسە لاواز و بـێ دەسـەڵاتەکانە، نوعمـانیش فـەرمووی: لاواز و بـێ دەسەڵات بم لە گوێڕایەڵی خوادا پێم خۆشترە سەربەرز و سەرفرازبم لـە بێ فەرمانی و سەرپێچی خوادا، پاشان دابەزی).[1]

هەروەها زۆربەی جێنشین و پادشاکانی ئیسلام خاوەن چاکە و فـەزڵ ویژدان و دادگەری بون، سولەیمانی کـوری عبدولمـەلیك (٩٩ك) بـەوە وەسف کراوە کە دادویـست بـوە و لەگـەڵ خەڵکیـدا ڕەفتـارو هـەڵس وکەوتی باش وجوان بووە.[2] عومـەری کوری عبدولعەزیزی کردە وەزیر وڕاوێژکاری خـۆی پاشـان کردیـە (ولـی عهـد)ی خـۆی، عومـەریش ئاماژەی پێ دا کە نوێنەرەکانی حەجاجی کوڕی یوسف لابەرێ وگیراو و دیلەکان بەربدا، ئەو بەخشینانەی خـەڵکی عـیراق کـە ڕاگیرابـوو بـۆ

---

(١) تاريخ ابن جرير ٢٧٩/٣ ساڵی ٦٠ك

(٢) ابن كثير ١٨٥/٩

ئەوانەی دژایەتی جەنگی حەجاجیان کردبوو پێیان بدرێتەوە.[1]

پێشەوای تابعین موحەممەدی کوڕی سیرین لەبارەیـەوە فەرمویـەتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت، خەلافەتەکەی بەچاکەخوازی وخێر دەستی پـێ کرد، بەچاکەخوازی وخێر کۆتایی پێ هێنا لەوەدا کە عومەری کـوری عبدولعەزیزی کردە کاریەدەست.[2]

زانایانیش بە ئاشکرا هەقیان پێی دەووت و فـەرمانی چـاکەکاریان پێی دەدا.

سولەیمانی کوری عبدولمەلیك حەجی کرد ووتـی: سـەیرکەن بـزانن فـەقیهێکم بـۆ ناییننـەوە سـەبارەت بـە هەنـدێ لـە دروشـم و ڕێـو شوێنەکانی حەج پرسیاری لێ بکەم، دەرگاوان (حاجـب) بـۆی کەوتـە گەڕان لەو کاتەدا (طاوس) تێپەڕی وتیان: ئەمـە (طاوس اليماني)یە، ئەویش بردیە لای سولەیمان، (طاوس) دەفەرموێ: کاتێ لەبەردەمی دا وەستام ووتم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إن أهون الخلق علـى الله عز وجل من ولي من أمور المسلمين شيئاً فلم يعدل بينهم)) واتە: سـوکترین کەسـێك لای خـوا ئـەو کەسـەیە شـتێك لـە کاروبـاری موسوڵمانان دەگرێتە دەست و پێـی دەدرێ بـەڵام دادگـەری نـەکا لـە نێوانیاندا، یەکسەر دەم وچاوی سولەیمان گـۆڕاو ماوەیـەك زۆر سـەری داخست و پاشان سـەری بـەرزکردەوە و ڕووی تێکـردو ووتـی: ئەگـەر

(١) ابن كثير ١٨٦/٩

(٢) ابن كثير ١٨٧/٩

فەرمودەیەکی تریـشمان پێـی بڵـێی؟ ووتـی: پیاوێـك لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ فەرموی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خواردنی کۆڕێك لە کۆڕەکانی قورەیش بـانگ هێـشتی کـردم، پاشـان فـەرموی: ((ئێـوە مافتان هەیە بەسـەر قورەیـشەوە، ئـەوانیش مافیـان هەیـە لەسـەر خەڵکی، ئەگەر بە بەزەیی بون، کاتێکیش فەرمانڕەواییان کرد دادگەر بون، کاتێکیش سپاردەیان لا دانرا بیپارێزن، هەرکەسە وانەکات ئـەوا نەفرینی خواو فریشتەو هەموو خەڵکی لەسەر بێت، لای خوای گەورە هیچ بریتییەکی نیەو خاترێکی نـاگیرێ)) کـابرا دەڵـێ دەمو چـاوی سولەیمان گۆڕاو ماوەیەکی زۆری تر سەری داخستو پاشان سەری بەرز کردەوەو فەرموی: ئەگەر فەرموودەی تریشمان پـێ بڵـێی؟ فـەرمووی عەبدوڵای کوری عـەبباس هـەواڵی پـێدام بـەوەی کـە دوا ئایـەتێك دابەزیوە لە کتێبـی خوادا بریتی بووە لە: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ [1] واتە: بترسـن لـە رۆژێك کە تیادا دەگەرێنەوە بۆ لای خوای و هەموو کەسێکیش بە پێی کاروکردەوەی خۆی پاداشت دەدرێتەوەو هیچ ستەمێکیان لـێ ناکرێ.

پاش ئەویش عومەری کوڕی عبدولعەزیز فەرمان ڕەوایی کرد، لـە ڕووی دادگـەریو پـەرێزپاکیو ڕەفتـارو ژیننامـە چـاکیەوە نمونـەی پێدەهێنرێتەوە، (إبن کثیر) فەرمویەتی: (ڕۆژێك عومـەر سـەرکردەو

(١) ابن کثیـر (٩/٢٤٧).

ڕیش سپیانی خەڵکی کۆکردەوە ووتارێکی بۆدان‌و فەرموی: لە ڕاستیدا فەدەك بە دەستی پێغەمبەری خواوە بووە ﷺ بە پێی پێویـست لـە شوێنی خۆیدا بەکاری دەهێنا، پاشان ئەبوبەکرو عومەریش بە هەمان شێوە بون، پاشان مەروان بەش بەشی کرد، منیش بەشێکم بەرکەوت، وەلید و سولەیمانیش بەشی خۆیان پێدام، هیچ سامان و داراییەکم نیە بیانگێڕمەوە لەوە بەنرخ تر بێت، وا گەڕاندمەوە بۆ (خانـەی سـامان) بەو شێوەیەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ وابووە.

فەرموی: لێرەدا خەڵکی نائومێدبون لەو دەستکەوتانەی بەرەنجامی مافخۆری وستەمکارییەوە بەدەستیان هێنـابوو، پاشـان فـەرمانی دا سامانی کۆمەڵێك لە ئومەویەکان بگەڕێتـەوە بـۆ خانـەی سـامان و گەڕانیەوەو ناوی نـا سـامانی مـاف خوراوییـەکان (أمـوال المظـالم)، ئەوانیش خەڵکیان کردە تکاکار، فاتمـەی کـچی مـەروانی میمکیـان هێنایە لای، بەڵام بێ سود بو، وە پێی ووتن: یا ئەوەتا وازم لـێ دێـنن چی دەکەم بیکەم، یا ئەوەتا دەچم بۆ مەککەو لەوێ واز لـە کارەکـەم دێنم بۆ باشترین کەسی شیاو.

وە فەرموی بـەخوا ئەگـەر پـەنجا سـاڵیش فـەرمانڕەوایی بکـەم و تیاتاندا بمێنمەوە تەنها هەر دادگەری دەکەم، وە من دەمەوێ ئەم کـارە بکەم ئەوەشی دەیکەم لـەکاتێك دا دەیکـەم کـە خەڵکـــی ئومیـدو حـــەزی ژیانیان مابێ تاوەکو دڵیان ئارام بگرێ.

(الثوري) فەرمویەتی: خەلیفەکان پێنجن، ئەبوبەکرو عومەرو عەلی‌و عومەری کوری عەبدولعەزیز. هەمان بۆچوون لە (أبوبکر بن عیاش)و شافعی‌و چەندان کەسی تر دەگێڕنەوە، تەواوی زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی لە پێشەوا دادگەرەکانەو یەکێکە لە خەلیفە ڕاشدین و پێشەوا ڕێنمونی کراوەکان، زیاد لە کەسێکیش بە یەکێك لەو دوانزە ئیمامەی داناوە کە فەرمودەی (صحیح)ی لەبارە هاتووە: ((لایزال أمر هذه الأمة مستقیماً حتی یکون فیهم أثنا عشر خلیفة کلهم من قریش))، واتە کاروباری ئوممەتەکەم تا ئەم کاتە ڕێك و ڕاست دەبێت کە دوانزە جینشینیان تیادا دەبێت کە هەمویان لە قورەیشن.

عومەر -بەریەزەیی خوا کەوێ- لەسەردەمی کاربەدەستێتیەکەیدا -لەگەڵ ئەوەی کورت بوو- هەوڵێکی زۆری دا تاوەکو مافی ستەم لێکراوەکان بگەڕێنێتەوەو سامانە بە فیڕۆ براوەکانیش بباتەوەو شوێنی خۆی و هەر کەسەش مافی خۆی پێ بدا، هەموو ڕۆژێك بانگدەرێکی بانگی دەکرد: قەرزارەکان کوان و لە کوێن؟ کوان ئەوانەی دەیانەوێ خێزان پێك بهێنن؟ کوان هەژارەکان. کوان هەتیوەکان، تا هەموو ئەمانەی دەوڵەمەندو بێ نیاز کرد).[(١)]

لە سەردەمی (وەلیدی کوڕی عبدولەلیك)دا کاربەدەست و والی ئەو بوو لە مەدینەدا، ئەنجومەنێکی ڕاوێژی بۆ خۆی دانا، لەو

(١) إبن کثیر (٩/٢٠٨) سالی (١٠١) ك.

سەردەمەدا بە باشترین شێوە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیـدا دەکردو دادگەرترین کەس بوو لەگەڵیاندا، ئەگەر گرفتێکی بـۆ بـەرز بکرایەتەوە هەموو زانایانی بۆ کۆدەکردەوە، دە کەسی دیاری کردبـوو، بەبێ ئەوان یا ئەوەندەیان کە ئامادە دەبوو هیچ کـارێکی نەدەبڕیـەوە، ئەوانیش بـریتی بـوون لـە ((عـوروەو عوبەیـدوڵای کـوری عوتبـەو ئەبوبـەکری کـوڕی عەبـدوڕەحمانی کـوڕی حارسـی کـوڕی هیـشام و ئەبوبەکری کوڕی سـولەیمانی کـوڕی خەیـسەمەو سـولەیمانی کـوڕی یەسارو قاسمی کوڕی موحەممەد وئەبوبەکری کوڕی حەزم وسالمی کوڕی عەبدوڵاو عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعەو خارجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابت))، لە قسەی سەعیدی کـوڕی موسـەییب دەرنەدەچـوو، سـەعیدی کـوڕی موسـەییب نەدەچـووە لای خەلیفـەکان، بـەڵام لـە مەدینەدا دەچووە لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ئیبراهیمی کوڕی عەبلە وتویەتی: چوومە مەدینە عەبدوڵای کوڕی موسەییب وکەسـی تریشی تێدابوو، ڕۆژێـك عومـەر سـەبارەت بـە بیروبۆچـونێ بـانگی کردبوو.[1]

زۆرجار دەبووە ڕێگر لەبەردەم ستەم و زۆرداریـیەکانی وەلیدی کوری عەبدولمەلیك، جارێك ڕاوێـژی پـێی کـرد ووتـی: بیروبۆچـونت چـیە سەبارەت بەو کەسەی جنێو بە خەلیفەکان دەدا، ئەکوژرێ؟؟

(١) ابن كثير (٩/٢٠٢).

عومەر ووتی: ئایا کەسی کوشتووە ئەی ئەمیری باوەرداران؟

وتی: نەخێر، بەڵام جنێوی داوە.

عومەر ووتی: پەنگ و بەزمی پـێ دەکـرێ و نـاکوژرێ، وەلیـدیش توڕەبوو.[1]

عومەر نەیدەهێشت کـەس دەسـتکاری خەوارجـەکان بکـا ئەگـەر هەڵیان نەکوتایەتە سەر موسوڵمانان و سامانی خەڵکی یان نەبردایەو ڕێگریان نەکردایە، کاتێکیش لە شەڕدا شکان سامانەکانیان بدرێتەوەو شــوێنی ڕاکردووەکانیـــان نەکـــەون وبرینـــدارەکانیان نـــەکوژرێن، خەوارجەکان دەهاتنە ماڵی ومشت ومڕیات لەگەڵی دەکرد وپاشان بە هێمنی و دڵنیاییەوە دەردەچون.[2]

لەلایەن بەرپرسی پۆلیس (صـاحب الـشرطة)ەوە پرسـیاری لێکـرا سەبارەت بە خەڵکێك لە دوکانێکـدا بـەدەوری عەرەقـدا کۆبونەتـەوە دوکانەکەیان بەسـەر خۆیانـدا داخـستووە چـی بکـا باشـە. عومــەر فەرموی: هەرکەسە ماڵ دایپۆشیبـێ، وازی لێ بێنە.[3]

کاربەدەستی عێراق نامەیەکی نوسی بۆ عومەرو تیایـدا پرسـیاری کەسـێکی لـێ کردبـوو کـە جنێـوی بـەو - واتــە عومــەری کـوڕی عبدولعەزیز- داوەو ئەمیش ویستویەتی بیکوژێ.

---

(١) ابن كثير ٢٠٣/٩

(٢) ابن سعد ٢٧٧/٥ وحلية الأولياء ٣٠٩/٥- ٣١٦

(٣) ابن سعد ٢٨٣/٥

عومەریش بۆی نوسی: ئەگەر بیکوژی ئەتکوژمەوە لەسەری، لە ڕاستیدا هیچ کەس ناکوژرێت مەگەر جنێوی بە پێغەمبەری خوادا بێت ﷺ، ئەگەر دەتەوێ جنێوەکەی پێ بدەرەوە یان بەڕەڵای کە. وە فەرموی: هیچ کەس بەوەی جنێو بەکەسێك بدات ناکوژرێت مەگەر لە جوێن بە پێغەمبەر بدات.[1]

بۆ کاربەدەستی میسری نوسی: نابێ سزای زیاتر لە (٣٠) لێدان لە هیچ کەسێك بدرێ مەگەر لە سنور وحدودی خوادا.[2]

وە دەیفەرموو: پیادەکردنی حدودەکان لای من وەك پیادەکردنی نوێژو زەکاتە.[3] پێی ووترا توندوتیژبە لەگەڵ کاربەدەستەکانت دا تا ڕێك و ڕاست بن، فەرموی: بە ناپاکیەکانیانەوە بگەنەوە خوای گەورە پێم خۆشترە لەوەی بە خوێنی ئەوانەوە بچمەوە خزمەتی.[4]

وە دەیفەرموو: (تا دەتوانن بە هەموو شوبهەیەك ڕێگری بکەن لە پیادەکانی حدودەکان، چونکە کاربەدەست لە لێبوردن دا هەڵە بکات باشترە لەوەی لە سزاداندا هەڵە بکات): (أدرئو الحدود ما أستطعتم في كل شبهة، فإن الوالي أن يخطئ في العفو خير من أن يخطئ في العقوبة).[5]

---

(١) ابن سعد ٥/٢٨٧ بە ئیسنادێکی سەحیح و ٥/٢٩٥ بە ئیسنادێکی سەحیح

(٢) ابن سعد ٥/٢٨٣

(٣) ابن سعد ٥/٢٩٤ بە ئیسنادێکی سەحیح

(٤) ابن سعد ٥/٢٩٢

(٥) حلية الأولياء ٥/ ٣١١

فەرمانیدا پارەی ئەو شوفعەیەی زیمی بدرێ کە هی موسوڵمانە.[1]
وە مۆڵەتی دان ئەو زەویەی باجی لەسەرە بیفرۆشن.[2]

وە (عدي بن أرطأة)ی کاربەدەستی و والی بەسرە نوسراوێکی بۆ نوسی کە: خەڵکی بەسرە ئەوەندە دەوڵەمەندو تێرو پڕبونە تەنانەت ئەترسم لەخۆبایی بین -ئەمەش مەبەستی ئەوەبوو مۆڵەتی بدات لە خانەی ساماندا بەخشینەکانیان کەم بکاتەوە- عومەریش بۆی نوسی: لە ڕاستیدا خوای گەورە بەوەندە لەخەڵکی بەهەشت ڕازی بووە کاتێ کە دەیانخاتە بەهەشتەوە بڵێن: سوپاس بۆ خوا (الحمدلله)، لای خۆتەوە بیاندەرێ با ستایش و سوپاسی خوا بکەن.[3]

وە نوسراوێکی بۆی نوسی وتیایدا فەرمانی پێ کردبو کە باج لەسەر خەڵکی لابەرێ، هەرکەسێ زەکاتەکەی دا لێ ی وەربگرێ، هەرکەسەش نەیدا بیداتە دەست خوا، خوا بەسیەتی.[4]

لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدولعەزیزدا خەڵکی سەمەرقەند سکاڵایان لەدەستی میرەکەیان (سليمان بن سري) بەرزکردەوەو ئیدعای ئەوەیان کرد کە ڕزگارکەری سەمەرقەند قوتەیبەی کوڕی موسلم ستەمی لێکردوون و بە غەدر لە زەوی و زاری خۆیان دەری کردوون.

(١) ابن سعد ٢٨٤/٥
(٢) ابن سعد ٢٩٢/٥
(٣) ابن سعد ٢٩٨/٥ بە ئیسنادێکی سەحیح
(٤) ابن سعد ٢٩٨/٥ بە ئیسنادێکی سەحیح

عومـــەر فەرمانیـــدا قـــازی دابنیـــشێ بـــۆ ســـەیرکردنی مـــاف خوراویەکەیان، ئەگەر قەزاوەت لە بەرژەوەندی ئەوان بوو ئەوا لەشکری موسوڵمانان زەوی و زارەکانیان بەجێ بهێڵن وە بگەڕێنـــەوە ســـەر ئـــەو بارەی پێش ڕزگارکردنەکەی لەسەری بونە، سولەیمانی کوڕی جەمیعی قازی بڕیارو حوکمەکەی لە بەرژەوەندی خەڵکی سەمەرقەند دابوو، وە فەرمانیدا رزگارکەران (الفاتحون) لـــە ســـەمەرقەند دەرچـــن، ئەگـــەر ویستیان پاشتر ئاشـــتەوایی یا شەڕ بکـــەن، خەڵکەکـــەش ئاشـــتەوایی هەڵبژارد.[1]

هیشامی کوری عەبدولمەلیک - لە ســـاڵی (١٠٥)ك بـــۆ (١٢٥)ك جێنشینایەتی گرتەدەست- یەکێك بوو لە باشـــترین ئـــەو خەلیفانـــەی هەڵسوکەوت و ژیاننامەی جـــوان بـــووە لەگـــەڵ خەڵکیـــدا، جیهـــادی بەرپاکردووە، پارێزەری خانەی ســـامان بـــووە، ڕقـــی لـــە خـــوێن ڕشـــتن بووەتوە، عەبباسیەکان پشتیان بە دیوانو تۆمارەکانی ئـــەو بەســـتووە هـــەر وەك عەبـــدوڵای کـــوڕی عـــەلی دەڵـــێ: (تۆمـــار ودیوانـــەکانی ئومەوییەکانم کۆکردەوە لە دیوانی هیشام باشتری تێدا نەبوو کە سازو گونجاو بێت بۆ خەڵکی بە گشتی و بۆ سوڵتان)

مێژوونوسان ووتویانە: ((هیچ کـــەس لـــە ئومەویـــەکان ئەوەنـــدەی هیشـــام بیـــرتیژ ووردنـــەبووە ســـەبارەت بـــەو هـــاوڕیو هـــاوەڵانو

(١) ابن جریـر (٤/ ٦٩)، ساڵی (١٠١) ك.

سەبارەت بە دیوانەکانی، وە کەس وەکو ئەو پشکنینی نەکردوون).[1]

جلوبـــەرگی کـــەم بـــووە، تەنانـــەت بـــە ڕژدو ڕەزیـــل وەســـف کـــراوە، کاتێکیش لەو بارەیەوە پرسیاری لـــێکراوە وتویەتی: (ئـــەوەی دەیبیـــنن کە سامـان کۆدەکەمـەوە و دەیپارێزم، ئەوە تەنها بۆ ئێوەیە).[2]

پیاوێکی نەسرانی دەستدرێژی لە غـــولامێکی موحەمـــەدی کـــوڕی خەلیفە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك کردبوو، موحەممەد ویستی تۆڵـــە لە نەسرانیە کە بکات -پێی وترا- تـــەنها لـــە ڕێـــی قـــەزاوە ئـــەبێت هەڵس وکەوت بنـــوێنی و قـــەزات لەبـــەردەم دایـــە، بـــەڵام موحەمـــەد خزمەتگوازارەکەی نارد دەستدرێژی کردە سەر کابرای زیمی، هەواڵەکە گەیشتەوە هیشام، هیشامیش لە خزمەتگوزارەکەی داو هەڕەشـــەی لـــە موحەمەدی کوڕیشی کرد.[3]

هیشام ئومەوییەکانی بە غەزووەو شەڕەوە پابەند دەکـرد.[4] بەشـــی هیشام لە خانەی ساماندا دوو سەد دینـــار بـــوو، دەیـــدا بـــە هاوپـــشت (مولی)ێکی کە لە جێی ئەو بەشداری هێرشی و شەڕەکانی دەکرد.[5]

هەندێ جار بووە وارێکەوتوە لـــە ڕێگـــەدا قـــسەی ڕەقیـــان ئاراســـتە

---

(١) ابن جرير ٢١٨/٤، وابن كثير ٩/٣٣٦-٣٣٧ ساڵی ١٢٥ك، ئەمەش بەڵگەی هۆکاری بەرەو گەشەی ژیار و شارستانیەتە لەو ماوەیەدا.

(٢) ابن جرير ٢١٨/٤

(٣) ابن جرير ٢١٨/٤

(٤) ابن جرير ٢١٨/٤

(٥) ابن جرير ٢١٨/٤

کردووە ئەویش لەوە زیاتری نەوتووە: بەڵا لێت دا!! بۆت نیە زیـرو ڕەق بیت لەگەڵ ئیمامەکەت دا.[1]

کاربەدەست و والی مەدینە عەبدولواحیدی کوڕی عەبدوڵای کـوڕی بیشر -میری مەدینە لەلایەن یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیکەوە- یەکێك بووە لە ڕەفتار جوانەکانی نێو کەس‌وکارەکەی لای خەڵکی خۆشەویست بووە، هیچ کارێکی بە بێ زانایانی مەدینە هاو وێنەی ئەلقاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو سالمی کوڕی عەبدوڵای کـوڕی عومـەری کوڕی خەتتاب نەدەبڕیەوە.[2]

عامری کوڕی عەبدوڵای تەمیمی - لە زانایانی تابعینی سەردەمی ئومەییەکانە- زیمییەکی بینی ستەمیان لێی دەکـرد ئـەویش قـسەی لەگەڵ کردن تا بەرەڵای بکەن بەڵام نەیانکرد، فەرموی: بەخوا درۆتان کرد نابێ من شـاهێدبم و ئێـوە سـتەم لـە ئەسـتۆگیری (ذمـة)ی‌خواو پێغەمبەر خوا بکەن، کراسەکەی دا بەسەریداو ڕزگاری کرد لێیان.[3]

وەلیدی کوڕی یەزید هەندێ لە خەڵکی قوبرسی ڕاگواست بۆ شام، پاش ئەوەی بەلایـەنگیری و هاوپـشتی ڕۆمـەکان تۆمـەتبار کرابـون، خەڵکی ئەم ڕەفتارەی ئەویان بە خراپ دانا و ئینکاریـان لێـی کـرد پاش ئەو یەکسەر یەزیدی کـوڕی وەلیـد گێڕانینیـەوە بـۆ وڵاتەکـەی

(١) ابن جریـر (٤/٢١٩).

(٢) ابن جریـر (٤/١٠٥).

(٣) ابن سعد (٧/٧٣)، بە ئیسنادێکی سەحیح.

خۆيان.[1] موعاويه ئاشتەواييەكى بەردەوامى لەگەڵ خەڵكى قوبرس دا لەسەر ماڵ وسامان گرێدابوو، عەبدولمەليكى كوڕى مەروان زيادى كرد لەسەريان، كاتێك مەنسورى عەبباسى فەرمان ڕەوايى كرد وتى: (ئێمە لە پێشترين دادگەرترينيان بين ودادگەرانە هەڵس و كەوتيان لەگەڵ بكەين، ستەميان لەسەر زياد نەكەين، پاشان گەرانديانيەوە، بۆ ئاشتەوايى و سولحەكەى موعاويە).[2]

خەڵكى قوبرس بەزمێكيان دروست كردبوو، عەبدولمەليكى كوڕى سالحى كوڕى عەلى عەبباسى، ميرى شام ڕاوێژى بە زانايانى چاخى خۆى كردو ويستى ئاشتەواييەكە هەڵوەشێنێتەوە. مالكى كوڕى ئەنەس بۆى نوسى: (وادەبينم پەلە نەكەى لە هەڵوەشاندنەوەى پەيمانەكەيان وتوڕدانيان تاوەكو بە بەڵگەوە بۆيان دەسەلمێنىو بەڵگەيان لەسەر دەبينيەوە، چونكە خواى گەورە فەرمويەتى: ((فأتموا إليهم عهدهم الى مدتهم)).[3]

(موسى) كوڕى (أعين)يش نوسى: لەوانەى پێشودا كەسم نەبينوە لەگەڵ پەيمان شكاندنى خەڵكى قوبرسو جگە لەوانيش دا بێت، لەوانەيە خەڵكى بەگشتىو كۆمەڵەكە يان لەگەڵ ئەو كارو ڕەفتارەى ئەو كەسە تايبەتانەدا نەبێت، من وادەبينم ئەمەكدارى (وفاء) يان بۆ

(١) (فتوح البلدان)ى (بلاذري)، ل (٢١٠).

(٢) (فتوح البلدان)ى (بلاذري)، ل (٢١١).

(٣) (فتوح البلدان)ى (بلاذري)، ل (٢١٢)

دەربـبـڕدرێ‌و مەرجەکانیان بۆ ئەنجام بدرێ هەرچەندە ئەوەش ڕوویداوە لێیان...).[1]

(اسماعیل کوڕی عیاش)یش بۆی نوسی: (خەڵکی قوبرس ملکەچ و ژێردەستەی ڕۆم بوون ڕۆمەکان خۆیان سەپاندووە بەسەر خۆیان و ئافرەتەکانیان، مافە لەسەرمان بەرگریان لێ بکەین و بیانپارێزین، حەبیبی کوڕی مەسلەمە لە سەردەمی خۆیدا بۆ خەڵکی تەفلیس نوسیبوی، ئەگەر بارودۆخێ هات بەسەر موسڵماناندا سەرقاڵبون و ئاگایان لێتان نەما، دوژمنەکانتان زاڵ بون بەسەرتانا ئەوە شکاندنی بەڵێنەکەتان نیە ئەگەر ئێوە ئەمەکدارین بۆ موسڵمانان، دیدو بۆچونی من وایە دان بنێن بەپەیمان و زیمەتیاندا، چونکە کاتێك کە وەلید ڕایگواستن بۆ شام موسلمانان ئەمەیان زۆر لاگران بوو، زانایانیش بە کارێکی ناڕەوایان دانا، کاتێکیش یەزیدی کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك کاروباری درایە دەست گەڕاندنیەوە بۆ قوبرس، موسڵمانان ئەم کردارەی ئەویان بە جوان وشیاو زانی، بە دادگەری تەماشایان دەکرد).[2]

ئەوزاعی - پێشەوای خەڵکی شام- وتویەتی: هیچ کات خەڵکی قوبرس ئەمەکداریان نەنواندوە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆچونمان وایە ئەوان لەسەر پەیمانی خۆیانن، ئاشتەوایی‌و سولح لەگەڵ کردنیان لەسەر

(١) (فتوح البلدان)ي (بلاذري)، ل (٢١٣).

(٢) (فتوح البلدان)ي (بلاذري)، ل (٣١٣-٣١٤).

شتێ بوە کە مەرجی تیادایە بۆیان - ئەوەش بریتیە لەوەی کاروبـاری موسڵمانان بە ڕۆم دەڵێن و نایشارنەوە - مەرجیشیان لەسـەر دانـاوە، دروست نیە ئەو پەیمانە بشکێنرێ مەگەر شـتێکی ڕون وئاشـکرا لـە ئارادا بێت کە غەدرو پەیمان شکێنیان بەدەربخا).[1]

یەحیای کوڕی حەمزەیش بۆی نوسی (هەرخاوەن پەیمانێ موسڵمانان لەسەریان نەجەنگێن ولەسەر حاڵ و باڵی خۆیـان بڕیاریـان بەسـەردا پیادەبکرێ ئەوە (اهل الذمة) نین، بەڵکو خاوەن بریتی (اهل الفدية)ن، ئەگەر دەست هەڵگرن لە خراپەکاری بەرگریان لـێ دەکرێ، ئەگـەر وەفادارو ڕەزامەندبون، وەفا بـە بـەڵێنیان دەکرێ، وە داوای لێبـوردن کردنیان پەسەند دەکرێ ئەگەر ئەرکی خۆیان جێبەجێ کرد ).[2]

(ابـن هبيـرة) مـیری عێـراق لـە سـەردەمی ئومەوییەکانـدا - موحەمەدی کوڕی سیرین و حەسەنی بەسری و کۆمەڵێکی تـری بـانگ کرد، (ابن هبيرة) لە موحەممـەدی کوڕی سیـرینی پرسـی: چۆنـم بەجێ هێلاً؟ واتە بەسرە. فەرموی: بە شـێوەیەك بـەجێت هـێلاوە کـە ستەم تیایدا بلاوە بکا.[3]

قازی ئەفریقیا عەبـدوڕەحمان کـوڕی زیـادی ئـەفریقی بـە سـکالاً کردنەوە هات بۆ لای ئەبو جەعفـەری مەنـسور لـە بەغـدادو وتـی:

(١) (فتوح البلدان)ي (بلاذري)، ل (٣٦٥).

(٢) (فتوح البلدان)ی (بلاذري)، ل (٢١٤).

(٣) اخبار القضاة ، (٣٥٢/١).

(زۆرداری له وولاتی ئێمــەدا بــەدەر کــەوتووە، هــاتووم پێتــی بلــێم و ئاگادارت بکەم، کەچی زۆر داری له ماڵەکەی خۆتەوە دەردەچێ).[1]

هەموو ئەمانە تەئکیدن لەسەر مەودای ئەو ئازادیە سیاسیەی که لەو ســەردەمەدا لــەبارەی ڕەخنەکردنـــی دەســەڵاتەوە لــە ئــارادابووە سەرەڕای بوونی زۆرداری سیاسیش؟!. کەچی دەســەڵات لاقــەی کەســی نەدەکرد، زاناو بیریارەکان ئازادبون لــە ڕادەربڕینــدا مەگــەر ئەوانــەی شیریان هەلکێشا بــێ و لــە ڕێــی زەبــروزۆرەوە ڕووبــەڕووی دەســەڵات بوبێتەوە.

هەندێ له خەلیفه ئومەوییەکان بیروڕایان وابووە هەرکەسێ لەبەر ڕاکردن لەسەرانه (جزية) موســڵمان ببــێ ئــەوا ســەرانەکەی لەســەر ناکەوێ، زۆربەی زانایان لەبەر ئەم هۆکاره بــە دروســتان دەبینــی لــە دژیان ڕابپەرن.[2]

ئەبو جەعفەری مەنسور دەیووت: (پادشایەتی بەهۆی چوار شــتەوە ڕێك‌و ڕاســت دەبێــت (قازیــەك لــە پێنــاوی خــوادا لــە سەرزەنــشتی سەرزەنشت کاران نەترسێ، ئەفسەر (صاحب شرطة)ێك مافی لاواز له بەهێز وەرگرێ، باج وەرگرێك وردکار بێت وستەم لــە خــەڵکی نــەکا چونکه پێویستم به ستەمکردنی نیه نامەبــەر (صــاحب البریــد)ێــك

---

(١) تاریخ بغـداد، (١٠/٢١٥).

(٢) سەیری (الاموال)ی (ابوعبید)، ل (٥٣) بکه.

هەواڵی ئەوانەم بەڕاستی ودروستی پێ بگەیەنێ).[1]

وە دەیوت: (سوڵتان ودەسەڵاتدار بە تەقواو خۆپارێزی چـاك دەبــێ، خەڵکیش بە گوێرایەڵی ووڵاتــیش بــە دادگــەری، هــەموو ئەمانــەش بەسامان ودارایی بەردەوام دەبن).[2]

وە دەیوت: (خەڵکی بەگشتی پێداویـستییەکانی لــە ســێ ڕێگــەوە دابین دەبێت: ئەگەر کەسێکیان بۆ دانرێ بڕوانێتە بڕیارو حوکمەکانیان و مافی هەمویان بدات و ئاسایشی ڕێگەوبانیان بۆ دابــین بکــات و لــە شەو و ڕۆژدا نەترسن، قەڵاو قولەکانیان بگرێ تا لەوێوە دوژمن بۆیان نەیەت).[3]

ئەبو جەعفــەر ئــازاو بڕیــاردەرو زۆرداربــووە، ســەرەڕای ئەمانــەیش دیندار و دادگەربووە لەگەڵ خەڵکیدا، زیاد لــە بیــست ســاڵ فــەرمان ڕەوایی کردووە.[4]

پــاش خۆیــشی کوڕەکــەی موحەمــەد کــوڕی عەبــدوڵای کــوڕی موحەمەدی مەهدی لە ساڵی ١٥٨ك -١٦٩ك فەرمانڕەوایی کرد، کە خاوەنی زانست و فەزڵ بووە، سامانی بەسەر خەڵکیدا دابــەش دەکــردو هیچ بەشێکی بە کەســوکارو مــاڵ و منــداڵ و هاوپــشتەکانی نــەدەدا

---

(١) إبن جرير ٤/٥٢٠

(٢) سەرچاوەی پێشوو بە دەستکاریەوە

(٣) إبن جرير ٤/٥٣١

(٤) تاريخ الذهبي ٨/٤٦٦

بەڵکو لە خانەی سامان بـە پێـی پێداویـستیەکانیان موچـەو ڕزق و ڕۆزی بۆ دەبرینەوە هەر یەکە پێنچ سەد بۆ هەر مانگێك.(1)

فەرمانیدا بەبەردانی هـەموو ئەوانـەی کـە لـە بەندیخانـە دابـون مەگەر ئەوانەی خوێنیان لەسەر بـوبێ یـاخود مافێکـان خـواردبێ و مافیان لەسەر بێت، یاخود ناسراو بوبێتن بـەوەی خراپـەکاری لەسـەر زەوی دا ئەنجام بدەن، سەرکردە نەیارە سیاسیەکانی بەردا.(2)

وە فەرمانیدا ڕزق و ڕۆزی دابەش بکرێ بەسەر تەواوی بەنـدکراو و گەڕوگولەکانی هەر چوارلای وڵات، وە بە پێـی پێداویـستی و دابـین کاریان دابەش بکرێ بەسەریاندا.(3)

ڕەفتارو هەڵس وکەوت جوان بووەو لای خەڵکیش خۆشەویست بووە، پاشان هارونەڕەشیدی کوڕی مەهدی جێنـشینایەتی پـێ دراو گرتیـە دەست لە ساڵی (١٧٠-١٩٣)ك، ئەو یەکێك بووە لـە باشـترینی ئـەو پادشایانەی لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتی جوان بووەو غەزوەی زۆر تر بووە(4) لە زۆر بەشـیان زیـاتر گرنگـی داوە بـە زانـست و زانایـان و کاروباری دەوڵەت (چەندین پیشەسازی وەهای بنیـات نـا کـە پێـشتر نەبوبوو، سامان و دارایی دابەشـکرد بەسـەر قـەڵاو قولـەو کـەناری

---

(١) ابن کثیر، (١٠/١٥٧)، و تاریخ الذهبي (٩/٤٣٨).

(٢) إبن جریر، (٤/٥٤٩)، و تاریخ الذهبي (٩/٢١).

(٣) إبن جریر، (٤/٥٦٤)، و تاریخ الذهبي (٩/١١).

(٤) تاریخ الذهبي، (١٠/٤٢٦)، و ابن الکثیر (١٠/٢٢٢).

دەریاکان و پاراستنیانی لە ئەستۆگرت).[1]

لە ساڵی (١٩٨- ٢١٨)ك مەئمون عەبدوڵای کوڕی هارپوونەڕەشید کاروباری پێ سپێردرا، کەسێکی زاناو بڕیاردەرو و ڕەفتار جـوان بـووە لەگەڵ خەڵکیدا، (إبن کثیر) فەرمویەتی: دادگەری دەویستو هەوڵی بۆ دەدا، خودی خۆی فەرمانڕەوایی‌و حوکمی نێـوان خـەڵکی دەکـردو کێشەکانی یەکلادەکردەوە).[2]

پیاوێك لە خەوارجەکان سەبارەت بە چۆنێتی گرتنەدەستی خەلیفەو جێنشتینایەتی پرسیاری لێی کرد کـە ئایـا جێنـشینایەتیەکەی بـە کـۆڕای ئومــەت و یەکـدەنگی ئـەوان بـووە یـا بـەهێزو زۆرداری و خۆسەپاند بووە؟ ووتی: نە بەمەیان، نە بەوەشیان . بـەڵکو کاروبـاری باوەڕداران بەدەستی ئەو کەسە بووە کە گرێ بەندەکەی بۆ مـن ئـەنجام داوە - هارونەڕەشـید - کـاتێکیش کارەکـە گەیـشت بـە مـن زانـیم پێویستیم بە یەك دەنگی باوەڕداران هەیە لـە ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوادا لەسەر ئەوەی ڕازی بن پێم، دیدو تێڕوانینم وابوو هەرکاتێ من بـەوێ واز لەم کارە بهێنم کەمەندو حەبلی ئیسلام دەشێوێ و ناکۆکی‌و خوێن ڕشتن تەشەنە دەکاو جیهادو ڕەوایەتی لەدەست دەدرێو ڕێگـری‌و ڕاو و ڕوت بەدی دێ، وەك پایزگاری و پـەرژینێ بـۆ موسـڵمانان بەکارەکـە

(١) فتوح البلدان، ل (٢٢٣).

(٢) ابن کثیر، (١٠/٢١٩)، تاریخ الذهبي (١١/٢٢٧).

هەستام تا ئەو کاتەی لەسەر پیاوێك کۆدەبنەوەو پێی ڕازی دەبـن، بـۆ ئەوەی ئەم کارەی پێ بسپێرم، هەرکاتێ ڕێك وکۆك بون لەسەر کەسێك ئەم کارەی پێ دەسپێرم و بۆ ئەو وازی لـێ دێنم.[1]

لەپاش خۆی گرێ بەستی بەیعەتی ئەنجامدا بۆ (علي الرضـا بـن موسی الکاظم بن جعفر الصادق الحسینی العلوي) لەبەر ئەوەی بڕوای هەبوو بە شیاوێتی و فەزڵداری ئەو.[2] کەچی ئەو پێش کۆچی دوایی مەئمون وەفاتی کرد.

مەئمون: فەرمانی زۆری بە دادگەری داوە، ڕەفتاری جوان بـووە، دڵ دەرون گوشادو دەروناس بوەو لە گەورە زانایان دەژمێردرا).[3]

ئەگەر بە ئاژاوەو فیتنەی دروسـتکراوێتی قورئـان (خلـق القـرآن) هەڵنەسایە لە باشترین و شکۆمەندترین خەلیفەی عەبباسیەکان دەبوو بە ڕەهایی.

پاشان لە دوای خۆی موحەمەد کوڕی موعتەسیم بـیللا کاروبـاری پێسپێردراو و گرتیەدەست لە ساڵی (٢١٨ – ٢٢٧)ك لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو ڕۆی، کەسێکی شکۆمەندو جەربەزەو خاوەن ورەیەکی بەرز بووەو گرنگیەکی زۆری بە جیهادو ڕزگارکردنەکان (الفتوح) داوە.[4]

---

(١) تاريخ الذهبي (٢٢٨/١١).

(٢) تاريخ الذهبي (٢٢٨/١١)، وابن كثيـر (٢٨٧/١٠).

(٣) تاريخ الذهبي (٢٣٢/١١).

(٤) تاريخ الذهبي (٣٩٣/١٢)، وابن كثيـر (٣٠٩/١٠).

پاشان (واثـق)ی کـوڕی کاروبـاری گرتـە دەسـتو پێـی سـپێررا، ژیاننامەو ڕەفتاری جێی ڕەزامەندی نەبووەو مەودای خەلافەتیشی زۆری نەخایاندووە.

پاشان (متوكل جعفر بن المعتصم) کاروباری پـێ سـپێرراو گرتیـە دەست لە ساڵی (٢٣٢ – ٢٤٧)ك، کەسێکی بەخشندەو بـە بـەزەییو خۆشەویست بـووە لای خـەڵکیو ڕەفتـاری جـوان بـووە لەگەڵیانـدا، فیتنەی خەلقی قورئانی لەسـەر خـەڵکی هـەڵگرتو فەرمانیـدا واز لەوکارە بهێنرێو خۆی تێ هەڵنەقورتێنندرێ، وە دەیوت: (خەلیفـەکان دەمارگرژو توندوتیژبون بەسەر خەڵکەوە تاوەکو بەگوێیان بکەن، مـن نەرم ونیان دەبم تا خۆشمیان بوێ و گوێرایەڵیم بکەن).[1]

پاش ئەویش (المهتدي بالله محمد بن الواثق بن المعتصم) لـە سـاڵی (٢٥٥)ك جێنشینایەتی پێ سپێرراو گرتیە دەست.[*]

(إبن کثیر) فەرموویەتی (سوپاس بۆ خوا جێنشینـایەتیەکەی چـاك بوو، ڕۆژێك بە میەکانی ووت: من تەنها خواردەمەنی پێویستم دەوێ، لە بەرامبەریشەوە هیچ زیادەو فەزڵێکم ناوێ تەنها بۆ براکـانم نـەبێ چونکە تووشی ناچاری و پێداویستی هاتوون).[2]

---

(١) تاریخ بغـداد (١٦٦/٧)، تاریخ الذهبي (١٩٧/١٣).

* (ولـی) = پـێی سپێررا وگرتیـە دەسـت، هەرچەندە دەکرا یـەك لـەو دوو دەربڕینـە لـە بەرامبەریـەوە بـەکار بهێـنین بـەلام هـەردوو دەربڕینەکـە پێکـەوە مەبەسـتەکە زیـاتر دەپێکێ بە تایبەت بۆ ئەم شوێنە (وەرگێڕ).

(٢) ابن کثیـر (٢٠/١١).

فەرمانی کرد بەگێڕانەوەی مافەکان، وە بەوەی فـەرمان بکـرێ بـە چاکەو نەهی بکرێ لە خراپە، وە دادەنیشت بـۆ کاروبـاری گـشتینەی خەڵك تا بە دادگەری قەزاوەت لە نێوانیاندا بکا).[1]

(إبن کثیر) فەرمویەتی (پێی خۆش بوو لە وەرع وکەمگری دونیاو زۆری پەرسـتش کـردن و زیـادە ئیحتیـات دا عومـەری کـوڕی عەبدولعەزیزی ئومەوی بکاتە سەرمەشقی خۆی).[2]

خەتیبی بەغدادی فەرمویەتی: (باشترین ڕێبـازو جـوانترین ڕێـڕەو دیارترین وەرع و زۆرترین پەرستشی هەبووە لە نێوان خەلیفەکاندا).[3]

هەروەها فەرمووبەتی: (لەگەڵ جوانی ڕێبـازو دادگەریەکەیـشیدا زۆر بـە تونـدی چـاودێری دیـوانو باجـەکانی دەکـرد، خـۆی لەگـەڵ دەزگاکانی (حوسـبەدا) دا دادەنیـشتو نوسـەرەکانیش لەبەردەسـتی دابون).[4]

وای لە دەسەڵاتداران کرد ستەم نەکەن و سەرکردەکانیشی تـەمبێ کرد.[5]

پاشان (معتمد علی الله احمد بن جعفر المتوکل بـن المعتـصم) لـە ساڵی (٢٥٦ ك- ٢٧٩ ك) کاروباری پێ سپێررادا، وەلـی عەهدەکەش

(١) ابن کثیر (٢٠/١١).

(٢) ابن کثیر (٢٦/١١).

(٣) تاریخ بغداد (٣٤٨/٣).

(٤) تاریخ بغداد (٣٥٠/٣).

(٥) تاریخ بغداد (٣٥٠/٣).

(الناصر لدين الله الموفـق) بـوو، ناسـر لـەم ماوەیـەدا کاریەدەسـتی ڕاستەقینە بوو، لە کاروبارەکانی دەوڵەت دا، حەلل وعەقد بەدەسـتی ئەم بوو، زەهەبی لەبارەیەوە دەڵـێ (لە بیوبۆچوندا باشترین پادشاکان بوو، لە ئازایەتیدا بێوێنە ترینیانو لەڕووی دەرونەوە لێبوردەترینیـان بوو، لای خەڵکی خۆشەویست بووە، دەستی گرت بەسەر کاروبارەکاندا، سوپاکان ملکەچی بون لەبڕیاردان وزیرەکی وریاییدا دەیانـچواند بـە ئەبوجعفری مەنسور).[1]

(إبن كثير) لەبارەیەوە دەڵـێ: (زۆر ژیـر بـوو و کاروبارەکـانی بـە جوانی بەڕێ دەخستو ڕایدەپەڕاند، بۆ سەندنەوەی مافەکان دادەنیشت، چەندین قازی لابووە کە مافی ستەم لـێ کراوانـی لـە سـتەمکاران دەسەند، زانابووە بە ئەدەبو فیقهو بەڕێوەبەری کاروبـاری وولات، زۆر چاکەو شوێنەواری جوانی تری هەیە).[2]

پادشان جێنشینایەتی سپێردرا بە (المعتضد بالله أحمـد بـن الموفـق الناصر) دوای ئەوەی (معتمد)ی مامی کۆچی دوایی کرد پاش ئەوەی ساڵی (٢٧٩ ك بۆ ٢٨٩ ك) جێنشین بوو.

(إبـن كـثير) لەبارەیـەوە فەرمویـەتی: (کاروبـاری خەلافـەت پوکابویەوە. بەهۆی دادگەری وئازایی و نەبەردی و چاونەترسی ئەمەوە

(١) تاريخ الذهبي (١٦/ ٤٨٠).

(٢) ابن كثير (١١/ ٦٧).

خوای گەورە ژیاندیەوە). [1]

وە فەرمویەتی (کاروبـاری خەلافـەت لـە سـەردەمی (معتمـد)ی مامی دا لاواز ببو، کاتێك (معتـضد) کاروبـاری گرتەدەسـت و پێـی سپێردرا دروشمەکانی بەرپاکردو مەشخەڵەکانی بەرز ڕاگرت، کەسێکی ئازاو بەرێز بووە لەو پیاوە قورەیشیانە بووە کە بریاردەرو چـاونەترس و دەست پێشخەر بوو، بە هەمان شێوە باوکیشی). [2]

وە فەرمویـــەتی (بـــەردەوام بـــوو لەســـەر بیروبۆچـــون و ڕاســـت ڕەفتارییەکانی تـاوەکو لـە هـەموو هـەرێم و ناوچـەکانیدا سـامان و داراییەکان زۆر بوون و کاروباری و بارودۆخەکان ڕێكو سازبون). [3]

وە فەرمویەتی (هەندێ لە خەڵکی دایدەنێ بە یەکێك لەو خەلیفـە ڕاشدیانەی لە فەرمودەی – جابر بن سمرە- دا باسیان کراوە). [4]

زەهەبی مێژوونوس لە بارەیەوە فەرمویەتی (ڕۆژانی ئەو چاك بووەو پڕ بـووە لـە ئاسـایش و خۆشـگوزەرانی، گـومرگی لابـردو دادگـەری بڵاوکردەوەو ستەمی لەسەر خەڵکی هەڵگرت، نـاودەبرا بـە سـەفاحی دووەم، چونکە پادشایەتی و دەسەڵاتی عەبباسیەکانی نـوێ کـردەوە و پاش ئەوەی کۆن و لاواز ببو نزیك بوو لابرێ و لەناوبچێ، هەر لەکاتی

(١) البداية والنهاية ٧٠/١١
(٢) البداية والنهاية ٧٠/٢٢
(٣) البداية والنهاية ٩٨/١١
(٤) البداية والنهاية ١٠١/١١

مردنی (متوکل)ەوە لە شێواویدا بووە). ئەوەبوو دەستی گـرت بەسـەر ئاژەوەو فیتنەی زنجیەکاندا.

وە فەرمویـەتی (ئـەبو عـەبباس - المعتـضد بـالله - کەسـێکی هەڵکەوتوو خۆڕاگر بووە، پیاوێکی بەخشەر بووەو بە پیاوەتیو ڕێزداری ناسراوە، بەشداری جەنگەکانی کردوو، ناوداری و ڕێزداری ئاشـکرابوە، بە باشترین شێوە بە کارەکانی هەسـتاوە، خـەڵکی گـەورەترین سـام و ترسیان لێی هەبووە).[1]

یەکێك لە میرەکانی ئەو سـەردەمە ئیـسماعیلی کـوڕی ئەحمـەدی سامانی میری خۆراسان و ئەودیو ڕووبار بووە، (إبن کپیر) لەم بارەیەوە دەڵـێ: (کەسێکی ژیرو دادگەرو ڕەفتار جوان بووە لەگەڵ خەڵکیــدا نەرمو نیانو بەخشندە بووە) زانایانی بەگەورە ڕاگرتووە، ساڵی (٢٩٥)ك کۆچی دوایی کردووە.[2]

پاش (المعتضد) (المکتفي بـالله علـي)ی کـوڕی خەلافـەتی گرتـە دەست لە (٢٨٩ ك-٢٩٥ ك)، ئەو حەشارگەو بەندیخانانەی ڕوخاند کە کەسانی دەرچوو لە دەسەڵاتی تێدا بەند دەکراو کردنی بـە مزگـەوت، موڵك و زەوی و زاری خەڵکی گەڕاندەوە بۆیان، ڕەوشت و ڕەفتار جـوان بوو خەڵکی خۆشیان دەویست.[3]

---

(١) تأريخ الأسلام (٢٠/٦٩).

(٢) البداية والنهاية (١١/١٠).

(٣) سير الأعـلام (١٣/٤٨٠).

پاش خۆی (جعفر المقتدر بالله بـن المعتــضد لـه سـالّی ۲۹۵ ك – ۳۲۰ ك) کاروباری گرته دەست.

(إبن كثير) لەم بارەیەوە دەڵــێ: (بەخشندە بووە، پەرستشێکی زۆری ســوننەتی نوێـژو ڕۆژوی هــەبوو، ڕســومات‌و خەرجیــەکان‌و کولفــەی گەڕانەوەی بۆ ئــەو بــارەی لەســەردەمە ســەرەتاکانی عەبباســیەکاندا لەسەری بوو، ئەو بەندکراوانــەی بــەردا کــە دروســت بــوو بــەردرێن، چەندین بیناو بیناسازی بۆ دروست کرابوو فەرمانیدا بروخێنــرێن بــۆ ئەوەی ڕێگەوبانی موسڵمانان بەرین و فراوان ببــێ).[1]

لە ڕووی زیادەڕەوی‌و زۆرمەسرەفــی‌و گوێڕایــەڵیکردنی ژنــان‌و زۆر لابردنی وەزیرەکان ڕەخنەو نەنگی لێگیــراوە.[2] ئەمەش دەگەڕێتــەوە بۆ کەمی تەمەنی ئــەوە بــوو کاتــێ وەفــاتی کــرد ســەرەڕای درێــژی ماوەکەی تەمەنی نەگەیشتبووە چل (٤٠) ساڵی.

پاشتر (الراضي بالله أحمد بن المقتدر بالله بن المعتضد) خەلیفەیەتی گرتەدەست لـە ســالّی (۳۲۲ ك -۳۲۹ ك). بەغــدادی دەڵــێ: (ڕازی چاکەکاری‌و فەزڵی زۆری هەبوو، دوا خەلیفە بوە کــە چــەندین کــاری ئەنجام داوە، لەوانە ئەو دواهەمین خەلیفەك بوو کە شــیعری نوســراوی هەیە، دواهەمین خەلیفەیەکە هەر بۆ خۆی کاروباری سوپاو لەشــکرو سامــان‌و دارایی بەڕێوەدەبرد، دواهەمین خەلیفەیــەکیش بــووە لەســەر

(١) البداية والنهاية (١١٢/١١).

(٢) البداية والنهاية (١١٢/١١).

دوانگه و له ڕۆژی هەینی دا ووتاری داوه). [1]

پاش ئەو حەلل وعەقد کەوتە دەستی وەزیری یەکەم، کە بە سەرۆك وەزیران دەچێ لە سەردەمی نوێدا، خەلیفەکان تـەنها ناویـان مـابوو، وتاریش بەناویانەوە دەدرا، میری ناوچەکانی دەوروبەریش لـە دەوڵـەتی ئیسلامیدا زیاتر لە جاران سەربەخۆی زۆرتریان بە دەست هێنا.

لە پاش وەفاتکردنی قازی و پیاوماقوڵ و کەسایەتیەکانی حەلل و عقد کۆبونەوەو ڕێککەوتن لەسەر ئـەوەی گـرێ بەسـتی بەیعـەت بـە (المتقی بالله) برای بدەن، هەر بە ناوەکەیدا دەردەکەوێ کـە زۆر ڕۆژو و نوێـژو و پەرسـتیش و زوهـدی هـەبووە و دونیـا نەویـست بـووە، خەلیفایەتیەکەی زۆری نەخایاند [2] ئەوە بوو ٣٣٣ ك دا لەکارخرا. [3]

لە میرەکانی ئەو چەرخە (علی بن بویـە عمـاد الدولـة)ی پاشـای شیراز بوو لە ساڵی ٣٢٢ ك ٣٣٨ ك یەکـەمین پادشـای بوەیهیـەکان بووە، (إبن کثیـر) لـەم بارەیـەوە دەڵـێ: (لـە باشـترین پادشـایانی سەردەمی خۆی بووە، دەسـت پێـشخەربووە و هاورێکـانی لـە ئاسـتیا نەبوون، خەلیفەکان بە ناوی ئەمیری باوەردارانەوە لەگەڵی دەئـاخفتن)، لەم بارەیەوە وتویەتی: (ژیرو بیـرتیژ و ڕەوشت جوان بـووە لـە خـودی

(١) البداية والنهاية ١١٢/١١

(٢) البداية والنهاية ٢١١/١١

(٣) البداية والنهاية ٢٢٣/١١

خۆیدا سەرکردەو گەورە بووە).[1]

هەر لەوان (رکن الدولة بن علي بن بويه)ی پاشای شیراز لـە دوای باوکی هات (٣٦٦) ك، (إبن كثير) لەم بارەیەوە وتویەتی: (دڵ نەرم و ئارامگرو خاوەن ویقـار بووە، خێرو ســــەدەقاتی زۆر بـووەو زانایـانی خۆش ویستووە، چاکەکاری و بەخشین و خۆنەویـستی و هـاوەڵ خۆشـی و سەرکردایەتی و دڵنەرمی بەرامبەر بە خەڵکەکەی تێدا بووە).[2]

هەروەها لە میرەکانی ئەو سەردەمە (الناصر لدين الله عبـدالرحمن الأموي)، یەکەمین خەلیفەبووە لە ئەندەلوسدا، لە ساڵی (٣٠٠ ك بۆ ٣٥٠ ك) فەرمانڕەوایی کرد، کەسـێکی زانـاو خوانـاس و تێکۆشـەر بـــووە).[3]

لەدوای خۆیشی (المستنصر بالله) کوڕی لـە ســـاڵی (٣٣٨ ك بـۆ ٣٦٦ ك) فەرمانڕەوایی کرد کە لە (باشترین پادشـاکان و زاناکـانیش بووە، زانابووە بە فیقهو خیلافو مێژوو، زانایانی خۆش ویستووە).[4]

پاشان بەیعەت درا بە کوڕەکەی (المؤيد بـالله بـن المستنـصر) کـە منداڵ بووە، کاروبـاری دەوڵەتەکـەی لـە لایـەن (منـصور بـن أبـی عـامر)ەوە بەڕێوە براوە، لەپاش ئەویش لە لایەن هـەردوو کوڕەکەیـەوە

---

(١) البداية والنهاية (٢٢٥/١١).

(٢) البداية والنهاية (٢٢٥/١١).

(٣) البداية والنهاية (٢٥٣/١١).

(٤) البداية والنهاية (٣٠٤/١١).

(مظفر و ناصر) بۆ ماوەی (٢٦) ساڵ.

(إبن کثیر) فەرمویـەتی: (کاروبـاری خـەڵکیان بـە باشـی دەبـرد بەڕێوە، دادگەریان لەنێواندا پیادەدەکرد، غەزوی دوژمنیان دەکرد).[١]

هەروەها لە پادشایانی تریش (سبکتکین) هەبووە کە سەرکردەکانی سوپا لە (غزنه) لە دەوروبەری خوراسان بەیعەتیان پێی داو کردیانـە میر بەسەر خۆیانەوە لـە سـاڵی (٣٦٦)ك (لەبـەر ئـەوەی چـاکەکارو خێرخوازبووە بۆیان، و ڕەفتارو ژینامەی جـوانو ژیـری کامـڵو ئـازاو بەجەرگ و دیندار بووە).[٢] بەردەوام پادشا بووە تاوەکو لە ســـــاڵی (٣٨٨) ك وەفاتی کرد، پاش خۆیشی مەحمودی کـوڕی فـەرمانڕەوایی کرد، کە ئەویش کەسێکی موجاهیـد بـووەو زۆر جێوشـوێنی وڵاتـی هیندی ئازادکرد، کەسێکی دادگەرو خاوەن فەزڵ بوو، ساڵی (٤٢١)ك. وەفاتی کردووە،[٣] تـوانی زاڵ ببـێ بەسـەر زۆرینـەی رۆژهـەڵات دا. بەناوی خەلیفەی عەبباسی (القادر بالله أحمد بن المقتدر بـن المعتـضد بن الموفق)ەوە وتاری دەدا کە لە (٣٨١ ك بۆ ساڵی ٤٢٢ ك) خەلافەتی گرتبوە دەست (- قادر بالله - کەسێکی خۆگرو بەخشندە بـوو، زانـاو دیندارو چاکەخوازانی خۆشدەویست، فەرمانی بە چاکە دەکردو نـەهی لە خراپە دەکرد).[٤] لە بارەیەوە دەڵـێ : (لـە باشـترین خەلیفـەکانو

(١) البداية والنهاية (١١/٣٠٤).

(٢) البداية والنهاية (١١/٣٠٤).

(٣) البداية والنهاية (١٢/٣٢،٢٩).

(٤) البداية والنهاية (١٢/٣٣-٣٤).

گەورە زانایان بووە).[٢]

بەڵام حەلل وعەقد لە دەستی میرە شیعە بوەیهیەکان دا بوو لە بەغداد. بەمەش دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم دەوڵەت دەبێ ئاشنابووە بە سیستەمی جیاکردنەوەی نێوان سەرۆکایەتی دەوڵەت کە لە خەلیفەدا خۆی دەنوێنێ، و سەرۆکایەتی وەزیران کە لە وەزیر یاخود سوڵتان دا خۆی دەنوێنێ، کە خەلیفە مافی پێدان یان لابردن ئەو پۆستەی هەیە، هەر یەکەشیان سەلاحیەتی خۆی هەیە هەر وەك لە کتێبەکانی (الأحکام السلطانیة)دا بە درێژی باسکراوە، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی خەلافەتی عەبباسی بۆ ماوەی حەوت سەدە بەردەوامی هەبێت، چونکە خەڵکی پێویستی بەوە نەبوو لەکاری خەن و لاییەرن لەبەر ئەوەی وازی هێنابوو لە زۆربەی سەلاحیاتەکانی بۆ وەزیری یەکەم.

کاروباری بەغداد بەردەوام بەدەستی بوەیهیەکانەوە بوو تا ئەو کاتەی (ملك العادل محمد بن سلجوق طغرلبك) ساڵی ٤٤٧ ك هاتە بەغداد، پاش ئەوەی خەلیفە (القائم بأمر الله) ناردی بە شوێنی دا و بانگەشەی کرد بۆ هاتنە ناو بەغداد. بەردەوام بوو تێیدا تاوەکو ساڵی ٤٥٥ك وەفاتی کرد، لە پاش خۆیشی برازاکەی (موحەممەدی کوڕی داود ئەلب ئەرسەلان) فەرمانڕەوایەتی گرتە دەست.[١]

ئەلب ئەرسەلان (دادگەربوو بە شێوەیەکی جوان ڕەفتارو هەڵس و

(٢) البداية والنهاية ١١/٣٣٠

(١) البداية والنهاية ١٢/٩٥

كەوتی لەگەڵ خەڵكیدا دەكرد، بەخشندەو میهرەبان بووە، بەرامبەر بە خەڵكی زۆر بە بەزەیی‌و دڵ نەوا بوو، دڵنەرم بوو لەگەڵ هەژاراندا، سەردەمی ئەو تاوانكاری و زەوتكردنی بەخۆوە نەبینیوە، زۆر سوور بووە لەسەر پاراستنی سامانی خەڵكی). (١) وەزیرەكەی (نظام الملك) بوو، ساڵی (٤٦٤)ك كۆچی دوایی كرد.(٢)

پاش خۆی (ملك شاه) بوو بە دەسەڵاتدار، وەزیری یەكەمی ئەویش (نظام الملك) بوو، (ملك شاه) لەگەڵ خەڵكیدا بە جوانی ڕەفتاری دەكرد. (٣)

ساڵی (٤٦٧)ك خەلیفە (القائم بأمر الله) كۆچی دوایی كرد، ساڵی (٤٢٢) ك جێنیشینایەتی گرتە دەست، ماوەی خەلافەتەكەی چل‌و چوار ساڵ بوو، ئەو كەسێكی بە وەرع‌و زاهیدو دادگەر بوو، زۆر چاكەكار بوو لەگەڵ خەڵكیدا، یەكێك بووە لە باشترین خەلیفەی عەبباسیەكان لە ڕووی دینداری و بیروباوەڕو دەوڵەتدارییەوە). (٤) ماوەی خەلیفایەتیەكەی لەگەڵ خەلافەتەكەی باوكیدا هەشتاو پێنج ساڵ بووە.

پاشان نەوەكەی (المقتدى بأمر الله عبدالله بن محمد بن القائم بأمر الله القادري العباسي)، لە ساڵی (٤٦٧)ك خەلافەتی گرتە دەست لە

---

(١) البداية والنهاية (١١٤/١٢)

(٢) البداية والنهاية (١١٣/١٢).

(٣) البداية والنهاية (١١٣/١٢).

(٤) البداية والنهاية (١١٧/١٢).

تەمەنی بیست ساڵی دا، بـاپیری زۆر بـە جـوانی پـەروەردەو پاڵفتـەی کردبوو، وەزیرو میرو خانەدان و قازی و زانایـان هـەمویان بەیعـەتیان پێی دا، ئەویش کەسـێکی (مـەرد و دلێـر و جـوامێر بـوو، تـەواوی رۆژەکـانی پیرۆزبـوون، رزق و رۆزی زۆر فرەبـوو، جێنـشینایەتی زۆر گەورەبوو، پادشاکانی بچوکیان دەکێشاو لە بەردەمیدا بـو دەڵـەببون، بەغدادو وڵاتانی تری ئاوەدان کردبووەوە، (ابن جهـیر) کـرا بـە وەزیـر، پاشتر (أبو شجاع) و (ابن الدامغانی) قـازی ئـەو و دواتـریش (ئـەبو بەکری شاشی)، ئەوانە لە باشترین قازیو وەزیرەکانی بون).[1]

(فەرمانی بە چاکە دەکردو نەهی لە خراپە دەکردو رەفتار ورەوشت جوان بوو)، ساڵی ٤٨٧ کۆچی دوایی کرد.

(معتمد بن عباس الاندلسی) یەکێك بوو لە پادشایانی ئەو چاخە (رەوشـــت و ژینامـە پاك، بوو لەگـەڵ خەڵکیـدا چـاکەکار و دڵنـەرم بوو).[2] لەپاش ئەویش (یوسفی کوڕی تاشفینی تێکۆشەر) کاروباری گرتە دەست.

دادگەری پادشایانی ئیسلام گەیشتبووە رادەیەك پادشا ئەوروپییەکان چاویان لێ دەکرد، (إبـن کـثیر) فەرمویـەتی: (لەوێـدا ئەوروپییـەکان (صقلیە)یان گرتەدەست، پادشاکەیان مرد، کوڕەکەی لەناو خەڵکیـدا بە پێی رەوشت و رەفتاری پادشا موسوڵمانەکان دەجولایەوە، وەك ئەوەی

(١) البدایة والنهایة ١١٨/١٢ و١٥٦

(٢) البدایة والنهایة

لەوان بێت، بەهۆی ئەو چاكەكاريەی لەگـەڵ موسـڵمانانـدا ئـەنجامی دەدا). [1]

لە بەناوبانگترين وەزيرەكانی (نظام الملك) لەوكاتەدا وەزيـر (ألـب أرسلان)و (ملكشاه) بوو كە ماوەی (٢٩) سـاڵ فـەرمانڕەوايی كـرد، يەكێك بوو لە باشترين وەزيرەكان وە زانايەكی پايەبەرزو خوانـاس بـۆ خوا سوڵحاوە بوو. [2] ساڵی (٤٨٥)ك كۆچی دوايی كرد.

هەر لەو كاتەشدا (ملكـشاه)ش كۆچـی دوايـی كـرد، دەوڵـەت و دەسەڵات لەوپەڕی سنوری توركەوە دەسـتی پـێ دەكـرد تـا ئەوپـەڕی يەمەن (ڕێگاو بانەكان لە سەردەمی ئەودا لـە هـێمنیو ئاسـايش دا بوون، بيناسازی هەرە گەورەی ئـەنجام دا، چـەندەها ڕووبـاری گـەورەی هەڵكەند)، (لەگەڵ ئەو شكۆمەندييەی هەيبو بەدەم هــەژارو لاواز و بێوەژنانەوە دەوەستاو پێداويستييەكانی بۆ دابين دەكردن)

كاتێك گومركی لابرد لەو بارەيەوە قسەی لەگەڵ كراو تێيان‌گەياند كە ئەمە زيان بە خەزينە دەگەينێ، ئـەويش فـەرمووی (دەك تياچـن! سامان سامانی خوايە، بەندەكانيش بەندەی خـوان، وڵاتـيش وڵاتـی خۆيەتی)

لەگەڵ ناحەزو شكاتكارەكانيدا لە بەرامبـەر قازييـەوە دەوەسـتاو فەرمانی دەكرد دادگەرانە حوكم بكات. بەم شێوەيە نۆزدە ساڵ فەرمان

(١) البداية والنهاية

(٢) البداية والنهاية (١٤٩/١٢)

ڕەوایەتی کرد.[1]

پاشان (المستظهر بأمر الله بن المقتدی بالله) لە ساڵی ٤٨٧ ك خەلافەتی پێ سپێدرا، (مستظهر) (ڕەوشت جوان بووە، قورئانی لەبەر بووەو ڕەوانبێژ بوو، کاروباری خەلافەتی سپارد بە (أبو المنصور عمید الدولة بن جهیر)ی وەزیری، ئەویش بە جوانترین شێوە بەڕێوەی دەبرد، بە باشترین شێوە ڕێخۆشکەری بۆ کاروبارەکان دەکردو کاروباری خەڵکی بەڕێوە دەبرد، یەکێك بوو لە باشترین وەزیرەکان).[2]

لە ساڵی (٤٨٧)ك وەفاتی کرد، (أتابك قسنقر) حەلەب و دیاربەکرو جەزیرەی گرتەدەست، کە باپیرەی نورەدین زەنکی یە، ئەم کارەشی لە لایەن (ملکشاه)وە پێ درا بە ئاماژەی (نظام الملك)ی وەزیر، (ئەو یەکێك بوو لەو پاشایانەی کە جوانترین ژیاننامەی تۆمار کردوە، ڕازو نهێنییەکانی پوخت پاراو بووە، خەڵکی لە سایەیدا لە ئاسایش‌و خۆشگوزەرانی‌و دادگەرید ژیاون).[3]

لە ساڵی (٤٨٨)ك (أبو شجاع محمد بن الحسین ظهیرالدین)ی وەزیر کۆچی دوایی کرد کە یەکێك بوو لە باشترینی وەزیرەکانی، خێرو خێرات‌و چاکەکاری زۆر بووە، وەزیری خەلیفە (المقتدی بأمر الله) بووە... هیچ کات بەبێ زانایان لە دیواندا دانەدەنیشتن ئەگەر

(١) البداية والنهاية (١٢/١٥٢-١٥٣).
(٢) البداية والنهاية (١٢/١٥٦-١٥٧).
(٣) البداية والنهاية (١٢/١٥٧).

ئیشکالێکی بۆ دروست بوایە پرسیاری لـێ دەکردن‌و بە فەتوای ئەوان حوکمی دەکرد، زۆر خاکی بووە لەگـەڵ هـەموو خەڵکیـدا بەگـشتی‌و تایبەتی). [1]

هەر لەم سەردەمەدا قازی دادگـەر (ئەبوبـەکری شاشـی) کۆچـی دوایی کرد، (المقتدی) دوای (ابن الدامغانی) قەزای پێ سپاردبو، (ئەو یەکێك بووە لە پـاك‌و پـوخترین کەسـی نێـو خـەڵك، بەخشـشی لـە سوڵتان‌و دیاری لە خەڵك وەرنەگرتووە، خواردن‌و جل‌و بەرگی نەگۆڕی، لەسەر قەزاوەتکردنی کرێی وەرنەگرت، کەسی نەدەکـــردە بریکـاری‌و هەر خۆی ڕاسـتەوخۆ پێـی هەڵدەسـتا، خۆخـۆیی نـەدەکردو کەسـی نەدەخستە پێش کەس). [2]

شایەتی یەکێك لە گەورە فەقیهـەکانی وەرنـەگرت، کاتێـك لێـی پرسرا: بۆ؟ فەرموی: چونکە تۆ ئاوریشم دەپۆشی‌و حەلقەی ئاڵتون لە دەست دەکەی. فەقیهەکە وتی: سوڵتان‌و (نظـام الملـك)ی وەزیریـشی حەریر دەپۆشن و ئەڵقەش لە پەنجە دەکەن.

شاشی فەرمووی: ئەگەر ئەوانیش لای من لەسەر چەپکە پاقلەیـەك شایەتی بدەن لێیان پەسەند ناکەم و شاهیدیەکەیان دەدەمە دواوە. [3] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مـەودای سـەربەخۆیی قـەزا لـەو ماوەیـەی

(١) البداية والنهاية (١٥٧/١٢).

(٢) البداية والنهاية (١٢/١٦٠-١٦١).

(٣) البداية والنهاية (١٦١/١٢).

دیاردەی (زۆرداری دادگەری) تیا بەدەرکەوت.

ساڵی (٥٠١) ك (تمیم بن المعز بن بادیس) پادشای ئەفریقیا کۆچی دوایی کرد، فەرمانڕەواییەکەی لە ساڵی (٤٥٥)ك دا بوو (باشترین پادشا بوو لە ڕووی نەرمونیانیو میهرەبانیو بەخشینو چاکەکاریەوە).[١]

هەر لەم ماوەیەدا (صدقه بن منصور الاسدی سیف الدولة) میری حللەو تکریت و واست کۆچی دوایی کرد کە (کەسێکی دەم و داوێن پاك و خۆ سەرزەنشتکەر بوو، پەناگەی هەموو ترسێندراوێك بوو لە وولاتی ئەمدا لە ئاسایش دا دەژیا لە سایەیدا دەحەسایەوە).[٢]

ساڵی (٥٠٩) (یحیی بن تمیم بن المعز بن بادیسی) پادشای ئەفریقیا کۆچی دوایی کرد کە (لە باشترین پادشاکانو کەسێکی خواناس بوو، ڕەفتارو هەڵسوکەوت جوان بوو، خۆشەویستی هەژارو زانایان بوو).[٣]

لە ساڵی (٥١١)ك (غیاث الدین السلطان محمد بن ملکشاه بن ألب أرسلان)ی سەلجوقی سوڵتانی عێراقو ڕۆژهەڵات کۆچی دوایی کرد کە (لە باشترین پادشاو ڕەفتار جوانترین پادشایان بوو، دادگەرو میهرەبانو ڕوح سوك و خۆش خوان بوو).[٤]

---

(١) تاریخ ابن الکثیر (١٢/١٨١).

(٢) تاریخ ابن الکثیر (١٢/١٨١).

(٣) تاریخ ابن الکثیر (١٢/١٩١).

(٤) تاریخ ابن الکثیر (١٢/١٩٣).

له سالّی (٥١٢)ك خەلیفه (المستظهر بالله المقتدي) كۆچی دوایی كرد كه كەسێكی (خێرخوازی بەرێزی زیرەكو لـێهاتوو بوو، ڕۆژانی ئەو له بەغدا وەك جەژنەكان وابوو، كاروباری خەلافەتی بە جوانی و وردی و توندوتۆڵیەوە رێكوپێك كردبوو).[1] پاش خۆی (المسترشد)ی كوڕی بۆ ماوەی حەڤدە ساڵ كاروباری گرتەدەست.[2]

له سالّی (٥١٥)ك (ابو القاسم الأفضل) وەزیری فاتمیەكان له میسر كۆچی دوایی كرد، كەسێكی دادگەرو هەڵسوكەوت جوانی مەردو جەوامێر بوو، پاش تێكچونی بارودۆخەكان، رێكو ڕاستی كردەوە، له ماوەی (٢٨) ساڵدا بەردەوام سەرقاڵی بەرێوەبردنی كاروباری میسر بوو[3]

له سالّی (٥٢٢)ك میری دیمەشق (طغتكين) كۆچی دوایی كرد، یەكێك له مەمالیكەكانی ئەلب ئەرسەلان و (كەسێكی ژیرو بڕیاردەرو خێرخوازبوەو جیهادی زۆری دەكرد).[4] وە (له باشترین پادشایان و دادگەرتریان بوو له هەموشیان زیاتر جیهادی ئەوروپییەكانی دەكرد).[5]

(١) تاريخ ابن الكثير (١٢/١٩٥).
(٢) تاريخ ابن الكثير (١٢/١٩٥).
(٣) تاريخ ابن الكثير (١٢/٢٠٢).
(٤) تاريخ ابن الكثير (١٢/٢١٣).
(٥) تاريخ ابن الكثير (١٢/٢١٣).

ساڵی (٥٢٥)ك کۆچی دوایی کرد کـه یـەکێك بـوو لـە باشـترین پادشاکان،[1] و لە ساڵی (٥٢٩)ك خەلیفە موستەرشـدی عەبباسـی کوژرا کە (نەبەردو جوامێرو دوور بین بـوو، پەرستـشی زۆر بـوو، لای خەڵکی بە گشتی و تایبەتی خۆشەویست بوو).[2]

لەساڵی ٥٣٠ ك خەلیفە (ڕاشدی کوری موستەرشد) لەکار لابـرا دوای ئەوەی لەگـەڵ سـوڵتان مەسـعودی سـەلجوقی نـاکۆکی کەوتـە نێوانیانەوە، سوڵتان مەسـعود نوسـراوێکی دەرکـرد کـە بەرێنوسـی خەلیفە نوسرابوو هەرکاتێ خەلیفە دژایەتیو دوژمنایـەتی سـوڵتانی کرد ئەوە خۆی لە خەلافەت لابردووە، بە پێی ئەو مەرجە هەنـدێ لـە قازیو فەقیهەکان فەتوای لابردنیان دا.[3]

لە ساڵی (٤٥١)ك پادشای حەلـەبو موسـڵو ڕەهـا (زنکـی بـن قسنقر) کۆچی دوایی کرد، کە پێشتر لە (٥٢٢ ك)یەوە ئەم ناوچانەی بە دەستەوە بوو (یەکێك بوو لە باشترین پاشاکان ولەوانـەی چـاکترین ژیاننامەو ڕەفتاری هەبووە، کەسێکی ئازاو نەبـەرد بـوو، پادشـایانی چواردەور ملکەچی بون، لـە ڕووی هەڵـسوکەوتەوە یـەکێك بـوو لـە باشترین پادشایان، لە هـەموویان غیرەتـی زۆرتـر بـووە بـۆ ئـافرەتی

(١) تاریخ ابن الکثیر (٢١٣/١٢).
(٢) تاریخ ابن الکثیر (٢٢٤/١٢).
(٣) تاریخ ابن الکثیر (٢٢٥/١٢).

خەڵکی‌و نەرم‌و نیانترین کـەس بـووە لەگـەڵ خەڵکیـدا).[1] پاشـان پادشای دادگەر (نورەدین مەحمود زەنكـی) پادشـایەتی گرتەدەسـت‌و كاروباری پێ سپێردرا.

لە ساڵی (٥٤٤)ك (أحمد بن نظام الملك)ی وەزیر كۆچی دوایی كرد، كە وەزیرێتی بۆ خەلیفـە موستەرشـیدو سـوڵتان مـەحمود كردبـوو، یەكێك بوو لە باشترین وەزیرەكان.[2]

هەروەها پاشای موسڵ (غازی بن قسنقر) بـرای نـورەدین زەنكـی كۆچی دوایی كرد، كە یەكێك بو لـەو پادشـایانەی بـاش و چـاكترین ڕەفتارو مـامـەڵەی هەبووە، نهـێنی و ڕازەكـانی پوخـت و پـاك بـووە و كەسێكی ئازاو بەخشندە بووە.[3]

لە ساڵی (٥٤٧)ك دەوڵەتی (بنو سبكتكين) لـە غەزنـەو وڵاتـی هیندا كۆتایی پێ‌هات، كە سەرەتاكەی دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵی (٣٦٦ ك) پادشاكانی لە باشترینی پادشایان بون، جیهادو چاكەكاری زۆریان هەبوو.[4]

لە ساڵی (٥٤٩)ك سوڵتان مەحمود كوڕی نورەدین زەنكـی شـام و میسری گرتە دەست، خەڵكی زۆر شادمان بون.

---

(١) تاريخ ابن الكثيـر (٢٣٧/١٢).

(٢) تاريخ ابن الكثيـر (٢٤٣/١٢).

(٣) تاريخ ابن الكثيـر (٢٤٤/١٢٢).

(٤) تاريخ ابن الكثيـر (٢٤٧/١٢).

له ساڵی (٥٥٥)ك خەلیفەی عەباسی (المقتفي بـأمرالله محمـد بـن المستظهر) کۆچی دوایی کرد، ماوەی خەلافەتی بیستو چوار ساڵ بوو، کەسێکی نەبـەردو جـوامێرو ئـازابوو، خـۆی کارەکـانی ڕادەپەڕانـدو بەشداری جەنگەکانی دەکردو سامانو دارایی دەبەخشی، یەکەم کەس بوو بە تەنها خۆی دەسەڵاتی بەسەر عێراق دا هەبو هەر لە سـەرەتای ڕۆژانی دەیلەمەوە تا ڕۆژانـی سـەردەمی خـۆی فـەرمانڕەوایی بەسـەر سەربازو میرەکاندا دەکرد.[1]

پاش خۆیشی بەیعەت درا بە (المستنجد بالله یوسف بن المقتفي) کە پێشتر وەلی عەهدی بوو، پیـاوێکی چـاك بـوو، موسـوڵمانان پێـی دڵشادو شادمان بون.[2]

هەروەها لە ساڵی (٥٥٥)ك پادشا (خەسرەو شای کوڕی مەلیکشای کوڕی بەهرامی کوڕی مەسعودی کوری سبکتکینی غەزنەوی) کۆچی دوایی کرد، یەکێك بوو لەو پاشا شکۆمەندانەی هەڵسوکەوتی ڕێکـو ڕاست بوەو زانستو زانست خوازانی خۆش دەویست.[3]

لە ساڵی (٥٦٠)ك (یەحیای کوڕی موحەممەدی هوبـەیرە) وەزیـری خەلیفە موقتەفـیو موستەنجدی کوڕی کۆچی دوایی کرد (یەکێك بوو لە باشترینی وەزیرەکانو ڕەوشت جوانترینیان، لە هەموویان دوورتر لە

(١) تاریخ ابن الکثیر (٢٥٩/١٢).
(٢) تاریخ ابن الکثیر (٢٥٩/١٢).
(٣) تاریخ ابن الکثیر (٢٥٩/١٢).

ستەمەوە، موقتەفی دەیووت: کەس وەکو ئەو وەزیرێتی عەباسـیەکانی نەکردووە. زیادە ڕەوی دەکرد لە پایەدارکردنی دەوڵەتی عەباسی دا، بە پێی توانا مـادەی پادشـایەتی سـەلجوقیەکانی حەسـم کـرد، تـاوەکو خەلافەت لە عیراق سەقامگیر بوو، بەشێوەیەك پادشاکان لەگەڵ ئەودا بە تەواوی فەرمان ڕەوایەتیان لە دەست دابـوو).[1] یـەکێك بـوو لـە گەورە زاناو شارەزاکان، چەندین بەرهەمی نوسـراوی لەسـەر ڕێبـازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەیە .

لە ساڵی (٥٦٥)ك پادشا (قطب الدين بن زنكـي) بـرای نـورەدین مـەحمود کۆچی دوایی کرد کە بۆ ماوەی بیست سـاڵ موسـڵی لـەژێر دەستابوو (یەکێك بوو لە باشترین پادشاکان، لای خەڵکی خۆشەویست بوو، بە سۆز بوو لەگەڵیاندا و چاکەخواز بوو بۆیان).[2]

هەر لەو سەردەمەدا خەلیفەی عەباسی (المستنجد) کۆچی دوایـی کرد، ماوەی خەلیفایەتیەکەی یانزە ساڵ بوو (یەکێك بوو لە خەلیفـە باشەکان دادگەرو نـەرمو نیـانترین خەلیفـە بـوو لەگـەڵ خەڵکیـدا، گومركو باجی لەسەر هەڵگرتن، لە عێراق دا گومرکی نەهێشت، زۆر فەرمانی بە چاکەو نەهی لە خراپـە دەکـرد).[3] لـە پـاش خۆیـشی بەیعت درا بە (المستضيء الحسن بن المستنجد).

---

(١) تاريخ ابن الكثير (٢٦٩/١٢).

(٢) تاريخ ابن الكثير (٢٨٠/١٢).

(٣) تاريخ ابن الكثير (٢٨١/١٢).

له ساڵی (٥٦٧)ك سەلاحەدین له میسردا ووتاری بەناوی خەلیفەی عەبباسی بەغداوه خوێندەوەو دەوڵەتی فاتمییەکانی نەهێشتو لایبـرد.

له ساڵی (٥٦٨) نەجمەدین ئەیوب کـوڕی شـادی بـاوکی، کۆچـی دوایی کرد، یەکەم جار له لایەن پادشا موحەممەد کوڕی مەلیك شـاوه کرابویه میری تکریت (به دادگەرانـه فەرمانڕەوایـەتی تێـدا دەکـردو کەسێکی زۆر بەڕێزو بەخشنده بوو).

پاشان چووه خزمەتی عیماد دەین زەنکی، ئەویش کردیه نوێنـەری خۆی لەسەر بەعلەبەك و ماوەیەکی درێژ فەرمانڕەوایەتی تێـدا کـرد، عیمادەدین، ئەسەدەدین شێرکۆی کـوڕی شـادی -بـرای نەجمـەدین-ی کرده یەکێك له سەرکردەی سوپاکەی.(١)

هەر ئەو بوو، به هاوەڵی سەلاحەدینی برازای لـه سـاڵی (٥٦٤)ك چووه مـیسر پاش ئەوەی (العاضد)ی فـاتمی هانـای هێنـا بویـه بـەر نورەدین زەنکی بۆ پاراستنی له هێرشی فرنجیەکان.

له ساڵی (٥٦٩)ك پاشای دادگەر نورەدین مەحمود کـوڕی زەنکـی سەلجوقی کۆچی دوایی کرد، که حەنەفی ڕێبازبوو، زانایانو هـەژارانی خۆشدەویستو ڕێزی دەگـرتن، لـه بریـارو حـوکم دا زۆر بـه چـاکیو هاوسەنگی دەجولایەوەو شوێنی شەرعی پاكو پوخت دەکەوت، کـۆڕی دادی دەگرتو خۆی پێی هەڵدەسا، قازیو زاناو فتواچیەکانی هـەمو

---

(١) تاریخ ابن الکثیر (٢٧٤/١٢ و٢٩٠)

ڕێبازەکـانی لـە دەوری خـۆی کۆدەبونـەوە، لـە ڕۆژی سێـشەممان لـە مزگەوتدا دادەنیشت بۆ ئەوەی هەمور کەسێکی موسڵمان پێی بگەن و یەکسانیان لەگەڵ ڕەچاو بکا، کەسێکی ئـازاو ورە بـەرزو زۆر بـەڕێزو دیندار بوو.[1] ساڵی (٥٤١)ك فەرمانڕەوایەتی کردو دژ بە فرنجیەکان تێکۆشا، تێکی شکاندنو چەندین شاری ڕزگار کرد کـە لـە شـام دا دەستیان بەسەردا گرتبوو.

نـورەدین یـەکێك بـوو لـە پاشـا چاکـسازەکان. (إبـن کـثیر)[2] فەرمویەتی: (لە وڵاتەکەیدا سوننەتی دەرخـستو بیدعـەی مرانـد، سنورەکانی پیادەکردو قەڵاکانی ڕزگار کرد، چەندەها جـار فرنجـەکانی تێکشکان، چەندین قەڵای زۆرو شورەی قـایمو سـەختی لـە دەسـتیان سەندەوە، کە شورەو قەڵای موسڵمان بوونو دەستیان بەسەردا گیـرابوو، چەندین بەشی دابویە عەرەبەکان بۆ ئـەوەی ڕێگـری لـە حاجیـەکانی نەکەن، لە دیمەشق دا خەستەخانەو بیمارستانی وای دروسـت کردبـوو کە لە پێشو پاش خۆیـشیدا شـتی وا دروسـت نـەکرابوو، چـەندین وەقفیشی کرد بوو بۆ ئەوانەی هەتیوانیان فێری ڕێنـوسو خوێندنـەوە دەکرد، نەفەقەو جلوبەرگی بۆ دابین کردبون، هەروەها بۆ ئەوانەش کە دەرو دراوسێی مـەککەو مـەدینەش بون، وە چەندین وەقفی تری هـەبوو کە لە هەمور دەروازەو دەرگاکانی خێردا سوودی لـێ دەبینرا، دەدرایە

(١) تاریخ ابن الکثیر (١٢/٢٩٧-٢٩٨).

(٢) لبدایة والنهایه (١٢/٢٩٨).

بێوەژنانو ئەوانەی خاوەنی پێداویستی هەمــە جـۆر بـون، مزگـەوتی (الجـامع) بـەرەو هەڵوەشـانو پوکانـەوە دەچـوو تـازی کەمالـەدین موحەممەدی کوری عەبدوڵڵای شارەزووری کردە سەرپەرشتیاری، ئەوقافی نوێی تری زیادکرد بۆ مزگەوت جگە لەو وەقفە دیاریانەی کـە زانـراو بووە، ئەمەیان وەقف کارەکانی ناسراو نەبوون، مەرجەکانیشیان زانراو نەبوو، کردی بە یەك شتو ناونرا سـامانو دارایـی بەرژەوەندیـەکانو موچـەیەکی لـێ برِیـەوە بـۆ موحتـاجو هـەژارو نـەدارو بێـوەژنو هەتیوەکانو هاووێنەی ئەمانە. ئەو (بە بەزەیی خوا کەویێ) خۆشنوس بـووە، خوێندنـەوەی کتێبـە ئایینیـەکانی زۆر بـووە، شـوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەری خوا بووە، خێرخواز بـووەو دەسـتو داوێـن پـاك بووە، خـۆیو خێزانـی لـە خـواردنو پۆشـین دا بـە شـێوەیەکی مـام ناوەندیانە خەرجیو نەفەقەیان کردووە، تا ئەو رادەی ووتراوە هەژارترین کەسی سەردەمی خـۆی لـە ئـەو زیـاتر خـەرجی کـردووە، بێ‌ئـەوەی گەنجینەی کردبێ یا دونیا خۆریو دونیاویستی ئەنجام دابێ، هیچ کات لەخۆشیو ناخۆشـیدا کـردەوەی نەشـیاو ناشـرینی لـێ نەبیـسراوە، بێدەنگو شکۆداربووە، (إبن أثیـر) فەرمویەتی: پاش عومەری کوری عبـدالعزیز کەسـێکی تـری وەك نـورەدین پادشـا نـەبووە، چـەند دووکانێکی بووە لە (حمص) لەو بەشە دەستکەوتە کرِیبوی کە تایبەت بوو بە خۆیەوە، لەو بـژێوی ژیـانی دابـین دەکـرد، خێزانەکـەی داوای خەرجیو پێداویستی زیاتری دەکرد، داوای فەتوای کرد لە زانایان بـۆ

ئەو ئەندازەی دروست بۆی لە خانــەی ســامان وەری گــریَ، ئەوەنــدەی وەردەگرت کە بۆی دانرابوو زیادی نەدەکرد، ئەگەر لە برسیشا بمردایــە، زۆر یاری تۆپێنی دەکرد، یەکێك لە گەورە پیاوچــاکانی لــەو بارەیــەوە سەرزەنشتی کرد، فەرموی: کردارەکان بە پێــی نیــازو نیەتــە، بەمــە دەمــەویَ خــۆڕاهێنم لەســـەر هاتوچــۆ، هەڵپــەو گەڕانــەوەی ئەســپو فێربوونی، ئێمە واز لە جیهاد ناهێنین، جلی ئاوریشمی لەبەر نەدەکرد، نانی بەری دەستی خۆی دەخوارد کە لــە بــەرەنجامی جیهــاد کردنیــدا بەدەستی دەهێنا.

زانــاو شــارەزای ڕێبــازی حەنــەفی بــووە، فــەرموودەی بیــستووەو گەیاندویەتی، شەونوێژی زۆر بووە لە کاتی سەحەر تا ئەوکاتەی لە ماڵ دەردەچوو.

(إبن أثیر) باسی ئەوە دەکــا ڕۆژێــك پاشــا نــورەدین لــەو کاتــەی خەریکی تۆپێن بوو، دەبینیَ پیاوێــك قــسە لەگــەڵ ئــەوی تــر دەکــاو لەوکاتەدا ئاماژە بە نورەدین دەکا، ئەویش دەرگاوان دەنێــریَ تــا لێــی بپرسیَ مەسەلەکەی چیەو چــی دەویَ! ئــەبینن پیاوێکــەو نێراوێکــی حاکم (قازی) لەگەڵدایــە وا دەردەبــڕیَ کــە مــافێکی هەیــە لەســـەر نورەدینو دەیەویَ لای قازی دادەوری بکا، کاتێك دەرگاوان دەگەڕێتەوە لای نورەدینو ئەوەی پیَ دەڵــیَ، نورەدین جۆکانەی[1] دەستی فریَ دەدا،

(١) الجوکــان: ئەو شتەیە کە پێی دەدریَ لە تۆپ.

لەگەڵ نەیارەکەیدا بە پێ بەرەو لای قازی شـــارەزووری دەکەوێتــە ڕێ، نورەدینیش کەسێك دەنێرێ بۆ لای قازی کە دەبێ هەڵسوکەوتی نەیارو ناحەزی لەگەڵدا بکا، کـاتێکیش گەیـشتن نـورەدین لەگـەڵ نـەیارو ناحەزەکەی لەبەردەم قازی وەستا، تاوەکو نەیارو ناحەزەکـەی کۆتـایی پێ هاتو دادەوریـیکەی ئەنجام درا، پیاوەکە هیچ مافێکی بۆ نەسەلماند لەسەر نورەدین، بەڵکو مافی سوڵتان بەسەر پیاوەکەوە هەبوو، کاتێك ئەمە بەدەرکەوت سوڵتان وتی: بۆیــە لەگـەڵی هـاتم تـاوەکو کـەس دوانەکەوێ لە ئامادەبون بۆ دادگای شەرعی کاتێك کە بانگ دەکرێ، ئێمـــەی فـــەرمانڕەوا ســـەرو خوارمـــان خزمـــەت گـــوزارو پاســـەوان (شجنکیە)[1]ی پێغەمبەری خواو شەرعی ئەوین، ئێمە لە خزمەت و بەردەستی ئەو داین وگوێرایەڵی ڕێو ڕەسمەکانی ئەوین، فەرمانمان پـێ بکا بە هەر شتێ ئەنجامی دەدەین، نەهیش لە هەر هەر شتێ بکا خۆی لــێ دەپارێزین، من دەزانم ئەو پیاوە هــیچ مــافێکی لام نیــە، لەگـەڵ ئەوەشدا ئێوە شاهێد بن من ئەو شتەم کردە موڵکی و بەخشیم بە ئەو کە وای دەزانی هی خۆیەتی.

(إبن الاثیــر) فەرمویەتی: ئەو یەکەم کەس بوو خـانووی بــۆ داد بنیات نا لە هەفتەی دوو ڕۆژ تیایدا دادەنیشت، ووتراوە: چوار جار، وە باسی پێنجەم جاریش دەکرێ. قازیو فەقیهەکانی هــەموو ڕێبازەکــان

(١) الشجنکیە: خزمەتگوزار یاخود پاسەوان

ئامادە دەبوون، هیچ دەرگاوانو کەسێکی تر ڕێگری لێ نەدەکرد، بەڵکو بەهێزو لاواز پێی دەگەیشت، لەگەڵ خەڵکی گفتوگۆی دەکردو تێی دەگەیاندنو هەر خۆی قسەو باسی لەگەڵ دەکرد، مافەکانی هەڵدەماڵی، مافی ستەم لێکراوی لە ستەمکار دەسەندەوە، هۆکاری ئەوەش بریتی بوو لەوەی کە ئەسەدەدین شادی پلەو پایەی لای نورەدین بەرز ببویوە، تاوای لێ هات وەك ئەوەی هاوبەشی ئەو بێت لە پادشانشینیەکەیدا، زەویو زارو سامان وکشتوکاڵ و لادێی دەست خست، لەوانەیە نوێنەرەکانیشی ستەمی لە زەویو زارو موڵكو سامانی دراوسێکانیان کردبێ، کەمالەدینی قازی دادگەرانە لەگەڵ تەواوی ئەو میرانەدا ڕەفتاری دەکرد، کە ئامادەی دادگا دەکران و سکالآیان لێ دەکرا جگە لە ئەسەدەدین نەبێ دڵی ڕادەگرتو هێرشی نەدەکردە سەری، جا کاتێك نوردین خانەی داد (دار العدل)ی بنیات نا ئەسەدەدین چووە لای نوێنەرەکانیو داوای لێکردن هەرکەسێ مافی لایەتی بیدەنەوەو نەهێڵی بێنێ، هەرچەندە گەورە بێت، چونکە هەموو سامانەکەی نەمێنێ ئەوەی لا خۆشترە لەوەی نورەدین وەك ستەمکارێك ببینێ، یاخود لەگەڵ کەسێکی ناحەزو سادەی نێو کۆمەڵگەدا ڕای وەستێنێ، ئەوانیش بەوە هەستان، کاتێك نورەدین ماوەیەکی دوورو درێژ لە خانەی داد دادەنیشت، هیچ کەسی نەبینی سکالآ لەسەر ئەسەدەدین بکا، لەم ڕووەوە پرسیاری لە قازی کرد، ئەویش وێنەی هەڵسوکەوت ڕێو شوێنەی نوێیەکانی ئەوی پێ

ڕاگەیاند، یەکسەر نورەدین کڕنوشـی سوپاسـگوزاری بـۆ خـوا بـردو فەرمووی: سوپاس بۆ خوا، هاوڕێو هاوەڵـەکانمان خۆیـان مافـەکانی سەرشانیان ئەنجام دەدەن.

سـەبارەت بـە ئازایـەتیو جوامێرییەکـەی دەوتـرێ؟ کەسـی لـەو جوامێرو نەبەردتر لەسەر پشتی ئەسپ نەبینراوە. ئازاو زۆر خۆڕاگربووە لە جەنگ دا، لـەو ڕووەوە نمونـەی پـێ دەهێنرایـەوە، وە دەیفـەرموو: چەندین جار توشی پلەی شەهادەت هاتووم بەڵام بۆم ڕێ نەکەوتووەو بە قسمەت نەبووە، ئەگەر چاکەو خێرم تێدابوایەو بەهاو نرخێکم لای خوا هەبوایە پێمی دەدا، کردارەکانیش بە پێی نیازو مەبەستە.

ڕۆژێك (قطب الدین النیسابوری) پێی ووت: بۆ خاتری خـوا ئـەی سولتانمان، خۆت مەخـە مەترسـیەوە، چـونکە ئەگـەر تـۆ بکـوژرێی هەموویان لەگـەڵت دەکـوژرێن، ووڵاتـیش داگیردەکـرێ و بـارودۆخی موسڵمانان خراپو تێکدەچێ . ئەویش پێی ووت: بـێدەنگ بـە ئـەی (قطب الدین)، ئەم قسەیە بێئەدەبیـە بەرامبـەر بـە خـوا، مـەحمود کێیە؟ کێ پێش من پارێزەری ئایین ووڵاتان بووە جگە لەو خوایەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لـە ئـەو؟ مـەحمود کێیـە؟ فـەرموی: هـەموو ئەوانەی ئامادەی بون گریان - بەریەزەیی خواکەوێ -

خانوو بورجی زۆری لەسەر ڕێگاکان بنیات نا، ئێشگکرو پاسەوانی لە شوێنە مەترسی دارەکاندا ڕێکخست، کۆتری نامەبەری تیادا دانـا کە بە خێراترین ماوە هەواڵ بگەیەنێ، خەڵوەتگەو خانەقای بنیات نا،

زانایـــانو شـــێخو ســـۆفیەکان لـــە لای کۆدەبونـــەوە، ڕێـــزی دەگرتـــنو بەگەورەی دادەنان، پیاوچاکانی خۆش دەویـــست، جارێـــك هەنـــدێ لـــە میرەکان تانەوتەشەریان لە هەندێ لە فەقیهەکان دا کە بریتی بوو لە (قطب الدين النيسابوری)، نورەدین پێی ووت: تیاچی! ئەگەر ئـــەوەی تۆ دەیلێی ڕاستو ڕەوا بێت ئەوا ئەو ئەوەنـــدە چـــاکەکاری هەیـــە کـــە خراپەکانی پێ بسڕێتەوە کە تۆ نیتە کە دەبێتە هۆی ســـڕینەوەی ئـــەو هەڵەو خراپەکارییانەی ئەو، کـــە باســـت کـــرد ئەگـــەر ڕاســـتگۆ بیـــت تیایدا، بەڵام بە خوا من بەڕاستت دانانێمو باوەڕت پێ ناکـــەم ئەگـــەر جارێکی تر باسی بکەیت یان باسی کەسێکی ترم بە خراپە لابکـــەیت ئازارت دەدەم، ئەویش وازی لێی هێناو هیچ کاتی تر باسی نەکرد.

لە دیمەشق دا خانەیەکی بنیات نا بۆ بیستن وگەیاندنی فـــەرمودە. (إبن الأثير) ووتویەتی: ئەو یەکـــەم کەســـە خانـــەی فـــەرمودەی دانـــا، کەسێکی سامدارو بە ویقارو شکۆدار بووە لە دڵی میـــرەکاندا، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر کاتێ یەکێك لە زانایان یان هەژاران بهاتنایەتـــە لای بۆی هەڵدەساو چەند هەنگاوێك دەچـــووە پیـــرییەوەو لەســـەر ڕاخـــەرو قاڵیەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێزو شکۆوە دایدەنیشاند، ئەگـــەر شـــتێکی زۆری بدایە بە یەکێك لەوانە دەیوت: ئەمانـــە ســـەربازی خـــوان و بـــە پاڕانەوەی ئەوان بەسەر دوژمناندا سەردەکەوین، لە خانـــەی ســـاماندا چەندین قاتی ئەوەی پێیان دەدەم مافیان هەیە، ئەگـــەر بـــە بەشـــێکی مافەکانیان لێمان ڕازی بن ئەوە منەتیان هەیە بەسەرمانەوە.

بەشێك لە فەرمودەیەکی بیست کە تیایدا هاتبو: ((فخرج رسـول الله صلی الله علیه وسلم متقلدا بالسیف)) واتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو شمشێرەکەی کردبووە ملی، ئەویش سەری سوڕما لەو گۆڕانەی بەسەر باو نەریتی خەڵکیدا هاتووە لە بەرامبەر ئەم ڕەفتارەی کە لـە پێغەمبەری خواوە سەلماوە، چۆن سەربازو میرەکان شیرەکانیان دەبەستنە ناوقەدیان وە بەو شێوەیە ناکەن کە پێغەمبەر خـوا ﷺ کردویـەتی ، پاشان فەرمانیدا بە سەربازەکانی شیرەکانیان هەڵواسن بە ملدا ،پاشان خۆیشی بۆ ڕۆژی دواتر بە کۆمەڵەوە دەرچوو، بە خـۆیو سـوپاکەیەوە شیرەکانیان بەملدا هەڵواسی بوو، بەمەشی دەیویست پێغەمبەری خوا ﷺ بکاتـە سەرمەشقی خۆی، - بەربەزەیی خوا کەویێ-.

(موفق الدین خالـد بـن محمـد بـن نـصر القیـسرانی) شـاعیری، بەسەرهاتی خەوێکی بۆ گێرایـەوە کـە لـە خەویـدا بینیوەیـەتی وەك ئەوەی جلەکانی پادشا نورەدین دەشوات، بەمەش نورەدین فەرمانیـدا چەند بڵاوکراوەیەك بنوسرێ سەبارەت بە لابردنی گومرگو باجەکان لە وڵاتدا، وە پێی ووت: ئەمـە لێکدانـەوەی خەوەکەتـە. وە نوسـی بـۆ خەڵکی تاوەکو گەردنی ئازادکەن لـەو شـتانەی لێـی وەرگرتـوون، وە پێیان بوتری هەموو ئەو شتانە خەرج کراوە لـە پێنـاوی جـەنگکردن لەگەڵ دوژمنانتاندا لەوانەی بێ باوەڕو کافرن، وە بۆ بەرگریکردن لـە وڵات و ئافرەت و منداڵەکانتان، ئەم نوسراوە بۆ تەواوی پادشانیـشنی وڵاتانی ژێر دەسەلاتی، وە فەرمانیدا ئامۆژگاریکـاران داوای گـەردن

ئازایی بۆ بکەن لە بازرگانەکان، دەووترێ هۆکاری لابردنی گـومرك و باج ، وە لەسەر وولاّت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە (أبو عثمان المنتخب بن أبي محمد الواسطي) ئامۆژگاریکار، کـە یـەکێك بـووە لـە گـەورە پیاوچاکان، کە نـەداربووەو هیـچی لەکەسـیش وەرنـەگرتووە، تـەنها جوببەیەکی هەبووە لەکاتی چون بۆ کۆڕێ ئامۆژگاریکردن دا لەبەری دەکرد ، لە کۆڕی ئامۆژگاری کردنەکەیدا هەزارەهای خـەڵکی ئامـادە دەبوو- چەند کۆپلەو بەیتێکی بۆ نورەدین ووت کە بارودۆخ و چۆنێتی کـار بەرێوەبـەری ئـەوی لـەخۆ گرتبـوو، ئـەو کۆپلانـە ترسـاندن و ئاگادارکردنەوەیەکی زۆری ئەوی تێدابوو:

مثل وقوفــــــك أيها المغرورُ
يوم القيامة والســـــماء تمورُ
إن قيل نورالديـن رحت مسـلماً
فأحذر بأن نبقي و مالـــك نورُ
أنهيت من شرب الخمور وأنت في
كأس المظـــــالم طائس مخمورُ
عطلت كاسات المـــدام تغفـاً
وعليك كاسات الحـــرام تدورُ
مـاذا تقول إذا نقلت إلى البلـــى
فرداً وجاءك مـنكــر ونكيـــرُ؟
مـاذا تقول إذا وقفـــت بموقف

فرداً ذليلاً والحساب عســـيـرُ؟
وتعلقت فيك الخصوم وأنـت في
يوم الحساب مسلسل مجـــرورُ
وتفرقت عنك الجنود وأنـت في
ضيق القبور متوســـد مقبورُ
وودت أنك ما وليت ولايــــةً
يوماً ولا قال الأنــــامُ أميـرُ
وبقيت بعد العز رهن حفيـــرةٍ
في عالم الموتى وأنت خقيــــرُ
وحشرت عرياناً حزيناً باكيـــاً
قلقاً و مال في الأنام مجيـــــرُ
أرضيت أن تحيا وقلبـــك دارسٌ
عافي الخراب و جســمك المعـمورُ
أرضيت أن يحظـى ســواك بقربه
أبداً وأنت معـذب مهجـــــورُ
مهد لنفسك حجةً تنجـو بهـــا
يوم المعاد ويوم تبـد والعـــورُ

واتاکەی بە کورتی: وێنەی وەستانی خۆت لە ڕۆژی دواییدا بهێنـە پێش چاوت کاتێـك ئاسمانـەکان تێـك و پێـك دەچـن، ئەگـەر بـوترێ نورەدین بە موسڵمانی ڕۆشت، بەڵام ئاگاداری خۆت بـە نـەوەك بـەبێ

نوری‌و ڕوناکی دۆش دابمێنیّ، ڕێگریت کردووە لە خواردنـەوەی مــەی‌و سەرخۆشـــەکەرەکان، بــەلاّم لــە کاســـی ســتەمکاریدا لـــیّ‌شێواو و سەرخۆشی، بۆ خۆ پارێزی کاس‌و پەرداخی مەیت لەکار خستووە، بەلاّم کاسی پەرداخی حەرام بەدەورتدا دەخولێتەوە، چی دەڵــێی ئەگــەر بــە تاقی تەنها بەرەو بەلاّو ناخۆشیەکان ببـــرێت‌و مونکـەرو نەکیـــریش بێنە لات؟ چی دەڵێی ئەگەر لە وێستگەیەکدا بە تەنهایی‌و سەرشۆڕی بوەستێنریت‌و لــیّ پرسینەوەت قورس وگران بێت؟ نە حەزو نەیارەکانت بــە دەورت دابــن‌و تــۆش لــە ڕۆژی لێپرسـینەوەدا زنجـیر بەنــد بیــت‌و ڕابکــشرییێت، سەربازەکانیــشت پەرتــەوازبکرێن‌و لــە تــەنگی گــۆڕدا ڕابکشێنرێنیت‌و بان بدرێیت، ئاواتەخوازی ئەوە بیت هیچ کات‌و هــیچ ڕۆژێك کاربەدەست نەبویتایەو خەڵکی پێتــی نەوتایــە ئــەمیر، پــاش سەرفرازی لــە گــۆڕدا بــە شــێوازێکی ســووك‌و نەشــیاو نەبویتایەتــە بارمتەی گۆڕو چاڵێك، بە ڕوتی‌و دڵتەنگی‌و گریان‌و ڕاڕاییەوە حەشــر نەکرایتایە، کە هیچ کەسێکیش پەنادەرت نابێت، ئایا ڕازیت بژییت‌و دڵت کوژاوە وێران بێت‌و لاشــەت ئــاوەدان، ئایــا ڕازیــت خــەڵکی تــر بەردەوام و هــەتاهەتایە لە نزیکی ئەودا بژین‌و تۆش ســـزا بــدرێیت‌و وەلا بخرێیت، دەی کەواتە خۆت ئامادەکــەو بەڵگەیــەك ببینــەوە پێــی ڕزگار بیت لە ڕۆژی گەڕانەوەدا، ئــەو ڕۆژەی تــەنگی‌و ناتەواوییــەکان بەدەر دەکەویّ.

کاتێك نورەدین ئەم چەند بەیتەی بیست گریانێکی بە کــوڵ گریــا،

فەرمانیدا گومرگو باجەکان لە تەواوی وولات هەڵگیرێو لابرێ.

شێخ عومەر مەلای موصل - کەسێك بوو نورەدین فەرمانی بە کاربەدەستو میرەکانی کردبوو هیچ کاروبارێك یەکلانەکەنەوە تامەلای لێ ئاگادار نەکەنەوە، هەر فەرمانێکی پێ کردبێتن جێبەجێیانی کردووە، ئەو یەکێك بووە لە پیاو چاکە دونیا نەویستەکان، نورەدین لە هەموو رەمەزانێکدا ئەوەندە شتەی لێ قەرز دەکرد تا ڕۆژوی پێ بشکێنێ ئەویش هەندێ ووردەشتو نانی تیری بۆ دەنارد تا تەواوی رەمەزاندا ڕۆژوی پێ بشکێنێ- ئەم عومەر کوڕی مەلایە لە بۆ نورەدینی نوسیبوو: خراپەکاران زۆربون وکاروبارەکە پێویستی بە ڕێو شوێنو سیاسەت هەیە، ئەم جۆرەبارانە کوشتنو لە خاچدان ولێدان دەخوازێ، کاتێك مرۆڤێك لە دەشتێکدا ببرێت کێ دێت شاهێدی بۆ بدا؟

لەسەر پشتی نوسراوەکە پادشا نورەدین بۆی نوسیەوە: خوای گەورە دورستکراوەکانی دروست کردو شەریعەتی بۆ داناون، ئەو زاناترە بەوەی لە بەرژەوەندیاندایە، ئەگەر زانیبای لە شەریعەت زیاد لەوەی هەیە بەرژەوەندی تریش هەیە بۆی دادەناین، پێویستمان بە زیاتر کردن نیە لەوەدا، خوای گەورە شەرعی کردووە بۆمان، هەرکەسەش زیادی کرد گومانی وای بردووە کە شەریعەت کەموکورتەو ئەم بەم زیادکردنەی تەواوی دەکا ئەمەش جورئەت کردنە لەسەر خواو شەرعەکەی عەقڵە تاریکەکان ڕێنمونی ناکەن، خوای گەورە ئێمەو ئێوە ڕێنمونی دەکا بۆ ڕێگەی ڕاست، کاتێك نوسراوەکە گەیشتە شێخ عومەرمەلا خەڵکی لە

موصڵ دا کۆکردەوەو نوســراوکەی بەســەردا خوێندنــەوە، وە دەیــوت: بڕواننە نوسراوی دونیا نەوویست بۆ پادشاو نوسراوی پادشا بــۆ دونیــا نەویست!!

هەروەها (إبــن کــثیر) فەرمویــەتی (ســوڵتان و پادشــای دادگــەر نورەدین، کە وڵات شام و چەندین وڵاتــی گــەورەو فــراوان تــری بــە دەستەوە بووە، تێکۆشەرێك بو دژ بە فرنجیەکان، فەرمانی بــە چــاکەو بەرهەڵستی لە خراپە کردووە، زاناو هەژارو پیاوچاکانی خۆشویستووە، رقی لە ستەم بووەو بیروڕای ڕاستو دروست بووە، کارو کرداری چاکەی هەڵبژاردووە، کەس نەی وێراوە لە ســەردەمی ئــەودا ســتەم و زۆرداری ئەنجامدا سەرکوتی خراپەو خراپەکارانی کــردووە، زانــســتو شــەرعی بەرز ڕاگرتووە، خوی گرتبــوو بــە هەڵــسانی شــەو و شــەونوێژوەو زۆر بەڕۆژوو دەبوو، خۆی دەگرتەوە لە حــەزو ئارەزووەکــان، حــەزی دەکــرد ئاسانکاری بۆ موســڵمانان بێتــە دی، گــەنمو دانەوێڵــەی دەنــارد بــۆ زانایانو هەژارانو کەم دەرامەتانو هەتیوانو بێوەژنان، دونیا لای ئەو نرخو بەهایەکی وای نەبوو، خاکی گۆڕەکەی بە بــەزەییو ڕەزامەنــدی خوا تەڕو پاراو بێت.

(إبن الجوزي) وتویەتی: نورەدین محمود زەنکی - بەر ڕەحمەتی خــوا کەوێ - پەنجاو ئەوەندە شاری لە دەستی کافرەکان سەندەوە، ئەو نامەو نوسراوی بۆ دەناردمو منیش بــۆیم دەنوســیەوە، وتویــەتی: کــاتێکیش

هاتە سەرەمەرگ کار سپاردنی بە کورەکەی بۆ پاش خۆی - واتــە بــە سالّح ئیسماعیل- بەسەر میرەکاندا خوێندەوە، پەیمانی ئەوەشی لەگەلّ کاربەدەستی (طرابلس)دا نوێ کردەوە کە هەلّنەکوتێتە سەر شام لــەو ماوەیەی دیاریکراوە بۆی، عەزمی هەبوو لەسەر ئەوەی (بیت المقدس) خوا رێزداری کا، رزگار بکا، بەلاّم لــە شــەوالی ئــەو ســالّەدا نۆشــی مردنی کرد، کاروکردەوەکانیش بە پێــی نیــازو نیەتەکانــە، پاداشــتی نیازەکەی هاتەدی، ماوەی کار بەدەستیەکەی بیــستو هەشــت ســالّو چەند مانگێک بوو).[1]

پاش مردنی کاروبارەکان شێوان، سەلاّحەدین لــە میــسرەوە ســالّی (٥٧٠)ك گەڕایەوە شــام، فەرمانڕەوایەتی کردو کاروبارەکــانی رێــكو ساز کرد، دەستی کرد بە تەواوکردنی ئــەوە رزگارکارییانــەی نــورەدین زەنکی ڕووبەڕووی خاچیەکان پێی هەستابوو، دەولّەتەکەی لە میــسرو شامەوە تا ئەوپەری یەمەن لەگەلّ نیوە دوورگەو مەککــەو مەدینــەو دەوروبەری گرتەوە.

سالّی (٥٧٥)ك خەلیفەی (المستضيء)ی عەبباســی لــە بەغــدادا کۆچی دوایی کرد، ماوەی جێنشینیەکەی بیست سالّێك دەبوو، یەکێك بوو لە باشترین خەلیفەکان، فەرمانی بــە چــاکەو نــەهی لــە خراپــە دەکرد، گومرکو باجی لەسەر خەلّکی هــەلّگرت، دلّنــەواو شــکۆدارو

(١) البداية والنهاية (١٢/٢٠٦-٢٠٧).

بەخشندە بووە، پاش خۆی بەیعەت درا بە (ناصر)ی کوڕی.[1]

خەلیفـەی (ناصـر) تـا سـالّی (٦٢٣)ك بـەردەوام بـوو لــە خەلیفەیەتی یەکەی، درێژترین مـاوەی خەلیفایـەتی بـوو، کەسـێکی دلێرو بە سامان بووە[2].

سەلاحەدینی کردە سولّتانو چەندین دیاری پێ بەخشی بەمەش ئەو بووە خەلیفەو سەلاحەدین بە سولّتان.

سـالّی (٥٧٧)ك سـەلاحەدین وەك تێکۆشـەرو موجاهیـدێك لــە میسرەوە بەرەو شام چوو، نەگەڕایەوە بۆی تا کۆچی دوایی کرد، براکەی کردە جێگیر لەوێ.

سالّی (٥٨٣)ك هاتە دیمەشق، سەردانی قازی (الفاضـل)ی کـردو راوێژی پێی کرد، بێ ئەو هیچ کارێکی نەدەبریەوە.[3]

سالّی ٥٨٣ ك ڕووداوی (حطین)ی بەناوبانگ ڕویدا کە سەلاحەدین خاچیەکانی تێدا شکاند[4] و شکستی پێ هێنـان، پاشـان هـەر لـەو سالّەدا قودس رزگار کرا.

لە سالّی (٥٨٩)ك سولّتان سەلاحەدین ئەیوبی کۆچی دوایی کـرد پاش ئەوەی ژیانی لە جیهـادی خاچـیەکانو رزگـارکردنی زەویو زاری

---

(٢) البداية والنهاية (١٢/٣٢٥).

(١) البداية والنهاية (١٢/٣٢٦).

(٢) البداية والنهاية (١٢/٣٤٠).

(٣) البداية والنهاية (١٢/٣٤١).

موسوڵمانان‌دا بەسەربرد، لە خەزینەکەیدا هیچ دینارو درهەمێکی بەجێ نەهێشت، بەڵکو هەر هەمووی خەرج کرد لە پێناوی جیهادو پاراستنی ڕووسووری موسوڵماناندا، یەکێك بوو لە زانا سوڵحاوەکان، ڕێوڕەسم و بەرنامەکانی ئایینی زۆر بەگەورە دەگرت‌و بەردەوام بەرژەوەندی موسوڵمانانی ڕادەپەراند.[1]

هەرێمەکانی دەوڵەتی دابەش کردبوو بەسەر کوڕەکانیدا، هەر یەکەیان فەرمانڕەوایی وولاَتێکی دەکرد؟! پاش خۆی کاروباری فەرمان ڕەوایەتی مەلیك عادلی کوڕی یەکلابویەوە.

ساڵی (٥٩٤)ك سوڵتان عیمادەدین زەنکی کوری مەودود کوڕی زەنکی میری سنجار کۆچی دوایی کرد کە یەکێك بووە لە باشترین پادشاکان، باشترین ژیاننامەی هەبوو، جوانترین هەڵسوکەوتی هەبووە، زانست‌و زانایانی خۆش ویستووە.[2]

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان یەعقوب کوڕی یوسف کوڕی عبدالمؤمین موورینی سوڵتانی مەغریب‌و ئەندەلوس کۆچی دوایی کرد، دیندارو ڕەفتارو ڕەوشت جوان، مالکی مەزهەب بووە، پاشان بووە بە زاهری، پانزە ساڵ پادشاو فەرمان ڕەوا بوو، جیهادی زۆر بووە، لە نویژەکانیدا پێش نوێژی دەکرد، دڵنەوا بووە بەرامبەر ئافرەت‌و لانەوازان.[3]

(١) البداية والنهاية (٦/١٣).

(٢) البداية والنهاية (١٨/١٣).

(٣) البداية والنهاية (٢٢/١٣).

هەروەها میری موجاهیدەدین قیماز کۆچی دوایی کرد، کــە مــیری موسڵ بووە، کەسێکی ژیرو شارەزا بووە، یەکێك بووە لــە چــاکەخوازو چاکەکارەکانی دونیا.(١)

ساڵی (٥٩٦)ك سوڵتانی خوارزم سوڵتانی عەلائەدین خوارزمــشاە ئەکش کوڕی ئەلب ئەرسەلان کۆچی دوایی کرد، کەســێکی دادگــەرو ڕەفتار جوانو شارەزا بووە.(٢)

هەر لەو ساڵەدا قازی فــازل عبــدورەحیم کــوڕی قــازی ئەشــرەف، وەزیری سەلاحەدین ئەیوبیو تایبەتــتــرین هاورێی کۆچی دوایی کرد، لە سەردەمی جیهادکردنیدا میسری بۆ بەڕێوەبردووە، کەسێکی زانــاو دادگەرو پیاو چاكو ڕەفتارو ڕەوشت جوان بووە، دڵپاكو خۆش مەشرەب بووە.(٣)

ساڵی (٥٩٩)ك پادشا (غیاث الدین الغوري) کۆچی دوایی کــرد، کەسێکی ژیرو دلێرو فەقیهێکی شافعی دادگەرو ڕەفتارو ڕەوشت جوان بووە.(٤)

لە ساڵی (٦٠٠)ك کۆڕێك گرێ درا لە بەغدا بۆ (قاضي القضاة) عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سولەیمانی جیلی، سەلما بەسەریدا کــە

(١) البداية والنهاية (١٣/٢٤).

(٢) البداية والنهاية (١٣/٢٥).

(٣) البداية والنهاية (١٣/٢٨).

(٤) البداية والنهاية (١٣/٣٨).

بەرتیلی وەرگرتووە، هەر بۆیە لابراو بڕیاری فاسقیەتی درا، مێزەرەکەی لەسەر فڕێ درا، ماوەی ئەو کاربەدەستیەی دوو ساڵ بوو.[1]

لە ساڵی (٦٠١)ك میری خوزستان (مجیر الدین المستنجدی) کۆچی دوایی کرد، شێخێکی شیعەی ڕەفتار جوان بووە، پەرستشی زۆر بـووە، بیستو شەش ساڵ میری حەج بووە.[2]

لە ساڵی (٦١٥)ك مەلیك عادل سەیفەدین کـوڕی ئـەیوب بـرای سەلاحەددینو سوڵتانی پاش ئەو لە دەوڵەتی ئەیوبیدا کۆچی دوایـی کرد، کە دەوڵەتەکەی تا ئەمپەرو ئەوپـەڕی مـیـسرو یەمـەنو شـامو جـەزیرەو هەمـــەدانی گرتبویـەوە، کەسـێکی دادگـەری بـە بـەزەییو لێبوردەو ئارامگر بووە، دینـدارو ژیـرو شـکۆدار بـووە، حەرامـەکانی پوچەڵ کردوەو لە هەموو شانشییەکەیدا پـاش سـەلاحەدین جیهـادی فرنجیەکانی کرد، زۆر بە باشـی ئـەمکارەی ئـەنجام دا، ناوبـانگی بـە چاکەخوازیو پەرستشو ڕۆژووگرتن دەرکردبوو، کەسێکی دڵنەرمو بـە بـەزەیی بـووە لەگـەڵ هـەژارو نـەدارو لانەوازانـدا، مـاوەی فـەرمان ڕەوایەتیەکی (٢٦) ساڵ بووە.[3]

لە ساڵی (٦١٧)ك تەتار ڕۆژهەلاتی ئیسلامیان داگیرکرد لە ماوەی ساڵێکدا دەستیان بەسەریدا گرت تاوەکو گەیشتنە عـیراق، سـوتانو

---

(١) البداية والنهاية (١٣/٤١).

(١) البداية والنهاية (١٣/٤٩).

(٢) البداية والنهاية (١٣/٦٧-٦٨).

کاولکاری زۆریان لە تەواوی ئەو وڵاتانەدا بەرپا دەکـرد کـە دەچـونە ناویـەوە بـە هـۆی سـەرقاڵی موسـوڵمانان بـە حـەزو ئـارەزوو چـێژ خوازیەکانیانەوە، کە ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە نەتوانن پارێزگاری لە دەوڵەتو گەلەکانیان بکەن؟![1]

لـە سـاڵی (٦٢٢)ك خەلیفـەی (الناصـرالدین الله أحمـد بـن المستـضیء)ی عەبباسـی لـە بەغـدا کۆچـی دوایـی کـرد، ڕەفتـارو هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی ناشرینو نەشیاو بووە، سـتەمکار بـووە لەگەڵیان، عێراق لە سەردەمی ئەودا کاولو وێرانە بووە خەڵکەکـەی پەرتەوازەی وڵاتان بوو سـامانو زەویو زاریـان داگیرکـرا، تـەتارەکان تەماحیان کردە عێراق؟!.[2]

لە پاش خۆی خەلیفە (زاهیر موحەمەد کوری ئەحمـەد) کاروبـاری گرتەدەست، کەسێکی ژیرو شکۆدارو دیندار دادگەرو چاکەخواز بووە، زۆر مافی خـەڵکی گەڕانـەوە، چـەندین گـومرکی لابـرد کـە بـاوکی دایهێنابوو، لە نێو خەڵکیدا بە جوانی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دەکرد، تەنانەت وتراوە: پاش عومەری کوڕی عبـدوالعزیز کەسـی تـر لـەو دادگەرتر نەدەبوو ئەگەر ماوەکـەی درێـژتر بوایـە. یـەکێك لـە خـوو نەریتـەکانی بـاوکی ئـەوە بـووە کـە جاسوسـەکانی هـەواڵی کـۆڕو کۆبونەوەکانی شاری بەغدایان هەموو ڕۆژێك بـۆ بـەرز دەکـردەوە بـە

---

(١) البداية والنهاية (١٣/٩٤-٩٦).

(٢) البداية والنهاية (١٣/١١٥).

باش‌و خراپیــوه، خەلیفــە (زاهــر) ئەمـــەی پـــوچ کــردەوه، پێـی وتــرا هەڵوەشاندنەوەی جاسوسی کردن باری خەڵك تێك دەدات، فەرموی: لە خـوا دەپارێینــەوه چاکــسازیان کــات، چ ســوودو قــازانجی هەیــە لــە هەڵماڵینی کاری خەڵکی‌و دڕینی پەردەی نهێنیەکان، هەموو ئەوانەی لەبەر قەرزاری دیوان بەندکراون بەری دان، هەموو ئەو شتانەی لێیان سەندرا گێڕایەوه بۆیان، هەندێ سامانی نارد بۆ قازی بـۆ ئـەوەی لـە بریتی ئەو بەندکراوانەدا بیدات کە ناتوانن مافەکانی خەڵکی بدەنەوه، نرخی شتەکان لە سەردەمیدا دابەزی، لە بازاردا دادگـەری بـەرپاکراو بارودۆخەکان چاك‌و باش بون.[1]

لە ساڵی (٦٢٣)ك خەلیفەی عەبباس (زاهر) کۆچی دوایی کرد، ئەهلی حەل وعەقد بەیعـەتی تایبـەتیان بـە (المستنـصر المنـصور)ی کـوڕی دا پاشـانیش بەیعـەتی گـشتی، هـەر ئـەویش بـوو زانکـۆی (المستنصریه) بنیات نا، کەسێکی خاکی و خۆشەویست بووه.[2]

لەم ساڵەدا (إبراهیم المعتمد) کاربەدەستی دیمەشق کۆچی دوایی کرد، کە چل ساڵ ئەم کارەی بـۆ ئەیوبیـەکان ڕاپەڕانـد، یـەکێك بـوو لـە کاربەدەستە زۆرباش‌و پاکژەکان‌و جوانترین ڕەفتارو ژیننامەی هەبووه.[3]

لە ساڵی (٦٢٤)ك پادشای گەوره (عیسای کوڕی عادلی ئەیوبی)

---

(١) البداية والنهاية (١٣/١١٥-١١٦).

(٢) البداية والنهاية (١٣/١١٢-١١٣).

(٣) البداية والنهاية (١٣/١٢٤).

مەلیکی شام کۆچی دوایی کـرد، کەسـێکی زانـاو بـەڕێزو جـوامێرو تێکۆشەر بووە [1].

پاش مردنی شیرازەی ئەییوبییەکان تێکـچوو، لەوکاتـەوەی عـادلی باوکیان کۆچی دوایی کرد لەسەر فەرمانڕەوایەتی لە نێـوان خۆیانـدا ناکۆکیان تێکەوت، بون بە بەش بەش‌و کۆمەڵ کۆمـەڵ، ڕێککـەوتن لەگەڵ فرنجیەکاندا لەسەر ئەوەی قـودس بگێڕنـەوە بەرامبـەر ئـەوەی بەشەکەی تری وڵات بەدەستیانەوە بـمێنـێ [2]؟؟!

لە سـاڵی (٦٣٥)ك مـەلیکی ئەشـــرەف موسـا کـوری عـادلی ئەیوبی کۆچی دوایی کرد، کە کار بەدەستی جزیرەو فورات‌و حـەڕان‌و دەوروبەری بوو، پاشان لـە سـاڵی (٦٢٦) ك شامیـشی گرتەدەسـت، یەکێك بوو لـە خاوێنتـــرین کـەس‌و جوانترین ژیاننامـەی هـەبووە، کەسێکی جوامێرو بەخشندە بووەو ڕێزی زانـست‌و زانایـانی لا بـووە، وڵات لە سەردەمی ئەودا لەوپەری ئاسایش‌و دادگەری دابووە. [3]

لەم ساڵەدا (الملك الكامل) موحەممەدی کوڕی عادل پادشای میسر پاش عادلی باوکی کۆچی دوایی کرد، (کامل) کەسێکی ژیری کامڵ‌و دادگەر بووە، ساڵی (٣٠) میسری گرتە دەست، ڕێگـەو بانـەکان لـە سەردەمی ئەودا لە ئاسایش دابوو، خەڵکی لە نێوان خۆیاندا مافدەرو

(١) البداية والنهاية (١٣٠/١٣).

(٢) البداية والنهاية (١٣٣/١٣).

(٣) البداية والنهاية (١٣/١٥٧-١٥٨).

بە ویژدان بون، کەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد ستەم لە کەسی تر بکات، دژ بە فرنجیەکان جیهادی کردو (دمیاط)ی لێ سەندنەوە.[1]

لە ساڵی (٦٣٧) ك پادشای تێکۆشەرو موجاهید ئەسەدەدین شێرکۆی کوڕی ناسرەدین موحەممەد کوڕی ئەسەدەدین شێرکۆی کوڕی شادی کۆچی دوایی کرد. سەلاحەدین - کە کوڕی مامی باوکی بووە – ساڵی (٥٨١)ك کاربەدەستێتی (حمص)ی پێ سپارد ماوەی (٥٧) ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی کرد، یەکێك بوو لەو پادشایانەی جوانترین هەڵسوکەوت و ژیاننامەی هەبووە، وڵاتی پاککردەوە لە حەرامەکان و گومرگ، گەیشتنە تەوپەری ئاسایش و دادگەری و سەقامگیری.[2]

لە ساڵی (٦٤٠)ك خەلیفەی (المستنصر بالله)ی عەبباسی لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، ماوەی خەلافەتەکەی (١٦) ساڵ بوو، لەگەڵ خەڵکیدا ڕەفتارو هەڵسوکەوتی جوان بووە، خێرو سەدەقەی زۆر بووە، بە تەواوی توانایەوە چاکەکاری بووە لەگەڵ خەڵکیدا، لە هەموو گەڕەکێکی بەغدادا دیوەخانێکی میوانداری بۆ هەژاران دروستکرد، زانکۆی موستەنسریەی لە بەغدا کردەوەو کۆمەڵێك ئەوقافی تەرخان کرد، گەورەترین خوێندنگای جیهان بوو لەو سەردەمەدا.[3]

پاش ئەمیش (المستعصم بالله) موحەممەدی کوڕی ناصر لیدینیلا

---

(١) البداية والنهاية (١٣/١٦٠).

(٢) البداية والنهاية (١٣/١٦٦).

(٣) البداية والنهاية (١٣/١٧٠).

دوا خەلیفەی عەبباسیەکان لە بەغدادا خەلافەتی گرتەدەستو پـێی سپێردرا، هەر ئەم بوو تەتارەکان سـاڵی (٦٥٦)ك لەوکاتـەی هاتنـە بەغدا کوشـتیان، (المستعـصم) لـە ڕووی چـاکەخوازیو خۆپـارێزیو ڕەفتار جوانی لەگەڵ خەڵکیدا وێنەی باوك و براکەی بـوو، کەسـێکی زانا بوو، پـاش کۆچـی دوایـی براکـەی کـوڕە مـامی عەبباسـیەکان بەیعەتیان پێ‌یدا، پاشان کەسایەتیەکانی دەوڵەت لە میرو وەزیرەکان و قازی و زانایانی لە ئەهلی حەلل وعەقـد، بەیعـەتیان پـێی دا بـە دوایدا، گشتینەی خەڵك بەیعەتیان پێدان، لە تەواوی شـارو وڵاتـانو جێگـەی جیاوازەکانـەوە درا، لــە هــەموو دوانگـەکانی ئەمپـەڕی ڕۆژهەڵاتەوە تا ئەوپـەڕی ڕۆژئـاوای ئیـسلامی وتـار بـە ناویـەوە درا بەهەمـان وەك ڕێ و ڕەسمی خەلیفەکانی پێش خۆی.[1]

سـاڵی (٦٤٢)ك (المستعـصم) ئـەبوتالیب موحەممـەدی کـوڕی ئەحمەدی عەلقەمی کردە وەزیـر کـە پاشـتر خـۆی ڕێکخـست لەگـەڵ تەتارەکاندا بۆ ئەوەی بێنە نێو بەغداوە[2]؟؟!!

لە ساڵی (٦٤٧)ك مەلیك سالح ئـەیوب مـەلیکی میـسر پـاش کاملی باوکی[3] کۆچـی دوایـی کـرد، پـاش ئـەوە یەکـەم کـەس لـە مەمالیکەکان عیزەدین ئەیبك فەرمانڕەوایەتی کرد.

---

(١) البداية والنهاية (١٣/١٧١-١٧٢).

(٢) البداية والنهاية (١٣/١٧٥).

(٣) البداية والنهاية (١٣/١٨٩).

له سالّی (٦٥٥)ك عیزەدین ئەیبك لەسەر دەستی (شجرة الـدر)ی خێزانیدا کوژرا، عیزەدین کەسێکی دینـداری پـاكو بەخـشندە بـوو، فەرمانڕەوایەتیەکەی حەوت سالّی خایاند.[1]

پاشان پادشایەتی دوای ئەو بۆ سەیفەدین قوتز یەکلا بویەوە.[2]

سالّی (٦٥٦)ك بەغدای پایتەختی خەلافەت بەدەسـتی تـەتارەکان کەوتو هەرەسی هێنا، خەلیفـە موستەعـسەم کـوژرا، (نـصیرالدین الطوسي)و (ابن العلقمی) وەزیر هۆلاکۆیان هاندا بـۆ ئـەوەی بەغـدا داگیر بکاو خەلیفەو کەسوکاری بکوژێ، زاناو پیاوچاکانو سەیدەکانی ئالوبەیتو ئافرەتانو منداڵانیان کوشـت، تـاوەکو ژمـارەی کـوژراوان گەیشتە نزیکەی دوو ملیۆن کەس.[3]

ئەم ڕووداوە بریتی بوو لەو کارەساتەی خەڵکی لەو کاتەوەی خـوای گەورە دروستکراوەکانی بەدی هێنابوو شتی لەو شێوەیەی نـەبینیبوو، موسڵمانان هاوێنەی ئەم کارەساتەیان بەسەر نەهاتبوو!!!

له سالّی (٦٥٨)ك جەنگی (عین جالوت) له نێوان تەتارو پادشای تێکۆشەر (سیف الدین قطز) ڕویدا، سـەرەنجام تـەتارەکان زەرەرمەنـد بوونو تێشکان.[4] تەواوی شام لەدەستیان رزگار کرا، حەلەبیان لـێ

(١) البداية والنهاية (١٣/٢١١).

(٢) البداية والنهاية (١٣/١٦٦).

(٣) البداية والنهاية (١٣/٢١٣-٢١٥).

(٤) البداية والنهاية (١٣/٢٣٣).

سەندرایەوە، (قطـز) پاڵــەوانێك بــوو، ئیــسلامو موســڵمانانی خــۆش دەویست، بەرامبەر بە شکۆداریو سنور بەندیەکانی ئیسلام بە غیرەت بوو، دادگەری بەرپاکردو کاروبارەکانی رێك وپێك کرد.[1] لە کۆتایی ئەو ساڵەدا کوژرا، پاش ئەویش (ظاهر بیبرس) فەرمانڕەوایەتی کرد.

لە ساڵی (٦٥٩)ك لە قاهیرەدا بەیعەت درا بــە (المستنــصر بــالله أحمد بن الظاهر العباسي) کە مــامی موستەعــسەم بــوو - کــە لــە بەغدا کوژرا - وەك خەلیفەیەکی موسڵمانان، دەسەلاتو ســەڵتەنەتی دا بە زاهیر بیبرسو کاروبارەکانی پێ سپارد، بــەم شــێوەیە خەلافــەت گواسترایەوە بۆ قاهیرە، پاش ئەوەی سێ ساڵ پچرانی تێکەوت، پێــشتر خەلیفە لەگەڵ کۆمەڵێك کەس دا لە بەغداوە هەڵهاتبون.[2]

لە ساڵی (٦٧٦)ك سوڵتان (ظاهر بیبرس) کۆچی دوایی کرد، کــە لە ساڵی (٦٥٨ ك)یــەوە فەرمانڕەوایــەتی کردبــوو، چــەندین کــاری رزگارکــاری ئەنجامــدا، ئــەو شــارانەی بــە دەســتی فرنجەکانــەوە بــوو گەڕاندنەوە، تەتاری شکست پێ هێنــا، دەوڵەتەکــەی بــەرفراوان بــوو لەوپەڕی فوراتەوە تا ئەوپەڕی نوبە، کەسێکی ئازاو جوامێربووە، خوای گەورە لەو سەردەمە سازاندبوی بۆ ئــەوەی بــەرگری بکــا لــە ســنورو ناوچەکانی ئیسلامو موسڵمانان، هەر حەرامو خراپەکارییەکی ببینایە لای دەبرد، کەسێکی ڕەفتارو هەڵسوکەوت جوانو خۆش مەشرەب بوو،

(١) البداية والنهاية (١٣/٢٣٨-٢٣٩).

(٢) البداية والنهاية (١٣/٢٤٤-٢٤٥).

له ته‌واوی فه‌رمانڕه‌وایه‌تیدا دونیا نه‌ویستو تێکۆشه‌ر بووه‌!

پاش ئه‌و ده‌وڵه‌تی مه‌مالیکی لـه‌ میـسرو شـامدا یـه‌ك بـه‌ دوای یه‌کدا هاتنو خه‌لافه‌تیش بۆ عه‌بباسیه‌کان بوو.[1]

له ساڵی (٦٩٤)ك قازانی پادشای ته‌تار له به‌غدا مـسوڵمان بـوو، زۆربه‌ی شوێنکه‌وتوانی هاتنه نێو ئیسلامه‌وه.[2]

پاشـان بـه‌ بـه‌رده‌وامی مه‌مالیکـه‌کان فه‌رمانڕه‌وایـه‌تی میـسرو شامیان ده‌کرد، ڕووبه‌ڕووی فـرنج وهه‌ڵمـه‌تیی خاچـیه‌کان ده‌بونـه‌وه، مه‌غۆلـه‌ مـسوڵمانه‌کانیش فه‌رمانڕه‌وایـه‌تی عێـراق و ڕۆژهـه‌ڵاتیان ده‌کرد تاوه‌کو خه‌لافه‌تی عوسمانی به‌رپا بـوو بـه‌وه‌ی سـه‌لیمی یه‌کـه‌م هاته میسره‌وه‌و خه‌لیفه‌ی عه‌بباسی وازی لـه خه‌لافـه‌ت هێنـا بـۆی، لێره‌وه‌و به‌م کاره خه‌لافه‌ت له ده‌ره‌وه‌ی قوره‌یشو عه‌ره‌ب به‌رپابوو، بـه درێژایی چوارسه‌دده خه‌لیفه عوسمانیه‌کان توانیان ده‌وڵـه‌تی ئیـسلامی بپارێزن له مه‌ترسیه ده‌ره‌کیه‌کان.

ته‌واوی ئه‌وه‌ی باسکرا ته‌ئکید ده‌که‌نه‌وه له‌سه‌ر دیـارده‌ی (زۆرداری دادگه‌ر) له‌م قۆناغه‌دا که داده‌نرێ به یه‌کێك له هۆکاره‌کانی به‌رده‌وام بوونیو سه‌قامگیری ژیارو شارستانێتی ئیسلامی، هه‌روه‌ها پڕوپوچـی ئه‌و پڕوپاگه‌ندانه که‌شف ده‌کا که سه‌باره‌ت به خه‌لیفـه‌و پادشـاکانی ئه‌و ماوه دوورو درێژه‌ی مێژووی ئیسلامی بلاوده‌کرێتـه‌وه، ئـه‌وه بـوو

(١) البداية والنهاية (١٣/٢٩١-٢٩٢).

(٢) البداية والنهاية (١٣/٣٦٠).

سەلما کە زۆربەیان خاوەنی زانستو فەزڵو چاکەخوازیو دادگەری بون نەك بەو شێوەیەی هەندێ لە نوسەرە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکەن کە گوایە تەواوی مێژووی ئیسلامی ستەم و خوێنڕێـژی و تەنگ پێهەڵچنین بوو، وە ڕاپەرینو ڕێنیسانسی نوێ بە کۆلۆنیالیزم و ئیستعماری ڕۆژئاوایی بۆ جیهانی عەرەبیو ئیسلامی دەست پێدەکاو ئەمە سەرەتاکەیەتی؟؟!!

لە ڕاستیدا گوتاری فیقهی سیاسی تەئویلکراو پارێزگاری کرد لـە هەندێ بنەمای سەرەکی گوتاری سیاسی یەکەمی دابەزێنراو (الخطاب السیاسي المنـزل)، هـاو وێنـەی پێـویس (وجـوب)ی بـەرپاکردنی شەریعەت و پاراستنی ئوممەت و بیروباوەر (ملة)، چونکە پاراستنی ئەم بنەماو ڕێسایە یەکێکە لە کارە گرنگ و یەکەمینەکانی دەسـەڵات و ئەرکەکانی ئیمام، هەروەك (ماوەردی) لە بابەتی واجبەکانی سەرشانی ئیمامدا ڕوونی دەکاو دەڵـێ:

(ئەو شتانەی کە پێویسـتن و دەبێ ئیمام پـابەندی بێت لـە کـاروبـاری گشـتی خەڵـك دە شـتە):

یەکەم: پاراستنی ئـایین بـە پـێی ئەسـڵو ڕێـسا چەسپاوەکان بـەو شێوەیەی پێشینی ئـەم ئوممەتـە لەسـەری کۆبونەتـەوە، ئەگـەر بیدعەچی و لادەرو خاوەن گومانێك سەری دەرهێنا، بەڵگـەکانی بۆ ئاشکرا دەکرێتو ڕاسـتی بـۆ ڕوون دەکرێتـەوە، ئـەو مـافو

حدودانەشی دەیگرێتەوە بۆی باس دەکرێ، بۆ ئەوەی ئایین، پارێزراو بێت لە کەلێنو ڕێگە بگیرێ لەوەی ئوممەتیش توشی هەڵەو هەڵتریزان بگیرێ.

دووەم: پیادەکردن و جێبەجێکردنی حوکمەکان لە نێوان ئەو کەسانەی ناکۆکیو ناحەزیان لە نێواندایە، وە برینەوەی ناکۆکی ئەوانەی ناکۆکن لە نێوان یەکتریدا تا دادگەری هەموو لایەك بگرێتەوە، بۆ ئەوەی ستەمکاری و دەستدرێژی نەکاو ستەم لێکراویش نەچەوسێنرێتەوە.

سێیەم: پاراستنی کرۆکی ئیسلام و داکۆکی کردن لە سنوورو قەدەغەی موسوڵمانان، تاوەکو خەڵکی بە ئاسانیو ئاسایی ژیان بگوزەرێنێ، لە ڕێبواری و سەفەرەکانیدا بێمەترسی لەناوچون یان سامان لەدەستدان گەشتو سەردان ئەملاولا بکەن.

چوارەم: بەرپاکردنی سنوورو حدودەکان بۆ ئەوەی حەرامکراوە خواییەکان سوك نەکرێنو مافەکانی خەڵکی بپارێزرێن لە لەناوچون و تیابردن.

پێنجەم: پتەوو تۆکمەکردنی قەڵاو قولەکان بە چەكو پێداویستی بەرگریکارو هێزی پاڵنەر، تاوەکو دوژمنان لە ناکاودا هەڵنەکوتنە سەر خەڵکیو ڕێزو قەدەغەکانیان نەشکێنن، یا خود خوێنی مسوڵمانێك یان پەیمان پێ دراوێك نەرێژن.

شەشەم: جیهادکردنی هەر کەسێ پاش بانگەشەکردنی موسڵمان نابێو عینادی دەکا تاوەکو موسوڵمان دەبێ، یان دەچێتە ژێر

سایەوە، تاوەکو سەروەری‌و مافی خوا بەسەر تەواوی ئایینەکانـدا دەرکەوێ و بشەکێتەوە .

حەوتەم: کۆکردنەوەی دەسـت کـەوت وخێروسـەدەقات، لـەو شـتانەی شەرع بە دەق وئیجتیهاد بە واجبـی داناوە.

هەشتەم: ئەندازەگیری لـە بەخـشینەکان‌و ئـەو مافانـەی لـە خانـەی ساماندا هەیە بێ زیادەڕەوی‌و پێدان‌و خەرج کردنـی لـە کـاتی خۆیدا بێ پێش خستن‌و دواخستن.

نۆیەم: پـشت ببەسـترێ بـە کەسـی دەسـت پـاك‌و ئامۆژکارگـار لـە پێسپاردنی کاروبارەکـان وە لـەو سـامان و داراییـەی دەخرێتـە ژێردەسـتیان، بـۆ ئـەوەی کاروبارەکـان بـە لێوەشـاوێتییەکی ڕێك‌وپێکەوە ئەنجام بـدرێ، سـامان‌و داراییـەکانیش لای کەسـە ئەمینداره‌کان پارێزراو بێت.

دەیەم: ڕاستەوخۆ خۆی چاودێری کاروبارو بارودۆخەکان دەکات، تاوەکو خۆی بەکاروباری ئوممەت‌و پارێزگاری میللەت هەڵبسێ، بە هۆی سەرقاڵی خۆی بە چێژ وەرگرتن یان پەرستشەوە پشت نەبەسـتێ بەوانەی کارەکەی پێسپاردوون، چونکە دەگونجێ کەسی ئـەمین‌و دەستپاك ناپاکی بکاو کەسی ئامۆژگاریکار گزیکاری ئەنجام بداو خوای گـــەورەش فەرمویەتی: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّـا جَعَلْنَـاكَ خَلِيفَـةً فِـي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَـن سَـبِيلِ اللَّهِ﴾. (١)

(١) الأحكام السلطانية ل (١٨)

پاشان (ماوەردی) دەڵـێ: (ئەگـەر ئیمـام بـەو مافانـەی ئومـەت هەستێ ئەوا مـافەکانی خوای بەجێ هێناوە لەبارەیانـەوە بـە مـاف و ئەرکیانەوە، ئیمـامیش دوو ئـەرکی هەیـە لەسـەریان، گوێڕایـەڵی و پشتگیری، تا ئەو کاتەی ئیمام لەسەر بـاری ئاسـایی خۆیـەتی، ئـەو شتانەی باری ئیمامی پێدەگۆڕێ بریتیە لە: تەشەردان لە دادگەرێتی یەکەی، دووەم ناتەواوی لە جەستەیدا..... هتد).[1]

پاشان سەبارەت بە ئەرکی میر (أمیر) کە لەژێر دەستی خەلیفەدایە لەبارەی سەلاحیاتی هەردوکیانەوە، جـا ئـیتر میرەکـە ئارەزوومەندانـە گرتبێتیە ئەستۆ یا بەناچاری دەڵـێ: (ئەگەر خەلیفە کەسـێکی کـرد بە میر بەسەر هەرێم یا وڵاتێکەوە ئەو کاتە میرایەتیەکەی دوو جۆرە: گـشتیو تایبـەتی، لەگـشتی یەکەیـدا، تیروانـینی حـەوت کاروبـار ئەگرێتەخۆ:

یەکەم: تێڕوانین لە کاروباری سوپاو لەشکرو ڕێکخـستنیان بـە پـێی ناوچەکان، دانان و ئەنـدازەگیری خواردەمـەنی ورۆزیـان، مەگـەر خەلیفە خۆی دیاری کردبێ وئەمیش دابەشیبکا بەسەریاندا.

دووەم: تێروانین لە حوکم وبریارەکان ودانانی قازی وفەرمان ڕەواکان.

سێیەم: کۆکردنەوەی باج و وەرگرتنی سەدەقاتو دانانی کاربەدەسـتو فەرمانبەر بۆیانو جیاکرنەوەی بەشی خۆیان تیایدا.

---

(١) الأحكام السلطانية ،ل (١٩).

چــوارەم: پاراســتنی ئــایین وبــەرگری کــردن لــە قەدەغــەکراوەکانی، چاودێریکردنی ئایین لەوەی گۆرانکاریو شێواندن نەیگرێتەوە.

پێنجەم: پیادە وجێبەجێکردنی ئەو ســزایانەی مــافی خــوا وخــەڵکی تێدایە.

شەشەم: ئیمامەتی کردنی هەینی و نوێژە بە کۆمەڵــەکان بــۆ ئــەوەی خۆی ئەنجامی دا یا کەسێك بکاتە جێنشینی و نوێنەری.

حەوتەم: بەرێکردنی حاجیەکان کاری ئەمە و لەلایەن ئەمەوە وەبەدەر لە خزمی خۆی کەسی بــۆ دیــاری دەکــا، تــاوەکو بــە پــشتیوانیو هاوکاری ئەمەوە بەرەو حەج برۆن، ئەگەر ئەو هەرێمە هاوســنوری دوژمن بوو.

هەشتەمیشی بۆ زیادەکــرێ کە بریتیــە لــە جیهــادکردنی دوژمنــانی نزیك و دەورپشتی و دابەشــکردنی دەســتکەوتی جــەنگ و دانــانی پێنج یەکی بۆ ئەوانەی دیاری کراوە بۆیان.

دروستە ئەو میرە وەزیرێکــی جێبــەجێ کــار (وزیــر التنفیــذ) بــە فەرمانی خەلیفە یا بەبێ فەرمانی خەلیفە بــۆ خــۆی دابنــێ، بــەڵام، وەزیری پێسپێرراو (وزیر التفویض) بەبێ مۆڵەتو فەرمانی خەلیفــە دانانرێ، چونکە وەزیری جێبەجێکەر هاوکــارەو وەزیــری پێــسپێردراو (وزیر التفویض) زۆردارو فەرمان بەدەستە، ئەگەر ئەو مــیرە ویــستی رزقو خەرجی سوپاکەی بەبێ هۆ زیاد بکات دروست نیە، لەبەر ئەوەی لەناوبردنو تیابردنی سامانە بــە نــارەوا، ئەگــەر بــە هــۆی ڕوودانــی

هۆکارێکەوە بوو، ئەوەی دەخواست سەیری هۆکارەکە دەکـرێ، ئەگـەر لەو شتانە بوو هیوای لابردنو نەمانی هەبوو ئـەوە زیـاد کردنـە کـە نابێتە شتێکی بەردەوام وەك ئەو زیاد کردنەی بە هـۆی بەرزبوونـەوەی نرخەوە یا رووداوێکەوە یا خەرجی جەنگێکەوە بەدی دێت، دروستە میر ئەو زیادەیە لە خانەی سامان بدات، پێویست نیە فـەرمانی خەلیفـە وەرگرێ، چونکە لەو مافە سیاسیانەیە کە سـپێردراوە بـە ئیجتهـادی خۆی، ئەگەر هۆکاری زیاد کردنەکە ئەوەی دەخواست کە بەردەوام بـە جێگیری بمێنێتەوە وەك ئەو زیاد کردنەی لە جەنگێکدا بـەدی هـاتووە کە ماندووبونی زۆریان پێوە چەشتوەو تیایدا بە تەواوی سەرکەوتوون، ئەم مووچە بەردەوامە پێویستی بە ئاگاداریو فەرمانی خەلیفە هەیە، میر بۆی نیە سەربەخۆیانە جێبەجێی بکاتو تاکڕەوانە ئیمزای بکات، دروستە میر بژێوی و مووچەی ئەو منداڵانەی سوپاییەکان بدات، کـە پێ گەیشتوونو بەبێ فەرمانیش بەخشینیان بۆ ببڕێتەوە، دروست نیـە بەبێ فەرمان لە سەرەتاوە موچەیان بۆ ببڕێتەوە، ئەگـەر لـە سـامانی خەراج بژێوی و شتومەك زیاد بـوو لـە سـوپاکەی، ئەیگێڕێتـەوە بـۆ خەلیفە تـا لـە خانـەی سـامانی گـشتیدا دایبنـێ کـە دانـراوە بـۆ بەرژەوەندییە گشتییەکان، ئەگەر سـامانی زەکـاتو خێروخێـرات لـە خەڵکەکەی خۆی زیاتر بو پێویست نیە بیگێڕێتەوە بۆ خەلیفە بەڵکو لە نزیکتـرین شوێنی کارەکەیەوە دابەشـی دەکـات بـە سـەر کەسـە شیاوەکاندا، ئەگەر سامانی خەراج بەشی بـژێوی سـوپاکەی نـەدەکرد

داوا لە خەلیفە دەکات لە خانـەی سـامان بـۆی تـەواو بکـا، ئەگـەر سامانی سەدەقات بەشی خەڵکەکەی خۆی نەکرد، بـۆی نیـە داوا لـە خەلیفە بکات بۆ تەواوکردنی، چونکە بـژێوی سـوپا دەبـێ بـە پـێی بەشکردن بێ و ئەو مافانەی دانـراوە بـۆ ئـەو کەسـانەی سـەدەقاتو زەکاتیان پێ ئەبەخشێ بە پێی بوون ئیعتباری بۆ ئەکرێ .

ئەگەر دانانی میر لە لایەن خەلیفەوە بوو، بە مردنی خەلیفە لەکار لانادرێ، ئەگەر لەلایەن وەزیرەوە بوو بە مردنی وەزیر لادەبرێ، چونکە دانانی خەلیفـە لـە بریتـی موسـڵمانانە، دانـانی وەزیـر لـە لایـەن خۆیەوەیەتی، بە مردنی خەلیفە وەزیرشی لادەبرێ هەرچەندە میری پێ لاناچـێ، چـونکە وەزارەت نوێنەرایـەتی خەلیفەیـەو میـــرایەتیو ئەمارەت نوێنەرایەتی موسڵمانانە، ئەمە حـوکمی یەکێکـە لـە دوو بەشەکەی میرایەتی گشتیی، ئەو میراتییەی لەسەر ئارەزوومەندی گرێ بەستەکەی ئەنجام درابێ .

بەڵام میراتی تایبەت (الإمارة الخاصة)، بریتیە لەوەی میر بێ توانا بێت لە بەرێوەبردنی کاروباری سوپاو خەڵکیو پاراستنی روو سـووری موسـڵمانان و بـەرگریکردن لـە قەدەغـەکراوەکانیان، وە بـۆی نـەبێ دەستوەرداتە قەزاو حوکمەکان و کۆکردنەوەی خەراجو خێـرو خێـرات، سەبارەت بە پیادەکردنی حدودەکانیش ئەوا ئەو شتەی پێویستی بـەوە هەبێ هەڵبژاردنی تیادا ئەنجام بدرێ لەبەر ئەو جیاوازییەی زانایان لەو بارەیەوە هەیانە وە پێویستی بە بەڵگە سازی هەبێ لەبەر ئەوەی لایەنە

ناکۆکەکان جیاوازن لە نێوان خۆیانـدا – ئـەوا بـۆی نیـە خـۆی لـە پیادەکردنی بدات، لەبەر ئەوەی بەدەر لـە تایبەتمەنـدی میراتیەکـەی ئەوە، بەڵام ئەگەر پێویستی بە هەڵبژاردن یاخود بەڵگە سازی یـاخود پێویستی بە هەردووکیان هەبوو، وە ئیجتهادی حاکمی تیادا جێبەجێ دەکرا یاخود لای خۆیەوە توانای بەڵگە سازی لەسەری هەبوو، ئا لـەو کاتەدا یا ئەوەتا ئەو شتە پەیوەندی هەیە بە مافەکانی خوای گەورەوە یاخود بە مافەکانی مرۆڤەوە، جـا ئەگـەر پەیوەنـدی بـە مافـەکانی مرۆڤەوە هەبوو وەکو حدودی دەم هەڵبەستو تۆمەتبار کـردنو تۆڵـە کردنەوە، ئەوا حاکم شیاو ترە پێی هەستێ، لەبەر ئەوەی لە کۆی ئەو مافانەیە واباشە حاکم جێبەجێی بکـات، ئەگـەر داواکارەکـە حـەدو تۆڵەکردنەوەی بردە لای ئەو مـیرە، ئـەوا میرەکـە شـیاوو لـە پێـشترە جێبەجێی بکات، لەبەر ئەوەی حوکم نیە بەڵکو هاوکاری و پشتیوانی کردنی پێدانەوەی مافە، هاوکاریکاریش بریتیە لە مـیر نـەك حـاکم، بەڵام ئەگەر ئەو حەدە یەکێك بوو لەو مافانـەی بەتـەواوی پەیوەنـدی داربوو بە خوداوە وەکو حەدی زیناو شەرواڵ پیسی جەڵدەبێ یا ڕەجـم، ئەوا میر لە پێشترو ڕەواترە جێبەجێی بکا وەك لە حاکم (واتە قازی)، لەبەر ئەوەی دەچـێتە نـاو یاسـاکانی سیاسـەت و پێداویـستییەکانی پاراستنو بەرگری کردن لە بیروباوەڕ (ملە) لەبەر ئەوەی بەدوادا چوونی بەرژەوەندییەکان سپێردراوە بە مـیرە نوێنـەرەکان تـاوەکو بـە دوایـدا بگـەڕێن، بـەدەر لـە حاکمـەکان کـە چـاودێری یەکالاکردنـەوەو

چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان نەیارو ناحەزەکان دەکەن، لێرەوە دەچێتە ناو مافەکانی میرایەتی (الإمارة) وەو بـە دەق نـەبێ ناچـێتە دەرەوەی مافەکانی میراتییەوە، وە لەمافەکانی قەزا دەردەچێو بە دەقێك نـەبێ نایەتە چوارچێوەی قەزاوە .

سەبارەت بە تێڕوانینی ئەو بۆ مافخوراویەکان: ئەگەر لـەو شـتانە بوو حوکمیان لەبارەوە جێبەجێ دەکراو قازیو حاکمەکانیش ئیمزایـان لەسەری کردبوو، میر بۆی دروستە جێبـەجێی بکـات وەك هاوکـاری کردنی ڕەوا بەسەر نارەوادا، وە وەك سەندنەوەی مافی ماف خوراوێك لە دانپێدانەرێکی کەم تەرخەمو بێ دەربەس، چـونکە ئـەو راسـپێردراوە بەرگری بکا لەوەی بەسۆزو دادگـەرو بـە ویـژدان بێـت ئەگـەر مـاف خوراویو ستەمکارییەکان لەو شـتانە بـوون حوکمـەکانیان دووبـارە دەکرایەوەو قـەزا تـێی هەڵدەچـوەوەو ڕێگـری لـە دەسـت تێـوەردانو هەڵقورتانـدنی ئـەو مـیرە دەکـرێ، چـونکە لـەو حوکمانـە دەبێـت گرێبەسـتی میراتیەکـەی ئـەو نایگرێتـەوە، وە دەیگێڕێتـەوە بـۆ لای فەرمانڕەواو حاکمی وڵاتەکەی خۆی، ئەگـەر بـە ڕەوا حوکمەکـەی بـۆ یەکێکیان دەرکرد ئەوا ئەم پێی هەڵدەستێ ئەگەر حاکم لاواز بوو لـە جێبەجێ کردنیدا، ئەگەر لە وڵاتەکەیدا حاکمێکی تیا نەبوو دەبرێتـە لای نـزیکترین حـاکم لـە وڵاتەکەیـەوە ئەگـەر بـۆ گەیـشتن پـێی نەهامەتیو ماندوبوونی زۆریان تـوش نـەدەبوو، ئەگـەر مانـدوبوونی زۆریان دەویست ئەوا پێویست نیە لەسـەریان، خەلیفـە کەسـێك بـۆ

یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان دادەنێتو بڕیارو حوکمی ئەو ناکۆکیانـە بەسەریاندا جێبەجێ دەکات .

لە ویلایەتو کاربەدەستێتی ئەو میراتیەدا مەرجە موعتەبەرەکانی وەزارەتی جێبەجێکردن (وزارة التنفیذ) ئیعتباری بۆ دەکرێ بـە زیـاد کردنی دوو مەرج: ئـەوانیش ئیـسلامو ئـازادین، لەبـەر ئـەوەی ئـەو ویلایەتە چەندین کاروباری ئاینی لە خۆ دەگرێ کە ناکرێـت کەسـێك ئەنجامیدا کە کوفرو کۆیلەیەتی تیادا بێت، زانستو فیقه مەرج نیە تیایدا، ئەگەر ببێ چـاکەو فـەزڵێکی زیادەیـە، لێـرەدا مـەرجـەکانی میرایەتی گـشتی (الإمــارة العامــة) بـەپێی مـەرجـەکانی وەزارەتـی ڕاسپێردراو (وزارة التفویض) دەبێ، لەبەر ئەوەی یەك دیـدو تێـڕوانین دەیانگرێتەوە، هەرچەندە لە تایبەتمەندی کاردا جیا لە یەکن .

مـەرجەکانی میراتی تایبەت (الإمارة الخاصــة) یـەك مـەرجی لـە مـەرجەکانی میراتی گشتی (الإمارة العامة) کەمترە، کە بریتیـە لـە زانستو زانیاری، چونکە ئەمە بۆ ئەو کەسەیە میرایەتیەکەی گـشتی بێت نەك تایبەتی، هیچ یەك لەم دوو میرە لەو کارو بارانـەی بـەپێی ناوەڕۆکی میرایەتیەکەیەتی ئەنجامی دەدات ناگەڕێتـەوە بـۆ خەلیفـە، ئەگەر کارەکان بارو ئاسایی بوو، مەگەر لە ڕووی ئارەزوومەندییـەوە نەبێت وەك دەرخستنی گوێڕایەڵی، ئەگەر ڕووداوێکی ناباو بەدی هات دەوەستین لەسەر گەڕانەوەی بۆ ئیمامو بە پـێی فـەرمانی ئـەو کـاری تیادا دەکەین، ئەگەر ترسان لەوەی تا دەگەڕێتـەوە بـۆ ئیمـام بارەکـە

نالەبارو درزەکە فراوانتر دەبێـت، کارێـك دەکـەن هێرشـی ئـەو بـارە بوەستێنن، تاوەکو مۆڵەتی خەلیفەیان بۆ دێ بۆ ئەوەی بزانن چی لـەو بارە بکەن، چونکە بیروڕای خەلیفە لەبەر ئـەوەی ئاگـادارو چـاودێری گشتی کاروبارەکانە بەهێزو چاکترە بۆ ئەو رووداو تازە بەدی هاتوانە .

سەبارەت بە میراتی خۆسـەپێنەر، کـە بەناچـاری گرێبەسـتەکەی بەدی هاتووەو بریتیە لـەوەی میرێـك بـەهێز دەسـت بگرێـت بەسـەر وڵاتێکــداو خەلیفــەش میرایەتیەکــەی پەســەند بکــاو کاروبــارو بەڕێوەبــەرێتی پــێ بــسپێرێ، میریـش بـەم دەسـت بەسـەرا گرتنـەی سیاسەتو کار بەڕێوەبەریەکەی زۆردارانەیە، خەلیفەش بـە مۆڵـەتی ئەو جێبەجێکاری حوکمەکانی ئاینە، تاوەکو لە خراپەکاری یەوە بەرەو بارێکی تەندروست و لە حەرامییەوە بۆ دروستی هەنگاو بنێ، ئەمـە هەرچەندە دەرچوونە لە نەریتو باوی رەها و مـەرجو حوکمەکان بـەڵام چەندین هۆکاریشی تیادایە بۆ پاراستنی یاساو ڕێـسا شـەرعیەکانو پاراستنو پاسەوانی حوکمە ئاینیەکان کە ناکرێ وازی لێ بهێنـرێ بـە کـــەلێنو خڵتـــەداریو خراپـــیو دەردەدارییەکەیـــشیەوە، ئـــەم دەستبەسەراگرتنو خۆسەپاندنو ناچار کردنەش چەند شـتێکی تیـادا دروست دەبێت، کە لەباری ئاساییو هەڵبـژاردنی خودموختیاریانـەی میردا ڕێگری لـێدەکرێ، لەبەرئەو جیاوازییـەی کەلەنێوان مـەرجەکانی تواناو بێتواناییدا هەیە.

ئـەو کاروبـارو یاسـایانەی شـەرعیش لەگـەڵ کارگرتنـە دەسـتی

خۆسەپێنەریـــشدا دەپـــارێزرێن، حـــەوت شـــتن، خەلیفـــەو مـــیری خۆسەپێنەریش هاوبەشن لەوەی پابەندن پێیەوە، واجبایەتیەکـەی لـە لایەن کاربەدەستەوە سەختو ئەرکدارترە:

یەکـەمیان: پاراستنی پلـەو پایـەی ئیمامەتـە لـە جێگرتنـەوەی پێغەمبەرایەتیو بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانانو دینداری بۆ ئەوەی ئەوەی شەرع بە پێویستی داناوە راپەڕێنرێو بەرپا بکـرێو پارێزراو بێت، ئەو مافانەشی لەمە دەکەوێتەوە پاسەوانی بکرێت.

دووەم: ئاشکرایی گوێڕایەڵی ئاینی کە لەگەڵیـدا فـەرمانو حـوکمی سەرکەشی و لاملی لادەچێو، تاوانی خۆ بواردن لەو گوێڕایەڵیـە لە ئارادا نابێت.

سێیەم: یەك دەنگی لەسەر پێکەوە بوونو پشتگیریکردنی یەکتری، بۆ ئەوەی موسڵمانان دەسەڵاتدار بن بەسەر ئەوانی تردا

چوارەم: تاوەکو گرێ بەستی ویلایەتە ئاینیەکان دروست بێ و حـوکمو قەزاوەتەکانی تیا جێبەجێ بن، بـەهۆی خراپـی گرێبەسـتەکەوە پوچ و ناڕەوا دەرنەچن، بەهۆی کەلێنداری پەیمانەکانیەوە لە کـار نەکەون.

پێنجەم: تاوەکو سامانو داراییە شەرعیەکان بەڕاسـتیو ڕەوایـی لـە ئەستۆی بدەرو بەخشەرەکەی بکەوێ وەرگرەکەشـی بـە حـەڵاڵیو دروستی وەری بگرێ .

شەشـەم: تـاوەکو حـدودەکان بـە ڕاسـتو ڕەوایـی، بەسـەر کەسـە

شایستەکاندا پیادە بکرێ، چونکە جەستەی موسڵمان پارێزراوە، مەگەر مافێکی خوایی یا حەدێك لە حەدەکانی لەسەر بێت .

حەوتەم: تاوەکو میر لە پاراستنی ئایندا خۆی بپارێزێ لەوانەی خـودا قەدەغەو حەرامی کردوون، فەرمان بەو مافانەی خۆی بکات گەر گوێڕایەڵی لێ کراو داواو بانگەشـەی گوێڕایـەڵی بکـا گـەر بـە فەرمانی کرا

ئەمە حەوت ڕێـساو بنـەمان لـە یاسـاکانی شـەرعو بەهۆیانـەوە مافەکانی ئیمامەتو حوکمەکانی ئومەت دەپـارێزرێن، هـەر لەبـەر ئەمانەیە پێویستە کار بسپێررێت بە میری خۆ سەپێنەر، دواتر ئەگەر مەرجەکانی هەڵبژاردنی تیادا هاتە دی ئەوا پێـسپاردنەکەی دەبێتـە شتێکی زیندوو راسـتەقینەو دەخـوازرێ گوێڕایـەڵی بکـرێو ڕێگـری دەکرێت لەوەی بێفەرمانیو نەیارێتی بکرێ، بـە مۆڵـەت پێدانیـشی دەبێتە خاوەنی تەسەڕوف لە مافەکانی دینداری میللەتو حوکمەکانی ئومەتدا، ئەو کەسەشی ئەم دەیکـات بـە وەزیـرو نوێنـەری، هـەمان حوکمی وەزیرو نوێنەری خەلیفـەی هەیـە، وە بـۆی دروسـتە وەزیـری ڕاســپێردراوو جێبــەجێکاری هــەبێت، بــەڵام ئەگــەر مەرجــەکانی هەڵبژاردن (الإختيار)ی بەتەواوی تیادا نـەبوو دروسـتە ئـەرکو پـێ سپاردنی بۆ ئاشکرا بکا تاوەکو گوێڕایەڵی کردنی بەدەست بهێنێـتو نەیاریو سەرکەشیەکانی نەهێڵێو ئەرك پـێ سـپاردنی بـۆ ئاشـکرا بکات، یاخود سنوری دەسەڵاتو پیادەکردنی ئەو لە حوکمو مافەکاندا

وەستا بێت لەسەر ئەوەی خەلیفە کەسێکی بۆ دابنــێ لــەو کەســانەی مەرجەکانی بەتەواوی تیادا بێ، بۆ ئــەوەی تــەواوی مەرجــەکان لــەو کەسەی بەناچاری ئەو دایناوەو لە کەسی خۆسەپێنەردا ئەو مەرجانــە نیە، بەمشێوەیە کار سـپاردن بـۆ خۆســەپێنەرەو جێبــەجێکردن بـۆ نوێنەرو ئەو کەسەیە خەلیفە دایناوە، ئــەم کــارە هەرچــەندە ریزپــەڕ (شاذ)ە بەڵام دروستە لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: ناچاری وا دەکا مەرجە پێویستو تەواوەکانی ئەم کــارە چــاوی لــێ بپۆشرێ .

دووەم: ئەو مەترسیانەی رووبەرووی بەرژەوەندییە گشتییەکان دەبێتەوە وا دەکات مەرجەکانی سوك تر بن لەو مەرجانەی بــۆ بەرژەوەنــدی تایبەتی دانراون.

ئەگەر میرایەتی داگیرکەرو خۆ سەپێنەر دروست بێت ئەوا جیاوازی لە نێوان ئەم میرایەتییەو میرایەتی لێوەشاوەدا لە چەند روویەکەوەیە:

یەکەمیان: میرایەتی داگیرکارو خۆسەپێنەر دیاریکراوە لــەو کەســەدا کە کارەکەی گرتــووە دەســت، بــەڵام میرایــەتی لێوەشــاوە (إمــارة الإســتكفاء) بەســتراوە بــە هەڵبــژاردنو ویــستی ئــەو کەســەی هەڵیدەبژێری و دیاری دەکات.

دووەم: میرایەتی داگیرکارو خۆســەپێنەر ئــەو وڵاتانــە دەگرێتــەوە کــە کاربەدەستەکە زاڵ بووە بەسەریاندا، بەڵام میرایەتی لێوەشاوە تەنها لەو وڵاتانەدایە کە سپاردنی هەڵبژێرەر دەیگرێتەوە.

ســێهەم: میرایــەتی داگیرکــارو خۆســەپێنەر کاروبــارە ئاســاییو ڕیزپەڕەکانی لە خـۆدەگرێ، میرایــەتی لێوەشــاوە تــەنها کاروبــارە ئاساییەکان لە خۆ دەگرێ.

چوارەم: وەزارەتی پێسپاردن (وزارة التفويض) لە میرایەتی داگیرکــارو خۆسەپێنەردا دەبێت و دروسـتە بـەڵام لـە میرایـەتی لێوەشـاوەدا دروست نیە دابنرێ، لەبەر ئەو جیاوازی تێڕوانینەی لە نێوان میری خۆسەپێنەرو وەزیرەکەیدا هەیە، چـونکە تێڕوانینـی وەزیـر تـەنها بەستراوە بە باری ئاساییو باوەکانەوە، میری داگیرکار تێڕوانینی بۆ هەر یەك لە ڕیزپەڕو ئاساییەکان هەیە، میرایەتی لێوەشاوەو دانراو تێڕوانینی ئاساییو باری هەیە، دروست نیە وەزارەتێکی لەگەڵـدا بێت هەمـان تێڕوانینی ئاساییو باری هەبێ لەبـەر ئـەوەی وەزیـرو ئەوەی کاری وەزیرێتی پێ دەبەخشرێ وەكو یەك دەبن).(1)

عەبدولواحید تەمیمی زانای حەنبەلیەکانی سـەردەمی خـۆی کـە (٤١٠)ك لە ڕوونکردنەوەی ڕێبازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا سەبارەت بەو ئەرکانەی پێویستە ئیمام پێی هەستێو هــەروەها ســەبارەت بــە سنوری دەســەڵاتەکەی ووتویــەتی: (لــە راســتیدا دەســتکەوت ئیمــام

---

(١) الأحكام السلطانية ل (٣٥-٤١)، سەیری ئەرکەکانی ئیمامو میر بکە لە الأحكام السلطانيةی (ابي يعلى ل(٢٧-٣٨) هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر دەوڵەمەندی فیقهی دەستوری کە مەودای کارو ئەرکەکانی هەریەکە لە خەلیفەو وەزیرو ئەمیر دیاری دەکات، وە چۆنیەتی دانانو لابردنی هەریەکەیان لەم قۆناغەدا بە شێوازێك جیهان ئاشنا نەبووە بە شتی وا مەگەر دوای شۆڕشی فەرەنسی وسستەمە دەستوریەکان.

دابەشی دەکات، ئەگەر موسڵمانان لە نێوان خۆیان بە یەکسانی و ڕێکوپێکی دابەشیان کرد هیچ شتێکی تیادا نیەو کارێکی باشە، وە ئەگەر پایەی ئیمامەتیش لەکار خرا غەزاو حەج لە کار ناخرێو وازی لێ ناهێنرێ، ئیمامەتیش تەنها بەپێی مەرجەکانی خۆی دەبێت کە بریتین لە (نەسەبو ئیسلامو بەرگری و خۆپارێزیو تەقواو بەگوێکراوی و ڕێکوپێك کردنی سامانو دارایی موسڵمانان، ئەگەر ئەهلی حەللو عەقدی موسڵمانانو جێی متمانەکانیان لەم ڕووانەوە شایەتیان بۆی دا، یاخود خۆی ئەمەی بۆ خۆی دەکرد پاشان موسڵمانان نارەزاییان لەسەر دەردەبڕی ئەوا بۆی دروستە ببێتە ئیمام، دەرچوون لە فەرمانی ئیمام دروست نیە، هەرکەسە دژ بە ئیمامی یەکەم دەرچێ ئەوا دووەمیان دەکوژرێ. هەرکەسەش ئەم سیفاتانەی تیادا کۆبوەوە دروستە بکرێتە ئیمام هەرچەندە کەسی لەو زاناو شارەزاتریش هەبن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (خەلافەت لە قورەیش دا ئەبێت تا ئەوکاتەی نوێژ بە باشی ئەنجام دەدەن.

وە دەیفەرموو: (لە بێ فەرمانی خوادا گوێڕایەڵیان ناکرێ).[1]

لە نێوان زاناو شارەزایانی ئەم قۆناغەدا جیاوازی نەبوو لەوەدا کە ئەمانە لە گرنگترینو پێویسترین لێپرسراویەتیەکانی ئیمام بوون، چونکە پێویستی بوونی ئیمامێتی (وجوب الإمامةَ) حوکمێکی

(١) طبقات الحنابلة. ٢/٣٠٥

شەرعیە وە پەیوەسـتە بـە پاراسـتنی ئـایینو ئومـەتو بـەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان بەپێی یاساو ڕێساکانی شەرع . هەر بۆیە زانایـان بـە چەندین شێوە دەقیان هەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر ئیمـام بـێ توانـا بـو پێویستە ئومەت بە هەندێ لە کارەکانی هەسـتێ، بـەوەی ئیمـام بـێ توانایە کارەکان پـەکیان نـاخرێ، هـەر بۆیـە کـۆکن لەسـەر ئـەوەی تێکۆشانی بەرگری (جهاد الدفع) لە دەوڵەتو ئومەت فەرزی عـەینـە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە توانای ئەوەی هەبێت، مۆڵەت وەرگرتن مەرج نیە تیایدا، ئەگەر ئیمام کاروباری جیهادی دەبـرد بـەڕێوە ئـەوا چاکە، ئەگینا جیهاد پەکی ناخرێ.[1] بە هەمان شێوە پشتگیریکردنی ستەملێکراو موسڵمان بێ یا زمی بۆ هەر کەسێ بتوانـێ هاوکـاریو پشتگیری بکات... هتد.

شەوکانی لە (وبل الغمـام)دا مەبەسـتەکانی دانـانی ئیمـام روون دەکاتەوە و دەڵێ: لای من کرۆکی کاروباری ئیمامـەت و سـەڵتەنەت، گەورەترین مەرجو شکۆدارترین پایەی بریتیە لەوەی بەتوانا بن لەسەر پاراستنی ئاسایشی ڕێگەوبانو سەندنەوەی مافی ستەم لێکـراوان لـە ستەمکاران، وەتوانای بەرگری کردنیان هەبێت لە موسـڵمانان ئەگـەر بـارێکی نالـەبارو هەڵکوتینـە سـەرێك روویـدا لەلایـەن سـوپاو لەشکرێکی کافر یا دەستدرێژکارو یاخیەوە، نابێت بەمـە هەڵنەسـێ، یاخود قورسو لاواز و بێدەسەڵات بێت لە ئاستیدا، وە نابێ سـەرقاڵی

(١) سەیری (الفتاوی المصریة)ی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە بکە ٤/٥٠٨-٥٠٩

چێژو خۆشیەکانی بێت و پشت بکاتەوەو لێی ڕاکشێ .

جا ئەگەر سوڵتانو دەسەڵاتدار بەو شێوەیە بوو ئـەوا بریتیـە لـەو سوڵتانەی کە خوای گەورە گوێڕایەڵیکردنی واجب کردووەو حەرامە بێ فەرمانی بکرێ، بـەڵکو هـەر ئەمـە هۆکـاری دانـانی پێـشەوایان و سوڵتانەکانە لە لایەن شەرعی خواوە، ئەمەش بە گـەورەترن ئـەرکێك لە ئەرکەکانی ئاین دادەنرێت .

زیان بە ئیمام ناگەیەنێ ئەگـەر هـاتوو مـەرجێك یـا زیـاتر لـەو مەرجانەی کەم بێت کە باس کراون، ئەگەر هاتوو بەو کارانە هەسـتێ کە باسمان کرد ، موسڵمانان پێویستیان بەوە نیـە ئیمـام لـە شـــوێن نوێژو لەسەر بەرماڵەکەی دابنیشێو تـەزبیح بـە دەســـتەوە بگـرێ، یاخود سەرقاڵی خوێندنـەوەی کتێبـە زانـستی یـەکان بێـتو وانـەی قوتابیانی سەردەمەکەی خۆی بڵێتەوە، لەبارەی ئاڵۆزیەکانـەوە کتێـب دابنێ، وە خۆی بپارێزێ لـە خـوێن ڕێـژی، لەولاشـەوە موســـڵمانان یەکتری بخۆن، بـەهێزیان سـتەم لـە لاوازیـان بکـات، خانـــەدانیان نەداریان ناچارو تەنگەتاو بکات، جا ئەگەر کاروبارەکـە وا بـوو ئـەوا ئیمامەتو سەڵتەنەت هیچی بەدی نەهاتووەو نەکردووە لەبەر نەبوونی گرنگترینو گـەورەترین ئـەو ئەرکانـەی ئیمامـەتو سـەڵتەنەتی بـۆ دانراوە، ئەم ووتەیە تەنها چەند تاکێکی زاناو خـاوەن زانـست لـێی تێدەگەن). (۱)

(۱) سەیری (الحلیل الکرامة)ی (صدیق حسن) خان بکە، ل (۱۱٤ –۱۱۵).

هەروەها لە (وبل الغمام)دا دەڵێ: (زۆردارو ستەمکار یەکێك لـەم دوو کەسەیە: یا ئەوەتا کەسەکە زۆرو ستەمی لە هەموو موسـڵمانان یان هەندێکیان کردووە بەوەی ماڵو سامانیانی بەتاڵان دەباو خوێنیان دەڕێــژێ و ئابرویــان دەبـا، ئەمــە خــوای گــەورە لــە کتێبــە بــەڕێزو ئازیزەکەیــدا ســنورو حــەدی دیــاریکردوە، جــا ئەگــەر ســوپایەکیان کۆکردەوە ئەوا بەرەنگار بوونەوە لە پێناوی پاراستنی قەدەغەکراوەکانی ئاینو موسڵمانان دەبێتە پێویــستی تــرین هــەرە پێداویــستی یــەکانی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە، یــا ئــەوەتا پیاوێکــە دەســتدرێژی دەکاتە سەر ئیمامێك لە ئیمامی موسڵمانان پاش ئەوەی یەك دەنــگ بوون لەسەریو چوونەتە ژێر گوێڕایەڵیەوە جا ئیتر کەم بن یا زۆر، ئەم کەسە بە دەقی قورئانی پیرۆز جــەنگی لەگــەڵ دەکــرێ: ﴿ فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي﴾ (الحجرات -٩) هیچ کەسێك بەوە لە یاخیەتی دەرناچێ تەنها بەوەی وا بانگەشە بکا کە ئیمامە یــاخود باشتــرو چوستو چالاکترە، یاخود بــەوەی کۆمــەڵێك لــە موســڵمانان شوێنی بکەون چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە لێــدانی گەردنی ئەو کەسەی کە دەیەوێ یەکڕیزی موسڵمانان پەرتەوازە بکات، پاش ئەوەی یەك دەنــگو کــۆك بــوون لەســەر کەســێك ئەمــەش لــە (صحیح)دا ســەلماوە، بــەڵی ئەگــەر یەکــەم کــوفری ئاشــکرای لـــێ بەدەرکەوت یاخود دەریخست کە ناتوانێ بە گرنگترین و لــە پێــشترین و گەورەترین پایە لە کاروبارەکانی ئیمامەت هەستێ کە پێشتر خستمانە

ڕوو ئەوا دووەم زۆردارو یاخی نیە .

لە (نیل الأوطار شرح منتقی الأخبار) ئەمەش زیاد دەکـاو دەڵـێ: (نابێ موسڵمان بایەخی ئەو پێشـــینە چاکانە کەم بکاتەوە ئەوانـەی لە خزمانی پێغەمبەرو بـەدەر لـەوانیش دژ بـە ئیمامـە زۆردارەکـان دەرچوون و ڕاپەڕیون، ئەوان بە ئیجتهادی خۆیان بەو کارانە هەستاون، لە هەمان کاتدا زیاتر لە خوا ترساون‌و زۆرتر ملکەچ و گوێڕایەڵیان هەبووە بـۆ سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کۆمەڵە زانـاو خـاوەن زانـستانەی پاش ئەوان هاتوون، هەندێ لە زانایان‌و خاوەن زانستەکان و ئەوانـەی هاوڕایان بوون زیـادە ڕەویـان کـردوەو کەمتەرخـەمیان نوانـدوە لـەو فەرمودانەی لەم ڕووەوە هەن تا کار گەیشتوەتە ئەوەی حوکمی یـاخی بوون‌و زۆرداریان داوە بەسەر حوسەینی کچەزای پێغەمبەری خوا (خوا لێـــی ڕازی بێـــت)و ڕەزامەنـــدی کـــا، بـــەوەی لـــە دژی ئەتکـــەری قەدەغـــەکراوەکانی شـــەریعەت یەزیـــدی کـــوڕی موعاویـــە دەرچـــووەو ڕاپەڕیوە، ئای لەو سەرسامیەی لە گوتەو وتاری ئەو کەسانەدا بـەدی دەکرێ کە موچوڕکە بە لاشەی مرۆڤدا دێنێ !)[1]

هەروەها ئەم گوتارە لە ڕووی دیدو تێڕوانینەوە پارێزگاری کرد لەو کۆت‌و بەندانەی بۆ دەسەڵاتەکانی ئیمام دانرا بوو بەوەی دەبێ هەڵس و کەوتەکانی لە کاروباری ئومـــەت دا بـــەپێی ئـــەنجام دانـــی باشـــترین‌و تەواوترین‌و بەرژەوەندی ترین شتێك بێت بۆ خەڵکی، ئیمام بۆی نیە بە

(١) سەرچاوەی پێشوو.

پـــێی حـــەزو ئارەزوکـــانی هەڵس‌وکـــەوت بکـــا، قـــەرافی لـــەبارەی ڕونکردنەوەی هەڵس‌و کەوتـــەکانی ئیمـــام‌و ئـــەوەی جێبـــەجێ دەبـــێ‌و جێبەجێ نابێ ووتویەتی: (بەشی یەکەم: ئەوەی ولایەت لـە بناغـەدا تاوتوێی ناکات: بزانە هەرکەسێ بـوو بـە کاربەدەسـتی خەلافـەت‌و خـوارتر تاگرتنـە دەسـتی وەسـیەتێك، دەبێـت هەڵس‌وکەوتـەکانی بەرژەوەندیەك بهێنێتە دی یاخود خراپەکاریەك دوور بخاتەوە، لەبەر ئەو فەرمودەیەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَقْرَبُوا مَـالَ الْيَتِـيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (الأنعام: ١٥٢) بە باشترین شێوە نەبێ نزیکی سامان‌و دارایی هەتیوو مەکەون‌و بێهودە بە فیـرۆی مـەدەن، وە لەبـەر ئـەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت: ((مـن ولـي مـن أمور امتي شيئاً ثم لم يجتهد لهم ولم ينصح، فالجنة عليه حرام))، واتە: هەرکەسێ شتێك لە کاروباری موسڵمانانی پێ بسپێردرێ پاشان بۆیان تێنەکۆشێ‌و ئامۆژگارییان نەکات، ئەوە بەهەشتی لێ حەرامـە، بـەم شێوەیە پێشەواو کاربەدستان دەبێت خۆ دوور بگرن لە هەرشتێك کـە هەوڵدان‌و تێکۆشانی تیادا نیە.

(مرجوح)یش هیچ کات (احسن) نیە، بەڵکو دژێتی، خۆ خـەریك کردن بە شتە کەم سود (مرجوح)ەکانەوە، بەخشینی هەوڵ‌و تێکۆشان نیە بەڵکو دژەکەیەتی، هەر بۆیە خوای گەورە نەیهێشتوە راپەڕێنـەرو جێبەجێکاری راسپاردە هەڵس‌وکەوتێك بکەن بەدەر بێ لـە باشـترین مـامەڵەو هەڵس‌وکەوت، لەگەڵ ئەوەی بەرژەوەندی کـەم‌و بێنرخـشیان

لە دەست دەچێ بەبەراورد لەگەڵ کاربەدەستو قازییەکان، باشتر وایـە لەو رووەوە (حجر) بخرێتە سەر کاربەدەستو قازییەکانیش، نـاوەڕۆکی ئەم دەقانەش ئەوە دەخوازن هەموو لایەك خۆ دوور بگرن لـە خراپـەی گەورەو بەرژەوەندی کەمو بێبایەخو ئەو شـتانەی بەرژەوەنـدیو زیـانی وەکو یەکەو یەکسانە چونکە ئەم چوار بەشە لە بواری باشترین (ما هو أحسن) نیـە، کاربەدەسـتی (الولایـة) تـەنها بـۆ بەدەسـت خـستنی بەرژەوەندی تەواوو لاسەنگەو وە بۆ دورخستنەوەی خراپەی تەواوو یاخود پارسەنگە، ئەم چوار ئیعتبارە هەیەو ئەو چوارەی تر نزمو بێ نرخە.

بۆ ئەم ڕێسایە شافیعی (خوای لـێ رازی بێت) فەرمویەتی: نابێ جێبەجێکاری راسپاردە (وصی) ساعێك بە ساعێك بفرۆشێ، چـونکە هیچ کەڵکی تیادا نیە، خەلیفەش نابێت لە سامانی موسـڵماناندا وا بکات، پێویستە فەرمانڕەوا لەکار خرێ ئەگەر گومانی لەمەدا هەبوو، وەك ڕێگری کردنی خراپیەکانی گومانو دوو دڵی بۆ سەر موسڵمانان، کەسی لاوازو بێهێز لە کـاتی بـوونی بـەهێزو پارسـەنگ دا لـەکار لادەبـرێ، لـە پێنـاوی بەدەسـت هێنـانی بەرژەوەنـدی موسـڵماناندا، سەبارەت بە لەکار خستنی دوو کەسی وەکیەك جیاوازی هەیە).[1]

ئیمام بۆی نیە قازی باشو شیاوتر لەکار لاداو کارەکە بسپێرێ بـە کەسێکی خوارتر، چونکە هەڵسوکەوتەکانی ئیمام بەسەر خەڵکیـەوە

---

(١) (الفروق) ی (قرافی ٧٨/٤) سەیری (قواعد الأحکام)ی (عزالدین بن عبدالسلام) (٦٩/١) بکە.

گریّ دراوه به بەرژەوەندییەوە، لەکار لادانی قـازی بـاش‌و شـیاوتر بـه پێچەوانەی بەرژەوەندییەوەیـه، هەربۆیـه لەکارخـستنەکەی جیٚبـەجیٚ ناکریٚ، ئەبو یوسف قازی هارونە رەشید لە کتێبی (الخراج)دا کـه بـۆ ئەوی دانابوو تاوەکو دەسەڵاتەکانی ئیمامی تیادا دەستنیشان بکـات‌و روونی بکاتەوە کە هەڵس‌و کەوتەکانی ئیمام گریّ دراوی بەرژەوەندییە، لەوێدا دەڵیٚ: (ئەگەر کاربەدەست زەویەك لە یەکێك وەربگریٚ‌و بیداتە یەکێکی تر، ئەمە وەکـو داگیرکـەرو زەوتکـار وایـەو هـی کەسـێکی داگیرکەر داویەتی بە کەسێکی تر، ئیمام بۆی دروست‌و رەوا نیە مافی هیچ کەسیٚ لە خەڵکی داگیر بکات نە هی موسڵمان‌و نە مافی کەسی پەیمان پیٚدراو (معاهد)، هیچ شـتێك لەوانـه لـه دەسـتی دەرناچـیٚ مەگەر لەو شتەدا مـافێکی هەبیٚ‌و لەسەری بێت، وەرگرتنەکـەی بـەو شێوەیەیە کە بۆی دانراوە).[1]

هەروەها وتویەتی: (ئیمام بۆی نیە هیچ شتێك لە دەسـتی کـەس دەربهێنیٚ مـەگەر بە مـافێکی سەلماوی زانراو).[2]

هەروەها وتویەتی: (هیچ کەسیٚ بۆی نیە شتێك بەدی بهێنـیٚ لـه ریٚی موسڵماناندا کە زیانیان پیٚبگەیەنیٚ، ئیمامیش بۆی نیە شـتێك لە رێی موسڵماناندا لابەریٚ‌و نەیهێڵیٚ ئەگەر بە زیان دەگەرایـەوە بـۆ سەریان، ئەوەی بۆ نیـه، ئەگـەر ئیمـام ویـستی راسـته شـەقامێکی

(١) الخـراج، ل (٦٠).

(٢) الخـراج، ل (٦٥-٦٦).

موسڵمانان بدا بە کەسێك کە بینای لەسـەر بکـات، ڕێگـای گـشتی بگۆڕی بە نزیك یان دوور لەوە، بۆی نیەو دروست نیـە ئـەوەی پێبـدا، ئیمام گوناهبارە ئەگەر شتی وا بکات).[1]

هەروەها ئیمام بۆی نیە دەستکاری ڕووبارەکان بکات بە هەڵکەندن یاخود پڕکردنەوە مەگەر بەرژەوەندی گشتی تێدا بێت نەك تایبەتی.[2] ئەمەش جێی یەك دەنگی نێوان زانایانی هەموو ڕێبازەکانە.

هەروەها ئەم گوتارە پارێزگاری لە چـەند گرەنتییـەکی دادوەریانـە کردووە بۆ پاراستن‌و بەرگری کردن لە مافو ئازادی تاکەکان، هەروەك دەبینین ئەمە لە کتێبەکانی شەرعدا بە درێژی لە تـەواوی بابـەکانی (المعاملات)و (الدعاوی)و (القضاء)دا باسی لێوەکراوە، ئەبو یوسفی قازیش لەبارەی ڕوونکردنەوەی ئەو گرنتییە دادوەریانەوە نوسـراوی بـۆ هارونەرەشید نوسیوە لەوانەی پێویستە ئیمام‌و والی پابەندی بن‌و کاری پێ بکەن، لەوانە:

١- قەدەغەبوونی بەندکردن، یا ئەشـکەنجەدانی تۆمـەتبار لـە ڕووی ماددی‌و مەعنەویـەوە، چـونکە ئەسـڵ پـاکی‌و خاوێنیـە تـاوەکو تۆمەتی لەسەر دەسەلمێ، دان پـێدان‌و ئـیعتراف کردنـێ کـە لـە بەرەنجامی زۆرلێکردن‌و ناچارییەوە بێت کاری پێناکرێ‌و وەرناگیرێ، وە نابێ بەند بکرێ.

(١) الخـراج، ل (٩٣).

(٢) الخـراج، ل (٩٣).

ئەبو یوسف فەرمویەتی: (هەر کەسێ گومانی پێبرا، یاخود تۆمەتبار کرا بە دزینێ یا هەرشتێکی تر نابێت تەمبێ بکرێ بە لێدان‌و هەڕەشەو ترساندن، چونکە ئەگەر کەسێك دان بنێ بە دزیەك یـاخود حـەد یـا کوشتنێ لە بەرەئەنجامی ئەو کارانەی پێ‌ی کراوە (لە لێدان‌و هەڕەشەو ترسان) ئەوا ئەو دانپێدانانەی بایەخێکی نیەو دروسـت نیـە دەسـتی ببڕدرێ، لەسەر ئەو دانپێدانانەی بگیرێ‌و تۆڵەی لـێ بسێنرێ .

ئەبو یوسف دەفەرموێ شەیبانی لە عەلی کوڕی حەنزەلەوە ئەویش لە باوکییەوە پێمی راگەیاند کە فەرمویەتی: عومەر (خوای لێـرازی بێت) فەرموویەتی: (پیاو ئاسایش‌و هێمنی پێ نەبەخـشراوە، ئەگـەر ئازاری بدەی یا بیترسێنی یا بەندی کەی بەمەش ئیقرار لەسـەر خـۆی بکات) .

فەرمووی: موحەمەدی کوڕی ئیسحاقی زوهری هەواڵی پێداوم کە: تارق لە شامەوە پیاوێکی هێنابوو بە تۆمەتی دزی کـردن گـیرا بـوو، لێی دا، ئەویش یەکسەر دانی پێدانا، ناردیان بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عومەر (خوایان لێ رازی بێت) پرسیاری ئەوەی لـێ بکەن، عەبدوڵای کوڕی عومەر فەرموی: (دەستی نابڕدرێ چونکە ئەمـە پـاش لێـدان دانی پیادا ناوە) .

ئەبو یوسف بە هارونەرەشید دەفەرموێ: ئەی میری بـاوەڕداران بـە کاربەدەست‌و والی یەکانت بڵێ خەڵکی بە تۆمـەت نەگـرن: پیاوێـك دێت بۆ لای پیاوێکی تر (واتە کاربەدەست‌و والیـەك) و دەڵـێ: ئەمـە

تۆمەتباری کردووم بە دزیەك کە لێیم کردوە، ئەویش فـەرمان دەدات لەسەر ئەوەو شتی تریش بیگرن، ئەم شێوە کارکردنــە دروســت نیــە، دروست نیە دەعوای کەسێك لەسەر کەسێك بە کوشتن یا دزی پەسەند بکرێ، وە نابــێ حــەدی بەســەردا پیــادە بکــرێ مەگــەر بەڵگەیــەکی دادپەروەریانەی هەبێت، یاخود بــەبێ هەڕەشــەو ترســانێکی والی بــەو شێوەیەی بۆتم باس کرد خۆی دانی پیادا بنێ، دروستو ڕەوا نیەو نابێ پیاوێك بە هۆی تۆمەتبارکردنیــەوە لەلایــەن کەســێکی تــرەوە بەنــد بکرێت، پێغەمبەری خوا بە هۆی تۆمــەتو دەم هەڵبەســتەوە کەســی نەدەگرت، بەڵکو پێویستە داواکار و تاوانبارکراو کۆبکرێتەوە، ئەگەر بەڵگەی هەبوو لەسەر بانگەشەکەی ئەوا حــوکمو بڕیــاری بــۆ دەدرێ، ئەگینا تاوانبار کراو کە فیلو دەستەبەریەکی لێ وەردەگیرێو ڕێی پێ دەدرێ بڕوا، مەگەر تاوانبار کراو خۆی شــتێك ڕوون بکاتــەوە ئــەگینا هیچی لەگەڵ ناکرێ، بە هەمان شێوە هەمان ڕەفتار لەگــەڵ هــەموو ئەو تۆمەتبارکراوانەی لە بەندیخانەدان لەگــەڵ خــۆیو نەیاریەکەیــدا دەکرێ، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زۆر شوێندا خۆیان لە حــەد لێدان پاراستوە وە بە باشو خێریان داناوەو بەهۆی گومانێکەوە پیادەی نەکەن، تا ئەوەی بەوکەسەیان ووتوە کە لەســەر دزی هێناویانــە ئایــا دزیت کردووە؟ هەر خۆیان پێیان ووتوە بڵێ نەخێر .

ئەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکیان بــۆ هێنــا پــێی ووتــرا

ئەمە شەملەیەکی(*) دزیوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بڕواناکەم دز بێت)

سوفیانی کوڕی عوەینە لە (یەزیدی کوڕی خصیفە)وە لە موحەمەدی کوڕی عەبدولرەحمانی کوڕی سەوبانەوە هەواڵی پێداوین، کە پیاوێك شەملەیەکی دزی بوو گەیاندیانە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: (ما إخاله سرق، اسرقت؟) وانازانم دزی کردبێت، دزیت کردووە؟.

ووتویەتی(**) (سعد بن أبو عروبة) لە (عليم الناجي)ەوە ئەویش لە (أبو المتوكل)ەوە هەواڵی پێداوم کە دزێکیان بۆ ئەبو هورەیرە هێنا، لەو ڕۆژەدا ئەو ئەمیر بوو، فەرمووی: (دزیت کردووە؟ بڵێ: نەخێر. دزیت کردوە؟ بڵێ، نەخێر).

ووتویەتی: کوڕی جورەیج لە (عطاء)ەوە هەواڵی پێداوم کە پیاوێکیان هێنا بۆ لای عەلی (خوالێی رازی بێت) دوو پیاو شایەتیان لەسەری دا کە دزی کردووە، فەرمووی: علی هەندێ شتی خەڵکی تاوتوێ کردو پاشان هەڕەشەی لە شایەتیدانی درۆ کرد، وە فەرمووی: هەر شایەتێکی درۆزن بهێنن بۆ لام واو وای لێ دەکەم، پاشان داوای لە

---

(*) (شملة) بریتیە لە کالا، بەرگی فراوان بۆ خۆ پێچانەوەو داپۆشین، سەیری فەرهەنگی شیرین ل (٣٥٨) بکە وەرگێڕ.

(**) قال: وتویەتی، دەگەڕێتەوە بۆ قسەی (ابو یوسف) کە بە هارونە ڕەشیدی دەڵێ (وەرگێڕ).

دوو شایەتەکە کرد، بەڵام نەیبینیەوە بەمەش پیاوەکەی بەردا).[1]

٢-گەڕانەوەی دانپێدانەر لە دان پیادانەکـەی بـە گومانێـك دادەنـراو دەبووە هۆی ئەوەی حەدی لێ نەدرێ و ڕزگاری بێت لێی .

ئەبو یوسـف دەڵـێ: (هەرکەسـێ دان بنـێ بـە دزییەکـدا کـە هاوێنەی ئەو حەدی لێ بـدرێ یـا عـەرەقی خواردبـێ یـا حـەدی زینایەکی بکەوێتە سەر بەو کارەشی پێویست بێ حەدی لـێ بدرێ، بەڵام پەشیمان بویەوە لە دانپێدانانەکەی حەدی لـێ نادرێ).[2]

٣- خـەرجی کێـشی بەنـدکراوەکان و دەسـت خـستنی پێداویـستییە زەروریەکانیان و سوکایەتی پێ نەکردنیان .

ئەبو یوسفی قازی دەڵێ: (ئەوەی تۆ پرسـیارت کـردوە ئـەی مـیری باوەڕداران سەبارەت بە بێئابڕوو شەرواڵ پیسان و خراپەکارو دزیکاران، کاتێـك ئەگـەر گـیران لەسـەر تاوانـەکانیان و بەنـدکران: ئایـا خواردەمەنیان لـە بەندیخانـەدا پـێدەدرێ؟ ئـەوەی پێیـان دەدرێ لـە سەدەقەیە یاخود بەدەر لە سەدەقەیە؟ وە چ ڕەفتارو کارێکیان لەگـەڵ بکرێ .

ئەبو یوسف دەڵێ: پێویستە بۆ هەرکەسێ ئەو بارەی ئەوانی هـەبێ ئەگەر شتێکی نەبێ لێی بخوا، سامانی نەبێ وە شتێکی نەبێت خـۆی پێ بژێنێ، ئەبێ لەسەدەقە یاخود لە خانەی سامان پێیان بـدرێ، لـە

(١) الخراج، ل (١٧٥-١٧٦)

(٢) الخراج، ل (١٦٩)

هەر ڕوویەکیەوە بیکەی‌و هەرکامیان بکەی فراوان‌و والآیە بۆت، پـێم باشترە لە خانەی سامان بەپێی پێویستیان بۆ هــەر یەکـەیان دابینــی بکەی، چونکە جگە لەمە هیچ شتێکی ترو بارێکی تر دروست نیە.

ووتویەتی: دیلی هاوبەش پەیداکەران پێویستە خۆراکی بـدرێتێ و چاکەی لەگەڵدا بکرێ تا بڕیاری لەســەر دەدرێ، ئــەی کەواتــە چــۆن دەکرێ پیاوێکی موسڵمان هەڵە یا گوناهی کردبێ، بهێڵرێ لــە برسـا بمرێ؟

ئەوەی ئەمڕۆ پێی گەیشتوە هۆکارەکە قەزا یــا نەزانیــە، بــەردەوام خەلیفەکان —ئەی ئەمیری باوەڕداران — پێداویــستی بەنــدکراوەکانیان دابین کردووە لە خواردن و پێخۆریان‌و لە جل‌و بــەرگیان لــە زســتان‌و هاویندا، یەکەم کەسیش ئەوەی کردووە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بــووە — خوا ڕێــزداری کــا- لــە عێــراق، پاشــان موعاویــەش لــە شــام دا کردویەتی، پاشتریش خەلیفەکانی دوای ئەویش کردویانە.[1]

ئەبو یوسف دەنوسێ عەلی کوڕی ئەبو تالیــب ئەگــەر هۆزێــك یــا خەڵکێك پیاوێکی خراپەکارو ڕەوشت نزمی هەبوایــە بەنــدی دەکــرد، ئەگەر سامانی هەبوایە لە سامانی خۆی خەرجی خۆی پێدەکرد ئەگەر سامانی نەبوایە لە خانەی سامانی موســڵمانان خــەرجی دەکێــشا، وە دەیووت، زیان‌و خراپیەکانی ئەوەیان لــێ دوور دەکەوێتەوەو لە خانەی

---

(١) پێش ئەوە بەندیخانە هەر نەبووە.

سامانی خۆیان خەرجی دەکرێ.

وە دەنوسێ: هەندێ لە مامۆستاو شێخەکانمان لە جەعفەری کوڕی بەرقانەوە هەواڵیان پێداوین، وتویەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بۆی نوسیوین: (هیچ کەسێ لە موسڵمانان لە بەندیخانەتاندا بە دەستو پێ بەستراوی بەجێ مەهێڵن، بە شێوەیەك نەتوانێ بە پێوە نوێژ بکات، هیچ کەس بە کۆتو بەند کراوی بەجێ مەهێڵن مەگەر خوێنی لەسەر بێت، لە سەدەقە بەشیان بدەن لەو خۆراکو پێ خۆرانەی بەکەڵکیان دێ، والسلام).تۆش ئەوەندە خواردنو پێخۆریان بۆ ببڕەوە کە بەشیان دەکات، ئەوەش بگۆڕە بیکە بە چەند ژەمێك کە مانگانە بۆیان خەرج بکرێو پێیان بدرێ ئەگەر نانیان پێ بدەیت ئەوا کاربەدست وپاسەوانو بەردەستی یەکان دەیبەن ئەو کارە بدە بەدەست کەسێکی خێرخوازو چاکەخواز کە ناوی ئەوانەی لا بێت کە لە بەندیخانەدان تاوەکو سەدەقەیان پێ بدرێ و بۆیان خەرج بکرێ، ناوەکان لای ئەو بێت، مانگانەش ئەوەیان پێ بدات، دانیشێ ناوی یەك یەکیان بڵێو بانگیان بکاتو بیداتە دەستی خۆیان، هەرکەسیان ئازاد کرابوو وە بەردرا بوو ئەوەی پێی دەدرا دەگەڕێتەوە، هەر کرێکارێکیش مانگانە دەدەرهەمی پێ بدرێو هەرکەسێ لە بەندیخانەدا بێ مەرج نیە مووچەی بدرێتێ، جلوبەرگیان لە زستاندا بریتیە لە کراسو جلو بەرگێکی ئاوداماو پۆشتە، لە هاوینیشدا کراسو پۆشـەنیەکی تر، هەمان شت بۆ ئافرەتیش دەکرێ، لە زستاندا کراسو سەرپۆشو

جل‌وبەرگێکی ئاودامان‌و پۆشەنی، لە هاوینشدا کراس‌و پۆشـەنیەك‌و سەرپۆشێك، مرۆڤەکان دانەمالڕاون لـە گونـاهو تـاوان، ئـەحوالّیان بپرسەو فەرمان بدە خەرجیان بۆ بکرێ بەو شێوەیەی بۆتم روون کردەوە، هەرکەسیان مرد سەرپەرشتیارو خزم‌و کەس‌و کاری نەبوو، دەشـۆرێ‌و لە خانەی سامان کفنی بۆ دەکرێ، نوێژی لەسەر دەکرێ‌و دادەپۆشرێ، ئەگەر فەرمان بدەی بە پیادەکردنی حدودەکان بەند کراو کەم دەبێـت، خراپەکارو شەروالّ پیسیان کەم دەبێتـەوە وە واز دەهێـنن لـەو بـارەی تیایدااین، بەندی بۆیە زۆر دەبێ چـونکە زۆر بەکـەمی کـەس بۆیـان دەڕوانێ‌و لە بارودۆخیان دەپرسێتەوە، بەڵکو تەنهـا گیــــراوەو کـەس لـــێی ناپرســێتەوە، فـەرمان بـدە کاربەدەسـتەکانت هـەموو ڕۆژێ بپرسنەوە لە بەندکراوەکانیان هەر کەسە پێویستی بە تەمێ‌و ئـەدەب بوو تـەمبێ بکـرێ‌و بـەرەڵا کـرێ، هەرکەسـەش کێشەیەکی نـەبوو بەردەمی واڵاکرێ و بەردرێ، پێیان بڵێ با لە تـەمێ کـردن‌و ئـەدەب داندا زیادەڕەوەی نەکەن.

لەوەدا سنور بەزێنی نەکەن تـارادەی کـاری نادروسـت و نەشـیاو چونکە پێم گەیشتووە ئەوان لە تۆمەت‌و تاوانێکدا سێ‌سەدو دووسەدو کەم‌و زیاتریان لێ داون، ئەمە نەدروستەو نەبەرگەی دەگیرێ، جەستەو پشتی باوەڕدار پارێزراوە، مەگەر مافێکی واجب بووی لەسەر بکـەوێ لەسەر شەروالّ پیسی کردنێ یـاخود تۆمـەت هەڵبەسـتن یـا عـەرەق خۆریەك بێت، یا تەمێ‌کردنی لەسەر شتێ کە حەدی لەسەر پێویست

نـــەبێ، لەســـەر ئـــەو شـــتانەش(*) لێـــدان نیـــە، هـــەروەها بیـــستومە کاربەدەستەکانت لە خەڵك دەدەن، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرهەڵـستی ئەوەی کردووە لە نوێژ خوێن‌و نوێژکەران بدرێت .

مانای ئەو فەرمودەیە لای ئێمە - خـوا زانـاترە - بریتیـە لـەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کـردوە لـەوەی لێیـان بـدرێ بـێ ئـەوەی حەدێکیان لەسەر واجب بێت، کە شایستەی لێدانیان بکـات، ئـەوەی پێمان گەیشتوە کە کاربەدەست‌و والیەکانی تۆ دەیکەن نە حوکم‌و نـە پیادەکردنی حدودەکانیشە، شتی وا لەســەر خراپـەکار پێویـست نیـە پیادە بکرێ تاوانەکەی گەورە یا بچوك بێت، هەرکەسیان شتێکی کرد پێویست بوو لەسەری تۆڵەی بدات یا حەدی لـێ درێ یا تەمبێ بکرێ تاوانەکەی گەورە یا بـچووك بێـت، هەرکەســەیان شـتێکی کـرد کـە پێویست بوو لەسەری تۆڵەی بدا یا حەدی لـێ بدرێ یا تەمبێ کـرێ ئــەوە دەبێــت ســزاکەی بەســەردا پیادەبـێ، بەهــەمان شـێوە ئەگـەر کەسێکیان برینداریێەکی وای کردبوو کە تۆڵەسەندنەوەی تیادا ئەنجام دەدرا، بەڵگەشی لەسەر بـوو، لێـرەوە برینەکـەی دەپێـورێ و تۆڵـەی لـێ‌دەکرێتەوە مەگەر خاوەن ماف لێی ببورێ ئەگـەر نـەدەتوانراو بـە شێوەیەك نەبوو تۆڵەی لـێ بکرێتەوە ئەوا بڕیاری بریتیەکـەی دەدرێ‌و بەنــدکردنی درێــژ دەکرێتــەوە تــاوەکو پەشــیمان دەبێتــەوەو پاشــان بەردەدرێ، بەهەمان شـێوە هەرکەسـیان دزییـەکی وای کردبـوو کـە

---

(*) ئەوانەی حەدیان لەسەر نیە وەرگێڕ

پێویستی بە دەست بڕین بوو دەبڕدرێ، لەراستیدا پاداشتی پیادەکردنی حدودەکان گەورەیە.[1]

زاناو فەقیهەکان بە گشتی کۆك بـوون لەسـەر ئـەو دەسـتەبەرییە دادوەریانە، (الضمانات العدلیة)و زیاتر لەوەش، هەر ئەمەش بوو بووە هۆی رێگری کردن -سەرەڕای سەربەخۆییو چاکەخوازی قازیەکان لە- بڵاوبونەوەی ستەم لە جیهانی ئیسلامیدا بەوشـێوەیەی لـە ئـەورووپادا بـەدی هـات کـە مرۆڤـە ئازادەکانیـان دەکـردە کۆیلـە لەبەرئـەوەی نەیاندەتوانی قـەرزەکانیان بدەنـەوە، وەلـەوێ دەرەبـەگی بڵاوبویـەوەو خەڵکی لە مافی موڵکداری بازرگانیو گواستنەوە بێبەش کرا بوون.. هتد. دابینکردنـی ئەوانـەش دوای شۆڕشـی فەرەنـسی سـاڵی ١٧٨٩ بەدەستکەوتەکان دادەنرا، کەچی جیهانی ئیسلامی بە شتی لەو جـۆرە ئاشنا نەبوو .

لەکاتێکدا جیهانی ئیسلامی دیاردەی زۆرداری و تاکڕەوی سیاسیو خراپی دەسەڵاتی بەخۆوە بینی، لە تواناداد هەبوو بەرەنگاری ئـەو بـارە بکـرێ ئەگـەر بنـەماو ڕێـساکانی گوتـاری سیاسـی تـەئویل کـراو نەهاتایەتە ئاراوە، کە بووە ڕێگـر لەبـەردەم ئـەو چاکـسازییەدا، بـە بیانوی ئەوەی سونەت داوای گوێڕایەڵیو ملکەچی (السمع والطاعـة) دەکات دەسەڵات هەرچەندە لادەرو خراپەکاریش بێـت، یـا هەرچـەندە

---

(١) الخراج، ل (١٤٩-١٥١) بڕوانە ئـەو زامنیو دەستەبەریانەی کە (قاضـی القضـاة)ی سەدەی دووەمی کۆچی تەئکیدیان لەسەر دەکاتەوە!

وازی هێنابێ لە کارو ئەرکەکانی خۆیشی نمونە پاراستنی ڕووســوری‌و سەربەرزی موسڵمانان‌و بە پایـان گەیانـدنی بیروبـاوەڕو پیـادەکردن‌و بەداوەری کردنی شەریعەت؟!

هەر کە ئەم بیروباوەڕە لە نێو زانایانی ئومەت‌و گشتینەی خەڵکیدا بڵاوبویەوە، تادەهات لادانەکان جار دوای جار تۆزە تۆزە زیاد دەبوو، بێ ئەوەی کەسێك ڕووبەرووی دەسەڵات ببێتەوەو لێپرسینەوەی لەگەڵ بکاو بەرهەڵستی خراپەکاری یەکانی ببێتەوە، بەمەش حـوکم‌و بڕیارەکـانی شەریعەت وورده وورده لەکار خرا، خراپە کاری گەیشتە ئەوپـەڕی تـا کار گەیـشتە ئـەوەی زۆرێـك لـە پادشـاکان هاوپـەیمانێتیان لەگـەڵ دوژمـنانی ئیسلام دا دەبەست‌و وازیان لە جیهاد دەهێنا، موسڵمانانیش کەوتنە ژێردەستی فەرمانڕەوایەتی دوژمنەکانیانەوە، بەوشێوەیەی لـە ئەندەلوس دا ڕوویدا، لەوێ لە ڕیشە دەریانکردن، بەهۆی خراپەکاری‌و لێـك هەڵوەشـانی پادشـاکانیانەوە، وە بـە هـۆی ئـەوەی ئومـەت ڕووبەڕوویان نەدەبونەوە، بەمەش کارەساتەکە هەموویانی گرتەوە، لـە پاش چوارده سەدە لە کـەوتن‌و هەرەسـی دوا پادشـا لـە پادشـاکانی ئەندەلوس تەواوی جیهانی ئیـسلامی کـەوت‌و هەرەسـی هێنـا - بـۆ یەکەم جار لە مێژووی موسڵماناندا - موسڵمانان کەوتنە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی داگیرکاری ئەورووپیـەوە، لەگـەڵ بـوون‌و هـەبوونی پادشـاو حکومەتەکان لـە هـەر وڵاتێـك لـەو وڵاتانـەی داگیرکـەر چـووبویە ناویەوە؟!!

داگیرکەرو ئیـستعمار هاتـە نێـو زۆربـەی وولاتانـەوە بـێ ئـەوەی رووبەرووی بەرەنگارییەکی وا ببێتەوە کە شایەنی باس بێت، بەڵکو بە ڕێکەوتن لەگەڵ زۆربەی پادشاکانی ئەو سەردەمەدا بەدی هات ؟!

بەردەوامیش زانایـان وایـان دەبینـی کـە گوێبیـستیو ملکەچـی ئەوپادشایانە پێویستە، لە گەڵ ئـەوەی واقـع تەئکیـد لەسـەر ئـەوە دەکاتەوەو ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە ئەوانە تەنها کاربەدەستێکی ژێـر دەسەلاتی داگیرکەرو ئیستعمارن، هەروەك چۆن خدێوی میسر لە ژێـر دەســەلاتی ئینگلیــزدا بــوو، وە سەنوســیش لـــە لیبیــا لـــەژێر فەرمانڕەوایەتی ئیتالیەکاندا بوو...هتد.

بەردەوام زۆربەی زانایـانی ئـەو سـەردەمە وایـان دەبینـی دەبێـت گوێڕایەڵیو مل کەچی ئەو پادشایانە بکرێ بێ ئەوەی هەست بکـەن کە وولات بووە بە وولات و خانەی کوفرو بێباوەڕی (دار الكفر)، هێزو دەسەلات هی دوژمنانە، فەرمانرەوای راستەقینە و بەرجەسـتە بریتـی بوو لە پادشای ئینگلتەرەو سەرۆکی ئیتالیاو فەرەنسا، نەك خدێوی و سەنوسی.. هتد.

زانــاو شــەرع زانــەکان ئیجماعیــان لەســەر ئەوەیــە هــەر زەویو زەمینەیەك هێزو دەسەلات هـی موسـڵمانان بـوو شـەریعەت تیایـدا فەرمان رەوا بێت، ئـەوە بریتیـە لـە خانـەی ئیـسلام (دار الإسـلام)، هــەروەها جیاوازیــەکی گەورەشــیان لــەوەدا نیــە کــە هــەر زەوی و زەمینەیەك، بە شـەرع فەرمانڕەوایـەتی تیـادا نـەکرێ، هێـزو قـسە

ڕۆیشتویی تیایدا بۆ موسڵمانان نەبێت، ئەوە بریتیە لە خانەی کوفرو بێ باوەڕی (دار الكفر)[1] تەنانەت ئەگەر موسڵمانیش تیـادا زۆرینـە بن، هەروەك باری زۆرینەی دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامی لەو ماوەیـەدا وابووە، ئەوە بوو شەریعەت لەکار خرا، هێزو قسە ڕۆیشتویی بۆ داگیر کەر و ئیستعماری ڕۆژئاوایی بوو .

لە ڕاستیدا داگیرکراویی‌و هەرەس‌و کەوتن سەرەنجامێکی سروشـتی ئەو نەتەوەو ئومەتانەیە کە بارودۆخی سیاسی‌و فیکری تیایدا دەگاتە ئەو ڕادەیـەی کـە باسـکرا لـەو کاتـەی جیهـانی ئیـسلامی کەوتـە ژێردەستی جیهانی ڕۆژئاواییەوە قۆناغی گوتاری سیاسی تەئویل کراو لەسەر زەمینەی واقع کۆتای پێ هـات‌و سـەرەتای قۆنـاغی سـێهەم دەست پێدەکات، کە بریتیە لە قۆناغی گوتاری سیاسی گۆڕێنراو کە بەرەئەنجامی شکستی فیکری‌و سیاسی‌و سەربازییە لە بەرامبەر ئـەو هێـزە داگیرکـەرە ئیـستعماری‌یـەی دەسـتێکی بـاڵای هـەبووە لـە دروستکردنی ئەم گوتارە نوێیە ؟!

(١) سـەیری المدونـة (٢٢/٢)و بـدائع الـصنائع (١٠٣/٧) والانـصاف (١٢١/٤) والـسيل الجرار (٥٧٥/٤) و تفسير المنار (٣٦٨/١٠ - ٣٦٩) بکە.

له کاتێکدا ئەگەر گوتـاری تـەئویل کـراو لـە قۆنـاغی دووەم دا پارێزگاری کردبێ له هەندێ له بنەماکانی گوتاری دابەزێنراو - وەکو بە پایان گەیاندنی بیروباوەڕ لـە ڕێی حـوکم کـردن بـە شـەریعەتو پارێزگاری لێکردنی، وە پاراستنی ئومەت لە ڕێی هەستان بە جیهادو بەرگری لـێ‌کردنی، وە پارێزگاری کردن لـە پلـەو پایـەی خەلافـەت، تەنانەت ئەگەر ڕوکاریش بێت بەو پێیەی ڕەمزی یەکێتی ئومەت بـوو - له ڕاستیدا گوتاری قۆناغی سێیەم تەواوی ئەوانەی تێپەڕانـد، لـە قۆنـاغی دووەمـەیش دا وورده ووردەو لەسـەرخۆ دەسـتکرا بـوو بـە پاشەکشێ لەو بنەمایانە، تاوەکو لادانەکە لە کۆتایی‌و دوادواییەکانی سەردەمی عوسمانیدا گەیشتە ترۆپك‌و لوتکە ئەویش بە هێنانی یاسـا دانراوە مرۆڤـ کردەکان لە ئەورووپاوە پاشان بەوەی ئومەت بـە تـەواوی کەوتە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرو ئیستعماری ڕۆژئاوایی‌یەوە، ئەوە بـوو ئەم بارە نالەبارەو ژانداره گوتاری سیاسی شەرعی گۆڕێنراوی لـێ لـە دایك بوو، کە لـە دەرکـەوتنی کتێبـی (الاسـلام واصـول الحکـم) — (ئیسلام‌و بنەمـاکانی فەرمانڕەوایی) شـێخ عەلی عەبدوڕازق‌و پاشـان بە پشتگیری شێخی ئەزهەر شێخ مەراغی دادەردەکـەوێ، تـاوەکو بـە تـەواوی شـەرعیەت ببەخـشـێتە ئـەم گوتـارە نوێیـەی بانگەشـەی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و هەڵوەشانەوەی قەزای ئیسلامی دەکرد، بە بیـانوی ئـەوەی ئیـسلام بنـەماکانی فـەرمانرەوایی‌و سیاسـەت و

بەڕێوەبردنی ئومەتی تیادا نیەو نەیهێناوە ؟!

سەرەڕای ئەوەی زانایانی ئومەت لەو کاتەدا ڕووبەڕووی ئەو کتێبە بوونەوە شەن‌و کەوی ئەو بیروبۆچونەیان کرد کە تیایدا بوو، کەچی ئەو گوتارەی لەو کتێبەدا هاتبوو بووە ئەو گوتارەی خۆی سەپاند بەسەر زەمینەی واقع دا، دواتریش چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی و ناوچەیی وەها بەرپا بوو کە باوەڕی بە یەکێتی ئیسلامی نەبو؟! وەچەندین سستمی عەلمانی وەها بەدیهات کە باوەڕی بە شەریعەتی ئیسلامی نەبووەو دیدو بۆچونی وانەبوو کە پێویست بێ پیادە بکرێ؟! وە جیهادی بە واجب نەدەزانی لە پێناوی پاراستنی ئومەت‌و ڕێبازی ئایین دا؟!

وای لێهات ئەم سێینەو سێ کوچکەیەی (خەلافەت - شەریعەت - جیهاد)ە بووە شتێکی قەدەغەکراو لەسەر ئومەتی ئیسلامی لەو کاتەوەی داگیرکەر هاتە ناوەوە، ئەمەش دیارترین بنەماکانی ئەو ووتارە گۆڕێنراوەیە، ئەم گوتارە وازی نەهێنا بەو هەموو لادان‌و پاشەکشێیەی لە بنەماکانی گوتاری تەئویل کراوەوە بۆمان جێمابوو، بەڵکو شەرعیەتی پۆشیە بەر ئەم گوتارە سیاسیە نوێیە بەناوی ئاینەوە ؟!

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە ئاماژە بە سەرەتاکانی ئەو لادانە دەکات و دەڵێ: (هەروەها ئەمە لە زۆر گوتاری هەندێ لە کوفیەکان‌و دانراوەکانیاندا دەبینرێ، ئەگەر یەکێك کاروکردەوەی پێغەمبەر ﷺ بکاتە بەڵگە لەسەریان دەڵێن ئەوە وەك سیاسەت دەیکرد! پێیان دەوترێ ئەمە سیاسەتە: بەڵام ئەگەر ووتیان ئەوە

دروستە بۆمـان ئەوە شتێكى ڕەوايە و بریتیە لـە سیاسـەتى شـەرعى، ئەگــەر وتیــشیان ئــەوە دروســتو مەشــروع نیــە بــۆ ئێمــە، ئــەوە پێچەوانەكردنى سوونەتە، پاشان گوتەى ئەو كەسەى كە دەڵێ: ئەمــە سیاسەتە یا ئەوەتا مەبەستى ئەوەیە خەڵكى بـە شـەریعەتى ئیـسلام سیاسەت دەكرێنو بەڕێوە دەبرێن، یا ئەوەتا ئـەم سیاسـەتە بـەدەر لـە شەریعەتى ئیسلامە، ئەگەر قسەى یەكەم وترا ئەوە بەشێكە لە ئایین، ئەگەر دووەم وترا ئەوە هەڵەیە.

بەڵام سەرهەڵدانى ئەم هەڵەیە لە ڕێبازى كوفییەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ كەموكورتى و كەم شارەزاییان بە سیاسەتى پێغەمبەرى خودا ﷺو سیاسەتى خەلیفە راشیدیەكان. لە (صحیح)دا سەلماوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتى: (إن بني إسرائيل كان تسوسهم الأنبياء، كلما مات نبـي قام نبـي، وأنه لا نبـي بعدي و سـيكون خلفـاء يكثـرون) قالوا فما تأمرنا؟ قال: (افوا بيعة الأول فالأول، وأعطوهم حقهم، فـإن الله سـائلهم عمـا اسـترعاهم)) واتــە: ئیــسرائیلیەكان لــە لایــەن پێغەمبەرەكانیەوە كاروباریان بەڕێوەدەبراو سیاسـەت دەكـران، كاتێـك كە پێغەمبەرێك دەمرد یەكێكى تر دەهـات، لـە راسـتیدا دواى مـن پێغەمبەرى تر نایەت بەڵكو خەلیفەى زۆر دێن.فـەرمویان فـەرمانى چیمان پێ دەكەى؟ فەرمووى ئەمەكدار بن بە بەیعەتى یەكەمو یەكەم، مافەكانیان بدەن، خواش لـە بـارەى خـەڵكو رەعیەتەكـەیان لێیـان دەپرسێتەوە .

کاتێك خەلافەت کەوتە دەستی عەباسییەکانەوە و پێویستیان بە بەڕێوەبردنی خەڵکی هەبوو، وەهەندێ لە شەرعزانی عێراقیش قەزایان بۆ گرتنە دەست، ئەوەندە زانستەی پێیان بوو بەس نەبوو بۆ ئەوەی سیاسەتێکی دادگەرانەی پێ ئەنجام بدەن -تا لەوکاتەدا- پێویستیان بەوە هەبوو ویلایەتی مافخوراوییەکان (ولاية المظالم) دابنێن، کردیانە ولایەتی جەنگ نەك ولایەتی شەرع، کارەکە لە زۆرێك ولاتی موسڵماناندا گەورەبوویەوە، تاوای لێهات دەوترا: شەرع و سیاسەت، ئەمەیان نەیارەکەی بۆ شەرع بانگ دەکردو ئەویتریان بۆ سیاسەت، بۆ فەرمانڕەوایەك بە دروست دادەنرا کە بە شەرع فەرمانڕەوایەتی بکاو ئەویتریش بە سیاسەت.[1]

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی بەشەرعزان ناسراون، لە ناسین و شارەزایی سوننەت داکەمو کورتیان هەبوە، هەر بۆیە لە زۆرکاروباردا کاتێك کە فەرمان ڕەوایەتیان دەکرد چەندەها مافیان لە دەست دەداو چەندین حدودیان لەکاردەخست.

تا وای لێهات خوێن دەڕژاو سامانو دارایی دەبراو قەدەغەو حەرام کراوەکان بە دروست و موباح دادەنران، ئەوانەشی بە سیاسی دەناسران

(١) مەبەست لە سیاسەت لە قۆناغی دووەمدا، بریتیە لە هەر کارێك کە خەڵکی بەهۆیەوە لە چاکە خوازی و خۆشگوزەرانی نزیك بکاتەوە لە کاروباری ژیاندا هەرچەندە حوکمی شەرعیشی لەسەر نەهاتبێ نەك لە کار خستنی شەرع بە بیانوی سیاسەت وەك لە قۆناغی سێیەمدا ڕوویدا؟!

به جۆرێك له بیروبۆچون سیاسه‌تیان ده‌كردو كاروباریان ده‌برد بـه‌ڕێوه كه دوور بوو له پابه‌نـدبوون‌و ده‌ستگرتن بـه كیتـاب‌و سـوونه‌ته‌وه، باشترینیان ئه‌وه‌یان بوو به‌بێ حه‌زو ئاره‌زوو فه‌رمانڕه‌وایـه‌تیان ده‌كـردو بـه‌دوای دادگه‌ریـدا وێـڵ بـوون‌و زۆربـه‌یان بـه حـه‌زو ئـاره‌زوو فه‌رمانڕه‌وایه‌تیان ده‌كرد، به هێزو به‌رتیل، ئـه‌و جۆرانـه‌یان ده‌خسته پێشه‌وه‌و كاروباریان بۆ ئاسان ده‌كردن.

له هه‌مان كاتدا ئه‌و وڵاتانه‌ی ڕێبازی خه‌ڵكی مه‌دینه‌ی تیادا بـه ده‌ركه‌وت، جۆرێك له فه‌رمانڕه‌وایـه‌تی دادگه‌رانـه‌ی وای تیـادا بـه‌ده‌ر كه‌وت كه له شوێنانی تردا نه‌بوو، ئه‌وه‌ی به‌رپرسی جه‌نگی بوو، مـل كه‌چی زانایان بوو، له كاتێكدا ئه‌و شارو وڵاتانـه‌ی ڕێبـازی خـه‌ڵكی عێراق‌و شوێن كه‌وتوانی ئه‌وانی تێدا بووه، وه‌هـا نـه‌بووه، لای ئـه‌وان كاربه‌ده‌سته جه‌نگیه‌كان هه‌بوو كـه مـل كه‌چـی زانـاو شـه‌رع زانـان نه‌بوون، خوای گه‌وره‌ش له قورئانه‌كه‌یدا فه‌رموویـه‌تی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ﴾ (الحديد: ٢٥) پیاده‌كردن‌و راگرێتـی ئاین به كتێبێكی ڕێنمای كارو شیرێكی سه‌رخه‌ر به‌دی دێت ﴿وَكَفَى بِرَبِّكَ هَادِياً وَنَصِيراً﴾ (الفرقان: ٣١) لـه ئـاینی ئیـسلامدا ده‌بێـت شـیر (سیف) شوێنكه‌وته‌ی كیتـاب بێـت، جـا هـه‌ر كاتـێ شـاره‌زایی بـه كیتاب‌و سـونه بـه‌دی هـات‌و شـیریش شـوێنكه‌وته‌ی ئـه‌وبوو، ئـه‌وه كاروباری ئیسلام پایه‌داره، خه‌ڵكی مه‌دینه یه‌كه‌مین وڵات بوون لـه‌و رووه‌وه، لـه سـه‌رده‌می خه‌لیفـه‌كانی ڕاشـیدیندا كاروباره‌كـه ئـاوا

ڕۆیشتووە، بەڵام لە پاش ئەوان ئەوا بارەکە لاوازو سست تر بووە بـەڵام باشتر لەوانی تر، بەڵام ئەگەر شارەزایی بە کیتاب کەمو کورتی تیـادا بێت، شمشێریش جارێك لەگەڵی بێتو جارێك جیا بێت لێـی - ئـەوا ئاینەکەش بەو پێیە دەبێت ..

هەرکەسێ لەمەو هاوشێوەکانی تێبگا بۆی روون دەبێتەوە کە چۆن بنەماو ئەسڵەکانی خەڵکی مەدینە باشترین بنەمای خەڵکی ڕۆژهەڵات بوون بە شێوازێك نزیکیو ڕێژەیەکیوا لە نێوانیاندا نیە)[1].

هـەروەها فەرموویـەتی: ((گـشتینەی میرەکـان چـەند جۆرێـك سیاسەتی زۆردارانەیان داهێنا، لە وەرگرتنی سامانێك کە دروست نیە وەریگرنو جۆرەها سزادان لەسەر خراپەکارییـەکان کـە دروسـت نیـە سزاو ئەشکەنجەی تیـادا بـدرێ، چـونکە کەمتەرخـەمیان نوانـد لـە فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، ئەگینا دەگەیشتنە ئەوەی بەدروستی شتیان لە خەڵك وەربگرتایە و لە شوێنێکدا دایانبنایـە کـە شـوێنو جێگەی خۆی بوایە، بەمەش وێڵی بەرپاکردنی دینی خوایان مەبەست بوایە نەك سەرکردەیی خۆیان، حدودە مەشروعەکانیان پیادە بکردایـە لەسەر خانەدانو لانەواز، دوورو نزیك، هـەوڵیان بخـستایەتە گـەڕ بـۆ ئەوەی بە هاندانو ترسان ئەو دادگەرییەیان بەدی بهێنایە کـە خـوای گەورە دایناوە، ئا لەوکاتەدا پێویستیان بەوە نەدەبوو گومرگ دابنێنو

(١) مجموع الفتاوی (٢١/٢٩١-٢٩٣) خەڵکی ئەنەدەلوس و مەغریب لەسـەر ڕێبازی مالـك و بنەماو ئەسڵەکانی خەڵکی مەدینە بوون.

سزای زۆردارانە بدەن بەسەر خەڵکیداو پێویستیان بەوە نەدەبوو کـەس بیانپـارێزی لــە کۆیلــەو بەنــدەکان، بەوشــێوەیەی لــە ژیاننامــەی خەلیفەکانی راشیدین و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو کەسانی تر لە مێژی هەندێ لە هەرێمەکان بیسراوە.

بە هەمان شێوە زانایان ئەگەر کیتابی خوای گەورەیان بەرپاکردایەو تێبگەیشتنایە لەو روونکردنەوەو رێنمایانەی تێیدایە کە بریتیە لـە بەڵگەی خوایی‌و زانستی بە سوودو کرداری چـاك‌و بەکـەڵك، وە ئـەو داناییە خواییەیان پیادە کردایە کە خوای گەورە بـە پێغەمبەرەکەیـدا ﷺ هێناویێتی‌و بریتیە لە سوونەت‌و ڕێ‌و شوێنی ئەو، ئەگەر ئاوەهـا بەسەرنجەوە لێیان بڕوانیایە ئەوا، چەندەها زانست‌و زانیاری بەکەڵکیان تیادا دەبینیەوەو بە شێوازێك ڕەنگی دەدایەوە کە ڕۆڵـی هەبوایـە لـە دیسپلین زەبتکردنی گشتینەی خەڵکیدا، لـەو کاتـەدا کەسـی حـەق ویست‌و رەوا خوازیان لە ناڕەوا خواز جیا دەکردەوە، بەو پێیـەی خـوای گەورە ئەم ئومەتەی کردوە بە شاهید بە سەر خەڵکیدا، ئەوەتا خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِتَكُونُوا شُـهَدَاءَ عَلَـى النَّاس﴾ (البقرة: ١٤٣) بەمەش دەرباز دەبوون لەو بەڵگە هیچ‌و پوچانەی بیدعە چیەکان دایان دەهێنا بو، کە ئەهلی کەلامیش واگومان دەبەن بەو شێوەیە ئەسڵ‌و ڕێسای ئاینی پێ سەردەخرێ، وە بێ نیـاز دەبـوون لەو بۆچوونە بێکەڵکانەی پێوەرخوازەکـان وا گومانیـان دەبـرد چـڵ‌و

لقەکانی ئاینی پێ تەواو دەکەن.[1]

دیاردەی لادان لە سەردەمی مەملوکیدا زۆر بــە روونو ئاشــکرایی دەستی پێ کرد، ئەو ســەردەمەش بریتیــە لــەو ســەردەمەی شــێخی ئیسلام تیایدا ژیاوە، لە هەردوو سەدەی حەوتەمو هەشتەمی کۆچیدا، بەردەوام پاشەکشێ کەم کەم لە زیادبوندا بو تا کۆتاییــەکانی چــاخی عوسمانی .

لەراستیدا گوتــاری سیاســی شــەرعی ئیــسلامی بــە گوتــارێکی مرۆییانەی جیهانی دەستی پێکردو هەڵگری ئەو بنەما ئاسمانیە بــوو کە بانگەشەی دەکرد بۆ ئازادکردنی مرۆڤ لە کۆیلەیەتی مرۆڤ .

رزگارکردنیان لە بەندایەتی کردنی هەموو ئەو شتانەی بەدەرن لــە خوای گەورە: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ (آل عمران: ٦٤) بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان وەرن بۆ لای گوتارێــك کە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا یەکسانە ئەویش بریتیە لەوەی تەنها خــوای گەورە بپەرستینو هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەینو هەندێکمان هەنــدێکی تر بەدەر لە خوای گەورە نەکەینە خاوەن و پەروەردگار.

پێغەمبەری خــوای ﷺ پــەروەردگارێتی (الربوبیــة)ی لێــرەدا بــە واتایەك لێك داوەتەوە کە بریتیە لە ملکەچیو گوێڕایەڵیکردنی مرۆڤــ

(١) اقتضاء الصراط المستقيم، ل (٢٨١).

بۆ جگە لە خوا، ئەنگی لە خاوەن کیتابەکان گرتووە کە دەچن ئەحبارو رەهبانەکانیان بەدەر لە خوا دەکەنــە پــەروەردگاری خۆیــان: ﴿اتَّخَـذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابـاً مِـنْ دُونِ اللَّـهِ﴾ (التوبـة: ٣١) واتــە: بــە هــۆی گوێڕایەڵیو ملکەچی کردنیان بۆ حبرو راهیبەکان ئــەوانیان کردوەتــە پەروەردگاری خۆیان .

وە بانگەشەی یەکسانی کردووە لە نێوان هەموو خەڵکیدا، هەروەك خوای گــەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّـا خَلَقْنَـاكُمْ مِـنْ ذَكَـــــرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَـاكُمْ شُــــعُوباً وَقَبَائِـلَ لِتَعَـــارَفُوا إِنَّ أَكْـرَمَكُمْ عِنْـدَ اللَّـهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات: ١٣) وە تەئکیدی لەسەر رێزداری مرۆڤــ کردوەتــەوە هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الاسراء: ٧٠) لە راستیدا ئێمە مرۆڤــ و نەوەی ئادەممان رێزدار کردووە.

وە هەواڵی ئەوەی پێداوین کە کیتابو شەریعەت هەرهــەمووی بــۆ پیادە بوونی دادوەری هاتووە لە نێوان خەڵکیدا و هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ (الحدید: ٢٥) واتە: سوێند بە خوا بێگومـان ئێمە پێغەمبەرەکانمان رەوانەکردووە هاورێ لەگەل بەڵگەو نیـشانەی روون و ئاشکراو کتێبە ئاسمانیەکانیشمان هێنایـە خـوارەوە کـە لەگـەڵ ئـەو پێغەمبەرانەدا بێت، تـــــەرازوو پێوەری شەرعیو دادپەروەرانەمان بــۆ روون کردوەتەوە تا خەڵکی بە عەدالەتو دادپەروەری رەفتار بکەن.

کەواتـــە مەبەســـت لـــە شــــەریعەتو حوکمـــەکانی کیتـــابو

تەشـریعەکانی بریتیـە لـە: جێبـەجێ بـوونی دادپـەروەری لـە ڕێی ڕزگارکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتیو دەربازکردنی لە ملکەچی پادشـاو سەرۆكو روهبانو حبرو هەموو ئەوانەی بەدەر لە خوان، وە بەتـەنهاش گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ خوا دەربـڕدرێ چـونکە هـەموان تەنانـەت پێغەمبەران شتێك نین تەنها بەندەی خوا نەبێ، ئەو خوایەی شایستەی سوپاسگوزاریو گوێڕایەڵییە.

روبعی کوڕی عامر کاتێك دەچێتە لای ڕۆستەمی سەرکردەی سوپای فارسەکان بنەماکانی ئەم گوتارە دەردەبڕێ، سەبارەت بەو ئەرکەی کە بۆی هاتوونو ئەو پەیامە مرۆییەی هەڵیان گرتووە دەڵێ: (لە ڕاستیدا خوای گەورە ئێمەی نـاردووە بـۆ ئـەوەی بەنـدەکان دەربازبکـەین لـە کۆیلایەتی کردنی بەندە بۆ پەرسـتنی خـوای بەنـدەکان، وە لـە زۆرو ستەمی ئاینەکانەوە بیانگەیەنینـە دادگـەری ئیـسلام، وە لەتـەنگو تاریکی دونیاوە بیانبەین بۆ فراوانیو بەرینی دوا ڕۆژ).[1]

هەروەها (زهرە بن عبدالله الجشمی)ش هەمان شت دەردەبڕێ کاتێ کە ڕۆستەم سەبارەت بە ئاینەکـەی لێـی دەپرسـێ و ئـەویش دەڵـێ: (بریتیە لە شایەتی دان بەوەی هیچ پەرستراوێك نیـە جگـە لـە خـوا نەبێت وە موحەمەد نێردراوی خوایە، وەدان نان بە هەموو ئەو شتانەی لای خواوە هاتووە، وە ڕزگارکردنی بەندەکان لە بەندە بە پەرستیەوە بۆ

---

(١) سەیری (ابن جریر الطبري) (٢/٤٠١)، ساڵی (١٤)ك بکە.

خوا پەرستی، خەڵکی نەوەی ئادەم و حەوان و بـرای دایکـیو بـاوکین) ئەگەر موسڵمان بن ئەوا دەگەڕێنەوە، پێنانێنە زەوی زاریانەوە مەگەر بۆ بازرگانی یاخود پێویستی یەك).[1]

لــە راســتیدا گوتــارێکی مرۆییانــەی جیهــانی بــوو، هــەموو موسڵمانێکی ئەو سەردەمە بەشداری دەکرد لە هـەڵگرتن و بانگەشـە بۆکردنیدا، هەروەك لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: ((لأن یهـدي الله بك رجلا واحداً خیر لك من حمر النعم))[2] ئەگەر بە هۆی تۆوە خـوای گەورە کەسێك ڕێنمایی بکات باشترە بۆت لەوەی حوشتری سـورت پـێ بدەن .

هەموو ئەمەش بە مەبەستی ئازادکردن و ڕێنماییکردنی مرۆڤ و بەرپاکردنی دادپەروەری.

لە راستیدا دەوڵەت و ئومەت لە خزمەتی ئەم ئاینەو بنەماو ڕێسا مرۆییەکانیدا بووە، پاشان ئەم گوتـارە سـەری کێـشا - هـەروەك لـە گوتــاری گــۆڕێنراودا بــەدی دەکــرێ - بــۆ گوتارێــك کــە ســوڵتان و دەسەڵاتدار دەکاتە خوا یا نیوە خواو لێی ناپرسێتەوە لـەوەی ئـەنجامی دەدات، ئەوان لێپرسراون؟ فەرمان دەکاو گوێڕایەڵی دەکرێ، دەفەرموێ و هەموو ئومەت گوێبیستی گوتەکانین؟ زۆردارو خۆسـەپێنی دەکـار کەس وەڵام ناداتەوە؟ دەکوژێ و کەس تۆڵەی لێ ناسەنێتەوە؟ بـە پـێی

(١) ابن جریـر (٢/٤٠٠-٤٠١).

(٢) البخاري ف ژمارە (٣٧٠١) ومسلم ف ژمارە (٢٤٠٦).

ویستی خـۆی دەیبـاتو بـەپێی ویـستی خـۆی واز دەهێنـێ، پاشـان هەربەوەنەدەش واز ناهێنێ تاوەکو فەتوا دەرو موفتی یەکی بۆ راسـت دەکرێتەوەو ئایین دەخاتە خزمەتی دەسەڵاتو حەزەکانیانـەوەو وەگـەڕی دەخات بۆ خزمەتی ئەوان، وە شەرعیەت دەبەخـشێتە تـەواوی یـاخی بوونو لە سنور دەرچووەکانیان، تاوای لـێدێ ئومەتی ئیسلامی بست بە بستی شوێن پێی ئـەوروپای مەسـیحی هـەڵگرێ لـە سـەدەکانی ناوەڕاست دا، هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە: ((لتتبعن سنن من كان قبلكم)) واتـە: شـوێن پـێو هەڵسوکـەوتی ئەوانـەی پـێش خۆتـان هەڵدەگرن.

لە نێو موسڵمانانداا قەیسەر بەدی هات هەروەك ئەوان قەیسەریان هەبوو، وە پاپا پەیدا بوو، ئاینی دەخستە گەڕ بـۆ خزمـەتی دەوڵـەت هەروەك چۆن ئەوان پاپایان هەبوو، بـە نـاوی ئاینیـشەوە شـەریعەتی ئیسلام گۆڕێنرا بە یاسا دەستکردەکان، زۆرداریی سیاسی بڵاوبویـەوە، ســوکایەتی بــە مافــەکانی مرۆڤــ کــرا بــەناوی گوێڕایــەڵیکردنی کاربەدەستو سوڵتانەوە؟

لە راستیدا گوتاری سیاسی شەرعی گۆڕا بۆ گوتارێکی شێوێنراوی گۆڕاو، هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بە گوتاری یەکەمی دابەزێنراوەوە وە گۆڕا بۆ چەندین کۆتو بەند کە دەبوە پەردەو رێگر لەبەردەم ئومەتو راپەرینیدا، گەلانو ئازادیاندا، مرۆڤایەتیو رێزیاندا، زۆری نەخایانـد خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ لە ئیسلام دەردەچـوون هـەروەك چـۆن پێـشتر

کۆمـــەڵ کۆمـــەڵ دەهاتنـــە ناویـــەوە، لـــە ئیـــسلامی هـــەق و ڕەوا دەرنەدەچوون، چونکە ئەو کەسەی بە ڕاستی ئیسلامی ناسـیبێ لێـی ناچێتە دەرەوە، بەڵکو خەڵکی لەو ئاینە پوچ و ناڕەوایە دەرچـوون کـە بانگەشـەی دەکرد بۆ بت پەرستی و ئەفسانە بەناوی تەبەڕوك و پیرۆزی پیاو چاکانەوە؟! وە بانگەشەی دەکرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی ژیری و عەقڵ بە بیـانوی شـوێنکەوتنی دەق و نەقڵـەوە؟! وە بانگەشـەی دەکـرد بـۆ ملکەچـی و کۆیلایـەتیکردنی سـەرۆك و پاشـاو زانایـان بـە بیـانوی گوێڕایەڵی کاربەدەست (أولي الأمر)ەوە؟!!

وە بۆ چینایەتی بە بیـانوی ئـەهلی حـەل و عەقـدەوە؟! وە بـۆ خـۆ بەدەستەوەدان و تەسلیم بون بە بیانوی قەزاو قەدەرەوە؟!

لە ڕاستیدا بڵاوبونەوەی شەپۆلی بێبـاوەڕی و ئیلحـاد لـە جیهـانی ئیسلامی و لە سەدەی ڕابـردوودا لـە ڕێی بڵاوبونـەوەی کۆمۆنیـستی لیبراڵی و نەتەوە پەرستییەوە، کاردانەوەیەکی سروشتیانەی وون بوون و نادیاری گوتاری سیاسی شەرعی بوو کە لە ڕێنماییەکانی ئیـسلامی دابەزێنراو و زاڵ بوونی گوتـاری سیاسـی شـەرعی گـوڕێنراودا خـۆی دەبینێتـەوە، کـە شـەرعیەتی دەکـردە کـاڵای بـاڵای زۆرداری و لادان و خراپەکاریەکانی سوڵتان، وە شەرعیەتی دەدا بەدەسـت بەسـەراگرتنی گەلان و تاکەکان و مافەکانیان بە شێوازێك ئومەت شتی وای بـەخۆوە نەبینیوە، تەنانەت لە خراپترین سەردەمەکانی قۆنـاغی دووەمیـشدا، سـەرەڕایی نادیـاری ڕۆڵـی زانایـان و پیاوچـاکە کاریگـەرەکان لـەم

مـاوەیەدا، بە ناوی تەئویل‌و لێکدانـەوەی ئاینـەوە حوکمـەکانی ووردە ووردە گۆڕێنرا، جارێـك بـەبیانوی بەرژەوەندییـەوە، جارێـك بـەبیانوی ناچاری‌و زەرورەتـەوە، بـەردەوام واقـع چـەمکەکانی خـۆی دەسـەپاند تەنانەت وای لێهات ئیسلام تەنها ناوەکەی‌و شەرعیش تـەنها رەسـم‌و وێنەکەی مـایەوە؟

لە راستیدا زۆرێك لە زانایـان ڕووبـەرووی ئـەم لادانـەی گوتـاری سیاسی بوونەوە، بەڵام بانگەشـەکردنی ئـەوانیش تێپەڕنـەبوو لـەوەی گەڕانەوە بێت بۆ گوتاری سیاسـی شـەرعی تـەئویلکراو، ڕاسـتە بـە تەواوی ڕووبەڕووی بانگەشەی هەڵوەشانەوەی پیادەکردنی شـەریعەت و پوچ کردنەوەی خەلافەت بوونـەوە، بـەڵام هـیچ کـەس بـە ئاشـکرایی بانگەشەی نەکرد بۆ گەڕانەوەی ئومەت بۆ گوتاری سیاسـی شـەرعی دابـەزێنراو بـەو شـێوەیەی موسـڵمانانی سـەدەی یەکـەم لەسـەری دەڕۆیشتن‌و داوای گەڕانەوەی ئەم کارەیـان کـردووە بـۆ راوێـژ، تـاوەکو ئومەت خۆی کەسێك هەڵدەبژێری‌و کاروبارەکانی ببات بەڕێوە، بـەبێ خـەڵکیش هـیچ کارێـك یـەکلا نەکرێتـەوە، هـیچ خـەرجی‌و دەسـت تێوەردانێك لە سامـان‌و دارایدا نەکرێت بەبێ مۆڵەتی ئەو .

یەکەم بزوتنەوەی چاکسازی لە جیهانی ئیسلامیدا بریتی بـوو لـە بزوتنەوەکەی پێشەوای نوێخواز موحەمەدی کوری عەبدولوەهاب کـە هەستی بەو مەترسی یە کرد کە موسڵمانان پێی گەیشتوون، هەر بۆیە بیروای وا بوو پێویستە کاری جەماعی بۆ بکرێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی

ئەو لادانانەو جێبەجێکردنی چاکسازی، ئەمەش پـاش بڵاوبوونـەوەی گوتاری تەئویل کراو بۆ مـاوەی چەند سەدەیەکی دوورو درێژ کە ئەرکی چاکسازی بەهێز دەسپێرێتە دەسەڵات نەك بە کەسانی تـر، ئـیتر ئـەو دەسەڵاتە هەرچەندە لاوازو بێ دەسەڵاتو گەندەڵ بێت ؟!

شێخ موحەمەد دەستی کرد بە بانگەوازە چاکـسازییەکەی، یەکـەم تۆمەتێك کە ڕوو بەڕووی دەکرایەوە ئەوە بوو کە ئەو ئامـانجی ئەوەیـە خـەڵکی بورووژێنێـت دژ بـە دەسـەڵاتو دەیـەوێ خـەڵکی شـۆڕش بەرپاکەنو یاخی بوونی خۆیـان ڕاگەیـەنن، وە ئـەو خـاوەنی چـەندین ئامانجی سیاسییە؟ (١)

شێخ لە ساڵی ١١٥٣ ك هەستا بە ژیانەوەی فەریزەی فـەرمان بـە چاکەو نەهی کردن لە خراپە (باسو خواسی بڵاوبوەیـەوە، خـەڵکێکی زۆر هـاتن بـۆ لای، کۆمـەڵێك لـە دەوری کۆبوونـەوەو کردیانـە بـە سەرمەشقیان، شوێنی ڕێگەکەی دەکەوتن، بەردەوام لەگەڵیـدا بـوون، خەڵکی لە بەرامبەریدا بوونـە دوو دەسـتەوە، دەسـتەیەکیان شـوێنی کەوتوو بەیعەتو پەیمانی پێیدا لەسەر ئەوەوە بانگەشەی بـۆ دەکـرد، دەستەیەکی تریان دوژمنایەتیو دژایەتیان دەکردو کارەکـانی ئـەویان

(١) سەیری (تأریخ نجد)ی (ابن غنام)ی قوتابی شێخی پێشەوا بکە، ل (٨٥-٨٧). وە سـەرنج دە لـە دووبارەبوونـەوەی هـەمان ئـەو تۆمەتانـە بـۆ هـەموو ئـەو کەسـانەی ڕووبەڕووی لادانەکانی دەسەڵات دەبنەوەو بانگەشە دەکەن بۆ چاکسازی؟!

خراپ ناوزەد دەکرد).[۲]

شێخ موحەمەد ئالۆزیو ئیشکالیاتی مافی دەسەڵاتو دەوڵەتی لە چاکسازیو گۆڕانکاری بەدەر لە خەڵکی تێپەڕاند، ئەوەی بـۆ مـاوەی چەندین سەدەی دوور درێژ لە گوتاری سیاسی تەئویلکراودا بڵاوو باوو بوو تاوەکو خراپەکاری تەشەنەی کردو شەریعەت لە کار خرا، هەروەها شێخ هەستی بەوە کردبوو ئەوەی ئامانجو مەبەستی ئەمـە بـە کـاری کۆمەڵیانە نـەبێت ئـەنجام نادرێـت و جێبـەجێ نـاکرێ، هـەر بۆیـە شوێنکەوتووانی هەر لە سەرەتای بانگەوازەکەیەوە لە (حریملای) شارو نیشتمانەکەی خۆیدا بەیعەتو پەیمانیان پێی دا پێش ئەوەی بچێ بـۆ (الدرعیة)و لەگەڵ موحەمەدی کوڕی سعودی میری ئەوێـدا دیـدەنی بکات.

پاش ئەوەی لە ساڵی (۱۱۵۸ك) لە (العیینة) دەرچوو، وە ڕۆیـشت بۆ (الدرعیة)و کۆبونەوە لەگەڵ مـیر موحەمـەدی کـوڕی سـعوددا، گوتاری سیاسییە نوێ خوازییەکەی روونو ئاشکرا بوو، ئەوە بوو مـیر بە (ڕێزو شکۆدارییەوە پێشوازی لـێکردو هەواڵی ئـەوەی پێـدا وەكو خێزانو منداڵەکانی خۆی دەیپارێزێو بەرگری لـێ دەکات.

شێخیش باسی ئەو بارەی بۆ کرد پێغەمبەری خـوا ﷺ لەسـەری بووەوەو بانگەشەی بۆی کردووە، وە لەپاش خۆیشی هاوەڵانی (خوایـان

---

(۲) سەرچاوەی پێشوو، ل (۸۳-۸٤).

لـێ رازی بێـت) پیادەیـان کـردووە، فـەرمانیان کـردووە بـە چـاکەو بەرهەڵستی خراپەیان کردووە، وە هـەموو بیدعـەو زیادکردنێـك لـە ئایندا گومڕاییە، وە باسی ئەوەی بۆ کرد کە خـوای گـەورە بـە هـۆی تێکۆشـانو جیهـادکردن لـە پێنـاوی خـوادا سـەربەرزو شـکۆدارو دەوڵەمەندیان دەکات و کردویانێتی بە برا، پاشان هەواڵی دا ئەو بارە نالەبارەی پێ دا کە لە سەردەمی ئەودا خەڵکی نەجدی پێ گرفتاربوونە هەر لە سەرپێـچیکردنی شـەرعی خـواو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەیو هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا تاوەکو بیدعەچیەتی و ناکۆکیو ستەم.

کاتێك میر محمـدی کـوڕی سـعود بـە تـەواوی ئاشـناو شـارەزایی یەکتاپەرستی بوو، وە زانی چەندە بەرژەوەندی دینو دونیـای تیادایـە، پـێی ووت: (ئـەی شـێخ، ئەمـە ئـەو ئاینـەی خـوای گـەورەو پێغەمبەرەکەیەتی کە هیچ گومانێکی تیادا نیە، مـوژدە بـدە بـەوەی پشتیوانی خۆتو ئەوەی فـەرمانت پـێ کردووە دەکـرێ، جیهـادیش دژ بەوانە ڕادەگەیەنرێ کە پێچەوانەی یەکتاپەرستین، بـەڵام دوو مـەرجم لەسـەرت هەیـە: ئێمـە ئەگـەر هەسـتاین بـە پـشتیوانیکردنت وە جیهادمـان کرد لە پێناوی خوادا، خوای گەورە وڵاتانی لەسەر دەستی ئێمەو تۆدا رزگار کرد - ئەترسم لامان برۆیتو بە جێمـان بهێڵـی وە بەکەسـی تـر بمانگۆڕیتـەوە، دووەم: مـن قـانونێکم[1] هەیـە بەسـەر

(١) بریتیـە لـەو بەرهـەمو سـامانەی بێدەسـەڵات دەیداتـە دەسـەڵاتدار بـۆ ئـەوەی بیپـارێزێ و بەرگری لێ بکا،لای نەجدیان ناو ئەبرێ بە (الخفارة والقانون).

(درعیة)وە ئەویش ئەوەیە لە کاتی بەروبوم دا لێیان وەردەگرم، ئەترسم بڵێی: هیچیان لـــێ وەرمـــەگرە، شـێخیش فـەرمووی: سـەبارەت بـە یەکەمیان دەستدرێژکە: خوێنم خوێنتانەو ژیانم لەگەڵ ژیانتانە (الدم بالدم والهدم بالهدم)، سەبارەت بە دووەمیش هیـوادارم خـوای گـەورە ئەوەندە سەرکەوتنت بۆ دەستەبەر بکات بەمـەش دەسـتکەوتی باشـتر لەوەت بۆ دابین ببێ.

مـیر موحەمـەد دەسـتی درێـژ کـردوو لەسـەر ئـاینی خـواو پێغەمبەرەکەیو جیهـاد لـە پێنـاوی ئـەو و پیـادەکردنی یاسـاکانی ئیسلامو فەرمان بەچاکەو بەرهەڵستی خراپە بەیعـەتی دا بـە شـێخ، شێخیش هەسـتاو لەگەڵیـدا چـووە شـارو نیـشتمانەکەیەوەو لـەلای نیشـتەجێو سەقامگیر بوو، لە بەناوبانگترین ئەو کەسانەی هاوکاریو پشتیوانیان کرد لە میرموحەمەدو وەزیرەکانو هاوکارەکانیان لە خەڵکی درعیە بریتی بوون لە (ثنیان بـن سـعود) مەشـاری کـوڕی سـعودو فەرحانی کوڕی سعودو شێخ کوڕی سولیمو شێخ عیسای کوڕی قاسمو موحەمەدی حوزەیمیو عبداللە کوڕی دغیشرو (سولیمان الوشەیقری)و حەمەد کوری حوسێنو موحەمدی برایی‌و جگە لەمانیش).[1]

پێشەوا موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەم دیدارەدا پێویستی بە گەڕانەوەو هێنانەکایەوەی گوتاری سیاسی نەبەوی سەردەمی مـەککی

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل (٨٧).

هەبوو - ئەیتوانی بەڵگە بهێنێتەوە لەسەر واجبی فەرمان بە چـاکەو بەرهەڵستی لە خراپە بێئەوەی پێویستی بەو پێشەکییە هەبێت لەبەر بڵاوی گوتاری تەئویلکراو کە خەڵکی هەر بەوە ئاشنا ببوون و دیدیان وابوو ئەو ئەرکە تەنها بە دەوڵەت دەسپێری نەك ئوممەت، ئەمەش شێخ موحەمەدی ناچار کرد سەرەتای بانگەوازی ئیـسلامی لـە مەککـەدا وەبیر بهێنێتەوە، وە چۆن توانرا دەوڵەت لە مەدینەدا بـەرپا بکـرێ، وە جیهاد بکرێ تاوەکو ئەم پرۆژە چاکسازییە بەدی بهێنرێتو ئەنجام بدرێ.

لە راستیدا شـێخ روون و ئاشـکرا بـووە لـەو هەوڵـەی دەیـدا بـۆ بەرپاکردنی دەوڵەتێك ئەم ئاینە پیادە دەکات، چـونکە نـاکرێ ئـایین بەرپاکرێ – بەتایبەت ئیسلام – بێئەوەی دەوڵەتێك هـەبێت حـوکمو یاساکانی جێبەجێ بکات، شێخ موحەمـەد پێغەمبـەری خـوای ﷺ کردە سەرمەشـق لـەو بەیعەتـەی لـە مـیری وەرگـرت، هـەمان ئـەو دەربڕینەی بەکارهێنا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بـەکاری هێنـا (الـدم بالدم والهدم بالهدم).[(١)]

دۆزو کێشەکە دۆزو کێشەی بەرپاکردنی دەوڵەتێکـە لـەو کاتـەدا بوونی نیە، بـەرپاکردنی ئاینێکـە مەشـخەڵو نیـشانەو شـەقڵەکانی سڕاوەتەوەو وە پێویستی بە قوربانیو هەڵە مادیو مەعنەویانە هەیـە لەو رووەوە پێویستن.

---

(١) سەیری (مختصر سیرە ابن هشام)ی هارون، ل (٩٧) بکە.

به تایبه‌ت ئه‌و ڕووبه‌ڕووبونه‌وه فیکریـه‌ی پاشـتر ڕووده‌دات له‌گـه‌ڵ گوتاری سیاسی ته‌ئویل کراوو که دوژمـنانی ده‌وڵه‌تی نویێ له نـاوخۆی نه‌جدو دورگه‌ی عه‌ره‌بی و ده‌ره‌وه‌یدا وه‌ك چه‌كێك به كاری ده‌هێـنن دژ به گوتاری سیاسی راشدی که شێخ موحه‌مه‌د پێویستی پیێ ده‌بێ بۆ ئــه‌وه‌ی بیهێنێتــه‌وه ئـاراو ســه‌ر لــه نــویێ زینــدووی کاتــه‌وه بــۆ ڕووبه‌ڕووبونه‌وه‌ی گوتاری ته‌ئویل کراو .

مشت‌و مڕ سه‌باره‌ت به دروست بوونی جیهادو پیاده‌کردنی مـاف‌و حدوده‌کان به‌بێ ئیمام یا جێگره‌کـه‌ی هاتـه ئـاراوه هـه‌روه‌ك گوتـاری ته‌ئویلکراو وا ده‌خوازێ، شێخیش وه‌ڵامی دانه‌وه به‌وه‌ی: (ئیمامـه‌کانی هه‌موو ڕێبازێك کۆن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی هه‌رکه‌سێ تـوانی زاڵ بـێ به‌سـه‌ر وولآتێك یان چه‌ند وولآتێکدا ئه‌وه له هه‌موو شتێکدا حوکمی ئیمامی هه‌یه، ئه‌گه‌ر ئه‌مه نه‌بوایه کاروباری دونیا ڕێك‌و ڕاسـت نه‌ده‌ڕۆیـشت چونکه خه‌ڵکی له سه‌رده‌مێکی زووی پێش ئیمامی ئه‌حمه‌ده‌وه تـاوه‌کو ئه‌مڕۆش له‌سه‌ر ئیمامێك کۆك نه‌بوون‌و نه‌شزانراوه یه‌کێك له زانایان باسی ئه‌وه‌ی کردبێت هیچ شتێك له‌و حوکمانه پیاده ناکرێـت ئه‌گـه‌ر ئیمامی گـه‌وره نـه‌بێت، ئـه‌و قـسه‌یه‌ت کـه ده‌ڵـێ: ئایـا پێویـسته له‌سه‌رت؟ به‌ڵێ پێویسته له‌سه‌ر هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی توانای ئه‌وه‌یان هه‌یه، ئه‌گه‌ر نه‌یکات گوناهباره، به‌ڵام دوژمـنانی خـوا ئـه‌م گوناهـه ده‌که‌نه به‌ڵگه بۆ ره‌تکردنه‌وه‌ی ئه‌وه‌ی له تواناياندا نیه نکـوڵی لـێ

بکەن، هەروەها کاتێك من فەرمانم دا بە رەجم کردنی زیانکەر ووتیان: ئەبێت مۆڵەتی ئیمام وەرگری و ئەگەر قسەکەیان تەواو بێت ئەوا دروست نیە قەزاو ئیمامەتو هی تریش بگرنە دەست).[1]

بەردەوام ئەم گومانو شوبهانەی ئاراستەی بانگەوازەکەی شێخ کرا تەنانەت تا دوای کۆچی دوایشی دەوترا ئەوەی پێی هەستاوە حەرامە، وە دەرچوونە لە گوێڕایەڵی ئیمام – خەلیفەی عوسمانی- هەربۆیە فیقهی حەنەفی میسری (ابن عابدين) بە دەق لە (الحاشية)دا دەڵێ شێخو شوێنکەوتوانی خەوارجن، بەهۆی ئەو تێکەڵیەی گوتاری تەئویلکراو ئەنجامی ئەدات لە نێوان چەمکی دەرچوونو ڕاپەرینی سیاسیانەو دەرچونی بیروباوەرو عەقیدیانە، ئەمە لە کاتێکدا شێخ تەئکیدی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەو بیرورای لەگەڵ ئیمامەتی سوڵتانی عوسمانیدایە، شێخی عەلامە عەبدولرەحمان کوری حەسەنی کوری عەلی کورەزای وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە گومانی ئەوەیان دەوروژاند کە جیهاد بەبێ ئیمام ناکرێ، لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (بێگومان فەرزی جیهاد تا رۆژی قیامەت دەمێنێ، ئەوەی گوتارەکەی ئاراستەکراوە باوەڕدارانن، ئەگەر کۆمەڵێك کۆبونەوەو توانای بەرگریان هەبوو پێویستە لەسەریان بە پێی توانای خۆیان لە پێناوی خوادا

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل (٤٥٣-٤٥٤)، سەرنج بدە چۆن هەمان ئەو شوبهەیەی شێخ موحەممەد ڕووبەرووی بویەوە سەرلە نوێ گەڕایەوە بۆ گوتاری هاوچەرخ ، بەڵام ئەمجارەیان لەسەر دەستی هەندێ لە شوێنکەوتوانی قوتابخانەکەی شێخ موحەممەد خۆی دا؟!

تێبکۆشن، بە هیچ شێوەیەك ئەو فـەرزە لاناچـێت و لەسـەر تـەواوی دەستەو کۆمـەڵەکانیش دەمێنێ). [1]

ئەو ویستویەتی شەرعیەتی جیهاد کردنی شێخ موحەممەدو هاوڕێکانی بسەلمێنێ دژ بە ئەوانەی ڕێگردەبن لەبەردەم بانگەوازەکەیدا، هـەروەها دەڵێ: (بـە چ کتـابو بـە چ بەڵگەیـەك جیهـادکردن تـەنها لەگـەڵ ئیمامێکی شوێن پێ هەڵگیراودا ئەنجام دەدرێت؟

ئەمە دەم هەڵبەستە لە ئاییندا، بەڵگە لەسـەر مایەپووچـی ئـەم وتەیە زۆرترو بەناوبانگترە وەك لەوەی باسکرێ، لەو بەڵگانە گشتییتی فەرماندان بە جیهادو هاندان بۆی و هەڕەشەکردن لەسەر واز لێهێنانی) [2]

پاشان دەڵێ: (تەواوی ئەوانەی بە جیهادی ڕێی خوا هەستاون، ئەوە گوێڕایەڵی خوای گەورەیان کردووەو ئەو فەرزەیان بەجێهێناوە کە خوای گەورە لەسەری داناون، ئیمام نابێت بە ئیمام ئەگـەر جیهـاد نـەکات، نەك ئەوەی جیهاد بەبێ ئیمام ناکرێ). [3]

لێـرەدا تەئکیـد هەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو کەسـەی حوکمـە شەرعیەکانی ئاڕاستە دەکرێ بریتین لـە تـەواوی موسـڵمانان، ئـەوان

---

(١) الدرر السنية، (٩٨/٧).

(٢) الدرر السنية (٩٨/٧)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وتەیەی عەبدورەحمانی کوڕی حەسەن ڕووبەڕووی بویەوە تاوەکو پروپوچیەکەی بسەلمێنێ بووەتە ئەسڵو بنەمایەك لە ئەسڵ و بنەماکانی سەلە فیەتی هاوچەرخ

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ئەمە قسەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە، کە جیهاد لە کاتی نەبوونی ئیمام دا پوچو بەتاڵ نابێتەوە، ئەمەش کۆڕای هەرچوار ڕێبازەکەیە بگرە تەواوی ڕێبازە فقهی یەکانە جگە لە ئیمامیەکان

لێپرسراون لەوەی واجبێك جێبەجێ بكەن ئەگەر هاتوو ئیمام نەیتوانی ئەنجامی بدات یا وازی لـێهێنا، هەمو ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ نادیاری ئەو چەمكانەی سیاسەتی شـەرعی لـەو ماوەیـەی گوتـاری سیاسـی تەئویلكراو باڵی كێـشابوو بەسـەریدا، شـێخ موحەمـەدو ئەوانەشـی بەدوایدا هاتن هەسـتیان بـەوەكردبوو ئـاین بـەبێ دەوڵـەت نابێـت، دەوڵەتیش بە بێ كۆمەڵ و سـەركردەو بەیعـەتو پـەیمانو تێكۆشـان بەدی نایەت، هەموو ئەمانەش لە قەدەغەكراوەكانی گوتاری سیاسـی تەئویل كراون چونكە دەرچوونە لە گوێڕایەڵی كاربەدەست (ولی الامر).

شێخ موحەمەد بەڵگەی خۆی لەو بارەدا دەبینیەوە كە پێغەمبـەری خوا ﷺ لەسەرەتای بانگەوازی ئیـسلامەوە لەسـەری بـووە، وە چـۆن هەوڵی دەدا بۆ پیادەكردنی ئاین لە ڕێگەی پیادەكردنی دەوڵەتەوە لـە مەدینەداو ڕاگەیاندنی جیهاد بۆ بڵاوكردنەوەی پەیامەكـەی ... هتـد، شێخ پێویستی بەوە بوو چونكە گوتاری تەئویلكراو بێ توانا بوو لەوەی ئەو بەڵگانەی فریا بخا كە ئەتوانێ بیكاتـە بەڵگـە لەسـەر ئەوانـەی پێچەوانەی ئەوە بوون لەبابەتی گۆڕاندنی خراپەو پیـادەكردنی حـەدو مافەكان بـەبێ مۆڵـەتو ڕاسـپاردەی ئیمـامو بـەرپاكردنی جیهـادو كوشتاری دوژمنو ناحەزان ... هتد.

شێخ سەركەوتوو بوو لەوەی گوتاری سیاسی شـەرعی لـە هەنـدێ ڕوویەوە نوێ بكاتەوە، وەكو زەرورەتـی بـەرپابوونی دەوڵـەت تـا ئـاین پایەدارو بەرپا بێت، وە پێویستی هەستانی ئومەت بەو ئەركانەی خوای

گەورە لەسەری داناوە لە کاتێکدا ئیمام جێبەجێی نەکات یا نـەتوانێ پێیان هەستێ، بەڵام نوێکردنەوەکە تا دوای بەرپاکردنی دەوڵەتیش لە نەجددا ساڵی (١١٥٨)ك لەو ئاستەدا وەستاو گەشەی نەکرد.

لەگـەڵ ئـەوەی شـێخ لـە سـاڵی (١٢٠٦)ك کۆچـی دوای کـردوو هاوچەرخی سێ لە میرەکان بوو، ئەوانیش موحەمەدی کوڕی سـعودی کوڕی عەبدولعەزیزو عبدولعـەزیزی کـوری سـعودو سـعودی کـوڕی عەبدولعەزیز بوون، حـەلو عەقـدو وەرگـرتنو پێـدانو پێشخـستنو داخستن بەدەست ئەو بـوو، هـیچ سـوپایەك نەدەخرایـە ڕێ وە هیــچ رایەك لە موحەمـەدی کـوڕی سـعودو عەبدولعـەزیزی کـوڕی یـەوە دەرنەدەچوو بەبێ قسەو بیـروڕای ئـەم ،کاتێـك (ریـاض) لـە سـاڵی (١١٨٧)ك رزگار کرا شیخ موحەمەد کاروبارو خانەی سامانی سپاردە مـیر عەبدولعــەزیزو خـۆی پابەنـدی پەرسـتشو فێرکـاری کـرد، عەبدولعەزیزیش بێ ئەو هیچ کـارێکی نەدەبڕیـەوەو بـەبێ مۆڵـەتی ئەویش جێبەجێی نەدەکرد.[(١)]

لە راستیدا گوتاری سیاسی شـەرعی پـاش بـەرپابوونی دەوڵـەتی ئیسلامی نوێ لە نەجـددا، گەڕایـەوە بـۆ چـەمكو تێگەیـشتنەکانی گوتـاری سیاسـی تـەئویلکراو، هـەروەك لـە کتێبـەکانی (الأحکـام السلطانية)دا هاتووە، هاو وێنەی مەشـروعیەتی سـپاردنی کاروبـاری فەرمانڕەوایــەتی بــە کوڕەکانیــان بــەو شـێوەیەی لـە سـەردەمی

---

(١) تاريخ نجد، ل (٨٩-٩٠).

ئەمەویەکانو عەباسیەکاندا باو بوە، بێئەوەی ئەو کارە بکرێتە راوێـژ لە نێوان موسڵماناندا بەو پێیەی لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا بووە.

هەروەها توێژینەوەی ئەو کێشانە نـەدەکرا کـە بریتـی بـوون لـەو چەمکە سەلەفیانەی هاوەڵان لەسەری رێك بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ هانی داوە پابەندی پێیەوە بکرێ لە فـەرمودەی: ((علـیکم بـسنتي و سنة الخلفاء الراشدين)) لێرەدا مەبەست رێو شوێنی ئەوانە لـە کـارو باری خەلافەت و بەرێوەبردنو سیاسەتکردنی کاروبـاری ئومـەت بـەو شێوەیەی لە کیتابو سوننەدا هاتوە .

ئەگەر شێخ سەرکەوتوو بوایە لە زیندوکردنەوەی ئـەم چـەمکانەدا ئەوا بانگەوازەکەی دەنگۆیەکی گەورەترو زیـاتری دەبـوو لەگۆڕانـدنی واقیعـی جیهـانی ئیـسلامیدا، دەبـوە نمونەیـەکی راشـدیو دەکرایـە سەرمەشقو شوێنی هەڵدەگیرا.

لەوانەیە ئەو هۆکارەی بـووە رێگـر لەبـەردەم ئـەوەی بتـوانێ ئـەو گۆڕانکارییە ئەنجام بدات بریتی بـوو لـەو بارودۆخـەی دەورو خولـی بانگەوازی دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بارودۆخەی دەوری دەوڵەتی دابوو لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا توندو نالەبار تر بوو، هاوێنـەی جەنگی هەڵگەڕاوەکانو جەنگە دەرونیـەکان لەگـەل فـارسو رۆمـدا، بەڵام ئەوانەش رێگر نەبون لەوەی هەڵبژاردنی ئیمام بە راوێـژی نێـوان

موسڵمانان بێت، وە ڕێگر نەبوو لەوەی ئومەت چـاودێر بێـت بەسـەر ئیمامەوەو بـەبێ ئـەو هـیچ شـتێك نەبڕێتـەوە، وە بـەبێ زانیـاری و ڕەزامەندی ئەو هیچ دەستکاری یـەك لـە خانـەی سـاماندا نـەکات، هەموو ئەمانەش وای نەکرد بەبێ ڕەزامەندی ئـەو کـار بـسپێرێ بـە کەسێك ..

لە راستیدا بانگەوازی چاکسازیانەی شـێخ موحەمـەد گـەورەترین کاریگەری هەبووە لە نوێکردنەوەی هەندێ لە چـەمکەکانی گوتـاری سیاسی شەرعی، کە بووە هۆی کردنـەوەی دەرگـا لەبـەردەم چـەندین بزوتنەوەی چاکسازی تر لە زۆربەی وولاتە ئیسلامییەکاندا ئەمەش لە دوای ئەوەی چەند سەدەیەکی دوورو درێژ تێپـەڕی بـە سـەر ناکـارایی ئومـەتو زاناکـانی لـەوەی بـە چاکـسازی کاروبارەکـان هەسـتنو سەرورەرییەکان زیندو کەنەوە بە گەڕانەوەیان بۆ ئاین، پاش لەناوچوونی شقڵو مەشخەڵەکانی.

گوتـاری سیاسـی تـەئویلکراو کـە دەوڵـەتی عوسمـانیو مـیرە شوێنکەوتووەکانی لە جیهانی عەرەبیو دورگەی عەرەبیـدا تەبـەنیان دەکرد توانی ڕووبەڕووی ئەم گوتارە ببێتەوەو زینـدە بەچـاڵی بکـاتو درعیە تێك بشکێنێت بەڵام بزافێکی فیکری نوێی تر دەستی کرد بە بڕینی ڕێگەو گوتـاری سیاسـی خـۆی نـوێ کـردەوە بەسـەرکردایەتی جەمالەدینی ئەفغانی (١٨٣٨ز- ١٨٧٩ز) کە لە مێرنشینی (کنر)ی

ئەفغانستان لە خێزانێکی حوسەینی عەلەوی بەناوبانگ لەدایك بووە.[1] پاش ئەوەی بینی بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لە چ لاوازیو پەرتەوازەییو شکستیەکدایەو چۆن کەوتوەتە ژێردەستی داگیرکەرو ئیستعمارەوە، وە چۆن گەلان ڕۆڵیان وونو نادیارە لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا، لەبەر ئەوەی بێ ئاگایە لەوەی لە دەورو پشتیدا ڕوودەدات، هەر بۆیە جەمالەدین بڵێسەی ڕاپەڕینی داگیرساندو هاواری پیادا کرد. هەروەك بیریاری جەزائیرو مالك کوی نەبێت دەڵێ: (لە هێمنی شەوداو لە سڕبوونو بێهۆشی قوڵی ئومەتی ئیسلامیدا، لە وڵاتی ئەفغانەوە دەنگێ زیندوو بووەو بانگی سپێدەیەکی نوێی دا بە گوێیدا، دەنگێ بانگی دەکردوو دەیووت: وەرن بەرەو ڕزگاری، لە هەموو شوێنێکدا دەنگی دەدایەوە، ئەویش دەنگی جەمالەدینی ئەفغانی بوو، بەئاگاهێنەری ئەم ئوومەتە بۆ ڕاپەڕینێکی نوێو ڕۆژێکی تازە.[2]

هەروەها کاتێك باس لە تەوژمی چاکسازییانەی جیهانی ئیسلام دەکات، دەڵێ: (سەبارەت بە تەوژمی یەکەم: وا دەردەکەوێ ئەمە هەر

(١) مێژوو نوسو ئەدیب شوکەیب ئەرسەلان لە ژیاننامەکەیدا تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە، ئەرسەلان پێش جەنگی جیهانی یەکەم لە حەجدا یەکێك لە سەیدە بەناوبانگەکانی (کنر)ی ئەفغانی بینیوەو تەئکیدی لەوە کردبووەوە کە ئەفغانی لە خێزانەکەی ئەوانە، بە هەمان شێوە تەواوی سەفیرەکانی حکومەتی ئەفغانستان و پیاوە ناودارەکانیان ئەمەیان بۆ ئەرسەلانی مێژوونووس تەئکید کردووەتەوە

(٢) شروط النهضة، ل (٢٢).

لە سەردەمی ئیبن‌و تەیمیەوە ملی ڕێی گرتبێ‌و هێڵێکی دیاری کراوی خۆی دیاری کردبێ لە ژیانی موسڵماندا، هەروەك چۆن تەزوی کارەبـا لە ناخی زەویدا ڕێڕەی خۆی دەگرێ پاشان لێرەو لەوێ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر تیشکی خۆی دەداتەوە، ئیبنو تەیمیە وەکو شێخەکانی تـر زانا نەبووە وەکو غەزالیش سۆفی نەبووە بەڵام تێکۆشەرو موجاهیدێك بووە بانگەشەی کردووە بۆ نوێ خوازی‌و ڕوحی کۆمەڵایەتی لە جیهانی ئیسلامیدا

هەر ئەم تەوژمەش سەری کێـشا بـۆ پێکهێنـانی ئیمپراتۆریـەتی موەحیدینی بەهێز لە ئەفریقای باشورو لەسەر دەستی (ابن تومرت)، هەر ئەمەش بوو سەری کێشا بۆ بنیات نان‌و دامەزرانـدنی دەوڵـەتی وەهابیـەکان لـە ڕۆژهـەڵات‌و لەسـەر دەسـتی (موحەمـەدی کـوری عەبدولوەهاب) پاشان موحەمەد عەلی بە فەرمانی بابی عـالی و بـە پشتیوانی‌و پشتگیری وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە ساڵی (١٨٢٠) ڕایماڵی، لەگـەڵ ئەوەشـدا گیـانی وەهابیـەت بـە زینـدووی مایـەوە، تـاوەکو هەوادارانی ساڵی (١٩٢٥) توانیان جارێکی تر سەر لەنوێ لە شێوەی پاشا نشینی وەهابێ نوێدا بەدەری بخەنەوە، سەرەڕای ئەمـەش لێـرەدا سەرنجی ئەوە دەدەین کە ئەم بزوتنەوەیە هەر لـە سـەردەمی کـەوتنی دەوڵەتی وەهابی یەکەمەوە واتـە نزیکـە سـەدەیەك بریتـی بـوە لـەو ویژدانەی لە جیهانی ئیسلامی نوێدا ڕەنگ دانەوەی هەبووە، ویژدانی (جەمالـەدینی ئـەفغانی) ئـەو کەسـەی لـە دڵڕفێنـی‌و شـەیدایی

شاخەکانەوە ڕایکرد لە داخی ئەو مۆرکە سـوکایەتییەی کۆمـەڵگـەی پاش موحیدەکان نوسانبوی بە تاکەوە، تاوەکو بیکات بە قوربـانی یـا مـاستاوچی‌و مـەرایی کار.

لە ڕاستیدا جەمـالەدین سەرەڕای ئەوەی خاوەن چـەندین لێهـاتووی خوارسـك‌و (فطـري)یانـە بـوو لـە هـەمان کاتـدا پیـاوێکی خـاوەن ڕۆشنبیرییەکی بێ‌وێنە بوو، وە دادەنرێ بە دەروازە والآکـەری سـەرەتای سەردەمی (پیاوی ڕۆشنبیری‌و زانست) لە جیهانی ئیـسلامی نـوێدا، لەوانەیە هەر ئەم ڕۆشنبیرییە پاڵنەر بووبێت بۆ ئەوەی لاوانی ڕۆشنبیر لە ئەستەمبول و قاهیرەو تاران شوێنی بکەون‌و هەر ئەم لاوانـەش لـە پاشەڕۆژدا سەرکردەی بزوتنەوەی چاکسازی تیادا هەڵ بکەوێ.(١)

هەروەها دەڵێ: (قەدەرەکان ویستیان ئەو پیاوە لە مێژوودا بکەنـە شایەدێکی ڕاستگۆ، وە حوکمێکی یەکلاکەرەوەو کۆتایی هێنەر بەسەر کۆمـەڵگەیەکـدا کـە زۆر لەسـەر خۆیانـە کاروبارەکـانی بـەرەو هەڵوەشانەوە چوو بوو، لـە هـەمان کاتـدا داگیرکـەرو ئیـستعماریش دەستی کردبوو بـەوەی زەوی نیـشتمانەکەی داگـیر بکـات، لەوانەیـە پاڵنەری ڕاستەقینە کە بووە هۆی ئەوەی ویستی چاکسازی لە ویژدانی ئەو پیاوەدا بچێنێ بریتی بوبێت لە شۆڕشی (سیبای) کـە بـە خـوێن دامرکایەوە، جەمـالەدین ئامادەی ئەم کارەساتە بوو کە دیمەنی ئیفلاس

---

(١) وجهة العالم الإسلامي، ل (٤٩)

بوونی روحی‌و مادی لـێ ده‌خوێنده‌وه، لـه جیهـانی ئیـسلامیدا ئـه‌و ئیفلاسه شکستی ئه‌و شۆڕشه‌ی به‌دوادا هات، له وێنه‌یـه‌کی تریـشدا بزوتنه‌وه‌ی (علیکره) که له دوای ئه‌و رووداوه خوێنیاویانه لـه هینـدا به‌ده‌ر کـه‌وت هـه‌مان ئـه‌و راسـتییه‌ی ته‌ئکیـد کـرده‌وه‌و لـه دیـدی جه‌ماله‌دیندا بریتی بوو له ناپاکیه‌ك به‌رامبه‌ر ئیسلام و موسڵمانان، هه‌ر بۆیـه یه‌کـسه‌ر جـه‌نگی راگه‌یانـد دژ بـه سیـسته‌مه کۆنخـوازو به‌سه‌رچووه‌کان‌و دژبه بیروبۆچونه مرێنه‌ره‌کان.

ئامانجی یه‌که‌می: بریتی بوو له‌وه‌ی پایـه‌کانی سیـستمی فـه‌رمان ره‌وایـی ئـه‌و کاتـه بپوکێنێتـه‌وه، هـه‌روه‌ها جـارێکی تـر بونیـاتی رێکخستنێکی سیاسی له جیهـانی ئیـسلامیدا بنیـات بنـێ له‌سـه‌ر بناغه‌ی (برایه‌تی ئیسلامی)، ئه‌و برایه‌تییه‌ی لـه (صـفین) پاره‌پـاره بوو، سیستمه ئیستعماریه‌کانیش به‌یه‌کجاری له‌ناویان بردبوو.

ئاراسته‌ی کاره‌که هه‌رچۆنێك بووبێت ئه‌وا رۆڵی جه‌ماله‌دین رۆڵـی ئه‌و بیریاره نه‌بووه کـه قـووڵ ده‌بێتـه‌وه بـه نێـو گرفته‌کانـدا تـاوه‌کو چاره‌سه‌ره‌کانی بۆ ئاماده‌ساز کـا، چـونکه ره‌وشـتی تونـدو یـه‌کلایی خوازی ئه‌و رێی پێ‌نه‌ده‌دا به‌و شـێوه‌یه بێـت، له‌ڕاسـتیدا ئـه‌و پـێش هه‌رشتێك تێکۆشه‌رو موجاهید بووه، رۆشنبیریه ده‌گمه‌نه‌کـه‌ی تـه‌نها هۆ کارێکی جه‌ده‌لی بووه‌و هه‌ندێ جار بۆ ئاستی جه‌ماوه‌ریش دابه‌زیوه‌و بۆته هۆکارێك بۆ چالاکی شۆڕشگێڕانه.

له ڕاستیدا ئه‌و چالاکییه گرنگییـه‌کی ده‌رونـی‌و ئـه‌ده‌بی زیـاتری

هەبوە وەك لە گرنگییەکی سیاسی هەبوبێ بۆ ئەو چاخەی ئەو تیایـدا ژیـاوە، کاتێـك کـە جیهـانی ئیـسلامی نقـووم بـوو لـە بـێدەنگیو دامرکاویەکی هەمە لایەنەدا، یەکێك لـە سـودەکانی ئـەم چـالاکییە بریتی بوو لە تەقاندنەوەی کارەساتی ئیسلامی لە ویژدانی موسـڵمان خۆیـدا بـەڵام وادەردەکـەوێت بـەئاگا هێنانـەوەی ئـەو ویژدانـە بـەو کارەساتانەی پەنگی خواردبوەوە بەشێك بـوو لـەو نەخـشەو بەرنامـە ڕێژییەی جەمالەدین داینابوو ...

ئەگەر جەمالەدین بەوەش دانەنرێ کە سەرکردە یان فەیلەسوفێکی بزوتنەوەی چاکسازی نوێ بوو بێت. ئەوا بێگومان پێشڕەوی بـووە بـە هۆی ئەوەی هەڵگری ئەو هەموو ڕاڕاییە بووەو لە هەر کوێ بـوو بـێ لەگەڵ خۆیدا گواستویەتیەوە، ئـەو ڕاڕاییـە سـەلمێنەری ئـەو هەوڵـە خاکیانەیەیە کـە ئـەو داویـەتی لـە پێنـاوی ڕاپـەرینو ڕێنیسانـسی هەنوکەدا، لە راستیدا پێشڕەویشی بوو، لەو کاتەوەی هەوڵی دەدا لـە پێناوی سەر لەنوێ ڕێکخـستنەوەی سیاسـیانەی جیهـانی ئیـسلامی، هەرچەندە مەبەستی ئەو لەو ڕێکخستنە بریتی بوو لـە ڕێکخـستنی کۆمـەڵانی خەڵكو چاکسازی یاسـاکان، بـێ ئـەوەی مەبەسـتی بێـت چاکسازی لەو مرۆڤـەدا بکـات کـە چـاخی دوای (موەحیدینـەکان) دایڕشتبووەوە .

جەمالـــەدین بـــە زیرەکیـــە ڕاســـتگۆیانەکەی هەســـتی کردبـــو کۆمـەڵگەکەی تووشی چ بۆگەنیو گەندەڵیەك بووە، جا ئەو بـاوەڕی وا

بوو لە جێگای ئەوەی توێژینەوەی ئەو هۆکارە ناوخۆییانـە بکـات کـە سەری کێشاوە بۆ ئەو بارە، ئەتوانێ بەدەسەت گـرتن بەسـەر سـستەمو یاساکانی دەوروبەریدا ئەو بارە نالەبارە نەهێڵێ.[1]

موحەمـــەد ئیقبـــال[2] ســـەبارەت بـــە جەمالـــەدین و بزوتنـــەوە چاکسازییەکەی دەڵێ:

(.... لەوانەیـە یەکـەم موسـڵمانێ زۆر سـور بـوو بێـت لەسـەر پێداویستی گیانی تازە، شا وەلیولا دەهلەوی بوو بێت، بەڵام ئەو پیاوەی بەتەواوی هەستی کردبوو بەگرنگی ئەم قورسایی‌و چورتم و کارەساتە، وە ووردبین بوو بەواتا قوڵەکەی لە مێژووی فیکرو ژیان لە ئیسلامدا، سەرەرای ئەوەش ئاسۆیەکی فراوان‌و فـرەی هـەبوو کـەس‌و بـارودۆخی ناسی، شارەزاییەك کردبویە پردی پەیوەندی لە نێوان رابردوو ئێستادا ئەو کەش بریتی بوو لە جەمالەدینی ئەفغانی.

هەرچەندە ئەو چالاکییەکی یەکجار فرەو پەرتەوازەیەی هـەبوو کـە کول بوون‌و ماندووبوونی نەدەزانی ئەگـەر بەتـەواوی کـۆ ببوایەتـەوە لەسەر ئیسلام بەو پێیەی سیستەمە بـۆ بیروبـاوەڕی مرۆڤـ و رەفتـارو رەوت‌و رێڕەوی لە ژیاندا، ئەگەر تەو تەنها ئەوەی بکردایە ئەوا جیهانی ئیسلامی لە رووی ژیری‌و عەقڵیەوە بناغەیەکی بەهێزو پتەوتری دەبوو لەوەی کە ئێستا هەیەتی‌و لەسەریەتی....)

---

(١) وجهة العالم الإسلامي مالك كوری بنی، ل (٥٠-٥٢).

(٢) تجديد التفكير الديني في الإسلام، ل(١١١).

مـــیر (شـــکیب ارســـلان) ســـەبارەت بـــە کاریگـــەری بانگەشـــەی جەمالەدینی ئەفغانی لە ڕاپەڕین‌و ڕێنسانـــسدا ووتویـــەتی: (هـــەموو خاوەن دیدو تێڕوانینەکانی ئەم سەردەمە ڕێکن لەسەر ئەوەی، هـــاتنی سەید جەمالەدینی ئەفغانی بۆ میسر سەرەتای بزاڤێکی فیکری بوو، کە لە ولاتە عەرەبیەکان‌و وولاتانی تری ڕۆژهەلاتی خـــوارووەدا دەســـتی پێ کـــردووەو بـــەردەوام تـــاوەکو ئێـــستەش لـــە گەشـــە کردندایـــە، بـــە مەبەستی ئەوەی ڕۆژهەلاتیش ئەوشارەزایی‌و مەعریفەتانە بەدی بهێنێ کە ڕۆژئاوا توانی بە هۆیەوە زاڵ‌و سەروەر بێت، وە زاڵی ڕۆژئاوا لەسەر ڕۆژهەلات نەهێلێت‌و ڕۆژهەلاتیش مێژووی گەشەکردنی خۆی بەدەست بهێنێتەوە، جەمالەدین لای هیچ کەس لە ئەزهەر نەیخوێندووە، بـــەلام هەلقەیەکی تایبەتی لە ماڵی خۆیدا هەبووە، هەندێ لە ئەدیبـــەکانی وولاتی تیادا ڕێك خستبوو، دەریای داناییـــەکانی ئـــەویان وەردەگـــرت، ئامێزیان بۆ ووتە بەنرخ‌و بیرو بۆچونە جوانەکانی گرتبـــوەوە، لـــە نـــاو قوتابیەکانیـــدا چـــەندەهایان ناوبانگیـــان دەرکردبـــوو لەوانـــە شـــێخ موحەمەد عەبدەو شێخ عەبدولکـــەریم ســـەلمان‌و ئیـــبراهیم ئەفەنـــدی لەقانی‌و سەید وەفا قونی‌و سەعد پاشا زەغلول.

موریدو هەلگرانی زانـــستەکەی زۆر بـــە گـــەرم‌وگوڕی یـــەوە دەیـــان نووســـی‌و ووتاریـــان دەداو ئـــەو ســـوودو قازانجـــەی پێیـــان گەیـــشتبوو دەیانگەیاندە جەماوەر، شتە بێ‌وێنەو ناوازەکانی ئـــەویان ڕێـــك‌و پێـــك دەکرد، ئەمانەش زمانێکی بالاو نوێ بوو، خـــەلکی ئاشـــنای شـــتی وا

نەبوون و کەسی لەو جۆرانەیان نەبینی بوو، شێوازێکی وابەرزو بـالآی هەبوو چەند سەدەیەك بوو لە مـەیداندا پیاوانی وا نەبینرابوون، هــەر بۆیە لە ئومـەتدا بزاڤێکی بیروبۆچونی وای بەدیهێنا کە پێشتر نـەبوو، فووی بە گیانێکی وادا کردبوو کە مۆرکی عیرفانو چاکیەکانی ئەوی تیا بەدی دەکرا، ورەیان بەرزبویەوە، عەزیمەتیان نوێ بویەوە، تواناکان کەوتنە گەڕو چەندین کەسی بواری ڕەوانبێژیو ووتاربێژی بەدەرکەوتن.

شێخ موحەمـەد عـەبدە سەبارەت بە وەسفی ئەم بزاڤە ئـەم ووتەیـە دەڵێ: (ژیریو بیرەکان رۆشن بونەوە، دیدەکان رووناکی بەخش بـوون و وەهەو ئەندێشە خوازی لەبـەردەم پایـەکانی ژێریـدا خۆیـان نـەگرت وتوانەوە[1]).

هــەروەها شــکیب ئەرســەلان دەڵــێ: (ئــەو شۆڕشــەی ســەید جەمالەدینی ئەفغانی لە سیاسەتدا بەرپای کرد کەمتر نـەبوو لـەوەی لە مـەعریفەکاندا بەدی هێنا، سوێند بێ ئەم دووە جەکانەی یەکن کەم جار هەیە زانست لە شوێنێکدا بلآوبوبێتەوەو هاواری رزگاریو ئازادی بەرز نەبوبێتــەوە یەکـەم کاریگەریـەکی جەمالــەدین لــە گۆڕەپـانی سیاسیدا بەدەرکەوتبێ بریتی بوو لەو بزوتنەوەیەی لە دوادوایی ڕۆژانی خدێوی ئیسماعیل پاشادا کلپـەی سـەندو سـەری کێـشا بـۆ ئـەوەی ئیسماعیل پاشا لە خدێوێتی لا ببرێت، سەید دەستێکی بالآی هـەبوو

(١) السید جمال الدین الأفغاني، ژیاننامە بە پێنوسی (شکیب ارسلان).

تیایدا، کاتێك تۆفیق پاشا لەسەر کورسی میسر دانیشت سوپاسی هەوڵەکانی جەمالەدینی کرد، بەڵام کارەکان بەو شێوەیە درێژەی نەخایاند تاوەکو مارەکانی دوو زمانی دژ بە ئەو خۆیان خشاند، کەسانێك هاتن‌و چپاندیان بە گوێی خدیوی نوێداو تێیانگەیاند کە سەید لەم ئاست‌و سنوورەدا ناوەستێ، لەوانەیە بیر لە شۆڕشێکی ترو بەرپاکردنی فەرمانڕەواییەکی جەماوەری وشتی لەو جۆرە بکاتەوە، بەردەوام دوو زمان‌و مەرایی خوازەکان بەم ئاستە ناشیاوەدا قسەکانیان دەڕازاندەوەو شتیان ڕێك دەخست، لە کوتوپڕێکدا فەرمانێك دەرچوو بۆ دوور خستنەوەو دەربەدەرکردنی جەمالەدین بۆ سوێس، لەوێوە چوو بۆ هیند، پاشان هاتەوە میسر، بزوتنەوەی عورابی لە نادیاری ئەودا روویدا، ئینگلیزیش میسری داگیرکرد).[1]

پاشان چوو بۆ ئێران لەوێ شوێنەوارەکانی ستەم‌و زۆرداری و کارەساتی جەورو ستەم مافخوراوی‌و لە دەستدانی بەرژەوەندییە گشتییەکانی خەڵکی بە چاوی خۆی بینی کە خرابوونە خزمەت حەزوو ئارەزوی تاکە کەسەکانەوە، هەموو ئەمانە ئەوەی لە بیریدا چەسپاند کە کار بکا بۆ لابردنی شا لەو پلەو پایەی کەتیایدا بوو.[2]

لە (دائرة المعارف الاسلامیة الفرنسیة)دا هاتووە کە:

(سەید موحەمەد کوڕی سەفتەر، یەکێك بووە لە پیاوە گەورەکانی

---

(١) سەرچاوەی پێشوو

(٢) سەرچاوەی پێشوو

ئیسلام لە سـەدەی نـۆزدەدا بـەپێی بۆچـونی (بـراون) فەیلەسـوفو نووسەرو وتاربێژوو رۆژنامەنووس بووە، پێش هـەموو شـتێك سیاسـی بووە، هەواداراني بـە نیـشتمان پـەروەرێکی گـەورە تێیـان روانیـوەو دووژمنانیشی بەوروژێنەرێکی مەترسـیدار، کاریگەریـەکی گـەورەی هەبووە لەسەر بزاڤە ئازادیخوازەکانو ئەوانەی داوای راوێژیان کـردووە، کە لە دەیەکانی دوواینی ئەو سـالآنەدا بەدەرکـەوتن، لـە حکومەتـە ئیـسلامیەکاندا بزوتنەوەکـەی مەبەسـتی بـوو ئـەو پادشانـشینو مەملەکەتانە لە ژێر دەسەلآتی ئەورووپیەکان دەربهێنێت و رزگاری کـا لە ئیستغلال کردنی بیانیەکان، وە هەولی دەدا کاروبارە ناوخۆییەکان پەرەی پێبدا بە دامەزراندنی چەندین دامودەزگای ئازاد

بەهەمـان شێوە بیری لـەوە دەکـردەوە تـەواوی ئـەو حکومەتانـە -لەناوياندا ئێرانی شیعی- پێکەوە کۆبکاتەوە لە دەوری خەلافـەتێکی ئیسلامی تاوەکو بەویەکێتیو یەکگرتنە رێ بگرێ لەدەست تێوەردانی ئـەورووپی لـە کارەکانیانـدا، جەمالـەدین بـە پێنـوسو زمـانی، راسـتگۆترین نوێنـەرو نماینـدی کۆمکـاری ئیـسلامی (الجامعـة الاسلامیة)یە بوو، خێزانە بەرێزەکەی دەگەرێتەوە سەر حوسێنی کوری عەلـی کوری ئەبوتالیب لە رێی فەرمودەناسی بەناوبانگ (الترمذي) یەوە، هەر بەر لەئەمەش نازناوی (السید)ی پێ بەخشراوە). [1]

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

ئەفغانی هەستی بـە مـەترسـیەکانی زۆرداری سیاسـی کردبـوو، وە دەیزانی سەردەکێشێ بۆ پەرتـەوازە بـوون و پـەرتبوونی ئومـەتو زاڵ بوونی ئیستعمار بەسەریدا، ڕێگەی رزگاریو سەربەخۆیش تەنها بریتی بوو لە چاکسازی گوتاری سیاسی، هەوڵێکی زۆری دا بـۆ ئامۆژگـاری کردنی خەلیفەی عوسمـانی (سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم) تـاوەکو کاروباری دەوڵەت چاکسازی بکا لە ڕێی ڕاوێژو ئازادیو هەوڵـدان بـۆ یـەکگرتن لەگـەڵ ئێرانـدا بـۆ ڕوو بەڕووبونـەوەی هاوپـەیمانێتی داگیرکاریو ئیستعماری خاچی کە دەستی کردبوو بە زاڵ بوونو دەست بەسەرا گرتنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی.[1]

گرفتـی ڕۆژهـەڵاتی ئیـسلامی و هۆکـاری لاوازییـەکانی لـە یادەوەریەکانیدا شیتەڵ دەکـات و دەڵـێ: (گاڵتەجارییـە هەڵبـسین بـە خۆپیێـوان لەگـەڵ پێـشینە چـاکەکاندا، ئەگـەر پێوانەکـە لەگـەڵ جیاوازیشدا بوایە کارەکە سوکو ئاسانو زیانەکەش کەم بـوو، بـەڵکو پێوانەکردنەکە بە تەواوی پێچەوانەیە ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَـا بِقَـوْمٍ حَتَّـى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ (الرعد: ١١) وە دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّـهَ لَـمْ يَـكُ مُغَيِّراً نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (الأنفال: ٥٣) وە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُـورِ مِـنْ بَعْـدِ الـذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ (الانبياء: ١٠٥) وە دەفـەرموێت: ﴿وَلِلَّـهِ

(١) سەیری (خاطرات جمال الدين الأفغاني) بکە.

الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (المنافقون: ٨) وە فەرمویێت: ﴿وَكَانَ حَقّاً عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الروم: ٤٧) وە دەفەرمویێت: ﴿وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً﴾ (الفتح: ٢٨)

خـوای گـەورە بـەڵێنی داوە لـە ئایەتـە روونو ئاشـکراکانیدا بـە شێوازێك کە تەئویل پەسەند ناکات، کەسێ ئەو ئایەتانـە بـە خراپـی لێك دەداتەوەو تەئویلی دەکا کە ڕێگەی وون کردبێ و سەری لێ شـێوا بێت، وە بەدوای ئەوەوە بێت کە ووتەو شتەکانی تـر لـە جـێی خۆیـدا دانەنێو بیان شێوێنێ، ئەمە بەڵێنی خوایە بـۆ ئـەم ئومەتـەی خـوا خستویەتیە بەر بەزەیی و خوای گـەورەش بەڵێنـەکانی دەباتـە سـەر، بەڵێنی سەرکەوتنو سەبەرزیو قسە بالآیی پێداوە، ڕێی خۆش کـردووە بۆ دەستکەوتنی بەرئەنجامی ئەو بەڵێنانەی تا ڕۆژی دوایی سەربەرزیو سەرفرازیەکەی سنوری نیە.

بەڵێ، خەڵکێك ڕاستگۆ بوون لەگەڵ ئـەو پەیمانانـەی بـە خوایـان دابو، ئەویش پاداشتی خۆی پێدان کە سـەربەرزی دونیـاو بەختـەوەری ڕۆژی دوایی بوو.

ئەم ئومەتە لەمڕۆدا ژمارەی بـەنزیکی دەگاتـە دووسـەدو هەشـتا ملیۆن،پانتایی زەوییەکەی هەروەك پێشتر ڕوون کرایـەوە لـە زەریـایی ئەتڵەسییەوەیە تا ناوەوەی چـین، زەویو زاری پـاكو پوخـتو بەپیتـەو چەندین وولاتی بەرینو فراوانە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبیـنین وولاتـانی بـە تـالآن بـراوە، سـامانەکەی داگیرکـراوە، بیانیـەکان زاڵو دەسـەڵاتدارن

بەسەر تەواوی گەلانی ئەو نەتەوەیـەدا گـەل بـە گـەلی، زەویەکـەیان بەشبەش کردووە، پادشا نـشین‌و هەرێمـەکانی پـەرت پـەرت کـراوە، قسەیەکی بیستراوی بۆ نەماوەتەوە، گوێڕایەڵی ناکرێت، تەنانەت ئەو پادشایانەشی کە ماویەتی، هەموو ڕۆژێك لە چورتم‌و تەنگانەیەکـدان وە تووشی ناخۆشی‌و شـەوەزەنگی ئەنگوستەچـاو دەبـن، کاتـەکانیان بەشی ئەو کارەساتە ناکات کە ڕووبەڕوویان دەبنەوە، ترس‌و بیمەکانیان لە هیواو ئاواتەکانیان گەورەترە .

بەبەرچاوی خۆمانەوە دەبینین بیانیەکان وڵاتەکانمان داگیر دەکـەن، کەس‌و کارمان سەرشۆڕو ژێردەست دەکەن، خوێنێ برا بێ‌تاوان‌و پاك‌و بەریئەکانمان دەڕێژن، جوڵەیەك لەکەسمانەوە نابینرێ .

ئـــەم ژمـــارە زۆرە، ئـــەم ڕەشـــاییو جـــەماوەرەی ئـــەم میلەتـــەو ڕۆژهەڵاتیەکانی تر، بۆ بەرگری کردن خۆیان‌و نیشتمانیان لە زیـادەی ماڵـــەکانیان، شـــتێك نابەخـــشن، ژیـــانی دونیایـــان هەڵبـــژاردوو خۆشەویستیان بۆ دونیا بە ڕادەیەکە هەریەکەیان پێی خۆشـە هـەزار ساڵ بژی با خواردەمەنی سەرشۆڕیشی بە قوڕگدا بکرێت‌و دەرخواردی دریێ‌و جل‌و بەرگی شڕۆڵی‌و نەداری بێ‌و جێگەو ڕێگەشی سوکایەتی‌و بێ ڕێزی بێت.

ڕۆژهەڵاتیەکان بەگـشتی‌و موسـڵمانان بـە تایبـەتی کـە خـاوەنی موڵکی داگیرکراون‌و سامانی بەتاڵان براون، خاوەنی یـەك قـسە نـین، پەرتەوازەو ناکۆکن، برا سۆزی بۆ برا نیە، دراوسێ ئـاوڕ لـە دراوسـێ

ناداتەوە هەریەکەیان چاوەڕێی هەلێکێتی تا زیان لەویتر بـدات، ڕێـز لە دروشمی ئاینەکەمان نـاگرین و بـەرگری لـە پایـەگاو حـەوزەکانی ناکەین، بە گیانو سامانمان سەربەرزو سـەر فـرازی ناکـەین هـەروەك فەرمانمان پێ کـراوە، ئایـا ئەوانـە خـۆ بـە بـاوەڕدار دەزانـن و ئـەو پۆشاکەیان پۆشیوەو وادەزانن خوای گەورە تەنها بـە قـسەو گوفتـاری سەرزمانیان لێیان ڕازی دەبێت و لە دڵەکانیان ناپرسێتەوەو حسابی بۆ ناکا؟ ئایا خوای گەورە لێیان ڕازی دەبێت بەپێی بەرژەوەندییـەکانیان بیپەرستن؟ ئەگەر خێرو بێریان تووش بوو دڵ ئارام بـن پـێی، ئەگـەر تووشی ئازارو ناخۆشیەك بێن هەڵگەڕێنـەوە، دونیـاو دواڕۆژیـش لـە دەست بدەن .

ئەوروپیەکان چەندەها سیاسەتو ڕێو شوێنیان گرتەبەر بۆ فراوانو بەرینکردنی شانشینەکانیان، هونەرکاریان کـرد بـۆ دۆزینـەوەی ئـەو هۆکارانەی دەیانگەیەنێتە ئەو ئامانجەیان، زیـرەکترین و خێراترینیـان لەمەدا (ئینگلیز) بوو کـە تـوانی دەسـت بگرێـت بەسـەر زۆرتـرین شوێندا، ئەوان لە پێشەوەی ئەو وولاتە ڕۆژئاوایانەوە بوون کە دەیانزانی داگیرکردنی وولاتـانو خۆسـەپاندن بـە سـوپاو هەوڵـدانو کوشـتار، نالەبارو بێزارترین کارێکە، بەڵام هاتنە ناوەوە لە دەروازەی فرتو فێڵو نەرمو نیانیو گـزیو سـاختەکاری یـەوە، ئاسـان و لـەبارترو نزیـكو کـــاراترین هەوڵدانێکـــە، ئەمـــەیانی وەك چـــەکێك بـــەکارهێناو سەرکەوتنێکی یەکجار گەورەی پێ ئەنجام دا، وازی لە یەکەم هێنا کـە

بریتی بوو لە (جەنگ‌و کوشتارو دەستگرتن بەسەر وولاّتاندا بـە زۆرو ناچاری‌و گەڕایەوە بۆ دووەم‌و چادرو عابایەکی لەبـەرکردوو نـاوی نـا نەرم‌و نیان‌و خۆش پۆش، ئەم داگیرکاری یەشی ناونا ئیـستعمار واتـە (ئاوەدانکردنەوە) ئەو شارنشینانەشی داگیری دەکـردن نـاوی نـا بـوو (ئاوەدانکراوەکان) (المستعمرات) ئەو خەلّکەشی فەرمانڕەوایی دەکردن ئاوەدانخواز (مـستعمرین) بـوون، کارەکـە بـەو شـێوەیە ڕۆی تـاوەکو پەیدابوو (تجلّی) پەیدابوو، ئەوان دەستپێـشخەریان کـرد، وولاّتـانی تریش بەدوایاندا هاتن‌و (شکیت)یش هاتە ئاراوە.

ئـەم ئیـستعمارە لـە رووی زمـان‌و زاراوەوە، لـە رووی چـاوگ‌و داتاشراوەوە، من تەنها بە ناوە دژەکان (اسماء الأضداد) دەیبینم، بەڵکو نزیك ترە لە کاولکاری‌و وێرانکردن (الخراب والتخریب)و بەندەو کۆیلە کردن (الأسترقاق والإستعباد)ەوە وەك لەوەی بنیات نان‌و ئاوەدانکاری‌و ئاوەدان خوازی (العمار والعمران والاستعمار) بێت، وولاّتە داگیرکـەرو ئیستعمارەکان تەنها بۆ ئەو وولاّتانە دێن کە دەوڵەمەندن لە سەروەت‌و سامان‌و کان‌و کانزاداو خاکەکەیان بە پیتە، وە بۆ ئەو ناوچـانەی کـە خەڵکەکانی کەڕەواڵەو نـەفام‌و نـەزانن‌و تەمبـەڵی‌و تـەوەزەلی بـاڵی بەسەریاندا کێشاوەو هیچ بزوتنەوەو جوڵەیەکیان نیەو نزیکـی شـەڕو پێکداداان ناکەونەوە .

ئەگـەر (وەك ڕیزپـەڕی‌و ناوازەییـەك) دەوڵەتـە ئیـستعماریەکان ڕێگایان بکەوێتە هەندێك شانشین‌و ناوچە، کـە سـوڵتان‌و میرەکـانی

بەرگریـەك پیـشان بـدەن، ئـەوا بریتـی دەبێـت لـە دەسـتەو یەخـەو پەلاماردانێکی بچووکی جەنگی لەگەڵ چەكو تەقەمەنیە نوێیەکان و پادشا یا میرەکە بە دیلی گیراوەو لەگەڵ خاوو خێزانیدا بە سوكو سەر شۆڕی رەوانەی شوێنێك کراوە لـە تـەنگ تـرینو دوور ئـاوەدان تـرین وڵاتدا دەست بەسەر کراوە، شانشین یا دوورگە یا ناوچەکەی خراوەتـە سەر ریزبەندی (مستعمرات) ەکانەوە بەمەش سەرفرازترین کەسی ئەو وڵاتە سەرشۆڕکراون، لە بری ئازادی تاکـە کەسـی کۆیلایـەتیو دەم بەستن جێگەی گردووەتەوە، تەرازوو دانراوە تاوەکو لێپرسینەوە لەگـەڵ هەرکەسێك بکرێت کە قنگ چاو دەدات یـان چـاو دەبڕێتـە شـتێك و بەرەو دواوە ئاوڕدەداتەوە، خێروبێری وڵات بۆکەس نەبووە، هەموو باجو لێدانەکان، زیانو کارەساتەکان، بەشی خەڵکی وڵات بووەو باربوە بە سەریاندا، لەمەدا کەس هاوبەشیان ناکات.[(١)]

ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر بەناوی (گەمەی جەنگەوە) هاتبێت، بەڵام ئەگەر بۆ هاوکاریو پشتیوانی میر یا چەسـپاندنی پادشـاییەکەی یـا سەرکۆنەکردنی شۆڕش هاتبێت وە لەژێر ئەو پەردەیـەداو بـەو نـاوەوە گەیشتبێو ئەو پۆشاکەیان پۆشی بێو لە بەرگی هاوڕێی ئەمینداری دڵسۆز یا خۆشەویستانی گەلو خەمخۆرانی گەشـەپێدانیو فێرکـارانی وانەکانی خۆ بەڕێوەبەری بن، بۆ ئەوەی پاشـەڕۆژ پێویـستیان بـەمان

(١) سەیری واقیی جیهانی ئەمڕۆی عەرەبی بکە، ئەمڕۆ چەند بە دوێنێ دەچێت ؟!

نــەبێت و خۆیــان بــە خۆیــان وڵات بــەڕن بــەڕێوە!! لێــرەدا ڕوکــاری کاروبارەکان پارێزراون، هەندێ لــە بــاوو نەریتــە پڕوپوچــەکان وەکــو خۆیانن‌و دەست لــێ نەدراون‌و حوکمــەکان شــکڵ ڕێــژ دەکــەن لـــــە پێناوی بەڕێوەبردنی ئەرك‌و کاروباری وڵات، خەڵکانێك ســاز دەکــەن، میری وڵاتیش لەگەڵیاندا تەنها قوببەو قوچــەکێکی بــۆش‌و بەتاڵــە، تەنها دەنگ دەداتەوە، لە کاروبارەکاندا تــەنها شــوێن کــەوتنیان لــە سەرەو هیچی تر.

پێم بڵێ: ئەگەر ئەمریکاییەکان ســاڵانێکی زۆر تــەنها ســکاڵایان بکردایە لــە دەســتی کاربەدەســتە ئینگلیزەکــان و ئــەو ســکاڵانەیان ڕەوانەی ئەنجومەنی وەزیرانی ئینگلیز بکردایە، مەرەکەبەکانیان گشت تەواو کردایەو لاپەرەکانی سەرزەیان ڕەش بکردایەتــەوە لــە بێ‌مــافی‌و هاوارو هانا، ئایا هیچ سودێکی دەبوو بۆ سەربەخۆییان، یاخود بــەڵاو نالەباری ئیستعماری بەریتانیەکانیان لادەبرد؟

نەبەو کەسەی بەهەشتی کردوەتە ژێر سێبەری شیرەکانیەوە، هێــزی هەر نەتەوەیەك لە نێــو تاکــەکانی خۆیاندایــە، تــەنها بــە یــەکێتی‌و یەکگرتن بــەدەر دەکــەوێ وە بــە پەرەتــەوازیش دەشــاردرێتەوە، هــەر نەتەوەیەك ویستبێتێ سەروەریەکانی بگێڕێتەوە، وە ڕزگاری بێــت لــە چەوسێنەرەکانی وە بەدەر لە ڕێی یەکگرتن‌و یەکێتی، بۆ گەیــشتن بــە مەبەستەکان‌و ڕزگاربوون لە ناسۆریەکان چارەسەرێکی تر نیە، تــەنها خۆشەویستی مردن لە مردن ڕزگارت دەکات و مرۆڤ یەکێك لەو دوو

بەختەوەرییەی پـێ دەبەخـشرێ یـا ئـەوەتا ئازادانـەو سـەربەخۆییانە (بەختیارانـە) دەژی، یـاخود بـەبێ ئـەو دووانـە وەك (شـەهیدێکی پاڵەوان) دەمرێ.

پاشانشین یا نەتەوەیەکم پێ نیشان دەن، کە پادشاو میرەکـانی لـە هیچو پوچیو زیادەڕەویدا نقـوم بووبێـت، نـەفامیو نـەزانی هـەموو چینەکانی گەلی گرتبێتەوەو یەك گوفتاریان نەمابێت، هەموو ملیـان دابێ بە سەرشۆڕی و سوکایەتی، ئەو پادشاو میرانە لەسـەر تـەختو پلەو پایـەکانیان لانـەبرابێت و ئیـستعمار نـەیکردبێت بـە کۆیلـەو کارلکاری نەیگرتبێتنەوە ... !!

پاشانشینو کیشوەرێکم پـێ بڵـێ یـەك گوفتارییـان هـەبووبێت و سەرشۆڕیو کۆیلەیەتیان پەسەند نەکردبێتو شێریان هەڵکێـشابێتو مردنیان لا خۆشەویست بووبێت، پاشـان نـەیتوانی بـێ سـەربەخۆیی بەدەسـت بێنـێو چـێژی لـە ئازادیـەکانی وەرنـەگرتبێ، هەرچـەندە ئیستعمارەکەش گەورەترین وڵات بووبێت لە ڕووی هێزو تواناوە؟!

ئایا پێویستمان بە هێنانەوەی بەڵگەو نمونە گێڕانەوە هەیە، لەسەر ئەوەی بچوکترین نەتەوە توانی ڕاپەڕێ دژ بـە گـەورەترین دەوڵـەت و، پێداویستییەکانی دەستخاتو ئـازادیو سـەربەخۆیی خـۆی بەدەسـت بهێنـێ .

ئایا میسریەکان بە گومانن لەوەی لە کاتێکدا ئەوان زیاتر لـە دە ملیۆن کەسن و هەموویان نەوەی رزگارکـەرانن وە لـە سـەربەرزترین

هۆزەکـــانی عـــەرەبن، براقیبتیەکانـــشیان نـــەوەی توانـــادارو کەســـە بـــەهێزەکانن، ئەوانـــەی شـــوێنەوارەکانیان بەڵگەیـــە لەســـــەر وورە گەورەییان - ئەوان کاتێ بیانەوێ ڕاپەڕن، ناتوانن سەربەخۆیی‌و ئازادی بەدەست بهێنن؟! وە ئەو سەربەرزییە کـۆن‌و پێـشینەیەی ئـەم وولاتـە بەختەوەرە بگێڕنەوە ؟!

بەڵێ!! ئەوان بە ویستی خوا هـەر ڕادەپـەڕن‌و یەکگرتوانـە کـاری خۆیان دەکەن، دەست بە کەمـــەندی خواوە دەگرن، بـەهێزو توانــــای خوا ئاواتەکانیان بەدی دەهێـنن، خـوای گـــــەورەش توانـای هــەموو شتێکی هەیە.

لەو شتە سەرسام‌و نامۆیانەی، شایستەی سەرسامی‌و واق وڕمانە، ئەوەیە لە موسڵمانان دا دەیبینین، ئەوان بـەپێی شـەریعەت و دەقـە ئاشکراکانیان لەلایەن خوای گـەورەوە داوایـان لێکـراوە پارێزگـاری‌و بەرگری بکەن لە هەرکەس‌و وولاتێك کە دەیەوێت ببێتـە زەوی و زارو هەرێمەکانیانەوە، هەموویان ئەمەیان لێ داواکراوە، جیاوازی نیـە لـە نێوان دوورو نزیکدا، لە نێوان یەك رەگەزی‌و جیاوازی رەگەزیاندا ئەوە فەرزی عەینە لەسەر هەریەکێ لە ئەوان ئەگەر خەڵکێك بەرگری لـە دەوروبەرو ناوچەی خۆیان نەکەن، هەموو لایەکیان زۆر گوناهبار دەبن وە لەو شتانەی ئەرك‌و فەرزە لەسەریان لە پێناوی بەرگری‌و پاراستنی هــەرێم‌و دەســەڵاتداری ناوچــەکانیان، بەخـشینی گیــان‌و ســەروەت‌و سامانە، بڕینی هەموو ناخۆشی‌و تەنگەوەری‌و مەترسیەکانە، بە هیچ

شێوەیەك دروست نیە ئاشـتەوایی بکـەن لەگـەڵ ئەوانـەی زاڵ دەبـن بەسەریاندا تاوەکو دەسەڵاتداریو فەرمانداری تایبەت دەبێ بە خۆیانو لە دەسـتی ئـەوانی تـر دەری دەکـەن، شـەریعەت بـە زیـادەوە داوای سەروەریان لێدەکاو دەخوازێ لەوانی تر رزگاریان بێت تائـەو ڕادەیـەی ئەگەر موسڵمان بێتوانا بوو، وە هەستی دەکرد ژێردەستەی دەسـەڵاتی ئەوانی ترە، پێویستە لەسەری لەو خانەی جەنگە کۆچ بکـات، لەبـەر چـرپەو سـرپەیەك کـە لـە ناخیـدا ئاگـاداری دەکـاو داخوازیـەکانی شەریعەتی پێ دەگەیەنێ و فەرزو ئەرکە ئیمانیەکانی وەبیر دەخاتـەوە ئەویش چرپەو سروەی رەواو هەقە کە لە ئیلهامـەکانی ئاینـەوە بـۆی ماوەتەوە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش دینـداران لەئـەمڕۆدا بێئاگـان لەوەی تووشی ئەوی تریان هاتووە، وە ئازار ناچەژن بە هۆی ئەو ئـازار چەشتنەوەی ئەوانی تریان تووشی بوون، خـەڵکی بلوجـستان بـزاوتو گاڵتەجاڕیو یاریبە نارەواکانی ئینگلیزیان لە ئەفغانستاندا دەبینی و بۆیان دەڕوانی بێ ئەوەی بۆی بخروشێنو دڵیان بسوتێ بـۆ براکانیـان، ئەفغانیەکان ئاگاداری دەستێوەردانەکانی ئینگلیز بـوون لـە وڵاتـی فارسدا بێئەوەی بێزاری دەربڕنو جێبەخۆیان نـەگرن، هەردووڵاشـیان ئاگـاداری ئـەو زۆرو سـتەمو سـوکایەتیو بـێ شـەرمیە بـوون لـە هیندستاندا ئەنجام دەدرا بێ ئەوەی بۆی ببزوێن، سەربازەکانی ئینگلیز ئەمسەرو ئەوسـەریانە لە میسردا، دەکوژنو دەبـڕن، لـە بەرامبـەردا هیچ بەدەمەوە هاتنو هانایەك لـە نـاخی ئـەو برایانـەوە نـابینن کـە

ئاگاداری ئەو جۆگەلە خوێناویانەن و دەڕواننە ئـەو کارەســاتو بـەڵاو نەهامەتیانەی تووشیان بووە .

لەولاشەوە دەبینن نەتەوەی یابان بەرەو گەشەکردن دەچـێ، گرفـتو کۆسپەکانی سەر ڕێی نامێنێت، دوورگەکانی لەوپـەڕی ڕۆژهەڵاتـەوە شوێنو پایەی خۆیانیان بۆ دروست دەبێت، هەر بۆیە لەگەڵ زەمانـەدا ئاشتەوایی بۆ دروست دەبێت، وە لە چاوی تەماعکاری ڕۆژئاواییـەکان بەدوور دەبێت سەرەڕای بـوونی یـەکێك لـە هۆکـارە گەورەکـان کـە یەکێکە لە بەتواناترین هۆکارەکانو گەورەترین ڕۆڵـی هـەبووە لـەو ڕووەوە ئەویش بریتیە لەو حەزەی ئیمبراتـۆر (میکـادۆ) هەیـەتی بـۆ ئەوەی حکومەتەکەی بە دەسـتور، کـۆتو بەنـدو سـنوردار بکـات، ئارەزو مەندانە راوێژ پەسەند بکات وە دڵسۆزو وێڵی ئەمە بێت، ئەوە بوو چەند کەسێکی لە خاوو خێزانەکەی و لە ژێرمەندانی خەڵکەکەی ڕەوانەی ئەورووپا کرد تاوەکو شێوازو بنەماو ڕێساکانی فـەرمانڕەوایی‌و نوێنەرایەتی دەستوری بخوێنن، تەنانەت ئیمپراتۆری نەمـسا فرانـسوا جۆزیف خۆی پێ نەگیراو بە کوڕە مامی میکادۆی ووت لـە کاتێکـدا ئەو لەسـەر خـوانی ئیمپراتـۆر بـوو لـە ڤیـەنا (سـەرم سـوڕما لـە ئیمپراتۆرەکەی ئێوە! چۆن هـەوڵ دەدا بـۆ بـەدیهێنانی فـەرمانڕەوایی دەستوری نوێنەرایـەتی لـە شانـشینەکەیدا لـە کاتێکـدا ئێمـە لـە ئەورووپادا ئاواتەخوازین ئەگـەر بتـوانین فـەرمانڕەوایی نوێنـەران لـە وولاتدا نەهێڵین‌و لێی دەربازبیـن).

(البرنس)ی یابانی وەڵامی دایەوە ووتی: (لـە راسـتیدا میکـادری سەروەر (میـکادر واتە دادگەر) چوار شتی خۆش دەویّ:
یەکەم وولاّتەکەی، دووەم خـەڵك‌و نەتەوەکـەی، سـیّیەم دادگـەری، چوارەم حەوانەوەی دەروونی خۆی، ئەوەشی ئەم حەزانەی بۆ بەدی دیّنـیّ تەنها لە فەرمانڕەوایـەتی دەسـتوری نوێنەرایـەتی دایـەو بەشـداری کردنی خەڵك لە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی خۆیی‌و پاراسـتنی سـامان‌و دارایی‌و موڵکی دا بەدی دێت.(*)
بەڵیّ: لە راستیدا چاوگی نەهامـەتی و سەرچـاوەی مەینـەتی لـە ڕۆژهـەلاّت‌و شانـشینەکاندا لـەو سـودو ئیمتیازاتـە بیانیانـە (قابیتولاسیون) وە بەدی دێت، کە پێشتر باسکرا، وە باسـی ئـەوەمان کرد سەرەتاکەی چۆن بـووە، وە چـۆن لەوپـەڕی ڕۆژهەلاّتـەوە (صـین‌و یابان) وە تا ئەم پەڕی ڕۆژهەلاّتی نزم‌و خوارو وولاّتی عوسمانی‌و فارسی گرتوەتەوە وە چۆن یەکەمجار وەکو بەزەییەك بەخشراوە و دواجار کراوە بە تۆڵەسەندنەوەو مەینەتیەك بۆیان .
یابان زانی لە نەزانی‌و نەفامیدا هێز بەدی نایەت وە لەگەڵ بـوونی زانست‌و زانیاریشدا لاوازی و بیّدەسەلاّتی نیە، هـەر بۆیـە تورەبـوونی خۆی شاردەوەو بەرگری زۆرداری‌و ئیمتیـازاتی ڕۆژئاواییـەکانی گـرت،

---

(*) لە عەرەبیدا نووسراوە (صوف ملكها) بەبیّ دیاریکردنی حرکات ئەمەش وادەکات واتای ووشەی (ملكها) روون نەبیّت کە دەکرێت بەو پیّیەی سەرەوە بیّت، یاخود بە واتای پادشاکەی واتە (مليكها) بێت یاخود بە واتای نزیك لە شانشین (مملكە)ش بێت ) (وەرگێڕ)

ڕووەو چاولێکەری دروست هەنگاوی نا (بەســەدان نێـردراوی زانـستی یابانی بـۆ ئـەورووپا ڕەوانـەکردوو بەسـەر بـەشو لقـەکانی زانـستو هونەرەکانــدا دابەشــی کــردن، بــە دارایــیو سیاســی و زانــستی و کشتوکاڵیو پزیشکیو ئەندازیاری و ... هتد ەوە چارەکە نەوەیـەك بـە سەر ئەم هەوڵەی یاباندا تێ نەپەڕی، تاوەکو دادگاکـانی ڕێکخـست، زانستی دروست لـە نێـو تـازە پێگەیـشتواندا بـڵاوەی کـرد، چـینی ڕووناکبیر ئاشنا بوو بەوەی چی پێویستە لەسەری ئەنجامیداو بـەکاری بهێنێ و فێری چینەکانی نەتەوەکەی بکات، لە قوتابخانـە نیـشتمانیە یابانیەکاندا

بەم هەوڵدانــەش دەســتەیەکی کۆمـەڵایـەتیو نەتـەوەیی دروسـتی مەدەنیان بۆ ڕەخسا کە بواری نەهێشتەوە بۆ خۆبەگەورەزانو مل هوڕە ڕۆژئاوایەکان کە بانگەشەی ئەوە یاخود دەم هەڵبەستی ئەوە بکەن کە ئەوان (ڕۆژهەڵاتین)و کاروباری بەڕێوەبردن بە باشی نازانن یاخود ئاشنا نین بە مافە گشتییەکان یان بە دادگەری ڕەهایی مرۆیی .

لە خزمەتگوزارییە یابانیەکاندا چەند پسپۆڕێکی بیانی هەبوو لە لقــە بەڕێوەبەرایەتیەکەیانــدا بــۆ چــەند ســاڵێکی دیــاریکراو، بــە موچەیەکی بڕاوەوە، هەر کاتێك یابانیەك لە بەشو لقێکدا کارەکـەی تەواو دەکـرد دەیـانکردە هـاوەڵی ئـەو پـسپۆڕە هــەر بۆیــە ئاشـنای وردەکاری یەکانی ئەو لقەو پێداویستییەکانی دەبوو بەوپەڕی زانستو تێگەیشتنو وردەکارییەوە، تـا ڕادەی ئـەوەی یابانیەکـە لـە سـەرۆکە

ئەورووپیەکـەی باشـترو چـاکتر بـەدەر دەکـەوت تـا وای لێهـات ئـەو کرێگرتانە شەرمیـان لە خۆیان دەکرد، داخوازی بەخشینیان دەکرد لە خزمەتگوزارییەکانیان پێش ئەوەی وادەی گرێبەسـتەکە کۆتـایی پـێ بێت، وە ڕازی بوون بەوەی لە موچـەکانیان ببـورن، بـەو دانپێـدانانەو بیانووەی یابانیەکە بە تواناترن لەوان لە جێبەجێکردنی ئـەو پیـشەو کارانەی لە پێناویدا هاتوون وە کرێی لەسەر وەردەگرن .

بەم شێوەیە یابان بە چاولێکەری سوود بەخش سەرکەوتنیان بـەدی هێنـا، وە لـە نێـو دەوڵەتـە گەورەکانـدا بەدەرکـەوتن، دەوڵـەتێکی ڕۆژهەڵاتی خاوەن هێزو دەسەڵات، زانستو یەکگرتنەکـەیان هێزێکـی ترسێنەر بوو، وە سنورێکە خـۆی لـێ دەپـارێزرێ خـەڵکیش ڕۆڵـەی چاکەو ئەمەکداری چاکە خوازانن خـوای گـەورەش لـە مەخلوقاتیـدا مەبەستی خۆی هەیە.(١)

پاشتریش ئەو دەستوردانانو ئەنجومەنی گەلەی دەوڵـەتی عوسمـانی دایناو نوێنەری هەموو هەرێمەکانی عوسمـانی تیـادا بـوو لەوانـەش عێراقو شامو یەمەن و حیجاز سودێکی پێنەگەیانـد، چونکـــە ئـەم چاك سازیانە لە کاتێکدا بـوو دەوڵـەت بـەرەو لاچـوونو تیاچـوونو نەمان دەچوو.

بانگەشەو بانگەوازە چاکسازیەکەی جەمالەدینی ئەفغانی ئـەوەی بۆ ئەنجام نەدرا کە بانگەوازو بانگەشـە چاکـسازیەکەی موحەمـەدی

---

(١) خطرات جمال الدين افغاني، ل (١٩٥-٢٢٢) بە کورت کراوەیی.

کوڕی عەبدولوەهاب بەدی هێنــا، چــونکە شــێخ موحەمـــەد هەســتی بەوەدەکردبو کە پرۆژەی چاکسازی ناکرێــت رۆشــنایی ببینــی ئەگــەر نەتوانرێ دەوڵەتێك بەرپاکرێ لە پێنــاوی ئــەو پرۆژەیــەدا، هــەر بۆیــە توانی گوتاری سیاسی شەرعی نوێ بکاتەوە تا کاتی پێش بەرپاکردنی دەوڵەت، بەڵام پاش بەرپاکردنی و زاڵ بوون بەســەر هــەموو دورگــەی عەرەبیدا، نوێکردنەوەکە وەستا، سەرلەنوێ گوتاری سیاســی شــەرعی تەئویل کرا و زیندوکرایەوە بەو شــێوەیەی لــە کتێبــەکانی (الأحکـام السلطانیة) دا هاتووە، هەر بۆیــە ســەرکەوتوو بــوو لــە بــەرپاکردنی دەوڵــەتو زینــدوو کردنــەوەی ســەرلەنوێ گیــانی ئیــسلامی و نــوێ کردنەوەی نیشانەو مەشخەڵەکانی یەکتاپەرستی، بەڵام ئەمە هاوڕەوتی نوێکردنەوەیەکی فیقیهانە نەبوو هەر بۆیە دەوڵەت لە رووی فیقهیەوە لەسەر رێبازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەڕل بوو، لە بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسەتیش دا بەو شێوەیە دەچون بــەڕێوە کــە لــە کتێبــی (الأحکـام السلطانیة) ی ئەبو یەعلای حەنبەلی دا هەبوو کە نمونەیەکی گوتــاری سیاسی شــەرعی تــەئویلکراو بــوو، بــە وێنــەی تــەواوی کتێبــەکانی (الأحکام السلطانیة) کە بەرهــەمی ســەردەمی عەباســیو بارودۆخــە تایبەتیەکانی بوو.

لە راستیدا شێخ موحەمەد بلیمەتو هەڵکەوتوو بــوو، پــڕاو پــڕی واتای ئەو وشەیە، ئەوەبوو توانی ئەو ســەرئەنجامە بــەدی بهینــێ کــە

چاکسازەکانی تر بۆیان بەدی نەهات، لەگەڵ ئەوەی لە دوادوایـەکانی سەردەمی عەباسییەوە هەوڵیاون بۆی دەدا تا سەردەمی خۆی، هەروەها دوای خۆیشی کەس نەیتوانی ئەوە بەدی بهێنێ کە ئەو بەدەستی هێنا، ئەکرێ هۆکارەکانی ئەو نوێ نەبونەوەیە لە گوتاری سیاسی شـەرعی پاش بەرپابوونی دەوڵەت بگێڕینەوە بۆ پێویست نەبوونی کۆمەڵگە بۆ ئەو نوێکارییـە لەوکاتـەدا، بـەڵکو زیـاتر پێویـستی بـە چاکـسازی بیروباوەڕو بەرپاکردنی یاساکانو بەدیهێنانی ئاسایشو دادگەری بـوو، ئەمە تەواوی ئەو شتانە بوو خەڵکی دوورگەی عـەرەبی لەسـەردەمی ئەودا پێویستیان پێ بوو، بەڵام بانگەوازی پێشین گـەرایی (الـسلفية) زیندوکردنەوەی ڕێوشـوێنی خەلیفـەکانی راشـیدینی دەخواسـت لـە فەرمانڕەوایيو بەڕێوەبردنی کاروباری ئومەتو بەسەرمەشـق کردنـی ئەوان و شوێنکەوتنیان لەوەدا کەکاروبار بگەڕێتەوە بۆ ڕاویژوو ڕێگری بکرێت لەوەی ئیمامەت بکرێتە پشتاو پشتی، چـونکە ئـەو ڕێگەیـە سەرئەنجامەکەی زۆرداریو خۆسەپاندنو پاشان کەوتنو هەرەسی لـێ دەکەوێتەوە.

جەمالەدینی ئەفغانی لە بانگەوازەکەیدا شکـستی هێنـا چـونکە ڕێوشوێنی دروستی نەگرتەبەر بۆ گەیشتن بە پرۆژە چاکسازییەکەی وە گومانی وابوو دەکرێ دەوڵەتی عوسمانيو جێنشینەکانی یاخود خدێوی میسر پاشان ئێرانو ئەفغانستان قوربانی بدەن لە پێنـاوی پرۆژەکـەی

ئەودا.[1] بێ هەست کردن بەو ڕێو شوێنو سوننەتە کۆمەڵایەتیانەی پێویست بوون بۆ بـەرپاکردنی دەوڵەتــە چاکـسازیەکان وە گومــانی وابوو ئەتوانرێ راپەڕینێك بەدی بێت بەپێی نمونــە یابانیەکـە، تــەواو ورد نەبو لەوەدا کە ئیمپراتۆر لەو کاتەدا خــۆی هــەڵگری ئــاڵای ئــەو پرۆژەیەو خــاوەنی بــیری راپــەڕینو ڕێنسانــسی یابــانی بــوو، ئــەو بــە جەمالەدینی ئەفغانی خۆی دەچوو ئەگەر لەو کاتەدا خەلیفــە بوایــە، لەبەر ئــەوەی وەهــا نــەبوو هەربۆیــە بانگەوازەکــەی جەمالــەدین بــۆ بەرپاکردنی دەوڵەتێك کە بە پرۆژە چاکـسازیەکەی هەسـتێ شکـستی هێنــا ســەرەڕای ئــەوەی ســەرکەوتوو بــوو لــە رووی فیکریيــەوە لــە دەستنیشانکردنی گرفتــی رۆژهــەڵاتی ئیــسلامی و پێداویــستی ئــەو ڕۆژهەڵاتە بەنوێکردنەوەی گوتارە سیاسیەکەی .

گەورە زانایانو بیریارو نوسەرو سیاسیەکانی ڕۆژهەڵات کەوتنە ژێــر کاریگــەری هــەنگاوەکانی ئەفغانیــەوە لەوانــە موحەمــەد عەبــدەو موحەمــەد رەشــید رەزاو ئیبنــو بــادیسو عەبــدورەحمان کــەواکیبی (١٨٤٨-١٩٠٢ز) کــە کتێبــی سروشــتەکانی زۆرداری (طبــائع الأستبداد) و (ام القری)ی دانا، وە هەوڵیــدا گرفتــەکانی ڕۆژهــەڵاتی ئیسلامی دەستنیشان بکاتو کورتی کاتەوە لە زۆرداریو خۆسەپاندنی

(١) بەڵکو هەر هەموویان هەڵیان کوتایە سەریو فرتو و فێڵیان لێ کردوو هەوڵیاندا خۆیانی لێی رزگار بکەن، ئەوەیشی ویستیان بۆیان چووە سەر

سیاسیدا کە بووەتە هۆی لەکارخستنی توانای بیرکردنەوەو کۆتکردنی ئازادی دەربڕین، تاوای لـێهاتووە بووەتە نێچیرێکی سوكو ئاسان لـە بەردەستی زۆردارو دەجالەکان بەناوی ئاینەوە .

عەبدورەحمان کەواکیبی لەژێر کاریگەری هەنگاوەکانی موحەمەدی کوری عەبدولوەهابدا بووە، لەوەی بانگەشەی دەکرد بۆ یەکتاپەرستی و گەڕانەوە بۆ ئەو بیروباوەڕو پەرستشو دینداریيەی پێشینی لەسەر بووە، وە لەژێر کاریگەری ئەو بانگەوازەی ئەفغانیشدابوو کە دەیکـرد بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو بارەی پێشین و خەلیفەکانی راشیدین لەسەری بووتە لە کاروبارە سیاسیەکانی وەکـو راوێـژوو ئـازادی و دادگـەری کۆمەلایەتی، ئەویش لە کتێبی (ام القری)دا بەدەر دەکەوێت، ئـەوەتا لە بارەی زەرورەتی گەڕانەوە بۆ ئەوەی پێشین لەسەری بوونە لەمەشدا کارتێکراو بووە بە هەنگاوەکانی موحەمەدی کـوڕی عەبـدولوەهاب، لەوبارەیەوە دەڵێ: (ئەی برایان، وادەزانم ئێوەش ئیسلامی ئەمە بە باش دەزانن کە جیاوازی رێبازو مەزهەب بخەینە لاوە کـە بـە چـاولێکەری شوێنی کەوتوین، چـونکە ئاشـنای زۆربـەی ئـەو سـەرنجانە نـین کـە سەبارەت بە زۆرێك لەو حوکمانە لە ئارادان، وە پـشت دەبەسـتین بـە بەڵگە ئاشکراو روونەکانی کیتابو سونەتی سەحیحو کۆڕای سـەلماوو جێگیر، ئەمەش بۆ ئەوەیە لە بیروبۆچونەکاندا پەرتەوازەو ناکۆك نەبین تاوەکو ئەوەی دەیسەلمێنینو بریاری لەسەر دەدەین لای تـەواوی خـاوەن رووگەکان (أهل القبلة) پەسەندو وەرگیراو بێت، چونکە ڕێبازی پێشین

ئەو ئەسڵ و بناغەیەیە کە ڕەت ناکرێ و ئوممـەتیش خـۆ دوور نـاگرێ لەوەی بۆی بگێڕێتەوە، بە تایبەت لە هەنـدێ مەسـەلەی سـەرەکیدا، چونکە لەمەدا بە یەکسانی کردنی ڕێبازەکـان دەبینـرێ، هـەر بۆیـە قورس نابێـت ئەگـەر کەسـێك چـاولێکەری (تقلیـد)ی یـەکێك لـە پێشەواکان نەکات لە شتێکدا کە پێچەوانەی روکاری ئاشکرای دەقـی کیتابی پایەدار یا پێـچەوانەی سـوونەتی سـەلماو جـێگیر بێـت لـەو فەرموودانەی لای چینی یەکەم هەبووە.

با ئەم بۆ چوونە لای هیچ کەس لە ئێـوە بـە گـەورەو سـەیر بـۆی نەڕوانرێ ئەمە بۆچونێکی داهێنراو نیە لە نێوان موسڵماناندا بەڵکو تەواوی خەڵکی دوورگەی عەرەبی جگە لە تێکەڵەیەکی هەردوو حەڕەم نەبێت لەسەر ئەم بۆچونەن . شاراوە نیە لاتان کە خەڵکی دوورگەکـە بریتین لە حـەوت تـا هەشـت ملیـۆن کـەس هـەموویان موسـڵمانی سەلەفین لە ڕووی بیـروباوەڕەوەو زۆربەیان حەنبەلـی یان زەیـدین لـە ڕووی ڕێبازەوە، ئاین لە نێوان ئەواندا پێگەیشت وە بە زمـانی ئـەوان بوو، ئەوان خاوەن و هەڵگرو پارێزەرو بەرگری کاری ئـەو ئاینـەن، بـە کەمی تێکەڵی غەوارەو نەناسەکان بوون، بەکەمی بینراوە بانگەشە بۆ شتی نامۆ بکەن و لە پێناوی شانازی دا هونەرکاری لە ئاین دا بکەن[1]

سەبارەت بە نوێ کردنەوەی گوتاری سیاسی کە لـەژێر کاریگـەری

(١) أم القـرى، ل (٢١).

ئەفغانیدا بووە فەرمویەتی: (لە راستیدا نەهامەتیە، کە ئازادیمان لە دەست داوە، ئەزانن ئازادی چیە؟ بریتیە لەوەی واتاکەیمان لەدەست داوە تارادەی ئەوەی لە بیرمان چووەتەوە، ئەوانەی ئازادیان پێناسە کردووە وایان ناساندووە کە بریتیە (لەوەی مرۆڤ سەرپشكو سەربەخۆ بێت لە گوفتارو کرداریداو هیچ رێگرو ستەمکارێك رێی پێ نەگرێ)

ئازادی چەندین لقو بەشی هەیە لەوانە یەکسانی مافەکانو لێپرسینەوەی فەرمانرەوا بەو پێیەی ئەوان راسپێردراون و نوێنەرن، نەترسان لە داواکاریو ئامۆژگاریکردن، هەروەها ئازادی فێربوون وتار دانو چاپەمەنیەکان و ئازادی توێژینەوە زانستییەکان، هەروەها دادگەری بە هەموو جۆرەکانیەوە تاوەکو مرۆڤ لە ستەمکارو داگیرکەرو غەداری تیرۆرکار نەترسێ، لەو لقو بەشانەی ئازادی، پاراستنو ئاسایشی ئاینو گیانی مرۆڤەکان و پاراستنی ناموسو شەرەفیانە، وە ئاسایشو دەستەبەرکردنی زانستو بەرهەمەکانێتی، کەواتە ئازادی گیانی ئاینە، ئەم دێرە هۆنراوەیە دەدرێتە پاڵ حەسانی کوڕی سابتی هاوەڵ (خوای لێ ڕازی بێت) کە فەرموویەتی: (وما الدين إلا أن تقام الشرائع و تؤمن سبل بيننا وهضاب) واتە: ئایین تەنها بریتیە لە پایەدارکردنی یاساکانو شەریعەت وپاراستنی ئاسایشی ڕێوبانەکانی نێوان خەڵکی.

بڕوانە چۆن ئەو هاواڵە ئاینی چۆن ڕۆڵی ئایینی لە پیادەکردنی شەرعو ئاسایش دا کورت کردوەتەوە.

بەڵێ بێگومان ئازادی ئازیزترین شتێکە لای مرۆڤ پاش ژیانی خۆی، بە لەدەستدانی، هیواکان لە دەست دەدەین و کاروبارەکان پوچ دەکرێنەوەو دەرونەکان دەمرنو شەریعەتەکان لە کاردەخرێنو یاساکان کەلێندار دەبن .

جاران شوانی بەرخەکانمان ئازادبوون و پایەیەکی وایان نەدەدا بە پادشا، لەگەڵ میری باوەڕداراندا بە ئەی عومەرو ئەی عوسمان دەدوان، کەچی وامان لێهاتووە لەوانەیە منداڵ لە ژوری دایکیدا بکوژینو ناچاری بێدەنگی کەین تا بێ دەنگ بێت، دایکەکەشی جورئەت نەکات بۆی بگری نەوەکو بێزارمان بکا.

تاکە سەربازێك پەناو ئاسایشی دەبەخشیە سوپای دوژمنو پەیمانەکەی دەبرایە سەرو گفتەکەی جێبەجێ دەکرا، کەچی وامان لێهاتووە ناهێڵین سوپایەکی گەورە نوێژی هەینیو جەژنەکان بکات، وە ئاینەکەی سوك دەکەین نەك لەبەر پێداویستییەك بەڵکو لەبەر کەشخەییو خۆ نواندنێکی پوچو بەتاڵ.

هەر بۆیە لە بارو دۆخێکی ئاوادا سەرسام نەبین کە ژیانی ئومەت پڕ بێت لە بێزاریو ساردوسڕی زاڵ بێت بەسەریدا، سەدەکان دێنو دەچن و نەوەکان بەدوای یەکدا دێن کەچی ئێمە هەر لە شوێنی خۆماندایین، بێهیوایی ڕیشەی داکوتاوە لە ناخماندا، وازمان لە کار هێناوەو دوور کەوتوینەتەوە لە جدیەتو بە تەمبەڵیو گاڵتەو گەپ ئارامو دڵشاد دەبین، ڕۆچوون لە حەزو ئارەزوەکاندا بووەتە ئارام بەخشی

دڵە کۆیلەکەمان بۆ ئارامی ئەو بیرەی لە هـەموو لایەکـەوە لـە ژێـر پەسـتاندایە، بـەرەو خاوخلیـچـکی و نزمێتـی چـووین، تـا وامـان لـێهاتووە بە لای هیچ شـتێکی مـاددیو جدیـدا ناچـینو تەنانـەت توانای خوێندنەوەی کتێبی بەسودمـان نیـەو گوێبیـستی ئامۆژگـاری روونو ئاشکرا نابین، چـونکە ئەمــە سـەرکردەی سـەرروەرو بـەرێزمـان دێنێتەوە یاد، گیانمان لە ئازاردایە نزیکە دەرچێت ئەگەر پەنا نەبەینە بەر لـەبیرخۆ بردنــەوەو سـەر قـاڵ بـوون بـە ئارەزووەکـانو ئەفـسانەو خەرافەتە دڵبەرەکان .

بەم شێوەیە هەستمان لاواز بوو غیرەتیشمان مرد، وامـان لێهـاتووە هەرکەسێ ئەرکو پێداویستسییەکانی ژیانێکی پاکو پوختمـان وەبیـر بێنێتەوە لێی تورە دەبینو رقمان لێی دەبێتەوە، چـونکە نـاتوانین ئـەو ئەرکانە راپەڕێنین، لە رووی واقیعەوە نەك سروشت.

لەگەڵ ئەوەشدا، دان دەنێین بەوەدا خەڵکێکمان تیادایـە سـاڵەهای ساڵە خوویان گرتووە بـە کۆیلەیـەتیو چەرمەسـەری و سەرشـۆڕی و سوکایەتیەوە، وای لێهاتووە شکـستو روخـان بـووە بـە بەشـێك لـە سروشتیان و دوورکەوتنەوەیان لەمبارە ئازاریـان دەدا، هـەر ئەمـەش هۆکاری ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵکی هندیو میسری و تونسیەکان بە تایبەت پاش ئەوە بەناچاریو بەدەر لە توانای خۆیان ئاسایشی سامانو داراییان بۆ دروست بوو وە ئازادی بیروبۆچونو کاروفەرمانیان بۆ بەدی هات، هاوارو داد ناکەن بۆ کەسانی ترو ئازاری بارودۆخی موسڵمانانی

وولاَتانی تر ناچێژن، بەڵکو بە مـۆنیو چـاو سـوورکردنەوە دەڕواننــە ئەوانەی دەیانەوێ تۆڵە لە میرە موسڵمانەکانیان بکەنــەوە، لەوانەیــە وەك بێ دینێك بڕواننە ئەو چاکسازانە، وەك ئـەوەی تـەنها موسـڵمان بوونی میر بەس بێتو هیچ شتێکی تری نەوێت تەنانەت دادگـەریش، گوێڕایــەڵی کردنــی پێویــست بێــت لەســەر موســڵمانان، ئەگــەر ووڵاتەکانیشیان کاولو وێـران بکـات، منداڵەکانیـشان بکوژێـت، وە پێشیان کەوێ تاوەکو بیانکاتە ژێر دەســتەی حکومــەت، بیانیــەکان، هەروەکو پێشتر ئەمەیان لەگەڵدا کرا، بەرئەنجام ئەوەیە ئێمە بــەهۆی لەدەست دانی ئازادیەوە تووشی سادەییو سەرپەلیو بێ توانایی بووین، لەوەی بتوانین هەر کارێکی قورس یا ئاسان ئەنجام بدەین). [1]

بە هەمان شێوە شێخ رەشید رەزا لە نوسینەکانی گۆڤاری (المنار)دا گەیشتووە بە هەمان سەرئەنجام، لە راستیدا بزوتنەوەکەی شێخ حەسەن بەناش بریتیە لەدرێژکراوەو دەنگدانەوەی ئـەم بزوتنــەوە چاکـسازیەی تەواوی رۆژهەلاتی گرتبو یەوە – حەسەن بەنناش کەوتە نـاو هــەمان ئەو چاك گومانیەی ئەفغانی تێکەوت لەگەڵ دەسەڵاتدا. [2]

---

(١) ام القرى، ل (٣٤-٣٥) رامێنە لەو وەسفەی بۆ بارودۆخی میرەکانی چاخەکەی خۆی کردویەتی، بەراوردی بکە لەگەڵ واقیعی هاوچەرخماندا!!

(٢) شـێخ حـسن بـەنا داوای لـە مـەلیك فـاروق کـرد تـاوەکو خـۆی بکاتـە خەلیفـەی موسـڵمانانو جـەختی کـردەوە لـە سـەر ئـەوەی کـە جەماعـە بەیعـەتی پـێ دەدەن هەروەك لە (مذکرات الدعوة والداعیة)، ل (٢٣٥-٢٣٧)دا هاتووە، لە کاتێکدا مەلیك هیچ نەبوو تەنها بوکەڵەیەك نەبێت بە دەستی ئینگلیزەوە ؟!!

ئیستعماریش لە بۆسەو کەمیندا بوو بۆ ئەو راپەرینو رێنسانـــسە، ئەوە بوو زۆر بە خێرایی ئەوەی ئەفغانی ئاگـاداری کردبووینـەوە لێـی رویدا، خەلافەتی ئیسلامی شکـستی هێنـاو روخـا، ئـەوەی بـەردەوام ئەفغانی هـەوڵی دەدا موسـڵمانانی لەسـەر کۆبکاتـەوە، وە بـەردەوام هەوڵی دەدا تـاوەکو ئـەو پێکهاتەیـە بەخۆیـدا بـچێتەوە، بـۆ ئـەوەی موسڵمانان لە دەوری کۆببنەوە، بەڵام هەموو ئەوانە نەکراو ڕووینـەدا، ئیـستعماریش کۆتـایی هێنـا بـە دابەشـکردنی میراتـی ئـەو پیـاوە نەخۆشەی ئەوروپا چاوەڕوانی مردنی بوو!

لە راستیدا ئیستعمار کە خۆی لە ئینگلتەرادا دەبینیەوە، زۆرداریو سەپاندن، کە خۆی لە خەلیفەی عوسمانیو شای ئێرانو خدیۆی میسرو مـەلیکی ئەفغانـستاندا دەبینیـەوە، هاوپـەیمانێتیان ئـەنجام دا بـۆ ڕووبەرووبونەوەی بزاڤی راپەرینو بیروبۆچوونە چاکسازییەکەی ئەفغانی بەهەمان ئەو شێوەیەی توانیان دەست بگرن بەسەر دەوڵەتی وەهابی لە نەجداو لە ناوی بەرن پاش هاوپەیمانێتی هەردوو لا، بە هەمان شـێوە توانیان بزافەکەی جەمالەدینی ئەفغانی لەناو بەرنو خۆیانی لێ رزگار بکەن پاش ئـەوەی بانگیـان کـرد بـۆ ئەسـتەنبوول، وە لـەوێ دەسـت بەسەریان کرد تا نەخۆش کـەوتو لـە بـارودۆخێکی ناڕۆشـنو تـەمو مژاویدا کۆچی دوایی کرد؟![1]

(١) سەیری ژیانی جماله دینی ئەفغانی بکە کە (شکیب ارسلان) نووسیویەتی.

بەڵام دەنگدانەوەی بزوتنەوەکەی ئەفغانی هۆکارێکی سەرەکی بـوو بـۆ سـەرلەنوێ زیندووکردنـەوەی گیـانی بـەرەنگاری ئوومـەت لـە ڕووبەڕووبوونەوەی ئیستعماری ڕۆژئاواییدا، چونکە شوێنکەوتووانی لە هەموو شوێنێکدا وورەی موسڵمانانیان بەرزدەکردەوە تاوەکو ڕووبەڕووی ببنەوەو لە ڕۆژهـەڵاتی ئیـسلامی وەدەری نـێن، شـۆڕش لـە هـەموو لایەکدا بەرپا بوو، ئیستعماری سەربازی دەرچوو، بـەڵام ئـەو گوتـارە سیاسیەی خۆی سەپاند، ئـەو گوتـارە سیاسـیە نـەبوو جەمالـەدینی ئەفغانی بانگەشەی بۆ دەکرد، کە بریتی بوو لە مەلەکیەتی دەستوری ڕاوێژی، بەڵکو چەند سیستەمێکی سەربازی بەدی هـات کـە زۆردارو خۆسەپێنەرتر لە سستەمە لەناو چووەکان، سستمە نوێیەکان ونبـوی خۆیان لە گوتاری سیاسی گۆڕێنراودا بینیەوە، کە شـێخی ئەزهـەری علی عەبدوڕازق برەوی پێ دەدا لە کتێبـی (الاسـلام ونظـام الحکـم) ەکەیدا تەوەتا لە پێشەکیەکەیدا دەڵێ: (لە ساڵی هەزارو سێ سـەدو سی و سـێی کۆچـیەوە (١٩١٥)، وە کـاری قـەزا دەکـەم لـە دادگـا شەرعیەکانی میسردا، ئەوە وای لێکردم توێژینەوەیـەك ئـەنجام بـدەم سەبارەت بە قەزای شەرعی، قەزا بە هەموو بەشەکانیەوە، بەشێکە لە بەشەکانی حکومەت، مێژووەکەی زۆر بە تونـدو تیـژی بەسـتراوە بـە مێژووی ئەوەوە، بە هەمان شێوە قەزای شەرعی پایەیەکە لە پایەکانی حکومەتی ئیسلامی، وە بەشێکە لە بەشەکانی، هەر بۆیە ئەو کەسەی

دەیەوێ توێژینەوەی مێژووی قەزا بکـا دەبـێ بـە توێژینـەوەی پایـەی یەکەمی دەست پێ بکا، کە بریتیە لە حکومەت لە ئیسلامدا

بناغـەی هـەموو فەرمانڕەوایەتیـەك لـە ئیـسلامدا بریتیـە لـە خەلافەتو ئیمامـەتی گەورە هەروەك دەڵێن... بە هەمان شێوە هەر لـە سەرەتای یەکەمەوە وا بڵاوبویەوە لە نێو موسـڵمانانداا کـە خەلافـەت پایەیەکی ئاینیەو جێگرتنەوەی پێغەمبەری ئیسلامە، سـڵاوی خـوای لەسەر .

لە بەرژەوەندی سوڵتانو دەسەڵاتدارەکاندا بوو ئەو هەڵەیە لـە نێـو خەڵکیدا برەو پێبدەن، تاوەکو ئاین بکەنە قـەڵغانی تـەختو تـاراجو پلـەو پایـەکان دژ بـە ئەوانـەی لێیـان رادەپـەڕن، بـەردەوامیش هەروادەکەن، لە چەندین ڕێگەی جۆراوجۆرەوە، ئـای ڕێگـەکان چـەند زۆرن ئەگەر توێژەرەوان سەرنجی بدەن تـاوەکو توانیـان وا لـە خـەڵکی بگەیـەنن کـە گوێڕایـەڵیکردنی پێـشەواو ئیمامـەکان بەشـێکە لـە گوێڕایەڵی خوداو سەرپێچی کردنیشیان بەشێکە لـە سەرپێـچیکردنی خودا، پاشان خەلیفەکان هەر بەوەندە وازیان نەدەهێنا، وە بەوەش رازی نەدەبوون کە ئەبوبکر پـێی ڕازی بـوو، تورەبوونیـشیان بـە ئەنـدازەی تورەبوونی ئەو نەبوو، بەڵکو سوڵتانیان کردە جێنـشینی خـوا لەسـەر زەویدا، وە سێبەری درێژکراوەی خودا بەسەر بەندەکانیـەوە، پـاكو بـێ گەردی بۆ ئەو خودایەی لەوەی هاوبەشی بۆدابنرێ .

تاوای لێهات جێنشینایەتی (الخلافة) نوسـێنرا بـە بـاسو خواسـە

ئایینیەکانەوە وە بو بە بەشێك لە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی، موسڵمانان لەگەڵ سیفاتەکانی خودای گەورەو سیفاتەکانی پێغەمبەرە بەڕێزەکان دا، دەیانخوێندو تەلقینیان دەکرد وەك چۆن شایەتی (لا إله إلا الله مُحَمَّـدٌ رَسُولُ اللّٰهِ)ی تەلقین دەکرد.

ئەوە تاوانی پادشاکانەو زۆرداری ئەوانـە بـە موسـڵمانانی دەکـەن سەریان لـێ شێواندون، کوێریان کردوون لە ئاست ڕەواکاندا، بە ناوی ئاینەوە دەروازەکانی رۆشناییان لێگرتن، بەناوی ئاینەوە خۆیان سەپاند بەسەریانداو سەرشۆڕیان کردن‌و حەرامیان کرد بڕواننـە زانـستەکانی سیاسەت، هەروەها بە ناوی ئاینەوە فێڵیـان لــێکردن‌و ژێریـان بـەر تەسك کردنەوە، وایان لـێ هات بەدەر لەوەی دەیانەوێ سەرچـاوەیەکی تریان نـەبێت. تەنانـەت لـە کاروبـارە بەڕێوەبەرایەتیـە ڕوونـەکان و سیاسەتی پوختیش‌دا)

پاشان گەیشتە ئەم سەرەنجامە: (بەڕاسـتی ئـاینی ئیـسلام پـاك‌و دوورە لەو خەلافەتەی موسڵمانان پێی ئاشـنان‌و دەیناسـن، وە پـاك‌و دوورە لەو هەموو حەزو ترسانەی بەدەوریدا سازاندویانە، لە سەروەری‌و هێز، خەلافەت لە نەخشە ئاینیەکاندا هیچ شوێن‌و جێگەیەکی نیـە، بەهەمان شـێوە قـەزاو ئـەو کـارو پیـشانەی فـەرمانڕەوایی‌و بنکـەو سەنتەرەکانی دەوڵەتن، چونکە ئەوانە تەنها نەخشەی سیاسی پوخت‌و روتن، ئاین هیچی نیە بەسەریەوە، ئاین نەئاشـنایەتی و نـەئینکاری دەکا، نە فەرمانی پێ کردووەو نەهی‌شی لــێکردووە، بەڵکو بۆ ئێمەی

بەجێ هێشتوە، تاوەکو بگەڕێینەوە بـۆ بڕیارەکـانی ژیـری‌و ئـەزمونی گەلانی ترو بنەماکانی سیاسەت).[1]

شێخی ئەزهەر هـەر بەئەوەنـدە وازی نـەهێنا بابـەتی ئیمامـەت‌و خەلافەت لە بناغەوە بروخێنێ بـەڵکو قـەزاو دادگـای ئیسلامیـشی لەگەڵیدا خاپور کرد، لە هەموو ئەوەی کە نوسی تەنها مەبەستێکی هەبوو ئەویش جێ‌بەجێ‌کردنی مەبەستی ئەوانە بوو کە پاڵنەری بوون بۆ نوسین لەو بابەتەدا، چونکە خـدێوی مەبەسـتی بـوو لـەوەدا ئـەو بیردۆزە بسەلمێنێ لەبەر چـەند هۆکـارێکی سیاسـی وەك ئـەوەی لـە لایەکەوە دەیویست خەلافەتی عوسمانی لەناوبەرێ و ناشەرعی بـوونی بسەلمێنێ، لە لایەکی تریشەوە مەبەستی بوو دروسـتی و شـەرعیەتی یاساو دادگـا دەسـت کـردو دانراوەکـان بـسەلمێنێ، چـونکە ئـەم دوو کێشەیە لەو کاتەدا لە هەموو کێشەیەکی ویـژدانی تـر زیـاتر جێـی مشت‌ومڕو قسەو باس بوو، ئەوەی بە تەواوی لە پشتەوەی ئەم بابەتەوە بوو ئیستعماری ئینگلیزی بوو کە ئەو کاتە کـاری دەکـرد بـۆ ئـەوەی پەیوەندی یەکانی نێوان گەلی میسری‌و خەلافەتی عوسمـانی بپـچڕێ‌و شەریعەتی ئیسلامی لە هەر یەکە لە تورکیـاو میـسر دوورخاتـەوەو دایڕنێ، لە هەردوو کارەکەشدا سەرکەوتوو بوون؟!

شیخ علی عەبـدورازق لـە کۆتـایی ژیانیـدا پاشـگەزبوویەوە لـە کتێبەکەی، وەدانی نا بەوەی پاڵنەری هەبووە بۆ ئەوەی ئەوە بنووسێ؟!

---

(١) اصول الحكم في الاسلام، ل (٢٠٠-٢٠١).

بەڵام پاشگەزبوونەوەی هیچ کاریگەری و شوێنەوارێکی نـەبوو، بـە هەمان شێوە کتێبەکەشی ئەو کاریگەرییەی نەبوو، چونکە ئەوکتێبە دەربڕی واقیعێك بو پێش ئەو کتێبە بـە ماوەیـەك وورده وورده بـەهێز دەستی کردبوو بە خۆ سەپاندن، تەنها پێویستی بەوە بوو کەسێك کار بکات بۆ ئەوەی شەرعیەتی پێ ببەخشێ هەر بۆیە بـە قـسەکەرێکی ڕەسمی ئەو تەوژمە دەچو کە لە کۆشو خانەی ئیستعماری بـەریتانیو ڕاسپاردەیی خدیوی دا لە دایك بوو، پاشان پێگەیشتووەو گەورە بووەو لە شیری ئەوان گۆشکراوە، تاوەکو گوتاری سیاسی شەرعی گـۆڕێنراو لەزمانی کەسێکی ئەزهەرییەوە ڕابگەینرێ، پاشتریش شێخێکی تـری ئەزهەر شێخ مەراغی پشتیوانی لـێ بکات ؟! کـە دیـارترین شـێوەو دیمەنو گرنگترین بنەماکانی بریتی بوون لە:

١- سەلماندنی ناشەرعی بوونی خەلافەت کە بریتی بـوو لـە ڕەمـزی یەکێتیو یەکڕیزی نێوان گەلانی موسڵمان، تەنانەت کاتێ خەلیفەی عوسمانی عەبدولحەمیدی دووەم فەرمانڕەوایی دەکردو دەوڵەتیش لە سەرەمەرگدا بوو هیچ هۆکارێك لە هۆکارەکانی هێزی لەبەردەستا نەبوو جگە لەم دەسەلاتە ڕووحیە نەبێت کە داگیرکەری ڕۆژئـاوایی ئەوکاتەی پێهەژاند هەر بۆیە پێویست بوو بە ناوی ئاینەوە لە ناو ببرێو دەستی بەسەردا بگیرێ ؟![1]

(١) لەبارەی ئەو بابەتەوە بڕوانە (موقف العلم والعقل والعالم)ی (مصطفی صبري) دوایـن شـێخی ئیـسلام لـە دەوڵـەتی عوسمانیـدا (٤/٢٣٣-٣٢٣)، وە (مـذکرات الـسلطان عبدالحمید)، ل (٦٧).

٢- ســەلماندنی مەشــروعیەتی دادوەری بردنەبــەر یاســا دەســتکردوو دانراوەکــان کــە ئیــستعمار هێنــا بــووی، وە کــەنار خــستنو دوورخستنەوەی شــەریعەت بــە نــاوی شــەریعەتەوە، وە ســەلماندنی مەشروعیەتی عەلمانیەتو جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت؟![1]

٣- سەلماندنی نادروستی مەشروعیەتی جیهاد لە ئیسلامدا بە بیانوی ئەوەی ئیسلام ئاینی (ئاشتی)یە، لە پێناوی بەخشینی شــەرعیەت بــە بــوونی ئیــستعمارو هاوپەیمانیەتیــەکانی لەگــەڵ ڕژێمــە فەرمانڕەواکاندا بە ناوی ئاشتی جیهانیەوە کە ئیــسلام هــاتووە بــۆ بەدیهێنانو جێبەجێ کردنی؟![2]

زۆرێك لە زانایانی ئەو چەرخە لە هەموو شارو وڵاتێکەوە هەستان بە وەڵامدانەوەی ئەو ووتارە سیاسیە گۆڕێنراوە، لە هەموویان ووردبــین تر دوا شێخی ئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی (مصطفی صبري) بــوو لــە کتێبەکەیدا بەناوی (العقل والعلم) ئەوەبوو ڕۆچو بە ناخی ئەم گوتارە گۆڕێنراوەدا شێخ صبری -بەر بەزەیی خــودا کــەوێ- فەرموویــەتی:[3] (یەکەم کەسێك لە رووی مەبدەئیەوە بابەتی جیاکردنەوەی ئــاینی لــە

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٢) بروانە ئەم سێ ئەصلە (خەلافەت، شەریعەت، جیهاد) دەبینین تاوەکو ئێستاش قەدەغــەکراوەکانی واقعــی موســڵمانانی هاوچــەرخە لــە رووی سیاســی و رۆشنبیریەوە؟!

(٣) ژمارەی ئەو پەراوێزانەی کە دێن ووتەی شێخ (مصطفی صبري) یە، قسەو ووتەکانی خۆم لەسەر ووتەکانی ئەو بە ئاماژەی ئەستێرەیەك (*) جیاکردوەتەوە

سیاسەت ووروژاندو بانگەشەی بۆی کرد مامۆستا عــەلی عەبــدوڕازق بەگ پاشا بوو ئەوە بوو کتێبێکی لەسەر داناو بڵاوی کردەوەو ناوی نــا ئیـــسلامو بنــەماکانی فــەرمانڕەوایی (الاســلام واصــول الحکــم) لــەو کاتەشدا قازی شەرعی (المنصورة) بو، بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبــە بــووە هــۆی پــچڕانی پەیوەنــدی ئــەو بــە ئەزهــەرەوە، هەرچــەندە بنــەمای جیاکردنەوەکە لە میسردا کاری پێــدەکراو ماوەیــەکیش بــوو لــەکاردا بوو، سەرەتاکەشی لەو ڕۆژەوە بوو کە وەزارەتی میــسری لــەو ئەندامــە شەرعیانە داڕنرا کە ناو دەبرا بە (شــیخ الاســلام)، ئــەو کەســەی کــە هەموو ئەو حەللو عەقدانــەی لــە ئەنجومــەنی وەزیرانــەوە دەردەچــوو وەستابوو لەسەر ڕەزامەندی ئەو.

هەر ئەمەش لە تورکیادا بەدی هات و تــا هەڵگەڕانــەوە دوور لــە ئاینیە نوێیەکە بەردەوام بوو کە سەرەتاکەشی لــە حکومــەتی پــارتی یەکێتی و پەرەپێدان (الاتحاد والترقي)و لە ســەردەمی کەمالیەکانــدا تەواو کــرا، ســەرەتا تــەنها دادگاکــانی ســزادان لــە دەزگــای شــێخی ئیـــسلامی (المـشیخة الاســلامیة) جیاکرایــەوە، کــە لــە پــاش ئــەو پێداچوونەوە بێزارکەرانە بەدی هات کە دەوڵەتە گەورە مەســیحیەکان ئەنجامیان دەدا(*) هاوشێوەی ئەمە دادگای بازرگانی داهێنرا: کــە ئــەم

---

(*) واتــە دادگاکـانی سـزاو تۆڵـە (المحـاکم الجزائیـة) بـە هـەموو یاسـا دانراوەکانیـەوە دەسـتێوەردانو پەسـتانی ڕۆژئـاوای ئیـستعماری لەسـەر بـوو، بـە هـەمان شـێوە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی عوسمانی؟!

(مشیخة)یە بە گەورەترین‌و فراوانترین دەزگای حکـومی دادەنـرا کـە بەرامبەر (مشیخة)ی ئەزهەر بوو، بەشێك لە بەشەکانی تایبــەت بـو بە چاودێری‌و سەرپەرشتی کردنــی پــەیمانگا ئاینیــەکان، لــەم دیــدو تێڕوانینەوە شێخی ئەزهەر ئاستی دەسەڵاتەکە حکومیەکەی لە ئاستی بەڕێوەبەری زانکۆیەك تێ ناپەڕی، بە گــەورە دانانیــشی لــەوەی نــاوی شێخی ئیسلامە تەنها لە لایەن هەندێ حەماســەت دارەکانــەوە بــوو، دانانی لە پلەی وەزیران بەڵکو بە باشــتر دانــانی لای هەنــدێ لەوانــە گــەورەکردنێکی دەســتکردو لــە رووی ئــەو پــسپۆریەی لەدەســەڵاتی حکومیدا هەیەتی هیچ پاساوێکی نیە.[1]

دەگەڕێینەوە بۆ لای مامۆستا عەلی عەبدوڕازق بەگ‌و ئەو کتێبەی

---

(١) بە گـەورە دانـانی پلـەو پایـەی پیـاوانی ئـاینی بـە نـاوو قسە نابێـت، هـەر وڵاتێـك حکومەتەکەی چەندە لە ئاین جیا بێت و لێی دوور بکەوێتەوە ئەوەندە پلەو پایـەی ئاینی تیایدا بچووك دەبێتـەوە بە پـێی ئەنـدازەی جیابوونـەوەو دووردکەوتنەوەکە تاوەکو بارودۆخی دەگاتە ئەو رادەیەی تورکیای نوێی دوور لە ئاین پێی گەیشت.

بـەڵام دوور کەوتنـەوەی سـەرۆك‌و دەم سپی ئـاین لـە ئـاین خـۆی‌و هـەوڵ دان بـۆ ڕمانـدنی ئوسـوڵ‌و بنـەما کـۆن‌و دامـەزراوەکانی هـەروەك لـە سـەردەمی شـێخایەتی مامۆستای گەورە ئەلمراغیدا ڕوویدا، کە چـەندین دیـدی شـاراوەی خـۆی سـەبارەت بە یاساکانی ئیسلام لە چەندین شـێواندنی جـۆراو جـۆر دا بـەدەر دەخـست، لەوانـە ئـەو قـسەیەی لەگـەڵ نوێنـەری لاوە عێراقیەکانـدا کـردی کـە لـە ئـەهرامی (٢٨)ی فبرایەری (١٩٣٦)دا بڵاوکرایەوە کـە دەڵـێ: ( هەرکەسـێ بـە چاوێکی ووردو تیـژەوە بڕوانێتە کتێبە ڕەسەنەکانی ئایینی، نامەعقولە یاسایەك یان کتێبێك یـان بنەمایـەك کـە لـە سـەدەی دووەمـی کۆچیدا دانـراوە، پاشـان بـچی بیهێنـی ئـەو یاسـایە لـە (١٣٥٤)ی کۆچی دا پیـادە بکـەی) ئەمـە شـتێکی ڕیـسواترە لـەو بارودۆخـەی تورکیـا پێی گەیشت.

داینا لەو کاتەی قازی شەرعی بوو لە شـاری (منـصورة) مەبەسـتی دانانی کتێبەکەشی پشتگیری کردنی ئەوکارانە بوو (مصطفی کمـال) لە تورکیادا کردی لەوانەش هەڵوەشانەوەی خەلافەت، هەرچـەندە لـە کتێبەکەیدا بە ئاشکرا ئەم پشتگیری و دەست خۆشـییەی دەرنـەبڕیوە، بەرگریکارە تورکەکان لە ئاژاوەی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتدا لانی کەم تـەنها ڕەخنـەیان لـە خەلیفـەو سـاختەکاریەکانی خەلافـەتی پـاش سەردەمی چوار خەلیفە ڕاشدینەکان دەگرت، بەڵام قـازی (منـصورة) سەرەتای ساختەکاری دەگێڕێتەوە بۆ جێنشینایەتی ئەبوبەکر، ئیدیعای ئەوەی دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ حکومەتێکی نەبووە تاوەکو ئـەبو بەکر ببێتە جێنشین تیایدا، بەڵکو ئـەو تـەنها پێغەمبـەرێتی بـووە، پێغەمبـەریش جێنـشینایەتی (الخلافـة) پەسـەند ناکـات، (عــەلی عەبدوڕازق) سەبارەت بەو ئەرکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە دەڵێ: (پەیامە نەك فەرمانڕەوایی، ئایینە نەك دەوڵەت) سەبارەت بـە ناونانی ئەبوبەکر بەو نازناوە ئەوا دانەر بەو شێوەیە پەسەندی دەکا کە ئەمە دەربڕینێکی خوازەیی (مجازی)یەو بـەکارهاتووە بـۆ واتـای ئـەو سـەرکردەیی کردنـەی موسـڵمانان لـە دوایـی کۆچـی پێغەمبـەر گواستیانەوە بۆ ئەبوبەکر، نەك جێنشینایەتی بە واتای ئەو زاراوەیـەی سەرۆکایەتی ئایینی بیگرێتەوە.

مامۆستا عەلـی عەبـدورەزاق بـەگ ئـایینی لـە حکومەتەکـەی ئەبوبەکــر دەرهێنا، تاوەکو خەلافـــەتی لـێ دەرکێشێ تەنانەت لە

ل (٩٠)دا دەڵـــێ: (ئاســـایی یـــەو ژێـــری ڕێی تێـــدەبا تـــا ڕادەی بەڵگەنەویستی کە دوای پەیامبەر سەرۆکایەتی ئاینی نەبێت، ئەوەشی وێنای بوونی دەکرێ لە پاش ئەو تەنها جۆرێکە لە سەرۆکایەتی نوێ، کە پەیوەست نیە بە پەیامو لەسەر ئاین بنیات نەنراوە، کەواتـە ئـەو دەسەڵاتداری یە جۆرێکە لە نا ئاینی)

(جا ئەگەر سەرۆکایەتی و زەعامەت نائایینی بوو ئەوا هیچی کەمو زۆر نیە لە سەرۆکایەتیو زەعامەتی مـەدەنیو سیاسـی، زەعامـەتی حکومەت و سوڵتان نەك زەعامەتی ئاین، ئەوەی بووە هەر ئەمەیە)

مامۆستاو قازی شەرعی (منصورة) هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی پاساو بهێنێتەوە بۆ حکومەتی (مصطفی کمال) پاش ئەوەی خۆی لـە خەلافەت و ئاین داماڵی، بەوەی حکومەتەکەی ئەبوبەکری داگرتوەتە ڕیزی حکومەتەکەی ئەو، بەو پێیەی وەکو حکومەتەکەی ئەو نا ئاینی بووە هەروەك لە دەقی کتێبەکیدا دەیبینی .

ئەو دەیەوێ پەیوەندی حکومەتەکان -هەر حکومەتێك بوو بێـت- بـە ئاینـەوە ببپـچڕێ بـەو پێـیەی حکومـەت بـەپێی سروشـت و مەبەستەکەی جیایـە لـە ئـاین، لەبـەر ئـەوە هـەر ئومەتێـك یـان پادشایەك حکومەتەکەی تێکەڵ بە ئاین کرد، وە کردیە جێنشینایەتی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوا لـەوبارەی خـۆی دەری کـردوە کـە بـۆی دانراوە، جا هەرچەندە هەندێ لـە پادشـاکان زۆری لـە خـۆی کردبـێ ویستویەتی، ڕەنگێکی ئاینیانە لە حکومەتەکـــەی بدات بە وەهمی

ئەوەی ئەمە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی حکومەتەکەی و بەرزکردنەوەی پلەو پایەی لە چاوی خەڵکیدا وە هەر ئومەتێك ئەم رەنگو شێوەیەی بۆ حکومەتەکەی هەڵبژاردبێ وەك وەهمێك لە لایەن ئەوانەوە کە ئەمە بەهێزکردنی ئاینیانی تیادایە بەڵام ئاین بۆ گەلەو سیاسەتیش بۆ حکومەت، سیاسەت هیچ پەیوەندییەکی بە ئاینەوە نیە مەگەر ئەوەی پیاوانی حکومەت خۆیان لە باری کەسێتیاندا کەسی ئاین دار بن و وەکو هەر تاکێکی ئەو گەلەی نوێنەرایەتی دەکەن.

مەبەست لەم جیاکردنەوەیەی نێوان حکومەتو ئاینی گەل، رزگارکردنی کارمەندانی حکومەتە لەوەی پابەند بن بە کۆتو بەندە ئاینیەکانەوە، تاوەکو ئازاد بن لە کارکردن بەو شێوەیەی سودی دەوڵەتو ئومەتی تیادا دەبینن، ئەم جیاکردنەوەیەی نێوان ئاینو دەوڵەت لەوانەیە سودی دەوڵەتو ئومەتی تیادا بێت و هیچ زیانێك بە ئاین نەگەیەنێت، هەر یەکەیان جیهانێکی بەدەر لە جیهانەکەی ئەوی تری هەیە، ئەمە ئەو مەبەستەیە کە ئەکرێ بڵێین ویستی مامۆستا بووە، لەگەڵ ئەوەش دا ئەمە لە ویستی ئەودا بەژێری دەخوا.

پاش سەرنجم لەسەر ئەوەی کە وادەزانم ئەو ژێرتر بێت لەوەی مەبەستی بێت حکومەتی ئەبوبەکر بە حکومەتێکی نائاینیو چی و چی بزانێت، لە پاش ئەوە دەڵێم: لە راستیدا یان ئەوەتا کەمو کورتیەك لە بیرکردنەوەی مامۆستادا هەیە یاخود لانی کەم لە غیرەتیا بەرامبەر بە ئاین، چونکە تێناگا لەوەی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت چ

زیانێکی گەورە لە ئاین دەدات، یاخود گوێ نادات بـەو زیانـەی لـەم جیاکردنەوەیەوە سەر هەڵ بدات لەگەڵ ئەوەی لێی تێدەگات، باشە ئەو تاوەکو ئێستا لەوە تێنەگەیشتووە پاش هەڵوەشـاندنەوەی خەلافـەتو جیاکردنەوەی ئاین لە حکومـەت چـی لـە تورکیـادا روویـداوە، لـەو دورکەوتنەوەیەی کۆمەڵگە لە ئاین وەك پاشـکۆو شـوێنکەوتنێك بـۆ حکومەت، یاخود تێگەیشتووە بەڵام خۆی لێ بێ ئاگا دەکـاتو سـورە لەسەر ئەوەی ئەو ئینقلابە شتی زۆر گەورەی لەو وڵاتەدا بەدی هێناوە، وە بە ڕاپەڕینێکی راستەقینەی دادەنێ بۆ ئەو وڵاتە، هەمان ئـاواتیش بۆ میسریش دەخوازێ با ئاوات خواستنەکەشی لە دڵیدا شاراوە بێتو راینەگەیاندبێ هەروەك مامۆستا (فريد وجدی) ئاواتی بۆی خواسـتو ڕاشی گەیاند؟ ئەم دوو گریمانەو ئەگەرانـە دوور نـین لـە مامۆسـتاو دانەری کتێبی (الإسلام وأصول الحكم) کە لە ل(٣٧-٣٨)ی وتونی، لەو وتارانەی لە ڕۆژنامەکاندا بە بۆنەی ئەو وەرگێڕانە نوێیەی قوڕئان لە تورکیای کە مالـیدا کرا بـەو پێیـەی دایـە ئـەم وەرگێـڕانە جـێی قوڕئانە عەرەبیەکە دەگرێتەوەو خەڵکی پێویـسـتیان پـێی نابێـت، و لەوبارەوە دەڵـێ:

(ئایا هیچ بەرژەوەندییـەکی ئـاینی و دونیـایی موسـڵمانان لـەو پەیکەرە ئیفلیجو گۆجانـەدا هەیـە کـە پادشـاکانی میـسر قوتیـان دەکردەوەو ناویان دەنان خەلیفەکان، بەڵکو ئەو بتانەی دەیانجولاندن و ئەو ئاژەڵانەی گاڵتە جاڕیان پێدەکردن، ئـەو وڵاتـە ئیـسلامیە بـەر فراوانانەو میسر چیان لـێ بەسەر هاتووە کاتێك کـۆتی خەلافـەتیان

دارنیوەو دەسەڵاتی ئەوانیان پەسەند نەکردو تاوەکو ئێستاش زۆربەیان بەدەر لە سێبەری خەلیفەکان‌و ملکەچێتێکی وەسەنیانە بۆ سەرکردەو بەرێزیان ژیان دەگـوزەرێنن (*) ئایـا بـەبێ ئـەوان دروشمـەکانی ئـاین پشتگوێ خراو کاروباری خەڵکی لەکار خرا؟ یاخود ئایا دونیایان لـە سەر تاریك بوو کاتێك ئەستێرەی خەلافەتیان کەوت، وە ئایا بە تەریك بونی خەلیفـەکان بـەزەیی‌و میهرەبـانی زەوی‌و ئاسمانیـان لـێ دوور کەوتەوە؟ نەخێر .

بانوا فما بكت دنيا لمصرعهم
ولا تعطـلت الأعيـــاد والجمع

واتە: تەریك‌و دوورکەوتن بـەڵام دونیـا بـۆ لەناوچـونیان نـەگریا، جەژن‌و جومعەکانیش پەکیان نەکەوت .

پەنا بە خوا! خوای گەورە نایەوێ سەربەرزی‌و سەرشۆڕی ئاینەکـەی کە خۆی کەفالـەتی مانـەوەی کـردووە بەسـترا بێـت بـە جۆرێـك لـە حکومەت‌و بەشێك لە میرەکان.

وە خوای گـەورە نایـەوێ بەنـدە موسـڵمانەکانی چـاکی‌و خراپیـان گرێدراو بارمتەی خەلافەت یا ژێردەستەی خەلافەت بێت، خوای بەرزو باڵا لە هەموو کەس زیاتر پارێزەری ئاینەکەیەتی‌و بە بەزەیی تریـشە

(*) سەیرو نامۆ لێرەدا ئەوەیە عەبدورەزاق نەوروژا دژ بە ئیستعماری بەریتانی کە بە فیعلی دەستی گرتبوو بەسەر میسر لەو ماوەیەدا وەك ئەو وروژان‌و شۆڕشەی بە سەر خەلافەتی عوسمانیدا کردی کە جگە لە ناو هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر میسردا نەبوو؟!

بۆ بەندەکانی)

منـــیش دەڵـــێم (ئـــەو خەفەتـــە زۆر تونـــدەش ناشـــارمەوە لـــەوەی مامۆســـتای دانـــەر ئـــەو چـــەند رســـتەیەی کـــە لـــە کتێبەکـــەی گواستومانەتەوە چەند نمونەیەکی بەرزی لە ووشـەی رەوا هێنـاوە بـۆ مەبەستی نارەوا) لە راستیدا خەلیفە لای خەڵکی بە کەسێك دەوترێ لە نێوان پادشـایانی ئیـسلامدا تایبەتمەنـدی خـۆی هەیـە، ئـەوەش نازناوێکە لـە لایـەن موسـڵمانانی هـەر چـوار لای جیهانـەوە پـێی دەبەخشرێ، یاخود لە پێشینانی خۆیەوە بـۆی ماوەتـەوە تـا دەگاتـەوە ئەبوبەکری سدیق، دروست نیە فـرە بێـت هـەر چـەندە دروسـتە لـە بنەماڵەیەکەوە بۆ بنەماڵەیەکی ترو لە قەومێکەوە بۆ قەومێکی تـر بگوازرێتەوە، هاووێنەی خەلیفە ئەمەوی‌و عەباسی‌و عوسمانیەکان، تا ئەمە لە باوی خەڵکیدا بریتیە لـە خەلافـەت، خـەڵکیش وا گومـان دەبات مەبەستی (مصطفی کمال)ە لە هەڵوەشانەوەی خەلافـەت بـەم واتایە بووەو مامۆستای دانەریش ئەم هەڵوەشـاندنەوەیەی پـێ خـۆش بـــووە، بـــەڵام خەلافـــەتی راســـتەقینە لای مـــن‌و مەبەســـت لـــە هەڵوەشاندنەوەشی لە لایەن ئەوانەی لـە تورکیـادان‌و ئەوانەشـی لـە دەرەوە پـشتگیری ئـەم کارەیـان دەکـەن بریتیـە لـە هەڵوەشـانەوەی جێگرتنەوەی پێغەمبەری خوا لە جێ‌بـەجێ‌کردنی ئـەو یاسـاو رێـسا ئیسلامیانەی هێناویەتی، ئەم جێنشینیایەتیە (الخلافة) لە تەواوی ئەو حکومەتە ئیسلامیانەدا هەیە کە بـە پـێی توانـا مەرجـەکانی ئـەو حکومەتەیان تیادا کۆبووەتەوە.

هەرچەندە باوی گشتی یەکێك لەوانــە بــە دیـاریکراوی‌و تایبــەت ناودەنێ بە خەلافەت، چونکە ئەگەر حکومەتێك هەبوو، ڕەچاوی مەرج‌و پیشەکانی حکومەتی ئیسلامی تیادا بوو، بۆ ئەو نوێنەرایەتیەشی لە خۆ دەگرت کە باسمان کرد، ئەوەش بریتیە لە خودی خەلافــەت خــۆی، ئەوەی مەرجە لە خەلافەتدا بێتە دی ئەوەیە حکومەت شوێنی بنەماو ڕێسا ئیسلامیەکان بکەوێ، ئــەو کاتــە وەســفکردنی حکومەتــەکانی ئیسلام بە خەلافەت‌و فەرمانڕەوا بــە نازنــاوی خەلیفــە، بــەپێی ئــەو شوێنکەوتنە دەبێت کە هەیەتی بۆ ئەو بنەما ئیسلامیانە.

وتمان: خەلافەت بە واتای دووەمی کە واتە راستەکەیەتی، ئەمەیــە ویستویانە هەڵی وەشێننەوە لە چوار چێوەی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت بە واتا یەکەمە ڕەسمیەکەی، نوسینەکەی مامۆسـتای دانــەریش هــەر ئەمــەی مــەبەســتە کاتێــك هەڵوەشـاندنەوەی خەلافــەت خۆشەویــست دەکات، چونکە جیاکردنەوەی ئایین لــە سیاســەت کــە ئــەم نوســراوە بانگەشەی بۆ دەکات لەوەی خەلافــەت بــە واتــا دووەمــە راســتەکەی هەڵوەشێتەوە ئەم تێگەیشتنەش بــۆ خەلافــەت ئــەوە دەگەیــەنێ کــە فەرمانڕەوا لە حکومەتەکەیدا شوێنی یاساکانی ئیسلام بکەوێ،(*) لە پاش هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت لە تورکیادا لەگەڵ ئەوەی حکومــەت

---

(*) واتــە ئــەوەی ئــەتاتورك پــێی هەســتا هەڵوەشـاندنەوەی هــەردوو خەلافەتەکــە بــوو، خەلافــەتی بــاوو عــورفی کــە لــە خەلافــەتی عوسمانیــدا خــۆی دەنوانــدو ڕەمــزی یــەکگرتن‌و یــەکێتی ئیــسلامی بــوو، خەلافــەتی شــەرعیش کــە لــە پیــادەکردن‌و جێبەجێکردنی شــەریعەتدا خــۆی دەنوێنێت‌ونوێنەرایــەتی کردنــی پێغەمبــەرە ﷺ لەم ڕووەوە

مـایەوە کەچی ئەو حکومـەتەی لە خەلافەت جیایە وە بەهەمـان شـێوە لە ئاینش جیابویەوە، وەك ئەوەی ئەوانەی خەلافـەتیان هەڵوەشـاندەوە لەگەڵ ئەوەدا ئاینـشیان هەڵوەشـاندەوە، گومـان نیـە لـەوەدا ئـاینی حکومەتیان هەڵوەشاندەوە ئەگەر ئاینی ئومەتیش نـەبێت، نوسـەری ئەم کتێبە بە دەق دان دەنێ بە هەڵوەشاندنەوەی ئـاینی حکومـەتـدا، پشتگیریشی کردووە بە بیانوی ئەوەی حکومـەتی ئەبوبەکریش (خـوای لێ ڕازی بێت) ئاینی نەبوو، مامۆستا ئەم بانگەشەیەی بەسە بۆ ئەوەی دادوەر بێت بەسەر کتێبەکەیـەوە پـێش ئـەوەی رەخنـەگرانو دادوەری بکەن .

ئەگـەر بانگەشـەیەکی تـری هـەبێتو بلێـت، نائـایینی بـوونی حکومەت ناتەبا نیە بە، ئاینداری ئومەت ئەوا بـارودۆخی تورکیـای ئێستا بانگەشەکەی بەڕاست دانانـێ، دوو دڵ بـوون لـەوەی نیـشانەو مـەشخەڵەکانی ئیسلام بەرەو نەمانو پوکانەوەو لەناو چوون دەچن لـە تورکیاداو هەڵوەشاندنەوەی ئاین بە دوای هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتـدا هـات، تـاوەکو ڕێگـری کـرا لـەوەی خـەڵکی بـچێ بـۆ حیجـاز بـۆ جێبەجێکردنی فەریزەی حەج، دادگا شەرعیەکانو پەیمانگا ئاینیەکان داخراون، مارەبڕینی شەرعی گـۆڕا بـە مـارەبڕینی مـەدەنی و پیتـی عەرەبی بە پیتی فرنجی ئەمەش بۆ ئەو مەبەستە بـوو تـاوەکو تـورك پەیوەندی بپچڕێ بەو مێژووەی پێشتر لە ئیسلامدا هەیبوە، هەرچەندە ئەو مێژووە بەرزو پرشنگدار بوو بێ، وە گرنگی درا بە پێگەیاندنێکی

نائاپینیانەی نەوە خوێندەوارەکانمان بەوەی ناوی خودای بەرزو بـاڵا لـە سەر زمانی رەسمی باس نـەکرێو رێنـەدرێ بـە گۆڤـارو رۆژنامـەکان وتاری ئاینی بڵاوبکەنەوە ئەگەر وەڵامیش بێت بۆ ئەو ووتارانەی دەست درێژی تیادا کراوەتە سەر ئاپین ..

ئەگەر لـە ئەمانـەدا دوو دڵـی هـەبێت ئـەوا شـایەنی گفتوگـۆو مشتومڕ لەسەرکردن نیەو وەك ئەوە وایە لەگەڵ کەسـێکدا مـشتو مڕبکەی کە بەشێوەیەکی کەللەرەقانە پابەندە بە کوفرەوە .

هۆکـاری هەرەسـهێنانی پایـەکانی ئـاین لـە تورکیـادا پـاش هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتو جیاکردنـەوەی ئـاین لـە حکومـەت کـە پاشکۆو پەیوەسـتی ئـەو هەڵوەشـاندنەوەیە بـوو، روونو ئاشـکرایەو هەمان ئەو هۆکارانە خودی ئەو هەرەسە بـەدوای خۆیـدا دێنـێ لـەو وڵاتانەو وڵاتانی تریش کە هەمان هەنگاویان گرتەبەر لە جیاکردنەوەی دینو دەوڵەت چونکە ئاینو حکومەت ئەگەر لێـك جیابوونـەوە ئـەوا حکومەت زاڵ دەبێت بەسەر ئایندا بەو پێیەی حکومەت لە دەسەڵاتو سیاسەت جیا نابێتەوە بەڵام ئاین لە دەستیان دەدات، بەو پێیـەی بـە جیا بوونەوەی ئاینو حکومەت، دەسەڵات لە پاڵ حکومەتـدا دەبێـتو ئاینی جیاکراوەش دەکەوێتە ژێر بەزەیی حکومەتەوە، ئەگەر وویـستی رێزی دەگرێو ئەگەر ویستشی سوكو ریسوای دەکا، بـا بڵـێین ئەگـەر حکومەت ژێر بوو وە باوەڕی بە ئـاین هـەبوو سـەرەرای ئـەوەی ئـاین جیاکرابووەوە لێی وەکۆتی ئایینی لەسەر نەمابوو، ئایا بەشی یەکـەم

هەڵدەبژێرێ‌و ڕێز لە ئایین دەگرێ ؟ لــە کاتێکـدا هــەر ئــەوەی ئــایین دەخرێتە ژێر ڕەحمەتی پاراستنەوە خۆی لە خۆیدا پێچەوانەیە بە ڕێــزو کەرامـەتی دین، لە کاتێکدا وڵاتی میـسری نیـشتمانی نوسـەر ڕازی نابێت لە ژێر چاودێری‌و پارێزگاری کەسانی تـردا بێـت، لـە کاتێـك ئەگەر حکومەت ژیرو باوەڕدار بێت بە ئایین ئـایینی لـە خـۆی جیـا نەدەکردەوە، وە ئەوەی هەڵدەبژارد کە لە ژێر سایەو دەسەڵاتی ئایینـدا بوایە لە هەمان کاتدا ئومەتیش لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو، بەڵام ئەگــەر حکومـەت نا ئایینی بێت جـەنگ هەڵبگیرسـێنێ دژ بـە ئـایین ئـەوا سەرکەوتن لەو جەنگەدا بەدەست دەهێنێ، بەو پێیـەی دەسـەڵات لـە دەستی دایە لە کاتێکدا ئایین داماڵراوە لەو چەکە یەکلاکەرەوەیە .

مامۆستا لە کتێبەکەیدا دان نانێ بە حکومـەتی پێغەمبەردا ﷺ تاوەکو حکومـەتی ئەبوبەکری پاش ئەو بە جێنـشینی حکومـەتەکـەی ئەو دابنێ، هەر بۆیە چەندین زانای میـسری کتێبـی وەڵامدانـەوەیان نووسی، وێنەی شێخ (بخیت) بەر بەزەیی خوای گەورە بکەوێت‌و شـێخ (خضر) خوا سەلامەتی بکات(*) کـە دوای کتێبەکـەی خـۆم هـەردوو کتێبەکەیانم بینی - سەبارەت بە پێداویستی‌یەکانی ئەو حکومـەتەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوونی هەبووە، کە مامۆسـتای دانـەر خۆی زۆر سەرقاڵ کردووە بەوەی تەئویلیان بکات و بیانگێڕێتـەوە بـۆ

(*) دیارە لە کاتی نووسینی ئەم بابەتەدا شێخ خضر زیندوو بووە (وەرگێر)

واتایەك كە بەدەر بن لــە ئــەوەی پــێ‌ی دەوتــرێ حكومــەت، مــن بــە ئەندازەی ئەو مامۆستایانەی لە میسردا وەڵامی ئەویان دابویەوە و زۆر بە فراوانی ســەبارەت بــە ســەلماندنی پێداویستییەكانی دەوڵــەت لــە حكومەتدا قسەیان كردووە ئەوەنــدە بــە فراوانــی شــتم لــەو بارەیــەوە نەنووســیوە، بــەڵام مــن زیــاتر لــەوان گــرنگیم داوە بــە غــەزوەكانی پێغەمبەر ﷺ وە زۆر بە چــاكی پــشتم پــێ بەســتووە بــۆ ســەلماندنی حكومــەتی پێغەمبــەر ﷺ، تەنانــەت ووتومــە لــە راســتیدا چــۆن غەزوەكانی پێغەمبەری خوا كافرەكانی سەرشــۆر كــردوو ناحــەزەكانی تێك شكاند بەهەمان شێوە بوونی ئەو غەزوانە بەسەر ئەو كتێبەدازاڵ دەبێت و بانگەشە پڕوپوچەكانی هەڵدەوەشێنێتەوە هەر چەندە لە رووی زەمەنیشەوە زۆر پێشی كــەوتووە، گفتوگــۆو مــشتومڕەكانم بــۆ ئــەو كتێبە لە بڵاوكراوەكانی ڕۆژنامــەی (یــارین)مانــدا بەســترا بــوو بــەو وەرگێڕانەی بۆ كتێبەكە كرا بوو، ئیستا پاش ئەوەی ئەسڵی كتێبەكــەم بینی پێم باشە ئەم چەند دێرەی لــێ وەرگرمو پاشان رەتی دەدەمەوە لە ل ٥٢ دا دەڵێ: (بێگومان حكومەتی پێغەمبەر هەنــدێ شــتی تیــادا بوو كە بە دیاردەكانی حكومەتی سیاسی و شانشینی دەچوو، هەر بــۆ نمونە یەكەم شــتێ كــە بــە خەیاڵــدا دێ لــە كاروبــاری مەلەكیــەتی ســـەردەمی پێغەمبـــەردا ﷺ بەدەردەكـــەوێت مەســـەلەی جیهـــادە، پێغەمبەری خوا ﷺ غەزوی بێ باوەڕ عەرەبەكانی كردووە وولاتیــانی رزگاركردووە لە جەنگــداو دەســتی گرتــووە بەســەر سەروســامانیاندا،

گومانیشی تیادا نییه چاویشی بڕیبووه دەرەوەی دوورگەی عەرەبیش، وە خۆی ئامادەکرد بە سوپاکەیەوە بەرەو وڵاتانی تـر بخـزێ و بجـوڵێ بـە کردەوەش دەسـتی کـرد[1] بـە ململانـێکردنی دەوڵـەتی ڕۆمـان لـە ڕۆژئاواوەو داوای ئەکرد کیسرای فارس لـە ڕۆژهـەڵاتو نەجاشـی لـە حەبەشەو مەقوقس لە میسرو .. هتد ملکەچی ئایینەکەی بن .

یەکەم جاریش وا بەدەردەکەوێت کە جیهاد تەنها بانگەشە کردنـێ نییە بۆ ئایینو باوەڕهێنانی خەڵکی بە خواو پێغەمبەرەکـەی، بـەڵکو جیهاد بۆ سەقامگیری دەسەڵاتو فراوانکردنی شانشینیشە .

بانگەوازکردنی ئەو، بانگەوازە بۆ لای خـوا، پـشتو پێگـەی ئـەو بانگەوازەش تەنها بە ڕوونکردنـەوەو بزوانـدنی دڵەکانـە بـە هۆکـارە جۆراوجۆرەکانی کارتێکردنو قەناعەت پێکردن، بەڵام هێزو زۆرکـردن گونجاو نیە لەگەڵ بانگەوازێکدا کە مەبەستی بێت دڵەکان ڕێنمـونی بکـاتو بیـــروباوەڕەکان پاکـژ بکـات، لـە مێـژووی پێغەمبەرانـدا نـەمانزانیوە پێغەمبـەرێك بـە زەبـری شـمـشێر خـەڵکی ناچـار بـە باوەڕهێنان کردبێت وە یا نەتەوەیەکی داگیر کردبێت لە پێناوی ئەوەی باوەڕ بە ئاینەکەی بهێنن، ئەمەش بریتیە لە هەمان ئەو سـەرەتایەی پێغەمبەر ﷺ دەیسەلماند لـە کاتێکـدا دەیویـست کتێبـی خـودایی ڕابگەیەنێت.

---

(١) ئاماژەیە بۆ غەزوەی موئتە سریەی ئوسامەی کوڕی زەید

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة: ٢٥٦) وە فەرموویەتی: ﴿ادعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّك بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (النحل- ١٢٥)، وە فەرموویەتی: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية: ٢٢) وە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ وَقُلْ لِلَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ (آل عمران: ٢٠) وە فەرموویەتی: ﴿أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاس حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾(يونس: ٩٩)(*)

ئەمانە سەرەتاو بنەمای روونو ئاشکران لەوەی پەیامی پێغەمبەر ﷺ بە وێنەی پێغەمبەرانی پێش خۆی، تەنها پشت ئەستورە بە قەناعەت پێکردنو ئامۆژگاری دان، وە بۆی نەبووە پشت بە هێزو زۆرداری ببەستێ، وە کاتێکیش کە پەنای بەهێزو ترساندن بردوە ئەوە لە پێناوی بانگەوازکردندا نەبووە، بۆ ئاینو گەیاندنی پەیامەکەی بە جیهانیان، تەنها وا لێی تێ دەگەین کە ئەوە لە پێناوی پادشایەتیو پێکهێنانی حکومەتی ئیسلامیدا بووە حکومەتیش تەنها بە شمشێر بەرپا دەکرێ، وە بە هۆی ژێردەستکردن و زاڵ بونەوە بەدی

---

(*) تەواوی ئەم ئایەتانە باس لە ئەرکی پێڕاگەیاندنو ئازادی مرۆڤ دەکەن لە وەرگرتنو پەسەند کردنی ئەو بیرو باوەڕەی پێی دەگات، سەیری تەفسیری ئاسان بکە. (وەرگێڕ)

دێ، ئەمە لای ئەوان بریتیە لە نهێنی واتای جیهادی پێغەمبەرانە ).(*)

لەمە زیاتر هیچ لـە کتێبەکـەی عـەلی عەبـدوڕازق ناگوازینـەوە سەرەرای ئەوەی ئەو زۆر زیاد لەم مەسەلەیەدا تەئویلی کردووە، واتـە سـەبارەت بـە جیهـادی پێغەمبــەر ﷺ، سـەرەرای هـەموو ئـەو زیادەڕەویانەی لە لێدانی دەرگاکـانی تەئویلـدا ئـەنجامی داوە کەچـی هەموو ئەوانە سودێکی وای پێ نەگەیانـدوەو خزمـەتێکی بەرچـاوی نەکردووە بەو بانگەشەیەی چەقی کتێبەکەیـەتی و بەدەوریـدا خـوول دەخوات، مەبەستم جیاکردنەوەی ئاینـە لـە سیاسـەت وە هەوڵێـداوە بیسەلمێنێ ئەو بۆ چوونە دژ نیە بە خـودی ئیـسلام، ئـەو حکومـەتی پێغەمبەر ﷺ ناسەلمێنێ لەولاشەوە دان دەنێ بە جەنگەکانیدا بـەلاّم ئیدیعای ئەوە دەکات کە ئەو جەنگانەی لەپێناوی ئایندا ئەنجام نەداون، دەستی کردووە بە ژماردنی ئەو ئایەتانەی باس لەوە دەکەن زۆر کـردن لە ئاییندا نیە، پێغەمبەر ﷺ هـەژموونو زاڵێـــتی نیـە، بـەڵکو تەنها ئاگادارکردنەوەو پێڕاگەیاندنی لەسەرە، ئەی چۆن جەنگـەکانی

---

(*) ئـەو ووتەیـەی لـە نێـوان دوو کەوانەدایـە ووتـەی علـی عەبدوڕازقـە شـێخ مـستەفا سـەبری بۆیـە دەیهێنـێ تـاوەکو ڕەخنـەی لـێ بگـرێو هەڵـی وەشـێنێتەوە، لێـرەدا سەرنجی ئامانجی علی عبدالرازق بدە، کە بریتـی یـە لـەوەی بەهـەمان شێوە گومان بخاتـە سـەر مەشـروعیەتی جیهـاد وەك دەروازەیـەك بـۆ سـەلماندنی مەشـروع نـەبێ خەلافـەت و فـەرمانڕەوایی کـردن بـە شـەریعەت وە داداگـای شـەرعی، هـەموو ئـەو دوودڵیو گومان دروستکردنانە لە سایەی حمایەی بەریتانیادایە بۆ میسر، ئەمڕۆمان چەند بە دوێنێمان دەچێ ؟

لەگەڵ ئەم ئایەتانەدا دەسازێن‌و ڕێك دەکەون، جا ئەگـەر جەنگـەکانی بۆ ئاین نەبوو بێت کەواتە هەر دەبێت بۆ حکومەت بێت، بانگەشـەی ئەوەشی کردووە کە ئەو حکومەتی نـەبوە، کەواتـە یـا دەبێـت ئەمـە دژواری و ناکۆکی نوسەر خۆی بێت، یاخود ڕەخنەگرتنێکی ئاشـکرایە لە پێغەمبەر ﷺ کە بە پێچەوانەی ڕەوتـی پێغەمبەرانـەوە جـەنگی بەرپا کردووە، یاخود دەبێت حکومەتەکەی پێغەمبەریش ﷺ نائاینی بێت بەپێ‌ی ڕێبازی دانەر بە هەمان شێوەی حکومەتەکەی ئەبوبەکر .

وا دەبینین دژ بونەکان زۆر ئاشکران‌و تەئویل هەڵناگـــــرن لـەوەی کە ئەو بڕوای وایە پێغەمبەر ﷺ لـە پێنـاوی ئاینـدا نەجـەنگاوە لەگەڵ ئەوەی چەندین ئایەت هەیە کە دژ بەو بۆچونە لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّـارَ وَالْمُنَـافِقِينَ وَاغْلُظْـ عَلَـيْهِمْ وَمَـأْوَاهُمْ جَهَـنَّمُ وَبِـئْس الْمَصِيرُ﴾ (التوبة: ٧٣)، وە ئایەتی: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُـونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾ (البقـرة: ١٩٣)، وە لە ئایەتێکی تردا هاتووە ﴿وَيَكُونَ الـدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ (لأنفال: ٣٩) ئایا مـامۆستا ئینکـاری جـەنگکردن لـە پێنـاو ئایندا دەکات، جیهادکردن لە پێناوی خوداو بەرزکردنەوەی ووتەکانی؟ ئەگەر ئینکاری دەکات ئایا ئینکاری ئەم ئایەتەی خوا دەکات ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٤٤) هیچ گومـان‌و دوو دڵیەك لە ڕوودانی غەزوەکانی پێغەمبـەردا نیـە، هـیچ گومـان‌و دوودڵیەك لە بوونی ئایەتەکانی جەنگ کردندا نیە لە کتێبی خـوادا، ئایا ئەو جیهادەی لە کتێبی خوادا باسکراوەو فەرمان دراوە موسڵمانان

ئەنجامی بدەن دەگونجێـت شـتێك بێـت جگـە لـە ئـاینی ؟ ئەگـەر وا دابنەین ناتەباییەك لە نێوان ئـەم دوو جـۆرە لـە ئایەتـدا هەیـە کـە نمونەکانی زۆر زۆرن وەکو ئایەتی ﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْساً وَأَشَدُّ تَنْكِيلاً﴾ (النساء: ٨٤) وە ئایەتی: ﴿فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُولَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً مُبِيناً﴾ (النساء: ٩١) وە ئایەتی: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُم﴾ (الأنفال: ٦٠) کە قورئان لـەم ئایەتانـەدا دوژمنـی موسڵمانان بە دوژمنی خوا دادەنێ وە فەرمان دەدا پێداویـستیو هێـز بۆ تۆڵەو تۆقاندنیان ئامادە بکرێ، ئایا لەسەرەوەی ئەمـەوە جـەنگێك هەیە لە پێناوی ئاییندا؟ جا ئەگەر ئەم ئایەتانە بـە ناتـەبا دابنرێـت لەگەڵ ئەو ئایەتانەی مامۆستا ژماردوونی وەکو ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ (البقرة: ٢٥٦) یاخود ﴿أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاس حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾(یونس: ٩٩) یاخود ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشیة: ٢٢) وە یاخود ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ (آل عمران: ٢٠) وە بەشێکیان ئەوەی تریانی نەسـخ کردبێتـەوە ئـەوا پێویـستە نەسـخ کەرەوە ئایەتەکانی جیهاد بن نەسخ کراوەش ئایەتەکانی وازهێنان بێت تەنها بە ئامۆژگایو ڕێنمـای کـردن،(*) ئەگـەری پێـچەوانەکەی نیـە

(*) دیارە هیچیان نەسخ نین بۆ ئەم مەبەستە بروانە نوسراوەکەی (د. مصطفى الزلمي) بە ناوی (البينات لرفع غموض النسخ في القرآن) (وەرگێڕ)

چونکە وێنا ناکرێ پاش جەنگکردن لە پێناوی ئایینـدا، نـەهی لێ بکرێ بنیات لە سەر ئەوەی ئایین بە جەنگکردن سەر نـاخرێ، بـەڵکو تـەنها پـشت ئەسـتوورە بـە قەناعـەت پێکـردن هـەروەك مامۆسـتا بانگەشەی بۆ دەکات، ئەگینا ئـەم نـەهی کردنـە بەهەڵـەدانانی ئـەو جەنگـە پێـشوانەیە کـە بـە فـەرمانی خـوای گـەورە ڕویـان داوەو ئەنجامدراون .

بۆت هەیە ناتەبایی ئەم دوو دەستە ئایەتەی لە قورئاندا باس کراون ڕەت بکەیتەوە بێ ئەوەی پەنا بەریتە بەر نەسخ کردنەوەی بەشێکیان، بەڵام تەئویل کردن‌و لێکدانەوەی ئەو ئایەتانەی داخوازی ئـەوە دەکـەن کە تـەنها بـە ئامۆژگـاری و ڕێنمـایی کـردن واز بهێنـرێ نـەك ئـەو ئایەتانەی باسی جەنگ کـردن دەکـەن و تـەئویل کـردن هـەڵناگرن، فەرمودەی خـودا ﴿لا إِكْـرَاهَ فِـي الـدِّينِ﴾ (البقـرة: ٢٥٦) واتـە: هـیچ پێویستی بە زۆر کردن نیـە، چـونکە ڕێنمـایی‌و سەرلێـشێواوی لێـك جیابوونەوەو بەڵگەداری ئیـسلام روون‌و ئاشـکرا بـووە، یـاخود واتـای ﴿أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (یونس: ٩٩) ئەوەش دەگەیەنێ تۆ ناتوانی ئەو کەسە ڕێنومایی بکەیت کە خۆت ویـستوتەو دیاریـت کردوە بەڵکو خـوای گـەورە خـۆی ئـەوەی بیـەوێ ڕێنومـایی دەکـات بەهەمان شـێوە ئایـەتی: ﴿فَذَكِّـرْ إِنَّمَـا أَنْـتَ مُـذَكِّرٌ لَـسْـتَ عَلَـيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية: ٢٢) وە ئایەتی ﴿لَيْس عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ (البقرة: ٢٧٢) لەوانەشە تـەواوی ئەمانـە بـۆ دڵـــــدانەوەی

پێغەمبـــەرو ﷺ لابردنـــی خـــەمو خەفـــەت بێـــت، کـــە بـــە هـــۆی باوەڕنەهێنانی گەلەکەیەوە بۆی دروست دەبوو هـــەروەك خـــوای گـــەورە دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (الشعراء: ٣) ئەمـــەش لـــە ســـەرەتاکانی ســـەردەمی بانگـــەوازەوە بـــووە ئـــەو کاتـــەی موسڵمانان کەمو لاواز بوون، پاشان خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنْصُورُونَ وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ (الصافات: ١٧١-١٧٥) پاشان فەرموی: ﴿انْفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (التوبة: ٤١) وە فەرموی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفاً مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ﴾ (الأنفال: ٦٥) وەفەرمویـــەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ﴾ (التوبة: ١١١) چۆن دەکرێ پاش هێنانی ئەم ئایەتانـــە وەك نمونە کە زۆر بەیانمان نەهێناوە(*) بوترێ جەنگەکانی پێغەمبـــەری خوا لە پێناوی ئایندا نەبووە، وە لە نێو پێغەمبەراندا کەسێك نـــەبووە کە بە زەبری شیر خەڵکی ناچار بەباوەڕ بە خودا کردبێت؟ مامۆستا بە مێژوو رەخنە لە ئێمە دەگرێ ئێمەش بەو ئایەتـــە ڕوونو ئاشـــکرایانەی

(*) ئەو بۆچوونو ریزبەندییەی سەرەوەی شێخ (مصطفی صبري) دیدو بۆ چوونێکە لەو بارەیەوەو یەکێکە لە لێکدانەوەکان بۆ تێگەیشتن لەو ئایاتانە (وەرگێڕ)

قورئان ڕێی لـێ دەگرین کـە هـانی جیهـادکردن دەدات بـەڵام چـۆن هاندانێك، ئایا دەكرێ ئەو جیهادەی لە قورئاندا باسكراوەو لـە لایـەن خواوە بەڵێنی بەهەشتی لە بریتیدا دراوە وەكو نرخێك، ئـەكرێ ئـەوە كارێكی نائایینی بێت.[1] جا ئەگەر جەنگەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێناوی ئاییندا نەبێت‌و بۆ پادشایەتیش نەبێت هەروەك لە سەرەتای باسەكەیەوە نەرێی كرد ئەی كەواتە بۆچی بووە؟

لەوانەیە ئەوەی مامۆستای ناچار كردبـێ بـەوەی واقـع بـشێوێنێ لەوەی كە دەڵێ جەنگكردن لە پێناوی ئایندا نەكراوە، ئەو عەقڵیەتەی بێت كە كاریگەرە بە ڕۆژئاواییەكان ئینكـــاری ئەم جەنگ كردنـەیان پێ خراپەو لەم ڕێگەیەشەوە نەنگیش لە ئیسلام دەگرن، مامۆستا بـە

---

(١) لە (مبسوط)ی (شمس الأئمة السرخسي) لە یەكەم بابی دا بە ناوی (معاملە الجیش مع الكفار) لـە، ل (٣٠) بـەرگی دەیەمـدا هـاتووە:( ئەگـەر سـوپایەك زەویـەكی غـەزو كردو خەڵكەكەی بانگەوازی پێ نەگەیشتبوو دروست نیە لەگەڵیان بجەنگیٚ تـاوەكو بانگیـان نـەكات بـۆ ئیـسلام، تـا بـزانن لەسـەر چـی جـەنگیان لەگـەڵ دەكرێـت ؟ هـەر ئەمـەش واتـای فەرمودەكـەی (ابـن عبـاس)ە خوایـان لـێ رازی بێـت(كـە فەرمویـەتی پێغەمبەری خودا ﷺ غەزوی هیچ قەومێكی نەكردوە تاوەكو بانگی نەكردبێتن بۆ ئیسلام ) ئەگەر بەبێ بانگەواز كردن شـەریان لەگەڵدا بكـەن لـەوەدا تاوانبارن، بـەڵام بە دیـدو بۆچـونی ئێمـە ئـەو خـوێن‌و سـامان‌و داراییـەی لـە نـاو چـوە بریتـی نـادرێ، شـافعی (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت) فەرموویـەتی : بریتـی دەدەن لەبـەر خـوێن نەرشـتن‌و پاراسـتن مەگـەر هـەر بەرهەڵستی بكـەن و نـەهێڵن، ئـەوەش بـەدی نایـەت مەگــەر دوای ئــەوەی بانگــەوازیان پــێ بكــات، بــەڵام ئێمــە دەڵــێین: پــارێزراوی بەرگریكەر، بەوە دەبێت مافی پاراستنیان هەبێت ئەمەش بۆ ئەوان بەدی نەهاتووە، ئەگەر پارێزراویەكە بە ئاین و گەیاندنی بێـت هـەروەك بەرامبـەرەكانمان دەڵێن ئـەوە بۆ ئەوان دەستەبەر نەكراوە

هەمان شێوەی ئەوان ئینکاری ئەوەی کردووە جەنگ لە پێناوی ئایندا بکرێت، تا ناچار بووە بڵـێ: پێغەمبـەرمان لـە پێنـاوی ئاینەکەیـدا نەجەنگاوە .

هەر بۆیـە لـە بەرامبەرمـدا هەڵوێـستێکی گرتـووە ئاسـانە لـە گفتوگۆو وتوێژدا زاڵ بم بە سەریدا، لە بەرامبـەر ئـەو ڕۆژئاواییانـەی هەڵوێـستیان هەیـە لـە جەنگـەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، هەڵوێستێکی گرتووەتەبەر کە شێواندنی واقعو مەرای کردنە .

من وەکو مامۆستا نیم نەنگی بگرم لەو جەنگـە ئابوریانـەی لـەم دواییەدا بەرپاکران لەلایەن ئەوانەی جەنگی ئایینی بە نەنگیو عەیب دادەنێن، عەیبترین نەنگیەك لەسەر ئومەتێك ئەوەیە بجەنگی بۆ ئەوەی خۆی تێر بێو کەسانی تر برسیان بێت، هـەر مەبەسـتێکی مادیانـە جەنگو کوشتاری نێوان مرۆڤەکانی لەسەر بنیات نرا ئەوا ئامانجێکی نـزمو بـێ بایەخـەو دروسـت بـوونو سەرهەڵدانیـشی چلێـسیەکی ئاژەڵیانەی عەیبدارە، ئەوە لە کوێو جەنگ کردنێك لە کـوێ کـە لـە پێنـاوی ئاییـن دا ئەنجام دەدرێ و مەبەستیش تیایدا بەرزو بڵندکردنی ئایینی خواو ڕێنیشاندانی خەڵکیە لە هەردوو جیهاندا سەرەرای ئەوەی ئەو کەسەی لە پێناوی خوادا دەجەنگێ ترسی خوا ڕێگر دەبێ لـەوەی لە جەنگدا ستەم بکات، وە لـە نێـو جـەنگو پـاش سەرکەوتنیـش سنورێکی دیاری کراوی هەیە دەبێت نەیبەزێنێ، ئەو سنورانەش بـەوە ناچێت کە ناودەبرێ بە مافی وولاتـانو بووەتـە یاریگایـەك بەدەسـتی

جەنگاوەرانەوە بە تایبەت ئەوانەی زاڵو سەرکەوتوون .

جاران کاتێ موسـولمانان بـۆ بڵاوکردنـەوەی ڕێنمـایی ئیـسلامی دەجەنگان ئەو وولاتانەی دەچوونە ناوی یەوە رزگاریان دەکردنو هەموو خێرو خۆشیەکیان بۆی دەبرد ، ئەوانـەی دەهاتنـە نێـو ئاینەکەیانـەوە دەیان کردنە برای یەکسانی خۆیان لە ڕوی پلەو پایـەو ڕێـزەوە ، هـیچ کەس تایبەتمەندی بەسەر ئەوەی تردا نەبووە لەو موسڵمانە پێشووانەی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بـوو لەگـەڵ ئـەو موسـڵمانە نوێیانـەی هاتبوونە نێو ئاینەوە مەگەر بە تەقوا نەبێت، ئەوانەشـی نەدەهاتنـە نێو ئاینەکەیانەوە پێیان دەوتن: هەر مافـێ ئێمـە هەمانـە ئـەوانیش هەیانە ، هەرئەرکێ لەسەر ئێمەیە لەسەر ئەوانیـشە تـاوەکو سـەرانە دەدەن، کە بریتی بوو لە سەرانەیەکی سوك، کە هاندەر بوو بۆ ئـەوەی ئەهلی زیمە ڕوو لە ئیسلام بکەن .

با مامۆستا سەیر بکات بزانێت وڵاتە هاوچەرخە سـەرکەوتووەکان چیان کردووە ، جا ئیتر لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیـدا بووبێـت یـاخود لـەو جەنگانـەی پێـشوو تـر روویـان داوە ، بزانـێ چـیان بـە ژێردەستەکان کردوە ، بەردەوامو تا ئێستاش لـە هەوڵـدان بـۆ ئـەوەی هەموو خێروبێرەکان بمژن، بـە هـیچ ڕێو شـوێنێك نـاکرێو ناگونجـێ کەسانی نەتەوە ژێردەستەکان بگەنە پلەو پایەی خۆیانو وەكو ئـەوان بن ، وە بەو چاوەوە بۆی بڕوانن کە بۆ خۆیان دەڕوانن، وە وەکو یەکێك لە خۆیان خۆشـیان بـوێ، وێنـا نـاکرێ ئینگلیزێـك وەکـو یـەکێك لـە

ئینگلیزەکان بڕوانێتە میسری یا هیندی یەکانو هەمان شوێنو پلـەو پایەیان هەبێت لە دڵیاندا

دەگەڕێینەوە لای مامۆستای دانـەر کـە ڕێگـەکانی لا بەرتەسـكو تەنگ بووەتەوە لەوەدا کە بۆچی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو جەنگانەی ئەنجام داوە:

جا ئەگەر جەنگا بێت لە پێناو شانشینو حکومەتەکەیدا ئەوا ئـەو هیچیانی نەبووە، ئەگەر بۆ پشتیوانیو پشتگیری ئاینیش ئەوەی کردبێ ئەوا بە تێڕوانینی مامۆستا لە پێناوی ئایندا جەنگ نـاکرێ، پاشـان بـۆی دەرکـەوت کـە جەنگـەکانی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ پـشتیوانی سەرکردایەتی کردنی ئومەتو بەهێز کردنی دەسەڵاتی بووە بەسەر ئەو خەڵکەی کە بۆی ڕەوانە کراوە تاوەکو بانگیان بکات بۆ ئـەوەی تـەنها باوەڕ بە خودا بهێنن، ئەو دەسەڵاتەی پێویـستە پێغەمبـەرانیش بیـان بێتو لەو ڕووەوە بەهێزو تواناتر بن لە پادشاکان .

ئەمە ئەوپەڕی نامۆییو سەرسامی یە کە ئیدیعا بکرێت بۆ ئەوەی سەرۆکی حکومەتی موسڵمانان کە باو وا بووە لە سەرەتای ئیسلامدا لەگـەڵ ئـەوەی پێـشەواو ئیمامیـان بـووە بەهـەمان شـێوە ئیمـامی نوێژکەرانیش بووەو دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر بـۆی دیـاری کرا، یەکێك لە بەڵگەکانیش بریتی بوو لەوەی لە سەرەمەرگیدا ئەوی ڕاسپارد لە جێی خۆی نوێژ بە موسـڵمانان بکـات، ئـەو ئەبوبـەکرەی (خوا لـێی ڕازی بێ) پاش ئەوەی بەیعەتی پێدرا لە یەکـەم وتاریـدا

که بۆ خەڵکیدا، ووتی: (گوێڕایەڵم بن تا ئەو کاتەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ دەکەم، ئەگەر سەرپێچی خـواو پێغەمبەرەکـەیم کـرد گوێڕایەڵیم مەکەن) .. ئەوپەڕی نامۆیی‌و ڕیزپەڕییە بانگەشەی ئـەوە بکرێ سەرۆکی حکومەتێکی ئاوەها سەرۆکی حکومـەتێکی نائـاینی بێت، ئایا بینیوتانە یا بیستوتانە حکومـەتێکی زەمـەنی پەیوەنـدی نەبێت بە ئاینەوەو کەچی سەرۆکەکەی لەگـەڵ کاروبـار بـەڕێوەبردن‌و سەرۆکایەتیەکەیدا پێشنوێژی ئەنجام بدات؟

ناکرێ بڵێین مامۆستای دانەر ئـەم بەڵگـە نەویستانە نازانـێ، وە نازانێ ناونانی حکومەتەکانی ئەبوبەکرو عوسمان‌و عەلی بە نائـایینی سەرئێشیەکی بێ سنورە، بەڵام مامۆستا ئەم کیتابەی بـۆ پـشتگیری‌و پشتیوانی ڕەوفتارەکەی ئەنقەرە نوسی کـە خەلافـەتی هەڵوەشـاندەوە، هەرچەندە وەك پێـشتر ووتمـان ئەمـەی لـە کتێبەکەیـدا بـە ئاشـکرا نەووتوە- وە ویستی ژمـارەی پێوانـەیی تۆمـار بکـات و پاڵـەوانێتی سوکایەتی کردنی جەدەلیانە لە نوسەرانی تورکیـای نـوێ (ئەوانـەی پشتگیری کارەکانی ئەنقەرە دەکەن) دامـاڵێ، بـە مەبەسـتی خۆیـشی گەیشت، چونکە ئەوان سەرەڕای سەرەڕۆیی‌و هەڵەشەییان تەنها تانەو تەشـەریان لـە خەلیفـە دواینـەکان دەدا، بـە خەیاڵیانـدا نـەدەهات هەرچەندە بێویژدانیش بن، تانەو تەشـەر لـە خەلیفـەکانی راشـیدین بدەن، کە بە دەق لە فەرمودەدا هاتووە: (خەلافەت پاش من سی ساڵە ((الخلافة بعدي ثلاثون سنة)) کەچی دەبینین مامۆستای دانەر تانـەو

تەشەرەکەی لە خەلیفە ئەبوبەکرەوە دەست پێ دەکات .

ئەمڕۆ لەم کتێبەمدا دەڵێم هـیچ کەسـێکی ژیـر لـە ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئاوادا گومـانی نیـە لـەوەدا کـە حکومـەتی ئەبوبـەکرو عومـەر نمونەیـەکی بـاڵای فـەرمانڕەوای چـاکەکارو دادگـەر بـوونو ڕەچـاوی مافەکانی خەڵکیان کـردووە و بـە باشـترین و چـاکترین شـێوە وێڵـی بەرژەوەندییـەکانیان بـوون.. تەنانـەت عومـەر لەسـەر دوانگـەوە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد کـە ئەگـەر لـە فەرمانڕەوایەکەیـدا لاریو لەوێرییەکیان بینی ڕاستی بکەنەوە، لەو کاتەدا پیاوێك هەڵدەسـتیو دەڵێ: ئێمە بە شمشێر ڕاستی دەکەینـەوە، عومـەریش سوپاسـی خـوا دەکات کـە کەسـێکی وا لـە گەلەکەیـدا هەیـە، ئێمـەی موسـڵمان حکومەتی ئەبوبەکر بە تەواو دەزانین لەرووی چاکیو سەرکەوتوی یەوە وە لە ڕووی گرنگی دانیەوە بە حوکمەکانی ئیسلامو شوێن کەوتنێکی تەواوی بە ڕێوشوێنەکانی پێغەمبەر ﷺ، تەنانەت ئەبوبەکر جـەنگا بۆ پیادەکردنی یاسایەکی ئیسلامی کە لـە سـامانی دەوڵەمەنـدەکان مافێکی دیاری کراوی هەژارانی تیادایە .

بەکورتی ئێمە نهێنی باشێتی هـەردوو حکومەتەکـەی ئەبوبـەکرو عومەر دەگێڕینەوە بۆ چـاکیو فـەزڵی ئـەو ئاینـەی پێغەمبـەرێکی عەرەب زمان هێناویـەتی، بـەڵام مامۆسـتا دەیـەوێ پەیوەنـدی ئـەو چاکەکاریو فەزڵە دیارو ئاشکرایانەی ئەوان بە ئیسلامەوە بپچڕێ، وە

دان نەنێ بــە چــاکی‌و فــەزڵی ئــاینی ئیــسلام لــە بــەرزو بــاڵابوونی فەرمانڕەوایەتی ئەم دوو پیاوە گەورەیەی هەموو جیهان شــاهیدی دەدا بەوەی نمونەی فەرمانڕەوایەتیەکی بەرزو باڵای مرۆییانە بوون). [1]

بەم شێوەیە گوتاری گــۆڕێنراو بەوەنــدە وازی نــەهێنا کــە وتــاری تەئویلکراو ئەنجامی دابوو لەوەی دەقە شەرعیەکان‌و پیادەکردنــەکانی سەردەمی راشدین بە شێوەیەکی تەئویل کراو بکاتە بەڵگە بە شێوازێك کە لە خزمەتی گوتارەکەی خۆیدا بێت، هەروەك ڕاسپاردنی ئەبوبکر بۆ عومەریان کردە بەڵگەی دروستی کاروبار سپاردن‌و عەهددان بە کوڕو نەوەکان؟! ئەو کارە سپاردانەشیان کردە بەڵگــەی ئــەوەی ڕەزامەنــدی ئــەهلی حــەلل‌و عەقــد پێویــست نیــە، چــونکە ئەبوبــەکر چــاوەڕێی ڕەزامەندی ئەهلی حــەلل‌و عەقــدی نــەکرد کاتــێ کــاری ســپارد بــە عومەر؟!

دەست خستنە نێو دەستی عومــەرو ئەبوبــەکریان کــردە بەڵگــەی ئەوەی گرێ بەستی ئیمامەت بــە یــەك کــەس دادەمــەزرێ ؟! بــەڵکو گوتاری گــۆڕێنراو تــەواوی ئەمانــەی تێپەڕانــدو بابــەتی ئیمامــەت تەنانــەت ئیمامــەتی پێغەمبــەر ﷺ و ئەبوبــەکرو عومەریــشیان وا دانەنا کە سەر بە باس‌و خواسی حوکمی ئاین بن؟! لەم ڕووەوە گرنگی‌و ئیعتبارێکی بۆ نەهێشتەوە؟!

---

(١) موقف العقل والعلم، (٤/٣٥٨-٣٧٥).

له ڕاستیدا - بـه نـاوی ئاینـەوه- ڕاگەیانـدنی ڕەسمـی سـەرەتای سەردەمێکی نوێ وگوتارێکی سیاسی شەرعی نوێ - له ژێر سـایەی ئیستعماردا - بەدی هاتو ڕاگەیەندرا، کـه شـەرعیەت دەبەخـشێته جیاکردنـەوەی ئیـسلام لـه دەوڵـەتو وای لێهـات ئیلحـادو کـوفرو هەڵگەڕانەوەو لابردنی گرێ بەندی ئیسلام که له عیلمانیەتـدا خـۆی دەنواندو بەرجەسته دەبـوو، بـوو بـەکارێکی دروسـت و مەشـروع بـه فەتوایەکی ئەزهەری؟!

تاوەکو له سەرزەمینی واقعدا ڕاستی ئەو هەواڵەی پێغەمبەری خوا بسەلمێنێ که دەفەرموێت ((لتتبعن سنن من کان قبلکم شبراً بـشبرٍ، و ذراعا بذراع، حتی لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه))؟!

بست به بستو باڵ به باڵ شوێنی ڕێو شوێنەکانی ئەوانـەی پـێش خۆتان دەکەون، تەنانەت ئەگەر بچنه کونی بزن مژەشەوه به دوایانـدا دەچنه ژوورەوە؟!

له ڕاسـتیدا شـێخی ئەزهـەری ئەوکاتـه دەسـتێکی هـەبوو لـەم ئاژاوەیەدا، شێخی ئیسلام (مصطفی صبری) ئاماژەی بەوەداوه له باسی ڕونکردنەوەی مەترسی جیاکردنەوەی ئاین لـه دەوڵـەت، وه ئەمـه لـه دیدی ئەودا کوفرێکی ئاشکراو هەڵگەڕانەوەیـه ئـەوەتا دەڵـێ (بـابی چوارەم: سەبارەت به نادروستی جیاکردنەوەی ئایینه له سیاسەت: لـه سەرەتای کتێبەکەوه هەندێ ئاگاداریمان خسته ڕوو سەبارەت به گرنگی

ئەم مەسەلەیە لە دیدو تێروانینـی ئیـسلامدا کـە هەمیشە چـاوی بڕیوەتــە مافــەکانی خـۆی، ســەرەرای بــە ســوك ســەیرکردنی ئــەو داهێنانکارانەی بوونەتە مەترسی لە سەری، وە وێنەکێشانی ئەوە لای خەڵکی بە شێوازێك وەك ئەوەی جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت بریتی بێت لە ئاگادار بوونو ڕەچاوکردنی هــەردوکیان بــەوەی هەریەکــەیان سەربەخۆ بێت لەوی تـر بێئـەوەی هـیچ کـەلێنو زیانێـك بـە هـیچ یەکێکیان بگەیەنێت .

بەڵام راستی مەسەلەکە لەوەدایە کە ئەم جیاکردنەوەیـە پیلانێکـە دژ بــە ئــاین تــاوەکو لــە نــاوی بــەرن، تــەواوی ئــەو داهێنانکاریــە نەشیاوانەی هاوچەرخە رۆژئاوا ویستەکان لــە وڵاتــە ئیـسلامیەکاندا بەدیان هێنا فێڵ کردن بووە لە ئایین و هەوڵ بووە بۆ دژایەتی کردنی، بەڵام فرتو فێڵی ئەوان بۆ جیاکردنەوەی لە سیاســەت فــێڵاوی تــرین کارێك بووە کردویانە، ئەمە بریتیە لە شۆڕشـێکی حکـومی بەسـەر ئایینی گەلدا - لە کاتێکدا باو وایــە شۆڕشــەکان لەگەڵــەوە دژ بــە حکومەت بن - و سەرکەشیو بێ فەرمانی حکومەتە بۆ حوکمەکانی ئیسلام، بەڵکو هەڵگەڕانــەوە لــە ئیـسلام ســەرەتا لــە حکومەتــەوە پاشــانیش لــە ئومەتــەوە بــەدی هــات، جــا ئەگــەر ئەوانــەی لــەو حوکمەتەدان بەو پێیەی تاك تاکن هەڵگەڕاوە نـەبن، ئـەوە بـە پـێی کۆمەڵو جەماعــەت بوونیــان ئــەو حوکمــە دەیانگرێتــەوە، ئەمــەش

نزیکترین ڕێگەیە بۆ کوفر.[١] وەك لە هەڵگەڕانەوەی تاکەکان، بەڵکو هەڵگەڕانەوەی تاکەکانیش، دەگرێتــەوە لەبەرئــەوەی گوێڕایــەڵی ئــەو حکومـەتە هەڵگەڕاوەیە دەکەن کە بانگەشەی سەربەخۆ بـوونی خـۆی دەکات لە ئیسلام پاش ئەوەی ملکەچی حوکمو بڕیارەکانی ئیسلام بوو بـە ســەربەخۆیەوە، جیــاوازی چـیە لــە نێــوان ئــەوەی حکومــەتێکی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام کاروباری وڵاتێکی ئیسلامی بگرێتە دەســت وە لە نێوان ئەوەی حکومـەتێکی بیانیو نامۆ بە ئیسلام داگیــری بکا؟[٢]

---

(١) یـەکێکی تـر لـەو نەهامەتیانـە ئەوەیـە ئـەو بزوتنەوانـەی لـەم سـەردەمانەی دوایـدا دەوروژێن و دژایەتی ئیسلام دەکەن لە وڵاتی ئیسلام دا دژ بە خەڵکەکەی خۆی، کە بێگومــان ئەمــە بــێ بــاوەڕیو پیــسترین هونــەرەکانی بــێ باوەڕییــە، کــردارو ڕەفتارەکانیان بە ڕەوا دادەنرێ و بە دروستی نازانن بە ناوی خۆیانەوە ناونرێنو لە لایەن ئەو کەسانەی

(٢) لە پێشەکی کتێبەکەدا ووتمان: لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان خانەی ئیسلامو خانـەی جـەنگ وەسـتاوە لەسـەر ئـەو یاسـایەی لـە وڵاتـدا جێبـەجێ دەکرێـت هـەروەها جیاکردنـەوەی ئـاین لـە سیاسـەتیش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە حکومـەت لـە یاسـاکاندا پابەند نیە بە ڕێساکانی ئاینەوە.

نـەیاری ئـەو بزوتنەوانـەنو جـەنگی جـەنگاوەران دەکـەن، چـەندە جـوانی ووتـوە (المعری، کاتێك دەڵێ:

وتعارف القوم الذین عرفتهم　　　بالمنكرات فعطــل الإنكـار

واتە: ناسینی ئـەو خەڵکەی بە هـۆی خراپەکردنیانـەوە ناسـیومن ئینکاریکردنی من بۆ ئەوان سودی نیە. ئەگەر بیوتایە (فإنكار الإنكار) واتە: ئینکاری کردنە جێی بایەخ نەدەبوو بۆ سەردەمی ئێمە گونجاوتر بوو.

پاشـان دژایـەتی ئیسلام و جەنگی جـەنگاوەران لـە میـسردا، کـە پـێی دەوتـرێ: سەرکردەی جیهانی ئیسلامی بە شێوازێکی سەیرو نائاشکرا، وا ئەنجام ئەدرێ کە لـە خراپـی نیـازی جـەنگاوەران و لاوازی بنکـەی نەیارانـەوە سەرچـاوەی گرتـووە و دروست بووە، وەك ئەوەی هەردوو لای شەڕکەر لـە کـاتی مشتو مڕکردنیانـدا لـەوە

تێناگەن کە هەر یەکەیان چی بەوەی تر دەڵێ و چ ناوێکی لێ ناوە، بۆ نمونـە بەڕێز (صاحب الدولة اسماعیل صدقي باشا ) سەرۆك وەزیرانی پێشوو، پێشنیاری ئەوە دەکا لە ئەنجومەنی نوێنەراندا کە قەزا لە میسردا یەك بخرێ بەوەی داداگا شەرعی و ئەهلیەکان بکرێنە یەك، ئەم پێشنیارە بەشێکی گرنگە لەسەرەتاکانی جیاکردنەوەی ئـاین لـە سیاسـەت لـە میسردا کـە رەوتـی خـۆی گرتوەتـە بـەر و چـەندین قۆنـاغی گەشەکردنی خۆی بریـوە، ئەوانەشی نـەیارن بـەم پێشنیارەی دەوڵـەتی (ئیسماعیل صـدقی) دەڵـێن: لـە راسـتیدا ئیـسلام تـەنها ئـاینی پەرسـتن نیـە بـەڵکو ئـاینی فەرمانرەواییـشە، نوسـاندنی دادگـا شـەرعیەکان بـە دادگـا ئەهلیەکانـەوە کـە هەڵوەشـاندنەوەی دادگـا شـەرعیەکانی لێ دەکەوێتـەوەو نـەرێی کردنـی ئەوەیـە ئیسلام ئاینی فەرمانرەوایی بێت،بەڵام دەوڵەتی ئیسماعیل صدقی پاشا کە نەزان و بێئاگانیـە بـەوەی ئیـسلام ئـاینی فەرمانرەواییـە، دەیـەوێ ئـەو فەرمانرەواییـە هەڵوەشـێنێتەوە، لەبەرئـەوەی یەکێکـە لەوانـەی پەسـەندی نیـە ئـاین حکومـەتی هــەبێ و فــەرمانرەوایی خــەڵك بکــا، ئەگــەر دەتــەوێ بڵــێ: حکومــەتی خــوایی بەسەرخەڵکەوە، بەڵکو حکومەتی خەڵکیان پەسەندە، ئەمە مەبەستی ئیسماعیل صـدقی پاشایە لـەو پێشنیارەی بـۆ ئەنجومـەنی نوێنـەرانی کـردوە، بـەڵام ئیـسلام هێزێکی وای نـی یە لـە میسردا بـە ئەندازەی ئـەوەی ڕاشکاوانە بەوانـە بـوترێ کـە (شەروخراپەیان لە ناخدایە، بەڵکو لەوانەیـە ئاشکراشـی کـەن) مەبەستتان ئەوەیـە دەست بگـرن بەسـەر ئـاینی ئومەتدا لـە ڕێی دەست گرتنتانـەوە بەسـەر ئـاینی دەوڵەتدا، جێی سەرسورمانە دەوڵەتی پاشا لەو کەسانەی دەوڵـەت پێکهاتووە کە ئایینی دەوڵەتەکەیان ئیسلامەو پێکهاتووە لـە نوێنـەرانی ئومـەتێك لـە پەرلەمانێکدا ئایینەکەی ئیسلامە کەچی ئەمە هەڵوێستێتی.

پێویستە لێرەدا بەوپەری ڕێزەوە باس لە قسەی دکتۆر عەلی زەینی بەك مامۆستا لە زانکۆی میسری و پاشان راگری کۆلیژی بازرگانی لە کتێبەکەیدا (اصول القانون التجاري)بەرگی یەکەم، ل(٢٤)بکەین کە دەڵێ:(لە کاتێکدا ئەگەر شەریعەت کاریگەری هەبووبێ لەسەر ڕاپەڕینی بازرگانی لە سەرەتاکانی سەدە ناوەڕاستەکانەوە و کەڵکی بـوو بێـت بـۆ پاڵنـانی بـاوو یاسـا بازرگانیـەکان بـە ئاراسـتە نوێیەکەیـدا، ئـەوا ئـەو شـەریعەتە لـە لایـەن خۆیـەوەو لـە دوادواییـەکانی ئـەو سـەدانەو چاخە نوێیەکانـدا کەوتووەتە ژێر کاریگەری یاسا ئەورووپییەکانەوە کە دەستی کردووە بە بەربەرکانی کردنی لە رووی پیادەکردنی یەوە لە نێو وڵاتی خۆیدا، لە پێشترین یاسایەك کە هاتە نێو میسرەوەو دەست کرا بە پیادەکردنی لە پاڵ شەریعەتی ئیسلامیدا خودی یاسا بازرگانی یەکان بووەو شەریعەت خۆی هاوکاری پێکهێنانی کردووە

پاشـان کوتـوپڕ سـستمی یاسـایی میـسری ئـەوەی پەیوەسـت بـوو بـە مامەڵـە مـــەدەنی و بازرگـــانی یەکانـــەوە دەســـتکاری کـــراوو یاســـا ئەورووپیـــە مـــەدەنی و بازرگانیـەکان شـوێنی شـەریعەتی ئیسلامیان گرتـەوە؛ شـەریعەتی ئیـسلامیش لـەو کاتـەدا تـەنها لـە بـاری کەسـیەتیدا کـورت کرایـەوە. لـەوەی کـە رابـوورد ئـەبینین داگیرکاری یاسا ئەورووپیـەکان بۆ میسر هـیچ کاریگەریـەکی لە بابەتی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی نەکردووە، چونکە ئەو حوکمە هەروەکو خۆیان مانەوە هیچ دەسـتکاری یـان گۆڕانکاریـیـەکی بەسـەردا نـەهێنراوە لەبـەر ئـەو پیرۆزیـیـەی لـە سـەرەتاوە تاکۆتـای هـەیبووە، وا دەبیـنم هـیچ یاسـایەك لـە یاسـا نوێیـەکانی نەیتوانیوە بالادەستی خۆی بسەلمێنێ بەسەریدا لە رووی ئاسانی سەودا گەرییە بازرگانیەکان و ئاسانی سەلماندنیان، لە لایەکی ترەوە دەبینین ئەو کاریگەریـەی کە دروست بووە تەنها لە رووی پیادە کردنەوە بووە نەك باشتری )

پێویسته ئەم قسەیە لە پاڵ پێشنیارەکەی سدقی پاشادا باس بکەم، تا روون بێتەوە لە میسردا داگیر کەری ناوخۆیی هەیە کە دەیـەوێ یاسا ئەورووپیەکان جێی شەریعەتی ئیسلامی بگرێتەوە، ئەوانەش بریتین لەو کەسانەی ئیستعمار هاتووەتە نێو دڵیانـەوەو شـەیدای بـوون، لـە بەرامبەریـشەوە پارێزراوو بـەرگریکاری وا هەیـە بەرهەڵـستی ئـەم داگیـر کردنـە دەکـەن بـە هـۆی ئـەوەی تـەواو شـارەزای کەلـەپوری ئیسلامن و لەو ڕوەشەوە قەدرو ڕێزی دەزانن، ئەرکی من ئەوەیـە لـەم کتێبـەدا مـافی شـیاو بدەمـە هەریـەك لـەو دوو دەسـتەیە بـەو شـێوەیەی شـیاوێتی لـە سـوپاس یـان ئینکاری و بەرهەڵستی، شێخی گەورە (المراغی)یش یەکێکـە لـەو کەسانەی هـەوڵی غـەزو کردنـی شـەریعەتی ئیسلامی دەدا سـەرەرای ئـەو پلـەو پایـە ئەزهەریـەی کـە هەیـــەتی، هەرچـــەندە ئـــەو نەخـــشەیەی ئـــەو کێـــشاویەتی بـــۆ داگیرکاریەکـــەی نەخشەیەکی ترە بەدەر لـەوەی سدقی پاشا، ئەتوانی بڵـێی نەخشەیەکی نهێنـی و پەنامەکیـە، ئـەو نەخـشەیەش هـەمان ئـەو نەخـشەی گۆڕانکـاری و دەسـت کـاری کردنەیـە کـە دکتـۆر زەینـی بـە خـراپترین نەخـشە دەیبینـێ، لەبـەر نەسـازی و نـەگونجاوی لەگـەڵ پیرۆزیایـەتی شـەریعەتی ئیـسلامیدا، شـێخی ئەکبـەریش ئـەو قودسیەتە ئینکار دەکات و دواتر ئەو وتارێکی لەم بارەیەوە لەگەڵ وەڵامی ئێمە بۆ ئـەو دەهێنێـت، ئـەوەی لێـی تێدەگـەین ئـەویش لـە بانگەشـەکارانی جیاکردنـەوەی ئاینە لە سیاسەت بەرێوشوێنێکی تایبەتی و نهێنی.

لەگەڵ ئەوەدا دەوڵـەتی صـدقی پاشـا کـە پێـشتر پێشنیارەکەیمان بـاس کـرد بـۆ پەرلەمانی میسری یەکێکە لە پەرۆشترین ئەو کەسانەی هەڵگەڕانەوە کەمالیەکەی تورکیان پێ خۆش بووە.

جا ئەگەر دەوڵەتی پاشا ئەو موستەفا کەمالە شێواوە بە پاڵەوان دەزانێ و بە هۆی پاڵەوانێتێکانیەوە چاو دەپۆشێ لەو دوژمنایەتی یەی هەیەتی بۆ ئیسلام و ئەو رق بونەی هەیەتی لە عەرەب، ئەوە زۆر زۆر هەڵەیە، ئایا دەبێ مەرجێکی ئەو پاڵەوانێتییەی ئەو بریتی بێت لە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و بەرپاکردنی شۆڕشێك دژ بە ئایین و نەتەوەی تورکی کە ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵە موسڵمان بووە، وە مێژوش جیهادێکی دورو درێژی بۆ تۆمار کردوە لە پێناوی ئیسلام دا ؟ ئایا صدقی پاشا بیری لەم وردەکاریانە کردوەتەوە کاتێك پلەی پاڵەوانێتی بەخشیە ئەو پیاوە، یاخود گرنگترین ئەو بوارانەی لە پاڵەوانیتیەکەی ئەودا بەدی دەکرێ لای پادشا بریتیە لەوەی خەلافەت و دەوڵەتی ئاینی لەناو بردووە؟ ئەوەی جێی سەرنج و ووردبوونەوەیە یەکەم کەسێك پلەی پاڵەوانێتیان پێ ی بەخشی ئەوروپیەکان بوون، موسڵمانانیش لەمەدا شوێنیان کەوتن، وەکو لە هەموو شتێکی تریشدا هەروان، لە ڕۆژنامەکاندا خوێندمەوە ژمارەی ئەو کتێبانەی لە ئەوروپادا سەبارەت بە موستەفا کەمال نوسراون زیاد لە شەش سەد کتێبە، ژێری لەمەدا ئەگاتە ئەو بەرئەنجامە ئەو پیاوە کەسێکە زیاتر ئەوروپیەکان ویستویانە بیکەنە پاڵەوانێك وەك لەوەی خۆی لە راستیدا پاڵەوان بێت.

ئەبێ چی کردبێت تاوەکو لای ئەوان شایستەی پاڵەوان بوون بێت؟

جا ئەگەر ئەم نازناوە پاداشتێك بێت بۆ ئەو لەسەر ئەوەی لە شەڕەکانی پێشودا یۆنانی لە ئەزمیر دەرکرد ئەوا لەو کاتەدا ئینگلیزو فەرەنسیەکان کە ئەوکات خاوەنی قسە بوون هاوپەیمانی یۆنان بوون، کەواتە چۆن دەبێت هاوپەیمان دەستخۆشی و پاداشتی ئەو کەسە بکات کە بەسەر هاوپەیمانەکەیدا زاڵ بووە؟ بۆچی لە جەنگی جیهانی دووەمدا ئافەرینی ئەوانەیان نەکرد کە زاڵ بوون بەسەر یۆنانیەکاندا لەگەڵ ئەوەی لە هەردوو جەنگەکەدا ئەوان هاوپەیمانی یۆنانی ژێردەستەکراو بوون؟

بۆچی بۆ زاڵ بووی یەکەم ئافەرینیان کرد بۆ دووەمیان نەکرد بەڵکو بە نهێنی دژایەتیان کرد تاوەکو هاوپەیمانەکەیان رزگار کەن؟ ئایا ئەم ئافەرین کردنە ئیمتیازێکی تایبەتە بەو تورکەی سەرکەوتوە؟ لە کاتێکدا ئەو یەکەم کەسێك نیە ئەم سەرکەوتنەی بەدەست هێنابێ: ئەوە بوو سوپای ئەدهەم پاشا لە سەرکردەکانی سوڵتان عەبدولحەمید لە ماوەی مانگێکدا گەیشتە دەرگاو دەروازەکانی ئەسینا، کەچی ئەو سەرکردەیە وەك شایستەییەك بانگ نەکرایە تەخت و تاراجی تورکیا، ئینگلیزو فەرەنسیەکان نازناوی پاڵەوانیان پێ ی نەبەخشی، تەنها کتێبێکیشیان لەسەر دانەنا، دورگەی (کریت)شیان نەگێڕایەوە بۆ تورك کە هۆکاری ئەو شەڕەی نێوان ئەوان و یۆنانیەکان بوو، بەڵکو نهێنی شیاوێتی موستەفا کەمال بۆ ئەو

بەڵکو هەڵگەڕاوە لە کەسانی تـر خـراپو دوورتـرن لـە ئیـسلام، کاریگەریە خراپەکانی لەسەر ئایینی ئوومەت زۆرتـرە، لـە کاتێکـدا حکومەتی بیانی لە کارو بارە ئاینیەکانی گەل دەست وەرنادات، ئـەو کاروبارانە بۆخۆیان بەجێ دەهێڵـێ تـاوەکو یـەکلای بکەنـەوە، لەبـەر ئەوەی ئومـەت بەردەوامو تاوەکو ئێستەش حکومــەت بـە هـی خـۆی دەزانێ لەگەڵ ئەوەی لە ئاینەکەشی هەڵگەڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە ووردە ووردەو لەسەرخۆ ئومـەتیش بەدوایدا توشی هەمان هەڵگەڕانەوە دەبێت ئەگەر نــەڵێین بــە یــەکجاری هــەڵ دەگەڕێتــەوە، بــەو پێیــە ناچـارە گوێڕایەڵی حکومەت بێت وە لەو ڕووەوە کە هەڵوێستەکەی ناچاریە لە ئاست حکومەتێکدا کە دەسەڵاتو هێزی لە خودی ئومەت خۆیـەتی، ئەمە وەکو ئەو هەڵوێستە نیە کە لە بەرامبـەر حکومـەتێکی بیانی دا دەبێ کە هێزێکی بیانی وەکو ئەمی هەیە.

---

پاڵەوانێتیـەی ئینگلیـزو فەرەنسیەکان بریتـی بـوو لـەو پەیمانـەی بـەوانی دابـوو لـە کاتێکـدا لـە لۆزانـدا ڕێکـەوتنیان لەگەڵیـدا ئـەنجام دەدا بـەڵکو هـەر لـە کـاتی جـەنگ کردنیدا لەگەڵ یۆنانیەکاندا کە دەیویست لە ئەنازۆڵ دەریان بکات، ئەوکاتە بەڵێنی دابوو خـەلافـەتو دەوڵـەتی عوسمـانی ئیـسلامی هەڵدەوەشـێنێتەوەو جمهوریـەتێکی نائـاییـنی لـە جێگـەی دادەنـێ،شۆڕشـی ئـەو پیـاوەی بەسـەر یۆنانـدا سـەرکەوت لـە تورکیـا خۆیـدا بریتـی بـوو لـە دژایـەتیکردنی ئیـسلامو ئـاداب و بـاوو نەریتـەکانی، جێبەجێکردنی ئەو پەیمانە بریتیـە لـە نرخی ئـەو پاڵەوانێتیـەیـە، بە هـەمان شێوە ئینگلیـزیش بـەو رادەیـە شێت نـەبوون ئافـەرینی بەزێنـەری هاوپەیمانەکـەیان بکـەن بێئـەوەی سـودێکی وایـان دەسـتبکەوێت کـە بەرامبـەر بێـت بـە قوربـانی دان بـە هاوپەیمانەکەیان، بەڵکو کابرا سور بوو لەسەر راکێشانی هاوسۆزی وڵاتانی دوژمن بە ئیسلامو هاریکاریکردنیـان بۆ جێبەجێ کردنـی حـەزەکانی بەمـەرجێ ئـەو کـارە قێزەوونەی کە چەندین سەدەی دوورو درێژ هیواو خواستی دوژمنانی ئیسلام بوو، بەڵام بۆیان جێبەجێ نەدەبوو ئەنجام بدا

لــەو خاڵــە وردو گرنگانــەوە دەردەکــەوێ ئــەو زیانــەی حکومــەتی کەمالی بە ئومــەتی تــورکی موســڵمانی دەگەیــەنێ خــراپترە لەهــەر حکومەتێکی بیانی کە خۆی سەپاندوە بەسەر وڵاتدا، وە لەوانەیە ئەو کەسەی بێبەشە لە کرۆکی ئیسلام نەنگی لەم قسەیە بگرێ، چــونکە نیشتمان لە سەروی هەموو شتێکەوە دەبینێت لەکاتێکدا موســڵمان نیــشتمانی لەگــەڵ ئیــسلام دا دەوێ، هــەر بۆیــە لەگــەڵ ئیــسلامدا نیشتەجێ دەبێ لەگەڵیشیدا کۆچ دەکات، ئەگەر بە شێك لــە وڵاتــی تورکیا بەشێوەیەکی کاتی بکەوێتە ژێر دەستی داگیرکــەری یۆنانیــەوە لە ئەزمیر، ئەوا تورکیا بەتەواوی وڵاتو دانیشتوانەکەیەوە لــە پــاش حکومەتی کەمالیەکان لە دەستی ئیسلام دەردەچێ.

لەکاتێکدا من نمونە دەهێنمەوە بە باری تورکیــای نــوێی کــەمالی سەبارەت بە زەرەرو زیانەکانی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵــەت دەبیــنین بەرێز مامۆستای گەورە (المراغي) شێخی زانکــۆی ئەزهــەر لــە ووتــە بەناوبانگەکەیدا دەڵێ، هەروەك لە رۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە کە ئەمە واتاکەیەتی: (ئــەکرێ هــەر حکومــەتێکی ئیــسلامی لــە ئاینەکــەی دەرچێو ببێتە حکومەتی نائاینی، ئەمــەش رێگــر نیــە لــەوەی گــەل لەسەر ئیسلامەکەی بمێنێ هەروەك لە تورکیای نوێدا وەهایە) نمونە بە باری تورکیای ئێستە دەهێنێتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی من کردوومەتە نمونە بۆی.

مامۆســتای گــەورە پێویــستی بــەوە نیــە پــشکنینێك بــۆ تــازە پێگەیشتوانی تورکیای نوێ بکات کە لەسەر بنــەماکانی حکومــەتی

کەمالــی پێئەگەن کە بە دان پێدانی مامۆستا خــۆی حکومــەتێکی نائاییینیە، پێویستمان بەوە نیە بیر بکرێتەوە لەوەی گەلی تورکی کۆنی موسڵمان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەناو دەچێ و ئەم تازە پێگەیشتووە نوێیـە نائاییینیە جێی دەگرێتەوە

بەرێزی پێویستی بە پـشکنینی ئـەم ڕاسـتیە تاڵـە نیـە، چـونکە مەبەستی نیـە سـەرەنجامی تـورك چـۆن دەبێـت موسـڵمان بـن یـان ناموسڵمان، وە گرنگی نادات بە بارودۆخی ئەو ئیسلامەی کە زۆر بـە خێراییەکی نائاسایی سێبەرەکەی لادەچێ لەسـەر وڵاتیـان، تەنانـەت مامۆستا مەبەستی نیە فتواکەی ئەو چ شـوێنەوارێکی دەبـێ کاتـێ سەرەخۆشی دەکات لەوەی کە گەل لە سەر ئیسلامەکەی ماوە لەگـەڵ ئەوەی حکومەتەکەی لە تورکیادا هەڵگەڕاوەتەوە، کە ئەمەش دەرگـا واڵا دەکات بۆ ئەوەی کە بوترێ: لەبەر ئـەوەی حکومــەت کوفرەکـەی هەر بۆ خۆیەتی وە ناتەنێتەوە بۆ گەل، ڕێگر نیـە لـەوەدا حکومــەتی میسر هەمان ئەو کردارەی تورکیا دووبارە بکاتــەوە لـەوەی ئـاین لـە سیاسەت جیا بکاتەوە، بەو واتایەی هیچ ترسێکی نابێت لەسەر ئاینی گەل، وەك ئەوەی ئاین تەنها هی گەل بێـت نـەك حکومـەت، لەگـەڵ ئەوەی حکومەت شتێك نیە تەنها نوێنەری گـەل نـەبێت یـاخود ئـەو جێگرەیە کەبەبێ رەزامەندی ئەو هیچ شتێك ئەنجام نادات، جا ئەگـەر رەفتارەکانی ئەو لە ئاین وەدەری نێت ئەوا مـەرج نیـە راسـپێرەرەکەی بەهەمان شێوە بێت، چونکە رازی بوون بە کوفر کوفرە، ئەمـە تـەنها ئەو کارانەی حکومەتە کە کاریگەریەکـەی دەشـکێتەوە سـەر گـەل،

سەرەرای ئەوەی گەل خۆی چی دەکات لە پاش ئەو کارەی کە حکومەت دەیکات لە جیاکردنەوەی ئاینو سیاسەت کە ئەگـەر بـە شـێوەیەکی پلەپلـەیی و لەسـەر خـۆیش بـووە لـە ئـایین وەدەری دەنـێ، وەك شوێنکەوتنێك بۆ ئەو حکومەتەی خۆی بـە ئـەو دەزانـێ بەتایبـەتی ئەگەر حکومەتێکی نوێنەرایەتی پەرلەمانی بێت .

بەهۆی ئەو جیاکارییەی مامۆسـتا مـەراغی لـە نێـوان نەتـەوەی تورکو حکومەتەکەیدا کردویەتی لەوەدا کە حکومەت لە ئاین دەرچێ ئەم باسەی ئەو هاوکاریـان دەکـات لـەوەدا کـە بتـوانین لـەو رووەوە رونکردنەوەیەك بدەین لەسەر بابەتی جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسـەت کە زۆر بە ئاسانی هەموو موسڵمانان- مەگەر ریـز پـەرێك لەوانـەی دڵیان رەق بووە — تێگەیشتوون لەوەی ئاژاوەی بێدینی لە تورکیادا چ ترسناکییەکی هەیە، لە نێو موسـڵماناندا هـەبوون پـێش ئینقلابو هەڵگەرانـەوەی تـورکی کـەمالی تـێ نەدەگەیـشتن لـە رادەی ئـەو مەترسـیەی جیاکردنـەوەی ئـاین لـە سیاسـەت بەسـەر ئیـسلامدا دەیهێنێو چەندە زیانی لـێ دەدات، لەگەڵ ئەوەی لـە تورکیـادا کـرا تەنها بریتی بوو لە جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت...

بە دەربرینێکی تر، چاکسازیو چاکەکاری لە کوێوە دەست پێدەکات لـە ئومەتەوەیـە تـاوەکو حکومـەت چاکـساز بکـات، یـاخود لـە حکومەتەوە تا ئەویش لە ئومەتـدا چاکـسازی ئـەنجام بـدات؟ ئـەوەی زانراوە بریتیە لە ریزبەندی دووەم، هەرچەندە ناتوانرێ ئینکاری رۆڵـی هیچ لایەك لەسەر ئەویتر بکرێت، ئەمـەش ئاسانو کورت ترە سەبارەت

**به یەکەم، چونکە ئەگەر چاکسازیو رێکخستنی کاروبـاری ئومـەت لەخۆیەوە راستەوخۆ ئەنجام بدرایە ئەوا هەموو ئومەتێك خۆی بێنیـاز دەکات لـەوەی حکومـەتێك بـۆ خـۆی دانێـت کـە دەسـەڵاتدار بێـت بەسەریەوە.** [١]

---

[١] بەڵام حکومەت کێ چاکسازی تیا بکات ئەگەر لە خودی خۆی دا چاك نەبێت، وە چاکە خوازیو ئاینداری بەرێگە دروستەکانی پەسەند نەکا ؟ ئایا لە کاتێکی وادا پێویستە حکومەتەکە هەڵگەرێنیتەوە، راستیکەیەتەوە بەشیر؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لای ئێمـەوە نـەخێرە... چـونکە بـەرپاکردنی جـەنگی جـەماوەری لـەم سـەردەمەی ئێمەدا دژ بە حکومەتـەکان کەسی ژێـر جورئەت کردنی نیـە، کەسی هەڵچووش لە دەرەوەی ئــەم پلانــەوە نــاتوانن چــاکەیەك بــەدی بهێــنن، نــەبۆ خۆیــانو نــەبۆ وڵاتەکەشیان، لەبەر ئەوەی ناتوانرێ سەرکەوتن بەسەر حکومەتێکدا بەدی بهێنرێ بەوپێیەی سوپاو سەرکردە باڵانابەرپرسەکەی لەگەڵیدایە، ئەوانەی شۆڕشیان کردە سـەر سـوڵتان عەبدولحەمیـد لـە تورکیـادا پاشـان بەسـەر سـوڵتان وەحیدەدینـدا کردیـان، پـشتگیری و پـشتیوانی سـوپایان لەگەڵـدا بـوو، پاشـان قـسەرۆییو بەدەسەڵاتی لەو وڵاتانەدا کەوتە دەستی ئەو سوپایەی کە لە سوپاو لەشکری ئەو دەوڵەتـەوە گۆڕا بۆ سـوپاو لەشکری حیـزب، دەوڵـەتی تورکیا کەوتـە نێـو جـەنگی جیهـانی یەکەمـەوە بـەبێ مۆڵـەت وەرگـرتن لـە سـوڵتان موحەمـەد رەشـادو (صـدر الأعظم) کە موحەمەد سەعید حەلیم پاشای میری میسر بوو.

ئەگـەر کۆمەڵـەی برایـانی موسـڵمان کـە لـەم دوایانـە لـە میـسردا پێکهـاتوون و دروست بوون و هێزێکی بەرفراوانی ئاینیو جەماوەری وایان بەدیهێناوە کە ناکرێ گرنگییـەکی نـەزانرێو پـشتگوی خـرێ، ئەگـەر هـەوڵی رزگـارکردنو چاکـسازی خـوازراوی بدایـە، لـە رێی سـەرکەوتنی لـە هەڵبژاردنـەکانو بەدەسـت هێنـانی زۆرینـەی پەرلـەمان، ئـەوا هـەم خـۆی بـەفیڕۆ نـەداوەو دەشـیتوانی خزمـەتی ئـاینو دونیای وڵاتی بکردایە.

باشـترین رێگـە بـۆ چـاککردنو چاکـسازی کردنـی دەسـبژێرو کەسـە تایبەتـە رۆشنبیرەکانی ئومەت توێژینەوەو گفتوگۆ کردنە لەگەڵیاندا پاشان دژایەتی کردنی حکومـەت ئەگـەر پێویـست بـوو، بەدەسـتی ئـەم کەسـە شـیاوو پیـاو چـاکانەوە، رزگارکردنی بە هۆکارە ئاشتی خوازیەکانیان

ئەم ئەساسو بناغەیەش ئەوە دەخوازێ کە ئەگەر بنەماو سـەرەتای ئاینداری ڕەواو سەلمێنراو بێتو پابەندبوون بە ئایینەوە پێویست بێـت لە لایەن ئومـەتەوە، بەتایبەت نەتەوە موسڵمانەکانەوە، وە مـەرجێکی زیندووبونیان بێت ئەوا پێویستە حکومەتەکەی ئاییـندار بێـت واتـە ملکەچی ئاین بێت، تاوەکو ئاینداری ئوممەت دەرفەتی بۆ دەرەخسێتو مانەوەی لەسەر ئایینی بۆ دەستەبەر دەبێت .

پێشبینی ئەوە ناکەین خوێنەر لای خۆیەوە بڵێت ئەوە چـیە نوسـەر سەرقاڵە بەم کاروبارە روونو زانراوانەوە، ئایا کەسێك هەیە پێچەوانەی ئەمە بڵێت تا پێویستی بە سەلماندن بێت؟ وەئەمە چ پەیوەندیەکی بە بابەتەکانی ئەم بەشەوە هەیە کە بریتیە لە باسی جیاکردنەوەی ئـاین لە سیاسەت؟ ئەگەر وای ووت ئەوا وەلاممان بۆی بریتی دەبێـت لـەوەی کە ئایا ئێمەین ئـەم بـاسو خواسـە دەکـەین و ئـەم مەسـەلەیەمان ووروژاندووە، چونکە ووتنـی جیاکردنـەوەی ئـاین لـە سیاسـەت ئـەوە دەگەیەنێ کە ئاین پێویست نیە بۆ حکومەت، بە بیانوی ئەوەی تەنها ئاینداری ئومەت بەسەو ئەبێتە هۆی ئەوەی حکومەت بێ نیازی خۆی لە ئاینداری رابگەیەنێ، واتـای پێویـست نـەبوونو پابەندنـەبوونی حکومەت بە ئایینـەوە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ئـاین هـیچ دەسـەڵاتو چاودێرییەکی نـەبێت بەسـەر کاروبـاری حکومەتـەوە هـەروەك چـۆن حکومەت دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئوممەتداو چاودێری کارەکانی دەکات، بەڵام ئێمە کـە دەڵـێین دروسـت نیـە ئـاینو سیاسـەت لەیـەك جیـا بکرێتەوە لەبەر ئەوەیە دیـدو تێڕوانینمـان وایـە ئـەم جیاکردنەوەیـە

یەکسانە بە جیاکردنەوەی ئاین لە خـەڵك و ئومـەت، بـەڵکو زیـان‌و کاریگەری زۆر زۆرترە، چونکە حکومەت دەتوانێ ئومەت بکاتـە ژێـر کاریگــەری خۆیــەوە نــەك ئومــەت بتوانــێ حکومــەت بکاتـە ژێـر کاریگەری‌و کارتێکردنەوە لەبەر ئەوەی ئەم ژێردەستەو ملکەچی ئەوەو کارتێکردن‌و کاریگەری ئومەت لەسەر حکومەت تەنها گۆڕانیەتی .

جا ئەگەر نەیگۆرا یاخود بێ توانا بوو لە گۆڕانیدا ئەوا بێگومــان دەکەوێتە ژێر کاریگەری حکومەتــەوەو بــەپێی ئارەزوەکــانی بــەڕێی دەکاو لەسەر سەرەتاو بنەماکانی خۆی پــێی دەگەیـەنێ، بــێ ئــەوەی ئومەت کاریگەریەکی لە حکومەتدا هەبێت. [1]

واتای دروستی جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت، تەنها بریتیــە لــە دروستی داڕنینی حکومەت لە ئاین، ئایا دروستە حکومەت خۆی لــە

---

[1] جا ئەگەر حکومەت لە وولاتە ئیسلامییەکاندا پابەند نەبێ بە یاساکانی ئیسلامەوەو ئومەت پشتگوێ خا، لانی کەم لە ڕووی ڕەچاوکردنی حوکمە شەرعیەکانەوە ئەگەر نەڵێین هانی خەڵکی بدات بۆ ماندوکردن‌و پشتگوێ خستنی ئەو بوارە، خەڵکە هەلپەرستەکانیش دەیقۆزنەوە، ئەوانەی ئامادەی بەزاندنی ئاداب‌و حەرامکراوەکانن، لــە پێنــاو شــوێنکەوتنی حــەزو ئارەزوەکانیــان، بــە تایبــەت ئــەو زیــادەڕۆو خۆشگوزەرانانەی پەیوەست و گرێ دراوی حکومەتن کە خۆی جیاکردوەتەوە لە ئایین، خراپەکاریەکان لەم توێژە نزمەوە کە ناو دەبرێ بە توێژی باڵا دەگوێزرێتەوە بۆ ئەوانەی ئەمانیان کردوەتە سەرمەشق لە ئازادی بێ ئابروودا، بەمەش خراپەو تاوانکاری لە نێوان پیاوان‌و رووت‌و بەرەڵای لەنێوان ئافرەتاندا بڵاودەبێتەوە، تاوای لێ دێ ئەو کەسانەی پشتیوانی پاراستنی ئادابە ئیسلامیەکانیش دەکەن، توانایان نیە تەنانەت لە نێو ماڵەکانی خۆیشیاندا پارێزگاری لەو ئادابانە بکەن بە تایبەتی لەگەڵ تازە پێگەیشتواندا.

شتێك دابڕنیٚو بیٚدەربەست بێت کە ئەو شتە بۆ ئومەت دروستو ڕەوا نەبێت؟ کەچی ئەوانەی ئارەزوو مەندی داڕنینی ئایینن لە حکومەت ناوی دەبەن بە جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت، بۆ سووککردنی مەترسیەکەی و دروست نەکردنی کاریگەری خراپ لای خەڵکە ئایندارەکە، ئەوان دەیانەویٚ ئایینی حکومەت لەناوبەرن ئەم لەناوبردنەش بە جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت دەردەبڕن، پاشان بۆ لەناوبردنی ئایینی حکومەت پەنا بۆ لەناوبردنی ئایینی ئومەت دەبەن و ئەو ڕێگەیە دەگرنەبەر.[1]

جا ئەگەر واتای جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت بریتی نەبێت لە داماڵینی حکومەت لە ئاین تاوەکو بە ژێریە کەموکورتیەکەی خۆی

(١) ئەو مەبەستەی لە پشتەوەی ئەم وروژاندنەوە بوو کە هەر یەکە عەلی عەبدورازق، قازی شەرعی پێشوی مەنسورەوە پاشان نەقیبی شەرعیەکان و پاشان وەك نوێنەرێکی پەرلەمان قسەیان لەسەر کرد، پێش دەساڵو ئەوەندە سەبارەت بە (ئیسلامو بنەماکانی فەرمانڕەوایی) تەنها بریتی بوو لە مەسەلەی جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت، مامۆستا دەیویست بیانوی هەبێت بۆ برەودان بە بنەمای جیاکردنەوەکە لە ڕیٚی دوو بانگەوازو بانگەشەوە کە هەریەکەیان تێك دەگیریٚ لەگەڵ سەلمێنراو و بەڵگەنەویستەکانەدا، یەکەمیان: بریتی بوو لەوەی پێغەمبەر ﷺ دەوڵەتی نەبوو، وەك ئەوەی فەرمانو نەهی کردنی نەبوبیٚ یاخود لەوەدا گوێڕایەڵی نەکرابیٚ، دووەمیان ئەبو بەکر حکومەتی هەبووە بەڵام نائایینی بووە، واتە حکومەتێکی زەمەنی بووە و هیچ پەیوەندیەکی بە ئاینەوە نەبووە

مامۆستا کاتێك پێویستی بەوەیە بنیاتی مەبەستەکانی بکات لەسەر ئەم دوو بانگەشەیە بۆ ئەوەیە لە ڕێگەی جیاکردنەوەی لە سیاسەت کە بەدەرە لە سروشتو لۆژیکی ئیسلامو مەرامو مەبەستی تر بەدی بهێنیٚ کە پاشتر بە درێژی باس دەکریٚ.

بەدەر لە کۆت‌و بەندو حوکمەکانی ئایین ڕەفتار بکات، کەواتە واتـای جیاکردنـەوە چـی دەگەیـەنێت؟ حکومـەتـە ئیـسلامیەکان هـەر لـە سەردەمی هاوەڵانەوە —خوایان لێ ڕازی بێت- تاوەکو سەردەمێکی نزیك لـەوەی ئێمـە تـێی کـەوتوین‌و سـاڵانێکە پڕکـراوە لـە نەگبـەتی‌و بەدبەختی، فـەرمانڕەوایی خـەڵکیان دەکـردو خـەڵکیش بـە ئیـسلام لەسەرەوە فەرمانڕەوایی ئەوانیان دەکرد جا ئەگـەر لـە میانـەی ئـەو نەخشە دیاری کراوەدا کارێکی ناڕەواو پێچەوانەی حوکمەکانی ئاینیان بکردایە ئەوە بە گوناحی حکومـەت دادەنرا، هەروەك چۆن کەسێك لـە موسڵمانان بەهۆی شوێن کەوتنی ئارەزویەوە تاوانێك ئەنجام بدات بەڵام بە هۆی ترسی خواو ترسی خەڵکیەوە دڵ شکاو و کزۆڵە .

بـەڵام دەرچـوونی ئاشـکرا لـە چـاودێری ئیـسلام‌و هەوڵـدان بـۆ جیاکردنەوەی ئایین و کەنار خستنی لە سیاسەت واتە کـەنار خـستنی لەوەی فەرمانڕەوایی بکات بەسەر حکومـەتدا، دانانی ئەم مەسـەلەیە وەك بابەتێکی توێژینـەوە لـە شـێوەی پرۆژەیـەکی نـوێ‌و ڕێبـازێکی کۆمەڵایەتی تازەدا، وە هەوڵدان بۆ چاوکردن لە حکومەتە بیانیـەکان لەم ڕووەی ئیسلام دا، (پێـشتر لـە پێـشەکی کتێبەکـەدا ووتەیـەکی هەیکەل پاشامان هێنا کە دەستخۆشی و ئافەرینی ئەم جیاکرانەوەیـە دەکات) بە ئەندێشەی هیچ حکومەتێك لە حکومـەتی موسـڵماناندا نـەهاتوە هەرچـەندە خراپـەکارو بـێ ئـابرو بووبـێ، چـونکە ئەمـە ڕاگەیاندنی جەنگە لـە حکومەتـەوە بـۆ ئیـسلام هـەروەك بـاوە لـە

جەنگەکاندا حکومەت رای دەگەیەنێ پاشان دەبێتە راگەیاندنێك لـە ئومەتیشەوە

ئەگەر دەتەوێ دەربرینەکە سوکتر بێت لەوەی راگەیاندنی جەنگ بێ ئـەوا بڵـێ: راگەیانـدنی سـەربەخۆیی لـەو حکومەتـەی کـە لـە حوکمەکانیدا شوێنی حوکمەکانی ئیسلام دەکەوێت، ئەم راگەیاندنەش دژ بە شوێنکەوتووەکانی خۆی، لە واتادا ئەمە هیچی کەمتر نیە لـە راگەیاندنی جەنگ دژ بە شوێنکەوتوەکانو دەرچوون لە گوێڕایەڵی .

لەو شتانەی پەیوەست بوون بەمەسـەلەی جیاکردنـەوەی ئـایین لـە سیاسـەتو لـە پێـشەکی کتێبەکەشـدا باسـم کـردووە ئەوەیـە کـە سەربەخۆبوونی هەریەکە لە ئایینو حکومەت لەویتر ئـەوە ناگەیـەنێ هەردوکیان لەو سەربەخۆییەدا یەکسانن، بە شێوەیەك هیچ یەکێکیان دەست وەرنەداتە کاروباری ئەوی ترەوە، هەرچەندە ئەم یەکسانیەش بـە هەمان شێوە ئیسلام پێی رازی نابێت بەو پێیە رازی نیە بە کـوفر ... بەڵام مەسەلەی جیاکردنەوەکە لەمەش قورسو تاڵ ترە، چـونکە ئـەو سیاسەتەی کە حکومەت سەرپەرشتی دەکات و دەیگرێتـەوە دەسـت و بەم جیاکردنەوەیە لە دەستی ئاین دەردەچێ، ئەمەش ئـەوە دەگەیـەنێ کە حکومەت سەروەریو سەرپەرشتی هەموو ئەو کاروبارانـە دەکـات کە دەکەونە ژێر سێبەری وولاتـەوە، بەمـە ئـاینیش وەك هـەموو ئـەو شتانەی تر دەکەوێتە ژێر ئەو سایەو سێبەرەوەو لە ژێر رەحمەتی ئـەمرو نەهی حکومەتدا دەبێت، تەنها ئەم بارە بە تەواوی دژە بە سەروەری ئەو

ئیسلامەی بـەرزو بڵنـدەو نابـێ ژێـر کەوتـەو نـزم بێـت و ئەمـەش بێباوەڕیو کوفرە، هەرچەندە گریمانەی ئەوەش بکرێت کـە حکومـەت بەردەوام ڕێـــز لە ئایینی ئومـــەت دەگرێت، وە لە خزمەتیـدا بێـت، بێئەوەی ئەو ڕێزو خزمەتە فەرز بێت لەسـەری، هـیچ تەنگەتاویـشی نـەکات سـەرەڕای ئـەوەی توانـای ئەوەشـی هـەبێت، بـەو پێیـەی بەڕێوەبردنو سیاسەتی وڵات بەدەستی ئەوە نەك ئاین .

مەبەستی ئەم ڕێزگرتنە لەوەدایە ئاین دەبێتە پارێزەرو بەرگریکاری حکومەت هەروەك چۆن میسر پارێزەری ئینگلیز بوو، بێگومان تەنها ئەم هەڵوێستە ڕێزی ئاین لەکەدار دەکـات، هـەروەك ڕێـزی میـسری لەکەدار کـرد، سـەرەڕای ئـەوەی سیاسـیو کاربەدەسـتان داخـوازی و خواستی زۆریان هەیە لە ژێردەستەکانیان، لەراستیدا پەیوەندی ئـایین لە دەوڵەتی عوسمانیـدا بـە حکومـەتو سـوڵتانەکانیەوە لـەم نمونـە تورکیەدا روون دەبێتەوە کە دەڵێ: (باش باشـە بـاغلی، بـاش شـەریعەتە باغلی) واتـە: سـەرگرێدراوو پەیوەسـتە بـە سـەرۆکەوە، سـەرۆکیش پەیوەستو گرێ دراوی شەریعەتە .

هەرکاتێو لەسەردەمی هەردەوڵەتێکدا ئاین لـە سیاسـەتو کـار بەڕێوەبردن جیاکرایـەوە، ئـەوا ئـەو مادەیـەی بـە ئاشـکرایی باسـی ئاینەکەی تیادایە دەپێچرێتەوەو لا دەبرێت، هەروەك لە تورکیای نوێی کەمالیدا رویدا، ئەوەبوو لە سەردەمی موستەفا کەمالدا ئەووتەیەی لە دەستوری تورکی کۆندا دەیووت، ئایینی دەوڵەت ئیـسلامە لابـراو

نەهێڵرا، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا ئەو یاسایەی لە فیقهـی ئیـسلامەوە وەرگیرا بوو، وە لە (مجلة الأحکـام العدلیـة)دا کۆکرابـووەوە گـۆڕا بـە یاسای مــەدەنی سویـسری وە فــەرمان درا بــە لەسـەرکردنی کـڵاوی شەپقەو کەپلە، شوکردنی ئافرەتی موسڵمان بۆ ناموسڵمان دروسـتو حەلاڵ کرا، هیچ کەمتەرخەمی نـەکرد بـۆ گـۆڕینی دەرەوەو نـاوەوەی دەوڵەتی عوسمانی ئیسلامی .

لەناوخۆو دەرەوەی تورکیـادا موسـڵمانی بـەناو موسـڵمان هەیـە، تاوەکو ئێستەش دەبینرێ، کە وادەزانێ بانگەشەی جیاکردنەوەی ئایینو گۆڕینی یاساکانو لابردنی ئاینی دەوڵەت لە دەسـتورو لەسـەرکردنی شـــەپقەو حـــەلاڵکردنی هاوســـەرگیری گـــشتیو هەڵوەشـــاندنەوەی هاوسەرگیری شەرعیو رێگرتن لە سەفەر بۆ ئەنجام دانی حەجو شـتی تریش، تەنانەت وازهێنـان لە سوێند خواردن بەخوا لە سوێند خواردنە رەسمیەکاندا ... زیان بە ئیسلام ناگەیـەنێ، لـە راسـتیدا بـرەودان بـە جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت جا ئیتر ئەو بـرەو پێدانـە لـە پیـاوانی حکومەتەوە بێـت یـاخود لـە نوسـەرە بیریارەکانـەوە بێـت بـە نـاوی بەرژەوەندی دەوڵەتو ئومەتەوە رێك ناکەوێت لەگەڵ باوەڕ بـەوەی کـە ئەم ئایینە لە لایەن خواوە دابەزێنراوە، وە ئەو حوکمانەی لە کیتـابو سونەدا باسکراون حوکمی خوانو بە هۆی پێغەمبەرەکەیەوە گەیەنراوە، وە هەر کەسێ ئاماژە بدا بەم جیاکردنەوەیە لە کۆمـەڵگادا ئـەوە یـا لادانو ئیلحاد لە دەروونیدا شاردراوەتەوە — مامۆسـتا فەریـد وجـدی

پێش ئەوەی ببێتە سەرنوسەری گۆڤاری ئەزهەر ئەوەی ئاشکرا کرد کە نوســەرو شــاعیرە هەڵکــەوتوەکانی وڵاتــە ئیــسلامیەکان ئیلحادیــان لەناخدا شاردوەتەوەو بیرو ژیریــەکان ئامــادە دەکــەن بــۆ ئــەوەی ئــەو بۆچونەیان پەسەند بکەن لە ڕێگــەی ووتــارو هۆنراوەکانیانــەوە — یــا ئەوەتا گێلو نەزانە بەواتاو ناوەڕۆکی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵــەت، لەگەڵ ئەوەی بریتیە لە دابرینــی ئیــسلام لــە حکومــەتی دەوڵــەتو ڕێگری کردن لەوەی لە کاروبارەکانیدا دەســت تێــوەردا، هــەر لەبــەر ئەوەیە بە شێوەیەکی ئاسایی ڕێگری دەکــرێ لــەوەی زانایــانی ئــاینی سەرقاڵی سیاسەت بن[1] سەرەرای ئــەوەی بنــەمای جیاکردنەوەشــیان پەسەند کردوە، جا کاتێ ئەگەر مرۆڤێك بەوە لە ئیسلام دەرچــێ کــە دەسەڵاتی ئایینی پەسەند نەبوو لە رووی ئەمرو نەهی و دەستتێوەردان لە کاروبارەکانیەوە لە کاتێکدا ئەو تاکێکە لە موسڵمانان، ئەی چۆن دەرناچێ لە ئیسلام کاتێك ئەو دەسەڵاتو دەســت تێوەردانــە پەســەند ناکات، بەو سیفەتەی لە نێو پێکهاتەیەکی حکومەتدایە؟ ئــەی بــۆی مافی خوایە لە کاروباری بەندەکاندا بەتاك تاکی دەســت وەربــدا، لــە هەمان کاتدا ئەو مافەی نیە لە کاروباریاندا ئەگەر هاتو لە شێوەی دەوڵەتدا بوو، لەگەڵ ئەوەی ئەمــە گــرنگ تــرە؟ ئایــا خــوای گــەورە

---

(١) خۆپاراستنی کۆمەڵو ڕێکخراوەو گۆڤارە ئاینیەکانی میسر لەوەوە سەری گرتووە کە میسر چەند قۆناغێکی بریوە لە قۆناغەکانی کارکردن بە بنەمای جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت.

بەرژەوەندیو چاكو خراپەی تاك دەزانیێو بەرژەوەندیو چـاكەو خراپــەی كۆمەڵ نازانیێ؟ لە كاتێكـدا ئـەوەی روونو ئاشـكرایە كۆمــەڵ زیـاتر ئامادەییو توانای خێرو شـەڕی تیـادا بـەدی دەكرێـت وەك لـە تـاك، لوتكەی چاكە كاریش بەرزكردنـەوەی ووتـەی خوایـە كـە بـەڕێزترین ئەركی موسڵمانانە

لەوانەیە جیاكردنەوەی ئایین لە دەوڵـەت زیـاتر زیـان بـە ئیـسلام بگەیەنێ لە چاو ئایینـەكانی تـردا، لەبەرئـەوەی ئیـسلام تـەنها لــە پەرستەكاندا كورت هەڵنایەت بەڵكو دیـدو تێڕوانینـی ئـەو تـەواوی سەودا گەری و سزاكان دەگرێتەوە هەمـوو ئـەو شـتانەش كـە دەچـێتە بــواری دادگــاو وەزارەتو ئەنجومـــەنی نوێنـــەران و پیرانـــەوە، ئیـــسلام پەرســتشو شــەریعەتو جێبــەجێكردنو بەرگریــە، ئــەم تێڕوانینــە گشتگیریەی ئیسلام بۆ هەموو كاروبارێك لە كاروبارەكانی دەوڵەت، لە لای ئەو برەو پێ دەرانەی جیاكردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، بـە نـەنگیو عەیب دادەنرێ، نەنگیــەك ســوریان دەكــات لــەوەی پابەنــد بــن بــەو جیاكردنەوەیەوە، لە كاتێكـدا ئــەوە لــە دیـدی ئێمــەداو لــە هــەمان كاروباردا تایبەتمەندیەكی ئیسلامەو بەرزو باڵای دەكاو تــای تــەرازوی قورس تر دەكات بە بەراورد لەگەڵ تەواوی ئایینەكەكانی ترداو دەبێتە بەرهەڵسترین ڕێگریك لەبەردەم ئەو جیاكردنەوەیــەدا، ئــەم ئیــسلامە لای ئەوانەی لە هــەموو رووەیەكــە قەناعــەتیان پــێكردووە، ئــایین و دەوڵەتو ناسنامەیە بۆ ئەوان، هەموو جیاوازیەكانی نێوانیان لادەبـا،

هەموو ناسنامەو نەتەوایەتیەك لە ناسنامەی خۆیدا دەتوێنێتەوە، ئەو یەكێتیە كۆمەڵایەتیەی تیادایە كە هەموو ئومەتان بەدوایدا وێڵن و نایدۆزنەوە، یەكسانی ڕاستەقینەی تێدایە، كەس لە كەسی تر باشتر نیە مەگەر بە تەقواو خۆ پارێزی، كەسی خۆپارێزیش لە تەقواو خۆپارێزیەكەیدا بانگەشەی ئەوە ناكا كە لە كەسی تر بە تەقوا ترە، لە ئیسلام دا كەس لە كەس خۆی بە باشتر نازانێ.

ناوترێ[1] هەروەك چۆن ئیسلام ناسنامەیە، هیچ ڕێگرێكیش نیە لەوەدا نەسرانیەتیش بە ناسنامە دابنرێ بە هەمان شێوە یەهودیو ئەوانی تریش، لەبەر ئەوە دەڵێم جیاوازی ئیسلام لەوەدایە كە هەموو ئەو یاسایانە لەخۆ دەگرێ كە دەوڵەتو ئومەت پێویستیانە، ئەو بێنیازە لەوەی پێویستی بەدەر لە خۆی بێت، هیچ بیروباوەڕێكی تر لەمەدا لێی نزیك نابێتەوە هەموو یاساكانی لە كیتابو سونەتەوە هەڵگواستراون، بە فیعلی هەڵگواستراون، وە لە هەزارەها دانراودا تۆماركراون لە كتێبەكانی فیقهو ئسولی فیقهدا، ئایا مێژووی مرۆڤ و

(١) هەروەها نابێ بوترێ: كاركردن بەو یاسا شەرعیانەی وڵاتی ئیسلام كە زۆربەی جار كەمینەیەكی ناموسڵمانی تێیدا نیشتەجێیە، تەحەكوم كردنە بەسەر ئەو كەمینەیەدا، لەبەرئەوەی دەڵێم، تەحەكوم كردنی زۆرینە بەسەر كەمینەدا چارەیەكی نی یە لە هەڵبژاردنی یاساكاندا هەرچەندە ئەو یاسایانە لە لایەن خەڵكیشەوە دانرابێ نەك لە شەرعەوە وەكو رونی دەكەینەوە، بەڵكو تەحەكومو لایەنگیری زیاتر لە یاسا دانراوو دەستكردەكاندان، زۆر بە كەمی لە یاسا شەرعیەكاندا دەبینرێ.

مێژووی ئایینەکان ئایینێکی وەهای بەخۆیەوە بینیوە؟[1]).

مستەفا سەبری تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خانە (الدار) بەم جیاکردنەوەیە لەوە دەردەچێ خانـەی ئیـسلام بێـت وە دەبێتـە خانـەی بێباوەڕو کوفر .

ئەوەتا دەڵێ: (وڵاتی ئیسلام لـە پێناسـەی شـەرعدا بریتیـە لـەو وڵاتەی یاساکانی ئیسلام تیایدا فەرمانڕەوایە، کەنار خستنو دابڕینی ئایین لەوەی دەستوەرداتە کاروباری دەوڵەتەوە وڵات دەردەکات لـەوەی بە وڵاتی ئیسلام بێتە ئەژمار).[2]

بەهەمان شێوە عەلامە ئەحمەد شاکر - قازی شەرعی- ڕووبەرووی ئەو گوتارە نوێیە بویەوە لە کتێبی (الكتاب والسنة يجب ان يكونا مصدر القوانين في مصر) (کتابو سونەت پێویستە سەرچاوەی یاساکان بن لە میسر) لـەو کتێبـەدا وەڵامـی عەبدولعـەزیز پاشا دەداتەوە سەبارەت بەوەی کە وتبووی (ئـاین هـی خوایـە، سیاسـەتی مرۆڤیش هی مرۆڤە) ئەحمەد شاکریش لەو بارەیەوە دەڵێت: (قورئـان پڕە لە ئەحکامی بەرزو شـکۆدار، سـەبارەت بـە کاروبـارە مـەدەنیو بازرگانیەکان، حوکمەکانی شەرو ئاشتی، حوکمـەکانی شـەڕو دەست

---

(١) موقف العقل والعلم (٢٨١/٤-٢٩٥).

(٢) سەرچاوەی پێشوو (١٦٣/١)، لەبەر گرنگی قسەکانی شێخ مستەفا سەبری لە ڕوونکردنەوەی ڕەهەندو هۆکارەکانی گوتاری سیاسی گۆڕێنراو ئەوانەی دەستیان هەبووە لە دەرکەوتنی دا درێژەمان بە ووتەکانی دا.

کەوتو دیل، وە چەندین دەقی روونو ئاشکرا سەبارەت بە حدودو تۆڵە سەندنەوەکان.

هەرکەسێ وا گومان بات کە ئیسلام تەنها ئایینی پەرستشەو هیچی تر ئەوا ئینکاری هەموو ئەمانەی کردووە، وە بەدەمی خواوە درۆو دەلەسەی گەورەی هەڵبەستووە، بەهەمان شێوە وا گومان بەرێ کەسێك هەر پلەو پایەیەکی هەبێت، یا دەزگایەك هەرچۆنێك بێت بۆی هەیە بتوانێت ئەو کارانەی خوا: وەك گوێڕایەڵیەك بۆ خۆی داینـاوە، یا فەرمانی داوە کار بە حوکمەکانی بکرێت، ئەم دەتوانێت بیانسڕێتەوەو نەسخیان بکات، موسڵمان نەشتی وای ووتوەو نە شتی وا دەڵێ هەر کەسەش وای ووتبێ ئەوا بە تەواوی لە ئیسلام دەرچووەو هەموی رەت کردوەتەوە، هەرچەند بەرۆژووبێ و نوێژ بکات وادانێ کە ئەو موسڵمانە.

ئەوان بە دەوری ئەم واتایەدا خولیان دەخوارد و دەیان بزرکاندو بە ئاشکرایی نەیان دەوت تاوەکو ئەم پیاوە خۆی ئاشکرا کرد، ترسیشم هەیە ناخی ئەوانی ئاشکرا کردبێ بەڵام پێم خۆش نیە سەبارەت بەوان بە دڵنیاییەوە هیچ شتێك بڵێم، ئێمە لێپرسینەوەی خەڵك لەسەر گومان ناکەین، لێپرسینەوەیان لەبەر دەستی خوای گەورەدا دەبێت لە رۆژی دوایدا .

لە هەموو سەیرتر ئەوەیە مەعالی پاشا لە بەڕێز (محب الدین الخطیب) دەپرسێو دەڵێ:(ئایا لەم سیستەمو یاسایانەدا شتێك دەبینین پێچەوانەی بیروباوەڕی موسڵمانان بێت، یاخود فەرزێك لە فەرزەکانی

ئایین لە کار بخات؟).

من وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی دەدەمەوەو دەڵێم: بەڵێ لە راستیدا یاسا فرنجیەکانو سستمە ئەورووپیەکان، زۆرشتیان تیادایە پێچەوانەی بیروباوەڕی موسڵمانانەو زۆرێك لە فەرزەکانی ئایین لەکار دەخات.

لەو یاسایانەدا عەرەق بە روونو ئاشکرایی درووستەو بەرەسمی مۆڵەتی کڕینو فرۆشتنی دەدرێ، بە راگەیاندنێکی نوسراو وەزیرێك لە وەزیرەکانی دەوڵەت یا گەورە کارمەندێکیان ئیمزای لەسەر دەکات، بەڵکو بەشێك لە گەورە پیاوانی دەوڵەت شەرم ناکەن لەوەی لە ئاهەنگە ڕەسمیەکاندا عەرەقیان بەسەردا دەگێڕن، لە سامانی دەوڵەت بۆیان خەرج دەکرێت، بە بیانوی ئەوەی ئەمە ڕێزگرتنە لە میوانە بیانیەکانیان، یاخود ئەتوانی بڵێی بەهەر بەڵگەیەکی تر کە داڕنراوە لە شەرم، تەنانەت کۆمەڵێك کەسیان و ئەوانەی ناویان دەبەن بە توێژی باڵا (الطبقة الراقیة) گەورەو سەرکردەکانی خۆیانیان کردوەتە سەر مەشق و ئەو یاسایانەیان بەکارهێناوە بۆ شتێك کە ژیریان دەباتو سامانیان بە فیڕۆ دەچێت، بەمەش کەوتونەتە چالاکی نزمو بێ ئەمانەوە.

لەو یاسایانەدا قومار بە هەموو جۆرەکانەوە دروستە، بەچەند مەرجو ئاسانکاریەك کە بۆ خۆیانیان داناوە، بەمەش خانەکان وێران دەبنو بیرو ژیری مرۆڤ کەلێنو لەکەدار دەبێت، ئەوەی لەم رووەوە دەبینرێ قەڵەم بێ توانایە لە وەسفکردنی.

لەو یاسایانەدا خراپەکاری بە چەند ڕێگەوشێوەیەك سەرسامو حەڵاڵ کراوە، لەوانە پارێزگاری کردن لە پیاوانو ئافرەتە خراپەکارەکان، لــە دەسەڵاتی باوکـانو سەرپەرشـتیاران، بـە بیـانوی پاراسـتنی ئـازادی کەسێتی .

پاشان ئەو خراپەکاریانەی لە مەیخانەو بارەکانـدا دەکـرێ، پاشـان تێکەڵی پیاوانو ئافرەتان، دواتر گەشـتو گـوزارە نەشـیاوەکانی نێـو سەیرانگاکانو ئەو نەهامەتیو خراپەکاریانەی تێیدایـە، پاشـان ئـەم سەماخانە گشتیو تایبەتیانـە، بـەڵکو ئـەو سـەماخانانە دەوڵـەت خەرجیـەکی زۆری تیـادا دەکـات بـۆ ئاهەنگـەکانو نوانـدن، وەك چاولێکەریەکی گەورە ئاغای ئەوروپیەکانیان (ئەو عەقڵە گەورانـەی کارەباو رادیۆو موعجیزەی فڕینیان دۆزیەوە)!

لەو یاسایانەدا لەکار خستنی ئەو حدودانەی تیادایە کە قورئانیان لەسەر دابەزیوە، وەك هاوڕەوتیەکی گیانی گەشەسەندنی هاوچەرخانەو شوێنکەوتنێك بۆ ڕێساو یاسا شەرعیە نوێیەکان! دەك تیاچـیو دوور بێت لە ئێمە ئەو یاساو تەشریعە نوێیانە! لەو یاسایانەدا بە فیڕۆدانی خوێنی تیادایە لەبارەی کوشتنەوە، بەهۆی دانانی چەند مەرجێك لـە بارەی حوکمی تۆڵە سەندنەوە کە لە کیتـابو سـوونەتدا نـەهاتووە . نمونەی نەکوشتنەوەی ئەو کەسەی پێشتر سـووربووە لەسـەر کوشـتنی دەست ئەنقەست کە حەدەکەی لە یاسای ئیسلامدا تۆڵە سەندنەوەیە، وە وەکو کۆلینەوە لەوەی ناوی دەبەن بە بارودۆخی سوك کەر (الظروف

المخففة) وه خوێندنی نەفسیەت‌و بارودۆخی خراپەکار، هەروەها ئـەوەی مافی لێبوردن بدرێتە دەوڵەت نەك خاوەن خـوێن، کـە خـوای گـەورە تەنها مافی لێبوردنی بەو داوە بە دەقی قورئان، بەمەش خوێنەکان بە فـیڕۆ دەچـن، کوشـتن لـە تۆڵـە سـەندنەوەدا بڵاوبوەتـەوە، هـیچ سەڵەمینەوەیەك نیە، ئومـەت‌و حکومـەت‌و ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـان‌و ئەوانی تریش سەبارەت بە زیـاد بـوونی تاوانـەکانی کوشـتن پرسـیار دەکەن؟ هۆکارەکە بۆ ئەو یاسایانە دەگەڕێتەوە کە پێچەوانەی عورف‌و ئایینن.

سەرەڕای چەندین شتی تر کە ناتوانین لـەم ووتەیـەدا بیانـژمێرین، هەموو ئەو شتانە حەڵاڵکردنی ئەو شتانەیە کە خوا حەرامی کردوون، سوکایەتیە بە سنورەکانی خواو دەرچوون و ترازانە لـە ئیـسلام، هـەر هەمووشی ڕاگەیاندنی جەنگە دژ بە بیروباوەڕی موسـڵمانان، تـەواوی ئەمانە لە کارخستنی فەریزەکانی ئایینە). [1]

هـەروەها شـێخ ئەحمـەد شـاکر دەڵـێ: (مەسـەلەی ئـەو یاسـا دەستکردانە بەوێنەی خـۆر روون‌و ئاشـکران، کـوفری ئاشـکران هـیچ نهێنی‌و دڵ ڕاگرتنێکی تیـادا نیـە، هـەر کەسێك لەوانـە خـۆی بـە موسڵمان دەزانێ هەر کەس بێت بیانوی نیە لـەوەدا کـە کاریـان پـێ بکات یان ملکەچیان بێت یاخود دانیان پیادا بنێت). [2]

---

(١) الكتاب والسنة يجب ان يكونا مصدر القوانين في مصر ل٩٨-١٠١

(٢) عمدة التفاسير ١٤٧/٢

وە دەفەرمویت: (دادگای کردن لـە سـەروەتو سـامانو نـاموس و خوێن دا بە یاسایەکی پێچەوانەی شەریعەتی موسڵمانان و دەرکردنـی یاسایەك کە پێویست بێت موسڵمانانی پێوە پابەنـد بکرێـت، بـەوەی دادوەری بەرنە لای دەرەوەی حوکمی خواو ئایینەکەی، ئەمە بێ باوەڕیەو هیچ کەس لە ئەهلی ڕووگە سەرەرای جیاوازیان گومانیان نیە لـەوەدا ئەوەی وابڵێ و بانگەشەی بۆ بکا بێباوەڕدەبێت). [1]

لە یەکەم کتێبدا بە ناوی (الکتـاب والـسنة) باسـی هۆکارەکـانی لاوازی ئومـەتو چۆنیەتی ئەو گۆڕانانەی شەریعەتی ئیسلامی دەکا بە یاسا دەستکردەکان و دەڵێ: (ئەو زانایانەی کە چاویان لـێدەکرا پێیان بـــاش بـــوو بۆچـــونەکانیان پیـــادە بکـــرێ و هـــەڵهێنجان لـــە تەقلیدکردنەکانیاندا ئەنجام بدرێ، پادشاو میرو سەرکردەو سەرۆکەکان شارەزای ئایینەکەیان بوون و پابەنـد دەبـون پێیـەوە، تـاوەکو چـاخی لاوازی مـوسڵمانان هات، ئەمـەش بەرئەنجامی لاوازی زانایانو زۆرداری مـیرە نەزانــەکان بــووە، خــەڵکی زیــادەڕەوی و بــەردەوەمیان دا بــە چاولێکەریو تەقلید، بە توندی دەمارگیریان بۆ ووتەی زانایانی دووایین بۆ دروست بو، لەو لقو چڵانەی کە دەقـی کیتـابو سـوننەی لەسـەر نەبوو، لەوانەیە زۆربـەیان لەوشـتانە بـوو بێـت کـە زانایـان لەسـەر عـــورفو بـــاوێکی دیـــاریکراو هـــەڵیان گۆســـتبێت، یـــاخود لەبـــەر

(١) پەراوێزی (تفسیر ابن جریر) شیخ ئەحمد شاکر ٢/٣٤٨

بارودۆخێك بوو بێت كه پێویسته زانا له‌كاتی ئیجهادكردندا ره‌چـاوی بكات، به‌ڵكو له‌وانه‌یه هه‌ندێكیان هه‌ڵه‌یان كردبێ له ووتنه‌كه‌یاندا، به‌و پێیه‌ی بێ تاوان (معصوم) نیه .

تاوه‌كو گوشین‌و ته‌نگی زۆر كرا، تا گه‌یشته ئـه‌وه‌ی ئـه‌و نه‌وه‌یـه‌ی پێش نه‌وه‌ی ئێمه هات، كاروباره‌كان ببونه تاریكی له‌ســه‌ر تـاریكی، زانایان یاخود زۆربه‌یان — ده‌مارگیری‌و چه‌قبه‌ستوویان زیادی ده‌كـرد، سه‌رده‌میش له‌گه‌ل گه‌شه‌كردنی خێرادا بوو، چاولێكه‌ریه‌كه‌یان وای لێ كردن نه‌توانن له‌گه‌ڵیدا هاوڕه‌وت بن، ئه‌مه سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی نه‌یانتوانی پێشی بكه‌ون، ته‌نانه‌ت هه‌ندێ میره‌كانی نه‌وه‌ی رابـردوو پێـشنیاریان كرد بۆ زانایان كه یاسایه‌كی شه‌رعی بۆ خه‌ڵكی دانێن له هه‌ر چـوار مه‌زهه‌به‌كه‌وه هه‌ڵی گۆزن‌و وه‌ری بگرن، وه‌ك ره‌چاوكردنێك بۆ ئـه‌وان‌و سور بوونیان له‌سه‌ر ئـه‌و خـوه‌ی بـه چـاولێكه‌ریه‌وه گرتبویـان، كـه ئه‌مه‌ش داواكاریه‌كی خاكیانه بوو، كه ده‌كرا چاره‌سه‌رێكی كاتی بێت، به‌ڵام نه‌یانكردوو به خراپیشیان دانا، ئه‌و میانه‌ش پشتیان تێیان كرد.

پاشان ئه‌و یاسایه فرنجیه وه‌رگێردرانه هێنرایه ولاتمانه‌وه، پیـت بـه پیت له گه‌لانێكه‌وه بۆمان گواسترابویه‌وه كه هیچ په‌یوه‌ندیه‌كیان به ئێمه‌وه نیه له رووی خوو نه‌ریته‌وه، هاتنه نـاوه‌وه تـاكو بیروباوه‌ڕمـان بشێوێنێ، باوو نه‌ریتمان بسڕێته‌وه، توێكڵ‌و به‌رگێكی ساختـه‌مان پێ بپۆشن كه ناو ده‌برێت به مـه‌ده‌نیه‌ت !!

پاشان ڕاپەرینی زانستیانەی ئیسلامی هاوچەرخ هـات، کەسـانێك فویان پیادا کردو گەشەیان پێدا کە نوکی ڕمـی سـەردەمی خۆیـان بوون، لە پێشی هەمویانـەوە جەمالـەدینی ئـەفغانیو[1] موحەمـەد عەبدەو موحەمەد ڕەشـید ڕەزا، موحەمـەد شـاکری بـاوکم خـوا لـە هەموویان ڕازی بێـت بنـەماکانیان بـە کـرداری دانـاو ڕێساکانیان چەسپاندو بونیاتەکەیان توندو تۆڵ کرد، بەهۆی ئەوانـەوە ژیریـەکان بەخەبـەر هــاتنو دڵو دەرونــەکان شۆڕشــیان بــەرپاکرد بەســەر چاولێکەریدا، لە نێو زانایانـدا کەسـانێك پێگەیشتن کـە ئیجتهـاد کردنیان بە واجب دانا، کە دەکرێ ئیجتهادێکی هەڵپروزاو قرچو کـاڵ بێت، ئەشکرێ ئیجتهادێك بێت هەڵەی زۆری تیادا بێت، بەڵام باشـترە لە چەقبەستووی، شیاوو لەبارترە بەویستی خوا بۆ ئومەتو ئایین.[2]

بەڵام تەواوی ئەمانە لەگەڵ باو ڕەشـەبادا ڕۆیـشتن، شـێخ ئەحمـەد شاکر ئەمە بەم ووتەیەی دەردەبڕێو دەڵێ: (هەمان ئەو ووتەیەیان پێ دەڵێم کە سەرکردەی ئیسلامی لەبیرکراوی نەناسراو سەید عەبدورەحمان کەواکیبی ووتبووی: ئەمـە ووتەیـەکی ڕاسـتو ڕەوایـەو هـاوارە لـە

(١) بڕوانـە لـەو بـەرز ڕاگریـەی عەلامـەی فـەرمودە نـاس (ئەحمـەد شـاکر) هەیـەتی بـۆ ئاڵاهـەڵگرانو پێشڕەوانی ڕاپـەرینی ئیـسلامی، کـە ئـەو زانـاتر بـووە پێیـان لەبـەر ئەوەی هاوچەرخیان بووە، تا بزانی لە لایەن نەوەکانی ئەم بێداری یەی ئێستاوە چ ستەمێکیان لێدەکرێ بەهۆی ئەوەی پلەو پایەیان نازانن‌و ئاشنایەتیان پێ ی نیە؟!

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل (٦-٧).

دۆڵێکدا ئەگەر ئەمرۆ لەگەڵ بـادا بـڕوات ئـەوا سـبەی مـێخو پـواز دەبات).[1]

بەم شێوەیە گوتاری نوێ خۆی سەپاند بەڵام نەك بە هێـزی بەڵگـەو بورهان، بەڵکو بە هێـزی شـیرو زەبـری ئـەو ڕژێمانـەی داگیرکـەر بـە چاودێری خۆی دروسـتیانی کردبـوو، لـە گیـانی خـۆی فـووی پیـادا کردبوون لە شیری خـۆی گۆشـی کردبـوون، بـەهێزی خـۆی یارمـەتی دابون، داگیرکەرو ئیستعمار دەرنەچوون، پاش ئەوە نەبێ کە گوتارێکی سیاسی شەرعیان پێکهێناو ئیـسلامێکی نوێیـان دروسـت کـرد کـە شەریعەتی ئیسلامی تیادا نەبوو، وە دەوڵەتێك نەبوو فەرمانڕەوایی پێ بکات و بیپارێزێ، وە جیهـادێکی نـەبوو کـە سـنورو ئـایینو مـافو بەرژەوەندییەکانی پێ بپارێزێ و بەرگری لـێ بکا، وە ئازادیو ڕێز بـۆ گەلەکانی نەمایەوە، ئەزمونی هەڵگەڕانەوەی سەربازی لـە تورکیـادا گشتێنرا بەسەر تەواوی هەرێمەکانی خەلافەتی ئیسلامی لـە هـەموو وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا، کـە دەڕوانیتـە تـەواوی ئـەو ئینقلابانـە، وادەبیستی کە ئەمانە هەر هەمویان لە کونێکـەوە دەرچـووبێتن و لـە یەك قاپدا ئاویان خواردبێ، هەر بۆیە دەبینی تەواوی ئەوانە سـەرەڕای جیاوازی و جۆراو جۆریان کۆدەبنـەوە لەسـەر دەسـتگرتن بـەو گوتـارە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ل٣٦ ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەخاتە روو ئەوەیە: چۆن ئەو ڕژێمانە توانیان فیکری ئەو ئالاهەڵگرو پێشڕەوانە لەناوبەرن تاوەکو ناویان بچێتە توێی لە بیرچونەوەوە هەر لە ناوەراستەکانی سەدەی رابردووەوە؟!

سیاسیە گۆڕێنراوە وە سوپایەك لـە زانـای بـۆ مـۆڵ دەدرێ و تـەواوی هۆکارەکانی پـەروەردەو فێرکـردنو ڕاگەیانـدنی دەخرێتـە ژێردەسـت تاوەکو وای لێهات منداڵ تیایدا بوو بەلاو، گەورە بو بە پیر، تەنانـەت لە لایەن زۆربەی زانایانی ئومەتەوە شتێکی کەم لە ڕەفـزو ئینکـاری بەدی دەکرێت؟!

شەهید سەید قوتب - بەر بەزەیی خـوا کـەوێ - دیـارترینی ئـەو کەسانەیە کە ڕووبەڕووی ئەو گوتارە بویەوە پیش شۆڕش، هەروەك لـە کتێبـی (جـەنگی ئیـسلامو سـەرمایەداری (معركـة الاسـلام والرأسماليـة)دا وەك شـیتەڵ کردنەوەیـەکی ئـەو قەیرانـەی ئومـەت دەیگوزەرێنیو هۆکارەکانی، دەڵێ: (دروست نیە ئیسلام فەرمانڕەوایی بکات ... ئەمە حەزو ویستی جیهانی خاچ پەرستییە، پێویستە ئێمـە ملکەچ کەین، وە باوەڕ بکەین بەو ئاماژانەی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە پێمان دەدەن بە سادەییو بێئاگاییـەوە بـەناوی ئـازادکردنو ڕۆشنبیرییەوە! کێ دابنـەین بـۆ گـچکە بودەڵـەکان، لـە ڕێـی کێـوە قەنەعەتیان پێ بکەین کـە ئـەوان تـاوەکو ئێـستاش هـەر گـچکەو بودەڵەن؟!

قورسە بتوانین دوژمنایەتی سەلیبیەتو ئیستعمار دژ بـە ئیـسلام لێك جیابکەینەوە . هەریەکەیان ئـەوی تـر گـۆش دەکـاو پـشتیوانی لـێدەکاو پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، ئیسلام بیروباوەڕێکی سەر بڵندانەیە هەر کاتێك لە دڵو دەرونـی کەسـانێکدا وەئاگابێتـەوە، بەرهەڵـستی

داگیرکەرو ئیستعمار دەکات، گەڕانەوەی فەرمانڕەوایی بۆ ئیسلام ئـەو گیانە زۆر بەتوندی بە ئاگا دێنێتەوە، بەمـەش نەخـشەی سـود لــێ وەرگرتنو سەرشۆڕکردنی ئیستعمار تێك دەچێت .

ئیسلام حەرامی دەکات شوێنکەوتوانی ملکەچی هەر حـوکمێکی بیانی بن، بەڵکو لەگەڵ هەر یاساو تەشریعێکدا کـە ڕێـك نایەتـەوە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام دا، ئەوە کۆسپێکی پێـشینو لـە مێژینـەی سەرریۆی داگیرکەرە، داگیرکـەران وەکـو ڕۆشـنبیرە بـەرێزەکانی ئێمـە بێئاگا نین، لە گەلحۆیدا وەکو فەرمانڕەوا هەڵکەوتووەکانی ئێمە نـین! ئـەوان داگیرکــەرنو خەونـــە ئیـــستعماریەکانیان لەســـەر چـــەندین توێژینەوەی فرە ڕەهەندی تەواوی پێگەو پایەکانی ئـەو گەلانـە بـەدی دێنن کە داگیریان دەکەن، تاوەکو تۆوی بەرگری بکوژن، یاخود خۆیانی لــێ رزگار بکەنو لەگەڵیدا هەڵکەن، ڕۆژهەلات ناسی لەسەر ئەمـە بنیات نراوە، بەدی هاتووە بۆ ئەوەی لـە رووی زانـستیەوە پـشتیوانیو هاوکاری ئیستعمار بکات، وە بۆ ئەوەی رەگو ریشاڵەکانی لـە خـاكو خۆڵی عەقڵیەتی ئەواندا فراوانو بەرین بکات .

جارێکی تر پرسیار دەکەین کێ بۆ ئەو گچکەو بودەڵانە دابنێین تـا قەناعەتیان پێبکات، کە تاوەکو ئیستاش هەر گچکەو بودەڵەن..

ئینگلیز دەیزانی هەر رۆژێك بێت دەبێت سوپای داگیر کـەر میـسر بەجی بهێڵێت، زوو بێت یاخود درەنـگ، هـیچ بوارێکیـان نـەبوو بـۆ هاوپشتیکردنی ئیستعمار جگە لە سوپای داگیرکەر خۆی نەبێت، هەر

بۆ ئەم هاوپشتی کردنە لە بواری ئابوریدا کارێکیان کرد کـە بتـوانن بازارەکانی میسر داگیر بکەنو هەوڵ بدەن دەرگای بازارە جیهانـەکانی تر بەرووی بەرهەمو بەروبوومی میسریدا دابخەن، لە جیهانی سـامانو داراییدا کارێکیان کرد کە نەختینەو خەزێنەمان پاشکۆی نەختینـەو خەزێنەی ئەوان بێت .. هتد

بەڵام هەمور ئەو هاوپیشەییە توانای مانەوەیانە نەبوو، ئەگەر ئەو ئیستعماری ڕوحیو فیکریە نەبوایە کـە ئـەوان لـە میانـەی سـەدەی رابردووەوە گرنگیان پێداوە، بەردەوامو لەم رۆژانەشدا گرنگی پێدەدات، ئینگلیزە سپیەکان دیوانەکانیان بەجێ هێـشتو تـاوەکو (ئینگلیـزی ئەسمەر) لە میسریەکانی دیوەخان و نزیك سەراکان کـە ڕوحو بیریـان ئیستعمار کرا بوو جێگەیان بگرنەوە، کە بە چاودێری ئیـستعمارو بـۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکانی ئیستعمار دروست کرا بوون، ئینگلیزی سپی پێست گرنگی یەکی زۆریان بـە وەزارەتـی مـەعاریف دەدا، بـەو پێیەی سەرپەرشتیاری پێگەیاندنی نەوەکانە، هەر بۆیە کاتێ ئـەمڕۆ جێیان هێشتن بۆ ئینگلیزی ئەسمەر بە دڵنیاییو ئارامییەوە بـەجێیان هێشتوە، بەردەوام تاوەکو ئێستەش سستمو بەرنامەو کتێـبو تـەواوی ڕێگەکانی ووتنەوە کار دەکات بۆ خزمەتکردنی ئیـستعماری روحـیو فیکری لە دڵو دەرونی نەوەکاندا، هەر هـەموو ئەمانـە ئامـاژەن بـۆ توڕدانی ڕەگەزی ئایینی! وە وەلاخستنو دابڕانی ئیسلامن نەك تەنها لە فەرمانڕەوایەتی بەڵکو لە تەواوی ژیان دا.

لـه ڕاسـتیدا ئیـستعمار چـەند نەوەیـەکی یـەك لـە دوای یـەکی پێ گەیاند، بەڵکو بەردەوام لە زیـاد بووندایـە بـە هـۆی ئـەوەی ئـەو عەقڵیەتەی سەرپەرشتی وەزارەتی مـەعاریف دەکـا، وەهـا دەڕوانێتـە ئیسلام کە پاشماوەیەکە لە پاشماوەکانی دواکـەوتن‌و تێکـشکان‌و خـۆ داماڵین لە ئیسلام خۆداماڵینە لە تۆمەتی چەق بەستوویی و نەزانی‌و بەڵگەی (ڕۆشنبیری!) ئازاد بونە.

بەرنامەکانی مێژوو لە قوتابخانەو کتێبەکانی میسردا بەشێوەیەکی تایبەتی فێلاویترین کارێکە ئیستعمار توانیویـەتی ئـەنجامی بـدا، وە لەناوبەرترین ئامرازێکە بۆ کوشتنی گیانی نەتەوەیی‌و ئـایینی وەکـو یەك، قوتابی ئامادەیی - بەڵکو زانکۆ - کاتێك لە خوێندنی مێـژوو دەبێتەوە بە مێژووی ئیسلامیشەوە شتێك نازانێت سەبارەت بە بیرۆکـە کۆمەلایەتی‌و تێڕوانینە مرۆییەکانی ئیـسلام، هـەموو ئـەو شـتانەی دەیخوێنێ داگیرکردن‌و جەنگ‌و ڕووداوەکانن، بـەوەش کۆتـایی دێ کـە ئیسلام بریتی بووە لە گۆڕەپانی جەنگ‌و کوشتار، وە ڕۆژێك لـە ڕۆژان گۆڕەپانیی فیکری‌و کۆمەڵایەتی‌و مرۆیانە نەبووە !

هۆکارێکی تر هاوکارییەکی باشی ئیستعماری کرد لە شـێواندنی فیکری ئیسلامیدا کە ئیستعمار لەوە لەناوبەرو کاراتری نەدەدۆزیەوە، ئەوانە بریتی بون لەو کەسانەی خـەڵکی بـە پیـاوانی ئـایین ناویـان دەبات، لە مـەلاو شـێخ‌و دەروێـشەکان کـە نمایـندەی چەقبەسـتویی فیکری‌و ئاسۆ تەسکی یاخود ئەفسانەو نەزانیان دەکردو پاشان تەواوی

ئەمانەیان بە ڕەنگێکی ئایینیانە ڕەنگ ڕێـژ دەکـرد، بـە شـێوەیەکی ناشرینو نابووتو شێواوو بێـزار دەیاغـستە ڕوو پاشـان لـە ڕەفتـاری شەخصیو کۆمەڵایەتی خۆیاندا چەندەها تاوانو خراپەکاری ئابڕووبەرو ناوزڕێنی وەهایان ئەنجام دەدا کە ڕێزو جدیەتو پلەو پایەی ئایینیشی لەکەدار دەکردو ونەیدەهێلا، بەتایبەت لە کاتێکدا بۆ نرخێکـی کـەم ئایەتەکانیان دەفرۆشـت، بـە نـاوی ئیـسلام و قورئانـەوە پـشتیوانی ئەوانەیان دەکرد کە بە خراپی سودیان لە خەڵکی دەبینی و زۆرداریو ستەمیان ئەنجام دەدا.(*)

بەم شێوەیە دەزگای فێرکاریانەی ئیستعمار لە وەزارەتی مەعاریفدا بە چاودێری پیشەسازی یەکانی داگیر کەر چاودێری بەرنامەو سیستەمو مەنهەجو کتێبەکانیان دەکرد، لەگەڵ ئەوانەی ناوبرا بوون بە پیـاوانی ئایینی بوون، تاوەکو پێکەوە بوارێك برەخسێنن کە داگیرکـەر بتوانـێ مەبەستی خۆی بپێکێ و ئیستعماری روحیو فیکری بگاتـە لووتکـە تەنانەت پاش ڕۆیشتنی داگیرکەریش!

ئیستعمار بۆ مەبەستێکی زانراوو ئاشکرا، کە لـە خـودی خۆیـدا لۆژیکە، ڕوو بە ڕووی فەرمانڕەوایی ئیسلامی دەوەستێتەوە، ڕێـی تـێ ناچێ کاتێك کە ئەو دژایەتی ئیسلام دەکات وەك بیروباوەڕێکی تونـدو تۆڵ، واز لەو بیروبـاوەڕە بهێنێ تـاوەکو بگـۆڕی بـۆ هێـزی مـاددی،

---

(*) ئەمڕۆش چەندە زۆرن ئەوانەی لە هەموو وڵاتێکدا بەرگری لە ڕژێمە زۆردارو نەخشە ئیستعماریەکان دەکەن!؟.

ئیستعمارەکان وەك ئێمە بێئاگاو نەزان نین بەو بانگەشە بەهێزەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ (الأنفال: ٦٠) وە ئەوە لە بیریان دەرناچێ کە فەرمانڕەوای ئیسلامی تەواوی دەزگاکانی دەوڵەت دەکاتە ئیسلامی: دەزگای ئابوری‌و بەرگری‌و فێرکاری، هەروەکو ڕەنگێکی ئیسلامیانە بە کۆمەڵگەش دەبەخشێ، ئەوەش مەترسیدارترین شتێکە بۆ داگیرکەرو ئیستعماری دیارو شاراوە وەك‌و یەك(*) ئیستعمار هەست بەوە دەکات لە بەرپابوونی فەرمانرەوایەتی ئیسلامی، دادگەری بۆ فەرمان ڕەوایەتی‌و دادگەری بۆ سامان‌و دارایی دەگێڕێتەوە، بەمەش نینۆکی دیکتاتۆریەتی فەرمانرەوایی و سامان قۆرخکردن دەکات، بەردەوام ئیستعمار مەبەستێتی گەلان فەرمانرەوایەتی خۆیان نەکەن، چونکە ئەو کاتە ناتوانێ ملکەچی بکات، هەر بۆیە پێویستە چین‌و توێژێکی دیکتاتۆریانەی فەرمانڕەوا هەبێت، دەسەڵاتی زۆرداری‌و چەوسانەوەی لەدەستدا بێت، خاوەنی سەروەت‌و سامانێکی بەهێز بێت، ئیستعمار لەگەڵ ئەم چین‌و توێژەدا ئەتوانێ سەودا گەری بکات، یەکەم لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی کەمن، دووەم لەبەر ئەوەی پشتیوانی مانەوەی دەکات و پێویستی پێی دەبێت بۆ ئەوەی پشتیوانی بێت لە

(*) ئیستعمار سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوە بوو لە میسردا ڕێی گرت لە بزاڤی ئیسلامی، پادشایەتی ڕووخاندو شۆڕشی سەربازی هێنا، تاوەکو بەرگری‌و ڕێگری بکات لە بەرپاکردنی حکومەتێکی ئیسلامی؟!

ڕووبەڕووبونـــەوەی جـــەماوەرداو ئـــەم توێـــژە ئـــەرکی ملکـــەچ کـــردنو بەڕێوەبردنی جەماوەری لەسەرە، ئیستعماریش لە پشتیەوە خۆی حەشار داوە، هەموو کات ڕووی ڕوتو ورووژێنەری خۆی هەڵناماڵێ.

هاوپەیمانیەتێکی سروشتی لـە نێـوان ئیـستعمارو دیکتاتۆریـەتی فەرمانڕەوایی سەروەتو ساماندا هەیە، هەریەکەیان پشت بە ئەوی تر دەبەستێت، بەرژەوەندییەکانی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕدەکـات، هـەموو ئـەو ئازادیو دادگەریە کۆمەڵایەتیەی داگیرکەران لە وڵاتی خۆیاندا سـود مەند دەبن لێی ڕێنادەن لە وڵاتە داگیرکەرەکانو ناوچـەی دەسـەڵاتی خۆیاندا سودمەند بیین لێی، چونکە ئەم وڵاتە ژێردەستانە هەر ڕۆژێك ڕزگاریـان بـوو لـە مافخوراویـە کۆمەڵایەتیـەکانیان ڕووبـەڕوویان دەبنەوە.

وە لەبەرئەوەی فەرمانڕەوایەتیەکی ئیسلامی دروست هیوای ئـەوەی لـێ دەکرێ دادگەریەکی ڕەها لە حوکمو ساماندا بەدی بهێنـێ، هـەر بۆیە ئیستعمار جەنگێکی پەرتو بڵاوی لەگەڵدا دەکات .

خۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵی دەجەنگێ و دژایەتی دەکـات، لـە پـشتی پەردەشەوە لەگەڵی دەجەنگێو دوژمنایەتی دەکـات، پـەردەی زۆرداری هەلپەرستەکان، پەردەی ئـازادی و خۆشـگوزەرانی، پـەردەی ئەوانـەی سەرپەرشتیاری فێرکاری دەکەن بە شێوەیەك هەست بکەن یان نا.

هەلپەرستو زۆردارەکان بـە باشـی دەزانـن قورسـە سـەرکردایەتی جەماوەر بکەی و بەکاری بهێنی دژ بـە بیروبـاوەڕە ئایینیەکـەی، هـەر

بۆیە ڕێ دەدەن تویکلّو ئەفسانە بەدیهاتووەکانی نێو ئەو ئایینە کراوەو والاّ بێت بۆ جەماوەر، بەلاّم ئەگەر ببێتە راستیەکی جیدی، لە کاتێکی وادا حەزو هەستی بەرگریکردن لە خۆو لە بەرژەوەندییەکان دەبزوێ، ئەم دوو حەزەش لە دۆلّو شیوێکەو فەرمانڕەوایی ئیسلامی لە دۆلّێکی تر .

هیچی تیادا نیە ئەگەر ئیسلام بریتی بێت لە دەمو لێو بزواندن بە زیکرو دەنگو تەقەتەقی دەنگی تەسبیح یاخود پاڕانەوەو قورئان خوێندن بێت، یاخود سوڕانەوەی حەوت جار بە دەوری کەعبەداو پاشان بیدەنە دەست ئەو چاو ساغەی بە رەسمی رەشمەی وشترەکەی بەدەستەوەیە!!

تا دواهەمین ئەو دەزگا سڕکەرانەی ستەمکارو هەلپەرستەکان سودی لێ دەبینن تاوەکو جەماوەری پێ بێئاگاو سەرقالّ بکەن، بەلاّم کاتێك ببێتە فەرمانرەوایەتیەکی جیدیو یاساکانی ئیسلام لە حوکمو ساماندا جێبەجێ بکات و مافە مرۆییو کۆمەلاّیەتیو یاساییەکانی هەموو تاكو تەواوی کۆمەلّ دەستەبەر بکات و جیاوزای نەخاتە نێوان دروشمە پەرستشیو تەشریعە یاساییەکانەوە... ئەگەر وای لێهات ئەو کات ئیسلام دەبێتە شتێکی مەترسیدارو کارەساتێك کە دەبێ ڕێگری لێ بکرێ و جەنگێك کە زۆردارو هەلپەرستان بەتەواوی ئەوەی هەیانە بەرپای دەکەن !

ئالەو کاتەدا ئیستعمارو هەلپەرست کاریان بەیەك دەکەوێ،

بەرژەوەنـدیان یـەك دەگـرێ بـۆ بەرهەڵـستیکردنی ئـەو مەترسـیەو ڕەتکردنەوەی ئەو ئازارەو وەستان لە ڕووی ئەو لافـاوو تۆفانـەدا، ئـەو تۆفانەی کە ئەگەر شەپۆل بدا ئەم‌و ئەویش دەخنکێنێ !

لە کاتێکی وادا هەردوو لایان مەترسی شیوعیەتیش بە سوك سەیر دەکەن وەبەبێ بایەخی دادەنێن، چونکە هـیچ شـتێك وەکـو دادگـەری ئیـسلامی ناتوانـێ بەرهەڵـستی شـیوعیەت بکـات لەبـەر ئـەوەی شیوعیەت لە دەرەوەی دەرگاکانە، بە هێزو چەواشە ڕێگری لـێ دەکرێ. بەڵام ئیسلام لەم دیو دەرگاو لەناوەوەیەو بەڵگەی خۆی پێ‌یـەو ئاسـان نیە هەڵەو پێچاو پێچی تیادا بکرێ !

ئەو ئیسلامەی ڕێـزو سـەربەرزی لـە دەرونـی تاکـدا دەوروژێنـێ، بەرهەڵستی دەکا لـەوەی ملکەچـی حوکمێـك بێـت کـە پێـچەوانەی شەریعەتەکەی بێت وە ئامادە سازی‌و سـەربڵندی پـێ دەبەخـشێ لـە بەرامبەر هەموو دەسەڵات‌و خۆسەپێنێکدا... ئەم ئیسلامە نارازییە لە فەرمانرەوایی دەسەڵاتە زۆردارو خۆسەپێنەکان، زۆردارەکان لەگەڵ ئەم ئیسلامەدا مانەوەیان دەستەبەر نیە .

ئەو ئیسلامـەی دەسەڵاتێکی فـراون دەبەخـشێتە دەوڵـەت، تـاوەکو دەستنیـشانی سـەروەت‌و سـامانەکان بکـات، بـە پـێی پێویـستی چاکسازیکردنی کۆمەڵگا لێیان وەردەگرێ، ئـەوی تـریش بـۆ سـودی خۆیان‌و کۆمەڵگە بەکار بهێنن، وە چاودێری کرێـی زەوی زارو خـانوو بـەرە بکـات‌و ڕێژەیـەکی کـرێی لـێ وەربگـرێ، تـاوەکو دابینـی

خزمەتگوزارییە گشتییەکان بکات، ڕێگری لە قۆرخ کاری بکاو سودو قازانجی لە رادە بەدەرو هەل پەرستی حەرام بکات .. ئەم ئیسلامە بەپێی دڵی هەلپەرستەکان نیە، هەلپەرستانیش تەنها ئاگرو ئاسن ناسەپێنن بۆ سەرکوت کردنی بانگەوازی ئیسلام، بەڵکو پیاوە ئایینیە پیشەگەرو نوسەرە کرێ گرتەکانیش(*) بەکاردەهێنن‌و ڕۆژنامە و گۆڤارە پروپوچەکانیش ئەم بابەتە دەکەنە مەبەستی قەشمەری‌و سوکایەتی و بابەتێك بۆ گاڵتەجاڕی کە هەرزەکارە سوك‌و بێ نرخەکانی نێو ڕۆژنامەگەری میسری دەیکەنە کەرەستەیەکی رابواردن و کات بەسەر بردن، ئەمەش هاوڕێکە لەگەڵ سوکی‌و بێ نرخی بیرو بۆچونیان و تەنگی‌و هەژاری ڕۆشنبیرییان، سەرەڕای ئەوەی کەم بایەخ‌و نەدارن لەوەی بتوانن ژیانێکی شەرف مەندانەو ڕێزدارانەی بۆ بە دی بهێنن وەك ئەو ژیانە زیندوو دەوڵەمەندەی لە سایەی ئیسلامدا بەدی دێت .

لەوانەیە سەیرو نامۆترین دوژمنایەتی فەرمانرەوایەتی ئیسلامی بریتی بێت لە دوژمنایەتی پیاوە ئایینیە پیشەگەرەکان، بە جیاوازی بیروباوەڕو ڕێبازو دەستەو ڕێژەیانەوە، بەڵام لە واقع دا زۆر سەیر نیە مەگەر لە رووکاردا نەبێت، هەموو ئەوانە دەزانن ئیسلام (پیاوانی ئایین)ی تێدا نیە کە تەنها کەسابەتی بەناوی ئایینەوە بێت، وە هیچ کارێکی تر ئەنجام نەدەن کە سەرچاوەی داهات‌و پێداویستیان بێت.

* سەیری واقعی ئەمڕۆشمان بکە دەبینی بارودۆخەکە هەروەکو خۆیەتی.

ئایین لە ئیسلام دا پیشە نیە، مەگەر کەسەکە سەرقاڵی فێرکردنی خەڵکی بێت، ئەمیش وەکـو هـەر کەرەسـتەیەکی تـر لـە کەرەسـتە مەعریفیە مرۆییـەکانی تـر یـاخود دادوەریو دادگـا بێـت لـە بـارە جۆراوجۆرەکاندا، وەکو پسپۆری لە هەر کارێك لە کارەکانی تر .

تەواوی ئەوانە دەزانن ئیسلام دەجالەکان وەدەر دەنێ، ئەوانەی شتی هـیچو پـوچو ئەفـسانە لـە دەوری ئیـسلام کۆدەکەنـەوە، ئیـسلام بیروباوەڕێکی سـادەو رووتـە، تـەنها پـشت نابەسـتێ بـە مـوعجیزەو کەرامـەتو شـەفاعەتو پاڕانـەوەکان، بـەڵکو پـشت دەبەسـتێ بـە بیروباوەری راستو دروستو ڕەفتاری پاكو جوانو کاری پوختو جیدیو بەرهەمدار.

ئەگەر ئیسلام فەرمانرەوایی بکات یەکـەم کـارێکی بریتـی دەبـێ لەوەدەرنانی ئەو بێکارانەی هیچ شتێك ناکەن بە ناوی ئیسلامیـشەوە دەژیەنو ژیان دەگوزەرێنن، وەدەرنانی ئەو دەجەلانە دەبێت کە لە جێی رونی ئیسلام، ئیسلامیان بە ئەفـسانەو شـتی پروپـوچ بـەرگ پـۆش کردووە، بە ناوی ئیسلامیشەوە جەماوەر بێ ئاگا دەکەن .

دەروێشیەك (کە لەسەر بنەمای خەرافیات و ئەفسانە بنیـات نـرا بێت) لە گۆڕەپانی ئیسلامدا پلـەو پاییـەکی نابێـتو لـە دەوڵـەتی ئیسلامی خاوەنی کارێك نیە، ئەمانە لە میسردا زۆر زۆرن.

پیـاوە ئاینیـە پیـشەگەرەکان ئـەزانن لـە کۆمەڵگـە دەرەبـەگیو سەرمایەداریەکاندا پیشەیەکی سەرەکیان هەیە، پیشەیەك کە دەوڵەت

گوزەرانیانی پێ دابین دەکا، لـە کۆمـەڵگـەش سـودی لـێ دەبینن‌و کەسابەتی پێوە دەکەن..

ئەمە پیشەی سرکردن‌و هەڵخەڵەتاندنی جەماوەری زەحمەت کێش‌و کرێکارو چاوساوەو بـێ بەشـە، بـەڵام کاتێـك ئیـسلام فـەرمانڕەوایی دەکات، ئەوا مافی ئەو خەڵك‌و جەماوەرە دەدات، دەستی هەلپەرست‌و زۆردار دەگرێ‌و دەوڵەمەندی لە رادەبەدەرو نادروستانە سنوردار دەکات، کە تەنها بە بوونی، ئازاری دەرونی بێ بەش‌و نەدارەکان دەدات ..کاتێك ئەمە بەدی دێت کاری ئەو پیشەگەرانە لە کۆمەڵگەدا چـی دەبێـت؟ پلەو پایەیان چیە لە دەوڵەتدا؟ کاریان چی دەبێت لەگەڵ جەماوەردا؟

ئایین کردنە پیشەو کەسـابەت پێـوەکردنی بەشـێکە لـە سـستمە کۆمـەڵایەتیـە کەلێنـدارەکان، بەشـێکی سـەرەکیە لـە دەزگاکـانی فەرمانرەواییەتی تیایدا، جا ئەگەر ئەو بارودۆخانە تەندروست کـران‌و ئەو دەزگایانەش ساغ‌و چاك کران، ئایین کردنـە پیـشە بـێ خواسـت‌و پێویستی دەبێت، چونکە خودی ئاین دەبێتـە کـارو رەفتـارو سـستم‌و کۆمەڵگە، تەنها چەند گوفتارو دروشم‌و دەمەلەرێ و تەرتیل نابێت.

ئەوە راستییەکی روون‌و ئاشکرایە ئەو پیشەگەرانە بەبیرو بۆچـون‌و ژیریەکانی خۆیـان لێـی تێناگـەن، هەرچـەندە ئـەوان بـە هەسـت‌و سروشتیان تێی دەگەن، ئەوان بەم کارەیان سود مـەنـدو هەلپەرسـتن‌و مەترسـی فـەرمانرەوایی ئیـسلام هەسـت پـێ دەکـەن، کـەمترین مەترسییەکی بۆ ئەوان بێنیـازبوونی ئیـسلامە لـەو خزمەتگوزاریـە

سلبی یەی کەلەگەڵ ڕێنمایەکانی ئیسلامدا ناتەبایە).[1]

بەهەمان شێوە سەید قوتب ڕوو بــە ڕووی دەســەڵات بــوەوە، پــاش بەرپابوونی ئەو شۆڕشەی گومانی وابوو کە کار دەکات بۆ بەدیهێنانی ئەو چاکسازیەی بەڵێنی پێ دابوو، هەر بۆیە کیتــابی مەشــخەڵی ڕێ (معالم في طريق)ی دانا کە تیایدا تەئکیدی کردەوە لەسەر نــەفامێتی ئەو سیستەمانەی فەرمانڕەوای ناکــەن بــەو قورئانــەی خــوای گــەورە دایگرتــووە و هــەروەها جــەختی کردوەتــەوە لەســەر نــەفامێتی ئــەو کۆمــەڵگایانەی ڕازی دەبــن دادوەری ببنــە دەرەوەی شــەریعەتی خــوای گەورە، گوتاری سیاسی نوێی گۆڕێنراو نەیتوانی بــە بەڵگــە ڕوو بــە ڕووی بەڵگە ببێتەوە، هەر بۆیە دەبوو هێز بەکار بهێنێ بۆ نــەهێڵان و زاڵ بوون بەسەر ئەم فیکرەو بیروبۆچونەدا، هەربۆیە سەیدی شەهیدیان لە سێدارە دا، ئەو سەیدەی بەردەوام و پێش و پاش شۆڕش بــەرگری لــە گەل و ئایین و ئازادیەکان و مافەکانی گەل دەکردەوە، بــەڵام گــەل بــۆی نەگریا هەروەك بۆ بکوژە زۆردارەکەی گریا؟!!

پاش لە سێدارەدانی سەید قوتب بیــست ســاڵی نەخایەنــد بزاڤــی ئیسلامی جیهانی عەرەبی لە گوتارە سیاسیەکەی پاشەکــشەی کــردو بڕیــاری پــەرگێری و زیــادە ڕۆییــدا بەســەر بیروبۆچــونەکانی ســەید قوتبدا؟!! بزاڤی ئیسلامی لە نێوخۆیدا دەستی کرد بە پەرت بوون لە

---

(١) معركـة الإسلام والرأسمالية، ل (٩٨-١٠٦).

کاتێکدا پێویست بـوو هەڵوێـست بگرێتەبـەر سـەبارەت بـە ڕژێمـە فەرمانڕەوا ستەمکارەکان. وە دەستی کـرد بـە چاکـسازی نـاوخۆیی و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ڕژێمە پاشـایی یـا سـەربازیەکاندا بەمەبەسـتی ئەوەی بتوانێ ئاراستەی بکاتو بەرووبومی ئەم هاوپەیمانێتییە بخاتـە خزمەتی پرۆژەی چاکسازی ئیسلامی تاوەکو ئومەت دەرباز بکات لەو قەیرانەی تێی کەوتووەو ڕاپەرینی پێ بەدی بهێنێ؟! بەڵام ڕژێمـەکان زیرەك و بەتوانا تر بوون لە بزاڤی ئیـسلامی، هـەر بۆیـە ڕژێمـەکان توانیان ئەم بزوتنەوانە بخەنە خزمەتی خۆیانەوەو لێرەشەوە شـەرعیەت بدەنە هەڵسوکەوتەکانیان، بـێ ئـەوەی بزاڤەکـە شـتێك لـە ئامانجـە ستراتیجیەکانی بەدی بهێنێ، وای گومـان برد کردنەوەی بوار بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی تەوژمی شیوعی یا لیبـرالی لەمـەولا لـە بەرژەوەنـدی پرۆژە ئیسلامیەکەی دەبێت، بەڵام ئەوە بەدی نەهات، بـەڵکو هـەموو ئەوانەی پێی هەسـتا بـەدیهێنانی بەرژەوەنـدی ڕژێمـە سـتەمکاریو زۆرداریەکان بوو، کە هەر زوو وازی لە بزافی ئیـسلامی هێنـا پـاش ئەوەی ئەرکی خۆی بینی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بڵاوبونەوەی شیوعیەت، پاشـتریش هـەر ئـەم بـووە قوربـانی پـاش ئـەوەی ئیـستعماری نـوێ فەرمانەکانی دەرکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم بزاڤە؟!

لە ڕاستیدا ئەم هاوپەیمانێتیانە لەسەر حسابی مافو ئازادییەکانی گەلان بـوو، بـە بیـانوی کـارکردن لەگـەڵ ڕژێمەکانـدا لـە پێنـاوی گەڕانەوەی سەرلەنوێی ژیانی ئیسلامیو پیادەکردنی شـەریعەت لـە

ڕێی ئەو هاوپەیمانێتیەوە کە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی متمانەی گــەلانی موسڵمان پاش ئەوەی بوو بە هاوپەیمانی ئەو ڕژێمانەی پیادەی زۆرداری سیاســیو ســتەمی کۆمەڵایــەتی دەکــەنو لــە لایــەن ئیــستعماری ڕۆژئاواییەوە بەڕێوە دەبرێنو ئاراستە دەکرێن، لە راستیدا گرنگی دانی بزاڤی ئیسلامی بە مافەکانی مرۆڤو بە مافو ئازادییەکانی گەلان لە پاشەکشەدا بوو، بە بیانوی کارکردن لە پێناو گەڕانــەوەی شــەریعەتی ئیسلامیدا؟!

وە چاو پۆشرا لە زۆر رەفتارو تاوانو خراپەکاری ئەم ڕژێمانە دژ بــە گەڵو هاوڵاتیان بێ ئەوەی ئەم بزاڤە بە شێوەی پێویست لە حەقیــەتی ئەم ئاینەو سروشتو ئامانجو مەبەستی شەریعەتەکەی تێ بگەن کــە بریتیە لە جێبەجێکردنی دادگــەریو ئــازادی و پاراســتنی ئاسایــشی تاکو کۆمەڵگەکان، وە کارکردن لە پێنــاوی پیــادەکردنی شــەریعەتدا دەخوازێ دەستپێشخەری بکرێ بۆ پاراستنی ئازادییەکانی تاکو مافــە سیاسیو ئابوریەکانیانو پاراســتنیان چــونکە ئەمانــە لــە گــرنگترین سەرەتاکانی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامین.

هــەروەها بزاڤــی ئیــسلامی لــە هەشــتاکانی ســەدەی بیــستەمەوە هەوڵیدا گوتاری سیاسی تەئویلکراو بگێڕێتەوە کە خزمەتی قۆنــاغی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ڕژێمەکانی ئەوکات دەکرد، هەر بۆیە دەستی کرد بە قسەکردن لەسەر حەرامی ڕاپەرینو دەرچــوون دژ بــەو ڕژێمانــە بــا خراپەکاریو دارزاوی لە هەرئاستێکدا بێت بە بیانوی ئەوەی دەکرێ لە

ناوەوە چاکسازی بکــرێ یــاخود بــە ڕێگەیــەکی ئاشــتیانە چاکــسازی بکرێ؟!

هەروەها هەڵوێستو گوتارەکان دەستیان بە گۆڕان کرد، وای لێهات وەلاخستنی شەریعەت لە واقیعی ژیانی موسڵمانان نەبووە هۆی ئەوەی ڕژێمەکان شەرعیەتی بوونو بەردەوام بوونیان لە دەست بدەن، تەنانەت وەسفی ئیسلام و موسڵمان بونیشیان لە دەست نەدا؟! ئەوان دەوڵەتو حکومەتی ئیسلامین، هەرچەندە شەریعەتی ئیسلامیان کەنار خستوەو دژایەتی ئەحکامو بانگخوازانی دەکەن زەبرو هێزیش لەو حکومەتانەدا بۆ ناموسـڵمانەکانە؟! زۆرێـك لــە بــانگخوازانی بزاڤــی ئیــسلامیو زاناکانی لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی دا بوونە خزمەتکارو دەرگاوانی ڕژێمە فەرمانڕەواکان، لە خزمــەتی خۆیانــدا بــەکاریان دەهێنــێ بــۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو بزوتنەوانەی نەیاری سیاسی بوون بــەو بزوتنــەوە ئیسلامیانەشەوە کە پەسەندی نیە هاوپەیمانێتی لەگەل ئەو ڕژێمانەدا گرێ بدرێ لەبەر چەندین هۆکاری شەرعی زۆر؟!

بزاڤی ئیسلامی لە ژێر پەستانی واقعدا پەنای بــردە بــەر گوتــاری سیاسی تەئویلکراو لە پێناوی سەلماندنی شەرعیەت پێدانو دروســتی هەڵوێــستەکانی، بــەبیانوی ئــەوەی دەرچــوونو ڕاپــەڕین جگــە لــە کاولکاریو وێرانی شتێکی بۆ ئومەت بــەدی نــەهێناوە، وای لێهــات دڵشاد بوو بەم خستنە ڕووە نوێیە، لەگەڵ ڕەچــاوکرنی ئــەو جیاوازیــە گەورەیەی لە نێوان بــارودۆخی ســەرهەڵدانی گوتــاری تــەئویلکراو و

بارودۆخی ئێستادا هەیە چونکە لە سـەردەمی سـەرهەڵدانی گوتـاری تەئویلکراودا خەلافەت بەرپا بوو ئالاکانی جیهاد بەردەوام دەشەکانەوە، شـەریعەت فـەرمانڕەوا بـوو، ئەمـەش وای کـرد خراپەکارییـەکانی راپەرینو دەرچوون گەورە تر بێت – لـە کاتێکـدا ئێـستا شـەریعەت کەنار خراوەو جیهاد لە کار خراوەو ئومەت و بەرژەوەندییەکانی دراوەتە دەست هێزە ئیستعماریەکان؟!

سەرئەنجام ئەم بزوتنەوە ئیسلامیانە لەگەڵ ڕژێمەکاندا لـە زۆربـەی وولاّتانـدا پێکـەوە دەژیـن بێ‌ئـەوەی ئامـانجێکی ڕوونو ئاشـکرا یـا نەخشەیەکی ستراتیجی یا پرۆژەیەکی چاکسازی هـەبێت، بـەڵکو وای لێهاتووە گەورە سەرکردەکانیان بە بەرچاوی خەڵکو جـەماوەرەوە بڵـێن کە ئەوان هەوڵ نادەن بۆ دەسەلاّتو مەبەستیان نیە ڕژێم بگۆڕن؟!

ئەمە لە خودی خۆیدا راگەیاندنی ئیفلاسبوونی ئەو بزوتنەوەیەیـە لە رووی سیاسیو فیکرییەوە و پاشەکشەیەکی ترسناکە لـە گوتـاری سیاسیدا .

بزوتنەوەی ئیـسلامی و سـەرکردەکانی تـەنها بـە ئەوەنـدە وازیـان نەهێنا بەڵکو بیریارەکانی دەستیان کـرد بـە نوێخـوازی لـە گوتـاری سیاسیدا لە شوێنێکدا کە قابیل بە نویْخوازی نیە، روخانو کاولکاری ئەنجام دەدەن بە گومانی ئەوەی بنیاد دەنێن، وایان لیْ هـاتووە چـەندین بیروبۆچوونی وەها دووبارەدەکەنەوە کە خزمـەتێك بـە بزاڤـی ئیـسلامی ناکاتو لە هەمان کاتدا خودی ئاینش کاول دەکـات، وەك قـسەکردن

سەبارەت بەوەی دروستە سەرۆك لە دەوڵـەتی ئیـسلامیدا ناموسـڵمان بێت؟! وە دەکرێ ئافرەت ئیمامی گشتی موسڵمانان بێـت؟! وە دەکـرێ قازی ناموسڵمان بێت؟!! دەستیان کردووە بە بەزاندنی کـۆڕا (اجمـاع) بەدەر لەوەی ئەوەی مەبەستیانە بەدی بهێنن، بەگومانی ئـەوەی ئەمـە نوێکردنەوەیە لە گوتاری سیاسیدا، لە کاتێکدا ئەوان لە ژێر سـایەی فەرمانڕەوایی ئەو ڕژێمانەدا دەژین کـە گەلـەکانیان کـەمترین مافـە سیاسیەکانیان دەست نەکـەوتووە ئـیتر واز لـە ئـافرەتو ناموسـڵمان بهێنە، لەژێر سایەی چەندین ڕژێمدا دەژین کـە کـەمترین مافـەکانی مرۆڤ لەوانە، مافی ژیان دەستەبەر نەکراوە، واز بهێنە لەسەر ئـەوەی قسە لەسەر ئیمامەتو قەزا بکەین؟!

هەموو ئەمانە مەودای ئەو قەیرانە فیکریو گاڵتەجاڕیە سیاسـیە بەدەر دەخەن کە بزوتنەوەی ئیسلامی و سـەرکردە نوێخوازەکـانی لـە کاتی لە سێدارەدانی سەید قوتبەوە دەیگوزەرێنن؟!

هەروەها ڕۆژان ئەوەیان سەلماندوە کە بزاڤی ئیـسلامی لـە جیهـانی عەرەبیدا بە ئەندازەی ئەو دڵسۆزیەی کە هەیەتی بـەو ئەندازەیـە بـێ ئامانجە، ئەو ئامانجێکی دیاری کراوی نیە، ئەگـەر چـەندین ئامـانجی هەبێت ئەوا نەخشەکانی روون نین، ئەگـەر نەخـشەشی هـەبێت ئـەوا بەڕێوەبردنێکی توندو تۆڵو بەهێزی نیە، ئەگەر ئەوەشـی هـەبێت بـێ متمانەیە بە سەرکەوتن، هەموو ئەمانە هۆکـاری سـەرەکین بـۆ هـەر پرۆژەیـەکی چاکـسازی، بـەبێ ئەمانـە هـەبوونو نـەبوونی هـەر

بزوتنەوەیەکی سیاسی وەکو یەکە .

لە راستیدا بزوتنەوە سیاسیو فیکرییەکان تـەنها بـۆ گۆڕانکـاری بەرپا دەبن، جا ئەگەر هەر خۆی بنەماو سەرەتای گۆڕانی ڕەفز کـردەوە ئەوا بریارو حوکمی لە سێدارەدانی سیاسی بەسـەر خۆیـدا داوە، ئـەو کاتە بوونەکەشی ئەرکێکی قورس دەبێت لەسەر کۆمـەڵگە. بوونی ئەم بزوتنەوانە لە تێڕوانینی شوێنکەوتوانیدا بووەتە مەبەست نەك هۆکار، سەردەمێکی زۆری بەسـەردا تێپـەڕیوە بێئـەوەی بەخۆیـدا بـچێتەوەو پێداچوونەوەی ئامـانجو نەخـشەو پەیکـەرە رێکخـستنەکانی بکـات، چونکە سەرکەوتن چـەندین هۆکـاری هەیـە ئەگـەر لێـی دواکـەوتی سـەرکەوتن بەدەسـت ناهێنـێ، وە مەبەسـتی خواسـتراویش لەدەسـت دەدەین.

ناکرێ هۆکاری شکستی بزوتنەوەکانی جیهانی عەرەبی بگێڕینـەوە بۆ قەزاو قـەدەر،دڵ خۆشـکەین بـەم راڤـەو لێکدانەوەیـە بـێ ئـەوەی رەخنەیەکی بابەتیانە لە سیاسـەتو نەخـشەو بەرنامـەکانی بگـرین، چـونکە زۆر بزوتنـەوەی تـر لـە جیهانـدا، یـەك لـە سـەردەمی ئـەو قوربانیانەی نەداوە کە بزاڤی ئیسلامی هەیـەتی کەچـی توانیویـەتی ئامانجەکانی بەدی بهێنێت و بگاتە دەسەڵات و پرۆژەی خۆیـشی بـەرپا بکات، لـە کاتێکـدا زۆربـەی بزوتنـەوە ئیـسلامیەکان لـە جیهـانی عـــەرەبیو ئیـــسلامی نـــەیانتوانیوە بگەنـــە ئاســـتی بـــەدیهێنانی ئامانجەکانیان؟!!

ئەمــە لــە کاتێکـدا بزوتنــەوەی شـیعی لــە ئێرانـدا توانیویــەتی هــەنگاوێکی بــاش بنــێ بــۆ بــەدیهێنانی پرۆژەکــەی، پــاش ئــەوەی سەرکەوتوو بوو لە سەرکردایەتی کردنی گەلـی ئێرانی لە شۆڕشێکی میللی جەماوەری مێژووییدا، توانی بـەهێزترین ڕژێمـی زۆرداری لـە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت بڕوخێنــێ، هــەروەها تــوانی ڕژێمێکــی سیاسی بەرپا بکات، کە گەل بـە ویـستی خـۆی بەشـداری بکـا لـە هەڵبــژاردن و لێپرســینەوەی ســەرۆکەکەی، ئێــران تاکــە دەوڵــەتی ئیسلامییە دوابەدوای یەك چوار سەرۆکی لە هەڵبژاردنە ئازادەکانـدا هەڵبژاردووە لە ماوەی بیست ساڵداو بەبێ دابڕان یا زەوت کرنی مافی گەل لە هەڵبژاردنی حکومەتەکەیدا، زیندو کردنەوەو ژیانەوەی فیقهی جەعفەری کە پێشتر ڕووبەڕووی واقیعێکی وەکـو ئـەم واقعـە نوێیـە نەبوەتەوە، وە توانیویەتی ئێران بکاتە دەوڵەتێکی بەهێزی سەربەخۆ لە بریاری سیاسیو سەربازیدا[1] لە کاتێکدا بزوتنــەوەی ئیـسلامی لــە سودان نەیتوانیوە ئەم ئامانجە بەدی بهێنێت پـاش تێپەڕانـدنی پـانزە ساڵ بەسەر دەسەڵات گرتنە دەستی لەو وڵاتەدا !؟

(١) ئەمە ئەگەر بەراوردی جمهوری ئێرانی ئیسلامی بە بارودۆخی جمهوریـەتو پادشا نشینەکانی تر بکەین لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەگینا ڕێگەی دوورو درێژی تر ماوە لەبەردەم جمهوری ئێرانی ئیسلامی دا، چونکە بەردەوام ئەناڵێنی بەدەست ئاڵۆزیو تائیفیـەتو ئـاڵۆزیو گرفتـی ولایـەتی فەیقهـ کـە هـیچ بناغـەو بنەمایـەکی نیـە لـە سیـستەمی سیاسـی ئیسلامیدا کـە لەسـەر راوێـژدا دادەمـەزرێ لـەو شتانەی دەقـی لەسەر نیە

هەروەها بزوتنـــەوە ســـەلەفیە هاوچـــەرخەکانی جیهـــانی ئیـــسلامی نەیانتوانیوە پرۆژەیـــەکی چاکـــسازی بخەنـــەڕوو، بـــەڵکو بـــەردەوام لـــە بازنەیەکی بەتاڵدا دەسوڕێنەوە، دوور لە واقـــعو گەشـــەکردنی ژیـــانی کۆمەڵایەتی و سیاسیو تـــاوەکو ئێـــستەش زاناکـــان مـــشتو مڕیانـــە سەبارەت بە دروستیو نادروستی کاری جەماعی و بەشداری سیاسیو چونە نێو پەرلەمانو پێکهاتنی پارتەکان ..هتد.

ئەمە لە کاتێکدا گەورە زانایـــانی فیکـــری ســـەلەفی لـــە ســـەدەی رابردوودا دەست پێشخەر بوون لە وەڵامدانەوەی تەواوی ئەو پرسیارانە هـــەروەك لـــە نوســـینەکانی رەشـــید رەزا لـــە (منـــار)و عەبـــدورەحمان کەواکیبی لە (ام القری)دا نوسیویانە، هەروەك لە وتارێکی عەلامەی سەلەفی ئەحمەد شاکردا بەدی دەکرێ کە بۆ پیاوانی یاساناسی میسر داویێتی لە ساڵی ١٩٤١ . هەروەکو دەڵـــێ: (بـــەڕێزان ! لـــە راســـتیدا مەدەنیەتی ئەورووپی ئیفلاسی هێناوە، بە هۆی ئەوەی لەسەر پەرستشی مادده بنیاد نراوە، پاش ئەوەی ئەو هەموو تاوانکارییـــەی هێنـــای بـــە سەر وڵاتانی موسڵمانانـدا جیهان دەکوڵێو هەڵدەچێ و پێشوازی دەکا لە چەندین رووداوی گەورە، هەڵگەڕانەوەی بێشومار لـــە چارەنووســـی گەلان بەدی دێت، جا هەر وەکو لە پاش جەنگی رابردوو زانیمان چۆن سەربەخۆیی سیاسی یا زۆربەی بگێڕینـــەوە، ئێـــستەش دەزانـــین چـــۆن تەواوی سەربەخۆیی تەشریعیو عەقڵی خۆمان بگێڕینەوە، بە ویـــستی خوا سەروەری سەربەرزی ئیسلام دەگێڕینەوە .

پیاوێکی ئەندێشە خواز نـیم، بانگەشـەش ناکـەم بـۆ شۆرشـێکی کلّپوکۆ بەسەر یاساکاندا، مـن بـروام وایـە زیـانی توندوتیـژی لـە ئێستادا زیاترە لە سودەکانی، بۆیە هاتومەتە نێوتان تاوەکو بانگتـان بکەم بۆ کارکردنێکی لەسەرخۆیانەی بەرهەم دار، بۆ سـوننەتی پلـە پلەیی سروشتیانە، تابگەینە مەبەستی خۆمـان، بۆئـەوەی یاسـاکانمان لە شەریعەتەکانمانەوە وەربگیرێ، من دەزانم لـە رۆژوو دوو رۆژێـك یـا ساڵو دوو ساڵێکدا بەمە ناگەین .

من بۆ بانگەوازی خوایی بانگتان دەکەم، داوا لـە ئومـەت دەکـەم بگەرێتەوە شورەو پەرژینی ئیسلام،داوای یەکێتی قەزا تەشریع دەکەین، بەپێی حوکمی خوا: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (النور: ٥١)

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْـراً أَنْ يَكُـونَ لَهُمُ الْخِيَـرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْـصِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ فَقَـدْ ضَـلَّ ضَـلالاً مُبِيناً﴾ (الأحزاب: ٣٦)

یاساکان لەسەر بناغەی ئیسلامی دابنێن، لەسەر کیتابو سوونە، پاشان چی دەکەن بیکەن، با فلاّن یاخود فلاّن، فەرمانرەوایی پێبکـا، ئێمە تەنها خوامـان مەبەستە .

ئەی پیاوانی یاسا لە میسردا !

بانگەوازەکەم لەوێوە دەست پێدەکەم، ئێوە خـاوەنی دەسـەلاّتن لـە وولاّتدا، ئەمرو نەهی بەدەستی ئێوەیە، ئەوانەی یاسا دادەنێن، ئێـستا

له لیژنه‌کانی ئێوه‌دا کار ده‌که‌ن بۆ ده‌ستکاری کردن‌و رێکخستنه‌وه‌ی له‌سه‌ر بنه‌ماکانی ته‌شریعی نوێ، وه‌رن به‌ره‌و ووته‌و گوفتارێك که بۆ هه‌موان وه‌کو یه‌که، ده‌ستمان ده‌خه‌ینه نێو ده‌ستمان به دڵسۆزیه‌وه بۆ خوا کارده‌که‌ین، ئێوه له ئێمه شاره‌زا ترن، به نهێنی یاساکان، ئێمه‌ش شاره‌زا ترین له ئێوه به کیتاب‌و سوونه‌و نهێنیه‌کانی شه‌ریعه‌ت ئه‌گه‌ر هاوکاری یه‌کتری بکه‌ین داهێنانه‌ترین شوێنه‌وارو کاریگه‌ریی به‌ده‌ست ده‌هێنن.

وا گومان مه‌به‌ن کاتێك بانگه‌شه‌تان ده‌که‌م بۆ ته‌شریعی ئیسلامی بانگه‌وازتان ده‌که‌م بۆ ده‌ق گرتن‌و پابه‌ندبوون به‌وه‌ی (ابن عابدین) یان (ابن نجیم) وتویانه، یاخود چاولێکه‌ری زانایان له‌و فه‌رعانه‌ی هه‌ڵیان هێنجاوه به‌ده‌ر له‌وه‌ی له کیتاب‌و سوونه‌دا ده‌قیان له‌سه‌ر هاتبێ، زۆرێکیان ته‌نگی‌و ناخۆشیه‌کی زۆری تیادا ده‌بینرێ، نه‌خێر، من ره‌فزی هه‌موو چاولێکه‌ریه‌ك ده‌که‌مه‌وه، جا ئیتر چاولێکه‌ری پێشینیان بێت یا دوایینان پاشان ئیجتهادی تاکه که‌سی (الاجتهاد الفردی) به‌رهه‌مدار نیه بۆ دانانی یاساکان، به‌ڵکو نزیکه بڵێین ئه‌سته‌مه که‌سێك یان چه‌ند که‌سێك به‌و کاره هه‌ستێ.

کاری دروست‌و به‌رهه‌مدار بریتیه له ئیجتهادی به کۆمه‌ڵ، جا ئه‌گه‌ر بیروراکان ئاڵوگۆڕ کران‌و ده‌ستاو ده‌ستیان پێ‌کراو گفتوگۆیان له‌سه‌ر کرا ئه‌وا به ویستی خوا رووی دروست‌و پێکراو به‌ده‌ر ده‌که‌وێ.

نه‌خشه‌ی کرداری‌و عه‌مه‌لی بیروباوه‌ڕی من ئه‌وه‌یه لیژنه‌یه‌کی به‌هێز

له پیاوانی یه‌كه‌یه‌كه‌ی یاساو زانایانی شه‌ریعه‌ت هه‌ڵبژێردرێ، تاوه‌كو ڕێساكانی یاسادانانو ته‌شریعی نوێ دابنێین، بێ ئه‌وه‌ی پابه‌ندبین بـه بۆچونێكه‌وه یاخود ته‌قلیدو چـاولێكه‌ری ڕێبـازو مـه‌زهـه‌بێكی تیـادا بێـت، تـه‌نها ده‌قـه‌كانی كیتـابو سـوننه بـن، ووتـه‌ی پێـشه‌وایانو ڕێساكانی ئسولۆو بیرو بۆچونی زانایانیان له‌به‌ر ده‌ستدا بێ، تێڕوانینو بیروبۆچونه‌كانی ته‌واوی یاسا ناسانیان له پێش چاو بێـت پاشـان لـه فروعدا ئه‌وه‌ی به‌ته‌واو و دروستی ده‌بینین هه‌ڵی هێنجێنین، به‌شێوه‌یه‌ك كه گونجاوو بێت به بارودۆخی خـه‌ڵكیو لـه‌ژێر ڕێـساكانی كیتـابو سونه‌شدا بێتو به‌ره‌نگاری ده‌ق نه‌كاو پێچه‌وانه‌ی شتێك نه‌بێت كه له ئاییندا زۆر روونو ئاشكراو زانراوه.

سه‌ره‌نجام ئاسانكاریو ووردەكاریه‌ك ده‌بیـنن لـه شـه‌ریعه‌ته‌وه، كـه ده‌رونتان پێی سه‌رسام ده‌بێتو دڵتان پڕده‌كات لـه بـاوه‌ڕ، وه ده‌بیـنین ئه‌وه‌ی كه وه‌همتان وایه ببنه كۆسپ لـه ڕێی ته‌شـریعی ئیـسلامیدا ئاسانو خۆش بووه، به‌هۆی هه‌ڵگرتنی كۆته‌كانی ته‌قلید، وه به‌ده‌ستی خۆتان له‌مسی ئیعجازه‌كانی قورئان ده‌كه‌ن و بـاوه‌ڕده‌هێنن به‌راسـتی ئه‌و ئایه‌ته‌ی خـوا كـه ده‌فـه‌رموویێت: ﴿لِكُـلٍّ جَعَلْنَـا مِـنْكُمْ شِـــرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾ (المائدة: ٤٨)

پاشان هه‌نگاوێكی تر هه‌یه كه پێویـسته بنـرێ بـۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌م ته‌شریعه ئیسلامیه دابنرێ:

ئه‌ویش بریتیه له‌وه‌ی له ته‌واوی لیژنه یاساییه‌كاندا پیاوانێـك لـه

زانایانی شەریعە دابنێن، بە یەکسانی لەگەڵ خۆتانـدا، لـە پێـشەوەی ئەو لیژنانە لیژنەی تەشریعیو لیژنـەی پێنوسـی کێـشەکان هـەبێت تاوەکو چەندین یاسا یا فـەتوا دەرنـەکرێ کـە یـەك ناگرێـت لەگـەڵ دەقـەکانی ئایینـدا، یـاخود دژو پێـچـەوانەی بنـەماو سـەرەتاکانی ئیسلام بێت .

لەوانەیە هەندی کۆتو بەند، لە نێوان خۆمانو وڵاتە بیانیەکاندا ببینین لە رووی پەیوەندیو پەیمانەکانەوە، ئەم جۆرە شتانە نابنە کۆسپ لە رێی یاسا دانانماند، هەیانە دەکرێ بە شێوەیەکی سیاسیو ئاسـایی لێك تێگەیشتنی تیـا بـەدی بێـت، هەیانـە رووداوەکـانی داهـــاتوو لایدەبەن و نایهێڵن، دەگمەنێکی دەمێنێتەوە ئەویش لەبەر تەسـکترین سـنوردا گـەمارۆ دەدرێـن، تـا خـوای گـەورە هاوکاریمـان دەکـا بـۆ رامکردنی، پاشان ئەگەر ئەوان لە ئێمەوە عـەزمێکی راسـتگۆیانەیان بینی، بە ئەمری واقع رازی دەبن، بەڵکو ستایشی دەکەن لەسەر پابەند بوونیان پێیەوە، لەبەر ئەوە سەردەمێکە پێشتر تاقیمانکردونەتەوە .

ئەمە بانگەوازی منە بۆ ئێوە، هیوادارم گوێ بیستی لـێکرا بێـت، لە دڵێکی ئارامی پڕ لـە بـاوەڕدا جـێی بووبێتـەوە، ئێـوەن ئومـەت کاروبارەکانی پێ سپاردوون، هیواو ئاواتی پێتانـە، ئەمــەش گومــانی منە بە ئێوە ئینشائەڵا.

بەڵام ئەگەر رازی نەبن و پەسەندتان نـەبێت پـەنا ئـەگرم بـە خـوا لەوەی رازی نەبن – ئەوا پیـاوانی ئەزهـەر، زانـاو پیـاوانی ئیـسلام و

پیاوانی قوتابخانەی قەزاو خانەی زانستەکان (دار العلوم) بانگهێشت دەکەم، بەدەمیشمەوە دێن و قورسایی ئەم کارە گرنگە لە ئەستۆ دەگرن و ئاڵای قورئان بەرز دەکەنەوە، بە دەست و بازووە بە هێزەکانیان، ئەوانەی لە وڵاتانی ئیسلام دا بۆ ماوەی هەزار ساڵ چرای زانستیان هەڵگرت، وە دەتوانن ڕاپەرینی پێ دروست بکەن هەروەك پێشتر تەواوی بزوتنەوە پەرەخوازو پێشکەوتوو خوازەکانی ئوومەتیان ڕاپەراند.

پیاوانی وایان تیادایە کەس پێشبڕکێیان لەگەڵ ناکات لەرووی زانست و لێوەشاوەیی و عەزمەوە، وە هاوکاری ڕاستگۆو دڵسۆز دەبیننەوە، لە ئێوەی پیاوانی یاساو لە تەواوی چین و توێژەکانی ئوومەت.

ئا لەو کاتەدا ئەو ڕێگەیە دەگیرێ کە دەمانەوێ بۆ سەرخستنی شەریعەت بیگرینە بەر، ڕێگای دەستوری ئاشتیخوازانە بۆ ئەوەی بانگەوازەکەمان لە ئومەتدا بڵاو بکەینەوە و هەوڵی بۆ بدەین و ئاشکرای بکەین، پاشان لە هەڵبژاردندا ئێوە دەکەینە نوێنەرو هەڵتاندەبژێرین، ئومەت دەکەینە دادوەر تیایدا، ئەگەر جارێك شکستمان هێنا چەند جار دەیبەینەوە، بەڵکو ئەو شکستەمان – ئەگەر یەکەم جارمان شکستمان خوارد – دەیکەینە پێشەکیەك بۆ سەرکەوتنمان بە شێوەیەکی وا ورەمان بەرزبکاو ویست و بڕیارمان وە ئاگا بێنێتەوە، وە بەوەی ببێتە بەرچاو روونیەك بۆ زانینی پێگەو

شوێنی هەنگاو و هەڵەکانمان، وە بەوەوی کارەکانمان تەنها بۆ خواو لە پێناوی خوادا بێت، جا ئەگـەر ئومـەت متمانـەی پێمـان هـەبوو، وە بانگەوازەکەمانی بەدڵ بوو، وە ئەوەی هەڵبژارد کـە فـەرمانڕەوای بـە شەریعەتەکەی بکرێت و وەك گوێڕایەڵیەك بۆ شەریعەت، وە لە ئێمـە نوێنەرەکانی ناردە پەرلەمان، ئەوکات ڕێگەی ئێمـەو ئێـوەش ئەوەیـە رازی بین بەوەی دەستور بڕیاری لەسەر دەدات، لێرەوە رەشمەی دەسەڵات دەگرینە دەست، بەو شـێوەیەی هـەموو حیزبـەکان دەیکـەن، ئەگـەر یەکێکیان لـە هەڵبژاردنـدا دەرچـوو، پاشـان خـوا ویـستی لێ بێـت ئەمەکدار دەبێت بەو بەڵێنانەی بە قەومەکـەی خۆمـان داوە، لـەوەی هەموو یاساکان وا لێ بکەین لە کیتابو سونەوە سەرچاوەی گرتبێ .

لە موژدەو ئاماژەکانی سەرکەوتن -گەر خوا مۆڵەتی دا- ئەوەیـە دەبینین زۆر کەس لە خاوەن بیرو راکان هـەمان قـسەی ئێمـە دەکـەن، هیوا خوازن بانگەوازەکەیان گوێی لێگیراو وبیستراو بێت، وە دەخوازن ئومەت بگەڕێتەوە بۆ ئاین و شـەریعەتەکەی خـۆی، وە هەنـدێك لـە ڕێکخراو و کۆمـەڵە بەهێزەکان ئەم مەبەسـتەی کردووەتـە گـرنگترین مەبەستو ئامانجی.(١)

لەم ووتارەدا عەلامەی سـەلەفیو قـازی شـەرعیو فـەرمودەناس (ئەحمەد شاکر) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕێگـەی بـەدیهێنانی

(١) الكتاب والسنة يجب ان يكونا مصدر القوانين في مصر، (٢٨-٣٥).

پرۆژه چاکسازییه‌که‌ی بریتیه له ڕێگه‌یه‌کی ده‌ستوری ئاشتیخوازانه به دروستکردن‌و پێکهێنانی پارتی ئیسلامی سیاسی، که کار بکات بـۆ به‌دیهێنانی ئه‌م ئامانجه له میانه‌ی گه‌یشتن به په‌رله‌مان‌و له ڕێگـه‌ی هه‌ڵبژاردن‌و متمانه پێدانی ئومه‌ته‌وه له‌مه‌وه بتوانێ ره‌شمه‌ی ده‌سه‌ڵات له حیزبه‌کانی تر وه‌رگرێ هه‌روه‌کو ده‌ستوری میسری ئـه‌و کاتـه ڕێی پێداوه‌و بریاری له‌سه‌ر داوه.[1]

هه‌روه‌کو گه‌وره زانایانی فیکـری سـه‌له‌فی فتوایـان داوه له‌سـه‌ر دروسـتی چـوونه پـاڵ و بوونـه ئه‌نـدام‌و کـارکردن له‌گـه‌ڵ پارتـه سیاسیه‌کاندا – ئه‌گه‌ر عه‌لمانیش بن – به مه‌رجێ موسـڵمان بتـوانێ کاریگه‌ری تیادا دروست بکات وه به شێوه‌یه‌کی ئیسلامیانه ئاراسته‌ی بکات، هه‌روه‌ك له فه‌توای لیژنه‌ی به‌رده‌وامی فه‌توادا هاتووه سه‌باره‌ت به (هه‌ڵوێستی موسڵمان له حیزب‌و پارته سیاسـیه‌کاندا، پرسـیاری چواره‌م له فه‌تواکه ژماره ٦٢٩٠)

پ٤/ هه‌ندێ له‌و که‌سانه‌ی که موسڵمانن، به‌ڵام ده‌چـنه نێـو پارتـه

(١) هه‌ڵوێستی شێخ ئه‌حمدشاکر له ده‌ستور که بریتی یه له گرێبه‌ندو به‌ڵگه نامه‌یه‌کی سیاسی که سه‌ڵاحیاتی ده‌سه‌ڵاته‌کان له ده‌وڵه‌تدا دیاری‌و ڕێك ده‌خات ناکۆك نیه به‌و هه‌ڵوێسته‌ی هه‌یه‌تی سه‌باره‌ت به یاسا ده‌ستکرده‌کان (القوانین الوضعیة) که شێخ شاکر دادوه‌ری بۆ بردنی به کوفر داده‌نێ و ده‌رچوونه له بیروباوه‌ڕ له‌به‌ر ئه‌و جیاوازییه‌ی له نێوان سروشتی هه‌ر یه‌که له ده‌ستورو یاساکاندا هه‌یه که ته‌نها زانا گه‌وره‌کان تێی ده‌گه‌ن سه‌یری ئه‌و نوسینه بکه که ئێمه نوسیومانه سه‌باره‌ت به (البیان فیما اشکل علی مجلة الفرقان) ژماره (٥).

سياسيه‌كانه‌وه، ئه‌و پارتانه‌ش يان پاشكۆو شوێنكه‌وته‌ى رووسيان يا ئه‌مريكان، ئه‌و حيزبانه جـۆراو جـۆرو فـره‌ن، نمونـه‌ى پـارتى پێشكه‌وتن‌و سۆسياليستى (حـزب التقـدم والأشـتراكية) پـارتى سه‌ربه‌خۆيى (حزب الاسقلال) پـارتى ئـازادى (حـزب الاحـرار)، پارتى ئومه‌ت (حزب الامة)، پارتى لاوانى سه‌ربه‌خۆ خواز (حزب الشبيبة والإستقلال) پارتى ديموكراسـى (حـزب الديمقراطيـة) هتد...و تاچه‌ندين پارتى تر كـه نزيكـى هه‌يـه لـه نێوانيانـدا، هه‌ڵوێستى ئيسلام چيه سه‌باره‌ت به‌و پارتانه، وه سـه‌باره‌ت بـه‌و موســڵمانانه‌ى ده‌چــنه نێــو ئــه‌و پارتانـــه، ئايـــا ئيـــسلام‌و موسڵمانێتييه‌كه‌ى دروست‌و ته‌واوه؟

و٤/ هه‌ركه‌ســێ بـه‌رچـاو روونيـه‌كى هه‌يـه سـه‌باره‌ت بـه ئيـسلام‌و باوه‌ڕێكى به‌هێزو حه‌سانه‌يه‌كى ئيـسلاميانه‌ى هه‌يه‌و دووربينـى‌و گريمانه‌ى پێـشهاته‌كان ده‌كـاو ڕه‌وانبێـژو زمـان ڕه‌وانـه، له‌گـه‌ڵ ئه‌وه‌شدا به‌توانايه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ى كار لـه ڕه‌وتـى حيزبه‌كـه بكـاو ئيسلاميانه‌ش ئاراسته‌ى بكا – ئه‌وه بـۆى هه‌يـه تێكـه‌ڵى ئـه‌و حيزبانـه بكـات، يـاخود تێكـه‌ڵى ئـه‌وه‌يان بكـات كـه هيـواى په‌سه‌ندكردنى ره‌واى هه‌يه، به‌ڵكو ئه‌مـه خودايـه سـوديان پـێ بگه‌يه‌نێ، وه له‌سه‌ر ده‌ستى‌دا ئه‌وه‌ى خوا بيه‌وێ ڕێنمايى وه‌رگرێ‌و واز له ره‌وته سياسـيه لاده‌ره‌كـان بهێنـێ و بـه‌ره‌و سياسـه‌تێكى شه‌رعى دادگه‌ر هـه‌نگاو هـه‌ڵگرێ، كـه بـه هۆيـه‌وه كاروبـارى

ئومەت تۆکمەو پوخت بێـت، بەمـەش ڕێگەیـەکی مامناوەنـد و
ڕاستو ڕەوان بگرێتە بەر، بەڵام پابەند نەبێت بە بیروباوەڕو سەرەتا
لادەرەکانیانـــەوە، هەرکەســـەش ئـــەو بیروبـــاوەڕەی نیـــە و ئـــەو
خۆپارێزیەیی لەباردا نیە، ترسی ئەوەی لێ بکـرێ بکەوێتـە ژێـر
کاریگەریەوە نەك کارگەری هەبێت، با کـەنارگرێ لـەو حیزبانـە
وەك خۆپارێزیەك لە ئاژاوەو فیتنـەو پارێزگاریـەك لـە ئاینەکـەی
نەوەکو توشی هەمان شتی ئـەوان ببێـت وە هـەمان ئـەو لادانو
خراپەکاریانەی ئەوان پێوەی دەتلێتـەوەو گیریـان خـواردووە پێـوە
توشی ئەمیش ببێت .
خوا هاوکار بێت، درودی خـوا لەسـەر پێغەمبـەرمان موحەممـەدو
کەسوکارو هاوڕێو هاوەڵانی.

لیژنەی بەردەوامی توێژینـەوە زانستی یەکان و فەتـوادان.

| | |
|---|---|
| عەبدولعەزیز کوڕی عەبدوڵلای کوڕی باز | سەرۆك |
| عەبدولرازق عەفیفی | جێگری سەرۆك |
| عەبدوڵلای کوڕی غەدیان | ئەندام |
| عەبدوڵلای کوڕی قەعود | ئەندام[1] |

لە ڕاستیدا گوتارەکـەی عــەلی عەبـدورەزاق سـەرکەوتوو بـوو لـە

---

(١) فتاوى اللجنة الدائمة ١٢/٣٨٤-٣٨٥

بەزاندنو دزەکردن بۆ نێو فیکری ئیسلامی بە گشتی و ســەلەفی بــە تایبەتی کە لە هەموو فیکرەکانی تر زیــاتر ڕەفــزی دەکــرد، چــونکە لەکار خستنی فەرمانڕەوایی بەو قورئانەی خوا دایگرتووە کارکردن بە یاسا دەستکردەکان لای ئــەو فیکــرە کوفرێــك بوولــە بیروبــاوەڕ پــێی دەردەچوێ، هەروەك پشتیوانی دوژمنانی ئومەتو جیهاد کردنیان بــە هەڵگەڕاندنەوە و هەڵوەشاندنەوەیەك دادەنــا لــە هەڵوەشــێنەرەوەکانی ئیسلام.[1] وای لــێ هات بابــەتی (خەلافــەت، شــەریعەت، جیهــاد) کرایە دەرەوەی بازنــەی گرنگــی پێــدانی زۆربــەی زانــاو بــانگخوازانی فیکری ســەلەفی هاوچــەرخ بــە بیــانوی گرنگــی دان بــە بیروبــاوەڕو عەقیدەوە؟!!

سەرئەنجام ئەم مەسەلانە بوو بە شتێکی قەدەغەکراو یا لاوەکی لە ئەدەبیاتی ئەم فیکرەدا، بەڵکو لادانەکــە زیــاد بــوو گەیــشتە ئــەوەی جیهاد بە تیرۆرو تۆقان دابنرێ؟! کارە شەهادەت خوازیەکانیش بە خــۆ کوژی؟! وە بانگەشەی گەڕانەوەی خەلافــەت یــا کــارکردن لــە پێنــاو بەرپاکردنی دەوڵــەتی ئیــسلامی یــاخود ڕاگەیانــدنی ڕەوا بەرامبــەر زۆردارو ستەمکاران دەرچوون بێ لە گوێڕایەڵی و سوونەت؟!

کار گەیشتە ئەوەی لەکار خستنی حوکمەکانی شەریعەت بەگشتی، تــەنها تاوانبــاریو فیــسقەو لــە ئیــسلامو موســڵمانێتی دەری ناکــاو

---

(١) سەیری فەتوای علامة (ابن عتیق ) بکە سەبارەت بەم بابەتە لە (مجموعة الرسائل النجدیة)، (٧٤٥/١).

پێویستی بە درچوونو ڕاپەڕین نیە؟!! خۆبەدەستەوە دانو تەسلیم بوون بە دوژمنانی ئوممەتو جێبەجێکردنی نەخشەکانیانو دانانی بنکە سەربازیەکانیان لەسەر زەمینی ئیسلام دا کارێکی دروستە بە بیانوی ئەوەی پەیمانیان هەیەو (معاهد)ن، تێڕوانینی کاروباری ئەوان لە پسپۆڕیو تایبەتمەندی سوڵتانو دەسەڵاتدارە، حەرامە دەستی تێوەردرێتێ ڕەخنەی لێ بگری، یا خەڵکی لێ بورووژێنی.[1]

هەروەها حەرامە کۆمەڵەو گروپ بەرپابکرێ بۆ جێبەجێکردنو ڕاپەڕاندنی فەرزە کیفائیەکان، وە حەرامە خۆهەڵقورتێنیتە کاروباری سیاسی بە بیانوی ئەوەی ئەمە نەیارو ناکۆکە بە بەرنامەو ڕێبازی سەلەف؟!

ئەمە لە کاتێکدا لە نێو سەلەفیەکانی پێشودا کەسی وەکو عەلامە موحەمەد بەشیری ئیبراهیمی جەزائیری هەبووە، کە پاش (ابن بادیس)ی دامەزرێنەر، سەرۆکی کۆمەڵەی زانایانی جەزائیر بووە، بەم وتەیەی لەگەڵ ئیستعماری فەڕەنسیدا دەئاخفێ: (ئیستعمار چ

(١) هەروەکو ئیستعماری فەڕەنسی لە جەزائیردا توانی بزوتنەوەی سۆفی بخاتە خزمەت نەخشە ئیستعماریەکانیەوە لە سەدەی ڕابردو هاوپەیمانێتی لەگەڵ ببەستێو دژ بە براڤی ئازادیو جیهادەکە زانا دڵسۆزەکانی ئەوێ بانگەشەیان بۆی کرد، هەروەکو چۆن هێزە ئیستعماریەکان لەمڕۆدا توانیویانە لە دوورگەی عەرەبیدا زۆربەی براڤی ئیسلامی بانگخوازانی سەلەفی بخاتە خزمەتی نەخشەکانی خۆیەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی تەواوی ئەو کەسانەی داوای دەرکردنی بوونی سەربازیانەی بیانی دەکەن ؟!!

گومانێکی بە کۆمەڵەی زانایان هەیە؟ ئایـا گومـــانی وایــە کـول‌و لاوازو بێزار دەبێت‌و دادەمرکێتەوە؟ نەبــەخوا، بەراســتی هیــوا بــڕاوەو تیرەکەی نەیپێکا، کەسێ شەکەت‌و کول دەبێت کــە دوو دڵ بێــت لــە کاروباری خۆی، کوێر بێت لە ئاست کارەکانی .. بەڵام ئەگەر سوور بێ لەسەر ئەوەی ئاینەکەی ئێمە بکاتە بەشێك لە سیاســەتەکانی خــۆی، ئەوا دەیبەینە ئەو گۆڕەپانەی دەیەوێ و بۆ خۆی هەڵی دەبــژێرێ، ئــەو کاتە کەتیبەکانی سیاسەت بە تەسکترین ڕێڕەو و گوزەرگەدا دەبــەین، دەستکەوت‌و مافەکانی خۆمانی لێ دەست دەخەین، بــە ویــستی خــوا لەجێی خراپی گومانی ئــەودا دەبــین، لــە شــوێنێکدا دەمانبینــێ — هەروەك ناسیومانێتی کە پێی ناخۆشە نە لە شــوێنێك پــێی خــۆش بێت، پاشتر تێگەیشتنێکی نوێی فێر دەکــەین، کــە ئــەویش بریتیــە لــــەوەی زەوی جــەزائیر تەنانــەت گرتوخانەکانیــشی مزگــەوتن بــۆ بەرپاکردنی نوێژەکان، وە هەموو دارو چڵێکی تەنانەت سێدارەکانیشی دوانگەی ووتارو جێگەی ووتار بێژ بوون، وە تەواوی ئــەو تاوێرانــەی(*) تێیدایە جێگــەی بانگــدان‌و (الله اکبر) لــێ بەرزدەبێتــەوە، پاشــتر پێشانی دەدەین کــە ســەرئەنجامی دەســتدرێژی کردنــە ســەر ئیــسلام نالەبارو زیانبەخشە.

ئێمە لەو کاتەوەی دروست کراوین سیاسین، لەبەر ئەوەی هــەر لــە

(*) تاوێــر: بریتیە لە بەردی تەخت و گەورەی ڕەساسی و بۆرباو (وەرگێڕ)

پێگەشـــتنمانەوە موســـڵمانین، ئیـــسلامی دروســـت بـــە هـــەموو دیاریدەکانیەوە بریتیە لە سیاسەت لە بەرێزترین روکاریدا، موسڵمانی رێـــك‌و راســـت پـــاڵیوراوێکی خواییـــە بـــۆ بـــەرێکردنی کارەکـــان و قورسکردنی تای چاکەی تەرازوو، ئەگەر هەندێ لـە ئێمـە نووسـتبێ بەمەش سەرکردایەتی لێ سەنرا بێت پاشان سـەروەرییان لێ دەرهێنـرا بێت، ئێمە خوا حەز بکات — بریتی‌و گوناه و پەتی دەوارین.

ئێمـە سیاسـین بـە سروشـت‌و پێگەیـشتن، ئێمـەین هەسـتەکانمان هێنایەوە هۆش بەو مافە خواییـەی زەوت کـراوە، هەرکەسـێ رێـڕەوی سیاسـەت بگـرێ لەسـەر رێنمـانی ئێمـە دەڕوا، هـەر هاوارێـك لـەو نێوەندەدا بەرزبێتەوە دەنگدانـەوەی هاوارەکـانی ئێمەیـە، بـەڵام ئێمـە نامانەوێ شتێك تێکەڵ بکەین کـە هـەموو هۆکارەکـانی رەوایـە بـە شتێك هەندێ هۆکاری ناڕەوای تیادایە، وە جیایی دروسـت کـەین لـە نێوان ئەو شتانەی مشت‌ومڕی تیادا نیە، ئێمە دەمانەوێ لـە بنـەمای هەموو سیاسەتەکانەوە دەست پێ بکەین کە بریتیە لە ئایین، تـاوەکو هەموو ئەو شتانەی لەسەر بنیات بنێین کە لە پاشیەوە دێت، تـاوەکو ئاشتی‌و ئاشـتەوایمان بـە موسـڵمانانە بێـت، شـەڕو ناکۆکیمـان لـە کاتێکدا بێت کە موسڵمان بین، دۆستایەتی یـان دوژمنایـەتیمان لـە کاتێکـدا بێـت کـە موسـڵمانین، بـە ئیـسلامەتیمان دەسـتەبەری هاوکێشەکە دەکەین تەنانەت لەگەڵ مافەکانی خۆشماندا، هەرکەسـێ لە نەوەکانی خۆمان دوو دڵە لە دانایی و حیکمـەت رەفتارمـان، ، بـا

بڕوانێته توندوتیژی ئیستعمار لەگەڵماندا وە توندوتۆڵی لەوەدا، زیادە ڕۆیی ئەو لە دوژمنایـەتیو سـتەمکاری لەگەڵمانـدا لەبـەر ئەوەیـە موسڵمانین، وە لەبەرئەوەی ئەم ئیسلامە سەرچاوەو کانیـاوی هێزێکـە لاوازی دەکوژێ، روحانیەتێك برەو پێ دەدا مادەی پێ مل کـەچ دەبـێ، ئایا نابێت لە بەرامبـەری ئـەو (پابەنـدی)ەی ئـەو مەبەسـتێتی بـە پابەندیەك لە لایەن ئێوەوە بەو واتایەی خوا دەیەوێ ئەنجام درێ؟

ئێمە سیاسین لەبەرئەوەی ئاینەکـەمان سیاسـەت بـە بەشـێك لـە بیروباوەڕ دەزانێ، وە لەبەرئەوەی سەردەمی ئێمـە سیاسـەت بـە ژیـان دەزانـێ، وە لەبەرئـەوەی نیـشانەی پاڵەوانێتیـە، وە لەبەرئـەوەی بارودۆخـەکان سیاسـەت دەکەنـە ئاووهـەوا بۆژیـان، وە لەبەرئـەوەی سیاسەت جۆرێکە لە جیهاد، ئێمەش بە سروشت موجاهیدو سیاسین، وە لەبەرئەوەشی ئیستعماری فەرەنسی بەهۆی ستەمو زۆرداریەکانیەوە، تەنها دوو بەرهـەمی چـێنا: ڕقـی هـەموو جەزائیـرییەك تەنانـەت منداڵەکانیش لە فەرەنسا، وەکردنی هەموو جەزائیـریەك بە سیاسـی تەنانەت پێشەواو ئیمامەکانیش.

خۆزگایە ئیستعمار لەم ڕاشکاوی یەوە دڵی خـۆی خۆشـکاو زیـاتر بـەرەو توندوتیـژی خـۆی هـەڵنێ، بـەو گومانـەی بـەهۆی لایەکـەوە سەرقاڵمان دەکا بەلایەکی ترەوە، بە هـۆی ئایینەکەمانـەوە دوورمـان دەخاتەوە لە دونیاو ژیانو گوزەرانمان، تا بزانێ ئێمە بوینەتە —بە هۆی ئەوەوە- کەسانێك هیچ شتێك بێ ئاگامان ناکات لە شتەکانی تـر، وە

ئێمه ئەگەر شتێکمان نەتوانی چەندین شـتی تـر دەتـوانین، وە ئێمـە ئەگەر نەتوانین ببینە تونێیەتی بۆ ناحەزەکانمان ئـەوا دەتـوانین بینـە لێلی لە ئاودا، وە ئێمە ئەگەر لە گەنمی زەوی بێبەش کرێین دڕکەکانی تۆودەکەین، لە جـەزائیردا کەسـێك نـەماوە بـچوکترین خۆشەویـستی فەرەنسای هەبێت، یاخود دەزولەیەك هیوای پێمابێت، با لەکۆتاییـدا بزانێ خوا لە کەمیندایە بۆ ستەمکاران.

ناڵێین قازانج یا زیانمان کرد، چونکە قازانجو زیان لە مـوفرەداتی فەرهـەنگی بازرگانەکانـە، بـەڵکو جیهادێـك کـە مەبەسـتەکەی سەلماندنی راسـتی‌یـە خواییەکانـە لەسـەر زەوی، وە چـاندنی تـۆوی روحانیەتە لە بونەوەردا، دانەوێڵـەو خەلەیـەکی ئاسمانیـەو هـەڵگری واتاکانی خاك نیەو بەرزو بڵندە، ئەوانەی موجاهیـدن لـەم ڕێگەیـەدا قـازانجو زەرەر لـە بیریاندانیـە، کـاتیش کـورت بێـت یـا درێـژ لـە حیسابیاندا نیە.(١)

هەمان کارەسات دووبارە دەبێتەوە کە پێشتر کەواکیبی باسی کردوە بە شێوەیەك زانایانی ئاینی بونەتە هۆکارێك وەگەڕدەخرێنو بە نـاوی ئاینو سونەتەوە دەخرێنە خزمـەتی دەسـەڵاتەوە ئـەوەتا دەفـەرموێت: (گرنگترین پیلانگێڕییەکانی عەمامە بەسەرەکان بریتیە لەوەی وەهـا میرەکان تێدەگەیەنن، کە پێویستە بەردەوام بن لەسەر بیورایی خۆیانو لەو ڕووەوە سەربەخۆبنو خۆ بپارێزن، ئەگەر زیان بەخـشیش بێـت، وە

---

(١) (دور العلماء المسلمين في ثورة الجزائر) نوعەیمی، ل (١٣٧-١٤٠).

دژایەتی ڕاوێژیش بکەن، ئەگەر سوننەتیش بێـت، وە پارێزگـاری لـە بارودۆخی باو بکەن ئەگەر خراپیش بێت، وە تەڵقینی میەکان دەکـەن کە بەشداری ئومەت لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا، وە ئازادی ڕەخنە لـێگرتنیان، دەسەڵاتو سامی میەکان ناهێڵنو پێچەوانەی سیاسەتی شەرعییە، بە چەند بەڵگەیەکی لاوازیش تەڵقینیان دەدەن، ئەگەر ئەوە نەبوایە کە لە بەرامبـەری ئەمانـەدا ئومـەتێکی نـەزان هەیـەو لـە پێشیشیانەوە زۆرو دەسەڵاتی میایەتی هەیە، زمانم بۆی نەدەجوڵانـدو هیچ قسەیەکم تیادا نەدەکرد، پێویستیشی بەوە نەبوو مرۆڤ وەڵامـی شتێکی لەو جۆرە بداتەوە.

کاری لەوە خراپو تاڵتر ئەوەیە ئەو میرانە سود لەو بەڵگـە گەلـە وەردەگــرن، وەك چــەکێك لـــە بەرامبـــەر ئەوانـــەی بەرهەڵـــستی سیاسەتەکانی ئەوان دەکەن لەگەڵ وڵاتە بیانیەکاندا، بەوەی دەڵـێن: ڕێسا گشتییەکانی ئاینی ئیسلام ســازو گونجـاو نیـە بـە بنـەماکانی راوێژ، یاساو گەشەو پلەداریە مەدەنیەکان پەسەند ناکا، وە ئەوان بـێ دەسەڵاتنو ناچارن ڕەچاوی ئاینی خەڵکەکـەیان بکـەن و هاوتـەریبی حەزی بیری گشتی بن .

با بگەڕێینەوە بۆ باسی زانا ڕەسمیەکان لەم بارەیـەوە دەڵـێین: بـەو یاسایانەی لای عوسمانیەکان هەیە وە بە هاوشێوەکانی کە لای زۆربەی حکومەتـــە موســـڵمانەکان بـــەدی دەکـــرێ، عەمامـــە بەســـەرەکان گومڕابوونو زەرەریان بۆ ئایین لە شەیتانەکان زیاترە).(1)

---

(١) أم القرى، ل (٤٦).

گوتـــاری عـــەلی عەبـــدوڕازق کـــە نوێنـــەرو نماینـــدەی سیاســـەتێکی شەرعی گۆڕێنراوە ئەمڕۆ بە بەرگو پۆشاکێکی سەلەفی هاوچـەرخەوە دەردەخرێتەوە، ئەوەی دوێنێ لە فیکری ســەلەفیدا کـوفر بـوو ئـەمڕۆ بوەتە مەشروعو جائیز؟!

ئەوەی جەخت لەسەر ئەو جیاوازیە بەرینەدەکاتـەوە کـە لـە نێـوان فیکـری ســەلەفی پـێش بەدەرکـەوتنی گوتـاری گـۆڕێنراوو فیکـری سەلەفی پاش بەدەرکەوتنی ئەو گوتارە هەیە بریتیە لەو بۆچونەی لـە پەیامێکی عەلامەی سەلەفی شێخ عەبدولەتیف ئال شێخ دا هـاتووەو هەڵوێستی ئەو روون دەکاتەوە سەبارەت بە میر عەبـدوڵلا کـە پـەنای بردە بەر دەوڵەتی عوسمـانی دژ بـە مـیر سـعود ئـەوەتا دەڵێـت: (لـە پاشاندا، تێ دەگەن لەوەی ئیسلام بەبێ کۆمـەڵ نابێت، کۆمەڵیش بـە بـــی پێـــشەواو ئیمـــام نابێـــت، ئەوەنـــدە نـــاکۆکی و جیـــاوازی و خـــۆ هەڵقورتاندن لە حەزو ئـارەزووە گومڕاکەرەکانـدا بـەدی هـاتووە کـە ئەسڵو فەرعی ئاینی ڕماندوە، نیـشانە دیـارو ئاشـکراو یاسـاکانی ئاینی سڕاندوەتەوە، لەم ئاژاوەو فیتنەیەدا مرۆڤ پێویستی بە چاوێکی تیژە لە کاتی هاتنی شوبهەو گوناهەکانـدا و بـە ئامـانجی ژیریـەکی بەهێزە لەکاتی بڵاوبونەوەو حەزو ئارەزوەکاندا، بەبێ زانیاری قسەکردن سەبارەت بە خوا گفتوگۆو قسەکردن لـە ئـاین دا بـەبێ کارامـەیی و لێزانین و تێگەیشتن، لە سەروی هاوبەش دانانو هاوەڵ بۆ دانانەوەیـە، لای ئێوە کۆمـەڵێك شت هەیە لە نێوانتانا بڵاوبوەتـەوە کـە نـاتوانرێ

بژمێردرێ و هەڵاوێردرێ، پێویستە موسڵمان لە کاتی بوونی هەر ورەو قسەیەکدا هەڵوێستە بکات، ئەگەر بۆ خوا بوو لەگەڵی بـڕوا ئـەگینا بێ دەنگی بۆ ئەو باشترین شتێکە، ئێـوە شـارەزای بـاری ئێمـەن لـە سـەرەتای ئـەو ئـاژاوەو فیتنەیـەوە بـەهۆی ئـەو نامـە نوسـراوو ئامۆژگاریانـەی لای ئێـوەوە دەرچـووە، لەوانـەدا هـاتوە ئیمامـەتی عەبدوڵاو پابەند بوون بە بەیعەتەکەیەوە بڕاوەتەوە، بە ئاشکراش روون کراوەتەوە کـە ئـاڵاو بەیـداخی براکـەی ئـاڵاو بەیـداخێکی نـەفامی کوێرانەیـە، وە ئامۆژگاریتـانم کـرد بـەوەی کـە بـەحوکمی خـواو پێغەمبەزمان زانیوە وە پێویستە گوێ بیستو گوێڕایەڵ بن، کاتێکیش عەبدوڵا ئەوەی لـێوەشایەوە کە لێیوەشایەوەو دەوڵەتی هێنایە وڵاتی ئیسلامیو دوورگەی عەرەبیەوەو (حسا) و (قطیـف) و (خـط)ی پـێ بەخـشین، خۆمـان خـاوێنو (بـریئ) کـرد لـە شـتێك کـە خـواو پێغەمبەرەکەی (بریء)ن لێی، خەڵکی کارەکەیان بە خراپ زانیو لـە رێی زارەکیەوە بوو بێت یا نامەوە بە تایبەت بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە بۆچونی منیان پەسەندەو قسەم لـێ وەردەگرن،(*) وە باسـی ئـەوەم بـۆ کردن کە هەندێ لە خەڵکی ئەمـەیان کردووەتـە قـەڵغان و ئایـەتو فەرموودەو (أثر)ەکانی پێ دەدەنە دواوە لەو دەقە قورئانیو فـەرموودە

---

(*) سەرنج دە هـەموو ئەمانـە سـەبارەت بـە کەسـێکە کـە داوای پشتیوانی لـە دەوڵـەتی عوسمـانی کـردووە، ئـەی چـی بـوترێ سـەبارەت بـەوەی پـشت دەبەسـتێ بـە ئیستعماری سەلیبی.

(صحیح)و ئاشکرایانەی سەبارەت بە پێویستی جیهاد کردنی ئەوانو خۆ خاوێن کردنەوە لێیانو حەرامی خۆشەویستیو برایـەتی کردنیـان هاتووە، ئەو قسەیەشی دەڵێ ئەوان بۆ پـشتیوانی ئیمـام یـا ئاینێـك هـاتوون وتەیەکـە بەڵگەیـە لەسـەر لاوازی ئـاییـنی خاوەنەکـەیىو ناڕۆشنی دیدەیو لاوازی ژیریو ملکەچ بوونی بۆ حـەزو ئارەزوەکـانی، لە هەمان کاتدا نەناسینی وولاّتانو خەڵکیەو ئەو بەڵگـــانە بـرەوی نیە مەگەر لای هەندێ لە بیابـان نـشینەکان، یـاخود ئەوانـەی ڕێی ڕەواو ڕاستیان بەرداوە .

لەمەش سەیرتر ئەمەیە ئەوە بدرێتە پاڵ زانایان و بێ دوودڵی بـە دروست بزانرێت، ئەو وێنەیەی کە هەیە جـێی جیاوازییـە، سـەرەڕای لاوازی ئەوەی بە جائیزو دروست بزانرێت و لەسەر ئەم بارە بپێورێت.

هەروەك لە باسی فەرمودەی (انا لا نستعین بـمشرك) ڕوون کراوەتەوە: وێنەو مەسەلەیەکی ترە، ئەمە ئێستە پشتگیری کەسانێك و وازهێنان لەوانی ترو ناپاکیەکی ئاشکرایە، کەسانێك کە کەمترین زەوقو حەزی زانستی تیادا بێت ئەم راستیە دەزانێت، بەلاّم پاش ئەوەی عەبدولاّ لـە (احساء)ەوە هاتو پەشیمانیو پاشگەزبوونەوەی ڕاگەیانـد، ئەسـەفو خەمێکی زۆری دەربڕی سەبارەت بەوەی لە دەستی دەرچوو، هەندێك لە خەڵکیش بەیعەتیان پێیدا، پەیامێکی نوسی بۆ (ابن عتیـق) کـە موسڵمان بوون پێش خۆی دەسرێتەوەو پەشیمانیش پێش خۆی ناهێڵێ، ئەرکو واجب ئەوەیە هەوڵ بدرێ بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان بەدی

بهێنرێ، ئەوەی خوا بیەوێت هەر ئەوە رووەدات ﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف: ٢١) مەبەست دەرخستنی راستی بارەکەیە لەسەرەتاوە کۆتایی روداوەکەوە، سعودیش زاڵ بوو بەسەر هەمو ولاتی نەجدی دا، جەماوەریش بەیعەتیان پێ‌ی دا، ناویان نا ئیمام، ئەوەش دەزانن کە کاروباری موسڵمانان بەبێ ئیمام چارەسەر نابێت، ئیسلامیش بەبێ ئەوە شتێك نیە، بەبێ کۆمەڵو ئیمامەت(*) مەبەستە ئاینیەکان تەواو نابن‌و پایە ئیسلامیەکان بەدی نایەن و حوکمە قورئانیەکان بەدەر ناکەون، ناکۆکی سزایەو لەدەست دانی ئاین و دونیایە، شەریعەتیش بەو شێوەیە بەدی نایەت .

هەرکەسێ رێسا شەرعیەکان بناسێ دەزانێ خەڵکی بۆ دین‌و دونیایان چەندە پێویستی‌و ئاتاجی جەماعەت‌و ئیمامەتن، لە دوادوای سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەسانێك خۆیان سەپاندو حوکمی ئیمامیان پێ بەخشرا، کێبەرکێ‌و کێشەیان لەگەڵی دروست نەکرد هەروەکو عەبدوڵای کوڕی عومەر ئەوانەی تریش وابوون، لەگەڵ ئەوەی بە زۆرو خۆسەپاندن وەرگیرا بوو، بەهەمان شێوە لە دوای ئەوان‌و لە چاخی نەوەو چینی سێیەمدا کەسانێك خۆیان زاڵ کردوو حوکمەکانی جەماعەت‌و ئیمامەت وەکو خۆی دەڕۆیی‌و کەسیش لەوەدا جیاوازی نەبوو، زۆربەی پێشەواو ئیمامەکان دوای ئەوانیش بەو شێوەو شێوازە

(*) رامێنە لەم بنەما گەورەیە چۆن لە فیکری سەلەفی هاوچەرخ دا نادیارو ونە، ئەوانەی بابەتی ئیمامەتیان پەراوێز خستووە بە بیانوی ئەوەی لە (فروع)ە؟!

بوون، لەگەڵ ئەوەشدا زاناو دینداران ئەو فەرمانانەی بۆ چـاکە کـردن پێیان دەدرا ئەنجامیان دەدا وەدەستیان لە کارێکی خـراپ هەڵـدەگرت کاتێـك کـە فـەرمانیان پـێدەکرا وازی لـــێ بێـنن، لەگـەڵ هـەموو ئیمامێك دا جیهادیان دەکرد هەروەکو لە بیروبـاوەڕی ئـەهلی سـونەدا دەقی لەسەر هەیە، هیچ یـەکێك لـەوان نـەیوتوە دروسـتە کوشـتاری خۆسەپێن بکرێ و لە دژی راپەڕیو لەو لاشەوە ئوممەت بەجێ بهێڵـرێ لە خوێنی خۆیدا بگەوزێتەوەو سـامانو دارایـی و قەدەغـەکراوەکانی حەڵاڵ بکرێ، دوژمـنی جەنگ کەریش لەو وڵاتەدا هاتووچۆو ئەمسەرو ئەوسەر بکاتو لە پەناگەکانیدا بحەسێتەوە، کەسێ ئەمە بە دروستو رەوا دەزانێ کە ژێری تێکـچووبێ، ئـاینو تێگەیـشتنی شـێواو بێـت، وتراویشە:

لا يصلح الناس فوضى لاسراة لهم ولا سراة اذا جهالهم سادوا

واتە / ئاژاوەو پشێویەك کە ئەمسەرو ئەوسەری نیە باری خـەڵکی ساز ناکا، بە لوتکەو بڵندییش ناگـەن ئەگـەر نـەزانو نەفامـەکانیان بوونە گەورەو سەروەر .

بەڵکو ئـەو فەرمانـە ئاینییـە لـەو فەرمودەیـەی خـوای گـەورەوە وەرگیراوە کە دەفەرموێت: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعـاً وَلا تَفَرَّقُـوا﴾ (آل عمران: ١٠٣) چونکە ئەم واجبە بەدی نایەت بەوە نەبێت کە باسمـان کرد، وازلێهێنانیشی خراپەی رووتـەو موخالەفـەی ئاشـکرایە، خـوای

گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الْـإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ (المائدة: ٢) لە فەرمودەشدا هاتووە: ((اذا امرتكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم، واذا نهيتكم عن شيء فـاجتنبوه) ) واتـە: ئەگـەر فەرمانێكم پێدان بەپێی توانا ئـەنجامی بـدەن، ئەگـەر بەرهەڵـستی شتێكم لـێكردن خۆتانی لـێ دوور بگرن، بە تایبەتی ئەگەر دوژمـن دابەزیە دەورو بەرتانو شەیتان ترسی خـستە نێـو دڵـی خەڵكیـەوەو پـشتیوانی كـردنو چـوونە نێـو ڕیـزی هاوبـەش پەیداكـەرانی بـۆ ڕازاندبوونەوە، وە ئەوەی لا جوان كردبوون كە كاروباری سەرۆكایەتیان پێ بسپێرێ، و بە كاربەدەستو سەرپەرشـتیار بناسـرێنو پـشتیوانی خەڵك دەكەن و خۆیان قوت دەكەنەوەو دایان دەنێن، ئەوان هاتوون بـۆ پشتیوانی كردنی فلان هەروەكو شەیتان خستبویە سەر زمانی هەندێ لەوانەی هەڵخەڵەتا بوون، پاش ئایندارایان بوونە هاوكاری هاوەڵگەڕان (المـشركين) ئەوانـەی وازیـان هێنـاوە لـە جیهـادكردنی دوژمنـانی پەروەردگاری جیهانیان، ئای ئەمە چ فێلێكی گەورەیە! چ هەڵەیـەكی مەزنە! چەند دوورە لە ئایینی خواو پێغەمبەرەكـەی! ﴿ولكـن اكثـر الناس لا يعلمون﴾ ئەو نامانەی لەلایەن هەندێ لە برایانەوە دەركراوەو ئـەوەی تیـادا هەسـت دەكـرێ كـە دروسـت بێـت داوای پـشتیوانیان لـێبكرێ و فیتنەكەیان بە كەم سـەیر بكـرێ، پـۆزش هێنانـەوە بـۆ هەنـدێ لـە گـەورەو سـەركردەكان — خزانێكـە ڕاسـتی تیـادا نیـە، تێكەوتنێكە بووەتە هۆی ئەوەی سـەركردەی ئـەو كـارە تیـا بـچێت و

سەرلێشــێواو بێــت، چــەند جوانــە ئــەو ئایەتــەی خــوای گــەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُمْ بِوَاحِدَةٍ أَنْ تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَى وَفُرَادَى ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا﴾ (سبأ: ٤٦) روو لە ئامۆژگاری پەروەردگارتان بگرن و پیــادەی کەن، لە پێناوی خوادا بەراستی جیهاد بکەن، موسـڵمانان کۆبونــەوە لەســەر جیهــادکردنی دوژمنانیــان لەگــەڵ ئیمــام ســعوددا خــوا سەرکەوتووی بکات، ئەهلی سوننەش لە بیروباوەڕەکانیاندا دانیان بەوە داناوە کە جیهاد هەر دەمێنێ لەگەڵ هەموو ئیمامێکدا، لە ســەر رای باوو بەناوبانگیش فەرزە، یـاخود پایەیەکـە لـە پایـەکانی ئیــسلام و ستەمی زۆردار پوچی ناکاتەوە.

هەندێ لە سەلەف کاتێك هەندێ لە خەڵکی سەرزەنـشتی دەکــەن لەسەر ئەوەی بۆ لە دوای بیدعەچـیەوە نوێـژ ناکـات، ئــەویش دەڵــێ ئەگەر بۆ لای خوا بانگی کردین وەڵامیــان دەدەینــەوەو گوێڕایــەڵیان دەکــەین، ئەگــەر بــۆ لای شــەیتانیش بانگیــان کــردین بەرهەڵــستی دەکــەین، لــە فەرمودەشــدا هــاتووە: ((جاهــدوا المشركين بأنفــسكم واموالكم والسنتكم)) خوای گەورە پشتیوانی ئێمــەو ئێــوە بێــت بــۆ جیهادکردن لە پێناویدا وە بۆ باوەڕکردن بە بەڵێنو گوفتارەکانی، خــۆ بپارێزن لەوەی بەبێ زانستو زانیاری لە ئاینی خوادا مشتو مڕبکەن، چونکە ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی تیاچوون هەروەك لــەو بارەیــەوە فەرمودەی دروســتی پێغەمبــەری خــودا هەیــە ﷺ خــوای گــەورەش راستو ڕەوا دەفەرموێتو ڕێی ڕاست پیشان دەداتو درودو سڵاوی خوا

لەسەر موحەمەدو کەس و کارو هاوەڵاتی).[1]

لەم پەیامەدا بەروون و ئاشکرایی هەڵوێستی فیکری سەلەفی سەدەی دوانزەوسیانزەی کۆچی سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت و جیهادو پشتیوانی کردنی بێباوەڕان بەدەر دەکەوێ، دەریش دەکەوێ کە گوتاری ئەم قوتابخانە سەلەفیە لە چاخی نوێدا چەندە پاشەکشەی کردووە؟!

ئەم جۆرە گۆڕانکاریانە مەودای ئەو قەیرانەمان بۆ دەردەخا کە ئومەتی ئیسلامی لە رووی فیکری و عەقائیدیەوە دەیگوزەرێنێ، حکومەتەکانی جیهانی عەرەبی لە چاخی نوێدا توانیان زانایان وەگەڕخەن بۆ خزمەتی ووتارە سیاسیە گۆڕێنراوەکەیان و لە ڕێگەی ئەوانیشەوە شەرعیەتی پێ ببەخشن، لە گوتاری سیاسی هاوچەرخ دا خراپترین شتەکانی نێو گوتارە گوڕێنراوەکەی عەلی عەبدورازق کۆکرایەوە، کە بریتیە لە شەرعیەتی کەنارخستنی (خەلافەت و شەریعەت و جیهاد) وە خراپترین شتی نێو گوتاری تەئویل کراوی تێدا کۆبویەوە، کە بریتی بوو لە مەشروعیەتی زۆرداری و واجب نەبوونی ڕاوێژو دروستی پشتاو پشتی و بۆمانەوەی فەرمانڕەوایی و حەرامی دەرچوون و ڕاپەڕین دژ بە دەسەڵات، لادان و خراپەکاریەکانی هەرچۆنێك بێت، وە هەرچەندە خوێنڕێژی ئەنجام بدات ماف و قەدەغەکراوەکانی پێشێل بکات، تاوەکو ڕاستی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ

---

(١) مجموعة الرسائل النجدية، (٣/١٧٠-١٧٤).

لەم رووەوە بەدی دەکرێ کە دەفەرموێ: (أخوف ما أخاف علـى أمـتي "الأئمة المضلون) [1] واتە ئەوەی زۆر زۆر ئەترسـم ئومەتەکـەم توشـی ببێ بریتیە لە پێشەواو سەرکردەی گومڕاو سەرلێشێواو .

گوتاری سیاسی تەئویلکراو زیندوو کرایەوە پاش ئەوەی بزوتنـەوەی جەمالەدینی ئەفغانیو شوێنکەوتووانی وەکو عەبدورەحمان کەواکیبیو ڕەشید ڕەزاو حەسەن بەنا تێیانپەڕان – یا نزیك بوو تـێی پـەڕێنن – ڕەشید ڕەزا هەوڵی دەرکردنی (المنار)ی دا کە هەڵگری ئەم فیکرە بوو، بەڵام کە دەیـەی هەشـتاکانی سـەدەی بیـستەم هـات جـارێکی تـرو سەرلەنوێ گوتاری تەئویلکراو باڵی کێشایەوەو بڵاوبوەیـەوە، کوتـوپڕ گوتاری بزوتنەوەی راپەرینو رێنسانس پاشەکشەی کرد، زانـاو بـانگ خوازانی ئەم ماوەیەی بێداری ئیسلامی کەوتنـە خولانـەوە بـە دەوری چەمکی (سمع وطاعة)و حەرامی دەرچوونو ئارامگری لەسەر زۆرداری ئیمامەکان و بە بەڵگەکردنی ووتەی پێشینان بۆ ئەوەی ڕەچـاوی ئـەو جیاوازیو ماوە دوورو فراوانە بکرێ کە لە نێوان سەرهەڵدانو دروست بوونی ئەو فیکرەو چاخی نوێدا هەیە، ئیمامەکانی سونە کاتی خـۆی ئەوەیان هەڵبژارد کە ئارام بگرن لەسەر مەئمونی عەباسی لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا ئاڵاو بەیداخەکانی جیهاد دەشەکانەوە، شەریعەت فەرمانڕەوا بوو، ناموسو خوێنیان پارێزراو بوو، بە پێچەوانەی ئەم سەردەمەوە کە

---

(٢) ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، (٦/٤٤١)، سەیری الصحیحە بکە، ژمارە (١٥٨٢).

تەوژمە عەلمانیەکان زاڵ بوونە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، شەریعەت تیایدا لەکار خراوە، کوفری ئاشکرا بەدەر کەوتووە، دوژمنـــانی ئومەتو ئاین دەستیان گرتووە بەسەر کاروباری موسـڵمانانـدا، هێـزو توانا تیایـدا بـۆ جولەکـەو خـاچ پەرستـەکانە، موسـڵمانانیش وەدەر دەنرێن، خوێنیان دەرێژن، ناموسیان ئەتکدەکرێ، ماڵیان زەوت ئەکرێ وای لێهاتووە بارودۆخەکە لـە سـەردەمی کۆیلـەکان خـراپترە، ئـەوەی زانایانی ئەو کات کۆبوون لەسەر بێ باوەڕیانو واجبـی دەرچـوون لـە دژیانو جیهادکردنیان .

ئەم گوتارە هێنرایەوەو کرا بە بەڵگە نەك لەو سەردەمەی پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێت(( سترون بعدي أثـرة فاصـبروه )) واتـە: دوای من خۆخۆیەك دەبینن ئارام گـرن، بـەڵکو هێنرایـەوەو کـرا بـە بەڵگە بۆ ئەو سەردەمەی تیایـدا فەرموویـەتی: ((إلا أن تـروا كفـراً بواحاً)) واتە: ئەگەر کوفرێکی ئاشکراتان بینی .

زۆربەی ئەو ڕژێمانەی ئەمڕۆ ئەوانە نین کە بـە زۆردارو سـتەمکار وەسف دەکرێن و زانایان جیاوازیان هەیـە لـە بارەیـەوە، بـەڵکو لـەو ڕژێمانەن بەو کوفرە وەسف دەکرێن کە زانایان کـۆکن لەسـەر ئـەوەی پێویستە لە دژیان ڕاپەڕیو دەربچی ئەگەر کەسـێك توانـای هـەبوو، ناکرێ قسەی پێشین داگریتە سەر زەمینەو واقیعێك مەگەر ئەوداگرتنە دروست بێت وهەمان حوکمی هەبێت وەکو داگرتنی ئەو حوکمەی بـۆ دەوڵەتی کۆیلەکان لە میسردا هەبوو.

بەڵكو پێشەوایان كاتێك گوێڕایەڵی‌و ملكەچیان بۆ خەلیفەكان بە پێویست‌و واجب داناوە - هەرچەندە زۆرداریشیان لێ بوەشێتەوە كە ئەوان خەلیفەو ئیمام بن و دەسەڵاتێكی تر لە سەرویانەوە نەبێت، بەڵام ئەم ڕژێمانەی ئیستعمار هێناونی یاخود لە ژێر چاودێری خۆیدا دروستی كردوون‌و پێی گەیاندوون بۆ جێبەجێ‌كردنی نەخشەكانی، گوێڕایەڵیەكە بۆ ئەوان نیە، بەڵكو لە واقع دا بۆ ئەو دەوڵەتە ئیستعماریانەیە كە بۆ خزمەتی خۆیان وەگەڕیان خستوون، لە سەردەمی پارێزەریی بەریتانی بۆ میسر گوێڕایەڵی بۆ خدێوی میسر نەبوو، بەڵكو لە واقع دا بۆ پادشای ئینگلتەرا بووە، نوێنەرەكەی ئەو تەواوی كاروبارەكانی میسری دەبرد بەڕێوە، هەر كەسە گومانی وابێت ئەم جۆرە پادشایە یا خدێویە پێویستە گوێڕایەڵی بكرێ وە گوێڕایەڵی‌كردنی ئەویش گوێڕایەڵی‌خواو پێغەمبەری خودایە، وە ئەمە كاربەدەست‌و (ولی الامر)ە، هەروەك لە فەرموودەی خوادا هاتووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ﴾ (النساء: ٥٩) ئەمە پێچەوانەی كۆڕای كردووە، بەڵكو ئەم جۆرە گوێڕایەڵیكردنە ملكەچ كردنە بۆ ئەو ئیستعمارەی كە سەپاوە بەسەریداو دەست لە كاروبارەكانی وەردەداو گوێڕایەڵی بۆ كەسی وانیە، بەڵكو پێویستە لە كار لادرێ و لە دژی ڕاپەڕی‌و جیهادكردن و دەرپەڕاندنی ئیستعماریش لە سەندیكای كارمەندانی تەندروستیەوە زەوی ئیسلام بە كۆڕای

زانایان پێویستو واجبە .

لە راستیدا ئومـەتی عـەرەبیو ئیـسلامی بـە شـێوەیەکی تایبـەتی لەمڕۆدا زیاتر لە هەموو کاتێکی تر ئاتاجی شۆڕشێکی فیکرین، بـۆ تێكوپێکدانو وێران کردنی چەمكو تێگەیشتنەکانی گوتاری سیاسی تەئویلکراوو گـۆڕێنراو، وەکـار بکـات بـۆ زیندوکردنـەوەو ژیانـەوەی چەمكو تێگەیشتنەکانی گوتاری سیاسی شـەرعی دابـەزێنراو، وەکـو مـافی ئومــەت لــە هەڵبــژاردنی دەســەڵات لــە ڕێگــەی راوێــژوو رەزامـەندییــەوە، وە دەســتەبەرکردنی مــافی ئـەو لـە چـاودێریکردنو لێپرسینەوەی، وە لادانی ئەگەر لایداو خراپەکاری ئـەنجام دا، وە مــافی هەبێت لەوەدا کە چاودێری ســەروەتو ســامانو داراییــەکان بکــات و پارێزگاری لە نیشتمانو بەرژەوەندییــەکانی بکرێــت، وە مــافی هــەبێ لەوەدا دادگەری کۆمەڵایەتیو یەکسانیو ئازادی دەستەبەر بکـرێ، وە مـافی هەبێت دادوەری بباتە لای شەریعەتەکەی خۆی، وەمــافی ئــەوەی هەبێت ئازادانە مومارەسەی کاری سیاسی بکاتو ئازادی رادەربـڕینو بیرکردنەوەو رەخنەگرتنی لە دەسەڵات هەبێت بێ هیچ ترسو بیمێك، وە مـافی ئەوەی هەبێت چەندین پارتو کۆمـەڵ پێك بهێنێ وببێتە ئەندام لە ناویانداو وە مـافی ئەوەی هەبێت کە وەقف کراوەکــان بداتــە پــرۆژە زانستیو فیکریەکان بێ دەست تێوەردانی دەسەڵات، هەموو ئەمانەش لە بازنەو چوارچێوەی شەریعەتی دابەزێنراوی دادگەردا.

لــە راســتیدا زیندوکردنــەوەی ئــەم چــەمکە سیاســیە شــەرعیانە

دەستەبەری ڕوودانی شۆڕشـێکی چاکـسازی سیاسـی گـەورە دەکـات، جائیتر لەمـەدا حکومـەتەکان دەستپێشخەر بن یا گەلان پێی هەستن.

پێویستە بزاڤی ئیسلامی هەست بەوە بکات کە تـەواوی بزوتنـەوە چاکسازی یەکانی جیهان هەر هەموویان پـرۆژە چاکـسازیەکانیان لـە ڕێگەی دەسەڵاتەوە جێبەجێی کردووەو ئەنجامی داوە، هیچ ڕێگەیەکی تر نیە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی یا ڕاپەرینی هەر ئومەتێك مەگەر لە ڕێگەی چاکسازی کردنی دەسەڵات خۆیەوە نەبێت، بە چاکسازی بوونی دەسەڵات چاکسازیو ڕاپەڕاندنی ئومەتیش بەدی دێت، هەر هەوڵێکی تر بەدەر لەم ئاراستەیە دەبەخشرێت، ناکرێت چاکسازی گشتی بـەدی بێنێت بۆ کۆمەڵگا ئیسلامیەکان هەرچـەندە سـودو چاکیەکانیـشی بگەڕێتەوە بۆ هەندێ لە تاکەکانی کۆمەڵگا .

تـەواوی بـزاڤ و ئایدۆلۆژیـەکان لـە جیهانـدا پـاش گەیـشتنیان بەدەسـەڵات هەسـتان بـە جێبـەجێ کـردنو بـەدیهێنانی پـرۆژە چاکسازییەکان، هەروەکو لە شۆڕشی فەرەنسیو روسـیو ئـەمریکیو هی تردا بەدی هات .

لە مێژوودا بزاڤێکی چاکسازی نـابینین سـەرکەوتوو بووبێـت لـە ئەنجام دانی پرۆژەکانیدا بەدەر لەم ڕێگەیە .

بەڵێ دەسەڵات خۆی دەتوانێت چاکسازی ئەنجام بدات ئەگەر هاتوو خۆی هەڵگری پرۆژەیەکی چاکسازی بێت بـەو شـێوەیەی لـە سـەدەی نۆزدەدا کردی، بەڵام جیهانی ئیسلامی دیاردەیـەکی لـەو شـێوەیەی

بەخۆیەوە نەبینیوە، لەبەرئەوەی گوتــاری سیاســی گــۆڕێنراو ناهێڵــێ بەدەرکەوێ و ڕێگر دەبێت لەبەردەم بوونو سەرهەڵدانیدا .

پێویستە لەسەر ئومەت ڕێگەی خۆی بگرێتە بەر بـۆ ئـەنجام دانو بەدیهێنانی راپەرینو ڕێنسانسەکەی بــە هــەر هۆکــارێکی دروســتو مەشروع، ئاشتیانە بێت یاخود شۆڕشگێڕی، بە رەزامەندیو بەشداری دەسەلأت بێت یاخود بە نارەزایو نەیارێتی ئەو، گەلان مافی ئـەوەیان هەیە لە پێناو ئایینو ئازادیو مــافو ڕێــزو کەرامەتیانــدا بجـەنگێن هەروەکو لە فەرمودەی صحیح دا هاتووە ((من قاتل دون مالــه فهــو شهید، ومن قاتل دون نفسه فهو شهید، ومن قاتــل دون عرضــه فهــو شهید) ) وە فەرموویەتی: ((هەرکەسێ لە پێناو مافی خۆیدا بجەنگی ئەوە شەهیدە، ((من قاتل دون حقه فهو شهید)) زانایان قەدەغــەیان کردبوو ڕووبەڕووی زۆرداریو سەرکەشیو لادانەکانی دەسەلأت ببنەوە، لە ترسی ئەوەی ئەو خراپەکاریانەی لــێی دەکەوێتەوەو بــەدی دێــت، بەرئەنجامەکەی بریتی بوو لەوەی هەموو ئومەت کەوتنە ژێر چەپۆکی ئیستعمارو لەدەستدانی ئاسایشو سەقامگیریو دواکەوتووی جیهــانی ئیسلامی، کار گەیشتوە بەوەی بارودۆخەکان چاك نەبــەن مەگــەر لــە ڕێگــەی شۆڕشــێکی فیکــریو سیاســییەوە کــە بوەتــە زەرورەتێکــی کۆمەلأیەتی وشەرعی .

تەمبەڵیو دواکەوتنی ئومەت لەوەی بە رۆڵی خۆی هەستێ، سەری کێشا بۆ ئــەوەی بکەوێتــە ژێردەســتو چــەپۆکی ئیــستعماری نــوێی

ئـــەمڕۆوە، بـــارودۆخ گەڕایـــەوە ئـــەو ڕۆژەی یەکـــەمجار پـــێش زیـــاتر لـــە سەدەیەك ئیستعماری ڕۆژئاوایی پێی نایە ئەم وڵاتانەوە.

شێخی ئیسلام سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات (کە واز لە فەرمان بە چاکەو نەهی کردن لە خراپەو جیهادکردن لە پێناو خوادا دەهێـنن، لەبەرئەوەی ئازاری هەندێ لە خەڵکی تیادایەو تۆڵەیان لێ دەکرێتەوە، تا وای لێهات بێ باوەڕو خراپەکاران دەستیان گرت بەسەر پیاوچاکانو چاکە خوازاندا، نەیان دەڕوانیە ئەو شتەی بەرژەوەندییەکەی زیاتر بوو، خوای گەورەش دەفەرمێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾ (البقرة: ٢١٧) .

خوای پاكو بێگەرد دەفەرموێت: ((هەرچەندە کوشتنی کەســەکان زیانی تیادایە بەڵام ئەو ئاژاوەیەی بـــە هـــۆی کـــوفرو ســـەرکەوتنی بـــێ باوەڕانەوە وەدی دێت لەوە گەورە ترە، یەکێك لەو دوو خراپـــە گەورەیـــە ڕێی لێ دەگیرێو ئەنجام نادرێ بە هۆی کردنی بچوکترەکەیانەوە).[1]

داگیرکـــەرو ئیـــستعماری نـــوێ هـــات بـــەپێی چـــەند نەخـــشەیەك بەمەبەســـتی لـــەناوبردنی ئیـــسلام لـــە خانـــەی خۆیـــدا، بـــە بیـــانوی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆرەوە، وە بۆ ئەوەی دەســـتبگرێ بەســـەر ئومـــەتو سەروەتو سامانیاندا پاش پارچە پارچەکردنو شڕوپڕکردنی، پێویستە

(١) جامع الرسائل ١٤٢/٢

لەسەر بزاڤی ئیسلامی بــە نهێنــیو ئاشـکرا کاربکــات لــە پێنــاوی گەیشتن بە ئامانجەکانی بەو شێوەیەی بانگەوازی پێغەمبەری خـوا لــە مەککەو لە سەرەتاکیاندا لەسەری بوە، ئەوە بوو بە نهێنی بو، بە هۆی ئەو بارودۆخەی دەوری دابوو.(١)

هەروەها پێویستە لەسەری هەوڵ بدات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە ئەگــەر ڕەخـسا یــا بەڕێگەیــەکی شــۆڕگێڕانە ئەگەر نەدەکرا، بەو شێوەیەی زۆربەی زانایان لە ســەرەتای یەکەمــەوە ئەوەیان بە دروســت بینیــوە بــۆ ڕووبەڕوونــەوەی زۆرداریو لادانــەکانی دەسەڵات، چ ئاژاوەو فیتنەیەك لەوە گەورە ترە کە دوژمنــانی ئومــەت زاڵ بىن بە سەریداو دەست وەردەنە کاروبارەکانیانــەوە، وە موســڵمانانی پیاوو ئافرەت لە هەموو شوێنێکدا توشی فیتنەو تاقیکردنەوە بکــەن لەسەر ئاینەکەیان، وە ببنە کۆسپ و بەرهەڵستکاری ڕێی خوا، خوای گەورەش فەرموویەتی: ((والفتنة اشد من القتل) )؟!

(١) سەیری (تفسیر المنار) بکە ١٠/٣٦٨-٣٦٩ سەبارەت بە مەشروعیەتی پێکهێنـانی کۆمەڵەو ڕێکخراوەی نهێنی بۆ گەڕانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی.

# پوختـــه

١- ئەو بارەی ئەمڕۆ ئومـمـەت دەیگوزەرێنـێ لـە شکـستو دارمـانو دواکەوتن بەرئەنجامێکی سروشتی ئەو لادانەیە کە بەسەر گوتـاری سیاسی شەرعیدا هات، ئەو بارەی کە بە ناوی ئـایینو سـوننەتەوە ئومەتی دارنی لـە مـافی هەڵبـژاردنی دەسـەڵات و لێپرسـینەوەو بـــەرگریکردنی زیـــادەڕەویو ســـتەمو خراپەکارییـــەکانی و چاکسازیکردنی لە کاتێکدا کە خراپ دەبێت، تاوای لێهات ستەمو زۆرداری بڵاوبویەوەو خراپەکاری ئاشکرا کرا، سەرەنجامیش تیاچوون بوو هەروەکو قورئان ئەم هـــەواڵەی پـێداوین لـەم فـەرمودەی خـوای گـــەورە ﴿وَمَـا كَـانَ رَبُّـكَ لِيُهْلِـكَ الْقُـرَى بِظُلْـمٍ وَأَهْلُهَـا مُصْلِحُونَ﴾ (هود: ١١٧) واتە: خوای گەورە تەنها بە هـۆی هاوبـەش پەیداکردنەوە ئومەتەکان لە ناو نابات، تانەگەنە ئەوەی کە سـتەم لـە یـەکتری بکـەن، هـەروەکو راڤـەکاران دەفـەرموونو واقعـیش شاهیدی بۆ دەدات، شێخی ئیـسلام ئیبنوتەیمیـە ئـەم واقعـە بـەم شێوەیە دەردەبڕێ و دەفەرموێت: (کاروبـاری خـەڵکی لـە دونیـادا زیاتر بەدادگەری ڕێكو راست دەبێت با لەگەڵیشیدا چەندین جۆر گوناهـ و تاوان بەشداری بکەن، وەك لەوەی بە ستەم ڕێـكو راسـت بێت با گوناهـ و تاوانیشی تیادا نەبێت، هەربۆیە ووتـراوە، خـوای گەورە دەوڵەتی دادگـەر پایـەدار دەکـات وە دەوڵـەتی سـتەمکاری

سەرشۆڕ دەکات هەرچەندە موسڵمانیش بێت، وە وتراوە: دونیـا بـە دادگەری‌و کوفرەوە بەردەوامی بەخۆی دەدا لەگەڵ ستەم‌و ئیسلامدا درێژە بە خۆی نادا) .

وە فەرمویەتی: (لە راستیدا دادگەری سستەمی هەموو شتێکە، ئەگەر کاروباری دونیا بە دادگەرییەوە بەرپا کرا ئەوا بەرپا دەبێت، هەرچەندە خاوەنەکەشی هیچ بەشێکی نەبێت لە دوا رۆژدا، ئەگەر دادگەری بەرپا نـەکردو ئـەنجامی نـەدا بـەرپا نابێـت هەرچـەندە کەسەکەش ئەوەنـدە بـاوەڕو ئیمانیـشی هـەبێت کـە لـە دوارۆژدا پاداشتی لەسەر وەرگرێ).[1]

زانایان گومانیان وابوو خۆڕاگری‌و ئارامگرتن لەسەر ستەم باشترە لـە ڕووبەڕووبونـەوەو بەرەنگاربونـەوەی، بێ‌ئـەوەی هەسـت بـەو مەترسییە بکەن کە دەکەوێتە سەر کۆمەڵگە، وە ئـەوەش دەبێتـە هۆکاری هەرەس‌وکەوتنی نەتەوەکان، هەروەکو واقعـی هاوچـەرخی ئومەتەکان شاهێدی لەسەر دەدەن .

٢-گوتاری سیاسی شەرعی دابەزێنراو بریتیە لەو گوتـارەی نماینـدەی ڕێنماییەکانی ئیسلامێکی رەوا دەکات، بـەدەر لـەو تـەئویلکراوە یاخود گۆڕێنراوە کە پێویستە پەسەندی نەکـەین‌و بیدەینـە دواوەو پابەند بین بەو ڕێ‌و شوێنانەی خەلیفەکانی راشیدین لەسەری بوون لـە بـواری ئیمامـەت‌و سیاسـەت‌و بـەڕێوەبردنی کاروبارەکـانی

(١) الحمیـة، ل (٩٤)، مجموعة الفتاوی، (١٤٦/٢).

ئومـەتدا: هەروەك لە فەرمودەدا هاتووە: ((علیكم بـسـنتي وســنة الخلفاء الراشدين من بعدي عضو عليها بالنواجذ، واياكم ومحدثات الأمور)). وە دەستگرتن بەم گووتـارەوە سـوننەتو ســەلەفیەتە، بــەدەر لەمــە بریتیــە لــەو بیدعەیــەی كــە پادشــاو میـــرەكان دایانهێناوەو زاناو شەرع ناسـەكانیش بـەپێی حـەزو ئارەزوەكـانی ئەوان بەدوایاندا چوون، وەك چاولێكەریو شوێنكەوتنێكی ئـەوان بۆ ڕێو شوێنی قەیسەرو كیسراكان هەروەكو پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوە: ((لتتبعن سنن من كان قبلكم شبراً بشبـرٍ و ذراع بذراع ... فارس و الروم))

٣- وە ئەم گوتارە وەستاوە لەسەر ئەوەی:

أ/ ئومـەت مـافی ئەوەی هەبێت دەســەڵات هەڵبــژێرێو بەشــداری تیادا بكات بە دەربرینی بیـــروڕاو لێپرســینەوەو لابــردنو مــەرج لەسەر دانانو چاودێریو ڕەخنە لــێ گرتنی.

ب/ مـافی ئەوەی هەبێ بە ئازادی بیر بكاتــەوەو بیروراكـانی خـۆی دەربڕێت بێ زەوتكردن یا بەرگرتن.

ج/ مـافی ئەوەی هەبێت بەرهەڵــستی زیـادەڕەویو زۆرداریــەكانی دەسەڵات بكاو ڕووبەڕووی ببێتەوە .

د/ مـافی ئینتماو كۆبونەوەی سیاسیو فیكری هەبێت .

هـ/ زەرورەتی ڕێزگرتنی مافو ئازادیەكانی مرۆڤ كـە شــەریعەت هێناویەتی.

و/ پێویستی بەدیهێنانی دادگەریو یەکسانی لە نێوان تاکـەکانی کۆمــەڵگاو لەبــەردەم قــەزاو دادگــاداو گرتنــە دەســتی پیــشە گشتییەکان بە پێی بنەمای سەرەتایی هەل ڕەخسانی وەك یەك .

ز/ ئومەت مـافی ئەوەی هــەبێت دادوەری بباتــە لای شــەریعەتو دەسەڵات لابــەرێ، ئەگــەر هــاتوو لــە بناغــەو ئوســوڵە بــراوەو یەکلاکراوەکان دەرچوو.

ح/ مـافی ئەوەی هــەبێت بــەرگری لــە نیــشتمانی خــۆی بکــات و داگیرکەرو ئیستعمار لە زەوییەکــەی وەدەرنــێ و پارێزگــاری لــە بەرژەوەندییەکانی بکات .

٤- ئــەم گوتــارە بــەدی نایــەتو خــۆی ناســەلمێنێت مەگــەر بــە ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگار بوونەوەی گوتاری تەئویلکراو گــۆڕێنراو نەبێت لە ڕووی فیکرییەوە، پاشان کار بکــرێ بــۆ بڵاوبوونــەوەیو بانگەشەکردنی ئومــەتو حکومەتەکانی بــۆ ئــەوەی بەرێگەیــەکی ئاشتیخوازانە تەبــەنی بکــەن، بــۆ ئــەوەی خــودی حکومەتــەکان دەستپێــشخەری بکــەن بــۆ چاکــسازیکردنی بارودۆخــەکانو پێڕاگەیشتن بەوەی لە دەست چــووە ئــەگینا پێویــستە بــە هــەموو هۆکارێکی گونجاو کاربکرێ بۆ گۆڕانی، جا ئیتر بە کــاری سیاســی ئاشتیانە بێت یاخود بە کاری شۆڕشکردنو شۆڕشــگێڕی، چــونکە مانــەوەی ئــەم بــارە مانــەوەی ئیــستعمارەو دەرکــردنو نــەهێڵانی ئیستعمار بە نەمانو لابردنی دەسەڵاتدارانی لەوجۆرە بەدی دێت.

٥- لە ڕووی شەرعیەوە دروستە سوود لە ئەزمونی گەلانی تر وەربگیرێ بۆ ڕێکخستنی ئەو مافانە، هەروەکو چۆن عومەر سودی بینی لەو سستمە بەڕێوەبەرییانەی لای فارس و ڕۆمەکان هەبووە، هــاوەڵانیش کۆڕا بوون لەسەر دروستی ئەوەی کــردی، لەبەرئــەوەی ئــەم کــارە دەچێتە ژێر فەرمودەی پێغەمبــەر ﷺ کــە دەفــەرموێت: ((أنــتم أعلم بأمور دنیاکم)) هەر شتێ چاکەو بەرژەوەندیو دادگەری تیادا بوو ئەوە لە سیاسەتی شەرعیە، هــەر شــتێکیش زیــان و خراپــەو ستەمی تیادا بوو، ئەوە بریتیە لە سیاسەتی نەهێڵراو (ممنوع) .

فیقهی ئیسلامی ئاشنای سستمی سەرۆکایەتییە، بە شێوەك کــە سەرۆك ڕاستەوخۆ لە گەلەوە هەڵبژێردرێ هەروەکو لــە ســەردەمی خەلیفــەکانی ڕاشــدیندا هــەبووە، وە لێپرســراو دەبێــت لــە بەرامبەریاندا، وە ئاشنایە بە سستمی وەزاری هەروەکو لەسەردەمی عەباسی دووەمدا بەدی دەکــرێ، کاتێــك خەلیفــە دەبێتــە ڕەمــزی ئومەتو ئەوەی کە مومارەسەی دەسەڵاتو سەڵاحیەتەکانی دەکات بریتیە لە وەزیر یاخود سوڵتان .

تەواوی ئەم سستەمانە لە ڕووی شەرعیەوە دروستن ئەگەر هاتوو ئومەت پێی ڕازی بوو وە دانی پیادا نا، وە بەرژەوەندی خۆی تیــادا بینی، چونکە کارەکە بە دەستی ئەوە .

هەروەها شتێك نیە بەرهەڵستی دروستیو مەشروعیەتی دەستاو دەستی ئاشتیانەی دەسەڵات بکات لە نێوان پارتە سیاسیەکاندا کە

هەر یەکەیان بەرنامەی هەڵبژاردنی خۆی لە چوارچێوەی دەســتوری دەوڵەتو سستمی گشتیدا دەخاتە روو کە بریتیــە لــە شــەریعەتی ئیسلامی، هەروەکو ئەنسار لە مەدینەدا ئەوەیان خستەڕوو، بەوەی کە ووتیان میرێك لە ئێمەو میرێك لە ئێوە (منا أمیر ومنكم أمیر) ئــەم ڕێگەیــە لــە زۆربــەی دەوڵــەتانی جیهــانی هاوچــەرخدا سەرکەوتوویی‌و بە کەڵکی خۆی سەلماندوە، دروســت نیــەو نــاکرێ قەدەغەی بکەین لەو گەلانە، ئەگەر بیانەوێت بێنە ناو ئیسلامەوە، هەروەها ناکرێ قەدەغەکرێ گەلانی ئیسلامی مومارەسەی کەن لە چاخی نوێدا، ئەگەر شەریعەت بریتــی بــوو لــە سەرچــاوەی یاســا دانانو تەشریع.

٦- وە هەر کارێکی جەماعی ڕێکخراو بــۆ بــەدیهێنانی ئــەو بنــەماو ڕێسایانەی ئیسلام هێناویــەتی، وە دامەزرانــدنی چــەندین پــارتی سیاسی‌و سەندیکای پیشەیی و کۆمەڵەی خێرخــوازی‌و لیژنــەکانی مافەکانی مرۆڤ کە کار بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتی دەکــەن لە کاروبارەکانی سیاســەتو ئــابوری‌و کۆمەڵناســی‌و بــەدیهێنانی دادگــەری‌و یەکــسانی‌و پاراســتنی مــافو ئازادی‌یــەکان، هــەموو ئەوانــە دروســتو مەشــروعن، چــونکە ئــەم جــۆرە کۆبونەوانــە بۆدەستکەوتنی بەرژەوەندییەکانو بەرهەڵستی خراپەکاری‌یەکانن و لە ژێر ئەو ئایەتەی خوای گەورەدا جێی دەبێتەوە کە دەفــەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ (المائدة: ٢) ((وما لا يتم الواجب الا به

فهو واجب)) واته: هەرشتێ کردنی واجبێکی لەسـەر وەسـتا بێـت خۆیشی دەبێته واجب.

کاتێك کۆبونەوە یـا هاوپەیمانێتیـەك قەدەغـەو حەرامـە کـە بـۆ پوچکردنەوەی رەوا یا دەرخستنی خراپەکاریەك یـا وروژانـدنی زیانێـك بێـت.[1]

شـێخی ئیـسلام ئیبنـو تەیمیـە دەفـەرموێت: ((ئەگـەر کەسـێك کاروباری دەستەو کۆمەڵێك بگرێتە دەست ئەوە پێی دەوترێ سەرکردە (زعیم) جا ئەگەر بەچاکەکاری ئەرکەکانی جێبەجێکرد ئەوا لەسـەر ئەو کارەی ستایش کراوە، ئەگەر بە خراپەش بـوو سەرزەنـشت دەکـرێ لەسەری .

سەبارەت بـە (سـەرۆکی حیـزب) ئـەوە سـەرکردەی ئـەو دەسـتەو کۆمەڵەیەیەکە کۆدەبێتەوەو حیزبایەتییەکە دەکات ((تتحزب))، واتە دەبێتە حیزب، جا ئەگەر کۆبونەوە لەسەر ئەو شتانەی خـوای گـەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پـێداوە بـێ زیـادو کـەم ئـەوا بـاوەڕدارنو هەموو مافو ئەرکەکانیان وەکو یەکە، بەڵام ئەگەر کەمو زیادیان کرد بۆ وێنە دەمارگیریان هەبوو بۆ ئەو کەسەی دێتە حیزبەکـەی ئەوانـەوە

---

(١) سـەیری ئـەو وتەیـەی شـێخی ئیـسلام بکـە کـە بـە درێـژی باسـی دروسـتی هاوپەیمانێتیو وەفا بە پەیمانو ئەو گرێ بەستانە دەکات کە چاکەو بەرژەوەندی گشتی لێ دەکەوێتـەوە، یـاخود زیـانو خراپەکاریـەکان دوور دەخاتـەوە سـەیری جامع الرسائل ٢(/٣٠٧-٣١٧) بکە

لەسەر ڕەوا بێت یا نارەوا، وە پشت هەڵکەن لــە هــەر کەســێ نەیەتــە حیزبەکەی ئەوانەوە، جا ئیتر لەسەر ڕەوا بێــت یــا نــارەوا، ئەمــە لــەو پەرتەوازەیەیە کە خــوای گــەورەو پێغەمبەرەکــەی ﷺ سەرزەنــشتیان کردوە، خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان داوە بــە جەماعــەتو یەکگرتوویی و نەهییان کردوە لە پەرتەوازەییو ناکۆکی وە فەرمانیان داوە بە هاوکاریکردن لەسەر چاکەو خۆپارێزی و نــەهیان کــردووە لــە تاوانو دەستدرێژی)[1] وە یەکەم هەنگاوێك لەسەر ڕێگــەی چاکــسازی بریتیە لە گومانکردن (الشك) هەروەك پێغەمبەری خــوا ﷺ بــانگی بۆی کردوە بەو فەرمودەیەی دەفــەرموێت: ((نحــن احــق بالــشك مــن ابراهیم))[2] ئێمە لە پێشترین کــە شــكو گومانمــان هــەبێت وەك لــە ئیبراهیم .

شــــكو گومــــانکردن لــــە تێگەیــشتنەکانی کۆمەڵگــەو دیــدو تێڕوانینەکانی ئەو سەبارەت بە ئایینو بوارەکانی، وە گومــانکردن لــە ڕۆشنبیری ئیسلامی هاوچەرخ بەوەی کە بریتیە لە بەرهەمی ڕۆشنبیری کۆمەڵگــە، کــە حکومەتــەکان هەڵدەســتن بــە پێکهێنــانی و ئاراســتەکردنی لــە ڕێگــەی هۆکارەکــانی ڕاگەیانــدنو فێرکردنــەوە، لەوانەش مزگەوتو قوتابخانە ئایینیو کۆلێژە شــەرعیەکان، کــە بــۆ خزمەتی حکومەتەکان وەگەڕخراوە بە جیــاوازی بیروئاراســتەکانیانەوە

---

(١) مجموع الفتاوى ٩٢/١١

(٢) متفق عليه.

لەوپەڕی چەپی سۆسیالیستییەوە تا ئەوپەڕی راستڕەوی سـەرمایەداری کە هەر لە سەردەمی کەوتنو هەرەسی خەلافەتی عوسمانیو هەژمونی ئیستعماری رۆژئـاوایی لـە کاروبارەکانیـدا دەسـتیان گرتـووە بەسـەر جیهانی عەرەبیدا

بەشكو گومانكردنەوە ئومەت دەگاتە ئەوپەڕی دڵنیاییو بەخششی ئازادی ئەگینا بەردەوام دەمێنێتەوە لە کۆتو بەندی ئەندێشەو وەهـمو دۆزەخی کۆیلایەتیـدا، بـۆ دەربـازبوونیش لـەم سـەرگەردانیە، تـەنها شۆرش یاخود تۆفانی لەبەردەم دایە!

# نـــاوەڕۆك

# الحرّية أو الطّوفان

## د. حاكم المطيري




نوسينگەی تەفسير

بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شيرين پالاص

ت: 2230908 - 2221695- 2518138

موبايل: 07701387291 – 07504605122

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

altafseer@hotmail.com


